* ژیاننامەیا پێغەمبەرێ خودێ
سلاڤ لێ بن
* تەحسین ئیبراهیم دۆسکی
* چاپا نەهێ ٢٠٢٣
* بەرگ: أيوب گارە
* سەرپەرشتیێ چاپێ:
أواب أحمد جزيرى
* ژمارا سپارتنێ ٢٢٢٠/١٦





# ژياننامەيا
# پێغەمبەرێ خودێ
## سلاڤ لێ بن

تەحسين ئيبراهيم دۆسكى

چاپا نەهێ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سەرنامەیێ نامە نامێ ئەللاهـ
بێ نامێ وی ناتەمامە وەللاهـ

خانی

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ ﴾

(آل عمران: ٨١)

# پێشگۆتنا چاپا نوی

حەمد وسوپاسی بۆ وی خودایی بن یێ بەرێ مە دایە ڕاستترین ڕێک و باشترین دین، و صەلات و سلاڤ ل وی پێغەمبەری بن یێ ب دورستترین و تمامترین ڕێ و ڕێباز بۆ مە هاتی، و هەر ئێکێ ل سەر ڕێکا وی چووی و بۆ مەنهەجێ وی گازی کری.

ئەڤ کتێبا نوکە ل بەر دەست د بناخەیێ خۆ دا بەرنامەیەک بوو، بەری بیست سالان مە ئەو ل رادیۆیا دهۆکێ پێشکێش کربوو، پشتی هنگی، و ل سەر داخوازا گەلەک گوهداران ئەو د کتێبەکا تایبەت دا پتر ژ جارەکێ هاتبوو چاپکرن، و ژ بەر کو گەلەک داخواز ل سەر ڤێ کتێبێ دگەهشتنە مە، و دا کو ئەو د کراسەکێ هێژاتر دا بکەڤتە بەر دەستێ خواندەڤانان، مە ڤیا ئەو جارەکا ب دەقێ کتێبا دا بچین، هندەک جهان ژێ دوبارە داڕێژین، و هندەک جهێن دی گوهۆرینێ تێدا بکەین، پشتی کو هژمارەکا نوی یا زێدەران کەفتینە بەر دەستێ مە.. و د ئەنجام دا ئەڤ چاپا نوی (یا ڤەوژارتی و زێدەکری) هاتە بەرهەڤکرن. د ڤێ چاپێ دا هژمارەکا ریوایەتان هاتنەلادان یێن لاوازییا وان بۆ مە ژ زێدەرێن ڕەسەن ئاشکەرا بووی، و هندەک ژ وان ریوایەتێن دان و ستاندن د ناڤبەرا زانایێن دیرۆکێ و سیرەتێ ل سەر دورستییا وان هەی ئیشارەت ل دەهمەنێن کتێبێ بۆ هاتەدان، هەر وەسا خواندەڤان زێدەکرن و بەفرەهکرنا هژمارەکا بابەتان ژی د ڤێ چاپێ دا دێ بینن.

هیڤیدارین خواندەڤان مفایی ژێ وەربگرن، و خودێ هاریکار و پشتەڤانێ هەر لایەکێ بت.

# پێشەکی

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، ومن سيئات أعمالنا، من يهدي الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ (آل عمران: ١٠٢).

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا ﴾ (النساء: ١).

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلًا سَدِيدًا ۝٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَـٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ (الأحزاب: ٧٠-٧١).

اللهم صل على محمد وعلى آل محمد، كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم في العالمين، وبارک على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم في العالمين إنک حميد مجيد.

أما بعد: فإن خير الكلام كلام الله، وأحسن الهدي هدي محمد رسول الله -صلى الله عليه وسلم- وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

کوردزمانێن هێژا: ژ ڕاستییێن نه بەرگومانه کو مرۆڤ ب خۆرستییا خۆ حەز ژ خواندن و گوهدانا ژین و سەربۆرا مرۆڤێن مەزن دکەت، چونکی ئەو ئەو رێکه یا کو دبته پێگەهەکا ب هێز یا خودانی ب وان ناڤداران ڤەگرێ ددەت، ئەڤە ژ لایەکی ڤە.. ژ لایەکێ دی ڤە: ئەڤ دویچوونەیە دبتە نیشانەکا بەرچاڤ یا ڤیانا مرۆڤی بۆ وان ناڤدارێن مەزن. و من نەباوەرە جهێ دودلییێ بت کو ناڤێ پێغەمبەرێ ئیسلامێ -سلاڤ لێ بن- سەر دەفتەرە بۆ لیستەیا مەزنە ناڤدارێن دیرۆکا مرۆڤینییێ، چونکی هەر ئەو بوویە خودانێ وان سالۆخەتێن تازە یێن دلسۆز و تێگەهشتی بۆ مرۆڤێ (نموونە) دخوازن، هەر ئەو خودانێ وی گازییێ بوویە یا مەزنی هەمی د چارچووڤەیێ خۆ دا حەواندی، لەو د کەڤن دا خەلکی ژ موسلمانان و نە موسلمانان ژی ڤیایە ژیاننامەیا وی بخوینن و پێ ئاگەهدار ببن، هندەکان ژ بەر هندێ بوویە دا چاڤ لێ بکەن و ل سەر رێکا وی بچن، و هندەکێن دی بۆ وێ چەندێ بوو دا تام بکەنە مەزنییێ ژ ژیانا ڤی سەرکێشێ بێ هەڤتا!

هەر چاوا بت کوردێن مە ژی دخوازن بارەک د ڤێ ئێکا ژێگۆتی دا هەبت، لەو ئەڤە دەمەکە -و ژ گەلەک لایان ڤە- داخواز دگەهنە مە کو ئەم ژیاننامەیا پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- ب کرمانجییەکا رەهوان بنڤیسین و بێخینە بەر دەستێن کرمانجان، چونکی وەکی ئەم هەمی دزانین هندی پەرتۆکخانا مە یا کرمانجییە حەتا ئەڤرۆ ژی -مخابن- د ڤێ دەلیڤەیێ دا یا چرێک و ڤالایە.. و پشتی خواستنا پشتەڤانییێ ژ خودایێ مەزن مە دەست دا نڤیسینا ڤی بابەتێ نەیێ ب ساناهی.

بەری قەستا گولزارا ژینا خۆشتڤییێ دلی بکەین پەیڤەک هەیە من دڤێت د گوهێ خواندەڤانێ هێژا دا بێژم: هەر ڤیانەکا هەبت ئەگەر ب تنێ

گۆتنا دەڤی بت ب بهایەکێ ئەرزان دی ئێتە فرۆتن، دێ وەکی وێ دارا سەر ئاخ بت یا ب بێ خێرترین هرەبای ژ رەهـ و ریشالان دئێتەدەر، ڤیانا مە موسلمانان ژی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەگەر گۆتنا دەڤی بیت دێ یا بێ مفا بیت ومنەکا ب تنێ ژی ل سەر مالێ باوەری یا مە زێدە ناکەت!

دەمێ ئەم ژیاننامەیا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دخوینین دڤێت بەری هەر تشتەکی ئەم ل بیرا خۆ بینین کو ڤیانا مە بۆ ڤی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنگی دێ یا راست و دورست بت، ئەگەر ئەم ل دویڤ رێکا وی چووین و پێگیری مە ب دینێ وی کر.

ئەگەر راستە ڤیانا وی د دلێن مە دا هەیە، دڤێت ئەم د هەمی کار و کریارێن خۆ دا چاڤ ل وی بکەین، چونکی درەوە مرۆڤ ژ حەژێکەرێن وی بت و ل دویڤ رێکا ئێکێ دی ژ بلی وی بچت.

هیڤی یا مە ژ خودێ ئەوە مە ب دورستی بکەتە ژ حەژێکەرێن وی و دویچوونا رێکا وی بکەتە بارا مە و مە ژ وان کەسان ب هژمێرت یێن کار دکەن پێخەمەت دوبارە بلندکرنا گازییا وی و چکلاندنا ئالایێ حوکمدارییا دینێ وی.

تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

دهۆک ٣ / ١٠ / ١٩٩٥ز

# بۆچی ئەم ژینەنیگارا پێغەمبەری دخوینین؟

ل سەری ئەم دێ ب پیسارەکێ دەست پێ کەین، ئەو ژی ئەڤەیە: ئەرێ بۆچی ئەم ژینەنیگارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دخوینین؟ یان: چ فایدە بۆ مە د خواندنا سیرەتا وی دا هەیە؟

هەر جارەکا مرۆڤ ڤێ پسیارێ ژ خۆ بکەت، بێ گومان ئەو دێ خۆ ل بەرانبەر پتر ژ بەرسڤەکێ بینت، و ئەڤە تشتەکێ غەریب نینە؛ چونکی پتر ژ ئەگەر و مفایەکی د پشت خواندنا مرۆڤی را بۆ سیرەتێ هەیە، لەو بەرسڤ ژی ب پتر ژ گۆتنەکێ دئێتەدان.. و هەر جارەکا مرۆڤی بڤێت سیرەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بخوینت پێتڤییە ل دەسپێکێ بیرا خۆ ل وان مفایان بینتەڤە یێن د خواندنا سیرەتێ دا هەین، دا پشتی هنگی ئەو کاری بۆ ب دەستڤەئینانا وان مفایان بکەت.

و ل ڤێرێ مە دڤێت ئەم هندەک ژ وان مفایان دەستنیشان بکەین یێن کو د خواندنا ژیاننامەیا پێغەمبەرێ خودێ دا -سلاڤ لێ بن- هەین..

ژ وان مفایان:

**١- ب خواندنا سیرەتێ مرۆڤ دێ شێت وێ حەزێ ب جہ ئینت یا د دلێ وی دا هەی کو عشقا قەهرەمانییێیە، و ڤیانا گوهدانا سەرهاتییێن قەهرەمانانە:**

مرۆڤ، هەر مرۆڤەکێ هەبت، چ زارۆک بتّ، یان یێ مەزن بت، ب تبیعەتێ خۆ یێ کو خودێ ئەو ل سەر دای، حەز ژ گوهدانا چیرۆک و سەرهاتییان دکەت، ب تایبەتی سەرهاتییێن قەهرەمانییێ، و دلێ وی

دچتـێ ئاگـەهـداریـیـا وی ب دەنــگ و باسێن وان قـەهرەمانان هـەبت یێن د دیرۆکێ دا هاتین، و هەر ل سەر ڤی بناخەیی لایەکێ مـەزن ژ وی ئـەدەبێ جیهـانی پەیدابوویـە یـێ پـال ددەتـە سـەر ڤـەهاندنا چیـرۆک و سـەرهاتییێن قەهرەمانییێ، ئـەگـەر خــۆ ل ســەر حسێبا وێ خـەیالـێ ژی بت ئـەوا ڤالا ژ ڕاستییێ.

قـەهـرەمـانـی، ئـەوا مرۆڤ حەز ژێ دکەت، نە ب تنێ ئەوە کسەک د مەیدانا شـەڕی و خۆلێکدانێ دا یێ زیرەک بت، بەلکی قـەهرەمانی ئـەوە د هــەر مەیدانەکا هەبت دا ژ مەیدانێن ژیانێ، کسـەک یـێ پێشـکەفتی بـت ل سەر خەلکی، و ب ڤێ چەنـدێ مـەردینی د مەیـدانا دانـێ دا قەهرەمانییـە، دلفرەهی د مەیدانا حەق و حقووقان دا قەهرەمانییە، لێبۆریــن د مەیـدانا دان و ستاندن و شیانێ دا قەهرەمانییـە.. و هۆسـا! ئـەڤ هەلویسـتێن بلند، دلـێ مرۆڤی ب نـک خۆ ڤـە دکێشت، و حـەزا گوهدانا وان ل نـک مرۆڤـی پەیـدا دکەت، و پێ نەڤێت بێژین: ئەو کارەکێ خۆش و شوینوارەکێ باش ژی ل سەر نەفسا مرۆڤـی دهێلن، ئەگـەر خۆ ئـەو هەلویسـت خەیالـەک بـت ژی د سـەرێ نڤیسـەری دا هاتییە ڤەهاندن، وەکی مە گۆتی، و چو ڕاسـتی بـۆ نـەبت ژی.. ڤێجا پـا ئەگـەر ئـەو هەلویسـت دڕاسـت بـن، و د واقعـی دا وەکـی خۆ هاتبنـە ڕویدان، وەکی هەلـویستێن سیرەتا پێغەمبەری -سـلاڤ لـێ بـن-؟ بێ گومـان کارێ وان ل سەر نەفسێ هێشتا دێ یێ پتر بت.

و خوانـدنا مـە بـۆ سـیرەتا خۆشـتڤییێ دلان -سـلاڤ لـێ بـن- ڤـێ حـەزا نەفسی و پێتڤییا دەروونی بۆ مـە ب جـهـ دئینـت، و ئێکا هند ژ نەفسا مـە چێ دکەت ئەو ب قەهرەمانییەکا دورست، یا دویـر ژ درەوێ و(موبالـەغێ) و خــەیالێ، عــەجێبگرتی ببــت، و وێ بــۆ خــۆ بکەتــە باشــترین نموونــە بــۆ چاڤلێکرنێ.

**٢- مرۆڤ دشێت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ خۆ بکەتە نموونەیێ چاڤلێکرنێ:**

کانێ چاوا مرۆڤ ب تبیعەتێ خۆ حەز دکەت گوهدانا سەرهاتییێن قەهرەمانییێ بکەت، و قەهرەمانان بنیاست، وەسا ئەو حەز دکەت ئێک ژ وان بۆ خۆ بکەتە نموونەیێ بلند، یێ ئەو حەز دکەت چاڤ لێ بکەت، و بەرگەڕیانێ دکەت کو خۆ وەکی وی لێ بکەت، و ئەڤە -وەکی مە گۆتی- تشتەکێ نەفسییە خودێ د دەروون وفیطرەتا مرۆڤی دا چاندییە..

و ئەگەر مرۆڤێ موسلمان یێ داخوازکری بت کو د هەر مەسەلەکا هەبت دا ئەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ خۆ بکەتە باشترین نموونەیێ چاڤلێکرنێ، وەکی خودایێ مەزن د ئایەتەکێ دا گۆتی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ (الأحزاب: ٢١) پسیار ئەڤەیە: ئەرێ چاوا مرۆڤ دێ شێت چاڤ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەت، ئەگەر چویێ ژ دیرۆک و سەرهاتییا ژینا وی نەزانت؟ کەسەکێ تو نەنیاسی، و تە چو ئاگەهی ب سەر و بەر و ڕێبازا وی د ژیانێ دا نەبت دێ چاوا شێی دویکەفتنا وی کەی، و ل سەر ڕێکا وی چی؟!

ژیانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مە وەکی وی نەخشەیی (خەریطێ) لێ دئێت، یێ ڕێکا دورست نیشا مە ددەت، ئەو ڕێکا مە دگەهینتە کنارێ تەناهییێ، کو حەژێکرنا پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن- و دویکەفتنا وییە..

**٣- مرۆڤ دشێت ڤیانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دەست خۆ بێخت، پشتی ئەو ب دورستی وی دنیاست:**

ڤیان وەکی ئەم هەمی دزانین تشتەکە ناکەفتە ژێر ئیرادەیا مرۆڤی، یەعنی: ئەو تشتەکە بێی مرۆڤی دئێت، و پتر جاران مرۆڤی چو ئختیار و هلبژارتن بەرانبەر نینە.. بەلێ دڤێت ژ بیر نەکەین کو د شیانا مرۆڤی دایە ئەو ڕێکێ بۆ ڤیانێ خۆش بکەت، و دەرگەهێ دلێ خۆ بۆ ڤەکەت، و ئێک ژ مە ئەگەر بڤێت دلێ خۆ بۆ ڤیانا پێغەمبەری ڤەکەت، دڤێت ل وێ ڕێکێ بچت یا ئەڤ ڤیانە پێ ب دەست وی ڤە بێت، کو ڕێکا خۆ شارەزاکرنا ب سیرەتا وییە، دەمێ تو ب سیرەتا کەسەکێ مەزن شارەزا بووی، دێ ب وان لایان ئاگەهدار بی یێن ئێکا هند ژ تە چێ دکەت کو تو ب وی (موعجب) ببی، و (ئیعجاب) دەرگەهێ مەزنێ ڤیانێیە.

گوهداریا ڤێ نموونەیێ بکەن ژ سیرەتێ دا بزانن کانێ چاوا مرۆڤ دشێت حەز ژ کەسەکی بکەت، دەمێ لایێن مەزنییێ د کەسینییا وی دا دبینت، ئەگەر خۆ بەری هنگی ئەو گەلەک حەز ژ وی نەکەت ژی:

پشتی قورەیشی ب سەرێ شۆڕ ڤە ژ بەدرێ زڤڕینە مەکەهێ، و حەفتێ ژ مەزن و گرگرێن وان هاتینە کوشتن، و حەفتێ ئێخسیر بووین، (صەفوانێ کوڕێ ئومەیەی) و (عومەیرێ کوڕێ وەهبی) د کەعبێ ڤە ڕوینشتن و کول و کۆڤانێن خۆ بۆ ئێک و دو ڤەگێڕان، یێ ئێکێ بابێ وی هاتبوو کوشتن، و یێ دی کوڕێ وی هاتبوو ئێخسیرکرن، لەو کەربێ دلێن وان تژی کربوو، عومەیری گۆت: ئەگەر نە ژ بەر هندێ با کو ئەز یێ دەیندارم، ئەز دا چمە (یەثربێ) و هنگی ئەز ڕادوەستام حەتا موحەممەدی ب ڤی شیرێ خۆ بکوژم! صەفوانی گۆتێ: ئەگەر تو وە بکەی دەینێ تە هەمی ل سەر من، هەر وەسا خودانکرنا عەیالێ تە ژی، ئەگەر تشتەک ل تە هات.. و ل سەر بناخەیێ ڤێ ڕێککەفتنێ عومەیر ڕابوو شیرێ خۆ باش ژەهر دا، و قەستا مەدینێ کر، حێشترا خۆ ل بەر دەرێ مزگەفتێ نیخاند، و ب ژۆر کەفت، پێغەمبەر

-سلاڤ لێ بن- و عومەر ژی ل مزگەفتێ بوون، عومەر ژ کەرب ڤە چوو بەراهیێ و بەرسنگێ وی گرت، و ڤەهژهژاند، گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو دیتی، گۆتێ: عومەر، وی بهێلە، عومەیر ب نک من ڤە وەرە.. عومەیر ب نک ڤە چوو، و گۆتێ: سپێدەیا تە ب خێر بت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: خودێ سلاڤەکا باشتر ژ سلاڤا تە یا دایە مە، سلاڤا خەلکێ بەحەشتێ: (السلام علیکم).. پاشی گۆتێ: تو هاتییە چ؟ وی گۆت: ئەزێ هاتیم ئێخسیرێ خۆ ژ هەوە بکڕم، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: پا ئەو چ شیرە ب ستوییێ تە ڤە؟ وی گۆت: خودێ وی نەهێلت، ما چ فایدە وی ل مە کر؟ پێغەمبەری گۆتێ: ڕاست بێژە، تو هاتییە چ؟ جارەکا دی وی گۆت: ئەزێ هاتیمە وی تشتی یێ من گۆتییە تە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: نە.. تو نەهاتییە هندێ، تو یێ هاتی تشتەکێ دی بکەی، حال و مەسەلێن تە و صەفوانی ئەڤەنە، بەلێ خودێ ناهێلت تو وێ بکەی، یا هەوە کرییە دلێ خۆ!

عومەیر حێبەتی ما.. مەعنا: موحەممەد دزانت ئەزێ هاتیمە چ، د گەل هندێ ژی شوینا ئەو بێژتە عومەری: وی باش بگرە، دا نێزیکی من نەبت، ئەو یێ دبێژتێ: وی بەردە بلا ب نک من ڤە بێت! ئەڤە چ سنگفرەهییە وی هەی، و بۆچی ئەو هندە یێ ژ خۆ پشت ڕاستە؟ ڤی هەلویستێ وی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیتی (ئیعجاب) ل نک وی ب پێغەمبەری پەیدا کر، و هەر زوی ڤێ ئیعجابێ بەرێ وی دا ڤیانێ، و ڤیانێ بەرێ وی دا ئیسلامێ..

**٤- ئەم دێ شێین ب دورستی د مەعنایا قورئان و حەدیسان بگەهین:**

گەلەک ئایەتێن قورئانێ د هندەک ڕوویدانێن تایبەت دا هاتبوونە خوارێ، و ژ بەر هندەک ئەگەرێن دەستنیشانکری، هەر وەسا پێغەمبەری ژی

-سلاڤ لێ بن- گەلەک گۆتنێن خۆ د هندەک هلکەفتنان دا گۆتینە، ئەڤ ڕوویدان وهلکەفتنە ئەون یێن پەیوەندی ب سیرەتێ ڤە هەین، لەو زانینا مە بۆ سیرەتێ دبتە باشترین هاریکار بۆ مە کو ئەم بشێین ب دورستی د وان ئایەت و حەدیسان بگەهین، و ئەگەر ئەم دورست تێ گەهشتین، دێ شێین پشتی هنگی ب دورستی (ئەحکامێن شەرعی) ژی ژێ دەربێخین، و کاری پێ کەین.

**٥- ئەم دێ زانین کانێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چەند زەحمەت دیتییە حەتا شیای جاهلییەتێ ب هەمی چەق و طایێن وێ ڤە لادەت:**

و ئەڤە هندەکێ ژ قەدر و بهایێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مە ئاشکەرا دکەت، ئەو قەدر و بهایێ وی پتر د چاڤێن مە دا بلند و مەزن دکەت، و دڤێت هزر نەئێتەکرن کو لادانا جاهلییەتێ، و بەلاڤکرنا ڕۆناهییا ئیسلامێ کارەکێ ب ساناهی بوو، نەخاسم ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینینە ڤە کو جاهلییەتێ مەیدانا عەقیدێ، و بیر و باوەران، و جڤاکێ، و سیاسەتێ، و ئابۆرێ، و هەمی لایێن دی ژی یێن ژیانێ ڤەگرتبوون، و هەما بەسە ئەم بیرا خۆ ل وێ زەحمەتێ ب تنێ بینینە ڤە یا مرۆڤ ب گوهۆڕینا عورف و عەدەتێن جڤاکی ڤە دبینت، ڤێجا چاوایە ئەگەر مرۆڤەک ئارمانجا خۆ بکەتە گوهۆڕینا هەمی لایێن ژیانێ، وەکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری؟ و د ناڤ مللەتەکێ مەژی هشک و دویر ژ هەمی ڕەنگێن شارستانییێ دا وەکی وی مللەتی یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ناڤ دا هاتی؟

خواندنا سیرەتێ، و زانینا وی دەورێ مەزن یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پێ ڕابووی پتر وی د چاڤێن مە دا مەزن دکەت.

**٦- قەدر و بهایێ جیلێ ئێکێ یێ ڤێ ئوممەتێ ژی ، کو صەحابینە، بۆ مە ئاشکەرا دبت:**

دەمێ ئەم قەدرێ وان دزانین، و بۆ مە ئاشکەرا دبت کانێ وان ژی د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چەند زەحمەت ب بەلاڤکرنا ڤی دینی ڤە دیتییە، و وان ژی چەند قوربانی داینە، حەتا شیاین جاهلییەتێ لادەن، و ئیسلامێ ل سەر عەردی بنەجهـ بکەن، و ئەڤە ڤیانا مە بۆ وان زێدەتر لێ دکەت، و ئاشکەرایە کو کانێ چاوا خودێ موحەممەد -سلاڤ لێ بن- هلبژارتییە دا ببتە پێغەمبەرێ وی یێ دویماهییێ، وەسا وی ئەڤ جیلە ژی هلبژارت دا ئەو ببنە هەڤال و هاریکار بۆ پێغەمبەرێ وی، و هلگر بۆ ڤێ گازییێ بۆ جیلێن کو دێ پشتی وان ئێن.

و دڤێت ژ بیر نەکەین کو ئەو کەسێن دڤێن ڤی دینی د چاڤێن خەلکی دا کرێت بکەن، بەری هەر تشتەکی کاری بۆ هندێ دکەن کو ڤان صەحابییان ب ڕەنگەکێ کرێت نیشا خەلکی بدەن؛ دا د ڕێکا وان ڕا بشێن دربێن خۆ بوەشیننە ئیسلامێ.. ما نە ئیسلام د ڕێکا ڤان صەحابییان ڕا گەهشتییە مە؟

## ٧- ئەم دێ زانین کانێ چاوا د مەسەلا گازیکرنا بۆ ڤی دینی دا چاڤ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەین:

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل دەمەکی هاتبوو هنارتن، ڕێنیشانێن تەوحیدێ و دینێ دورست د ناڤ خەلکی دا هاتبوونە بەرزەکرن، جیهان د جاهلییەتەکا مەزن دا دژیا، صەنەم دهاتنە پەرستن، و فاحیشە ب ڕەنگەکێ بەرفرەهـ دهاتنەکرن، یێ ب هێز یێ لاواز دخوار، فسادێ هەمی لایێن ژینێ ڤەگرتبوون: لایێ دینی، یێ سیاسی، یێ جڤاکی، یێ ئابۆری.. و هتد، دو هێز ل عالەمێ ددەسهەلاتدار بوون: هێزا فورسێ ل ڕۆژهەلاتێ، و یا ڕۆمێ ل ڕۆژئاڤایێ، و شەڕ و لێکدان د ناڤبەرا وان دا دبەردەوام بوون، و مللەتێن دی یێن بچویک گەلەک جاران نەچار دبوون خۆ بدەنە د گەل ئێک ژ هەردو

لایان؛ دا بەرژەوەندیێن خۆ بپارێزن، هەر چەندە ئەڤ لاگرییە گەلەک جاران دبوو ئەگەرا هندێ کو ئەو ببنە پێهلکرییێ ئاگرێ هندەک شەرێن نە وان چو ژێ و نە چو تێ ژێ!

ل دەمەکێ هۆسا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هات، وی ژ چ دەست پێ کر؟ و چاوا جڤاکا خۆ ئێکەمین جار بۆ ڤی دینی گازی کر، پاشی خەلکێ دی؟ ڕێبازا وی د گازیکرنێ دا بۆ ئیسلامێ یا چاوا بوو؟ ووی (ئەولەوییەت) ددا چ تشتی؟ چاوا ئەو شیا ب سەرکەڤت؟ وجیلەکێ وەسا پەروەردە بکەت کو بشێن ڕۆناهییا ئیسلامێ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ بکەن؟

بەرسڤێن ڤان هەمی پسیاران ژ خواندنا سیرەتێ بۆ مە ئاشکەرا دبن، و ئەگەر مە بەرسڤ زانی، ئەم دێ شێین ب دورستی چاڤ ل وی کەین، مەعنا: ئێک ژ گرنگترین مفایێن زانینا سیرەتێ ئەوە مرۆڤ دشێت ب سەر ڕێکا دورست هل ببت، کو مەنهەجێ پێغەمبەرینییە د (دەعوێ) دا، دا پشتی هنگی ب وان (مەنهەجێن) نوی دەرکەفتی نەئێتە خاپاندن ئەوێن د مەیدانا (دەعوێ) دا دەرکەفتین، یێن پشت دایە ڕێکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-. ئەڤە هندەک ژ وان مفایانە یێن کو ژ سیرەتێ دئێنە وەرگرتن، و بێ گومان ئەگەر مرۆڤ دویچوونەکا پتر بکەت، گەلەک مفایێن دی ژی دێ تێدا بینت.

## چاوا ئەم ژینەنیگارا پێغەمبەری بخوینین؟

مە گۆت: بۆچی ئەم ژینەنیگارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دخوینین؟ و د بەرسڤێ دا مە هندەک ژ وان مفاییێن مەزن بەرچاڤکرن یێن کو د خواندنا سیرەتێ دا هەین، و پسیارا نوکە ئەڤەیە: چاوا ئەم سیرەتا پێغەمبەری بخوینین؟ و بەلکی تبیعەتێ ڤێ پسیارێ ل بەر هندەکان یێ غەریب بت، بەلێ مەخسەدا مە پێ ئەوە ئەم پسیارەکێ بهلێخین و ل بەرسڤا وێ بگەرییێین، ئەرێ دەمێ ئەم دیرۆکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دخوینین و بۆ خەلکی دبێژین، و بەری هنگی دەمێ ئەم دنڤیسین، ئەم وێ ب کیژ مەنهەجی بنڤیسین؟ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چاوا نیشا خەلکی بدەین؟

سیرەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئێک ژ وان بابەتانە یێن هژمارەکا مەزن یا کتێبان ل سەر هاتینە نڤیسین، بۆ نموونە: د زمانێ ئوردی دا (یێ پاکستانی پێ دئاخڤن) پتر ژ دو هزار کتێبان ل دۆر سیرەتێ هەنە، و بۆ زانین ئەڤە نێزیکی دو سەد سالانە ب تنێ نڤیسینا ب ڤی زمانی دەست پێ کری، ڤێجا هوین چ دبێژن بۆ زمانەکێ وەکی عەرەبییێ ئەوێ ئەڤە نێزیکی هزار و سێسەد سالانە کتێب ل دۆر سیرەتێ پێ دئێنە نڤیسین، ئەو دێ چەند بن؟

ئەوێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب نڤیسینێن خۆ بۆ خەلکی پێشکێش کری، هەر ئێکی د گۆشەیەکێ ڕا ئەو دیتییە، و ل دویڤ وێ دیتنێ ئەو نیشا خەلکی دایە، هندەکان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- وەک قەهرەمانەکێ

ئەفسانەیی دایە نیاسین، دێ بێژی ئەو ژ نڤشێ مرۆڤان نەبوویە، ئەو ب سەری نەدهات یا ب سەرێ مرۆڤان دئێت، لەو دێ بینی ئەو وەسا وی وەصف دکەت کو سیرەتا وی هەمی موعجیزە و تشتەکێ پەردەدڕ بوو، هەر ژ بەری ببت دەمێ بەحر هشک بووین، و گاڤا بووی دەمێ کەفتیە عەردی و چوویە سوجوودێ.. و حەتا ژ دنیایێ وەغەر کری!!

و هندەکان ژی ئەو وەسا دایە نیاسین وەک (زەعیمەکێ دنیایێ) ڤێجا چ (سەرکێشەکێ قەومی) بت یان (موصلحەکێ جڤاکی) بت، دویر ژ مەسەلا (وەحیا خودێ) و (موعجیزاتێن پێغەمبەرینییێ)، لەو دێ بینی ئەو وەسا وی وەصف دکەن وەکی هەر (عەبقەریەکی) ژ شارەزایێن دنیایێ و سیاسەتێ وەصف دکەن!

و د ناڤبەرا ڤان ڕێبازێن جودا جودا دا، ئەم چاوا بەرێ خۆ بدەینە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-؟ و ب چ ڕەنگی ژیاننامەیا وی ل بەر دەستێ خەلکی بدانین؟

د بەرسڤێ دا دێ بێژین: دەمێ ئەم پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ددەینە نیاسین، و ژینەنیگارا وی پێشکێشی خەلکی دکەین، دڤێت چار مەسەلێن گرنگ ل بەر چاڤێن مە هەبن:

**١- دڤێت ل بیرا مە بت کو (موحەممەد) -سلاڤ لێ بن- مرۆڤەکێ پێغەمبەر بوو:**

و دەمێ ئەم ل بیرا خۆ دئینینە ڤە کو خودانێ ڤێ سیرەتێ مرۆڤەکێ پێغەمبەر بوو، ئەم د دەستنیشانکرنا ڕاستییا وی دا ناکەڤینە خەلەتییێ، یەعنی: ئەم بەحسێ وی ناکەین وەک کەسەکێ بلندتر ژ مرۆڤینییێ حەتا وە لێ بکەین هندەک سالۆخەتێن خودینییێ -حاشا- بدەینێ، یان وەسا وی بدەینە نیاسین کو ئەو د چو تشتێن خۆ دا وەکی مرۆڤان نەبوو، علمێ غەیبێ

دزانی، یان دەمێ ب رێڤە دچوو هەمی گاڤا عەورەک ل هنداڤی سەری بوو دا حەتاڤ لێ نەدەت، یان دەمێ حەتاڤێ لێ دابا سیبەرا وی نەدکەفتە عەردی.. و هتد، ژ ڤان سالۆخەتێن وی وەسا نیشا مە ددەن کو هەر وەکی ئەو نە مرۆڤ بوو!!

هەر وەسا ئەم ب رەنگەکێ وەسا ژی بەحسێ وی ناکەین وەکی ئەم بەحسێ (عەبقەریەکێ دیرۆکی) دکەین، کو هەر تشتەکێ وی کربا، یان هەر بریارەکا دا با، ئەو ژ شارەزاییا وی، و تێگەهشتنا وی یا سیاسی، و خواندنا وی یا دورست بۆ واقعی دهات، بەحسێ وی بکەین وەک سەرکێشەکێ لەشکەری، و رێبەرەکێ سیاسی، و موصلحەکێ جڤاکی.. و هتد، هەر وەکی پشتەڤانییا وی ب وەحیا خودێ نەدهاتەکرن، و (موعجزێ) چو دەورێ خۆ د ژیانا وی دا نەددیت!!

نەخێر! نە وەسا و نە وەسا.

د ئایەتەکێ دا خودایێ مەزن فەرمانێ ل پێغەمبەرێ خۆ دکەت کو دەمێ ئەو خۆ بۆ خەلکی ددەتە نیاسین، ئەو بێژت: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ﴾ (الکهف: ١١٠) یەعنی: تو ئەی پێغەمبەر! بێژە مرۆڤان: هەما ئەز ژی وەکی هەوە مرۆڤم، چو تشتەکێ زێدەتر ژ هەوە ل نک من نینە، تشتەکێ ب تنێ تێ نەبت، ئەو ژی ئەڤەیە: وەحی ژ نک خودێ بۆ من دئێتە خوارێ، پێغەمبەرینییە من ژ هەوە جودا دکەت.

مەعنا: دەمێ ئەم سیرەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دخوینین، دڤێت ئەم وەسا بخوینین کو ئەوی چو پشک و بار د خودایندییێ دا نینە، نە غەیبێ دزانت، نە عیبادەت بۆ وی دئێتەکرن، نە دوعا ژێ دئێنەکرن، نە هەوارا خۆ مرۆڤ دگەهینتێ، ئەو ژی وەکی مە مرۆڤە، تشتەکێ ب تنێ هەیە وی ژ مە مرۆڤێن دی جودا دکەت، ئەو ژی وەحیا خودێیە ئەوا بۆ وی دهات، و ئەو

پێغەمبەرینییە یـا ئـەو ب سـەر سەرێ هەمی مرۆڤـان ئێخستی، ئەگەر ئەڤە ل بیـرا مــە بــوو، دەمــێ ئــەم ســیرەتا وی دخــوینین، ئــەم وی ژ مەرتــەبا مرۆڤینییێ بلندتر لێ ناکەین، و وی ژ دەرەجا پێغەمبەرینییێ ژی نزمتـر لـێ ناکەین.

**٢- سیرەت دڤێت بـەرێ مـە بـدەتـە خواندنەکا دورست بۆ دیـرۆکـێ، و شرۆڤەکرنەکا بنەجهـ بۆ رویدانێن وێ:**

مرۆڤـی ب دیتنـێن خـۆ گەلـەک خوانـدن و تەفسـیرێن ژێـک جـودا بـۆ دیـرۆکـێ هەبووینە، و گەلەک شرۆڤەکرنێن هەڤدژ ژی داینـە رویـدانێن وێ، و بەلکی تەفسیرا (ئـابـۆری) ئێـک ژ بـەلاڤترین وان تەفسـیران بت یێن حەتا ئـەڤرۆ ژی گەلـەک پشـتەڤانێن خـۆ د نـاڤ رەوشـەنبیرێن مـە دا هـەین، و مەخسەد ب تەفسیرا ئابۆری ئەوە مرۆڤ هەر رویدانـەکا دیرۆکی ب ئەگەرەکا ئابۆری ڤە گرێ بدەت، و ل سەر بناخەیێ ڤێ تەفسیرێ پالـدەرێ (فتووحـاتێن ئیسـلامـی) -بۆ نموونە- ئـەو بـوو: عەرەب مللەتەکێ رویـس و برسـی بـوون ل صەحرایا خۆ، وەختـەکی وان هزرا خۆ کر و گۆتن: مـا بـۆچی ئـەم رانـابین هندەک هێرشان بکەینە سەر فورسـێ و رۆمـێ و خێـر و خێـراتێن وان بێخینـە بن دەستێ خۆ؟ ئینا رابوون وە کر، ب ناڤێ ئیسلامێ خۆ دەولەمەند کر!

یان نموونەیەکا دی: هێرشێن وەلاتێن ئەوروپی ل ڤان سـێ چار قـەرنێن دویماهییێ بۆ سەر جیهانـا ئیسـلامی ب تایبـەتی، و رۆژهـەلاتێ ب گشـتی، ئەگەرەکا ئابۆری د پشت را هەبوو، وان دڤیا بازارەکێ بۆ پەرتالێ خۆ ببینن.. و هۆسا، هەر رویدانـەکا دیرۆکی یا هەبت، تەفسیرەکا ئابۆری یا حازر ل نـک وان بۆ هەیە!

یـان تەفسـیرا ژینگـەهی (بیئی) بـۆ دیرۆکـێ، یـان یـا قـەومی، یـان یـا (طـەبەقی).. و هتد، ژ وان تەفسیرێن مرۆڤان بـۆ خۆ دانـاین.. بـەلێ دەمـێ

ئەم سیرەتێ دخوینین (تەفسیرەکا ئیسلامی) بۆ دیرۆکێ ل بەر چاڤێن مە ئاشکەرا دبت، د دەمەکێ کورت دا یێ پازدە بیست سالەکا ڤەکێشای، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- شیا (جیلەکی) دورست بکەت یێ جودا د هەمی تشتان دا ژ خەلکێ دی، بێی ئێک جوداهییێ د (بیئەت و موستەوایێ وان یێ ئابۆری) دا پەیدا ببت، یان (هەڤڕکییەکا طەبەقی و جڤاکی) د ناڤبەرا وان دا ڕوی بدەت، پا ئەو چ بوو ل نک وان هاتییە گوهاڕتن؟ بەرسڤ یا ب ساناهی و ئاشکەرایە، باوەریا دلێن وان هاتە گوهاڕتن، ئینا گوهۆڕینەکا مەزن د نەفسێن وان دا پەیدا بوو، و دەمێ نەفسێن وان هاتینە گوهاڕتن، واقعێ وان ژی هاتە گوهاڕتن، و ئەڤە قاعیدەیەکێ خودابیە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴾ (الرعد: ١١).

**٣- هەر وەسا سیرەت بەرێ مە ددەتە وان حنێرێن مەزن ژی یێن باوەری دکەت:**

د ژیانا مرۆڤینییێ دا گەلەک جاران گوهۆڕین پەیدا دبن، ژ بەر گەلەک ڕەنگێن هەڤڕکییێ: هەڤڕکییا سیاسی، هەڤڕکییا ئابۆری، و هەڤڕکییا شارستانی.. وهتد، و د گەل کارلێکرنا ڤان هەڤڕکییان یا بەرچاڤ، بەلێ نە ئەون هەڤڕکییا مەزنتر د ژینێ دا، وەکی ئەو مەنهەجێن ڕۆژئاڤایی بۆ تەفسیرا دیرۆکی دبێژن، یێن ئەڤرۆ ئەم نیشا گەنجێن خۆ ددەین، هەڤڕکییا مەزنتر ئەوە یا ل سەری د دلێ مرۆڤی دا پەیدا دبت، د ناڤبەرا حەقییێ و باطلی دا، د ناڤبەرا باوەرییا ب خودایەکێ ب تنێ و کۆمەکا خودایێن ژ درەو دا، ئەو هەڤڕکییا گوهۆڕینەکا بنبڕ د نەفسا مرۆڤی دا پەیدا دکەت، گوهۆڕینەکا وەسا کو ژینا وی هەمییێ وەرگێڕت.. و ئەڤە مەسەلەکە (مەنهەجێن جاهلی) حەز دکەن هەردەم خۆ ژێ بێ ئاگەه بکەن، و هەر کارەکێ هەبت دویر ژ ڤێ (زاویێ) شرۆڤە بکەن؛ دا خەلکی وە تێ بگەهینن

کو (باوەرییێ) و (مەسەلێن میتافیزیقی) -وەکی ئەو دبێژن- چو کارێ بەرچاڤ ل سەر رێڤەچوونا دیرۆکێ نینە!

بەلێ واقعێ دیرۆکێ -کو باشترین شاهدە- تشتەکێ دی دبێژت، هەر هەڤڕکییەکا د ناڤبەرا دو هێزێن جاهلی دا پەیدا دبت، ژ هەڤڕکییێن (شەخصی) دئێتە هژمارتن، ئارمانج ژێ ئەوە هێزەک ل سەر حسێبا هێزا دی (طوغیانێ) بکەت، و جهێ وێ د زۆردەستییێ دا بگرت، لەو دێ بینی کیژ وان هەردو هێزان ب سەرکەڤت یان بشکێت، چو گوهۆڕینێن مەزن ل سەر (مرۆڤینییێ) پەیدا نابن، بەلێ دەمێ هەڤڕکی دبتە هەڤڕکییا باوەرییێ و کوفرێ، ئیسلامێ و جاهلییەتێ گوهۆڕینەکا مەزن ب ئەنجامێ وێ هەڤڕکییێ ڤە دئێتە گرێدان، گوهۆڕینا حالێ مرۆڤی: هزر و بیر، دیتن و هەست، رەفتار و ئەخلاقێ وی.. و دەمێ ئەم سیرەتێ دخوینین، هەر وەسا سیرەتا پێغەمبەرێن بۆرین ژی، ئەڤ مەسەلە بۆ مە زێدە بەرچاڤ دبت، هەر پێغەمبەرەکێ هاتبت گازییا وی یا بەراهییێ و دویماهییێ گوهۆڕینا تارییا جاهلییەتێ بوو ب رۆناهییا ئیسلامێ، راکرنا شرکێ و دانانا تەوحیدێ، خودێ دبێژت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّـٰغُوتَ ﴾ (النحل: ٣٦) مەعنا: چو پێغەمبەر نەهاتبوون دا ببنە رێبەرێن نەتەوەیی، یان سەرۆکێن سەرهلدانێن جڤاکی، و شۆرەشێن تەخەیی (طەبەقی).. و ئەو هەمی ژی ل وێ باوەرێ بوون کو (تەوحیدە) مرۆڤی ژ هەر عەبدینییەکا ژ قستا رزگار دکەت، و رحا وی ژ هەر قەیدەکا ژ درەو ئازاد دکەت، و رێکێ ددەتە هەمی هێزێن وی کو ب دورستی کار بکەن. و ل سەر ڤی بناخەیی ئیسلام -کو گازییا هەمی پێغەمبەران بوو- مەزنترین بزاڤا رزگاریخواز بوو بۆ مرۆڤی، چونکی (تەرکیزا) وێ ل سەر هەمی لایێن ژینێ بوو، نە کو لایەکێ ب تنێ ژ نەفسا مرۆڤی، یان واقعێ ژینا وی.

**٤- سیرەت بۆ مە ئاشکەرا دکەت کو (موحەممەد) -سلاڤ لێ بن- مەزنەکێ عەشائری و سەرۆکەکێ نەتەوەیی نەبوو:**

و ئەڤ چەندە بۆ موسلمانێ ئەڤرۆ گەلەک یا فەرە، مە گۆت: ئەڤرۆ؛ چونکی ل زەمانێ مە یێ نوکە، ویشتی (مەدرەسەیێن قەومی) بۆ دوبارە نڤیسینا دیرۆکێ پەیدا بووین، گەلەک مسەلە و ڕویدانێن دیرۆکێ هاتنە دەرنشیفکرن، و خەلەت هاتنە خواندن، و ژ پێکەنینێن ڤێ مەدرەسەیێ ئەوە قەهرەمانەکێ وەکی صەلاحەددینێ ئەییووبی، ئەوێ دنیا هەمی دزانت کو کوردە، هاتە هژمارتن ئێک ژ (بەطەلێن قەومییا عەرەبی) یێن خزمەتا (عرووبەتێ) کری!! و بەری هنگی پێغەمبەرێ خودێ ب خۆ ژی هاتە حسێبکرن (زەعیمەکێ عەرەبی) یێ ئارمانجا خۆ کرییە ئەو (ئوممەتا عەرەبی) بکەتە ئێک، و مافێ وان ژ ئمبراتوورییەتێن زۆردەستێن وی دەمی بستینت، و وەلاتەکێ عەرەبی یێ ئێککگرتی و خودان ئێک ئالا پەیدا بکەت!!

ل سەر بناخەیێ ڤێ خواندنا بەروڤاژی، گازییا ئیسلامێ ل سەر بناخەیەکێ (قەومی و عورووبەوی) هاتە خواندن و شرۆڤەکرن، و تشتێ غەریب ئەو بوو گەلەک ژ خودانێن ڤێ بۆچوونێ د خواندنا دیرۆکێ دا نە ئەو بوون یێن باوەرییەکا باوەری ب ئیسلامێ هەی ژی، بەلکی هەر وەکی وان دڤیا ب ڤێ چەندێ دلێن موسلمانێن نە عەرەب ژ ئیسلامێ سار بکەن، و وان سست کەن، ئەگەر نە.. چو تەفسیرێن مەنطقی یێن دی بۆ ڤی کارێ وان نینن، ئەگەر ئیسلام نە ئەو بت یا ئەو پێگیرییێ پێ بکەن، پا دێ بۆچی شانازییێ پێ بەن، و کەنە (صناعەتەکێ عەرەبی)؟!

ڕاستە ئیسلام ئێکەمین جار د (بیئەتەکا عەرەبی) دا پەیدا بوو، و خودێ دبێژت: ﴿ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴾ (الأنعام: ١٢٤) خودێ چێتر دزانت کانێ دێ ریسالەتا خۆ ل کیڤە دانت، بەلێ ئیسلام نە (بەرهەم

و ڤەڕێژا) بیئەتا عەرەبی بوو، وەکی (عورووبەویان!) دڤێت مە تێ بگەهینن، و موحەممەد -سلاڤ لێ بن- زەعیمەکێ (عەرەبی) نەبوو، ئەو گازییا موحەممەد پێ هاتی هەر ئەو بوو یا پێغەمبەرێن خودێ هەمی ژ نووحی و حەتا عیسای -سلاڤ لێ بن- پێ هاتین، گازییا ئیسلامێ، ئەوا دبتە بوونەکا نوی بۆ مرۆڤی..

ڕاستە زمانێ ئیسلامێ عەرەبی بوو، و سالۆخەتێن شەخصییەتا عەرەبی د جیلێ ئێکێ یێ ڤێ ئوممەتێ دا -و پێغەمبەر ژی ئێک ژ وان بوو- د بەرچاڤ بوون، ب حوکمێ هندێ کو ئەو عەرەب بوون، بەلێ نە سالۆخەتێن ڤێ شەخصییەتێ ئەو (تەوجیهـ) دکرن و (سەیطەرە) ل سەر وان دکر، چونکی ئەو کەسێن بیست سالان نەیارەتییا ئیسلامێ و پێغەمبەری کری، و ب شیری لێ ڕاوەستیان هەر عەرەب بوون، و هەر قورەیشی بوون، و سالۆخەتێن شەخصییەتا عەرەبی ل نک وان ژی هەبوون، نە بەس هندە.. بەلکی هندەک جاران ڤان قورەیشیان دەستێن خۆ دکرنە د دەستێن هندەک کەسێن دی یێن نە قورەیشی دا، بەلکی یێن نە عەرەب ژی دا، دا دویماهیێ بۆ گازیا ئیسلامێ بدانن، و ل لایێ بەرانبەر ژی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابیێن وی، هەر ژ ڕۆژێن ئێکێ هەبوون د ناڤ دا یێن نە قورەیشی نە عەرەب ژی، تشتێ هندێ دگەهینت کو گازییا ئیسلامێ ئەوا ژ نک خودێ هاتی، ژ هندێ مەزنترە کو گازییەکا قەومی یان یا عەشائری یا بەرتەنگ بت، وەکی وان گازییان یێن (زەعیمێن دنیایێ) پێ ڕادبن وخەباتێ بۆ دکەن..

و وەک دەلیلەکێ بچویک ل سەر ڤێ چەندێ گوهدارییا ڤێ (ئحصائێ) بکەن: بەری (حەمزە و عومەر) بێنە د ئیسلامێ دا، کو ب هاتنا وان د ئیسلامێ دا قویناغەکا نوی ژ ژییێ ڤێ گازییێ دەست پێ دکەت، ناڤێن

(٦٧) كەسان ئەم دزانـين كو ئـەون يـێن ل سـەری هاتينـە د ئيسـلامێ دا، (٤٢) ژ وان قـورەيـشـی بـوون، (٣٢) زەلام و (١٠) ژن، و (١٢) كـەس ژ عەشيرەتێن دی يێن عەرەبانە، و (١٣) عەبد و جاريە بوون، و (٢) ژ وان هەر عەرەب نەبوون، ئێک بيلالێ حەبەشی بـوو، و يـێ دی صوهەيبێ رۆمـی بوو.

ژ ڤێ هژمارتنا كورت دئێتە زانين كو ئيسلام هەر ژ دەسپێكا ژيێ خۆ گازييەكا عەشائری و يا قەومی يـا بەرتەنگ نەبوو، و تەوحيـدا دورسـت ئەوا د ئيسـلامێ ب تنـێ دا هـەی، جەوهـەرەكێ كـارگێر و (فەععالـە) د هـەر نەفسەكا هەبت دا يا باوەرييێ پێ دئينت، عەرەب بت يـان عـەرەب نـەبت، و ب ڤێ ديتنا بەرفرەهـ يا ئيسـلامێ هەی، ئيسـلام شـيـيا شارسـتانييەكا وەسـا ئاڤا كەت (خالدێ كورێ وەليدی يێ عـەرەب) و (طـارقێ كـورێ زيـادی يـێ بەربـەر) و (صـەلاحەددينێ كـورد) و (سـەيفەددين قـوطز يـێ مـەملووک) و (محەمـەد ئـەلفاتحێ تـورک) ببنـە ئـەو لبنـەيێن مـوكم يـێ ديـوارێ ڤـێ شارستانييێ دورست كرين.

## ژینەنیگارا پێغەمبەری
## ژ چ ژێدەران وەربگرین؟

پشتی بۆ مە ئاشکەرا بووی کانێ بۆچی و چاوا ئەم ژیاننامەیا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بخوینین، تشتێ دی یێ گرنگ ئەڤەیە ئەم دیار بکەین کانێ ئەم ژیاننامەیا وی -سلاڤ لێ بن- ژ چ ژێدەران وەربگرین، دا نیاسینا مە بۆ پێغەمبەری یا پێکهاتی و دورستتر بت؟

ل سەری دێ بێژین: ژ وەفادارییا جیلێ ئێکێ یێ ڤێ ئوممەتێ، کو جیلێ صەحابییان بوو، د گەل پێغەمبەرێ خۆ، هەر تشتەکێ پەیوەندی ب پێغەمبەری ڤە هەبت وان پاراستییە و بێ کێم و زێدەهی بۆ مە ڤەگوهاستییە، چ گۆتنێن وی بن، چ کریارێن وی بن، یان حەتا ئەو تشت بن یێن گرێدان ب کەسینییا وی ڤە هەین.. و ئەو لایێن پەیوەندی ب ژینا پێغەمبەری ڤە هەین، ل سەری -ل سەر دەمێ صەحابی و تابعییان- ب ناڤێ (المغازی) دهاتنە نیاسین، تابعییێ ناڤدار (زین العابدین) کورێ حوسێنێ کورێ ئیمام عەلی، ئەوێ ل سالا (٩٤) کۆچی مری، دبێژت: مە وەسا خۆ فێری (مەغازیێن پێغەمبەری) -سلاڤ لێ بن- دکر، کانێ چاوا مە خۆ فێری سوورەتێن قورئانێ دکر.. مەعنا: کانێ چاوا صەحابییان جیلێ پشتی خۆ ژ تابعیان فێری قورئانێ دکر، وەسا وان ئەو فێری ژینەنیگارا پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- دکر.

و د ناڤ جیلێ تابعییان دا هندەک ناڤ د ڤی مەجالی دا گەش و بەرچاڤ بوون، وەکی -بۆ نموونە-: عوروەیێ کورێ زوبەیری (ل سالا ٩٢ مربوو)، ئەوێ بابێ وی دبوو کورمەتێ پێغەمبەری، و ئەببانێ کورێ ئیمامێ

عوثمان (ل سالا ١٠٥ مربوو)، و موحەممەدێ کورێ شهابێ زوهری (ل سالا ١٢٤ مربوو).

و پشتی ڤان جیلەکێ دی هات وان ژی کارێ خۆ یێ سەرەکی کربوو کۆمکرنا ریوایەتێن سیرەتێ، و ناڤێ ژ هەمییان بەرچاڤتر ل ڤێرێ موحەممەدێ کورێ ئیسحاقییە، ئەوێ ل سالا ١٥٢ مری، و ب ڕاستی ئەو دئێتە هژمارتن شێخێ نڤیسەرێن سیرەتێ.. ئبن ئیسحاقی کتێبەکا مەزن ل بن ناڤێ (المغازي) دانا، بەلێ مخابن ئەڤ کتێبا وی ب تمامی نەگەهشتییە مە، هەر چەندە بارا پتر ژێ ب ڕێکا عەبدلمەلکێ کورێ هیشامی (ئەوێ ل سالا ٢١٨ مری) یا گەهشتییە مە، و دئێتە زانین کو ئبن هیشام شاگردەیێ ئیمامێ بەککائی بوو، و بەککائی شاگردەیێ ئبن ئیسحاقی بوو، ئبن هیشامی کتێبا سەیدایێ سەیدایێ خۆ (المغازي) وەرگرت، و هندەک گوهۆڕین و دەستکاری تێدا کرن، و هندەک ریوایەتێن وی ژ هندەک سەیداییێن خۆ یێن دی گوهـ لێ بووین، لێ زێدەکرن، و کتێبەکا نوی ژێ چێکر و ناڤێ وێ کرە (السیرة النبویة)، و ئەڤ کتێبە نوکە ب ناڤێ (سیرة ابن هشام) دئێتە نیاسین، و ئەو ب تمامی یا گەهشتییە مە، و گەلەک جاران یا هاتییە چاپکرن ژی.

پشتی ڤێ قویناغێ و ل سەدسالا سێیێ مشەختی، دەستەکەکا دی یا زانایان دەرکەفت، خەم ژ کۆمکرنا ریوایەتێن سیرەتێ خوار، و کتێب د ڤێ دەلیڤەیێ دا دانان، ژ وان: ئیمامێ واقدی، خودانێ کتێبا (المغازي)، و موحەممەدێ کورێ سەعدی، خودانێ کتێبا (الطبقات)، و گەلەکێن دی.

و پشتی ڤێ چەندێ ژ سەدسالا سێیێ و هێرڤە بزاڤا دانانا کتێبان د سیرەتێ دا بەرفرەهـ بوو، و هندەک زانا پەیدابوون کتێب د لایەکێ سیرەتێ یێ تایبەت دا دانان، وەکی: نیشانێن پێغەمبەرینییێ (دلائل النبوة)، و

سالۆخەتێن پێغەمبەری (الشمائل)، و سەرهاتییا بوونا پێغەمبەری (المولد)، و چەند لایەکێن دی.

و ژ بلی ڤێ چەندێ دیرۆک نڤیسێن موسلمان ژی، وەکی ئیمامێ طەبەری، و پشتی وی (ابن الأثیر)، و (ابن کثیر)، و (الذهبي)، و هەر دیرۆکنڤیسەکێ دی یێ هاتی دەمێ دیرۆک دنڤیسی، د ناڤ نڤیسینا خۆ دا بیاڤەکێ مەزنددا بابەتێ سیرەتێ، حەتا دەرەجەکێ کتێبێن وان یێن دیرۆکی نوکە یێن بووینە ژێدەرەکێ سەرەکی بۆ هەر کەسەکێ بڤێت سیرەتێ بزانت.

و بەری ئەم بەحسێ ژێدەرێن وەرگرتنا سیرەتێ بکەین، مە دڤێت ئیشارەتێ بدەینە مەسەلەکا گرنگ، ئەو ژی ئەڤەیە: د گەلەک بابەتێن سیرەتێ دا ریوایەتێن ژێک جودا، و هندەک جاران یێن هەڤدژ ژی هەنە، هنگی مرۆڤ چ بکەت؟

ل سەری دڤێت ئەم بزانین نە هەر ریوایەتەکا هاتییە ڤەگوهاستن یا دورستە، لەو ل دەمێ وەرگرتنا ریوایەتان دڤێت ئەم چەند خالەکان ل بەر چاڤ وەربگرین:

١- حەتا ریوایەت بێتە قەبویلکرن، دڤێت ئەم ل گۆتنێن زانایێن حەدیسێ یێن (جرح و تعدیل)ێ بزڤرین، و هەر (سەنەدەکا) وان قەبویل نەکریت، دڤێت ئەم بێخینە ژێر گومانێ، و ب پشتڕاستی وەرنەگرین، حەتا (سەنەدەکا) دی وێ ب هێز بێخت.

٢- هەر ریوایەتەکا هەڤدژ بت د گەل (ظاهرێ قورئانێ) یان (ئوصوول و بناخەیێن سەرەکی) یێن ئیسلامێ، نابت ل سەر ظاهرێ وێ بێتە وەرگرتن، چونکی دبت یا دورست نەبت، یان تەفسیرا وێ یا وەسا نەبت وەکی ئەم تێ دگەهین.

٣- ئەگەر دو ریوایەت هەڤدژی ئێک بن، دڤێت ئەم (قاعیدەیێن تەرجیحێ) وەکی زانایێن ئوصوولێ دبێژن ب کاربینین.

٤- خواندنا زانایان بۆ ناڤەرۆکا ریوایەتان، یان ب تەعبیرەکا دی شرۆڤەکرنا مە بۆ سەرهاتییێن سیرەتێ، تشتەکێ جودانە ژ ریوایەتێ ب خۆ، و شەرت نینە هەر شرۆڤەکرنا هەبت یا دورست بت، ب تایبەتی ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینین کو گەلەک جاران شرۆڤەکرن دکەڤتە ژێر زەوق و بۆچوونێن شرۆڤەکەری.

پشتی ڤێ مە دڤێت بێژین: دەمێ مە بڤێت سیرەتێ بزانین پێتڤیە ئەم ل چەند ژێدەرێن سەرەکی بزڤرین، ژ وان ژێدەران کو ل ڤێرێ ئەم دێ ب کورتی بەحسێ ژێ کەین:

**١- قورئانا پیرۆز:**

قورئانە موعجیزەیا بەردەواما ڤی دینی، و کیتابا وی یا نەمر، یا کو چو کێماسی نەگەهشتینێ، و ب رەنگەکێ پاراستی و تمام گەهشتییە مە، و ئێک ژ وان گەلەک بابەتێن قورئانێ ڤەگرتین بابەتێ ڤەگێرانا هندەک رویدانێن سیرەتێنە، و دڤێت ژ بیر نەکەین کو ئەگەرێن هاتنە خوارا گەلەک ئایەتێن قورئانێ پەیوەندییەکا موکم ب سەرهاتی و رویدانێن سیرەتێ ڤە هەبوویە، مەعنا: تێگەهشتنا دورست بۆ مەعنایا ئایەتێن قورئانێ، و زانینا بەرفرەه بۆ رویدانێن سیرەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دو مەسەلەنە ژێک نائێنە جوداکرن.

و چونکی قورئان نە کتێبەکا دیرۆکییە، ئەو دەمێ سەرهاتییەکا دیرۆکی ڤەدگوهێزت، وەکی کتێبێن دیرۆکێ هند گرنگییێ نادەتە دەمی و جهی هندی گرنگییێ ددەتە وێنەکرنا ئنفعالاتێن کەسێن سەرهاتییێ، و ئەو تشتێ د هزرا وان دا دگەرییا، و ئەو دەرس و عیبرەتێن ژ سەرهاتییێ دئێنە وەرگرتن، لەو

دەمێ مرۆڤ سەرهاتییێ د قورئانێ دا دخوینت هەست ب تام و ئنفعالەکا تایبەت دکەت، و خۆ ڕوی ب ڕوی بەرانبەر ڕویدانان دبینت، لەو هەر کەسەکێ بڤێت ڤەکۆلینێ ل دۆر ژینەنیگارا پیغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت، یان ڕویدانێن وێ بزانت، پێتڤییە ل قورئانا پیرۆز بزڤڕت، و هزرا خۆ باش د وان ئایەتان دا بکەت یێن پەیوەندی ب سیرەتێ ڤە هەین.

**٢- کتێبێن سوننەتێ:**

و ئەوێ کتێبێن سوننەتێ خواندبن، دزانت کو هەر ئێک ژ وان ناڤبرەکا تایبەت تێدا هەیە ل بن ناڤێ: (المغازي و السیر)، بۆ بەحسکرنا ژ هندەک لایێن ژینەنیگارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و بۆ زانینا ڕویدانێن سیرەتێ پێتڤییە مرۆڤ نە ب تنێ ل ڤان ناڤبڕان بزڤڕت، بەلکی د ناڤبڕێن دی ژی دا ژ کتێبێن سوننەتێ ئیشارەت بۆ گەلەک سەرهاتییێن سیرەتێ دئێنەدان، و کانێ چاوا ئەگەرێن هاتنە خوارا ئایەتێن قورئانێ پەیوەندی ب دیارکرنا گەلەک ڕویدانێن سیرەتێ ڤە هەیە، وەسا ئەگەرێن گۆتنا حەدیسان ژی گەلەک جاران پەیوەندی ب دیارکرنا هندەک لایێن سیرەتێ ڤە هەیە..

ژ بەر ڤێ چەندێ زڤڕین ل کتێبێن سوننەتێ مفایەکێ باش دگەهینتە وی کەسی یێ بڤێت خۆ د سیرەتێ دا شارەزا بکەت.

**٣- کتێبێن دیرۆکێ و سیرەتێ:**

بەری نوکە مە دیارکر کو هزرا کۆمکرنا زانینان ل دۆر سیرەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و نیشادانا وان هەر زوی ل نک صەحابی و تابعییان پەیدا بووبوو، و پشتی هنگی ب دەمەکێ کێم هزرا دانانا کتێبێن تایبەت ژی ل دۆر سەرهاتییێن سیرەتێ ل نک هندەک ژ وان پەیدابوو، و زەمانەکی درێژ پێڤە نەچوو حەتا هژمارەکا مەزن یا کتێبان ل دۆر سیرەتێ هاتنە دانان، و د گەل ڤان کتێبان یێن سیرەت هەمی یان هندەک لایێن

سیرەتێ ب خۆ ڤە گرتین، هژمارەکا نە یا کێم یا کتێبان ل دۆر ڕویدانێن دیرۆکی ب گشتی ژی ژ لایێن زانا و دیرۆکڤانێن موسلمان هاتنە دانان، و پشکەکا نە یا کێم ژ ڤان کتێبان ژی بۆ قەیدکرنا ڕویدانێن سیرەتێ هاتینە تەرخانکرن، و ئەڤ کتێبە ژی بۆ وی یێ بڤێت سیرەتێ بزانت دبنە باشترین ژێدەر..

بەلێ ل ڤێرێ دڤێت نەئێتە ژبیرکرن کو نە هەر ریوایەتەکا د ڤان کتێبان دا هاتییە ڤەگوهاستن یا دورستە، لەو دڤێت مرۆڤ یێ هشیار بت، و ل ریوایەتێن دورست بگەڕییت، و یا باشتر بۆ خواندەڤانی -ب تایبەتی ئەوێ گەلەک شارەزا نەبت د دیرۆکێ دا- ئەوە، ئەو ل وان کتێبان بزڤرت یێ ژ لایێ وان دیرۆکڤانان هاتینە نڤیسین یێن شارەزایی د علمێ حەدیسێ ژی دا هەی، وەکی: ئبن کەثیر و ذەهەبی بۆ نموونە.. چونکی ئەڤ ڕەنگە زانایە گەلەک جاران ب کارێ ڕەخنەگرییێ ژی ڕادبن، و حالێ سەندا وان ریوایەتان ژی ئاشکەرا دکەن یێن ئەو د کتێبێن خۆ دا ڤەدگوهێزن، نە وەکی وان زانایان یێن دویر ژ علمێ حەدیسێ و (جەرح و تەعدیلێ)، ئەوێن هەر ریوایەتەکا هەبت ڤەدگوهێزن، بێی دەرەجا وێ دیار بکەن.

و بۆ وی کەسێ ڤەکۆلینێ ل دۆر سیرەتێ دکەت، و زانینان بۆ خۆ ل دۆر کۆم دکەت؛ دا ب ڕێکا نڤیسینێ یان گۆتنێ پێشکێشی خەلکی بکەت، گۆتنەکا فەر هەیە دڤێت بێتە گۆتن: سیرەت ژیانا پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن-، و پێغەمبەر وەکی هەر مرۆڤەکێ دی نینە، وەکی هەر مرۆڤەکییە ژ لایێ خۆ یێ ئینسانی ڤە.. بەلێ، بەس پشتگیرییا وی ب وەحیا خودێ و موعجیزەیان ژی دهاتەکرن، و ئەو کەسێ بەحسێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکەت، چێ نابت وی وەکی (قائیدەکێ عەبقەری) نیشا خەلکی بدەت، و ژیانا وی ژ هەر ڕەنگەکێ موعجیزە و

(تەئییدا ئیلاهی) بشۆت، یان بەروڤاژی وێ چەندێ وی وەسا نیشا خەلکی بدەت کو ئەو د سەر مرۆڤینییێ را بوو، یان -حاشا- رەنگەکێ خوداینییێ ل نک هەبوو، یان هەر تشتەکێ د ژیانا وی دا هەی ب موعجیزە و کارێن (خارق) ب رێڤە دچوو..

دەمێ مرۆڤ سیرەتێ بۆ خەلکی ڤەدگێرت، دڤێت بزانت کانێ ئەو بۆ کێ دئاخڤت؛ دا بزانت کانێ ئەو دێ چ بێژت، بوخاری ژ ئیمام عەلی ڤەدگوهێزت، دبێژت: ((**وی تشتی بۆ خەلکی بێژن یێ ئەو تێ دگەهن، ما هەوە دڤێت خودێ و پێغەمبەرێ وی درەوین دەربێخن؟**))، مەعنا: دەمێ مرۆڤ بابەتێن سیرەتێ بۆ خەلکی ڤەدگوهێزت، دڤێت تبیعەتێ وی خەلکی بزانت یێ ئەو بابەتی بۆ پێشکێش دکەت، دا ئاخفتنا وی بۆ وان نەبتە فتنە، و راستە دەمێ مرۆڤ بەحسێ سیرەتێ دکەت دڤێت (عاطفێ) ب کار بینت؛ چونکی ئەو یێ بەحسێ وی پێغەمبەری دکەت یێ ڤیانا وی واجب ل سەر موسلمانی، بەلێ ئەڤ (عاطفە) دڤێت (مەوضووعیەتێ) ژ بیرا وی نەبت، و بزانت کو ڤیان هندی د توخوبێن خۆ یێن دورست دا بت، ئەو بۆ خودانێ خۆ نابتە سالۆخەتەکێ (سلبی).

وەکی هەر بابەتەکێ دی، دەمێ مرۆڤ سیرەتێ ژی ڤەدگێرت، پێتڤییە هەر ژ سەری ئارمانجا خۆ بزانت، چونکی ئارمانجە شێوە و رێبازا مرۆڤی دەسنیشان دکەت، و وەکی ئەم دزانین بابەتێن سیرەتێ گەلەکن و دژێک جودانە، و حەتا مرۆڤ ئارمانجا خۆ بزانت و ب جه بینت، پێتڤییە هەر ژ دەسپێکێ وێنە د سەرێ وی دا یێ ئاشکەرا بت، دا بشێت ب رەنگەکێ ئاشکەرا بۆ وەرگری ڤەگێرت.

و بەری ئەم دەست ب ڤەگێرینا سیرەتێ بکەین، تشتێ دویماهییێ یێ مە دڤێت ئیشارەتێ بۆ بدەین، ئەوە ل ڤی زەمانێ مە گەلەک کتێب و

ڤـەکۆلـیـن ژ لایێ ڕۆژهەلاتناسان ژی ڤە ل دۆر سیرەتێ هاتینـە بەرهـەڤکرن، و هــەر چـەنـدە ئــەو وەســا خۆ نیـشا مـە ددەن کو ئـەو د نڤیسـینێن خۆ دا د (مەوضووعی) و بێ لانـە ژی، بـەلێ گومـان تێدا نینـە کـو (بەگراوەنـدێ) وان یێ ڕەوشەنبیری و هزری کارەکێ مەزن ل سەر وان هەیە، و گەلـەک جاران ئـەو ئارمـانجێن خـۆ یـێن خـراب د کراسـەکێ (علمـی) یـێ (خـاپینۆک) دا پێشـکێش دکـەن، و ل نـک وان چـو مـانع نینـە کـو سـەد ڕاسـتیێن وان پـێ خۆش نەبت بێژن ب تنێ دا درەوەکێ د نـاڤ ڕا بـەلاڤ کـەن، هنگـی مـرۆڤێن وان نەنیاسن، ژ بەر وان سەد ڕاستییان، دێ هزر دکەن ئـەو هندەک مـرۆڤێن خودان وژدان و(مونصفن)، لەو دێ وێ درەوا وان باوەر کەن و بەلاڤ کەن!

تشتێ ژ هەمییێ گرنگتر کـو مرۆڤـێ لـێ هشـیار بـت د نڤیسـینێن وان دا، ئەو شرۆڤەکرنن یێن ئـەو ددەنـە ڕویـدانین سیـرەتێ، ئـەو شـرۆڤەکرنێن ئـەو هـزر و بیـرێن خـۆ پـێ دەربـاس دکـەن، و پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- و صـەحابییێن وی ب ڕەنگـەکێ کرێت نیشـا خـەلکی ددەن.. لـەو ئـەم دبێـژین: خواندەڤانێ موسلمان دەمێ نڤیسینێن وان دخوینت، دڤێت گەلەک یێ هشیار بت، و پێ نەئێته خاپاندن.

# بەری هەلاتنا ڕۆناهییێ

## جیهانەکا حێبەتێ:

ل سەدسالا شەشێ پشتی بوونا عیسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جیهان تێکدا د دەلیڤەیەکا حێبەتییێ دا دژیا، و هەر کەسێ ب دیرۆکا ژینا مرۆڤینییێ ئاگەهدار بت دێ زانت ئەو نە ئێکەمین جار بوو مرۆڤینی تووشی ڤێ حێبەتییێ دبت.. نەخێر! هەر جارەکا ڕۆناهییا چرایێ پێغەمبەرینییێ کز ببا، جیهان بەر ب تاریستانەکا ب سەهم ڤە دچوو، هەر جارەکا دەنگێ گازییا خوداناسییێ کێم ببا یان کەڕ ببا، جیهان بەر ب بێ دینییەکا زیانکار ڤە دچوو.

ب ڕاستی بەرپەڕێن دیرۆکا ڤێ مرۆڤینییێ گەلەک دیمەنێن عنتیکە ل سەر هاتینە نەخشاندن، ئەڤە ژ وی ڕۆژێ وەرە یا بابێ مە ئادەمی بەرپەڕێ ئێکێ ل سەر ڕوویێ عەردی ڤەکری و حەتا وی سەردەمێ ئەم بەحس ژێ دکەین -بەلکی خۆ حەتا ئەڤرۆ ژی!- ئەگەر ئەم ب تەرازییا باوەرییا ب خودێ بکێشین، دێ بینین مرۆڤینییێ بارا پتر ژییێ خۆ د حێبەتییێ دا بۆراندییە، وەکی کەسەکێ مەست و تەلەس بوویە یێ پترییا دەمێ خۆ د بێ هۆشییێ دا دبەتە سەری! یان ژی وەکی وی نەساخی بوویە یێ ژ بەر دژوارییا تایێن گران ژ بەر دئاخڤت!

ئەگەر ئەم سڤک بەرێ خۆ بدەینە دەست و دارێن جیهانێ ل وی دەمێ پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- تێدا هاتییە هنارتن، دێ بینین جیهان

تێکدا چاڤەرێیی سەرکێشەکی بوو خەلکی ژ حێبەتییێ رزگار بکەت و بەرێ وان بدەتە کنارێ خودێ، بەر ل هندێ بوو پێغەمبەرێ دویماهییێ بێت دا بەرێ رووێ وان ژ تارییا بێ فامییێ بدەتە رۆناهییا باوەرییێ.

ب راستی د ڤێ دەلیڤەیا کورت دا ئەم نەشێین دەست و دارێن جیهانا وی سەردەمی ب بەرفرەهی ل بەر چاڤێن هەوە بدانین، بەحسێ چ بکەین و چ نەکەین؟

دەولەتا رۆمێ.. ئەوا دینێ خودێ سەر و بن کری و گەلەک ژ چیڤانوکێن صەنەمپەرێسێن ئغریقییان خرابتر لێ کری؟

یان ژی دەولەتا فورسێ.. ئەوا (ئاگر) ل شوینا خودێ دانای و دویکەفتنا دلچوون و گرێدارییان کری؟

یان ژی مللەتێن دی ئەوێن راستەرێیا خودێ وندا کری و سەرچەمیای ماین بەرامبەر خوداوەندێن چێکری؟

د ئایەتەکا کورت دا ژ قورئانا پیرۆز، خودایێ مەزن حالێ مرۆڤینییێ بەری و پشتی هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مە دیار دکەت، و دبێژت: ﴿ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ۝ ﴾ (آل عمران: ١٠٣).

وێنەیەکێ گەلەکێ د جهێ خۆ دایە: هزرا جڤاکەکا ژێکڤەبووی و بژالە بکە، یا تژی نەڤیان و کەرب و کین، هەر هندەک دوژمناتییێ د گەل هندەکێن دی بکەن و لێ بگەرێێن چو نەخۆشییا هەبت بیننە رێکێ.. ل وی دەمێ دویراتی د ناڤبەرا وان دا دگەهتە دویماهییێ، خێرخوازەک بێت و وان هەمییان بگەهینتە ئێک و دەستێ خۆ ب سەری دا بینت و هەمییان بکەتە ئێک دەست و ئێک دل وەکی برایێن دەیبابی، ما نە قەنجییەکا مەزنە؟

یان ژی هزرا مرۆڤەکێ نەزان و کێم تێگەهشتن بکە، بگەهتە سەر لێڤا کۆرکەکا تژی ئاگر، مەژییەکی وەسا نەبت بەرێ وی ژ ڤێ تێچوونێ وەرگێرت، ئینا کارێ خۆ بکەت، دەهمەنێن خۆ هلدەت و چاڤێن خۆ بنقینت و سنگ و سنگ بچت دا خۆ پاڤێتە ناڤ ئاگری، ئەو ئاگرێ سەداسەد دێ وی سۆژت و کەتە کۆلیەکێ رەژییێ.. ل وان دەلیڤەیان مرۆڤەکێ جامێر بێت، دەستێ وی بگرت و تەنا ببەتە جهەکێ خۆش و بێژتێ: ل ڤێرێ روینە. ما نە قەنجییەکا مەزنە؟

ئەڤە مەتەلا مرۆڤینییێ بوو ل سەردەمێ هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نێزیک بوو خۆ د کەندالێ نەمانێ دا بەردەتە د چالا تێچوونێ دا، بەلێ خودێ وەسا بۆ حەز نەکربوو، لەو ژ بانێن بلند هاتە کەرەمێ و دەستویری ب بوون و هنارتنا رزگارکەرێ جیهانێ دا و مزگینی هاتە بلندکرن ل عەسمانان و عەردی کو هندە پێغەمبەرێ خۆشتڤی دێ جیهانێ ب هاتنا خۆ گەش و روهن کەت.

## مرۆڤەکێ هلبژارتی:

ل وی دەمێ پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- هاتییە دنیایێ، جیهان هەمی -وەکی مە گۆتی- ل هیڤییا کەسەکی بوو بێت و بەرێ خەلکی بدەتە رێکا سەرفەرازییێ، ل گەلەک جهان -نەخاسم ل وان جهێن جوهی و فەلە لێ دژیان- بەلاڤبووبوو کو نێزیکە پێغەمبەرەک بێت و ئالایێ دینێ خودێ هلگرت و خەلکی ل دۆرا کۆم کەت.

نێزیک بوو سەدسالا شەشێ ژی پشتی بوونا عیسای -سلاڤ لێ بن- ب دویماهی بێت و هێشتا ئەو پێغەمبەر نەهاتی یێ تەورات و ئنجیلێ گۆتی دێ ئێت، سەرداچوون و خرابی و دویرکەفتنا ژ خودێ ل هەمی جهان بەلاڤبووبوو، نەفامی (جاهلییەت) ل سەر هەمی لایێن ژینێ زال بووبوو، خۆ

باوەرییا ب خودێ ژی ل نک پترین خودێناسان پاراستی نەمابوو، لەو مرۆڤ هەمی د چاڤێن خودایێ مەزن دا شکەست بوون ب تنێ ئەو کت و ماتێن مرۆڤان نەبن ئەوێن ڕاستییا باوەرییێ هێشتا ل نک مای، وەکی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ﴿ وَإِنَّ الله نَظَرَ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ فَمَقَتَهُمْ عَرَبَهُمْ وَعَجَمَهُمْ إِلاَّ بَقَايَا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ ﴾[1].

جیهان هەمی بەری هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل بن بارێ دویرکەفتنا ژ خودێ دنالی، حەتا خودێ دەستویری دای سەر و بەر بێنە گوهارتن و پێغەمبەرێ دویماهییێ بێتە هلبژارتن و فرێکرن.. گەلەک کەس ل هیڤییێ بوون بێنە هلبژارتن بۆ وێ پێغەمبەرینییا بەحس ژێ دئێتەکرن، بەلێ قەدەرا خودێ ئەو هەمی ب پاش ڤە هێلان، چونکی کەس ژ وان ئەو نەبوو یێ بشێت ملێن خۆ بدەتە بەر ڤی بارێ گران، مرۆڤەکێ دی هلبژارت، یێ ڕۆژەکا ب تنێ ژی ل سەر هزرا وی نەبوو کو ئەو بۆ ڤی کاری بێتە هلبژارتن، وەکی ئایەتەک دبێژت: ﴿ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ (القصص: ٨٦).

هلبژارتن بۆ کارێن مەزن نە ب دلچوون و هیڤییانە، بەلکی ب شیان و پێڤەهاتنانە، گەلەک مرۆڤێن هەنە هیڤییێن بەرفرەهـ بۆ خۆ درێسن بەلێ گاڤا دبتە دۆرا کرنێ خۆ پاشڤەدبەن، و گەلەک کەس هەنە د بێ دەنگن و ئەگەر بۆ دۆرا کریاران کەس نەشێت دەستێن وان بگرت. پێغەمبەرینی هلبژارتنەکە ژ لایێ خودێ ڤە، و ب تنێ خودێیە دزانت کانێ کییە ب دورستی ب کێر هلگرتنا پەیاما وی دئێت: ﴿ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴾ (الأعراف: ١٢٤).

---

(١) موسلم (٧٣٠٩) ژ عیاضێ موجاشعی ڤەدگوهێزت.

د نـاڤ کێلەشـۆکا هـەڤرکی و دوژمنکـارییێ دا ئـەوا ل ڕۆژهـەلات و ڕۆژئاڤایـا جیهـانێ بـەلاڤ.. و دویـر ژ مەیـدانا خۆلێکـدانا باژێرڤـانی و شارسـتانییێ، مللەتـەکێ بـێ سـەنگ ل بنـێ بەرپـەکا هشـک و زوهـا دژیـا، مللەتەکێ بژالـە و ژێـکڤەبووی بـوو، کانێ چەند یێ دویربوو ژ شارسـتانییێ، هندیتر یێ دویربوو ژ خودێ، هژمارەکـا مرۆڤـان کـو ب تبلێن دەسـتی دهاتنـە هژمارتن د ناڤ دا مابوون ل دویڤ دەست و دارێ دینێ ئیبراهیم پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- عەبـدینییا خودێ دکر، بـەلێ نێزیـک بـوو صەنەمپەرێسـییا بەلاڤ نەهێلیت کسێ ئاگەهـ ژ وان بمینت.

بەرانبەر هەمی کێم و کاسێن ژ ڤـی مللـەتی هاتینـە ڤەگوهاسـتن، بـەلێ دڤێت ژ بیرا خۆ نەبەیـن کو هژمارەکا نەیا کێم ژ سالۆخەتێن باش ژی د نـاڤ دا هـەبوون و نـەدویرە مانـا وان ل سـەر خوڕسـتییا سـادە و دویـر ژ گـرێکێن هەڤرکییا فەلسەفێن خرش و بێ مفا بەرچاڤترین باشییێن ڤـی مللـەتی بـن.. نەزانینێ جهـێ خۆ د نـاڤ دا کربـوو، بـەلێ نەزانینـەکا هنـدا ئاسـێ نـەبوو کـو نەئێتـە چارەسـەرکرن. دویـری خـودێ دژیـان، بـەلێ فەلسـەفێن بـێ دینییـێ مەژییێ وان خراب نەکربوو، وەکـی ئاخـەکا قەلـەو بـوون چاڤـەرێی وی دەسـتی بـوون یـێ چـاکییێ د ناڤ دا بچینت دا ل پاشـەڕۆژەکا نێزیـک ببتـە دارەکا ب خەمل و بێتە بەری.

ل جهـەکی ژ ڤـێ بەرپیـا پـان و بـەریـن، بـاژێرەک هـەبوو خـەلکێ وێ دەڤەرێ هەمییێ ب چاڤەکێ بلند و پیرۆز بەرێ خۆ ددایـێ، و وان ل درێژییـا سال و دەمان ئەو بۆ خۆ کربـوو ڕووگەهـ، ژ بـەر وی ئاڤـاهییێ دیـرۆکا دانانـا وی دزڤـرێتـە سـەر دەمێ ئیبراهیم و ئیسماعیلی -سلاڤ لـێ بـن- هـەر چەنـدە ل جهەکێ هشک و زوها و گـەرم ژی بـوو، بـەلێ ژ لایـێ خوارن و ڤـەخوارنێ ڤە یا بێ کێماسی بوو، و دویر نینە ئەڤـە ژ ئـەنجامێن وێ دوعایا بەرکـەفتی

بت ئەوا باپیرێ خەلکێ ڤی باژێری ئیبراهیمی ژ خودایێ خۆ کری، دەمێ گۆتی: ﴿ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾ (البقرة: ١٢٦).

ل ڤی باژێری ئویجاخەکا هێڤێن پاقژ دژیا، یا هێڤێن پاقژ چونکی باپیرێ وان یێ ئێکێ ئیسماعیل بوو، ئەڤ ئویجاخە ب خۆ ژی دبوو چەند بابکەک، بابکێ ژ هەمییان پێشکێشتر هاشمی بوون، چونکی ئەو ب خلمەتا مالا خودێ ئەوا دگۆتنێ: (کەعبە) ڕادبوون، هەر وەسا ب کارێ وان حەجییان ژی ڕادبوون ئەوێن هەر سال جارەکێ قەستا ڤی جهی دکرن، دیسا چونکی مەزنییا قورەیشییان د دەستێ وان دا بوو هندی عەبدلموطەلبێ کوڕێ هاشمی یێ ساخ. ژ مللەتێ عەرەبان، ژ ئویجاخا قورەیشییان، ژ بابکێ هاشمییان و ژ بنەمالا عەبدلموطەلبی پێغەمبەرێ دویماهییێ -سلاڤ لێ بن- هاتە هلبژارتن.

**بنەمالا عەبدلموطەلبی:**

عەبدلموطەلب باپیرێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- ناڤێ وی یێ دورست (شیبەیە) یەعنی: پیر یان پیراتی، دبێژن: ئەو ب ڤی ناڤی هاتبوو ب ناڤکرن؛ چونکی هەر ژ بچویکاتی هندەک موییێن سپی کەفتبوونە سەرێ وی، عەبدلموطەلب کوڕێ هاشمییە، و ئەو کوڕێ عەبدمەنافییە، و ئەو کوڕێ قوصەییە، و ئەو کوڕێ کیلابییە، و ئەو کوڕێ موررەیە، و ئەو کوڕێ کەعبییە، و ئەو کوڕێ لوئەیە، و ئەو کوڕێ غالبییە، وئەو کوڕێ فهرییە، و ئەو کوڕێ مالکییە، و ئەو کوڕێ نەضرییە[١]، و ئەو کینانەیە، و

---

(١) ناسناڤێ نەضری (قورەیش) بوو، و هەر کەسەکێ د نەسەبا خۆ دا دگەهتە وی دبێژنێ: قورەیشی، و هندەک دبێژن: قورەیش نەڤییێ وی فهر بوو، (بڕێنە: البداية والنهاية لابن كثير ٢ / ٢٠٠).

ئەو كورێ خوزەيمەيە، و ئەو كورێ مودركەيە، و ئەو كورێ ئلياسە، و ئەو كورێ موضەرييە، و ئەو كورێ نەزارييە، و ئەو كورێ مەعدييە، و ئەو كورێ عەدنانييە[1].

حەتا (عەدنانى)، كو بابێ وى يێ بيست و ئێكێيە، چو خيلاف د ناڤبەرا زانايێن نسەبێ د زنجيرا نسەبا وى دا چێ نەبوويە، و د سەر عەدنانى را ب دورستى نەهاتييە زانين، بەلێ تشتێ گومان تێدا نەهەى ئەوە كو عەدنان د نسەبا خۆ دا دگەهتە ئيسماعيلێ كورێ ئيبراهيم پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن-، بەلێ نەهاتييە زانين كانێ د ناڤبەرا عەدنانى و ئيسماعيلى دا چەند باب هەنە. و دەليل ل سەر هندێ كو عەدنان و دووندەها خۆ دگەهنە ئيسماعيلى گۆتنا پێغەمبەرييە -سلاڤ لێ بن- ئەوا تێدا هاتى: ﴿ إِنَّ الله اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى قُرَيْشًا مِنْ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ ﴾ يەعنى: خودێ كينانە ژ ناڤبەرا عەيالێ ئيسماعيلى هلبژارت، و قورەيش ژ ناڤبەرا كينانەى، و مالباتا هاشمى ژ ناڤبەرا قورەيشييان، و ئەز ژ مالباتا هاشمى هلبژارتم[2].

باپيرێ باپيرێ پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- عەبدمەنافى هژمارەكا كور و كچان هەبوون، ژ وان: هاشم و عەبدشەمس و موطەلب و نەوفەل، و هاشمى چار كور و پێنج كچ هەبوون، و ئێك ژ وان باپيرێ پێغەمبەرى عەبدلموطەلب بوو، و مە گۆت: ناڤێ وى يێ دورست شيبە بوو، پا بۆچى دگۆتنێ عەبدێ موطەلبى؟ و موطەلب كى بوو؟

موطەلب مامێ وى بوو، كورێ عەبدمەنافى بوو.

---

(١) بوخارى ب ڤى رەنگى ڤەدگوهێزت.

(٢) موسلم (٦٠٠٢) ژ واثلەيێ كورێ ئەسقەعى ڤەدگوهێزت.

دبێژن: جارەکێ هاشمێ کورێ عەبدمەنافی (بابێ عەبدلموطـەلبی)، د گەل کاروانێ قورەیشییان چووبوو شامێ، و گاڤا ئەو د ڕێکا خۆ دا گەهشتییە بازێڕێ مەدینێ -ئەوێ هنگی عەرەبان دگۆتێ: یەثرب- ئەو ل وێرێ بوو مێڤانێ مەزنێ مالباتا نەجارییان ژ ئویجاخا خەزرەجییان عەمرێ کورێ زەیدی، و عەمری کچەک هەبوو دگۆتنێ: (سەلما)، دەمێ هاشمی ئەو دیتی، دلێ وی کەفتێ و ژ بابێ وی خواست، بابێ وێ زوی ل بەر هات؛ چونکی هاشم ئێک ژ مەزنێن قورەیشییان بوو، دەمێ هاشم ژ شامێ ڤەگەڕیای، وی ژنکا خۆ سەلما ڤەگوهاست و د گەل خۆ برە مەکەهێ.

پشتی هەیامەکا دی دەمێ وی ڤیای د گەل کاروانێ قورەیشییان دەرکەفتە شامێ، وی ژنکا خۆ سەلما د گەل خۆ بر، و ب ڕێڤە وی ئەو هێلا ل مالبابا وێ، و ئەو بۆ بازرگانییێ چوو شامێ، سەلمایێ هنگی بچویکەک د زکی دا بوو، و ئەو چاڤەڕێی زەلامێ خۆ ما حەتا ژ کاروانی بزڤڕیت دا د گەل بزڤڕتە مەکەهێ، بەلێ دەمێ کاروانی زڤڕین هاشم د گەل دا نەبوو.. چونکی ئەو ل بازێڕێ (غەززە) ل شامێ مربوو، هنگی سەلمایێ بڕیار دا ل مالبابا خۆ بمینت و نەزڤڕتە مەکەهێ.

پشتی سەلمایێ بچویکێ خۆ دانای، دەرکەفت کوڕ، و ناڤێ وی کرە: (شیبە)، و شیبە حەفت سالان ل نک خالێن خۆ ما ل مەدینێ، ل سالا حەفتێ مامێ وی موطـەلبێ کوڕێ عەبدمەنافی هاتە مەدینێ و ئەو ژ دەیکا وی دزی و دگەل خۆ زڤڕاندە مەکەهێ، و دەمێ خەلکێ مەکەهێ موطـەلب دیتی هاتییە بازێڕی و بچویکەکێ حەفت سالی د گەل دا، پسیار ژێ کر: ئەوێ کییە ل گەل تە؟

موطـەلبی بەرسڤا وان دا و گۆت: ئەو عەبدێ منە..

ژ هنگی وەرە خەلکی گۆتێ: عەبدێ موططەلبی، حەتا وە لێ هاتی ئەڤ ناسناڤێ خەلکی بۆ وی دانای ژ ناڤێ وی مەشهوورتر لێ هات.

شیبە خوارزایێ خەزرەجییێن یەثربێ، ل مەکەهێ ل نک مامێن خۆ مەزن بوو، و ژ بەر کو ئەو مرۆڤەکێ تێگەهشتی بوو، وی جهێ بابێ خۆ هاشمی گرت، و دەمەک ب سەر دا هات ئەو بوو مەزنێ مەکەهێ..

عەبدلموطەلبی پتر ژ ژنەکێ ئینابوو، و وی دەهـ کوڕ و شەش کچ هەبوون، کوڕێ وی یێ ژ هەمییان مەزنتر حارث بوو، لەو دگۆتنێ بابێ حارثی.. و کوڕێن وی یێن دی ئەڤە بوون: ئەبوو طالب و ناڤێ وی یێ دورست عەبدمەناف بوو، و ئەبوولەهەب و ناڤێ وی یێ دورست عەبدلعوززا بوو، و زوبەیر، و حەجل، و موقەووم، و ضرار، و عەبدللاهـ، و عەبباس، و حەمزە، و کچێن وی ئەڤە بوون: صەفییە، و بەیضاء، و عاتیکە، و ئومەیمە، و ئەروا، و بەررە.

و کوڕێن وی ئەبوو طالب و عەبدللاهـ و زوبەیر، د گەل هەر پێنج کچان ژ بلی صەفییایێ، دەیکا وان فاطمایا کچا عەمری بوو، و ئەو ژنەکا قورەیشی بوو.

عەبدلموطەلب نەگەهشتبوو ئیسلامێ، چونکی دەمێ هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زارۆک، ل هەشت سالییێ باپیرێ وی مربوو، و باپیرێ وی هنگی پیرەمێرەکێ ب ناڤ سال ڤە چوویی بوو، و ئەو ل (حوجوونێ) ل باکوورێ مەکەهێ هاتبوو ڤەشارتن.

**کۆلانا بیرا زەمزەم**:

ل سەر دەمێ عەبدلموطەلبی خەلکی ڤەدگێڕا کو بەرێ ب ڕەخ کەعبێ ڤە بیرەکا ئاڤێ هەبوو دگۆتنێ: (بیرا زەمزەم)، خودێ ئەو بۆ پێغەمبەرێ خۆ ئیسماعیلی و دەیکا وی هاجەرێ ژ عەردی پەقاندبوو، بەلێ

ل زەمانـەكێ ژ مێـژە ئویجاخا (جورهوم) ئـەو بیـر ب ئـاخێ داگرتبـوو، و بـێ سەر و شوین كربوو.

شەڤەكێ، دەمـێ هێـشـتـا عـەبدلـموطـطـەلب ب ناڤ سـال ڤـە نـەچووی، و نەبوویـە ئێـك ژ مـەزن و مـاقویلێن مەكـەهێ، وی د خـەوێ دا دیت ئێكـی دگۆتێ: هەرە زەمزەمـێ بكۆلـە.. سـێ چـار شـەڤان وی ئـەڤ خەونـە ددیت، و شـەڤەكێ ئـەوێ هاتییـە د خـەونا وی دا گـۆتێ: هـەرە فـلان جهـی ژ كـەعبێ بكۆلـە زەمـزەم دێ دەركـەڤت. و ژ بـەر كـو دو صـەنەمێن قورەیشـییان ل وی جهی بوون، وان قەبویل نەكر ئەو وی جهی بكۆلت، هنگی عەبدلموططـەلبی كورەكێ ب تنێ هەبوو كو حارث بوو، وی كورێ خۆ دا د گەل خۆ و گۆتێ: تو بـەرەڤـانییێ ژ من بكە، و ئەز دێ عەردی كـۆلم.. هنگـی قورەیشـییان گـەف ل وی كرن، و طـان لێـدان كـو تـە عەیالـەكێ بـۆش نینـە بـەرەڤانییا تـە ژ مـە بكـەن، عەبدلموططـەلب ب ڤـێ گۆتنـا وان تێكچـوو، و د گـەل خـۆ گـۆت: ئەگەر من گەلەك كور هەبان قورەیشییان بستە نەدكر ڤان گەفان ل من بكەن، و هنگی عەبدلموططـەلبی سۆز دا ئەگەر خودێ دەهـ كوران بدەتە وی ئـەو دێ ئێكێ بۆ خودێ كەتە قوربان!

د سەر گەفێن قورەیشـییان را، و د گەل كـو وی كـەس نـەبوو بـەرەڤانییێ ژێ بكـەت ژ بلـی كـورێ وی حـارثی، وی بـەردەوامی دا كـارێ خـۆ، و جهـێ بیرێ كۆلا، و گاڤا قورەیشـییان دیتی ئەو یێ مجدە، وان دەست ژێ بـەردا، و پشتی كۆلانێ هەر زوی نیشانێن هەبوونا بیرێ بۆ وی دەركـەفتن، و ئـاڤ ژێ زا، و هنگـی كەیفـەكا مـەزن بـۆ وی و بـۆ هـەمی خـەلكێ مەكـەهێ هـەمییان چێبوو.

پشـتی ڤـێ سـەرهاتییێ قـەدر و بهـایێ عـەبدلموططـەلبـی د نـاڤ قورەیشییان دا زێدەتر لـێ هـات، و بەرپرسـییا بیـرا زەمـزەم، و كـارێ ئاڤـدانا

حـەجیـیان کەفتە دەستێ عەبدلموطـطـەلبی، و پشتی مرنا وی ئەڤ کارە ما د دەستێ کورێ وی ئەبوو طـالبی دا دەمەکی، پاشی ئەو بۆ عەبباسی ما.

**عەبدللاهێ بابێ پێغەمبەرێ:**

مە گۆت: دەمێ قورەیشییان هەڤرکییا عەبدلموطـطـەلبی ل سەر کۆلانا بیرا زەمزەم کری، و گەف لـێ کرین، وی ل سـەر خۆ نـەزکر کو هەر جارەکا خـودێ دەهـ کـوڕان بـدەتـە وی، ئەو ئێک ژ وان بکەتـە قوربـان بـۆ خودێ، و ل نک کەعبێ سەرژێ کەت! و گاڤا کوڕێن وی بووینە دەهـ، وی ڤیا نەزرا خۆ ب جهـ بینت، لەو وی کوڕێن خۆ هەمی کۆمکرن، و مەسەلا نەزرا خۆ بـۆ وان گۆت، وان گۆتە بابێ خۆ: یا تە دڤێت بکە..

هنگـی عەبدلموطـطـەلبی پشـک هاڤێـت، و گـۆت: هـەچییێ پشـک بکەفتە سەر ئـەز دێ وی سـەرژێ کـەم، و پشـتی وی پشـک هـاڤێتی، پشـک کەفتە سەر کوڕێ وی عەبدللاهی، ئینا وی دەستێ کوڕێ خۆ گرت، و برە نک ئەسـاف و نائیلـەی کـو دو صـەنەم بـوون قورەیشـییان قوربـانێن خـۆ ل نـک ڤەدکوشتن، گاڤا قورەیشییان ئەڤ چەندە زانی هاتنە بـەراهییێ و گـۆتنێ: دێ چ کەی؟

وی سـوحبەتا خۆ و قوربـانی بـۆ وان ڤـەگێڕا، وان گـۆتێ: ئەگـەر تـو ڤـێ چەندێ بکەی خەلک ژی دێ چاڤ ل تە کەن و کـوڕێن خـۆ کەنـە قوربـان، ئـەم ڤـێ قـەبویل ناکـەین.. و حەتا ئـەڤ قوربانـە نەمینتـە د سـتویێ دا هـەرە نـک خێڤزانکەکێ شـارەزا و سـوحبەتا خـۆ بـۆ ڤـەگێڕە، بـەلکی ئـەو ڕێکـەکێ بـۆ تـە ببینت.

عەبدلموطـطـەلبی ب یا وان کر، خێڤزانکی گۆتـە عـەبدلموطـطـەلبی و قورەیشـییـان: بچویکێ خۆ ببەنە کەعبێ و پـێش وی ڤـە دەهـ حێشـتران بکەنـە قوربان، و پشکێ پاڤێن، ئەگەر کەفتە سەر وی دەهـ حێشـترێن دی زێدەکەن،

و وەسا حەتا خودايێ هەوە ڕازی دبت، و پشکێ دئێختە سەر حێشتران، وێ گاڤێ کانێ ئەو حێشتر دێ بنە چەند هوین وان هەمییان پێش زارۆکێ خۆ ڤە بکەنە قوربان.

عەبدلموطەلبی ب یا خێڤزانکی کر، حێشتر دەهـ دەهە زێدە دکرن و هەر جارەکا وی پشک دهاڤێت ئەو دکەفتە سەر عەبدللاهی، حەتا حێشتر بوونە سەد، هنگی ژ نوی پشک کەفتە سەر حێشتران، کەیفا عەبدلموطەلبی و خەلکێ مەکەهێ گەلەک هات، کو عەبدللاهـ ژ ڤەکوشتنێ رزگار بووی.

ب ڤی ڕەنگی خودایێ مەزن بابێ پێغەمبەرێ خۆ -سلاڤ لێ بن- عەبدللاهـ ژ کوشتنێ رزگار کر، و ڤێ سەرهاتییێ بیرا خەلکێ مەکەهێ ل سەرهاتییا ئیبراهیم و ئیسماعیلی ئیناڤە، دەمێ خودێ فەرمان ل ئیبراهیمی کری کو ئەو کوڕێ خۆ بکەتە قوربان، پاشی وی ل دووماهییێ بەرانەک بۆ فرێکر و گۆتێ: ئەڤی پێش کوڕێ خۆ ڤە بکە قوربان، وەکی د ئایەتەکا پیرۆز دا ژ قورئانێ هاتی: ﴿ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١١﴾ ﴾ (الصافات: ١٠١-١١١).

### ئامینایا دەیکا پێغەمبەرﷺ:

پشتی عەبدللاهـ ژ ڤەکوشتنێ ڕزگاربووی، و بوویە زەلامەکێ تمام، بابێ وی ئێک ژ شەریفترین و پاقژترین کچێن قورەیشی بۆ وی خواست، ئەو

ژی ئامینایا کچا وەهەبێ کورێ عەبدمەنافێ کورێ زەهرەیێ کورێ کیلابێ کورێ موررەی بوو. و وەکی ئاشکەرا بابێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو قورەیشی بوو و ژ بابکێ هاشمییان، و دەیکا وی کو ئەو ژی قورەیشی بوو و ژ بابکێ زوهرییان، هەردو ل کیلابێ کورێ موررەی دگەهنە ئێک، کو باپیرێ وان یێ چار پێنجەکێیە.

عەبدلموطەلبی ئامینایا کچا وەهەبی ژ بابێ وێ وەهەبێ کورێ عەبدمەنافی بۆ کورێ خۆ عەبدللاهی خواست، و وەهەب هنگی مەزنێ بابکێ زوهرییان بوو ژ قورەیشییان، و بۆ زانین وەهەبێ زوهری برایێ خەزویرێ عەبدلموطەلبی بوو، ژنکا عەبدلموطەلبی (هالە) کچا ووهەیبێ کورێ عەبدمەنافی بوو، و ئەو دەیکا حەمزەیە و مەتا سەعدێ کورێ ئەبوو وەققاصییە، بابێ سەعدی مالک و مەتا وی هالە پسمام و دۆتمامێن ئامینایا دەیکا پێغەمبەرینە -سلاڤ لێ بن-.

و ب ڤی رەنگی قەدەرا خودێ ل سەر هندێ پێک هات کو دەیک و بابێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل دۆرێن نیڤا سالا ٥٧٠ زایینی (٥٤ بەری مشەختێ) بگەهنە ئێک، و پشتی گەهشتنا وان ب شەش حەفت هەیڤەکان رویدانەکا مەزن ل مەکەهێ چێبوو، ئەو ژی هاتنا ئەبرەهەیێ حەبەشی بوو بۆ مەکەهێ ب ئنیەتا خرابکرنا کەعبێ، ئەو رویدانا ب ناڤێ رویدانا فیلی هاتییە نیاسین، و هندی ئەو رویدانەکا غەریب بوو ل بەر خەلکێ مەکەهێ وان ئەو کربوو تاریخ بۆ سەرهاتی و رویدانێن خۆ، دا بێژن: فلان تشت هندە سالان بەری یان پشتی سالا فیلی چێبووبوو.

**سالا فیلێ:**

بەری بوونا پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- ب کێمتر ژ دو هەیڤان، سەرهاتییا فیلی رویدابوو، ئەو سەرهاتییا بوویە جهێ حێبەتییا خەلکێ

دەڤـەرێ ژ لایـەکی ڤـە، و ژ لایـەکێ دی ڤـە بـوویـە ئەگـەرا پتـر بلنـدبوونا قورەیشییان د چاڤێن عەرەبان دا، و گەلەک زانایێن سیرەتێ ل وێ باوەرێنە کو ئەڤ سەرهاتییە دبتە ئێک ژ نیشانێن پێغەمبەرینییێ (دلائـل النبـوة) بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەکی دێ بۆ مە ئاشکەرا بت.

ئـەڤ رویـدانـە ل دویماهییا هاڤینا سالا (٥٧٠) زایینی چێبووبوو، ل وی دەمـی وەلاتـێ یەمـەنێ ل بـن دەسـتێ حەبەشـییان بـوو، و مـەزنێ حەبەشـییان ل یەمـەنێ ئەبرەهـەیێ ئەشـرەم بـوو، و ئـەو ل سـەر دینـێ فەلـەیان بـوو، دەمـێ وی دیتـی عـەرەب هـەمی، و ژ وان خـەلکێ یەمـەنێ، قـەدر و بهایەکێ مـەزن ددەنـە وێ کەعبـەیا دکەفتـە مەکەهێ، ئـەوا تژی ژ صـەنەمان، وی گەلـەک ب ڤـێ چەنـدێ نـەخۆش بـوو، ئینـا وی بڕیـار دا دێرەکـا فرەهـ و خۆش و مەزن ئاڤا کەت، دا بەرێ عەرەبان بدەتێ، و وەسا چێبـوو وی دێرەکا عەجێب ل صەنعائێ ئاڤاکر و ناڤێ وێ کرە (قوللەیس)، بـەلێ ئارمانجا وی ب جهـ نەهات، و چو عەرەبان قەستا دێرا وی نـەکر، نە بـەس هندە، بـەلکی دبێژن: زەلامەکێ ژ (کینانەیان) دەمێ زانی ئارمانجا ئەبرەهەی ئەوە دێرا وی جهێ کەعبێ بگرت، ئەو ڕابوو شەڤەکێ ب دزی ڤـە چوو د وێ دێرێ ڤـە و دەسنڤێژا خۆ لێ خۆش کر! دا کەربێن ئەبرەهەی ڤەکەت، گاڤـا ئەبرەهـە ب وێ چەندێ حەسیای ئەو زێدە عێجز بوو و بڕیار دا هێرشێ بکەتە سەر مەکەهێ و کەعبێ خراب بکەت.

و ئـەو بـوو ل هاڤینـا سـالا (٥٧٠) زایینـی وی لەشـکەرەکێ مـەزن بەرهـەڤکر، و فیلـەک ب پێش ئێخسـت و ب نـک مەکـەهێ ڤـە چوو، حـەتا گەهشـتییە بـاژێرێ طـائیفێ ل ڕۆژهـەلاتا مـەکەهـێ، و ژ وێـرێ هنـدەک زەلامێن خۆ هنارتنـە مەکەهێ دا سـەح و سوییان بـۆ وی بینن، ب ڕێڤـە وان هژمارەکـا حێشـترێن خـەلکێ مەکـەهێ گـرتن و د گـەل خـۆ بـرن، و دوسـەد

حێشترێن عەبدلموطەلبی د ناڤ وان حێشتران بوون، ئەبرەهەی پسیار کر: کییە مەزنێ مەکەهێ؟ هندەکان گۆتێ: عەبدلموطەلبە، ئینا وی هنارتە ب دویڤ ڕا، و گاڤا ئەو گەهشتییە نک ئەبرەهەی، ئەبرەهەی قەدرەکێ زێدە بۆ گرت، حەتا دبێژن: ئەو ژ سەر کورسیکا خۆ هاتە خوارێ و ل نک وی ڕوینشت، وگۆتێ: ئەز نەهاتیمە شەڕێ هەوە بکەم، ئەزێ هاتیم ڤێ مالێ خراب بکەم ئەوا هوین دبێژنێ: کەعبە، عەبدلموطەلبی گۆتێ: مە ژی نەڤێت شەڕێ وی بکەین، و هەما ب مە ڤە نائێت ئەم شەڕێ وی بکەین..

پاشی ئەبرەهەی گۆتە عەبدلموطەلبی: تە چ داخواز ژ من هەیە؟ عەبدلموطەلبی گۆتێ: زەلامێن تە دوسەد حێشترێن من یێن برین، ئەز حەز دکەم تو وان ل من ڤەگەڕینی.

ئەبرەهەی گۆتێ: دەمێ من بۆ جارا ئێکێ تو دیتی، تو گەلەک د چاڤێن من دا یێ مەزن بووی، بەلێ نۆکە پشتی تە ئەڤ داخوازە ژ من کری تو د چاڤێن من دا هاتییە خوار، ئەزێ هاتیم دا کەعبا تە و باب و باپیرێن تە خراب بکەم، تو بۆ من بەحسێ دوسەد حێشتران دکەی؟!

عەبدلموطەلبی گۆتێ: ئەز خودانێ حێشترانم، و بەیتێ خودانەک هەیە ئەو دێ وێ پارێزت.

هنگی ئەبرەهەی حێشترێن وی لێ زڤڕاندن، و ئەڤ زڤڕی مەکەهێ، عەبدلموطەلبی گۆتە خەلکێ مەکەهێ: ژ باژێری دەرکەڤن، قەستا چیا و دۆل و نهالان بکەن، نە کو لەشکەرێ وان نەخۆشییێ بگەهینتە هەوە.. و دبێژن: بەری عەبدلموطەلب ژ مەکەهێ دەرکەڤت، ئەو چوو خەلەکا دەرگەهێ کەعبێ گرت و گۆت: هەر عەبدەک مالێ خۆ دپارێزت، تو مالێ خۆ بپارێزە، دا سوباهی خاچێن وان ب سەر هێزا تە نەکەڤت، و ئەگەر تو بهێلی ئەو بگەهنە ڕووگەها مە، وێ بکە یا تە دڤێت!

ڕۆژەکا گران بوو ل سەر خەلکێ مەکەهێ ئەوێن ژن و عەرز و عەیالێ خۆ ژ باژێڕی دەرێخستی و هەر ئێک ب لایەکی دا چووی، و ماینە ل هیڤییێ کانێ دێ چ چێ بت..

گاڤا لەشکەرێ ئەبرەهەی گەهشتییە بەردەرازینکا حەرەما مەکەهێ، ل نهالەکا نێزیکی مینایێ یا کو دبێژنێ: (ئەلموغەممەس)، ل وێرێ فیلێ ئەبرەهەی صەتمی، و هندی هاتنێ کو ئەو پێشڤە بچت، ئەو د جهـ دا ما و نەچوو، و گاڤا وان بەرێ وی ددا یەمەنێ وی دکرە غار! هنگی وان بڕیار دا فیلی بەردەن و ئەو بچن، بەلێ خودێ وەسا حەز کر ڕویدانەکا پەردەدڕ چێ ببت، ئەو ژی ئەو بوو یا د سوورەتا (الفیل) دا بەحس ژێ هاتییەکرن:

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ۝١ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ۝٢ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ۝٣ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ۝٤ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ ۝٥ ﴾ (الفيل: ١-٥) یەعنی: ئەرێ ما تە نە زانییە -ئەی پێغەمبەر- کانێ خودایێ تە چ ب سەرێ خودانێن فیلی ئینابوو: ئەبرەهەیێ حەبەشی و لەشکەرێ وی ئەوێن ڤیاین کەعبەیا پیرۆز خراب بکەن؟ ئەرێ ما وی فەند و فێلا وان پویچ نەکر؟ و وی کۆمێن تەیران ل دویڤ ئێک ب سەر وان دا هنارتن؛ دا بەرکێن ژ تەقنا هشک ب وان وەرکەن. ڤێجا وی ئەو ب وان بەرکان وەکی وێ کایێ لێکرن یا حەیوانەت دخۆن و دهاڤێن.

بارا پتر ژ لەشکەرێ ئەبرەهەی ب ڤی ڕەنگێ نەعەدەتی هاتنە کوشتن، و هندەک ژ وان ب کوتەکی ب ڕەڤا خۆ ڕاگەهشتن، و زڤڕینە یەمەنێ د نساخ و ئێشەوی، و ئێک ژ وان ئەبرەهە ب خۆ بوو، ئەوێ پشتی هنگی ب دەمەکێ کێم مری، و کوڕێ وی یەکسووم ل جهێ وی بوویە مەزنێ یەمەنێ.

ئەڤ ڕویدانە ل دووماهییا هەیڤا شویاتا سالا ٥٧١ زایینی چێبووبوو، کو دکەفتە بەرانبەر هەیڤا موحەررەمێ.

زانایێ مەزن ئبن تەیمیە ل دۆر ڤێ ڕویدانێ دبێژت: ((جیرانێن بەیتێ موشرک بوون، پەرستنا صەنەمان دکر، و دینێ فەلەیان ژ دینێ وان چێتر بوو، ژ ڤێ چەندێ دئێتە زانین کو ئەوا چێبووی نە ژ بەر جیرانێن بەیتێ چێبووبوو، بەلکی ژ بەر بەیتێ ب خۆ بوو، یان ژ بەر پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، ئەوێ ل وێ سالێ ل نک بەیتێ هاتییە سەر دنیایێ، یان ژ بەر هەردویان، و هەر چاوا بت ئەو ژ نیشانێن پێغەمبەرینییا وی بوو))[1].

و ئەگەر حەبەشی شیابان بچنە د حەرەما مەکەهێ دا، و بەیتێ خراب بکەن، دویر نینە وان خەلکێ مەکەهێ گرتبان و ئێخسیر کربان، و هنگی دەیکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەوا گران ب وی دا د گەل وان ئێختە ئێخسیرکرن، و دا وێ ژی کەنە کۆلە! ڤێجا دا کو خودێ پێغەمبەرێ خۆ و بەیتا خۆ ژ ڤی ئەنجامێ کرێت بپارێزت، وی ئەڤ کارێ موعجزە ب جهـ ئینا.

پشتی تێبرنا ئەبرەهەی و لەشکەرێ وی، و شکەستنا وان یا کرێت، خەلکێ مەکەهێ ب کەیف زڤڕینە مالێن خۆ، و کەعبە د چاڤێن وان و یێن خەلکێ دی ژی دا ژ عەرەبان پتر پیرۆز بوو.

## دەیک و بابێن پێغەمبەری ل وی دەمی:

دەمێ ئەڤ ڕویدانە چێبووی بابێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ژیانێ دا نەبوو، بەری هاتنا ئەبرەهەی ب نێزیکی حەفت هەیڤان عەبدللاهێ کوڕێ عەبدلموطەلبی ژنکا خۆ ئامینایا کچا وەهەبی ڤەگوهاستبوو، و پشتی

(١) ابن تيمية: الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح، ٤ / ١٢٢.

ڤـەگـوهـاسـتـنـێ ب هـەيـڤەکێ دويان کاروانەکێ بازرگانی يێ قورەيشـييان ژ مەکەهێ دەرکەفت و بەر ب شامێ ڤـە چوو، عـەبدلموطـطـەلبی کورێ خۆ عەبدللاه هلبژارت دا د گەل کاروانی دەرکەڤت، عەبدللاهی داخوازا بـابێ خۆ ب جهـ ئينا، و د گەل زەلامێن قورەيشييان قەستا شامێ کر.

پشـتی کـاروانێ قورەيشـييان بازرگانييـا خۆ پێـک ئينـای، و ژ شـامێ زڤڕی ب ڕێکێ ڤە عەبدللاه پێ حەسـيا کـو هـەر وەکـی لەشـێ وی يـێ گـران دبـت، و دەمـێ ئـەو گەهشتينە مەدينێ ئێش ل وی گران بوو و ئـەو نەشـيا د گەل کاروانی بزڤڕتە ڤە، لەو وی قەستا مـال خـالانێن بـابێ خـۆ ژ ئويجاخـا خەزرەجييـان کر، و ما ل نک وان.

ل مـەکـەهێ عەبدلموطـطـەلبێ پيرەمێر ل هيڤييا کوڕی خۆ بـوو، و وی ژ هـەمی کـوڕێن خـۆ پتـر حـەز ژ عەبـدللاهی دکـر، بـەلێ کـاروان گەهشـت و عەبدللاهـ د گـەل دا نـەبوو، و دەمـێ وان خەبـەرێ نەخۆشـييا عەبـدللاهی گەهاندييە عەبدلـموطـطـەلبی وی کوڕێ خۆ يێ مەزن (حارث) هنارتە مـەدينێ دا د هەوارا برايێ خۆ يێ بچويک بچيت، بەلێ قەدەرا خودێ زويتر ژ حـارثی گەهشتێ، و عـەبدللاه ل مەدينێ مر.

دەمـێ عـەبدللاهێ بابێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مـری، ژيـێ وی ل دۆرێـن بيـست و پێـنج سـالييێ بوو، و دەمێ ئەو مـری وی مـالـەکێ وەسـا ل پشت خۆ نەهێلابوو، دبێژن: هەما وی ب تنـی پێـنج حێشـتر، د گـەل چەنـد سـەرێن پـەزی، و جارييـەک ئـەوا دگـۆتنێ: (دەيکـا ئەيمـەنی) هـەبوون، لـەو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و دەيکا وی ب فەقيری ژيان.

هـەر ل دوومـاهـيـيـا وێ هـاڤـينـێ، يـەعنی: پشـتا مرنـا عەبـدللاهی ب دەمەکێ کێم، ئەبرەهە ب لـەشـکەرێ خۆ ڤـە ژ يەمـەنێ دەرکـەفت و قەسـتا مەکەهێ کر، دا کەعبێ خراب بکەت، و ئەو هاتە سەری يا هاتييە سەری.

و دەمێ سەرهاتییا فیلی چێبووی، ئەو حەفت هەیڤ بوو دەیکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئامینایا کچا وەهەبی یا گران بوو ب وی، و پشتی ئەبرەهە چوویە هیلاکێ ب نێزیکی پێنجی ڕۆژان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە سەر دنیایێ.

# هەلاتنا ڕۆناهییێ

## دوعا و مزگینیێ و خەونا بەرێ بوونێ:

د حەدیسەکا دورست دا هاتییە کو هندەک صەحابی هاتنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتنێ بەحسێ خۆ بۆ مە بکە، وی گۆت: ﴿ أَنا دَعْوَةُ أَبِي إِبْرَاهِيمَ، وَبِشَارَةُ عِيسَى قَوْمَهُ، وَرُؤْيَا أُمِّي الَّتِي رَأَتْ أَنَّهُ خَرَجَ مِنْهَا نُورٌ أَضَاءَتْ لَهُ قُصُورُ الشَّامِ ﴾ یەعنی: ئەز ئەو دوعامە یا بابێ من ئیبراهیمی کری، و ئەو مزگینییا عیسایی دایە مللەتێ خۆ، و ئەو خەونا دەیکا من دیتی دەمێ وێ دیتی ڕۆناهییەک ژێ ڤەدپەشی قسرێن شامێ ژ بەر گەش دبوون[1].

دوعایا ئیبراهیمی ئەوە یا د ئایەتا (١٢٩)ێدا ژ سوورەتا (البقرة) هاتی، دەمێ وی کورێ خۆ ئیسماعیل هێلایە ل مەکەهێ، وی دوعایەک ژ خودایێ خۆ کر و گۆت: ئەی خودایێ مە، تو پێغەمبەرەکی د ناڤ وان بهنێرە ئایەتێن تە بۆ وان بخوینت و کیتابێ و سوننەتێ نیشا وان بدەت، و وان پاقژ بکەت.

و مزگینییا عیسایی بۆ مللەتێ وی ئەوە یا د ئایەتا (٦)ێدا ژ سوورەتا (الصف) هاتی، دەمێ وی گۆتییە وان: ئەز مزگینییێ ددەمە هەوە کو پێغەمبەرەک پشتی من دێ ئێت ناڤێ وی ئەحمەدە.

---

(١) حاکم و بەیهەقی ڤەدگوهێزن.

و خەونا دەیکا پێغەمبەری -سلاف لێ بن- دیتی ئەڤەیە یا پێغەمبەری ب خۆ بۆ مە ژێ ڤەگوهاستی، دەمێ ئەو ب حەملە کەفتی ب پێغەمبەری -سلاف لێ بن-، وەکی د هندەک ریوایەتێن دی دا هاتی، وێ د خەونا خۆ دا دیت ڕۆناهییەک ژ وێ دەردکەفت و هند بلندبوو حەتا شامێ ب قەسرێن خۆ ڤە ژ بەر وێ ڕۆناهییێ گەش دکر.. پێغەمبەر -سلاف لێ بن- ڤێ خەونا دەیکا خۆ بۆ مە تەعبیر دکەت و دبێژت: ئەو ڕۆناهییا وێ دیتی ئەز بووم. و قورئان ژی د ئایەتەکا خۆ دا بۆ مە ئاشکەرا دکەت کو پێغەمبەر -سلاف لێ بن- ڕۆناهییەکە بۆ مە هاتی، دەمێ دبێژت: ﴿ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٦﴾ ﴾ (المائدة: ١٥-١٦) یەعنی: ڕۆناهییەک -کو پێغەمبەرە- و کیتابەکا ئاشکەرا -کو قورئانە- ژ خودێ بۆ هەوە هاتییە، خودێ بەرێ وی پێ ددەتە ڕێکێن تەناهی و سلامەتییێ، و ب ئانەهییا خۆ وان ژ تارییان دەردئێختە ڕۆناهییێ، و بەرێ وان ددەتە ڕێکەکا ڕاست.

و هەلاتنا (فعلی) یا ڤێ ڕۆناهییێ، و ب جههاتنا ڤێ دوعا و مزگینییێ کەنگی بوو؟

## کەنگێ ڕۆناهییا پێغەمبەرێ هەلاتبوو؟

بەلکی ل بەر گەلەک ژ مە ئەڤ پسیارە یا غەریب بت، یان یا زێدە بت، و دویر نینە هندەک بێژن: ما کی هەیە نەزانت کو پێغەمبەرێ مە -سلاف لێ بن- ل ڕۆژا دوشەنبێ دوازدەی رەبیعولئەووەلا سالا فیلی، کو دبتە سالا (٥٧١) زایینی، یێ هاتییە سەر دنیایێ!

بەلێ ئەم دبێژین: جارێ لەزێ نەکەن! چونکی نە هەر گۆتنەکا دئێتە گۆتن، ئەگەر خۆ یا بەلاڤ ژی بت، دێ یا دورست بت.. ل ڤێرێ مە دڤێت

دویچوونا ڤێ مەسەلێ بکەین، و گوتنێن زانایێن حەدیسێ و سیرەتێ و دیرۆکێ ل بەر چاڤ بدانین، و هلسەنگینین، و بێخینە بەر تیرۆژکێن ڕەخنێ، دا بگەهینە بۆچوونەکا بنەجھ دەربارەی دیرۆکا بوونا پێغەمبەرێ خۆشتڤی -سلاڤ لێ بن-.

و بەری ئەم دەست بدەینە شرۆڤەکرنا ڤی بابەتی سێ مەسەلێن دەسپێکێ هەنە دڤێت ئەم ل بیرا خۆ بینینە ڤە، ئەو ژی ئەڤەنە:

**مەسەلا ئێکێ:**

زانین و دەسنیشانکرنا ڕۆژا بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گرنگییا خۆ ژ لایێ دیرۆکێ ب تنێ ڤە هەیە، ئەگەر نە.. ژ لایێ دینی و شەرعی ڤە وێ چو بهایێ خۆ نینە، چونکی ئەو نە پشکەکە ژ دینی، و چو ئەحکامێن شەرعی ژی پێڤە دگرێدای نینن، لەو ئەڤ بابەتە د کتێبێن سیرەتێ و دیرۆکێ دا دئێتە بەحسکرن، نە کو د کتێبێن شریعەتی و ئەحکامان دا.

**مەسەلا دویێ:**

دەربارەی بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب تنێ ئتتفاقا زانایان د تشتەکی دا هەیە، ئەو ژی ئەڤەیە: بوونا وی یا پیرۆز ل ڕۆژا دوشەنبییە.. ئەو ژی ژ بەر حەدیسەکا دورست یا کو پاشی دێ بەحس ژێ کەین -ئەگەر خودێ حەز بکەت-، وەکی دی چەندی هەیڤێ بوو؟ وکیژ هەیڤ بوو؟ و حەتا کیژ سال ژی بوو؟

ئەڤە جهێ خیلافییە د ناڤبەرا زانایێن سیرەتێ و دیرۆکێ دا.

**مەسەلا سێیێ:**

ئەڤ گوتنێن هە یێن خیلاف ل سەر چێبووی، ئەگەر ئەم بکەینە د تەرازییا ڕەخنەیا علمی دا، یا کو زانایێن حەدیسێ و (جەرح و تەعدیلێ) کاری پێ دکەن، چو ژ وان ژ لایێ سەنەدێ ڤە دبێ عەیب و کێماسی نینن،

یەعنی: هەر بۆچوونەک ژ ڤان بۆچوونێن هە ئەگەرەکا وەسا تێدا هەیە ئەو پێ بێتە لاوازکرن (تەضعیفکرن) ژ لایێ زانایێن جەرح و تەعدیلێ ڤە.

ئەڤ هەر سێ مسەلە، هەر ژ دەسپێکێ دڤێت ل بیرا مە بن. پشتی ڤێ چەندێ، و حەتا گۆتنا مە دورست بێتە وەرگرتن، ئەم دێ گۆتنا خۆ ل سەر چەند خالەکان لێکڤە کەین، و ب ڤی رەنگی:

**١- بوونا پیرۆز ل دوشەنبێ بوو:**

مسەلا کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل رۆژا دوشەنبێ هاتییە سەر دنیایێ، ئەڤە تشتەکە زانا هەمی ل سەر د(موتتەفقن)، ئەڤە ب خێرا وێ حەدیسا دورست یا ئیمام موسلم ژ ئەبوو قەتادەی ڤەدگوهێزت، دبێژت: پسیارا گرتنا رۆژییێ ل رۆژا دوشەنبێ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتەکرن، وی گۆت: ﴿ ذَاكَ يَوْمٌ وُلِدْتُ فِيهِ، وَيَوْمٌ بُعِثْتُ، أَوْ أُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهِ ﴾ یەعنی: ئەو رۆژەکە ئەزێ تێدا بوویم، و ئەزێ تێدا هاتیمە هنارتن، یان قورئان یا بۆ من تێدا هاتییە خوارێ[١].

هەر وەسا ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی ژی دئێتە ڤەگوهاستن کو بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و مرنا وی ژی ل رۆژا دوشەنبێ بوو[٢].

و هەر چەندە ئەڤ ریوایەتە بۆ مە ئاشکەرا ناکەن، کانێ ئەو دوشەنب چەندی هەیڤێ بوو، بەلێ وەکی دێ بینین، دەسنیشانکرنا رۆژێ دێ مفایی گەهینتە مە بۆ دەسنیشانکرنا دیرۆکێ ژی!

---

(١) برێنە: صحيح مسلم، چاپا (محمد فؤاد عبد الباقي)، دار إحياء التراث العربي، حەدیسا ژمارە (١٩٧)، ٢ / ٨١٩.

(٢) برێنە: مسند الإمام أحمد، حەدیسا ژمارە (٢٥٠٦)، چاپا مؤسسة الرسالة، ٢٠٠١، (٣٠٤/٤)، و دلائل النبوة للبيهقي، چاپا دار الكتب العلمية ١٤٠٥ هـ، (٧٣/١).

**٢- بوون ل سالا فيلى بوو:**

مەسەلا كو بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سالا فيلى بوو، ئەڤە ژی نێزیکە جهێ ئێتفاقێ بت ل نک زانایێن سیرەتێ و دیرۆکناسان، و مە گۆت: نێزیکە.. چونکی زانایێ ناڤدار (ئبن کەثیر) هندەک گۆتنێن جودا ژ ڤێ گۆتنێ ڤەدگوهێزت، و ئەو ب خۆ ڤان گۆتنان (تەضعیف) دکەت، و دبێژت: جمهوورێ زانایان ل وێ باوەرێنە کو ئەو ل سالا فيلى بوو[1]. و سالا فيلى -وەکی بۆری د گەل مە- ئەو سال بوو یا ئەبرەهەیێ حەبەشی تێدا ژ یەمەنێ هاتی و قەستا بازێرێ مەکەهێ کری، ب ئنیەتا خرابکرنا کەعبێ، پشتی وی دێرەکا مەزن ل یەمەنێ ئاڤاکری، دا بەرێ عەرەبان ژ کەعبێ وەرگێرتە دێرا خۆ.. و سەرهاتییا تێبرنا ئەبرەهەی ل دەسپێکا سالا ٥٧١ زایینی بوو.

و گەلەک دیرۆکزان ل وێ باوەرێنە کو بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سالا چلێ بوو ژ حوکمێ کسرا نووشێروانی[2]، و چونکی ل نک زانایێن دیرۆکێ تشتەکێ مسۆگەرە کو ئەڤ کسرایە ل سالا ٥٣١ زایینی هاتبوو سەر حوکمی، مەعنا بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دێ کەفتە سالا ٥٧١ زایینی.

**٣- بوون ل بهارێ بوو:**

پسیارا ل ڤێرێ ئەڤەیە: ئەرێ بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل کیژ وەرزێ سالێ بوو؟

---

(١) السيرة النبوية لابن كثير، چاپا دار المعرفة، بيروت، ١٩٧٦، (٢٠٣/١).

(٢) وەکی مەسعوودی ڤێ چەندێ د کتێبا خۆ (مروج الذهب) دا ڤەدگێرت، دەمێ بەحسێ بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکەت.

وەکی مە گۆتی چو دەلیلێن دورست -ژ لایێ سەنەدێ ڤە- د دەست مە دا نینن ئاشکەرا بکەن کانێ بوون ل کیژ وەرزێ سالێ بوو، بەلێ پشتی هەڤبەرکرنا هندەک رویدانان و دیرۆکێن وان بۆ مە ئاشکەرا دبت کو بوون ل وەرزێ بهارێ بوو.. ژ وان رویدانان:

ژ حەلیما سەعدی دئێتە ڤەگوهاستن، کو پشتی دو سالێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل نک وێ ب دویماهی هاتین، وێ ئەو زڤرانە نک دەیکا وی، بەلێ ژ بەر بەرەکەتا وێ ژ مانا وی ل نک خۆ دیتی، ئەو ما ب دەیکا وی ڤە کو سالەکا دی ژی وی بهێلتە ل نک وێ، ئینا دەیکا وی قانع بوو.. و پشتی زڤرینێ ب دو سێ هەیڤەکان، جارەکێ ئەو ژێ غافل بوو، دیت ئەو نە ل ویرێیە، گۆت: ئەز چووم، من دیت خویشکا وی (یا شیری) یا وی دهلاڤێت، و شعران بۆ دبێژت، ئینا حەلیمایێ گۆتێ: چاوا تو وی دهێلیە ل بەر ڤێ گەرمێ؟![1]

مەعنا: دەمێ ژیێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دو سال و دو سێ هەیڤ کاملانا گەرما هاڤینێ بوو، و ئەگەر ئەم پاشپاشکی بزڤرینە دەمێ بوونا وی (بەری هنگی ب دو سال و سێ هەیڤان) دڤێت دەم بهار بت.

مەسەلا دی: دیرۆکزان دبێژن: سەرهاتییا هاتنا ئەبرەهەی بۆ خرابکرنا کەعبێ، و تێبرنا وی، د ناڤبەرا (١٥-٢٠)[2] هەیڤا موحەررەمێ دا بوو ژ سالا (٥٧١) زایینی، و گەلەک ژ وان دبێژن: پشتی تێبرنا ئەبرەهەی

---

(١) بڕێنە: السيرة الحلبية، على بن إبراهيم الحلبى، چاپا ٢، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢٧ هـ، ١٥٠. و دەسنیشانکرنا دو سێ هەیڤان پشتی زڤرینی ژ لایێ (ئبن ئەثیر)ی ڤە هاتییە، وەکی کتێبا (نتائج الأفهام) دا هاتی یا مەحموود پاشا یێ فەلەکی، ژێ ڤەدگوهێزت، پ ٢٣.

(٢) مەسعوودی دبێژت: ل (١٧)ی موحەررەمێ بوو.

ب چل یان پێنجی ڕۆژان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتبوو سەر دنیایێ، و ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینین کو زانایێن فەلەکێ و سالنامە و (تەقویمان) دبێژن: ل سالا بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەیڤا موحەررەمێ دکەفتە بەرانبەر هەیڤا شوباتێ، دێ بۆ مە ئاشکەرا بت کو بوون دڤێت ل وەرزێ بهارێ بت.

## ٤- بەلێ چ هەیڤ بوو:

مە گۆت: بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سالا فیلی بوو، ل وەرزێ بهارێ، بەلێ ئەو ل چ هەیڤێ بوو؟

د کتێبێن سیرەتێ و دیرۆکێ دا -هندی مە دیتی- سێ هەیڤ بۆ ڤێ رویدانێ یێن هاتینە دەسنیشانکرن، ئەو ژی ئەڤەنە: هەیڤا صەفەرێ، و هەیڤا (ربیع الأول)ێ، و هەیڤا رەمەزانێ. ئەوێن دبێژن: بوون ل هەیڤا صەفەرێ بوو، دیارە دەلیلێ وان ب تنێ ئەڤەیە، ئەو دبێژن: مادەم سەرهاتییا تێبرنا لەشکەرێ ئەبرەهەی ل نیڤا موحەررەمێ بوو، و بوون پشتی ڤێ سەرهاتییێ ب چل ڕۆژان بوو، دڤێت دیرۆکا بوونێ بکەفتە هەیڤا صەفەرێ. و ئەوێن دبێژن: ئەو ل هەیڤا رەمەزانێ بوویبوو، هێجەتا وان ئەڤەیە: ئەو دبێژن: مادەم پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل سەرێ چل سالییێ بووبوو پێغەمبەر، و پێغەمبەراتییا وی وەکی ئەم هەمی دزانین ل هەیڤا رمەزانێ دەست پێ کربوو، لەو دڤێت بوون ژی ل هەیڤا رەمەزانێ بت. و پشتی ئبن کەثیر ڤێ گۆتنێ ڤەدگوهێزت، دبێژت: ئەڤ گۆتنەکا گەلەکا غەریبە[1].

جمهوورێ زانایان ل وێ باوەرێنە کو بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل هەیڤا (ربیع الأول)ێ بوو، و زانایێ ناڤدار ئبن ئسحاق د کتێبا خۆ (المغازی) دا ب ئاشکەرایی ڤێ چەندێ بنەجهـ دکەت، دەمێ دبێژت: ئەو

(١) برێنە: السیرة النبویة لابن کثیر، چاپا دار المعرفة بیروت، ١٩٧٦، (١/٢٠٠).

هەیڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا بووی هەیڤا (ربیع الأول)ێ بوو[1].

و ئەڤ بۆچوونە یا دورستترە ژ بەر وی دەلیلێ مە بەری نوکە ڤەگێڕای کو سەرهاتییا ئەبرەهەی پشتی نیڤا هەیڤا موحەررەمێ بوو، و پشتی هنگی ب پێنجی ڕۆژان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتبوو سەر دنیایێ، وکی دێ د خالا بێت ژی دا پتر ڤێ مەسەلێ روهن کەین.

## ٥- ل چەندی (ربیع الأول)ێ ڕۆناهی پەیدابوو:

کو مە زانی بوونا پیرۆز ل هەیڤا سێیێ بوو، ئەوا دبێژنێ: (ربیع الأول)، نوکە مە دڤێت بزانین کانێ ئەو ل کیژ ڕۆژێ بوو ژ ڤێ هەیڤێ؟ و حەتا ئەڤ چەندە ب دورستی بۆ مە ئاشکەرا ببت، مە دڤێت وان گۆتن و بۆچوونان پێش چاڤ بکەین یێن د ڤێ دەربارەیێ دا هەین، د گەل هلسەنگاندنا وان.. و ئەو گۆتن و بۆچوون ئەڤەنە[2]:

هندەک دبێژن: ئەو ل دووی هەیڤێ بوو، (ئبن عەبدلبەر) ڤێ چەندێ د کتێبا خۆ (الاستیعاب) دا ڤەدگوهێزت، و واقدی ژی ڤێ چەندێ ژ ئەبوو مەعشەرێ مەدەنی ڤەدگوهێزت.

و وەسا دیارە کو زانایێ مەزن (الحافظ العراقی) ڤێ بۆچوونێ دورستتر دبینت، دەمێ د هزارمالکییا خۆ دا دبێژت:

وَوُلِدَ النبيُّ عامَ الفيلِ　　　أيْ في ربيعِ الأولِ الفَضيلِ
ليومِ الاثنينِ مُباركًا أتى　　　لليلتينِ مِنْ ربيعٍ خَلتا[3]

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، چاپا سالا ١٩٥٥ یا شرکة مصطفی البابي الحلبي، ١٨٥/١.

(٢) برێنە: السيرة النبوية لابن كثير، (١٩٩/١).

(٣) ألفية السيرة النبوية، نظم الدرر السنية الزكية، للحافظ العراقي، دار المنهاج بيروت، ١٤٢٦، پ ٣٥.

هندەكێن دی دبێژن: پشتی بۆرینا هەشت ڕۆژان ژ هەیڤێ، و ل سپێدەیا ڕۆژا نەهێ ئەو یێ هاتییە سەر دنیایێ، و خودانێ (السيرة الحلبية) ژ (قەسطەلانی) ڤەدگوهێزت، دبێژت: پترییا (ئەهلێ حەدیسێ) وەكی (حومەیدی و ئبن حەزمی) ڤێ بۆچوونێ هل دبژێرن، و هژمارەكا نڤیسەرێن سیرتێ و دیرۆكێ ژی ڤێ بۆچوونێ دورستتر دبینن، و ئێك ژ وان مەسعوودییە[1].

و هندەكێن دی دبێژن: ئەو ل دەهێ هەیڤێ بوو، و ژ وان یێ ڤێ بۆچوونێ دورستتر دبینن ئەبوو موحەممەدێ دمیاطی بوو، سەیدایێ ئیمامێ ذەهەبی، وەكی ذەهەبی ژێ ڤەدگوهێزت[2].

بەلێ ئەو ریوایەتا دمیاطی پالدایە سەر ریوایەتەكا (مورسەلە) وەكی زانا دبێژن.

و ریوایەتا ژ هەمییان بەلاڤتر ئەوە كو بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل دوازدەی هەیڤێ بوو، و خودانێ ئێكێ یێ ڤێ بۆچوونێ (ئبن ئسحاقە) و گەلەك خودانێن سیرەتێ و دیرۆكێ ئەڤ گۆتنە ژ وی ڤەگوهاستییە، بەلێ گرفتارییا ڤێ بۆچوونێ (ئبن ئسحاق) ب خۆیە، ئەڤ ریوایەتا وی -وەكی (ئبن دوحیە) دبێژت- یا (مەقطووعە) و چو سەنەد بۆ نینن، و زانایێن (جەرح وتەعدیلێ) ل وێ باوەرێنە كو (ئبن ئسحاق) مرۆڤەكێ نە یێ باوەرێیە، بەلكی هندەك ژ وان وەكی ئیمام مالكی ئەو ب درەوێ تاوانبار كرییە، لەو گۆتن و ریوایەتێن وی ل نك زانایێن حەدیسێ د صەحیح نینن[3].

---

(١) السيرة الحلبية، ٨٤/١-٨٥١٥٠.

(٢) تاريخ الإسلام، للذهبي، طبعة المكتبة التوقيفية، (٦/١).

(٣) السيرة الحلبية، (٨٤/١).

و ئەڤ بۆچوونە ژ زوبەیرێ کورێ بەککاری ژی دئێتە ڤەگوهاستن، بەلێ ریوایەتا وی ژی یا دورست نینە بەلکی یا (مورسەلە)[1].

و بۆچوونەکا دی ژی هەیە ژ هندەک شیعەیان دئێتە ڤەگوهاستن، کو ئەو ل هەڤدەی هەیڤێ بوو، ل رۆژا ئەینییێ، و ئبن کەثیر دبێژت: ئەڤێ گۆتنێ چو راستی بۆ نینە[2].

## ٦- بۆچوونا نێزیکتر بۆ راستییێ:

پشتی بەرچاڤکرنا ڤان هەمی بۆچوونان، و بەری دەسنیشانکرنا وێ بۆچوونا ئەم هزر دکەین ژ هەمییان نێزیکترە بۆ راستییێ، من دڤێت جارەکا دی بیرا هەوە ل هندێ بینمەڤە کو چو ژ ڤان بۆچوونان خودان سەنەدەکا دورست نینە ژ لایێ تەرازییا حەدیسێ ڤە، و بەلکی ئەڤە هندێ بگەهینت کو دەسنیشانکرنا رۆژا بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەک دیرۆک ل نک صەحابییان و یێن پشتی وان ژی گرنگییا خۆ نەبوویە لەو ئەو ل دویڤ ڤێ چەندێ نەچووینە، و چو گۆتنێن بنبڕ ژ وان نەهاتینە ڤەگوهاستن د ڤێ دەربارەیێ دا. پشتی هنگی مادەم مە چو ریوایەتێن (صەحیح) ژ لایێ سەنەدێ ڤە د ڤێ دەربارەیێ دا نینن، و پێخەمەت دەسنیشانکرنا رۆژا بوونێ دڤێت ئەم ل گۆتنا صنفکێ دی یێ زانایان بگەڕییێن نە زانایێن دیرۆکێ و ریوایەتان، ئەو ژی زانایێن فەلەکێ و تەقویم و سالنامەیانە..

## ٧- زانایێن سالنامەیان چ دبێژن؟

ب راستی د ڤی مەجالی دا ڤان رەنگە زانایان، نە ب تنێ یێن موسلمان، بەلکی هندەکێن ئەورویی ژی دویچوونەکا باش کرییە دا ئەو رۆژا بوونێ ب دورستی دەسنیشان بکن، و باشترین کتێب د ڤێ دربارەیێ دا

---

(١) تاريخ الإسلام، للذهبي، (٢٥/١).

(٢) السيرة النبوية لابن كثير، (١٩٩/١).

هاتییە نڤیسین، و ب بەرچاڤێن مە کەفتی، کتێبا (نتائج الأفهام)ە یا زانایێ فەلەکی مەحموود پاشای[1] د ڤێ کتێبێ دا نڤیسەر پال ددەتە سەر گەلەک دەلیلێن علمی و فەلەکی، دا بزانت کانێ هەیڤا (ربیع الأول)ێ یا قەمەری ل سالا (٥٧١) زایینی دکەفتە بەرانبەر چ هەیڤا شەمسی، و پشتی کۆمەکا دەلیلان ئەو ئاشکەرا دکەت کو: هیلالا هەیڤا (ربیع الأول)ێ یا قەمەری ل سالا (٥٧١) زایینی ل شەڤا (١١) ژ هیڤا نیسانێ بوویوو، سەعەت نەهێ و دەقیقا (٤١) ل دویڤ وەختێ مەکەهێ، ژ بەر ڤێ چەندێ رۆژا ئێکێ ژ هەیڤا (ربیع الأول)ێ دکەفتە بەرانبەر (١٢) نیسانا وێ سالێ، و ئەو رۆژ ئێکشەنب بوو. و ئەگەر ئەم رۆژان حسێب بکەین، ژ ئێکشەنبێ، رۆژا دوازدەی هەیڤێ دێ بتە پێنجشەنب، و چونکی پێغەمبەر -سلاف لێ بن- ب خۆ دبێژت: ئەز ل رۆژا دوشەنبێ یێ بوویم -وەکی د حەدیسەکا دورست دا هاتی- ئەم ب پشتراستی ڤە دشێین بێژین: دوازدەی هەیڤێ قەت و قەت نابتە رۆژا بوونا وی، چونکی ژ هەشتی هەیڤێ حەتا دوازدێ ب تنێ دوشەنبەک هەیە ئەو ژی نەهی هەیڤێیە، کو دڤێت ئەو ئەو رۆژ بت یا پێغەمبەر -سلاف لێ بن- تێدا هاتییە سەر دنیایێ. وئەڤ رۆژە، کو نەهی (ربیع الأول)ێیە، دکەفتە بەرانبەر (٢٠ نیسانا سالا ٥٧١ زایینی) و زانایێن فەلەکێ دبێژن[2]: ل نیسانا ڤێ سالێ کەوکەبا موشتەری هەڤچۆتی کەوکەبا زوحەلێ بوو ل بورجا عەقرەبێ، و ئەو ل نک زانایێن فەلەکێ

---

(١) ناڤێ وێ ب تمامی ئەڤەیە: (نتائج الأفهام في تقويم العرب قبل الإسلام و في تحقيق مولده و عمره عليه السلام) بەری پتر ژ سەد سالان یا هاتییە نڤیسین، د ئەصل دا ب زمانێ فرەنسییە، و ل سالا ١٣٠٥ مشەختی یا هاتییە وەرگێڕان بۆ زمانێ عەرەبی، و ل مصرێ چاپ بوویوو.

(٢) بڕێنە: نتائج الأفهام، چاپا مصرێ ١٣٠٥، پ ٣٠.

باشترین دەمێ تالعییە. و خودێ چێتر دزانت، ئەڤە ب نسبەت بوونا وێ بوو -سلاڤ لێ بن-.

ب نسبەت وەفاتا وی، هەر چەندە ڤی بابەتی ئەم ل دووماهییا کتێبێ ئینین -ئەگەر خودێ حەز بکەت-، بەلێ یا ناڤدار ئەوە کو ئەو ل ڕۆژا دوشەنبێ بوو، (١٢) هەیڤا ڕەبیعولئەووەلا سالا (١١) مشەختی، و ئەڤ ڕۆژە ل دویڤ گۆتنا شارەزایێن فەلەکێ دکەفتە بەرانبەر (٧)ی خزیرانا سالا (٦٣٣) زایینی، و پشتی زانینا ڤان هژماران، و دەمێ ئەم سالان دکەینە ڕۆژ، بۆ مە دیار دبت کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- (٢٢٣٢٩) ڕۆژان ژیایە، و ڤان ڕۆژان دەمێ ئەم دکەینە سالێن قەمەری، دبنە (٦٣) سال و سێ ڕۆژ. ئەڤ ڕەقەم و دیرۆکێن مە دەسنیشانکرین ب ڕێکا نەقل و ڤەگوهاستنێن دورست، و حسێبا فەلەکییان ژی دکەڤنە بەرانبەر ئێک، و خودێ چێتر دزانت کو یا دورستتر دێ ئەو بت.. و ب ڤێ چەندێ دیار دبت کو (١٢) ڕەبیعولئەووەلێ ب دورستی ئەو ڕۆژ نینە یا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا هاتییە سەر دنیایێ، بەلکی ئەو ئەو ڕۆژە یا وی تێدا وەغەر ژ دنیایێ کری.

## عەجێبیێن شەڤا بوونێ:

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل سحارا ڕۆژا دوشەنبێ (٨ / ٩)ی هەیڤا ڕەبیعولئەووەلا سالا (٥٣) بەری مشەختێ، کو دکەفتە بەرانبەر (٢٠ / ٤ / ٥٧١ ز) هاتبوو سەر دنیایێ، و دەمێ ئەم کتێبێن سیرەتێ -یێن کەڤن و یێن نوی- دخوینین، و گوهدارییا گۆتنێن دیرکڤان و نڤیسەران دکەین، ئەم دبینین گەلەک ژ وان -ب تایبەتی ئەوێن مەولوود نڤیسین- زێدە خۆ دوەستین بۆ هندێ دا وان ئەخباران کۆم بکەن یێن بەحسێ (عەجێبیێن شەڤا بوونێ) دکەن، وەکی: هەرفتنا ستوینێن کۆچکا کیسرایی، یان هشکبوونا

ئاڤا گۆلا ساوە، یـان بـوونا وی -سلاڤ لـێ بـن- سونەتکری و نـافکبڕی و ب گرنژین ڤـە.. وهتـد، ژ وان گۆتنـان یـێن ب ڕێکـێن دورسـت و نـەدورست گەهشتینە مە، و یێن عەقل قـەبویل بکـەت و قـەبویل نەکـەت، و یـێن د گـەل علمی و حەتا دینی ژی ڕێ دکەڤن و ڕێ نەکەڤن ژی، هـەر وەکـی وان ب ڤـێ چەندێ دڤێت پێغەمبەرێ مە -سلاڤ لێ بن- ب ڕەنگـەکێ ئەفسـانەیی نیشـا مە بدەن، و مە وە تێ بگەهینن کو ئەو د سەر مرۆڤینییێ ڕا بـوو، لـەو دڤێـت وەکی مرۆڤان هەمییان نەهاتبتە سەر دنیایێ!

ڕاستە ئەو سەیید و سەروەرێ دووندەها ئادەمییە، و خۆشتڤییێ خودایێ عالەمێیە، بەلێ دڤێت ئەم باش بزانین مەزنییا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- ژ هندێ نائێت چونکی شەڤا ئـەو تێدا هاتیـە سـەر دنیـایێ کوچکا کسـرای و نەجاشی هژیا بوو.. یان ئاگرێ مەجووسییان ڤـەمری بـوو.. نـەخێر! و ئـەوێـن باوەری ب موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- ئینای، و سەر و مالێ خۆ گۆری وی کری، وان ئـەڤ چەنـدە نـەکربوو چونکی موحەممـەد -سـلاڤ لـێ بـن- دەمـێ بـووی وەکـی هـەمی بچویکـان نـەدکـرە گـری و ئێکسـەر بـۆ خـودێ چـوو بـوو سـوجوودێ.. نـە، و مـە د چـوو کتێبـێن سـیرەتێ ژی دا نەدیتییـە کـو کەسـەک هاتبتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و باوەری پێ ئینابت چونکی ل شەڤا بوونا وی تشتێن عەجێب چێبووبوون.. ئەگـەر وەسـا بـا مـام و پسـمامێن وی بەری هەمییان دا باوەرییێ پێ ئینن.. مەزنییا موحەممەدی -سلاڤ لێ بـن- ژ وی بەرهەمی دئێت یێ ب گازییـا وی ڤـە هـاتی، ئـەو بەرهـەمێ چـو کـەس تێدا ب خیلاف نەچووینە.

و ئەگـەر خـۆ بـۆ جـەدەل ئـەم بـاوەرییێ ب وان گۆتنـان بینـین ژی یـێن هندەک نڤیسەرێن سیرەتێ ڤەدگێڕن، ژ وان نیشانێن پەردەدڕ یـێن کـو ل شـەڤا بوونـا پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ئاشـکەرا بـووین، دێ بێـژین: ئـەوێن وێ

شەڤێ ئەو نیشان دیتین، نەدزانی ئەڤ نیشانە ژ بەر بوونا وینە، چونکی حەتا پشتی هنگی ب چل سالان ژی بەرێ کەسێ نەکەفتبوو موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- و کەسێ نەدزانی ئەو دێ بتە پێغەمبەر و دێ رویێ دیرۆکێ گوهۆڕت.

پشتی موحەممەد -سلاڤ لێ بن- ب رۆناهییا ئیسلامێ هاتی، و وی گازییا خودێ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ کری، ئەوێن باوەری پێ ئینای، و بەرەڤانی ژێ کری، ل هیڤییا هندێ نەمابوون بیرا خۆ ل وان عەجێبییان بیننە ڤە یێن ل شەڤا بوونا وی چێبووین دا باوەرییا وان موکمتر لێ بت، و ئەوێن باوەری پێ نەئینای ژی مە گوه لێ نەبوویە ئێک ژ وان باوەری ئینا بت ژ بەر وان عەجێبییێن ژێگۆتی یێن کو وان ل وێ شەڤا ئەو تێدا بووی دیتین..

د سەر ڤێ هەمییێ ژی ڕا ئەو شەڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل سحارا وێ د گەل ڕۆناهییا ئەلندێ هاتییە سەر دنیایێ، گەلەک زارۆکێن دی ژی هاتبوونە سەر دنیایێ، و ئەگەر بۆ (موئمنەکی) هەبت وان عەجێبییان (ئەگەر خۆ دڕاست ژی بن) بۆ بوونا وی پال بدەن، بۆ (مونکری) ژی هەیە بێژت: ئەو ژ بەر بوونا ئێکێ دی پەیدا بووینە.. و چاوا حوکم د ناڤبەرا ڤان هەردووان دا دێ ئێتەکرن؟ و ئێک ژ وان دێ دەرکەڤت یێ دورست؟

بەرسڤ: ب وی بەرهەمی یێ موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- و خەلکێ دیتر یێ ل وێ شەڤێ بووین، ل پاش خۆ هێلاین، ل وێ شەڤا موحەممەد -سلاڤ لێ بن- تێدا هاتییە دنیایێ، دنیا هەمی ل هیڤییا وی بوو، و وی ژ ڤێ دنیایێ بار نەکر حەتا شوین تبلێن خۆ ل سەر هەر پەڕەکێ وێ ئاشکەرا هێلاین، و ئەڤ مەزنییە تێرا موحەممەدی هەیە وی بلند بکەت، و هەوجە ناکەت ئەم بۆ وی ل چیڤانۆکان بگەڕییێن دا وی پێ د چاڤێن خەلکی دا مەزن

بکەین. و نیشانا ژ هەمییێ حنێرتر یا ڕاستیا پێغەمبەرینیا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- بۆ خەلکی بەرچاڤ کری، و بوویە ئەگەرا هندێ ژی گەلەک سەرا وێ باوەرییێ پێ بینن، ئەو مزگینی بوون یێن ل نک جوهی و فەلان هەین، یێن ب ئاشکەرایی ژێ دهاتە زانین کو موحەممەد پێغەمبەرە.. حەسسانێ کوڕێ ثابتێ ئەنصاری، ئەوێ حەفت هەشت سالەکان ب عەمری ڤە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مەزنتر، دبێژت: ب خودێ بیرا من دئێت، دەمێ ئەز زارۆک، عەمرێ من حەفت هەشت سال بوون، من گوهـ ل جوهییەکی بوو، چوو سەر گرەکی ل (یەثربێ) و ب هەمی دەنگێ خۆ گازی کرە جوهییان، و پشتی ئەو لێ کۆمبووین، و گۆتینێ: تە خێرە؟! وی گۆتە وان: شڤێدی ستێرا ئەحمەدی ئەوا د گەل وی بووی هەلات.

و زەیدێ کوڕێ عەمرێ کوڕێ نوفەیلی، مامێ عومەرێ کوڕێ خەططابی، ئەوێ بەری هاتنا ئیسلامێ چوویە شامێ دا بۆ خۆ ل دینێ دورست بگەڕییت، و بەری پێغەمبەرینی بۆ پێغەمبەری بێت مری، کوڕێ وی ئوسامە ژێ ڤەدگوهێزت، دبێژت: بابێ من گۆت: ل شامێ زانایەکی ژ زانایێن ئسرائیلییان گۆتە من: ل وەلاتێ تە پێغەمبەرەک یێ دەرکەفتی یان نێزیکە دەرکەڤت، ستێرا وی یا دەرکەفتی، ڤێجا بزڤڕە باوەرییێ پێ بینە، و دویکەفتنا وی بکە.

ژ ڤان هەردو ریوایەتێن دورست دئێتە زانین کو ل شەڤا بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ستێرەک ل عەسمانی پەیدابووبوو، زانایێن جوهی و فەلان پێ دزانی کو پێغەمبەرێ دویماهییا زەمانی هاتە سەر دنیایێ، و چونکی د کتێبێن وان دا هاتبوو کو ئەو پێغەمبەر دێ ژ ناڤ عەرەبان بت، بەرێ وان لێ بوو کانێ کەنگی ئەڤ پێغەمبەری دێ ئێت.. و پشتی هنگی ب چل سالان، دەمێ پێغەمبەرینی بۆ پێغەمبەری هاتی، و وی گازییا خۆ

بەلاڤکری، هژمارەکا وان زانایان (وەکی عەبدللاهێ کورێ سەلامی) باوەری پێ ئینا، و گەلەکان ژی ژ حەسویدی کافری پێ کر.

## جهێ ئەو لێ بووی:

پشتی مە دەمێ بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا کری، مە دڤێت وی جهی ژی ئاشکەرا بکەین یێ ئەو لێ بووی.

گەلەک زانایێن سیرەتێ دبێژت: بوونا وی ل مالا بابێ وی عەبدللاهی بوو ئەوا دکەفتە تەنشت مالا مامێ وی ئەبوو طالبی، ل سەرێ وی گەلی ئەوێ دکەفتە رۆژهەلاتا گرکێ مەروایێ، ئەو گەلییێ دگۆتنێ: گەلییێ هاشمییان؛ ژ بەر کو پتریا مالێن بابکێ هاشمییان ژ قورەیشییان ل وێرێ بووون.

ل ڤێ مالێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مەزن بووبو، و پشتی ئەو مشەختبوویە مەدینێ، ئەو مال بۆ پسمامێ وی عەقیلێ کورێ ئەبوو طالبی مابوو، و دبێژن: عەیالێ وی پشتی وی ئەو فرۆتبوو موحەممەدێ ثەقەفی -براێ حەججاجی-، و ل سەر زەمانێ عەبباسییان دەیکا هاروون ئەلرەشیدی ئەو کڕی و کرە مزگەفت، و نوکە -وەکی زانایێن شوینواران دبێژن- ئەو دکەفتە وی جهی یێ ئاڤاهییێ (پەرتووکخانەیا مەکەهێ) لێ، ل رۆژهەلاتا صەفا و مەروایێ، ل نێزیکی نەفەقێن (محبس الجن).

## راوەستیانەک د گەل مەسەلا مەولیدێ:

و بەری ئەم سوحبەتا بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دوماهی بینین، مە ڤێت راوەستیانەک د گەل مەسەلا گێرانا ئاهەنگان ب هلکەفتنا بوونا پێغەمبەری ل دوازدەی رەبیعولئەوولێ ژ هەر سال مە هەبت، ئەو ئاهەنگێن دبێژنێ: مەولید، کانێ ئەصلەک بۆ ڤێ چەندێ د شریعەتی دا هەیە یان نە؟

و دا کو گوتنا مه گەلەک بەرفرەهـ و درێژ نەبت، ئەم دێ ئاخفتنا خۆ ل دۆر ڤی بابەتی ل سەر ڤان خالێن ژێری لێکڤەکەین:

١- هەمی کەس، خۆ ئەوێن دبێژن: مەولید دورستە ژی، دزانن کو گێرانا ئاهەنگێن مەولیدێ تشتەکە ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابیێن وی نەبوو، بەلکی پشتی وان سێسەد چارسەد سالان ژی ئەو نەبوو، و ئەگەر مە ئەڤ ڕاستییا دیرۆکێ زانی، پسیارەکێ دێ کەین: ئەرێ ئەڤ ئاهەنگێن دئێنە گێڕان کارەکێ باشە یان نە؟

ئەگەر بێژین: ئەو کارەکێ باشە، پسیار ئەڤەیە: پا بوچی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی -خودێ ژێ ڕازی بت- ئەو نەکربوو؟

بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بچتە بەر دلۆڤانییا خودێ، ئایەتەکا پیرۆز بۆ وی هاتبوو خارێ، تێدا خودایێ مەزن دیار کربوو کو ل وێ ڕۆژێ وی دینێ مە بۆ مە تمام کر و پێک ئینا: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴾ (المائدة: ٣) ژ ڤێ ئایەتێ دئێتە زانین کو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ ڤێ دنیایێ وەغەرکری، دینێ ئەو پێ هاتییە فرێکرن پێک هاتبوو و چو یێ ژێ کێم نەبوو، ڤێجا ئەگەر ئەم بێژین: مەولید یان هەر بیدعەیەکا پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرکەفتی پشکەکە ژ دینی، هنگی چو مەعنا بۆ ڤێ ئایەتا بۆری نابت! ژ خۆ ئەگەر ئەم بێژین: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ چەندە دزانی، هنگی دڤێت بێژین وی ژ قەستا ئەو نیشا مە نەدایە.. و ڤێ گۆتنێ کەسەکێ ب عەقل نابێژت.

٢- ئەڤ ئاهەنگێن ب هلکەفتنا مەولیدێ دئێنەکرن، ل ڕۆژا بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نائێنەکرن، چونکی ئەو ل ڕۆژا دوازدەی ڕەبیعولئەووەلێ دئێنەکرن، و بەری نوکە مە ئاشکەرا کر کو پێغەمبەر -سلاڤ

لێ بن- ل وێ ڕۆژێ نەبوویە، بەلکی ئەو ل نەهی رەبیعولئەووەلێ یێ بووی، مەعنا ئەو زەحمەتا ئەو دبەن هەمی د بەر ئاڤێ دا دچت!

٣- تشتەکێ مسۆگەرە کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل دوازدەی رەبیعولئەووەلێ یێ چوویە بەر دلۆڤانییا خودێ، لەو دێ بێژینە وان کەسێن ل ڤێ ڕۆژێ کەیفێ دکەن ب هێجەتا بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: بوچی هوین ب خەم ناکەڤن ژ بەر مرنا وی؟

ئەرێ ئەگەر شاهییەک و بەهییەک د ئێک دەمی دا پێکڤە کۆم ببن، خەلکێ شاهییێ دڤێت خۆ بێ دەنگ بکەن یان ژی بەهیچن؟

٤- دیرۆک بۆ مە ڤەدگێرت کو مەولیدا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئێکەمین جار ل مصرێ دەرکەفتبوو ل سەردەمێ دەولەتا (عوبەیدییان) ئەو هێڤێن جوهییێن ژ درەو دگۆتن: ئەم (فاطمینەی)! ئەو ئێکەمین کەس بوون ئەڤ بیدعە د ناڤ موسلمانان دا دەرێخستی ب هێجەتا هندێ کو ئەو حەز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکەن، و دڤێن قەدرێ وی بگرن. و دیرۆک دبێژت: دەمێ وان دیتی فەلەیێن مصرێ ل ڕۆژا بوونا عیسای -سلاڤ لێ بن- کەیفێ دکەن و ئاهەنگان دگێرن، گۆتن، ما بوچی ئەم ژی ل ڕۆژا بوونا پێغەمبەرێ خۆ -سلاڤ لێ بن- ڤان تشتان ناکەین!

مەعنا وان ئەڤ عەدەتە یێ ژ فەلەیان گرتی!

٥- هندەک کەس دبێژن: هندی ئەم حەز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکەین، مە دڤێت ل ڕۆژا بوونا وی کەیفێ بکەین.. بۆ ڤان کەسان دی بێژین: حەژێکرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تشتەکێ گەلەکێ فەرە، و موسلمان ب دورستی نابتە موسلمان ئەگەر ئەو ژ هەمی تشتان پتر حەز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەکەت، بەلێ حەژێکرن و قەدرگرتنا وی ب هندێ نابت مرۆڤ بیدعەیان ل دینێ وی زێدە بکەت، خودێ فەرمانێ ل پێغەمبەرێ خۆ

دکەت کو بێژتە مە: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ﴾ (آل عمران: ٣١) یەعنی: ئەی پێغەمبەر تو بێژە: ئەگەر هوین حەز ژ خودێ دکەن ل دویڤ من بکەڤن خودێ ژی دێ حەز ژ هەوە کەت، و گونەهێن هەوە ژێ بەت. مەعنا: دویچوونا مە بۆ پێغەمبەری ئەوە ئەم دویکەفتنا وی بکەین د دینێ خۆ دا.

٦- پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گۆتنەکا خۆ دا بەحسێ ڕۆژیيا دوشەنبێ دکەت و دبێژت: ئەو ڕۆژەکە ئەز یێ تێدا بوویم و (وەحی) تێدا یا بۆ من هاتی. و بۆ وان کسان ئەوێن ل سالێ ڕۆژەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل بیرا خۆ دئینن دێ بێژین: ئەگەر ڕاستە هەوە پێغەمبەر دڤێت، ئەڤە ئەو ب خۆ یێ ڕێکێ بۆ هەوە ئاشکەرا دکەت، دەمێ مرۆڤەکی پسیار ژێ کری و گۆتییێ: تو چ دبێژی بۆ ڕۆژیيا دوشەنبێ؟ ل شوینا ئەو بێژتێ: دورستە، وی ئەگەرا دورستبوونێ بۆ دیار کر دەمێ گۆتی: ئەز ل وێ ڕۆژێ یێ بوویم، و یێ لێ هاتیمە هنارتن.

مەعنا قەنجییەکا مەزن د گەل ئوممەتێ ل ڤێ ڕۆژێ یا هاتییەکرن، ئەو ڕۆژا هەر حەفتییێ -نە کو سالێ- جارەکێ دزڤڕت، و بەرانبەر ڤێ قەنجییێ دڤێت هوین سوپاسییا خودێ بکەن و سوپاسییا هەوە دێ ب ڕۆژیگرتنێ بت نە ب چو تشتێن دی.

ئەو کی ژ مەیە دوشەنبیان دگرت ژ بەر حەژێکرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-؟

بۆچی هەمی تشتان ب ناڤێ حەژێکرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەین و ب تنێ وی تشتی نەکەین یێ پێغەمبەری گۆتی؟

ژ ئەڤا بۆری بۆ مە دیار دبت کو دانا مەولیدان ل ڕۆژا بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گێڕانا ئاهەنگ و شەهییانان -ب هەر ناڤ و

هێجەتەكا هەبت- بیدعەیە و كارەكێ نە یێ دورستە و گونەهەكە دڤێت مرۆڤێ موسلمان خۆ ژێ بدەتە پاش، و ل ڤێرێ دێ پارچەكێ ژ گۆتنەكا ئیمام مالكی ل بیرا خۆ ئینین دەمێ دبێژت: ((هەر كەسەكێ بیژت بیدعەیەكا باشا هەی، مەعنا ئەو یێ دبێژت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خیانەت یا كری))!

**پشتەڤانی بوونێ**:

مە گۆت: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل بەری سپێدەیا رۆژا دوشەنبێ نەهی هەیڤا رەبیعولئەووەلێ هاتە سەر دنیایێ، و ب هاتنا وی بەرپەرەكێ نوی یێ گەش ژ دیرۆكا مرۆڤینییێ هاتە ڤەكرن، ئەو ل وی دەمی هات یێ جیهانێ پێتڤی ب هاتنا وی هەی، هات دا ب رۆناهییا ئیسلامێ تارییێن جاهلیەتێ بپژكینت.

مالباتا عەبدلموطەلبی هەمی پێكڤە ل هیڤییا مێڤانێ خۆ یێ نوی بوون، بەرێ وان لێ بوو بویكا وان ئامینایێ كورەك ببت جهێ بابێ خۆ عەبدللاهی بگرت.. هێژ بەری ئەو بێتە دنیایێ مرۆڤەكێ پیرۆز بوو، دەیكا وی د گۆتنەكێ دا بۆ هەڤالەكا خۆ دبێژت: ((كورێ من ئەڤی شولا وی دێ شول بت، دەمێ من هلگرتی و ئەزا پێ گران بارەكێ ژ وی سڤكتر من نەدیت، هێژ نەبووی د خەونێ دا من ددیت رۆناهییەك ژ من ڤەدپەشی قەسرێن شامێ ژ بەر روهن دبوون)).

كانێ چاوا دەیك ل هیڤییا ڤی بچویكێ خۆ یێ خوشتڤی بوو، ئەوێ كو دێ وێ ڤالاتییێ ژ ژینا وێ تژی كەت یا ب مرنا بابێ وی پەیدا بووی، باپیر پتر ل هیڤییێ بوو چونكی هیڤییا وی ئەو بوو نەڤییێ وی جهێ كورێ وی بگرت، ئەو زاڤایێ چوویە وەغەرێ و نەزڤری، لەو دەمێ مزگینییا بوونا نەڤی گەهشتییێ كەیفەكا مەزن بۆ چێبوو.

بەرێ مەکەهییان هەمییان ما ل عەبدلموطەلبی کانێ دێ ناڤێ نەڤییێ خۆ کەتە چ؟ پشتی بوونا وی ب حەفت ڕۆژان باپیرێ وی زەلامێن قورەیشییان ڤەخواندنە مال و خوارنەکا بەرفرەهـ بۆ وان چێ کر، و وی نەڤییێ خۆ سونەت کر و ناڤێ وی کرە (موحەممەد).. و دەمێ هەڤالان پسیار ژێ کری: ئەڤ ناڤە تە ژ کیڤە ئینا، ما بوچی تو ناڤێ ئێک ژ باب و باپیرێن خۆ نادانییە سەر؟ وی گۆتە وان: من ئەڤ ناڤە دانا سەر دا ل عەسمانان و ل عەردی ژی بەحسێ وی ب باشی بێتەکرن.

و پەیڤا (محمد) ب زمانێ عەرەبان بۆ وی کەسی دئێتەگۆتن یێ مەدحێن وی دئێنەکرن، و هەر چەندە ئەڤ ناڤە بەری بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ناڤ عەرەبان دا هەبوو ژی، بەلێ ئەو گەلەک یێ کێم بوو، لەو خەلکێ مەکەهێ ژ ڤی ناڤی حێبەتی مان، بەلێ مەزنێ قورەیشییان ئەو ژ ڤێ حێبەتییێ ئینانەدەر دەمێ گۆتی: من دڤێت خەلکێ عەرد و عەسمانان مەدحەکارێن نەڤییێ من بن!

## د گەل حەلیمایا سەعدی

### داپیرك و دادۆكێن وێ بەرێ حەلیمایێ:

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتییە سەر دنیایێ، دەیکا وی ئامنایێ ئەو هنارتە نک باپیرێ وی، ئەوێ کەیفەکا زێدە بۆ چێبووی، و دبێژن: گاڤا وان ئەو برییە نک باپیرێ وی، باپیرێ وی ئەو برە کەعبێ، و ل وێرێ دوعا بۆ کرن، و بەرانەک پێشڤە کرە خێر، و پشتی هنگی ئەو زڤراندە نک دەیکا وی، چەند ڕۆژەکان ئەو ما ل نک دەیکا خۆ، دەیکا وی شیر ددایێ و ب خودان دکر، پاشی وەسا چێبوو حەلیمایا سەعدی هات و ئەو برە نک خۆ ل دەشتێ؛ دا ب خودان بکەت وەکی دێ بۆ مە ئاشکەرا بت.. و بەری حەلیما وی ببتە نک خۆ، د گەل دەیکا وی چەند ژنکەکان پشکداری د خودانکرن و شیردانا وی دا کر، ژ وان:

**١- بەرەکەیا حەبەشی:**

ئەوا دگۆتنێ: دەیکا ئەیمەنی، و بەری نوکە مە ئاشکەرا کربوو کو ئەو جارییا بابێ وی عەبدللاهی بوو، و پشتی عەبدللاهـ مری ئەو ب میراتگری گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەو ل نک ئامینایێ بوو، و وێ د گەل ئامینایێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب خودان دکر، و پشتی دەیکا پێغەمبەری ئەو دەیکا وی بوو، وێ ئەو ب خودان دکر، و سەخبێرییا وی دکر، و دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مەزن بووی وی ئەو ئازا کر.

ئەو گەهشتبوو ئیسلامێ، و باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینابوو، لەو دئێتە هژمارتن ئێک ژ صەحابییان، شوی ب عوبەیدێ کوڕێ حارثێ خەزرەجی کربوو، و کوڕەک ژێ هەبوو دگۆتنێ: ئەیمەن، ل شەڕێ

حونـەينێ شـەهيد بووبـوو، پاشـی شـوی ب زەيـدێ كـوڕێ حارثـەی كربـوو، و كـوڕەک ژ وی ژی هـەبوو دگـۆتنێ: ئوسـامە، و ئەڤـە ئـەو بـوو يـێ دگـۆتنێ: خۆشتڤییێ پێغەمبەری و كوڕێ خۆشتڤییێ وی.

پێنج هەیڤان پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مابوو زێندی.

## ٢- شيفائا كچا عەوفێ زوهری:

و ئەڤـە مرۆڤـا دەيكـا وی بـوو ژ بـابكێ زوهرييـان، و ئـەو دەيكـا صـەحابییێ ناڤـدار عەبـدررەحمانێ كـوڕێ عـەوفی بـوو، و وێ داپيركييـا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- كربوو دەمێ ئـەو هاتييـە سـەر دنيـايێ. و ژ بلی داپيركییـێ وێ حـەفت ڕۆژان د گـەل دەيكـا وی شـير ژی دابـوويێ، ئـەو ژی گـەهشـتـبـوو ئيسلامێ، و موسلمان بووبـوو، و ئـەو د ژيانـا پێغەمبـەری دا -سلاڤ لێ بن- مربوو.

## ٣- ثوەيبە جارييا ئەبوو لەهەبی:

ئەڤـە جارييـا مـامێ وی ئـەبوو لەهـەبی بـوو، وێ ژی شـير دابـوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و پێغەمبەری هەر وەسا خەديجايێ ژی گەلـەک قـەدرێ وێ دگـرت، و هـاريكارييـا وێ دكر، و جارەكێ خەديجايێ داخواز ژ ئەبوو لەهەبی كر كو ئەو وێ بفرۆشتێ، بەلێ ئەو ل بەر نەهات[1].

---

(١) ذەهـەبـی ڤێ چەندێ ژ واقدی ڤەدگوهێزت (بڕێنە: سير أعلام النبلاء ٢ / ٦٥) و د گەلـەک ژێدەران دا هاتییە (و مە ژی ئەڤ چەندە د چاپا بەری نوكە دا ژ ڤێ كتێبا خۆ ڤەگوهاستبوو) كو ل ڕۆژا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا هاتییە دنيايێ ثويبەيێ مزگينییا بـوونـا وی دا مـامـێ وی (أبو لهب)ی، ئينا وی ژ كەيفان دا ئەو ئازا كر. بەلێ پشتی هنگی بۆ مە ئاشكەرا بوو كو ئەو گۆتن يا دورست نينە؛ ژ بەر كو ئەو هەر مابوو جاريە ل نک ئەبوو لەهەبی حەتا ب ناڤ سال ڤە چووی، هنگی ژ نوی ئەبوو لەهەبی ئەو ئازا كربوو، وەكی د ريوايەتێن دورست دا هاتی.

پشتی پێغەمبەر مشەختبوویە مەدینێ ژی وی گەلەک جاران دیاری و هاریکاری بۆ وێ دهنارتنە مەکەهێ. و ل سالا (٧) مشەختی ئەو ل مەکەهێ مربوو، و وێ شیر دابوو حەمزەی ژی، و خیلاف د ناڤبەرا دیرۆکزانان دا چێبوویە کانێ ئەو موسلمان بووبوو یان نە.

## دادۆکێن سەعدییان ل مەکەهێ:

عەدەتەکێ خەلکێ مەکەهێ ل وی سەردەمی هەبوو، ئەو ژی ئەڤە بوو وان بچویکێن خۆ یێن ساڤا بەرانبەر هندەک مالی ددانانە نک خەلکێ دەشتێ؛ دا ئەو وان ب خودان بکەن، و ئارمانجا مەکەهییان ژ ڤێ چەندێ ئەو بوو زارۆکێن وان فێری سویاری و زیرەکی و ئەزمانەکێ ڕەهوان ببن، ژ بەر ڤێ چەندێ هەر سال هژمارەکا ژنکێن دەشتێ (بادییێ) بەر ب مەکەهێ ڤە دهاتن، و هەر ئێک لێ دگەڕیا زارۆکەکێ قورەیشی د گەل خۆ ببەت، و ئەو ژنکێن بەردەستێ وان تەنگ پتر ئەڤ کارە دکر.

ل وێ بەڕیا دکەفتە ڕۆژهەلاتا مەکەهێ، ل دەور و بەرێن حودەیبییێ، ئویجاخا سەعدییان ( و ئەو چەقەکێ عەشیرەتا هەوازن بوو) ب کۆچەری دژییان، و ل وێ سالا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا هاتییە سەر دنیایێ، کو سالا (٥٧١) زایینی بوو، هشکاتی ل دەڤەرا وان پەیدا بووبوو، و نێزیک بوو هەیڤا نیسانێ ژی ب دویماهی بێت بێی باران بێن و گیا شین ببت، لەو هژمارەکا ژنکێن سەعدییان خۆ دانە ئێک و قەستا مەکەهێ کرن، دا هەر ئێک ژ وان زارۆکەکی د گەل خۆ بینت، بۆ خودانکرنێ، و هندەک مالی بۆ خۆ ژ مرۆڤێن وان وەرگرن.

## د گەل حەلیمایا سەعدی:

ئێک ژ وان ژنکان حەلیمایا کچا عەبدللاهێ کوڕێ حارثێ کوڕێ سەعدی بوو، حەلیما ژنکا حارثێ کوڕێ عەبدلعوززایێ کوڕێ رفاعەیێ

هەوازنی بوو، حەلیمایێ کوڕەک و دو کچەک هەبوون: عەبدللاهـ و ئەنیسا و خوذامە و خوذامە ئەوە یا ب ناسناڤێ (الشیماء) دئێتە نیاسین.

حەلیما بەحسێ ڤێ هاتنا خۆ بۆ مەکەهێ دکەت، و دبێژت: سالەکێ گرانی ب سەر مە دا هات، و عەرد هشک و زوها بوو، ئەم دەهـ ژنک ژ ئویجاخا سەعدییان هاتینە مەکەهێ دا هەر ئێک ژ مە زارۆکەکی بۆ خۆ ببەت ب خودان بکەت بەرامبەر مالەکی.. دەمێ ئەم گەهشتینە مەکەهێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆ مە هەمییان هاتە پێشکێشکرن؛ دا ئێک ژ مە وی د گەل خۆ ببەت، بەلێ کەس ژ مە پێ نەهاتە دەر؛ چونکی ئەو زارۆکەکێ ئێتیم بوو، و مە دڤیا ئەو زارۆکێ ئەم ببەین یێ ب باب بت؛ دا بابێ وی مالەکێ باش بدەتە مە.. پاشی هەڤالێن من هەر ئێکێ زارۆکەک ب دەست کەفت، و ئەز مامە وەسا، پشتی من زانی چو زارۆک ب دەست من ناکەڤن ئەز جارەکا دی ل پێغەمبەری زڤڕیم و من ئەو ژ باپیرێ وی وەرگرت. هەر ژ ڕۆژا ئێکێ پیێێ ڤی زارۆکی بۆ مە پیێێ خێرێ بوو، هەر چەندە ئەو سال سالەکا هشک ژی بوو، بەلێ پشتی مە ئەو د گەل خۆ ئینای، خودێ بەرەکەت هاڤێتە تەرش و دەرامەتێ مە.. کوڕێ من ئەڤە نە وەکی چو زارۆکان بوو، بەرەکەتێن وی ل سەر مە زێدە بوون، و ئەو ب ڕەنگەکێ نەعەدەتی مەزن دبوو، دەمێ ژییێ وی بوویە دو سال تە دگۆت: ئەو زارۆکەکێ چار سالییە...

### ڤەکرنا سنگێ وی:

پشتی هەر دو سالێن دادۆکییا وێ ب دویماهی هاتین، حەلیمایێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ڤەگەڕاندە مەکەهێ ل نک دەیکا وی، بەلێ هندی هند ئەو زارۆکەکێ پیرۆز بوو، و ژ بەر وێ بەرەکەتا ب هاتنا وی گەهشتییە مالا حەلیمایێ، وێ داخواز ژ دەیکا وی کر کو ئەو دەستویرییێ بدەتێ دا ئەو

بچویکێ وێ جارەکا دی د گەل خۆ ببت. حەلیما دبێژیت: پشتی مە دوبارە ئەو زڤڕاندیە مالا خۆ، چەند هەیڤەکان ئەو ل نک مە ما، ڕۆژەکێ ئەو و برایەکێ خۆ یێ شیری ل پشتا مالان بوون هندەک کارک دچەراندن، مە هند دیت برایێ وی ب غار هات و هەوار هەوارا وی بوو، دگۆت: دو زەلامێن جلک سپی برایێ من یێ قورەیشی بر درێژ کرە ئاخێ و سنگێ وی کەرکر.

حەلیمایێ گۆت: ئەز و بابێ وی -ئانکو زەلامێ حەلیمایێ- ب لەز د هەوارێ چووین، دەمێ ئەم گەهشتینێ مە دیت ئەو یێ ژ پێیان ڤە بوو و ڕەنگێ وی هاتبوو گوهارتن، بابێ وی ئەو دا بەر سنگێ خۆ و گۆتێ: تە خێرە کوڕێ من؟

وی گۆت: دو زەلامێن جلک سپی ئەز برم درێژ کرمە عەردی، سنگێ من ڤەکر و تشتەک ژێ ئینا دەرێ و هاڤێت، پاشی سنگێ من دوری ڤە[1].

دەمێ ڤێ سەرهاتییێ ڕویدای، زەلامێ حەلیمایێ گەلەک ترسییا لەو گۆتە ژنکا خۆ: ئەز دترسم تشتەک ل ڤی کوڕکی بێت، و ئەم شەرمزار ببین، یا باش ئەوە تو وی بزڤڕینییە نک مرۆڤێن وی، ئەگەر تشتەک لێ بێت ژی بلا ل مالا وان لێ بێت.

حەلیما دبێژت: ترسا من ژی ژ وێ ترسێ بوو، لەو ئەز ڕابووم من پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زڤڕاندە نک دەیکا وی، دەیکا وی ئەڤ چەندە ب غەریبی ڤە وەگرت و گۆت: بەری چەند هەیڤەکان داخوازا تە ئەو بوو تو کوڕێ من د گەل خۆ ببەی، چ قەومی حەتا تو ب ڤی ڕەنگی بێیە گوهارتن؟

حەلیمایێ گۆت: نە، چو نەقەومییە، بەلێ هندە ئەو مەزن بوو، و مە یا ل سەر خۆ کر، بەلێ دەیکا وی ب ڤێ گۆتنێ قانع نەبوو، و هنگی ئەو

---

(١) ئیمامێ موسلم د حەدیسەکێ ژ ئەنەسی ڤەدگوهێزت، دبێژت: جهێ وێ دورینێ من ل سنگێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ددیت. یەعنی: شوینا وێ لێ مابوو.

ڕاوستیا حەتا حەلیمایێ چیرۆکا ڤەکرنا سنگێ وی بۆ وێ ڤەگێڕای. ئامینایێ گۆتێ: نەترسە، شەیطان نشێتە کوڕێ من، کوڕێ من ئەڤی شولا وی دێ شول بت، دەمێ من ئەو هلگرتی، و ئەزا پێ گران، بارەکێ ژ وی سڤکتر من نەدیت، هێژ ئەو نەبووی د خەونێ دا من ددیت ڕۆناهییەک ژ من ڤەدپەشی قەسرێن شامێ ژ بەر ڕۆهن دبوون.

## زڤڕینا وی ﷺ بۆ نك دەیکا وی ﷺ:

ب ڤی ڕەنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زڤڕی مەکەهێ ل نک دەیکا خۆ پشتی ئەو پتر ژ دو سالان مایە ل دەشتێ ل ناڤ ئویجاخا سەعدییان.. ل وی جهێ ناڤدار ب زیرەکی و ئەزمان رەهوانییێ، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل نک وان فێری ئەزمانەکێ ڕەهوان بوو، و هەردەم وی شانازی ب ڤێ چەندێ دبر، و دگۆتە هەڤالێن خۆ: ئەزمانێ من ژ یێ هەوە هەمییان ڕەهوانترە، ئەز یێ قورەیشیمە، و ئەز د ناڤ سەعدییێن بەکری دا یێ هاتیمە ب خودانکرن.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەنجییا ڤێ ژنکا ئەو ب خودانکری و یا ئویجاخا وێ ژ بیر نەکر، لەو ل سالا هشتێ مشەختی دەمێ وی مەکەهـ ژ دەستێ کافران دەرێخستی، و شەڕەکێ گران د ناڤبەرا وی و هەوازنییان دا ل نهالا حونەینێ چێبووی، و شەش هزار ئێخسیر ژ ڤێ ئویجاخێ کەفتینە دەستێ موسلمانان، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا ئێخسیرێن وان هەمی بێنە بەردان. وەکی دێ بەحس ژێ کەین دەمێ ئەم دگەهینە بەحسێ سەرهاتییا شەڕێ حونەینێ، ئەگەر خودێ حەز بکەت.

خودێ خێرا حەلیمایا سەعدی ڤیابوو، لەو ژییێ وێ درێژ کر حەتا ئەو گەهشتییە زەمانێ هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و وێ باوەری پێ

ئینا، و دەمێ ئەو دهاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، پێغەمبەری قەدرەکێ مەزن بۆ دگرت.

ئەبوو طوفەیل دبێژت: ڕۆژەکێ من پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دیت ژنکەک هاتە نک، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەبایێ خۆ بۆ رائێخست دا ل سەر ڕوینت، من پسیار کر: ئەڤە کیژ ژنکە؟ گۆتن: ئەڤە دەیکا وییە، ئەوا شیر دایێ[1].

---

(١) ئەبوو داوود ڤێ حەدیسێ ڤەدگوهێزت.

# مرنا دەیکا وی و باپیرێ وی

**مرنا دەیکا وێ**:

پشتی چەند سالەکان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مایە ل دەشتێ ل نک دەیکا خۆ یا شیری حەلیمایا سەعدی، ئەو زڤڕی مەکەهێ ل نک دەیکا خۆ یا ژ ڕاستی، ل نک دەیکا خۆ و ل بن چاڤدێرییا باپیرێ خۆ ئەو هاتە پەروەردەکرن، و ژ بەر کو هنگی خواندن و نڤێسین د ناڤ خەلکێ مەکەهێ دا یا بەلاڤ نەبوو، عەدەتێ خەلکی نەبوو بچویکێن خۆ بدانن بەر خواندن و نڤیسینێ بکەن، لەو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مەزن بوو بێی فێری خواندن و نڤیسینێ ببت، و حەتا وی ژ دنیایێ وەغەرکری ژی وی خواندن و نڤیسین نەدزانی، و ئەگەر نەخواندەڤانی بۆ مرۆڤی کێماسی بت، ئەو بۆ وی جهێ شانازییێ بوو، چونکی ئەو دەلیلەکێ ئاشکەرا بوو ل سەر ڕاستگۆییا وی د وێ گازییێ دا یا ئەو پێ هاتییە هنارتن.. خودایێ مەزن د ئایەتەکێ دا بێژت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَمِنْ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ (العنكبوت: ٤٧-٤٨)

یەعنی: کانێ چاوا مە کیتاب بۆ وان پێغەمبەران ئینان یێن بەری تە -ئەی پێغەمبەر- هاتین، وەسا مە ئەڤ کیتابە بۆ تە ئینا خوارێ یا کو کیتابێن بەری خۆ ڕاستگۆ دەردئێخت، ڤێجا ئەوێن مە کیتاب بۆ ئینایە خوارێ ژ ئسرائیلییان و وان کیتاب ب دورستی زانی ئەو باوەرییێ ب قورئانێ دئینن، و ژ ڤان عەرەبێن قورەیشی و یێن دی ژی هەیە یێ باوەرییێ پێ بینت، و ژ کافران پێڤەتر کەس د ڤێ قورئانێ و هێجەت و دەلیلێن وێ دا

ناکەفتە گومانێ، و کوفرێ پێ ناکەت. و ژ موعجزەیێن تە یێن ئاشکەرا -ئەی پێغەمبەر- ئەڤەیە: بەری ئەڤ قورئانە بۆ تە بێت نە تە چو کیتاب خواندینە ونە تە چو حەرف ب دەستێ خۆ نڤیسینە، و ئەو ڤێ چەندێ دزانن، و ئەگەر بەری وەحی بۆ تە بێت تو یێ خواندەڤان بای یان تە نڤیسین کربا هنگی یێن نەحەق دا کەڤنە گومانێ، و دا بێژن: وی ئەڤە ژ کیتابێن بەرێ یا وەرگرتی.

بۆ دەمەکێ نە یێ درێژ ڤێ ژینا ب خۆشی و تەنا یا پێغەمبەری د هەمبێزا دەیکا وی دا ڤەکێشا، هەر وەکی خودایێ مەزن دڤیا رۆژ بۆ رۆژێ دلێ پێغەمبەرێ خۆ پتر نازک بکەت دا ب کێر شڤانییا ئوممەتێ بێت، و ئەو بوو ل سالا ٥٧٧ زایینی دەمێ ژییێ پێغەمبەری گەهشتییە شەش سالییێ دەیکا وی ئەو د گەل خۆ بر و ب سەرەدان چوونە باژێرێ مەدینێ ل نک خالێن باپیرێ وی ژ بەنی نەجارییان، ئەوێن ئاخا بابێ وی عەبدللاهی کەتییە د ناڤ وان دا، و ل نک وان مری.

د ڤێ سەفەرێ دا جارییا وان بەرەکەیا حەبەشی ژی د گەل وان بوو، و پشتی ئەو هەیڤەکێ مانە ل مەدینێ، و سەرا قەبرێ عەبدللاهی دای، وان رێکا زڤرینێ گرت، و گاڤا ئەو گەهشتینە وی گوندێ دبێژنێ: (ئەبواء)[1] دەردێ مرنێ جارەکا دی کاشۆیێ خۆ ل دلی دا، و ڤێ جارێ ئەو سێوی کر، دەیکا وی ل وی جهی، ل بەر چاڤان وەغەرکر، و ئەو هێلا بێ خودان د دەستێ جارییێ دا. و مرنا دەیکێ دنیا د چاڤێن زارۆکێ ئێتیم دا تاری کر، چونکی ئەو نە ب تنێ دەیکا وی بوو، بەلکی بابێ وی ژی بوو، یان دنیایا وی هەمی بوو، لەو خۆ پشتی ئەو مری ژی دیمەنێ وێ ژ بەر چاڤان نەدچوو، مرنا دەیکێ برینەکا کویر د دلێ وی دا پەیدا کر، برینەکا

---

(١) ئەبواء گوندەکە دکەفتە باشوورێ مەدینێ، د ناڤبەرا وی و مەدینێ دا (٢٣) میلن.

وەسا یا پشتی هنگی ب نێزیکی پێنجی سالان ژی خۆ نەدایە ئێک، ئەبوو هوریرە دبێژت: جارەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هندەک هەڤالێن خۆ بوو، وان هند دیت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەستا شوینوارێ قەبرەکی کر، ل هنداڤ سەری روینشت، بێنەکێ ما پاشی گری و گری حەتا هەڤالێن خۆ ژی هەمی گراندین، پشتی پسیار ژێ هاتییەکرن: ئەڤە قەبرێ کێیە، وی گۆت: ئەو قەبرێ ئامینایا کچا وەهەبییە.. من دەستویری ژ خودایێ خۆ خواست کو ئەز سەرا قەبرێ دەیکا خۆ بدەم، وی دەستویری دا من، و من ژێ خواست ئەو دەستویرییێ بدەتە من دا ئەز دوعایان بۆ وێ بکەم، وی دەستویری نەدا من[1].

د ریوایەتەکا دی دا هاتییە: رۆژەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چۆ سەر قەبرەکێ کەڤن، روینشتە خوار، هەڤالێن وی ژی ل دۆرا روینشتن، گۆت: مە دیت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرێ خۆ هەژاند تو دا بێژی ئێکێ د گەل وی دئاخڤت، پاشی کرە گری، ئینا عومەری پسیار ژێ کر: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بۆچی تو دگری؟ وی گۆت: ئەڤە قەبرێ ئامینایا کچا وەهەبییە، من ژ خودێ خواست ئەو بهێلت ئەز سەرا قەبرێ وێ بدەم وی دەستویری دا من، و من ژێ خواست ئەو دەستویری یێ بدەتە من ئەز دوعایان بۆ وێ بکەم، وی دەستویری نەدا من، ڤێجا دلێ من ما پێڤە لەو گرییا من هات[2].

و هندەک زانایێن تەفسیری دبێژن: ل وی دەمی ئەڤ ئایەتا پیرۆز هاتە خوارێ: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ ﴾ (التوبة:١١٣) یەعنی: نەبوویە بۆ موحەممەد پێغەمبەری و بۆ ئەوێن باوەری ئینای کو داخوازا ژێبرنا

---

(١) موسلم ژێ ڤەدگوهێزت.

(٢) بەیهەقی ژێ ڤەدگوهێزت.

گونەهان بۆ بوتپەرێسان بکەن، ئەگەر خۆ ئەو مرۆڤێن وان یێن نێزیک ژی بن، پشتی کو ئەو ل سەر شرک و صەنەمپەرێسییێ مرین، و بۆ وان ئاشکەرا بووی کو ژ بەر مرنا وان ل سەر شرکێ ئەو جەهنەمینە، و خودێ گونەهێ بۆ بوتپەرێسان ژێ نابەت. پشتی دەیکا وی ل ڤی جهی مری، ئەو هەر ل وی جهی هاتە ڤەشارتن ژی، و پشتی هنگی بەرەکەیا حەبەشی (دەیکا ئەیمەنی) دەستێ وی گرت و ئەو زڤراندە مەکەهێ ل نک باپیرێ وی.. و ژ وێ رۆژێ وەرە دەیکا ئەیمەنی بۆ وی بوو دەیک!

## ل نك باپيرێ خۆ عەبدلموطەلبی:

پشتی دەیکا وی نەمای، باپیرێ وی ئەو برە نک خۆ، دا ب رەنگەکێ ئێکسەر چاڤدێرییێ لێ بکەت، و باپیرێ وی ئەوێ ژییێ وی هنگی گەهشتییە حەشتێ سالییێ و کۆرە بووبوو، پویتەیەکێ زێدە پێ دکر دا ئەو هەست ب بێ خودانییێ نەکەت، حەتا دبێژن: وی قەدرێ نەڤییێ خۆ پتر ژ هەمی کورێن خۆ دگرت.. و جارییا وان (أم أيمن)ێ ل ڤی دەمی جهێ دەیکا وی گرتبوو، و ئەو پەروەردە دکر، حەتا فاما بووی.. ب ڤی رەنگی و بۆ دەمێ دو سالان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ما ل نک باپیرێ خۆ، پشتی دو سالان باپیرێ وی یێ حەشتێ و دو سالی ژی مر، و هنگی ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەشت سال بوون.

بەری باپیرێ وی عەبدلموطەلب بمرت، وی ئەو ئێمانەتی کورێ خۆ ئەبوو طالبی کر، و داخواز ژێ کر ئەو باش چاڤێ خۆ بدەتێ، و ئەبوو طالبی سۆز ب ڤێ چەندێ دا وی، و سۆزا خۆ ب جه ئینا ژی، و حەتا رۆژا دووماهییێ د ژییێ خۆ دا، وی بەرەڤانی ژێ کر و ئەو پاراست. و بەلکی هلبژارتنا عەبدلموطەلبی بۆ ئەبوو طالبی ژ ناڤبەرا هەمی کورێن خۆ ژ بەر هندێ بت چونکی دەیکا ئەبوو طالبی و عەبدللاهی ئێک بوو.

## ل نك ئەبوو طالبی

پشتی باپیرێ وی عەبدلموطەلبی ئەو ئێمانەتی کورێ خۆ ئەبوو طالبی کری، ئەبوو طالبی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- برە نک خۆ ل مالا خۆ، و ئەبوو طالبی سەر خاترا بابێ خۆ و برایێ خۆ، زێدە حەز ژ برازایێ خۆ کر و گەلەک قەدرێ وی گرت، حەتا ب شەڤێ وی ئەو ل بەر تەنشتا خۆ دنڤاند، و هەر جارەکا ئەو روینشتبا سەر سفرا خوارنێ بەری هەر تشتەکی وی ب دەستێ خۆ خوارن ددایێ، و ڤیانا مامێ وی بۆ وی هند بوو هەردەم وی ئەو ب پێش کورێن خۆ دئێخست.

و هەر چەندە ئەبوو طالب مرۆڤەکێ عەیال بۆش بوو و بەردەست تەنگ ژی بوو، بەلێ وی ئەو ب تازەیی ب خودان کر، و نەهێلا چو کێماسی بگەهنێ، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب چاڤێ رێز و قەدرگرتنێ بەرێ خۆ ددا مامێ خۆ، و زێدە حەز ژێ دکر.

### شڤانی و بازرگانی:

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چەندەکێ فاما بووی، و وەک هاریکارییەک ژ لایێ وی ڤە بۆ مامێ وی، دەمەکی وی شڤانی ب پارە بۆ خەلکێ مەکەهێ کر، و ئەو ب خۆ بەحسێ ڤێ چەندێ بۆ مە دکەت، دەمێ دبێژت: خودێ پێغەمبەرەک نەهنارتییە ئەگەر شڤانییا پەزی نەکربت. هەڤالێن وی گۆتێ: تە ژی شڤانی کرییە؟ وی گۆت: بەلێ، من بەرانبەر هندەک قیراطان شڤانی بۆ خەلکێ مەکەهێ دکر[1].

---

(١) بوخاری و ئبن ماجە ژێ ڤەدگوهێزن.

و قیراط پارەیەکێ کێمە، هویردەیێ دیناری یان دەرهەمییە، مەخسەد پێ ل ڤێرێ بهایەکێ کێمە، و ئەڤ گۆتنە ژ لایەکی ڤە (تەواضوعا) پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا دکەت، چونکی ئەو هندێ دگەهینت کو ئەو ب فەقیری یێ مەزن بووی، و ژ لایەکێ دی ڤە کارێ وی د شڤانییێ دا ئەو فێری صەبرێ و بێنفرەهییێ کر، دا ئەو بشێت پشتی هنگی شڤانییا ئوممەتێ بکەت. و ئاشکەرایە کو خودێ حکمەتەک د هندێ دا هەبوو کو هەر ژ دەسپێکێ ئەو پەرداغەکێ تژی ژ دەردێ ئێتیمی و سێویاتییێ و هەژارییێ بدەتە پێغەمبەرێ خۆ یێ دوومـاهییێ، دا ئەو ل سەر ئیرادەیەکا ب هێز پەروەردە ببت، پتر پال بدەتە سەر خۆ، د گەل هەبوونا دلەکێ نازک یێ هەست ب خەم و ئازارێن هەژار و بێ خودانان بکەت.

و هەر چەندە ئەوبوو طالب، وەکی بابێ خۆ عەبدلموطەلبی، و ئویجاخا وی، صەنەم دپەرێسین، و وی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پشتی هەشت سالییێ ب خودان کر، بەلێ پێغەمبەر -ژ لایێ خودایێ وی ڤە- یێ پاراستی بوو ژ کرێتی و کێماسییێن جاهلییەتێ ئەوێن ل نک مللەتێ وی هەین، وەکی صەنەمپەرێسییێ و ڤەخوارنا مەیێ و خوارنا رییایێ و کرنا فاحیشێ.. وهتد، و ژێ دئێتە ڤەگوهاستن کو هێشتا ژ زارۆکینییا خۆ وی پشکدارییا قورەیشییان د رێ و رەسمێن وان یێن دینی دا نەدکر، و ل ئاهەنگێن وان ئامادە نەدبوو، و خۆ ل دەمێ ئەو ب کرنا حەجێ ژی رادبوو -بەری ببتە پێغەمبەر- شەڤا عەرەفێ ئەو د گەل خەلکی د چوو ل عەرەفێ رادوەستییا، و نەدما ل موزدەلیفێ، و هنگی عەدەتێ قورەیشییان بوو، بۆ خۆجوداکرن ژ خەلکی ئەو دمانە ل موزدەلیفێ و نەدچوونە عەرەفێ.. مەخسەد پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ لایێ خودایێ خۆ ڤە یێ پاراستی بوو ژ هەر عەدەتەکێ جاهلی یێ پەیوەندی ب دینی ڤە هەی..

و هەر ژ بچویکاتی ئەو ب ڕاستگۆیی و دەستپاکییێ هاتە نیاسین، لەو هەر زوی خەلکی ناسناڤێ (الصادق الأمین) دانا سەر.

**ل نك بەحیرایێ راهب:**

دەمێ ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بوویە نەهـ سال، یان دوازدە سال، ل دویڤ گۆتنەکێ، مامێ وی ئەبوو طالبی ڤیا د گەل کاروانێ قورەیشییان دەرکەفتە شامێ بۆ بازرگانی، و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خۆ ب وی ڤە گرت، و گۆتێ: ئەز ژی دێ ئێم.. و چونکی وی حەز نەدکر دلێ برازایێ خۆ بهێلت، وی ئەو د گەل خۆ برە شامێ.

بەری ئەو بگەهنە دیمەشقێ، ل بازێرکێ (بوصرایێ) دەمەکی ئەو ڤەمان، و ل دەور و ڤی بازێرکی دێرەکا کەڤن و ڤەدەر هەبوو قەشەیەکێ زانا و ناڤدارێ فەلەیان لێ دژیا، ناڤێ وی د ریوایەتێن دورست دا نەهاتییە، بەلێ د هندەک ریوایەتێن لاواز دا هاتییە کو ناڤێ وی بەحیرا یێ راهب، ڤی قەشەیی د گەل هندەک هەڤال و دویکەفتییێن خۆ پەرستنا خودێ ل ڤێ دێرێ دکر، و قورەیشی ئەوێن د رێکا خۆ دا بۆ شامێ د بەر ڤێ دێرێ ڕا دبۆرین، گەلەک جاران ل نک دێرێ بێنا خۆ ڤەددا، و ژ بەر موژیلییا قەشەیێ مەزن گەلەک جاران ئەو ل وان دەرنەدکەفت، ڤێ جارێ وەسا چێبوو چاڤێ قەشەیێ مەزن ب وان کەفت دەمێ ئەو هاتین و بارێ خۆ ل نک دێرێ دانای.. ل ڤێرێ دو ریوایەتێن دورست هەنە، ئێک ب کورتی سەرهاتییێ ڤەدگێڕت، و ئێک ب بەرفرەهی، یا کورت کو ریوایەتا ئەبوو مجلزێ تابعییە[1]، دبێژت: گاڤا قەشەی ئەو دیتین، ب نک وان ڤە چوو و گۆت: زەلامەکێ چاکێ

---

(١) ئبن سەعد د (الطبقات) دا ژێ ڤەدگوهێزت، و هەر چەندە ئەو یا (مورسەلە) ژی بەلێ سەنەدا وێ یا دورستە.

د ناڤ هەوە دا هەی، وان گۆت: د ناڤ مە دا هەیە یێ مێڤانی دحەوینت و ئێخسیری بەرددەت و چاکییێ دکەت.. وی گۆت: زەلامەکێ چاکێ د ناڤ هەوە دا هەی.. پاشی ئەو چوو ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕاوەستیا، و گۆت: کانێ بابێ ڤی زارۆکی؟ هندەکان ئیشارەت کرە ئەبوو طالبی و گۆتێ: ئەڤە خودانێ وییە.. ئینا ئەو ب نک ئەبوو طالبی ڤە چوو و گۆتێ: ڤی زارۆکی بپارێزە، و نەبە شامێ، جوهی دحەسویدن، و ئەز دترسم تشتەکی لێ بکەن. ئەبوو طالبی گۆتێ: نە تویی وە دبێژی، بەلکی خودێیە وە دبێژت. و ل وێرێ ئەبوو طالبی ئەو زڤراند.

ژ ڤێ ریوایەتێ ئاشکەرا دبت کو ڤی قەشەیێ زانا هندەک نیشان ل نک ڤی زارۆکی دیتن ژێ زانی کو ئەو دێ ئەو پێغەمبەر بت یێ بەحسێ وی د تەوراتێ و ئەنجیلێ دا هاتی، و گاڤا جوهییان ئەو دیت و نیاسی، و زانی کو ئەو نە ژ ئسرائیلییانە، دویر نینە ئەو وی بکوژن، لەو وی گۆتە مامێ وی: ڤی زارۆکی بزڤڕینە ڤە، و مامێ وی ب گۆتنا قەشەی کر و ئەو زڤڕاند، چونکی ئەو ل وێ باوەرێ بوو کو قەشە ژ نک خۆ نائاخڤت.

بەلێ ئەو نیشانێن قەشەی دیتین چ بوون؟

ئەڤە د ریوایەتا دی دا هاتییە یا بەرفرەهـ ئەوا ئەبوو مووسایێ ئەشعەری ڤەدگوهێزت، و تێدا هاتییە[1]:

گاڤا قەشەی ئەو دیتین، د ناڤ وان دا هات و چوو، و باش د وان فوکری، حەتا هاتییە ڕاستا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستێ وی گرت و گۆت: ئەڤەیە پێغەمبەرێ خودێ، خودێ وی بۆ خەلکی دهنێرت رەحم و دلۆڤانی.. هندەک زەلامێن قورەیشی گۆتێ: تە چاوا زانی؟ وی گۆت: دەمێ هوین ژ گەلی هاتینە خوارێ دارەک و بەرەک نەما ئەگەر نە چەمیا بت، و بۆ

(١) ترمذی و حاکم ژێ ڤەدگوهێزن.

پێغەمبەرەکی نەبت ئەو خۆ ناچەمینن، و ئەز وی ب نیشانا پێغەمبەرینییێ دنیاسم، یا ب ناڤ ملێ وی ڤە هەی.

پاشی قەشە زڤری دێرێ و خوارنەکا بەرفرەهـ چێ کر، و کاروانێ قورەیشییان هەمی ڤەخواندن، گاڤا وان پێغەمبەر ئینای و وی چاڤدێری ل حێشتران دکر، هات و عەورەک ل هنداڤی وی بوو، گاڤا ئەو نێزیکی وان بووی قەشەی گۆتە وان: بەرێ خۆ بدەنێ، عەورەکێ ل هنداڤ وی! و دەمێ ئەو گەهشتی زەلام ل بەر سیبەرا دارەکێ روینشتبوون، ئەو ل وێڤەتر روینشت، سیبەرا دارێ ب نک وی ڤە چوو، ئینا قەشەی گۆتە وان: بەرێ خۆ بدەنێ سیبەرا دارێ ب نک وی ڤە چوو..

پشتی ڤێ چەندێ ئەو قەشە ما ب ئەبوو طالبی ڤە حەتا وی ئەو زڤراندییە ڤە.

ژ ڤێ ریوایەتێ دئێتە زانین کو خۆچەماندنا دار و بەران، و هاتنا عەوری ل هنداڤ سەرێ پێغەمبەری، و زڤرینا سیبەرا دارێ ل وی، د گەل ختما پێغەمبەرینییێ ئەوا ب ناڤ ملان ڤە.. ئەو نیشان بوون یێن قەشەی ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیتین.

و مەسەلا ئاگەهداربوونا زانایێن ئسرائیلییان ب پەیدابوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب رێکا هەلاتنا ستێرا وی، ئەڤە تشتەکێ بەلاڤبوو ل وی دەمی، وەکی ژ وێ سەرهاتییێ دیار دبت ئەوا حەسسانێ کورێ ثابتێ ئەنصاری بەحس ژێ دکەت، و بەری نوکە مە ئەو ڤەگوهاستبوو دەمێ مە بەحسێ بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری، هەر وەسا ئەو ژ سەرهاتییا موسلمانبوونا سەلمانێ فارسی ژی ئاشکەرا دبت[1]، و پەیدابوونا هندەک

---

(١) هەچییێ بڤێت دشێت ڤێ سەرهاتییێ ب بەرفرەهی د کتێبا مە (چیرۆک و دیرۆک) دا بخوینت.

کارێن نەعەدەتی یێن دبێژنێ: موعجزە، د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هێشتا بەری ئەو ببتە پێغەمبەر، ئەڤە تشتەکێ ثابتە ب رێکا حەدیسێن دورست، وەکی وێ حەدیسا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا دبێژت: ئەز بەرەکی دنیاسم سلاڤ ددا من بەری ئەز ببمە پێغەمبەر، ڤێ گاڤێ ئەز وی بەری دنیاسم[1].

و ژ ریوایەتا ئێکێ دئێتە وەرگرتن کو دەمێ قەشەی -بەحیرای- گۆتییە ئەبوو طالبی: وی بزڤرینە ڤە، دا جوهی چو نەخۆشییان نەگەهیننێ.. ئەبوو طالبی ئێکسەر باوەر ژ گۆتنا وی کر و ئەو زڤراندەڤە. بەلێ ژ ریوایەتا دی ئاشکەرا دبت کو ئەبوو طالبی ئاخفتنا وی ب چو ڤە وەرنەگرت، لەو ئەو ما پێڤە حەتا قەناعەت بۆ چێکری کو ئەو برازایێ خۆ بزڤریت و نەبەتە وەلاتێ رۆمێ..

و هەر چاوا بت، ژ ڤان هەردو ریوایەت دورست[2] دئێتە زانین کو ل سەر شیرەتا بەحیرایێ راهب ئەبوو طالبی بەردەوامی نەدا سەفەرا خۆ د گەل کاروانێ قورەیشییان، و ژ بوصرایێ ئەو د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زڤری مەکەهێ.

---

(١) موسلم ژێ ڤەدگوهێزت.

(٢) هندەک زانایێن کەڤن و یێن نوی ژی ل وێ باوەرێنە کو چو راستی بۆ سەرهاتییا دیتنا بەحیرایێ راهب بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نینە، و ئێک ژ وان زانایان ئیمامێ ذەهەبییە، و د چاپێن بۆری دا ژ ڤێ کتێبا خۆ مە ئەڤ بۆچوونە (تەرجیح) کریوو، بەلێ پشتی دویچوونێ بۆ مە دیار بوو کو دو ریوایەتێن ڤێ سەرهاتییێ د (صەحیحن) برێنە: (صحيح السيرة النبوية) یا سەیدا (ناصر الدين الألباني) بپ ٢٩-٣١.

### شەڕێ (فیجار):

ل سالا (٥٨٤) زایینی، دەمێ ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پازدە سال، شەڕەک د ناڤبەرا قورەیشی و قەیسییان دا چێبوو، نێزیکی پێنج سالان ڤەکێشا، و چونکی ڤی شەڕی ل وێ هەیڤێ دەست پێ کربوو ئەوا شەڕ تێدا ل نک عەرەبان چێ نەدبوو ژ وان هەیڤێن دبێژنێ: هەیڤێن حەرام، و هندەک ژ وی شەڕی د حەرەما مەکەهێ دا چێبوو ل وی جهێ شەڕ تێدا چێ نابت، ناڤێ وی شەڕی کرنە: (حرب الفجار) و فیجار ب مەعنایا زێدەگاڤی و سەرداچوونێ دئێت.

مەزنێ قورەیشییان د ڤی شەڕی دا بابێ ئەبوو سوفیانی (حەربێ کوڕێ ئومەییەی) بوو، و هندەک مامێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشکداری د ڤی شەڕی دا کربوو، ئەوێ قورەیشی تێدا ب سەرکەفتین، و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو د ڤی شەڕی دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاری مامێن خۆ دکر، بەلێ زانایێن حەدیسێ ل وێ باوەرێنە کو ئەڤ ریوایەتە د دورست نینن. و ئەگەرا پەیدابوونا ڤی شەڕی ئەو بوو (نوعمانێ کوڕێ مونذری) هندەک حێشترێن بارکری هنارتنە بازارا عوکاظێ، و زەلامەکێ قەیسی بەختێ خۆ دایێ، ئێکێ دی یێ قورەیشی گاڤا ئەڤ چەندە زانی ئەو بۆ خۆ ب کێماسی دیت، چاوا د سەر قورەیشییان ڕا ئێکێ قەیسی بەختێ خۆ بدەتە نوعمانی.. ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو چوو ب خافلەتی ڤە ئەو حێشتر کوشتن، گاڤا ئویجاخا قەیسییان ئەڤ چەندە زانی هێرش دا سەر قورەیشییان و شەڕ پەیدا بوو.

### پەیمانا (الفضول):

پشتی ئەڤ شەڕە ل شەوالا سالا ٥٩١ ب دوماهی هاتی، و ل هەیڤا (ذولقەعدە) دەمێ ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بیست سال،

سەرهاتییەکا دی ل مەکەهێ ڕویدا، ئەو ژی ئەڤە بوو بازرگانەک ژ یەمەنێ هاتە مەکەهێ و هندەک مالێ خۆ فرۆتە عاصێ کوڕێ وائلی، و ئەو ئێک ژ ماقویلێن مەکەهێ بوو، عاصی مالێ وی ژێ وەرگرت و ژ تەعدایی حەقێ وی نەدایێ، ئینا ئەو ل بەرانبەر کەعبێ ڕابوو ڤە و هەوار کر، بەلێ سەر خاترا عاصی کەسەک د هەوارا وی نەچوو، هنگی وی هەوارا خۆ گەهاندە مالباتا فهرییان و خودان وژدانان کو ئێک د هەوارا وی بچت، و حەقێ وی ژ عاصی بستینت.. هنگی مالباتا هاشمییان کو مالباتا پێغەمبەری بوو، و مالباتا زوهرییان کو مالباتا دەیکا وی بوو، و مالباتا تەیمییان کو مالباتا ئەبوو بەکری بوو، ل مالا عەبدللاهێ کوڕێ جەدعانی کۆمبوون، و وان د ناڤبەرا خۆ دا پەیمانەک گرێدا کو ئەو هاریکارییا هەر ئێکێ خودان ماف بکەن ئەگەر خۆ یێ بێ خودان و بیانی ژی بت. ل سەر بناخەیێ ڤێ پەیمانێ، ئەو چوون حەقێ ڤی مرۆڤێ یەمەنی ژ عاصێ کوڕێ وائلی ستاند.

قورەیشییان ناڤێ ڤێ پەیمانێ کرە: (حلف الفضول) و (فوضوول) تشتێ زێدەیە، یێ مایێ مرۆڤی تێ نەچت، و مرۆڤی چو پەیوەندی پێڤە نە، ژ بەر کو خودانێن ڤێ پەیمانێ بڕیار دا ئەو مایێ د وی تشتی بکەن یێ وان پەیوەندی پێڤە نەبت ژی مادەم ئەو زڤڕاندنا حەقەکییە بۆ خودانی.

د ڤێ کۆمبوونێ دا ئەوا ل مالا عەبدللاهێ کوڕێ جەدعانی هاتییەکرن، پێغەمبەر ژی -سلاڤ لێ بن- ئامادە بوو، و ئەو ژی ئێک ژ وان کەسان بوو یێن پەیمان دای کو هاریکارییا مرۆڤێن هەوجە بکەن حەتا حەقێ وان بۆ دئێتە زڤڕاندن، و هنگی ژییێ پێغەمبەری ەکی مە گۆتی ل دۆرێن بیست سالییێ بوو، و پشتی پێغەمبەرینییێ ژی وی بەحسێ ڤێ پەیمانێ دکر، و دلخۆشییا خۆ ئاشکەرا دکر کو وی پشکداری تێدا کری.

## ئەو و هندەك (حەنيفێ) يێن خودێناس:

خەلكێ مەكەهێ ژ قورەيشييان، هەر چەندە ژ نەڤييێن ئيسماعيل پێغەمبەرى بوون، و بندارێن مالا خودێ بوون، بەلێ ل درێژييا سالان، و ژ بەر گەلەك ئەگەران، وان ژ رێكا راستا پێغەمبەران لادابوو، و صەنەمپەرێسى د ناڤ وان دا بەلاڤ بووبوو، حەتا ب سەدان وان صەنەم ل دەور و بەرێن كەعبەيا پيرۆز دانابوون.

د سەر ڤێ چەندێ ژى را وان خۆ ب نەڤى و جێگرێن ئيبراهيم پێغەمبەرى دنياسى، و وان دگۆت: ئەم يێ ل سەر رێكا وى.. و وەكى مە دياركرى دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هێشتا زارۆك عەقلێ وى ژ ڤى دينى نەدبرى يى مللەتێ وى ل سەر، و رۆژەكا ب تنێ ژى وى عەبدينييا صنەمێن وان نەكر، و ژ بەر ڤى رەفتارێ وى يێ غەريب مامێ وى ئەبوو طالب گەلەك دترسييا كو ئەو ژى وەكى (زەيدێ كورێ عەمرێ كورێ نوفەيلى) لێ بێت، و رويێ خۆ ژ دينێ باب و باپيران وەرگێرت. و زەيد كو ئێك ژ پيرەمێرێن قورەيشييان بوو مەسەلا وى ئەڤە بوو: ئەو مرۆڤەكێ خودێناس بوو، وى دگۆتە مللەتێ خۆ يێ قورەيشى: ئەو دينێ هوين ل سەر دچن نە دينێ ئيبراهيمييە، بەلكى ئەو دينەكێ بێخێرە، و قەت چێ نابت ئەڤ دار و بەرێن هوين خۆ بۆ دچەمينن شريكێن خودێ بن..

و دبێژن: زەيد بەرى هنگى ل گەلەك وەلاتان گەريابوو، و چووبوو نك جوهى و فەلەيان، و دينێ وان ئەوێ نە گەلەكێ جودا ژ دينێ قورەيشييان، نياسيبوو، و ئەو ل وێ باوەرێ بوو كو جوهى و فەلە ژى نە ل سەر دينێ ئيبراهيمينە، و ب دورستى دويچوونا پێغەمبەران ناكەن، لەو ئەو زڤرى مەكەهێ و كار بۆ هندێ كر هندەك هەڤال و هۆگران بۆ خۆ پەيدا بكەت، و ل دويڤ ئجتهادا خۆ پەرستنا خودێ بكەت، و پشتى گەريان و لێگەريانەكا

دویر و دریژ وی گۆته خۆ: ئەز دێ ل سەر دینێ ئیبراهیمی بم، و ڤان دینێن هە هەمییان هێلم، و هەر جار ئەو دا سەرێ خۆ بۆ خودێ چەمینت و دبێژت: ئەی خودا، ئەگەر من زانیبا کیژ رەنگە تە دڤێت ئەز عبدینییا تە پێ بکەم، ئەز دا ب وی رەنگی عەبدینییا تە کەم.

زەیدی گوهێ خۆ نەدا قورەیشییان و باوەری ب صەنەمێن وان نەئینا، و گەلەک جاران ئەو دهاتە دیوانا وان ل کەعبێ، و تان ل دینێ وان ددا و دگۆت: چاوا چێ دبت خودێ هوین داین و هوین عەبدینییا دار و بەران بکەن؟!

گۆتنێن ڤی خودێناسی دگەهشتنە پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- هێشتا ئەو زارۆک، کا چاوا دگەهشتنە خەلکێ مەکەهێ، بەلێ فەرقا وی ژ خەلکێ دی ئەڤە بوو ئەڤ گۆتنە ل دلێ وی دهاتن، و کەیفا وی پێ دهات.. و قورەیشییان ب گۆتنێن وی نەخۆش بوو، لەو وان گۆتە مامێ وی (خەططابێ کورێ نوفەیلێ) -بابێ عومەری-: دەڤێ برازایێ خۆ بدانە سەرێک! هنگی خەططابی حالێ زەیدی نەخۆش کر ئینا ئەو ژ مەکەهێ دەرکەفت و بۆ خۆ رەڤی چوو وان چیایێن ل دۆرا مەکەهێ، و عەبدینییا خودێ ل وێرێ دکر. و دبێژن: جارەکێ ئەو ل چۆلی یێ ب تنێ بوو ب لایێ مەکەهێ ڤە دهات، هندەکان ئەو دیت و هێرش کرە سەر و کوشت.

جارەکێ پێغەمبەر و زەیدێ کورێ حارثەی (کورێ وی یێ تەبەنییێ) پێکڤە دروینشتی بوون ژ دەرڤەی مەکەهێ، زەیدێ کورێ عەمری د بەر وان را بۆری، پێغەمبەری -و هێشتا پێغەمبەراتی بۆ نەهاتبوو- داخواز ژێ کر کو ئەو بێت و د گەل وان خوارنێ بخۆت، وی گۆت: برازا، ئەو گۆشتێ نە بۆ خودێ هاتبتە ڤەکوشتن ئەز ناخۆم. د حەدیسەکێ دا هاتییە پێغەمبەر مەدحێن وی دکەت و دبێژت: رۆژا قیامەتێ ئەو دێ رابت وەک ئوممەتا خۆسەر.

ژ بلی زەیدی چەند مرۆڤەکێن دی ژی هەبوون عەقلێ وان ژ دینێ قورەیشییان نەدبڕی، دگۆتنە وان: (حەنیفی) یەعنی: ئەوێن ڕوییێ خۆ ژ شرکێ و پەڕستنا صەنەمان وەرگێڕای، وەکی: وەرەقەیێ کوڕێ نەوفەلی، و قەسسێ کوڕێ ساعدەیێ ئییادی، بەلێ ئەو ب تبلێن دەستی دهاتنە هژمارتن، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەر ژ زاروکینییا خۆ کەیف ب گۆتنا وان دهات، و پتر مەیل بۆ وان دکر، و باوەری ب دینێ مللەتێ خۆ یێ صەنەمپەڕێس نەدئینا.

و دەمێ وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتییە خوارێ، ژ ڤان مرۆڤێن هە کەس نەمابوو زێندی، ب تنێ وەرەقەیێ کوڕێ نەوفەلی تێ نەبن، ئەو حەتا دەسپێکا هاتنا وەحییێ مابوو و پشتی هنگی هەر زوی مر، وەکی دێ بەحس ژێ کەین، ئەگەر خودێ حەز بکەت.

ترسا ئەبوو طالبی ئەو بوو برازایێ وی موحەممەد، بچتە سەر دینێ زەیدی و هەڤالێن وی، و دینێ باب و باپیرێن خۆ بهێلیت، ژ بەر وی سەر و بەرێ وی ژ برازایێ خۆ ددیت.. و وەسا چێ بوو! د گەل کو ئەبوو طالبی پتر ژ جارەکێ ئەو شیرەت کربوو کو ژ بلی دینێ باب و باپیرێن خۆ ئەو چو دینێن دی بۆ خۆ نەگرت، بەلێ وی ب ڤێ گۆتنا مامێ خۆ نەدکر.

# د گەل خەدیجایا کچا خوەیلدی

ناڤ و دەنگێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ڕاستگۆیی و دەستپاکی و دەهمەن پاقژییێ د ناڤ خەلکێ مەکەهێ دا بەلاڤبوو، چونکی وی وەکی جحێلێن دی یێن مەکەهێ دەمێ خۆ ب مژویلاهییێن بێ مفا ڤە نەدبۆراند، بەلکی وی ئەو کار دکرن یێن سوود ژێ دگەهشتە وی و مالا وی و خەلکێ جڤاکێ ژی.

ئەو د ناڤ مەکەهییان دا ب جامێرییێ هاتە نیاسین، لەو خەلکی هەمییێ حەز ژێ کر و کەسێ چو نەخۆشی ژێ نەددیتن.. ل وێ سالا ژییێ وی بوویە بیست و پێنج، چەند ڕۆژەکان بەری کاروانێ بازرگانێن قورەیشییان بەر ب شامێ ڤە بچت، مرۆڤەک هاتە نک وی و گۆتێ: خەدیجایا کچا خوەیلدی حەز دکەت تە ببینت.

### خەدیجا کێ بوو:

خەدیجا ژنکەکا قورەیشی بوو، بابێ وێ خوەیلد کوڕێ ئەسەدێ کوڕێ عەبدلعوززایێ کوڕێ قوصەیێ کوڕێ کیلابی بوو، یەعنی: باپیرێ باپیرێ پێغەمبەری عەبدمەناف برایێ باپیرێ بابێ خەدیجایێ عەبدلعوززای بوو، هەردو کوڕێن قوصەی بوون.

خوەیلدێ بابێ خەدیجایێ سێ کوڕ و سێ کچ هەبوون: عەدی، و حزام، و عەووام (و ئەڤە بابێ زوبەیرێ کوڕێ عەووامییە) ئەڤە کوڕ، و کچ: خەدیجە و ڕەقیقە و هالە (و ئەڤە خەسوییا زەینەبا کچا پێغەمبەری بوو). و خوەیلدی پێنج برا هەبوون ئێک ژ وان نەوفەل بوو ئەوێ دبتە بابێ (وەرەقەیێ

کوڕێ نەوفەلی)، و دبێژن: بەری شەڕێ (الفجار) ب دەمەکی خوەیلدێ بابێ خەدیجایێ مربوو.

خەدیجایێ شوی ب ئەبوو هالەیێ کوڕێ زوورارەیێ تەمیمی کربوو، و پشتی ئەو مری وێ شوی ب عەتیقێ کوڕێ عائذێ مەخزوومی کر، بەلێ ئەو ژی مر هێشتا ژییێ خەدیجایێ نەبوویە بیست و هەشت سال.. خەدیجا ژنەکا خودان قەدر و قیمەت بوو د ناڤ مالباتا خۆ دا ئەوا دگۆتنێ: (بەنی ئەسەد)، و ئەوێ مالەکێ زێدە ژی هەبوو، و عەدەتێ وێ بوو هەر سال دەمێ کاروانێ قورەیشییان بۆ بازرگانییێ دەردکەفت، وێ ژی هندەک مالێ خۆ د گەل کاروانی دهنارت، و هەر جار وێ زەلامەک د گەل مالێ خۆ دهنارت دا بازرگانییێ بۆ خۆ و بۆ وێ ب مالێ وێ بکەت، یەعنی: وێ فایدە ل خۆ و وی ب نیڤی دکر، ژ بەر ڤێ چەندێ خەدیجایێ تبیعەتێ گەلەک زەلامێن قورەیشییان دزانی.

## پێغەمبەر و بازرگانی ب مالێ خەدیجایێ:

دەمێ ناڤ و دەنگێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ئەمانەت و ڕاستگۆییێ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤبووی، و خەلکی هەمییێ مەدحێن وی کرین و گۆتین: ئەو مرۆڤەکێ بێ چەپ و چویرە، خەدیجایێ ڤیا بهنێرتە د دویڤ وی ڕا و داخوازێ ژێ بکەت کو ئەڤ سالە ئەو د گەل مالێ وێ دەرکەفتە شامێ بۆ بازرگانییێ.. و ئەو بوو وێ عەبدێ خۆ (مەیسەرە) هنارتە نک موحەممەدی دا بێژتێ: دۆتماما تە خەدیجایا کچا خوەیلدی حەز دکەت تە ببینت بۆ کارەکێ پێتڤی.. پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل وی چوو مالا خەدیجایێ، و دەمێ ئەو گەهشتییە وێرێ خەدیجایێ بۆ وی دیار کر کو هەر سال ئەو زەلامەکی د گەل مالێ خۆ دهنێرت دا بازرگانییێ بۆ وێ و خۆ بکەت، و ئەو حەز دکەت ئەو بۆ وێ ب ڤی کاری ڕابت.

پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- ئاگەهداربیا وێ کر کو وی چو مانع نینن ئەو ب ڤێ چەندێ رابیت، ب تنێ دڤێت ئەو دەستوریریێ ژ مامێن خۆ وەربگرت، و پشتی مامێن وی ب تایبەتی ئەبوو طالبی دەستویری دایێ، وی داخوازا خەدیجایێ ب جهـ ئینا، و ئەو و هەڤالێ خۆ (مەیسەرە) کو خولام و عەبدێ خەدیجایێ بوو بەر ب شامێ ڤە چوون د گەل کاروانێ قورەیشییان.. و هنگی ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بیست و پێنج سال بوون، و ژییێ خەدیجایێ ل دویڤ ریوایەتا دورست بیست و هەشت سال بوون(١).

کاروان بەر ب شامێ ڤە چوو، و پشتی هەیامەکێ زەلامێن قورەیشییان کرین و فرۆتنا خۆ کری، ئەو زڤرینە وەلاتێ خۆ، و یێ ژ هەمییان پتر د ڤێ بازرگانییێ دا فایدەکری وەکیلێ خەدیجایێ بوو موحەممەد و هەڤالی وی مەیسەرە بوون، چونکی مالێ وان دو جاران هندی خۆ لی هات.

دەمێ خەدیجایێ فایدێ ئەڤ سالە دیتی، و ئەو د گەل فایدێ سالێن بۆری هەڤبەر کری، وێ ئەڤ چەندە ب حێبەتی ڤە گرت، لەو وێ پسیارا مەیسەرەی کر کانێ ئەڤە ژ بەر چییە؟

مەیسەرەی بۆ وێ ئاشکەرا کر کو ئەڤ سالە ژی وەکی هەر سال بوو، بەلێ ئەو مرۆڤێ ئەڤ سالە د گەل چووی نە وەکی وان بوو یێن ل سالێن بۆرین دچوون و گۆتێ: ئەڤ جحێلە مرۆڤەکێ پیرۆزە.. و بەحسێ راستگۆیی و دلنەرمی و پاقژیا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ وێ کر، ب ڤێ چەندێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د چاڤێن وێ دا گەلەک بلند بوو، و وێ زانی کو ئەڤ مرۆڤە نە وەکی وان دلرەش و حەسویدانە یێن ل دۆرێن وێ دژین،

---

(١) هەر چەندە یا بەلاڤ ل نک گەلەک نڤیسەرێن سیرەتێ ئەوە کو عەمرێ وێ هنگی چل سال بوون، بەلێ ئەو ریوایەت ددورست نینن.

و چونکی خەدیجا ژنکەکا فاما و تێگەهشـتی بـوو، وێ هزرەکا مـەزن ژ ڤـێ جحێلی کر، و ڤیا مرۆڤاینییا خۆ د وی گەل موکم بکەت.

## خەدیجا دبتە کابانیا پێغەمبەرﷺ:

گەلەک کەس هەبوون حەز دکر خەدیجایێ ب لایـێ خۆ ڤـە بکێشـن؛ دا دەستێ خۆ بدانـنە سەر مالێ وێ، خەدیجایێ ئەڤ چەندە دزانی، و دەمـێ وێ برازایـێ ئـەبـوو طـالبی دیتی و بۆ بازرگانی د گەل مالێ خۆ هنـارتـی، وێ ژ نێزیک ڤە ئەو نیاسی و زانی کو ئەو د ئەخلاقێ خۆ دا نە وەکی چو کەسێن دیـیە، لـەو وێ ڤیا وی ژ دەست خۆ نەکەت، خەدیجایێ جارەکا دی هنارتـە ب دویڤ پێغەمبەری ڕا -سلاڤ لێ بن- بەلێ ڤێ جارێ دا بێژتـێ: پسـمام، ژ بەر کو تو مرۆڤەکێ عەسلیی د ناڤ مللەتێ خۆ دا، و مرۆڤەکێ ب ئەخلاق و ئەمین و ڕاستگۆیی، مـن دڤێت مرۆڤاینییـا مـە ب هێزتر بکـەڤت.. و بـۆ وی ئاشکەرا کر کو ئەو حەز دکەت شوی پێ بکەت. و د هندەک ریوایـەتان دا هـاتـیـیـە کـو خـەدیـجـایـێ ئەڤ حەزکرنا خۆ بۆ خویشکەکا خۆ ئاشکەرا کـر، و خویشـکا وێ داخـواز گەهانـدە پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ب ڕێکـا هەڤالەکێ وی، و بەرسڤا پێغەمبەری جارەکا دی ئەو بوو: بلا، بەس حەتا ئەز دبێژمـە مـامێن خـۆ. و گاڤـا پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- سـوحبەت د گـەل مامێ خۆ ئەبوو طالبی ڤـەکری، ئـەبـوو طـالـب ب ڤـێ چەنـدێ ڕازی بـوو، و هنارتـە ب دویـڤ برایـێ خـۆ حـەمزەی ڕا، ئـەو پێکڤـە چوونـە نـک مـامێ خەدیجایێ (یان برایـێ وێ ل دویـڤ ریوایەتـەکێ) و ئـەو ژێ خواست، و ئـەو ئێکسەر ل بەر هات.. و ب ڤێ چەندێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و خـەدیجا گەهشتنە ئێک، و هەردویان پێکڤە مالەک دانا.

خەدیجا ئێکەمین ژن بوو پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- ڤەگوهاسـتی، و ئەو هەردو نێزیکی بیست و چار سـالان مانـە د گـەل ئێـک، و هنـدی ئـەو یا

زێندی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چو ژن ل سەر نەئینان، و د وی دەمی دا یێ ئەو پێکڤە ژیاین خودێ شەش زارۆک دانێ، دو کورِ و چار کچ، و ئەو ژی ئەڤە بوون:

١- بچویکێ وان یێ نەخری کورِ بوو، ناڤێ وی (القاسم) بوو، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب وی دهاتە ناڤکرن، دگۆتنێ: (أبو القاسم) و ئەڤ کورە بەری هەمی زارۆکێن وی ژی مربوو دەمێ هێژ یێ ساڤا.

٢- پاشی وان کچەک بوو ناڤێ وێ (زەینەب) بوو، و ئەڤە مابوو حەتا پشتی ئیسلامێ ژی و وێ باوەری ئینابوو، و شوی ب کورِخالەتێ خۆ (أبو العاص بن الربيع)ی کربوو.

٣- کورەکێ دی وان بوو ناڤێ وی کرە: (عبد الله) و هەر ئەڤەیە یێ دبێژنێ: (الطيب) و (الطاهر)، پشتی ئەو رابوویە سەر پێیان و شیای خۆ ل سەر پشتا دەواران بگرت مر.

٤- کچا دی ناڤێ وێ: (أم كلثوم) بوو.

٥- کچا دی (روقەییە) بوو، ئەڤان هەردویان شوی ب (عوثمانێ کورێ عەففانی) کربوو، پشتی ئێک مری خویشکا دی شوی پێ کربوو.

٦- کچا بچویکتر: (فاطمە) بوو، و ژ هەمییان پتر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- حەز ژ وێ دکر، و دەمێ ئەو مەزن بووی وێ شوی ب پسمامێ بابێ خۆ (عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی کربوو[1].

ئەڤ هەر شەش بچویکە بوون خودێ ژ خەدیجایێ داینە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و خەدیجایێ دو زارۆکێن دی ژی هەبوون کچەک و کورەک

---

(١) ژیانا خەدیجایێ و زارۆکێن وێ ب بەرفرەهی مە د کتێبا خۆ (د گەل صەحابییێن پێغەمبەری) دا ڤەگێرِایە، بۆ هەر کەسەکێ بڤێت لێ بزڤرِت.

ژ هەردو زەلامێن خۆ یێن وێ بەری پێغەمبەری -سلاف لێ بن- شوی پێ کری.

بەری نوکە مە گۆت: هندی خەدیجا یا زێندی پێغەمبەری -سلاف لێ بن- چو ژن ب سەر نەئینا بوون، و پشتی مرنا وێ ژی دەمێ پێغەمبەری -سلاف لێ بن- هندەک ژنێن دی ئینایین کەسەک ژ وان جهێ وێ د دلێ وی دا نەگرتبوو، و هەر سەرێ وێ ما ب سەر یێ هەمییان دکەفت، و ڕێز و قەدرگرتنەکا مەزن پێغەمبەری -سلاف لێ بن- بۆ وێ هەبوو. د گۆتنەکا خۆ دا دەیکا موسلمانان عائیشایا کچا ئەبوو بەکری دبێژت: پێغەمبەر -سلاف لێ بن- چو جاران ژ مەدحێن خەدیجایێ نەدوەستییا، و هەردەم وی دوعا بۆ دکرن، لەو ڕۆژەکێ غیرەتێ وەسا ل من کر ئەز بێژمێ: خەدیجا چ بوو؟ پیرەژنەک بوو خودێ ئێکا ژ وێ چێتر ب رزقێ تە کر!

و مەخسەدا وێ ب ڤێ چەندێ ئەو ب خۆ بوو، چونکی خەدیجا بیژن بوو، بەلێ ئەو کچ بوو و یا بچویک بوو..

گۆت: پێغەمبەر -سلاف لێ بن- عێجز بوو و گەلەک کەربێن وی ڤەبوون، و گۆتە من: تو چ دبێژی؟! ئەز ب خودێ کەمە ئێکا ژ وێ چێتر خودێ نەدایە من، وێ باوەری ب من ئینا دەمێ خەلکی باوەری نەئینای، و وێ ب مالێ خۆ هاریکارییا من کر دەمێ خەلکی دەستێ خۆ ل من گرتی، و ب تنێ ژ وێ خودێ عەیال دا من.

ئەڤە ئەو ئەگەر بوون یێن خەدیجا د چاڤێن زەلامێ وێ دا مەزن کری حەتا پێکەکێ کو نەهێلیت پشتی مرنا وێ ژی کەس بەحسێ وێ بکەت، ئەگەر خۆ ئەو عائیشا ژی بت، ئەوا د هندەک حەدیسێن دروست دا هاتی کو ئەو خۆشتڤیترین مرۆڤ بوو ل نک پێغەمبەری -سلاف لێ بن-.

ئەو ژن ب دروستی یا هێژای قەدرگرتنێیە ئەوا ملێ خۆ بدەتە بەر ملێ زەلامێ خۆ، و د تەنگاڤییان دا پشتا وی بگرت و ب مالێ خۆ و ب هەمی هێز و شیانێن خۆ پشتەڤانییا وی بکەت.. و خەدیجا ب دروستی یا ب ڤی ڕەنگی بوو.

و دەیکا موسلمانان خەدیجا ئێک ژ وان کەسانە یێن ب ساخی مزگینی ب بەحەشتێ بۆ هاتییەدان، و کو قەسرەکا ژ لوئلوئی بۆ وێ هەیە، هەر وەکی عائیشا ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزت[1].

و ئیمام عەلی دبێژت: من گوهـ ل پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- دگۆت: چێترین ژنکێن دنیایێ -یان ژی یێن بەحشتێ- خەدیجایا کچا خوەیلدی و مەریەما کچا عمرانییە[2].

(١) وەکی بوخاری و موسلم ژێ ڤەدگوهێزن.

(٢) وەکی موسلم ژێ ڤەدگوهێزت.

## ئاڤاكرنا كەعبێ بەری هنارتنا پێغەمبەری
## -سلاڤ لێ بن-

مزگەفتا حەرام، ئەوا دكەفتە نیڤا نهالەكێ د ناڤبەرا زنجیەرەكا چیایان دا، ل باكووریێ (ئەلفەلەق و قوعەیقوعان)، و ل رۆژئاڤایێ (ئەبوو حەدیدە و كودا)، و ل باشووریێ (ئەبوو قوبەیس) و ل رۆژهەلاتێ (خەندەمە)، ل سەنتەرێ مزگەفتێ ئاڤاهییەک ل سەر رەنگەكێ نێزیكی چارگۆشەیێ هەیە، ئەو رەنگێ ب عەرەبی دبێژنێ: (موكەعەب)، و ژ بەر ڤێ چەندێ د كەڤن دا عەرەبان دگۆتە ڤی ئاڤاهی: (كەعبە).

ئەڤ ئاڤاهییە كو د بنیات دا مەزەلەكا مەزنە، هێژ ل سەر دەمێ ئادەمی یان بەری وی هاتبوو دانان؛ دا ببتە مزگەفت بۆ پەرستنا خودێ، و ل درێژییا دیرۆكێ پتر ژ جارەكێ ئەو یێ هاتییە نویكرن، و جارا ژ هەمییێ ناڤدارتر ل سەر زەمانێ ئیبراهیم پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- پشتی كو وی -ب فەرمانا خودێ- كوڕێ خۆ ئیسماعیل و دەیكا وی هاجەر ئینایین ل وێرێ ئاكنجی كرین، ئیبراهیمی و كوڕێ وی ئیسماعیلی ئاڤاهییێ كەعبێ ل سەر وان بناخەیێن بەری هنگی هەین بلندكر، یەعنی: وان (ئەساس) دوبارە نەكۆلان، و جارەكا دی نەدانان، بەلكی وان دیوان هەر دانا سەر بناخەیێ كەڤن، و پشتی وان ل درێژییا سال و زەمانان ئەڤ ئاڤاهییە كەڤن بوو، حەتا دووماهییێ، بەری هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب پێنج سالەكان ئەو نێزیكە وەكی كاڤلەكی لێ هاتبوو، بان نەمابوو پێڤە، و دیوار نزم بووبوون، كێمتر ژ چار متر و نیڤان لێ هاتبوون، و دەرگەهـ ژی ل ئاخێ بوو، و هەر جارەكا لەهییەک رابیا، ئاڤ دچوو نیڤا كەعبێ، و ئەگەر ئێكی ڤیابا دشیا

پیچەکێ خۆ بلند بکەت و د سەر دیواری ڕا خۆ بهاڤێتە د کەعبێ ڤە.. و دبێژن: جارەکێ ژنکەکێ ئاگر د کەعبێ ڤە هلکر، ئینا چریسکەک ژێ ڤەپەشی و ب وان پاتان کەفت ئەوێن ب دیواران ڤە و ئاگر بەربوویێ، و هنگی ئاڤاهییێ کەعبێ هێشتا پتر بێ سەر و بەر بوو، لەو قورەیشییان دلێ خۆ برێ کو ئەو کەعبێ بهەڕفینن و ئاڤاهییێ وێ نوی بکەنە ڤە.

بەلێ ژ بەر سەرهاتییا ئەبرەهەیێ حەبەشی و ئەوا ب سەرێ وی هاتی دەمێ وی ڤیای کەعبێ خراب بکەت، ئەوا بەری هنگی ب سیه و پێنج سالان چێببووی، و گەلەک قورەیشییێن ئامادە ئەو ب چاڤ دیتبوو، وان بستە نەکر کەعبێ خراب بکەن، و گۆتن: نە کو تشتەک ب سەرێ مە ژی بێت!

پاشی ئێک ژ وان گۆت: ئارمانجا مە وەکی یا ئەبرەهەی نینە، مە دڤێت کەعبێ نوی بکەینە ڤە نە کو خراب بکەین، ئەز دێ دەست ب خرابکرنا دیواران کەم و ڕۆژەکێ خۆ ل من بگرن، ئەگەر چو ل من نەهات، مەعنا خودێ یێ ژ کارێ مە رازییە، و ئەم دێ بەردەوامییێ دەینە کارێ خۆ.. و وی دەست دا ماهۆلکەکی و هندەک ژ دیوارێ کەعبێ خراب کر، گاڤا قورەیشییان دیتی چو ل وی نەهات، ڕۆژا دی وان دەست دایێ و دیوارێن کەعبە هەمی خرابکرن، و دبێژن: دیوار ب تنێ ژ بەری هاتبوونە ئاڤاکرن، و گاڤا ئەو گەهشتینە بناخەیان، وان دیت ئەو بەرەکێ جودایە، هندەک ژ وان یێن ئامادە بوویـن دبێژن: ئەو یێ وەسا بوو دا بێژی ئەڤە هندەک حێشترن پشتێن خۆ یێن داینە ئێک، یەعنی: ئەو وەکی کڤانان بوون، و ب ڕەنگەکێ وەسا موکوم پێکڤە د نویسیای بوون کەس نەدشیا ژێکڤە کەت، ئینا قورەیشییان دەست نەکرە بناخەیان و ئەو هێلان وەکی خۆ و دیوار ل سەر دانان[1]، و چونکی

---

(١) گاڤا عەبدللاهێ کوڕێ زوبەیری ژی ل سالا (٦٥) مشەختی ئاڤاهییێ کەعبێ خرابکری و جارەکا دی ئاڤاکری، وی ژی بناخە ب وی ڕەنگی دیتن، و وەکی خۆ

ئاڤاكرنا كەعبێ كارەكێ پیرۆز بوو د چاڤێ قورەیشییان دا بابكێن وان ب جرە چوون كانێ كی ژ وان دێ ب ئاڤاكرنا وێ رابت، و دویماهییێ وان كار ل خۆ لێكڤەكر، و گۆتن: هەر بابكەک دێ ب ئاڤاكرنا هندەكێ رابت.

و بڕیارا وان ئەو بوو ئەو مالێ د ئاڤاكرنا كەعبێ دا دئێتە خەرجكرن دڤێت مالەكێ حەلال بت، و پشتی وان مالێ خۆ یێ حەلال كۆمكری، وان دیت ئەو تێرا ئاڤاكرنا كەعبێ هەمییێ ناكەت! لەو وان بڕیار دا ژ لایێ حجرا ئیسماعیلی ڤە (ئەو لایێ دبێژنێ: حەطیم) هندەكێ ڤەكری بهێلن، و ب تنێ شویرەهێ نزم ل دۆر ئاڤا كەن، دا بێتە زانین كو ئەو ژی ژ كەعبێیە، و نێزیكی فرەهیا سێ متران ژ وی لایی ڤە وان ژ كەعبێ بەردا، و وان نێزیكی هەشت متر و نیڤان دیوار بلندكرن، یەعنی دو جاران هندی بەرێ، و بانەک ژی بۆ چێكر، و ل شوینا دو دەرگەهان، وان دەرگەهەک ب تنێ ل لایێ رۆژهەلاتێ دانا، پشتی كو ژ عەردی بلندكری و هندەک دەرەج بۆ چێكرین، دا ئاڤ نەچتێ.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل مامێن خۆ پشكداری د ئاڤاكرنا كەعبێ دا كر، و ئەو ئێک ژ وان كەسان بوو یێن بەر بۆ ئاڤاكرنێ دكێشان، و ژ مەسەلەیێن گرنگ د ئاڤاكرنێ دا دانانا بەرێ رەش بوو ل جهێ وی، مە گۆت: قورەیشی ب هەڤڕكی چوون كانێ كی دێ كەعبێ ئاڤا كەت، پاشی ئەو

---

هێلان.. و ل سالا (١٤١٧) ل سەر دەمێ مەلک فەهدی دەمێ كەعبە هاتییە نویژەنكرن دۆر و رەختێن ئەساسی نێزیكی متر و نیڤەكان هاتنە كۆلان؛ دا بەرێ خۆ بدەنێ كانێ حالێ ئەساسی یێ چاوایە و كانێ دێ شێت خۆ ل بەر نویژەنكرنێ گرت یان نە، وان دیت بەر وەسا موكم پێكڤە دگرێدایینە هەر وەكی چو د ناڤبەرێ دا نە، و ئەو وەكی پشت و ستوینێن حێشترانە، لەو وان دەست نەدا بناخەیان و وەكی خۆ هێلان.

ل سەر هندێ پێک هاتن کو کاری ل خۆ لێکڤە بکەن، هەر بابکەک جهەک ئاڤا کەت، و دەمێ ئەو گەهشتینە وی جهی یێ کو دڤێت بەرێ رەش لێ بێتە دانان، جارەکا دی ئەو ب جرە چوون، و هەر بابکەکی دڤیا ئەو بەری بدانە جهێ وی، حەتا نێزیک بوو ئەو شەری بکەن، پاشی گۆتن: هەوجە ناکەت ئەم هەڤرکییێ بکەین، بەرێ خۆ بدەنێ کانێ کی ئێکەمین کەسە د ڤی دەرگەهی را دئێت بلا ئەو حوکمی د ناڤبەرا مە دا بکەت.. و بەرێ وان ما ل دەرگەهێ (بەنوو شەیبە) ئەوێ دکەفتە رۆژهەلاتا کەعبێ، و وان دیت ئێکەمین کەس هاتی (موحەممەد) بوو، ئینا هەمییان ب دەنگەکێ بلند گازی کر: ئەڤە یێ ئەمینە ئەم درازینە ئەو حوکمی د ناڤبەرا مە دا بکەت. و گاڤا وان سوحبەتا خۆ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری، پێغەمبەری گۆتە وان: کانێ پاتەیەکی بۆ من بینن، وان پاتەیەکێ مەزن ئینا، پێغەمبەری بەر دانا سەر و گۆت: هەر بابکەک بلا مەزنێ خۆ فرێکەت دا لایەکێ پاتەیی بگرت و بلند بکەت، وان ب یا وی کر و پشتی وان پاتە بلند کرییە راستا جهێ بەری، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەر ژ سەر پاتەی راکر و دانا جهێ وی، و ب ڤێ چەندێ جرێ وان ب دویماهی ئینا و ئەو هەمی ب ڤی حوکمی رازی بوون.

و ئەو رەنگێ نوکە کەعبە پێ دئێتە دیتن ئەوە یێ قورەیشییان کەعبە پێ ئاڤاکری، هەر چەندە ئەو ب تمامی نە ئەو رەنگە یێ ئیبراهیم و ئیسماعیلی کەعبە پێ ئاڤاکری.

# دەسپێکا پێغەمبەرینییێ

بەری نۆکە مە گۆتبوو: هەر ژ زارۆکینییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خودێ دینێ کافر و صەنەمپەرێسان ل بەر چاڤان ڕەش کربوو، لەو وی ڕوییێ خۆ ژ ڤی دینی وەرگێڕابوو و ڕۆژەکا ب تنێ عەقلێ وی ژێ نەبڕی بوو، و دەمێ ئەو بوویە زەلام دویراتییەکا ئێکجار کەفتبوو ناڤبەرا وی و دینێ مللەتێ وی، وی بەرێ خۆ دایێ هندەک کەسێن کێم هەبوون خودێ دنیاسی، و ب تنێ عەبدینییا وی ل سەر دینێ ئیبراهیم پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر، و ئەو ئەو بوون یێن دگۆتنێ: (حەنیفی)، و خودێ وەسا حەزکر کو بەرێ پێغەمبەرێ خۆ ژی بدەتە ڤی دینی.

ئەو مرۆڤێن هە، یێن پشتا خۆ دایە صەنەمپەرێسییا قوەریشییان گەلەک نەخۆشی ژ دەستێ بێ باوەران ددیت حەتا دویماهییێ ئەو بۆ خۆ ڕەڤین و قەستا چیایێن دەور و بەرێن مەکەهێ کرن، و ل وێرێ ئەو ب تنێ مانە د شکەفتان ڤە؛ دا هزرێن خۆ د مەزنییا خودێ دا بکەن، و ب دلێ خۆ عەبدینییا وی بکەن.

**پێغەمبەر ل شکەفتا حیرائێ:**

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ئێک ژ وان کەسان بوو یێن گەلەک خۆ ژ خەلکی ڤەدەر دکر؛ دا یێ پاراستی بت ژ خرابی و بێ دینییا وان، و هەر جار ئەو دچوو وێ شکەفتا دگۆتنێ: (حراء) ئەوا دکەفتە ژۆرییا مەکەهێ. دەیکا موسلمانان عائیشا[1] دبێژت: دەسپێکا پێغەمبەرینییا پێغەمبەری

---

(١) وەکی بوخاری ژێ ڤەدگوهێزت.

-سلاڤ لێ بن- خەونێن باش بوو، هەر خەونەکا وی ددیت ئەو وەکی گەشاتییا سپێدێ دهات، یەعنی: چو خەونێن وی خەلەت دەرنەدکەفتن، هەر وەکی خودایێ مەزن دڤیا ب ڤان خەونێن ئێک و ئێک پێغەمبەرێ خۆ ئاگەهدار بکەت کو ئەو مرۆڤەکێ پیرۆزە و بۆ کارەکێ مەزن یێ دئێتە ئامادەکرن. عائیشا دبێژت: پشتی ڤێ چەندێ ل بەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتە شرین کرن کو ئەو یێ ب تنێ بت، ڤێجا ئەو دچوو شکەفتا (حیرائێ) و ل وێرێ عیبادەت دکر، شەڤێن درێژ و ب هژمار ئەو دما ل وێرێ، و هەر جار دا زڤڕتە نک بچویکێن خۆ و هندەک خوارنێ بۆ خۆ بەت و زڤڕتەڤە، حەتا جارەکی حەقی بۆ هاتی دەمێ ئەو ل شکەفتێ.

ژ گۆتنا عائیشایێ یا بۆری و ژ گۆتنا دیرۆکڤانێن ژینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دئێتە زانین کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گەلەک جاران ب شەڤ و ڕۆژ دچوو شکەفتێ، و ب تنێ ل وێرێ دما، و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە، دبێژن: خەدیجایێ گەلەک جاران مرۆڤەک ب دویڤ وی دا دهنارت؛ دا نۆبەدارییێ لێ بکەت، و نەهێلت چو نەخۆشی بێنە سەری، بێی ئەو بزانت، و ئەڤە ژی هندێ دگەهینت کو دلێ کابانییا وی ب دویڤ ڕابوو، بەلێ چونکی وی ب ڤێ چوونا هە خۆش بوو خەدیجایێ دل نەددا بێژتێ: نەچە، و وی دیت یا ژ هەمییێ چێتر ئەوە ئەو هندەک نۆبەداران د دویڤ دا بهنێرت دا ئەو وی بپارێزن ئەگەر نەخۆشییەک هاتە ڕێکێ.

ل وێ سالا ژییێ وی بوویە چل، وەکی گەلەک سالێن دی ل هەیڤا ڕەمەزانێ، وی کارێ خۆ کر و قەستا چیایێ حیرائێ کر.. و وێ سالێ -وەکی زانایێن سالنامەیان دبێژن- هەیڤا ڕەمەزانێ دکەفتە بەرانبەر هەیڤا تیرمەهـ و تەباخێ، و سال -ل دویڤ سالنامەیا زایینی- سالا (٦١٠) بوو، وەکی مە گۆتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کارێ خۆ کر، و قەستا وی چیایی کر ئەوێ

دکەفتە باکووری ڕۆژهەلاتا مزگەفتا حەرام ل مەکەهێ، ئەوێ بەرێ دگۆتنێ: چیایێ حیرائێ، و نوکە دبێژنێ: چیایێ نوور، و ئەو چیا نێزیکی (٢٨٠) متران ژ عەردی یێ بلندە، و ل سەرێ وی شکەفتەکا بچویکا هەی درێژییا وێ نێزیکی سێ مترانە، و فرەهییا وێ د ناڤبەر متر و نیڤ حەتا دو مترانە، و مرۆڤ ل سەرێ ڤی چیایی مەکەهێ و دەور و بەرێن وێ هەمییێ دبینت.

ل شەڤەکێ ژ وان شەڤێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب تنێ مایە ل شکەفتێ، کو ئێک ژ شەڤێن هەیڤا رەمەزانێ بوو، و هنگی ژییێ وی چل سال و شەش هەیڤ و نێزیکە هەژدە ڕۆژان بوو، وی سەرهاتییەکا عنتیکە و نەعەدەتی دیت، ئەو سەرهاتییا نە ب تنێ ژینا وی گوهاڕتی، بەلکی ژینا مرۆڤینییێ هەمییێ گوهاڕتی.

و ئەو سەرهاتی -وەکی ئەو ب خۆ ڤەدگێڕت- ئەڤە بوو، دبێژت: دەمێ ئەز ل شکەفتێ من هند دیت کەسەک ب زۆر کەفت و ب نک من ڤە هات، و گۆت: (إقرأ - بخوینە)، من گۆتێ: ئەز نە یێ خواندەڤامە، وی ئەز گرتم و گڤاشتم حەتا بێهنا من چک کری، پاشی ئەز بەردام و جارەکا دی گۆت: بخوینە، من دوبارە گۆتێ: ئەز نە یێ خواندەڤامە، جارەکا دی وی ئەز گرتم و گڤاشتم، پاشی ئەز بەردام و گۆت: تو ب ناڤێ خودایێ خۆ بخوینە، یەعنی: بلا تو یێ خواندەڤان نەبی ژی، تو ب شیان و هاریکارییا خودایێ خۆ دێ خوینی، ئەو خودایێ مرۆڤ ژ پارچەکا خوینێ دورستکری، و مرۆڤ فێری وی تشتی کری یێ وی نەدزانی: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۝٣ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝٥ ﴾ (العلق: ١-٥)، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئینا من ئەو د دویڤ وی دا خواند.

د ریوایەتەکا دی دا هاتییە: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: دەمێ جبریلی ئەز گرتیم و گڤاشتیم، من وەسا هزر کر ئەڤە مرنە ب سەر من دا هات. پاشی دبێژت: پشتی جارا سێیێ وی ئەز گڤاشتیم و گۆتییە من: بخوینە، من گۆتێ: چ بخوینم؟ وی گۆت: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ٢ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ٣ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ٥ ﴾، گۆت: من پشتی وی ئەو خواند، دا بێژی ل سەر دلێ من یا هاتییە نڤیسین.

ڤێ چەندێ ترس د دلێ پێغەمبەری دا پەیدا کر، و ئەو حێبەتی کر.. و بیننە بەر چاڤێن خۆ:

د شکەفتەکا تەنگ و تاری ڤە، ل سەرێ چیایەکێ بلند، بلندتر ژ وان هەمی چیا و گرگێن ل دەور و بەران هەین، و ب شەڤ دەمێ هەر تشتەک یێ بێ دەنگ، مرۆڤەک ئەگەر چەند یێ ب جەرگ ژی بت، ل وێرێ یێ روینشتی بت، و کەفتبتە هزران، و ب خافلەتی ڤە ملیاکەتەک بێت و وی بگرت و بگڤێشت و بێژتێ: بخوینە.. چ ترس ل نک خودانی دێ پەیدا بت؟ و چاوا ئەو دێ وێ شەڤا خۆ بۆرینت حەتا لێ دبتە سپێدە؟

ئەڤە چییە ب سەرێ وی هاتی؟ و ئەڤە کییە خۆ نیشا وی دای؟ تو بێژی ئەڤە ئەجنەک بت و ئەو دێ دین بت؟ یان ئەڤە ئەو شەیطانە یێ ئیلهامێ ددەتە شاعران؟

ژ ترسان دا.. ژ حێبەتییان دا، ژ هەیبەتا جهی و رویدانێ.. لەشێ وی گران بوو، رەجفی، تایێ ئەو گرت، دا بێژی ئەڤە چەندە ئەو یێ نساخ، ب چی حالێ هەیی وی خۆ گەهاندە مال، ژنکا وی خەدیجایێ گوهۆڕینەکا غەریب ل سەر سیمایێ وی دیت، پێ حسیا کو هەر وەکی تشتەکێ مەزنێ ب سەری هاتی، بەلێ ژ بەر کو ئەو ژنەکا تێگەهشتی و ب عەقل بوو، وێ

ب شارەزایی هەلویست ستاند، خەدیجایێ چو ترس د خۆ نەئینادەرێ، و ئەو نەما پێڤە کانێ تە چییە و چ ب سەرێ تە هاتییە؟ و نەبوو هەوار هەوارا وێ؟ وێ بێ دەنگی و رحەتی پێشوازی ل زەلامێ خۆ یێ خۆشتڤی کر، پێغەمبەری گۆتێ: من بپەچنن، من بپەچنن!

خەدیجایێ جهەک بۆ وی بەرهەڤکر، و پشتی وی خۆ درێژکری ژنکا وی لحێفەک ب سەر دادا، و ب ترسەکا ڤەشارتی خۆ گرت حەتا زەلامێ وێ تەنا ببت، و ئەو ب خۆ ڕابت و سوحبەتا خۆ بۆ وێ بکەت.. و وەسا چێبوو، پشتی دەمەکی ئەو د ناڤ جهی دا مای، ترس و لەرزینا وی نەما، و ئەو ڕابووڤە و سوحبەتا خۆ هەمی بۆ کابانییا خۆ کر، و وی گۆت: ئەز ژ خۆ ترسییام.. یەعنی: ئەز دترسم ئەڤە دیناتییەک بت گەهشتییە من، یان موصیبەتەک بت خودێ دایە من.

هنگی خەدیجایێ ب ڕویەکێ گەش و رحەتی ڤە گۆتێ: نە، نەترسە، ئەز ب خودێ کەمە خودێ تە شەرمزار ناکەت؛ تو کەسەکێ ب مرۆڤاینی یی، و تو هاریکارییا مرۆڤێن پێتڤی دکەی، و دەستێ خۆ بۆ کەسێن هەوجە درێژ دکەی، و تو مێڤانان دحەوینی، و تو زەلامێ تەنگاڤییانی.

ب ڤی ڕەنگی ژنکا چاک و تێگەهشتی بۆ زەلامێ خۆ دبتە پشتەڤان و هاریکار، خەدیجایێ دلێ وی موکم کر، و باوەرییا وی ب وی زێدەتر لێ کر، و نەهێلا ل دەمێ تەنگاڤییێ ئەو هەست ب لاوازییێ بکەت، یان هزر بکەت ئەو یێ ب تنێیە!

و پشتی خەدیجایێ ئەڤ سەرهاتییا عنتیکە ژ زەلامێ خۆ گوهـ لێ بووی، و ژ بەر کو وێ پسمامەکێ پیر هەبوو، ل دنیایێ گەڕیابوو، و چووبوو سەر دینێ عیسای، و کتێبێن ئسرایلییان ب ئەزمانێ وان دخواندن، هندەک جاران وێ بەحسێ پێغەمبەران و وەحیێ و ملیاکەتان ژ وی گوهـ لێ دبوو،

ئێکسەر هاتە سەر هزرا وێ: بەلکی ئەڤا موحەممەدی دیتی وەحی بت، و ئەوێ ل شکەفتێ هاتییە نک ملیاکەت بت، ئاخری ئەو یێ بەحسێ خودێ و خواندنێ و ئافراندنێ دکەت؟ و ئەڤە کارێ ئەجنە و شەیطانان نینە.. دەمێ ئەڤ هزرە بۆ خەدیجایێ چێبووی، وێ گۆتە زەلامێ خۆ: پسمامەک من هەیە تشتەکی ژ ڤان کاران دزانت، بۆچی ئەم ناچینە نک و پسیارا خۆ ب وی بکەین؟

### د گەل وەرەقەیێ کورێ نەوفەلی:

وەرەقە کورێ نەوفەلی بوو، و نەوفەل و خوەیلدێ بابێ خەدیجایێ برایێن ئێک بوون، هەردو کورێن ئەسەدێ کورێ عەبدلعوززای بوون.. دەمێ ئەڤ سەرهاتییە چێبووی ئەو گەهشتبوو دووماهییا عەمرێ خۆ، ب ناڤ سال ڤە چووبوو و کۆرە بووبوو، و وەکی بەری نوکە ژی مە گۆتی ئەو ئێک ژ وان خودێناسان بوو یێن نە ل سەر دینێ قورەیشییان یێ صەنەمپەرێس، دەمێ هێشتا ئەو یێ جحێل عەقلێ وی ژ صەنەمپەرێسییا مللەتێ وی نەدبری، لەو وی رویێ خۆ ژ دینێ وان وەرگێرابوو، و باوەری پێ نەبوو، و ئەو د ڤێ چەندێ دا وەکی زەیدێ کورێ عەمری بوو، ئەوێ بەری نوکە مە بەحسێ وی کری، و جارەکێ ئەو هەردو ژ مەکەهێ دەرکەفتن و قەستا شامێ کرن گۆتن: بەلکی ئەم ب سەر دینێ ئیبراهیمی یێ دورست هلبین؛ چونکی نابت ئەڤ دینێ قورەیشی ل سەر دینێ ئیبراهیمی بت، و پشتی گەریانەکا دویر و درێژ و ئاگەهداربوونا وان ب دینێ جوهی و فەلان، زەیدی گۆت: د گەل کو ئەڤ دینە ژ یێ قورەیشییان چێترن، بەلێ ئەو ژی نە ئەو دینە یێ ئیبراهیم ل سەر، لەو ئەو زڤری مەکەهێ و گۆت: ل دویڤ ئجتهادا خۆ ئەز دێ عیبادەتێ خودێ کەم، و وی دینێ قورەیشییان هاڤێت.. بەلێ وەرەقەیێ کورێ نەوفەلی ئەو دین بۆ خۆ هلبژارت یێ فەلە ل سەر و دگۆتن: ئەڤە دینێ

عیسایە -سلاڤ لێ بن-، و وی خۆ فێری ئەزمانێ وان کر، و کیتابا وان یا پیرۆز ب ئەزمانێ وان دخواند، و زڤڕی مەکەهێ.. و وی ژی خۆ ژ خەلکێ مەکەهێ ڤەدەر کر، و دینێ وان هاڤێت.

گاڤا خەدیجایێ ئەو سەرهاتی ژ زەلامێ خۆ گوهـ لێ بووی یا شڤێدی ل شکەفتێ هاتییە سەری، ئێکسەر بیرا وێ ل وەرەقەیێ پسمامێ وێ هاتە ڤە، و ئەو بوو وێ ژ زەلامێ خۆ خواست ئەو پێکڤە بچنە نک وەرەقەی دا ئەو سەرهاتییا خۆ بۆ بێژت، و پسیارا ڤێ چەندێ ژ وی بکەت، و گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سوحبەتا خۆ بۆ وی کری، وەرەقەی گۆتێ: ئەڤە ئەو (ناموسە) یێ خودێ بۆ مووسای دهنارت، خوزی ئەز یێ جحێل بام، خوزی ئەز مابامە زێندی دەمێ مللەتێ تە تو دەردئێخستی!

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ گۆتنا وی عەجێبگرتی ما، یا ئەو دزانت مللەتێ وی گەلەک حەز ژ وی دکەن، ڤێجا چاوا نەڤیانا وان بۆ وی دێ گەهتە پێکەکێ کو وی بکەنە دەرێ! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب عەجێبی ڤە گۆت: ئەرێ ما ئەو دێ من دەرێخن؟

وەرەقەی گۆتێ: بەلێ، چو زەلام ب وێ نەهاتینە هنارتن یا تو پێ دئێیە هنارتن ئەگەر دوژمناتییا وی نەهاتبەکرن، و ئەگەر ئەز گەهشتمە ڕۆژا تە، ئەز باش دێ پشتەڤانییا تە کەم.

بەلێ خوزییا وەرەقەی ب جهـ نەهات؛ چونکی د وێ هەیامێ دا ئەو مر، بەری هندەک وەحیا دی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بێتە خوارێ. و دیارە ئەڤ ئنیەتا وی یا چاک گەلەک فایدێ وی کر، جارەکێ پسیارا وەرەقەی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتەکرن، وی گۆت: من ئەو دیت، کراسەکێ سپی د بەر وی بوو، من ئەو ل نیڤا بەحەشتێ دیت، جلکەکێ سوندسی ل بەر بوو.

## ژنەك ئێكەمین موسلمان بوو:

ژبلی ڤی هەلویستێ سەرخۆ یێ خەدیجایێ د ڤێ سەرهاتیێ دا وەرگرتی، تشتێ شارەزایی وعەقلداریا وێ و پشتەڤانی و ئیخلاصا وێ بۆ زەلامێ وێ بەرچاڤ دکەت، ئەو ئێکەمین کەس بوو باوەری ب وی ئینای وەک پێغەمبەر، چونکی ئەو شاهدا گۆتنێن وەرەقەی بوو، و ئێکسەر باوەری ژی ب وان گۆتنان ئینا، لەو خەدیجا دبتە ئێکەمین مرۆڤ باوەری ب ئیسلامێ ئینای، و ب ڤێ چەندێ ژنەک دبتە موسلمانا ئێکێ..

# چار پێپکێن ئێکێ
# یێن ڤێ گازییێ

**ڤەمانا وەحیێ**:

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتنێن وەرەقەی بهیستین، و دلێ وی تەنابووی کو ئەڤا وی دیتی نە دیناتی بوو، و ئەوێ وی دیتی نە شەیطان بوو، بەلکی ئەو چاڤەرێیێ کارەکێ مەزنە، ئەو د گەل ژنکا خۆ خەدیجایێ زڤڕی مال، و خۆ ل هیڤییا ڤەشارتییێن پاشەرۆژێ گرت، کانێ چ دێ چێ بت؟

و دەمەک چوو و چو دیار نەبوو.. هندەک دبێژن: ئەو دەم دو سێ سال بوون، و هندەک دبێژن: شەش هەیڤ بوون، و یا دورست وەکی ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی دئێتە ڤەگوهاستن چەند رۆژەک بوون، بەلکی هەیڤەک ژی تێ نەبت، بەرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ما ل وی ملیاکەتی ئەوێ ل شکەفتێ خۆ نیشا دای، و چو ژێ دیار نەبوو، و وەرەقە ژی یێ مری کو ئەو بچت جارەکا دی پسیارا خۆ پێ بکەت، وی هەست ب بێنتەنگییێ کر، و خوزی راهێلن کو ئەو ملیاکەت لێ بزڤڕتە ڤە، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بەحسێ ڤی دەمی دکەت و دبێژت: جارەکێ ئەز ب رێڤە دچووم، دەنگەک ژ عەسمانی هاتە من، من سەرێ خۆ بلند کر من دیت ئەو ملیاکەتێ ل شکەفتا حیرائێ هاتییە نک من د ناڤبەرا عەرد و عسمانی دا ل سەر کورسییەکێ یێ روینشتی بوو، ئەز ژێ ترسییام، و ئەز زڤڕیمە مال و من گۆت: من بپەچنن، من بپەچنن.. ئینا ئەڤ ئایەتە هاتنە خوارێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا

ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ۝٤ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ۝٥ ﴾ (المدثر: ١-٥)، و وەحییێ دەست پێ کر.

ب هاتنەخوارا سەرێ سوورەتا (العلق) نبووەتا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- دەست پێ کر، و ب هاتنەخوارا سەرێ سوورەتا (المدثر) ریسالەتا وی دەست پێ کر، جبریل هاتە نک و فەرمان لێ کر: ئەی ئەوێ خۆ پەچنی.. هلۆ، رابە سەر خۆ، رۆژا بێنڤەدانێ چوو، ئێدی تە و وەستیانێ ژڤانە، ژ ئەڤرۆ وێڤە دوژمنێن تە دێ مشە بن، و نەیارێن تە دێ زێدە بن، دڤێت تە دلەکێ پاقژ و مەزن و بێنەکا فرەهـ هەبت، دڤێت بەرێ تە ل خودایێ تە ب تنێ بت، و هەر رێ و گازییەکا هەبت ژ بلی رێیا خودایێ خۆ دڤێت تو خۆ ژێ بدەیە پاش. و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل ڤێ گازییێ رابوو، و ب دورستی ژ دەر حەقی وێ دەرکەفت، رابوو و حەتا رۆژا سەرێ خۆ بۆ جارا دویماهییێ دانای نەرڤینشت.

### ئیسلام د مالا خەدیجایێ دا:

ئاشکەرایە کو ئێکەمین مال رۆناهییا ئیسلامێ لێ بەلاڤبووی، ئەو مال بوو یا بوویە ئێکەمین جهـ پشتی شکەفتا حیرائێ وەحی لێ هاتییە خوارێ، مالا خەدیجایێ، ئەوا دکەفتە پشت مالا ئەبوو سوفیانی ل رۆژهەلاتا صەفا و مەروایێ، و ئێکەمین کەسی باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینای -وەکی مە بەری نوکە ژی گۆتی- کابانییا وی خەدیجا بوو، و ژ بلی خەدیجایێ و زارۆکێن وێ یێن هویر جحێلەکێ دی د ڤێ مالێ دا هەبوو وەکی کورێ مالێ دهاتە هژمارتن، ناڤێ وی زەید بوو.

زەید، ئەوێ عەمرێ وی دەمێ وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتی سیهـ سال -ل دویڤ گۆتنەکێ- مرۆڤەکێ عەبد بوو، دەمێ هێشتا ئەو یێ بچویک، هندەکان ئەو ژ بابێ وی حارثەیێ کورێ شەراحیلێ کەلبی دزی

بوو و بربوو فرۆتبوو، دبێژن: برازایەکێ خەدیجایێ ئەو کڕی بوو، و د گەل خۆ ئینابوو مەکەهێ و ئەو بۆ مـەتا خۆ خەدیجـایێ کرە دیاری، دا خزمـەتا وێ بکـەت، و هنـگی ئەو هێشتا یێ بچویـک بـوو، و دەمـێ خەدیجایێ شوی ب پێغەمبـەری کـری ژیـێ زەیـدی نێزیکـی پـازدە سـالان بـوو، و هنگـی خـەدیجایێ ئەو دا پێغەمبەری و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئـەو ئـازا کر، و ل دویـڤ دەسـت و دارێ سیسـتەمێ کۆلـەتییێ ئـەو بـوو (مـەولایێ) پێغەمبـەری، و هـەر چەنـدە وی مـاف هـەبوو ژی ژ نـک پێغەمبـەری بچت و بزڤرتە نـک مرۆڤێن خۆ، و وەک مرۆڤـەکێ ئـازاد بژیـت، بـەلێ ڤیانـا وی یـا زێـدە بـۆ پێغەمبـەری و گرێـدانا وی پێڤـە وە ل وی کـر ئـەو بمینتـە ل نـک پێغـەمبـەری، و ل وی دەمی عەرەبان عەدەتـەک هـەبوو دگۆتنێ: (تەبـەننی) ل دویـڤ ڤـی عـەدەتی زەلامی ماف هـەبوو بچویکـەکی ب خـودان بکـەت، و د ناڤ خەلکی دا ڕاگەهینت کو فلان بچویک کوڕێ منە، ب ڤێ چەندێ ئـەو کوڕ ژ هەمی لایان ڤـە وەکـی کـوڕێ وی مرۆڤـی یـێ ژ ڕاسـتی لـێ دهـات، و هنـدی پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- حـەز ژ زەیـدی دکـر، هیشـتا بـەری پێغەمبەرینییێ وی د ناڤ خەلکی دا ڕاگەهاندبوو کو زەید کوڕێ وییە، ژ بەر ڤێ چەندێ خەلکی دگۆتێ: زەیدێ کوڕی موحەممـەدی.. و پشـتی ئیسـلامێ ژی صەحابییان هەر ب ڤی نـاڤی گـازی وی دکـر، حـەتا ئـەڤ ئایـەتا قورئـانێ هاتییە خوارێ: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ ﴾ (الأحزاب: ٥)، پشتی هنگی ژ نوی خەلکی گـۆتێ: زەیـدێ کـوڕێ حارثـەی.. دەمـێ وەحـی بـۆ پێغەمبـەری هـاتی زەیـد ئێکەمـین کەس بوو ژ مەوالـییان (یەعنی: ژ عەبدان یێن کو هاتینە ئـازاکرن) بـاوەری پـێ ئینـای. و ژ بلـی خـەدیجایێ و زەیـدی مرۆڤـەکێ دی ژی هـەبوو گەلەک ب پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- یێ گرێدای بوو، لەو پترین جاران

ل مالا وی یێ ئامادە بوو، هەر چەندە ئەو زارۆک ژی بوو و هێشتا ل دۆرێن دەهـ سالییێ بوو، ئەو ژی پسمامێ وی عەلییێ کوڕی ئەبوو طالبی بوو.

یا بەلاڤ ل نک نڤیسەرێن سیرەتێ ئەوە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەلی ئینابوو نک خۆ ل مال، و وی ئەو ب خودان دکر، وەک هاریکاری بۆ مامێ خۆ ئەبوو طالبی، بەلێ چو ریوایەتێن دورست د ڤێ چەندێ دا نەهاتینە، و چ عەلی ل مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتبتە ب خودانکرن یان نە، ئەو بەردەوام ل ڤێ مالێ یێ ئامادە بوو، و ئەو ئێکەمین کەس بوو ژ زارۆکان باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینای.

## ئەبوو بەکر ئێکەمین گازیکەر بۆ ئیسلامێ:

نێزیکترین هەڤال پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ناڤ قورەیشییان دا هەی ئەبوو بەکر بوو[1]، ناڤێ وی یێ دورست بەری موسلمان ببت (عبد الكعبة) بوو، بەلێ پشتی ئیسلامێ وی ناڤێ خۆ کرە (عبد الله)، ئەو ژ بابکێ تەیمییان بوو، و ئەو د نسەبێ خۆ دا ل بابێ حەفتێ (موررەیێ کوڕێ کەعبی) دگەهتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ژ لایێ عەمری ڤە ئەو دو سێ سالان ژ پێغەمبەری بچویکتر بوو.

ژ بەر وێ هەڤالینییا موکم یا د ناڤبەرا پێغەمبەری و ئەبوو بەکری دا هەی نێزیک بوو هەر ڕۆژ ئەو ئێک و دو ببینن، بەلێ پشتی وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتی ئەو چەندەکێ ب ڤێ مەسەلێ ڤە موژیل بوو، و چەند ڕۆژەکان ژ ئەبوو بەکری دویر کەفت، ئەبوو بەکری ئەڤ تشتە ب غەریبی ڤە وەرگرت، و پسیار کر: ئەرێ موحەممەدی خێرە نە یێ دیار؟ و وی ب گوهەکی ڤە گوهـ لێ بوو کو هەڤالێ وی یێ بەحسەکێ غەریب دکەت،

---

(١) ژیانا ئەبوو بەکری ب بەرفرەهی مە د کتێبا خۆ دا: (د گەل صەحابییێن پێغەمبەری) ڤەگێرایە، هەچییێ بڤێت دشێت لێ بزڤڕت.

و دبێژت: وەحی یا بۆ من هاتی و ئەزێ بوویمە پێغەمبەر.. ئینا ئەو ڕابوو قستا هەڤالێ خۆ کر دا ڕاستییا مسەلێ بزانت.

دبێژن: دەمێ ئەبوو بەکری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دیتی، پسیار ژێ کر: ئەرێ ڕاستە ئەوا قورەیشی دبێژن، کو تە خودایێن مە ب پشت گوهـ ڤە لێداینە، و دینێ مە خەلەت دەرێخستییە؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بەلێ، ئەز پێغەمبەرێ خودێمە، خودێ ئەزێ هنارتیم دا گازییا وی بەلاڤ بکەم، و ئەز داخوازێ ژ تە دکەم کو تو باوەرییێ ب حەقییێ بینی، و باوەرییێ بینی کو خودایەکێ ب تنێ هەیە یێ بێ شریک و بێ هەڤالە.

دەمێ ئەبوو بەکری ئەڤ گۆتنە ژ هەڤالێ خۆ گوهـ لێ بووین، وی ئێکسەر باوەری پێ ئینا و دەلیڤەیەکا ب تنێ ژی دودل نەبوو، لەو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د مەدحێن وی دا دبێژت: هەر کەسەکێ من ئەو بۆ ئیسلامێ ڤەخواند بت، ئەو ل سەری پیچەکێ یێ دودل بووی، ئەبوو بەکر تێ نەبت، دەمێ من ژێ خواستی ئەو باوەرییێ بینت، وی د گاڤێ دا باوەری ئینا، و وی قەت خۆ ڤەنەهێلا و دودل نەبوو.

موسلمانبوونا ئەبوو بەکری سەرکەفتنەکا مەزن بوو بۆ ئیسلامێ ژ گەلەک لایان ڤە:

- چونکی ئەبوو بەکر ئێک ژ ماقویل و تێگەهشتییێن قورەیشییان بوو، و گۆتنا وی سەنگا خۆ د ناڤ خەلکی دا هەبوو.

- دیسان چونکی ئەو مرۆڤەکێ زەنگین بوو، و وی ب مالێ خۆ یێ خودێ دایێ قەنجییەکا مەزن ل گازییا ئیسلامێ کر، و هاریکارییەکا زێدە بۆ خودان باوەران پێشکێش کر.

- و ژ لایەکێ دی ژی ڤە، دەمێ ئەبوو بەکر موسلمان بووی وی نەڤیا ئەو بێ دەنگ روینت، لەو وی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خواست ئەو دەستویرییێ بدەتێ؛ دا ئەو ڤێ گازییێ بگەهینتە هەڤالێن خۆ یێن نێزیک ژی.

و دەمێ پێغەمبەری دەستویری دایێ، وی ب مجدی ملێ خۆ دا بەر بارێ گازییا ئیسلامێ، و وی ژ هەڤالێن خۆ یێن نیزیک دەست پێ کر، و ئەو -پشتی پێغەمبەری سلاڤ لێ بن- ئێکەمین کەس بوو خەلک بۆ ڤی دینی گازی کرین..

و ب ڤێ چەندێ ئاشکەرا دبت کو هەر چار پێپکێن ئێکێ و یێن سەرەکی یێن ڤێ گازییێ -پشتی پێغەمبەری سلاڤ لێ بن- ئەڤ هەر چارە بوون:

خەدیجا ژ ژنان، و ئەبوو بەکر ژ زەلامێن ئازاد، و زەید ژ زەلامێن مەوالی، و عەلی ژ زارۆکان.. و ل سەر ڤی بناخەیێ پیرۆز ئاڤاهییێ ب بەرەکەتێ ئیسلامێ هاتە دانان.

# موسلمانێن دەسپێکێ
# و قووناغا مالا ئەرقەمی

## موسلمانێن دەسپێکێ:

مە گۆت: ل هەیڤا رەمەزانێ (بەرانبەر هەیڤا تەباخێ ژ سالا ٦١٠ ز)، ل وێ سالا ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بوویە چل سال، وەحی بۆ وی هاتە خوارێ، و پێغەمبەرینییا وی دەست پێ کر، و هەر ژ رۆژێن ئێکێ پشتی دەسپێکرنا پێغەمبەرینییێ هژمارەکا مرۆڤان ژ ژن و مێران، ژ خەلکێ مالا وی و ژ هەڤالێن وی یێن نێزیک باوەری ب وی ئینا، و ل ڤێرێ ئەم دێ ناڤێن هندەک ژ وان کەسان ئینین یێن ل سەری باوەری پێ ئینای، وەکی د کتێبێن سیرەتێ و ژیانا صەحابییان دا مە دیتین:

١- خەدیجایا کچا خوەیلدی.

٢- زەیدێ کورێ حارثەی.

٢- عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی.

٤- ئەبوو بەکرێ صددیق. و بەری نوکە مە بەحسێ ڤان هەر چاران کر.

٥- کچێن پێغەمبەری: زەینەب و روقەییا (و ئەڤە هەردو دشویکری بوون) و ئوم کولثووم و فاطما (و ئەڤە هەردو د مالا پێغەمبەری دا بوون و دبچویک بوون)، یا مەزن زەینەب ژییێ وێ (١٩) سال بوو، و یا بچویکتر فاطما ژییێ وێ سێ چار سال بوون، دەمێ وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتی.

٦- عوثمانێ کوڕێ عەففانێ ئەمەوی، و ئەو زاڤایێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- روقەییایا کچا پێغەمبەری ل نک بوو، و ژییێ وی (٣٤) بوو.

٧- عەبدررەحمانێ کوڕێ عەوفی، ژییێ وی (٣٠) بوو.

٨- سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی، ژییێ وی (١٧) بوو.

٩- زوبەیرێ کوڕێ عەووامی، کوڕێ مەتا پێغەمبەری صەفییایێ بوو، ژییێ وی (١٢) بوو.

١٠- طەلحەیێ کوڕێ عوبەیدوللاهی، ژییێ وی (١٣) بوو.

**(وئەڤ هەر پێنجە ب رێکا ئەبوو بەکری موسلمان بووبوون، چونکی ئەو هەڤالێن وی بوون).**

١١- سەعیدێ کوڕێ زەیدێ کوڕێ عەمرێ تەیمی، پسمامێ عومەری و زاڤایێ وی، خویشکا عومەری فاطما ل نک بوو، و ژییێ وی دەمێ موسلمان بووی ل دۆرێن (١٥) سالییێ بوو.

١٢- ئەبوو عوبەیدە عامرێ کوڕێ جەرراحی، ژییێ وی (٢٧) سال بوو.

**(و ئەڤ هەر هەشت کەسێن دویماهییێ ژ وان دەهـ کەسان بوون یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگینی ب چوونا بەحەشتێ د ساخییا وان دا دایێ، ویێ نەهێ عەلییە و بەری نوکە مە بەحسێ وی کرییە، و یێ دەهێ عومەرە، و ئەو پشتی وان موسلمان بووبوو).**

١٣- ئەبوو سەلەمە، عەبدوللاهێ کوڕێ عەبدلئەسەدی، کوڕێ مەتا پێغەمبەری بەررایا کچا عەبدلموطەلبی بوو، و برایێ وی یێ شیری بوو.

١٤- جەعفەرێ کوڕێ ئەبوو طالبی، پسمامێ پێغەمبەری.

١٥- عوبەیدەیێ کورێ حارثێ کورێ عەبدلموططەلبی، پسمامێ پێغەمبەری، ل شەرێ بەدرێ شەهید بووبوو.

١٦- خەبابێ کورێ ئەرەتتی، و هندەک دبێژن: ئەو مرۆڤێ شەشێ بوو هاتییە د ئیسلامێ دا، کارێ ئاسنگەریێ و صنعەتکاریێ دکر، و ئێک ژ وان بوو یێن کافران گرتی و تەعزیب دای؛ چونکی ئەو مرۆڤەکێ هەژار و بێ خودان بوو.

١٧- عوثمانێ کورێ مەظعوونێ جومەحی، و هندەک دبێژن: ئەو کەسێ حەفتێ بوو هاتییە د ئیسلامێ دا.

١٨- عامرێ کورێ فەهیرەی، و ئەو عەبدەکێ ڕەش بوو، ژ وان بوو یێن کافران گرتی، و تەعزیب دای؛ دا ژ دینێ خۆ لێڤە ببت، ئەبوو بەکری ئەو ژ وان کڕی و ئازاد کر.

١٩- ئەبوو حوذەیفە کورێ عوتبەیێ کورێ ڕەبیعەی، بابێ وی ئێک ژ مەزنێن مەکەهێ بوو.

٢٠- مەعمەرێ کورێ حارثێ جومەحی، و هەردو برایێن وی حاطەب و حەططاب ژی پشتی هنگی موسلمان بووبوون.

٢١- واقدێ کورێ عەبدللاهێ تەمیمی.

٢٢- مەسعوودێ کورێ ڕەبیعێ قاری.

٢٣- حاطەبێ کورێ عەمری.

٢٤- عەبدللاهێ کورێ جەحشێ کورێ رئابی، کوڕمەتێ پێغەمبەری بوو.

٢٥- عامرێ کورێ ڕەبیعەی.

٢٦- عەبدللاهێ کورێ مەسعوودی، و هندەک دبێژن: ئەو کەسێ (٢٣) بوو موسلمان بووی.

٢٧- عیاشێ کوڕێ عەمرێ مەخزوومی.

٢٨- نوعەیمێ کوڕێ عەبدللاهێ نەححام، و هندەک دبێژن: ئەو کەسێ دەهێ بوو هاتییە د ئیسلامێ دا، ل شەڕێ موئتە شەهید بووبوو.

٢٩- سولەیطێ کوڕێ عەمری، ل شەڕێ یەمامێ شەهید بووبوو.

٣٠- ئەرقەم ئەوێ پاشی دێ بەحس ژێ کەین.

ئەڤە ژ زەلامان، و ژ ژنان:

٣١- ئەسمائا کچا عومەیسی، ژنکا جەعفەرێ کوڕێ ئەبوو طالبی.

٣٢- فاطمایا کچا خەططابی، خویشکا عومەری، و ژنکا سەعیدێ کوڕێ زەیدی.

٣٣- ئەسمائا کچا ئەبوو بەکری، ژنکا زوبەیرێ کوڕێ عەووامی.

ئەڤە هندەک ژ وان بوون یێن ل هەیڤێن ئێکێ ژ گازییا ئیسلامێ موسلمان بووین، بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بچتە د مالا ئەرقەمی ڤە، و دو مەسەلە هەنە ل ڤێرێ فەرە ئیشارەت بۆ بێتە دان:

**یا ئێکێ:** بارا پتر ژ ڤان یێن باوەری ب ئیسلامێ ئینای، د گەنج بوون، تشتێ هندێ دگەهینت کو بارێ گرانێ هەر گازییەکێ پتر دکەفتە سەر ملێن گەنجان.

**یا دوویێ:** گەلەک ژ ڤان کەسێن ل سەری باوەری ئینای، ژ کوڕێن مال مەزن و ماقویلێن مەکەهێ بوون، و وەسا نینە وەکی هندەک هزر دکەن کو ل سەری بەس مرۆڤێن هەژار و عەبد و بێ خودان باوەری ئینابوو.

ئەرێ ڕاستە موسلمانێن دەسپێکێ هەمی هەژار و عەبد بوون؟

بەلکی ل نک گەلەک کەسان ئەڤ پسیارە یا زێدە بت، چونکی ئێک ژ مەسەلەیێن زێدە بەلاڤ د سیرەتێ دا ئەوە کو ئەو موسلمانێن ل سەری

باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینای هەمی، یان بارا پتر، ژ عەبد و هەژار و بێ خودانان بوون، و حەتا ڤێ گۆتنێ هندەک جاران ئەم د کتێبێن سیرەتێ ژی دا دبینین، و ئەو ب خۆ چو ڕاستی بۆ ڤێ گۆتنێ نینە؛ چونکی دەمێ ئەم ناڤێن موسلمانێن دەسپێکێ دخونین، ئەم دبینین پترییا وان ژ قورەیشییانە، و هژمارەکا نە یا کێم ژ وان ژ مالێن مەزن و خودان سەنگن..

د سەرژمێریەکێ دا کو بۆ (٦٧) کەسان هاتییەکرن ژ وان یێن ل سەری موسلمان بووین، و بەری نوکە مە ناڤێن پتر ژ (٣٠) ژ وان ڤەگێڕاینە، ئەڤ ئەنجامە دەرکەفتیە:

(٤٢) کەس ژ وان (٣٢) زەلام و (١٠) ژن ژ قورەیشییان بوون، ژ مال و ئویجاخێن مەزن، (١٢) ژ عەشیرەتێن دی یێن عەرەبان بوون، و (١٣) ب تنێ ژ وان عەبد و مەوالی و بێ خودان بوون.. مەعنا ژ هەر پێنج کەسان ئێک یێ هەژار و عەبد بوو، ڤێجا چ مەعنا بۆ وێ گۆتنێ نینە یا مە گەلەک جاران گوهـ لێ دبت دەمێ دبێژن: ئەوێن ل سەری باوەری ئینای هەمی عەبد و فەقیر و هەژار بوون. و بەلکی پسیارەک ل ڤێرێ بێتەکرن: ئەرێ بۆچی ئەڤ گۆتنە هندە بەلاڤبوویە مادەم چو ڕاستی بۆ نینە؟

و بەلکی دو ئەگەر د پشت ڤێ چەندێ ڕا هەبن:

**یا ئێکێ:** کافرێن قورەیشیان، دەمێ دەست ب عەزابدانا موسلمانان کری ژ بەر هندەک (ئعتباراتێن عەشائیری) کەربا خۆ پتر دارێتە سەر وان موسلمانێن بێ خودان و عەبد و هەژار.. ڤێجا دەنگ و باسێن وان پتر بەلاڤبوون، و ناڤێن وان پتر ب بەر گوهێن مە کەفتن، حەتا هزر هاتییەکرن کو موسلمانێن دەسپێکێ بەس ئەون.

**یا دووێ:** د سەرهاتییا چوونا ئەبوو سوفیانی دا بۆ نک هیرەقلی، هاتییە: هیرەقلی پسیار ژ ئەبوو سوفیانی کر: مرۆڤێن عسلی و مال مەزن پتر باوەرییێ پێ دئینن یان لاواز و هەژار؟ وی گۆت: لاواز و هەژار، هیرەقلی گۆت: دویکەفتیێن پێغەمبەران دوەسانە.. ئەڤ گۆتنا ئەبوو سوفیانی و هیرەقلی ل نک گەلەک نڤیسەرێن سیرەتێ بوویە بناخە، بۆ ئاڤاکرنا حوکمێ بۆری، بێی ئەو بەرێ خۆ بدەنە ناڤێن وان موسلمانان یێن ل سەری موسلمان بووین.

## بەر ب مالا ئەرقەمی ڤە:

هەر ژ دەسپێکێ ئیسلام گازییەکا دویر بوو ژ هەمی ڕەنگێن (طەبەقییەتێ)، د ناڤ وان دا یێن موسلمان بووین قورەیشی و نە قورەیشی هەبوون، ژن و مێر، مرۆڤێن ئازاد و دەولەمەند و مال مەزن هەبوون، و هەژار و عەبد و مرۆڤێن بێ خودان ژی هەبوون، و ژ قورەیشییان ب خۆ ژی ژ هەمی بابکان هەبوون، ژ هاشمییان، ژ ئەمەوییان، ژ مەخزوومییان، ژ تەیمییان.. و گەلەکێن دی ژی، تشتێ هندێ دگەهینت کو ئیسلام نە گازییا تەخەیەکا جڤاکی بوو دژی تەخەیەکا دی، بەلکی ئەو گازییا تەوحیدێ بوو دژی هەمی ڕەنگێن شرکێ و جاهلییەتێ.

و ل ڤی دەمی ژ گازییا ئیسلامێ (ل هەیڤێن ئێکێ، کو ب دورستی مە نەزانییە چەند هەیڤ بوون) پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی دەمێ ڤیابا عیبادەتێ خودێ بکەن دا ژ باژێری دەرکەڤن، و چنە وان دۆل و نهالێن ل دۆرێن مەکەهێ هەین، و ل وێرێ نڤێژ دکرن؛ بۆ هندێ دا کافر وان نەبینن و پێ نەحەسییێن..

جارەکێ ژ وان جاران چەند صەحابییەکان ل نهالەکێ نڤێژ دکر، هندەک کافر ب سەر هلبوون، پشتی ب نک ڤە هاتین، گۆتنێ:

- ئەڤە چ تشتێ غەریبە هوین دکەن؟

وان گۆت: ئەڤە نڤێژە ئەم بۆ خودایێ خۆ دکەین..

گاڤا وان کافران زانی کو ئەو یێ عیبادەتێ خودایەکێ دی ژ بلی صەنەمێن وان دکەن، وان پێ نەخۆش بوو، و شەرەدەڤەک د ناڤبەرا وان دا چێبوو، و دویماهییێ مەسەلە گەهشتە هندێ ئەو لێککەفتن.. سەعدێ کورێ ئەبوو وەققاصی ئەوێ هنگی د گەل موسلمانان، هەستییەکێ حێشترێ ڕاکر و ل سەرێ کافرەکی دا و سەرێ وی شکاند.

دبێژن: ئەڤە ئێکەمین خوین بوو د ئیسلامێ دا هاتییە ڕێتن!

و پشتی ڤێ سەرهاتییێ سوحبەتا موسلمانان ل مەکەهێ بەلاڤبوو، و موسلمان ئێدی ژ خۆ ترسییان دەرکەڤنە چۆلی، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هزر د هندێ دا کر ڕێکەکا دی بۆ موسلمانان ببینت..

### ل مالا ئەرقەمی:

تشتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هزر تێدا کری ئەو بوو، جهەکی بۆ صەحابییێن خۆ دەسنیشان بکەت، ئەو لێ بگەهنە ئێک، عیبادەتێ خودێ بکەن، و خۆ فێری دینێ نوی ژی بکەن، ب شەرتەکی ئەڤ جهە یێ ئەمین بت، کافر چو هزرێ بۆ نەکەن، و زوی ب زوی پێ نەحەسییێن؛ دا نەخۆشییێ لێ نەگەهیننە موسلمانان و ل وان نەکەنە تەنگاڤی.. و بڕیار ئەو بوو صەحابی ل ڤی جهی بگەهنە ئێک و ل سەر دەستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خۆ فێری قورئانێ و ئەحکامێن دینی بکەن، پاشی هەر ئێک ژ وان بچت ل جهەکێ دی بگەهتە هژمارەکا دی یا خودان باوەران و وێ یا ئەو ژ پێغەمبەری فێربووی نیشا وان بدەت، ب تایبەتی ئەو خودان باوەرێن نەشێن بێنە وی جهی یێ پێغەمبەر لێ، وەکی ژنکان..

بەلێ ئەو جهێ ب کێر ڤی کاری بێت دێ کیژ جهـ بت؟

پشتی دەمەکی ژ هزرکرنێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مالا هەڤالێ خۆ ئـەرقـەمی بۆ ڤی کاری هلبژارت، و وی ئاگەهداریيا هەڤالێن خۆ کر کو ئـەو ب ڕەنگـەکێ ڤەشـارتی بێن و ل وێرێ کۆم ببن.. و بـەری ئـەم بەحسـێ ڤـێ مالێ بکەین، و وی دەورێ گرنگ یێ وێ گێڕای، مە دڤێت ل سەری خودانێ مالێ ب کورتی بدەینە نیاسین.

## ئەرقەم کی بوو؟

ئەرقـەم کـوڕێ ئـەبوو ئەرقـەمی بـوو، و نـاڤێ بـابێ وی یـێ دورسـت عەبدمەنافـە، کـوڕێ ئەسـەدێ کـوڕێ عەبـدللاهێ کـوڕێ عومـەرێ کـوڕێ مـەخـزوومییە، و مەخـزووم ئـەوێ بابکەکێ قورەیشییان پـێ دئێتـە نـاڤکرن، د نەسەبا خۆ دا دگەهتە باپیرێ قورەیشییان (نەضرێ کوڕێ کینانـەی)، و هـەر ئێکـێ د نەسـەبا خـۆ دا بگەهتـە (نەضـری) ژ عەشـیرا قورەیشـیان دئێتـە هژمـارتن، و ئـەڤ (نەضـرێ) هـە بـاپیرێ پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- یـێ یازدێ بوو.

پشـتی نەضری عەیالێ وی ل سەر هژمارەکا بابکـان هاتنە لێکڤـەکرن، و هـەر بابکـەک -وەکـی ژ نـاڤی دیـار- د نەسـەبا خـۆ دا دگەهشـتنە بابـەکی، هندەک هاشـمی بـوون، وەکـی بـاپیر و مـامێن پێغەمبـەری، و هنـدەک تـەیمی بوون، وەکی ئەبوو بەکری، و هندەک عەدەوی بوون، وەکی عومەری، و هندەک ئەمەوی بوون، وەکی عوثمانی، و هنـدەک مـەخزوومی بـوون، وەکـی ئەرقـەمێ ئەم نوکە بەحسێ وی دکەین.

و مـەخزوومی ئێـک ژ وان بابکـان بـوون یـێن حـەزدکر مـەزنییا قورەیشییان بێخنە دەستێ خۆ، و (عەمرێ کوڕێ هیشامێ مەخزوومی) ئەوێ ب ناسناڤێ (ئـەبوو جـەهلی) هاتییـە نیاسـین، کـو ئێـک ژ مـەزنێن مەکـەهێ بـوو ل دەمـێ هاتنا ئیسلامێ، د گۆتنەکا خۆ دا ئەگـەرا نـەباوەری ئینانا خۆ

ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ هندێ زڤراند، گۆت: مە و بنەمالا عەبدمەنافی هەڤرکی ل سەر مەزنییێ کر، وان نان دا، مە ژی دا، هەر تشتەکێ وان کری مە ژی کر، حەتا دەمێ ئەم و ئەو وەکی ئێک لێ هاتین نوکە ئەو بێن و بێژن: پێغەمبەرەک ژ مەیە.. ئەڤێ چاوا ئەم دێ شێین کەین؟! نە ب خودێ ئەم قەت باوەرییێ پێ نائینین.

ل سەر ڤی بناخەیی مەزنێن بابکێ مەخزوومییان، وەکی ئەبوو جەهلی و وەلیدێ کورێ موغیرەی (بابێ خالدی)، ل پێشیا وان مەزنێن قورەیشییان بوون یێن ئالایێ نەیارەتییا ئیسلامێ و پێغەمبەری هلگرتی.. بەلێ د گەل هندێ ژی گەنج و زەلامێن مەخزوومییان هەر ژ سەری هاتنە د ئیسلامێ دا، و باوەری ب پێغەمبەری ئینا، و ئێک ژ وان ئەرقەم بوو.

دگۆتنە ئەرقەمی: بابێ عەبدللاهی، و عەبدللاهـ کورێ وی یێ مەزن بوو، رۆژا فەتحا مەکەهێ موسلمان بوو، و ئەو ژی دئێتە هژمارتن ئێک ژ صەحابییان، ئەرقەم ئێک ژ وان کەسان بوو یێن هەر زوی هاتینە د ئیسلامێ دا، ل هەیڤێن ئێکێ ژ گازییا ئیسلامێ، و هنگی ژییێ وی (١٦) سال بوو، و هندەک دیرۆکزان دبێژن: ئەو مرۆڤێ دەهێ بوو هاتییە د ئیسلامێ دا، و هندەکێن دی دبێژن: ئەو یێ دووازێ بوو. و هەر چاوا بت ئەو ئێک ژ وانە یێن هەر زوی دلێ خۆ بۆ رۆناهییا خودێ ڤەکری. و د دەر حەقا بابێ وی دا زانایێن دیرۆکا صەحابییان ب خیلاف چووینە کانێ ئەو هاتبوو د ئیسلامێ دا یان ل سەر کوفرێ مربوو، هەر چەندە هەمی ل سەر هندێ کۆمبووینە کو ئەو گەهشتبوو دەمێ هاتنا ئیسلامێ.

ئەرقەم ژ صەحابیێن نێزیک بوو بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هندەک دبێژن: ئەو ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن خواندن و نڤیسین دزانی، و ئەو و کورێ وی عەبدللاهـ ژی -پشتی هنگی- ژ وان کەسان بوون

یێن کاغەزێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دنڤیسین، و دەمێ دەستویری بۆ موسلمانان هاتییەدان کو ئەو ژ مەکەهێ مشەخت ببنە مەدینێ، ئەرقم ئێک ژ وان بوو یێن مشەخت بووین.

ل مەدینێ ژی ئەو ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن نێزیک ژ پێغەمبەری، و وی پشکداری د گەلەک شەڕان دا کربوو، وەکی شەڕێ بەدرێ.. و ئەو مابوو ساخ حەتا زەمانێ خیلافەتا موعاویەی -خودێ ژێ رازی بت-، و ل زەمانێ وی و ب دورستی ل سالا (٥٥) مشەختی، ل مەدینێ، ئەو چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ، و هەڤالێ وی سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی نڤێژ ل سەر کر، و ل (بەقیعێ) هاتە ڤەشارتن، و دەمێ ئەو مری ژیێ وی ژ حەشتێ سالان بۆری بوو.

کوڕێن وی عەبدللاه و عوثمان ژ صەحابییان دئێنە هژمارتن.

## مالا ئەرقەمی ل کیڤە بوو؟

زانایێن دیرۆکێ هەمی ل وێ باوەڕێنە کو مالا ئەرقەمی دکەفتە بنارێ گرێ صەفایێ ئەوێ ل رۆژهەلاتا کەعبێ، بەرانبەر وی روکنی یێ بەرێ ڕەش لێ، و ئاشکەرایە کو کەعبە (ئاڤاهییێ چارگۆشە) دکەفتە د نیڤا نهالەکێ ژ نهالێن مەکەهێ دا، ل لایێ رۆژهەلاتێ دو گرێن بچویک هەبوون دکەفتنە بەرانبەر ئێک، یێ بنی دگۆتنێ: صەفا، و یێ سەری دگۆتنێ: مەروە، ل پشتا گرێ صەفایێ چیایەکێ هەی دبێژنێ: چیایێ ئەبوو قوبەیس، مەعنا مالا ئەرقەمی دکەفتە ناڤبەرا گرێ صەفایێ و چیایێ ئەبوو قوبەیسی دا.. و د ژێدەرێن بەردەست دا چو سالۆخەتێن مالا ئەرقەمی ب بەر چاڤێن من نەکەفتینە، یێ چەند بوو؟ یان چەند مەزەل لێ هەبوون؟ بەلێ هزر بۆ هندێ دچت کو ئەو خانییەکێ بەرفرەهـ بوویە، چونکی هندەک جاران حەتا چل زەلامان لێ حازر دبوون، پشتی هنگی ئەگەر ئەو خانییەکێ بەرفرەهـ نەبا دبت

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو بۆ ڤی کاری نەهلبژارت با، و ئەڤ خانییە مابوو حەتا دەسپێکا زەمانێ دەولەتا عەبباسییان ژی، دەمێ خەلیفێ عەبباسی (ئەبوو جەعفەرێ مەنصوور) ئەو ژ نەڤیێن ئەرقەمی ب هەڤدە هزار دەرهەمان کڕی، پاشی دایە کوڕێ خۆ (مەهدی)، و مەهدی ئەو دا ژنکا خۆ خەیزورانێ (دەیکا هاروون ئەلرەشیدی)، لەوا ئەو خانی پشتی هنگی ب ناڤێ (مالا خەیزورانێ) دهاتە نیاسین، خۆ پشتی ئەو ژ خەیزورانێ گەهشتییە بویکا وێ زوبەیدایێ ژی، ژنا هاروون ئەلرەشیدی، ئەوا مزگەفتەک لێ ئاڤا کری.

ئەڤ خانییە نوکە نەمایە، و خۆ گرێ صەفایێ ب خۆ ژی وەک گر نەمایە، پشتی کەعبە هاتیە بەرفرەهکرن، و ل جهێ خانی دەرگەهەکێ کەعبێ هەیە، ب ڕەخ دەرگەهێ (السلام) ڤە، هندەک دەرەجێن کارەبێ یێن لێ هەین، دبێژنێ: دەرەجێن ئەرقەمی، ل وی جهی مالا ئەرقەمی دکەفتێ، ئەو مالا دیرۆکێ ناڤێ وێ پاراستی، خۆ پشتی زەمانی شوینوار لێ نەهێلاین ژی!

### پێغەمبەر چەند مابوو د مالا ئەرقەمی ڤە:

کتێبێن سیرەتێ ڕادگەهینن کو پشتی وێ ڕوی ب ڕویبوونا د ناڤبەرا هندەک صەحابییان و کافران دا چێبووی، ل وێ نهالا نێزیکی بازێڕێ مەکەهێ، دەمێ سەعدی خوین د سەرێ کافرەکی ئینای، پێغەمبەری بریار دا ئەو د گەل هەڤالێن خۆ ژ خودان باوەران ب ڕەنگەکێ ڤەشارتی ل مالا ئەرقەمی بگەهنە ئێک.. بەلێ ئەڤ ڕویدانە ل کیژ دەمی چێبووبوو؟ یەعنی: هلبژارتنا مالا ئەرقەمی کو ببتە (مەدرەسا ئێکێ) بۆ صەحابییان پشتی چەندێ ژ دەسپێکرنا گازییا ئیسلامێ بوو؟

ئـەڤ چەنـدە د ژێـدەرێن بەردەسـت دا ب دەسـت مـن نەكەفتییـە، لـەو دەسنیشانكرنا ڤی دەمێ هە ب دورستی نوكە ب من ڤە نائێت، بـەلێ تشـتێ مـرۆڤ دشـێت ب نیشـانان بگـەهتێ ئەڤەیـە: بـارا پتـر ژ ژێـدەران دبێـژن: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- سێ سالان مابوو د مالا ئەرقەمی ڤە، و ئەگەر ئەم ل بیـرا خۆ بینینـە ڤـە كـو قوناغـا مـالا ئەرقـەمی ب موسلمانبوونا عومـەرێ كـورێ خـەططـابی ب دویمـاهی دئێـت، و موسـلمانبوونا عومـەری ل دویـڤ دورستترین بۆچوونان ل سالا شەشێ بوو پشتی دەسپێكرنا ئیسـلامێ، مـەعنا دڤێت هلبژارتنا مالا ئەرقەمی ل سالا چارێ بت.

ژ لایـەكێ دی ڤـە ئەگـەر ئـەم سـەح بكـەینێ: وەحـی ل رەمـەزانێ بـۆ پێغەمبەری -سـلاڤ لـێ بـن- هـاتبوو خـوارێ، یـەعنی ل هـەیڤا نهـە، و چەنـد هەیڤـەك ب هندێ ڤـە چـوون حـەتا پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- زانـی ئەڤـە چییە د گەل وی چێبووی، دەمێ ئەو د گـەل خـەدیجایێ چوویـە نـک پسـمامێ وێ (وەرەقـەیـێ كـورێ نـەوفـەلی)، و پشـتی جارا ئێكـێ ژ هاتنـا وەحییـێ ل شـكـەفـتـێ وەحی دەمەكی راوەستییا، چەند رۆژەكان -یان چەنـد هەیڤـەكان ل دویـڤ گۆتنـەكێ-پاشـی جارەكـا دی وەحییـێ دەسـت پـێ كرەڤـە، هـەر سـێ هەیڤێن سالا ئێكێ چوون، و چەنـد هەیڤـەك ژ سـالا دویـێ ژی حـەتا گـازییێ دەست پێ كری.. سالا دووێ و یا سێیێ و نیڤەك ژ سـالا چـارێ ژی ب بـێ دەنگی ب رێڤەچوون، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هێدی هێـدی بـۆ ئیسـلامێ گازی دكرن، خەلكێ مالا خۆ و هەڤالێن خۆ یێن نێزیک، حەتا نێزیكی سیهـ مرۆڤەكان باوەری پێ ئینـای، و نـاڤێن هنـدەك ژ وان بـەری نوكـە مـە ڤـەگێرا بوون، و ل ڤی دەمی كافرێن مـەكەهێ هەر چـەندە ب وان دحەسییان ژی بەلـێ چـو پـویـتـە پـێ نـەدكـر، وان هزر دكر ئەڤە تشـتەكێ بەروەختـە و گازییـەكا ژ قەستایە دێ بێ دەنگ بت، بەلێ ل سالا چارێ و پشـتی كـافرێن مەكـەهێ

دیتی ئەڤ گازییە یا بەرفرەهـ دبت، و هندەک زەلام ژ مالێن مەزن و ماقویل ژی پێن دگەهنێ، ئێدی وان خەم ژ ڤێ مەسەلێ خوار، و ل دۆرێن نیڤا سالا چارێ هندەک (مواجهه) و ڕوی ب ڕوبوون د ناڤبەرا خودان باوەر و کافران دا پەیدابوون، وەکی وێ یا د ناڤبەرا سەعدی و هندەک کافران دا چێبووی، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرێ خۆ دایێ و گەهشتە وێ باوەرێ کو ئەگەر ئەڤ ڕوی ب ڕویبوونە بەردەوام ببن، دویر نینە کافر خودان باوەران بپرینن، ئینا وی بڕیار دا ب بێ دەنگی خودان باوەران ژ مەیدانێ ڤەکێشت، و ل جهەکێ ڤەدەر و دویر ژ چاڤێن کافران پەروەردە بکەت، حەتا ئەو ژ لایێ هژمارێ و پەروەردەیێ ژی ڤە بگەهنە وی ئاستی بشێن خۆ ل بەر سنگێ کافران ڕاگرن، ئەو بوو وی بڕیار دا هندەک صەحابییێن خۆ ل مالا ئەرقەمی کۆم بکەت، و پشتی هنگی ب چەند هەیڤەکان هندەکێن دی ژ وان هنارتنە حەبەشە..

و ل سەر ڤی بناخەیی ئەم دشێین بێژین: دویر نینە قوناغا مالا ئەرقەمی ل نیڤا دویێ ژ سالا چارێ پشتی گازیا ئیسلامێ دەست پێ کربت، و حەتا سالا شەشێ ڤەکێشابت.

## بۆچی مالا ئەرقەمی؟

پسیارا ل ڤێرێ دئێتە سەر هزرا مرۆڤی ئەڤەیە: ئەرێ بۆچی ژ ناڤبەرا هەمی مالان پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مالا ئەرقەمی هلبژارت؟ مالێ یان خودانێ مالێ تشتەکێ تایبەت ل نک هەبوو حەتا ئەو بۆ ڤی کارێ گرنگ بێنە هلبژارتن؟

بەری ئەم بەرسڤا ڤێ پسیارێ بدەین، دێ بێژین: یا بەرهزر ئەو بوو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مالا خۆ، یان یا ئێکی ژ بنەمالا هاشمییان وەکی مامەک ژ مامێن خۆ، یان حەتا مالا هەڤالەکێ خۆ یێ نێزیک وەکی ئەبوو

بەکری، بۆ ڤی کاری هلبژێرت.. بەلێ هنگی یا ب زەحمەت نەدبوو بۆ کافران کو ئەو زوی ب سەر جهێ وی هلببن، ئەگەر وان ئەڤ چەندە ڤیابا، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ ناڤبەرا صەحابییێن خۆ (ئەرقەم) هلبژارت، و بەلکی ئەڤ هلبژارتنە ژ بەر ڤان چەند ئەگەرەکان بت:

**یا ئێکێ:** ئەرقەم ژ بابکێ مەخزوومییان بوو، و وەکی بەری نوکە مە گۆتی ژی هەڤڕکییەک د ناڤبەرا بابکێ هاشمییان (ئەوێ پێغەمبەر ژێ) و بابکێ مەخزوومییان دا (ئەوێ ئەرقەم ژێ) هەبوو، لەو مەزنێن مەخزوومییان یێن وەکی ئەبوو جەهلی و وەلیدی سەرکێشییا نەیارەتییا پێغەمبەری دکر، و نەدهاتە سەر هزرا کەسێ کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مالا ئێکێ مەخزوومی بۆ جهێ کۆمبوونا خۆ و هەڤالێن خۆ هلبژێرت.

**یا دوویێ:** ئەرقەم هنگی جحێلەکێ پازدە شازدە سالی بوو، و پێغەمبەر یێ چل و چار سالی بوو، و قورەیشییان (تەوەققوعا) هندێ نەدکر، موحەممەد وان هەمی مرۆڤ و هەڤالێن خۆ یێن ل عەمرێ خۆ یان ب عەمرتر ژی بهێلت، و بچتە مالا جحێلەکێ پازدە شازدە سالی.

**یا سێیێ:** موسلمانبوونا ئەرقەمی د ناڤ خەلکێ مەکەهێ دا بەلاڤ نەبووبوو؛ چونکی ئەرقەم ب خۆ (و حەتا بابێ وی ژی) مرۆڤەکێ ناڤدار و پێشکێش نەبوو د ناڤ قورەیشییان دا کو خەلک دەنگ و باسێن وی بەلاڤ بکەن، یان ل دویڤ بچن.

**یا چارێ:** و هەر ژ بەر یا بۆری، کو ئەرقەم مرۆڤەکێ جحێل بوو و یێ ناڤدار نەبوو، هاتن و چوون گەلەک ل سەر مالا وی نەبوو، و بۆ کەسێ خەم نەبوو بزانت کانێ کی دچتە مالا وی، یان ناچت، و دڤێت ژ بیر نەکەین ژی کو مالا وی ئەوا دکەفتە بەر گرکێ صەفایێ حەتا حەددەکی یا دویر و ڤەدەر بوو ژ سەنتەرێ بازێڕی، و یا بەرچاڤ نەبوو.

ژ بەر ڤان ئەگەران، ل درێژییا سێ سالان کو ئەو دەم بوو یێ صەحابییان ل مالا ئەرقەمی بۆراندی، نەهاتییە زانین یان ڤەگێڕان کو جارەکا ب تنێ ژی کافر ب سەر ڤی جهی هلببن، یان (موداهەما) وی کربت، دەمێ ئەو ل موسلمانان دگەڕیان و دڤیان نەخۆشییێ بگەهیننێ.. حەتا جارەکێ دەمێ عومەری کەربێ گرتی و شیرێ خۆ ڕاکری دا بچت (موحەممەدی) بکوژت، ئەوێ (فتنە) د ناڤ خەلکی دا هلکری -وەکی وی گۆتی- نەزانی دێ وی ل کیڤە بینت، حەتا چوویە مالا خویشکا خۆ، و پاشی وی ل وێرێ زانی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هندەک صەحابییێن خۆ یێ ل مالا ئەرقەمی. مەعنا: خەبەرێ خۆڤەشارتنا موسلمانان ل مالا ئەرقەمی ل نک قورەیشییان تشتەکێ ئاشکەرا نەبوو، حەتا ئێکێ وەکی عومەری کو ل وی دەمی دوژمنەکێ دژوار بوو بۆ موسلمانان، و لێ دگەڕیا وان بێشینت و عەزاب بدەت، ئەڤ خەبەرە نەدزانی.

و تشتێ مە دڤێت ل ڤێرێ ئیشارەتێ بدەینێ ئەوە: نە ل وی دەمی یێ صەحابی ل مالا ئەرقەمی، و نە بەری هنگی، و نە پشتی هنگی ژی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خۆ ژ کەسێ نەڤەدشارت، و گازییا خۆ ب دزی ڤە بەلاڤ نەدکر، بەلکی هەمی دەمان وی ب ئاشکەرایی بەرێ خەلکی ددا ئیسلامێ هەر ژ وێ ڕۆژێ یا خودێ فەرمان تێدا لێ کری و گۆتییێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢ ﴾ و حەتا ئەو چوویە بەر دلۆڤانییا خودێ، بەلێ خۆڤەشارتنا وی و صەحابییان د مالا ئەرقەمی ڤە بۆ هندێ بوو دا صەحابییێن وی بێنە پاراستن.

### مالا ئەرقەمی.. مەدرەسا ئێکێ:

مالا ئەرقەمی دئێتە هژمارتن مەدرەسا ئیسلامێ یا ئێکێ، یا کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابییێن خۆ لێ فێری قورئانێ و ئیمانێ و

خوڕاگرتنا ل سەر باوەرییێ كرین، بەلێ تشتێ ئەم نوكە مخابنییێ بۆ ڕادهێلین ئەوە دەنگ و باسێن مالا ئەرقەمی و ئەو تشتێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لێ نیشا صەحابییان ددان گەلەك د دەست مە دا نینن، ئەگەر نە.. مەنهەجەكێ پەروەردەیی یێ تمام نوكە دا د دەستێن مە دا هەبت، هەر چەندە بناخە و سەر و سیمایێن وی مەنهەجی مرۆڤ دشێت ژ قورئانێ بینتە دەر.

گومان تێدا نینە كو قورئان ئەو بابەتێ سەرەكی بوو یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابییێن خۆ ل سەر پەروەردە دكرن، چونكی بەرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەردەم ل هندێ بوو ئەو موسلمانان ب وی ژێدەرێ خودایی ڤە گرێ دەت یێ خودێ منەت پێ ل وان كری، كو قورئانە، حەتا دەمێ هندەك صەحابییان ڤیای گۆتنێن پێغەمبەری بۆ خۆ بنڤیسن، ل دەسپێكا ئیسلامێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ژ وێ چەندێ دانە پاش، ژ ترسێن هندێ دا كو ئەو تشتەكێ دی یێ جودا ژ قورئانێ تێكەلی قورئانێ بكەن. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دڤیا قورئان ژێدەرێ وان یێ ئێكانە بت بۆ وی مەنهەجی یێ ئەو ژینا خۆ هەمییێ ل سەر ب ڕێڤە دبەن، و ل سەر ڤێ باوەرێ ئەو هاتنە ب خودان كرن، لەو ئەو بوونە وێنەیەكێ (عەمەلی) بۆ وان (تەوجیهاتان) یێن خودێ وپێغەمبەری ددانە وان.

### ژ وان یێن ل مالا ئەرقەمی موسلمان بووین:

مە گۆت: ل نیڤا دویێ ژ سالا چارێ پێغەمبەر چوو مالا ئەرقەمی، و پشتی هنگی ب چەند هەیڤەكا (ل ڕەجەبا سالا پێنجێ) وی دەستویری دا هندەك صەحابییێن خۆ كو مشەخت ببنە وەلاتێ حەبەشە، و ئەو بوو نێزیكی چاردە مرۆڤان ژ وان ب دزی ڤە چوون و قەستا حەبەشە كر.. هژمارا موسلمانان د گەل ئەوێن چووینە حەبەشە ژی ژ پێنجی مرۆڤان دەرباس

بووبوو، و ل دەمێ مانا صەحابییان د مالا ئەرقەمی ڤە هژمارەکا دی یا مرۆڤان ژ ژن و مێران هاتنە د ئیسلامێ دا، و ب رێکا هندەک موسلمانان ئەو ب وی جهی حەسییان یێ پێغەمبەر و هەڤالێن خۆ لێ، لەو ئەو چوونە مالا ئەرقەمی و ل سەر دەستێ وی باوەری ئینا و هاتنە د ئیسلامێ دا.. و ژ وان کەسان ئەم دێ ناڤێن هندەکان ل ڤێرێ ئینین:

١- خالد و عامر و عاقل و ئیاس کورێن بوکەیری، و ئەڤ هەر چار برایە ئێکەمین کەس بوون موسلمان بووین پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوویە مالا ئەرقەمی.

٢- بیلالێ کورێ رەباحێ حەبەشی.

٣- ئەبوو فوکەیهە، و ئەڤە و بیلال هەردو عەبد بوون، و هەردو پێکڤە موسلمان بوون، ئەبوو بەکری ئەو هەردو کرین و ئازاد کرن.

٤- عەمماری کورێ یاسری.

٥- صوهەیبێ کورێ سینانێ رۆمی، و ئەڤە هەردو پێکڤە موسلمان بوون.

٦- موصعەبێ کورێ عومەیری.

٧- طولەیبێ کورێ عومەیری، کورێ مەتا پێغەمبەری ئەروایێ.

٨- حەمزەیێ کورێ عەبدلموطەلبی مامێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-.

٩- عومەرێ کورێ خەططابی، و ئەو کەسێ دویماهییێ بوو کو ل مالا ئەرقەمی هاتییە د ئیسلامێ دا، پشتی وی موسلمان دەرکەفتە حەرەمێ و ب ئاشکەرایی گازییا خۆ بەلاڤکر، وەکی پاشی دێ بەحس کەین.

هژمارەکا ژنکان ژی ل مالا ئەرقەمی موسلمان بووبوون، ئێک ژ وان سەلمایا کچا صەخری بوو، ئەوا دگۆتنێ: (أم الخیر) دەیکا ئەبوو بەکری.

## دەسپێکا بەرهنگارییێ د ناڤبەرا موسلمان و کافران دا

ئاشکەرایە کو ل دەسپێکا گازییا ئیسلامێ، و حەتا چەند سالەکێن کێم خودایێ مەزن فەرمان ل پێغەمبەرێ خۆ نەکربوو کو ئەو بچت ب ئاشکەرایی دینێ خۆ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ بکەت، لەو حەتا قووناغا مانا ل مالا ئەرقەمی نێزیک بووی ب دویماهی ژی بێت، گازی بۆ ئیسلامێ ب بێ دەنگی و نیڤ ڤەشارتی دهاتەکرن، ڕاستە هەر ژ ڕۆژا ئێکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خەلکێ ل دەور و بەرێ خۆ ئاگەهدار کرن کو وەحی یا بۆ هاتی، و کو ئەو پێغەمبەرێ خودێیە، و ب دینەکێ دی یێ جودا ژ دینێ قورەیشییان ئەو یێ هاتییە هنارتن، بەلێ د گەل هندێ ژی ئەو ل پێش چاڤ و ب ئاشکەرایی نەدچوو دیوانخانەیێن قورەیشییان و داخواز ژ وان نەدکر ئەو بێنە د ئیسلامێ دا، و ئەگەر کەسەک هاتبا نک وی و پسیارا دینێ وی ژێ کربا، وی ئیسلام بۆ دگۆت، و قورئان بۆ دخواند، و داخواز ژێ دکر کو ئەو بێتە د ئیسلامێ دا..

ڤێ قووناغێ ئەوا هندەک ناڤێ گازیکرنا نهێنی (الدعوة السرية) ل سەر ددانن، چەند ڤەکێشابوو؟

بەرسڤا ڤێ پسیارێ ب دورستی نائێتە زانین، بەلێ هزر پتر بۆ هندێ دچت کو ئەڤێ قووناغێ حەتا هنگی ڤەکێشا بت دەمێ موسلمان ژ مالا ئەرقەمی دەرکەفتین، و کەفتینە ناڤ کۆلانێن مەکەهێ، و گازییا خۆ ب ئاشکەرایی بەلاڤکری، و بەرهنگارییێ د ناڤبەرا وان و کافرێن قورەیشییان دا دەست پێ کری.. و بەری نوکە مە ئاشکەرا کربوو کو ئەڤ

قووناغـه (يا كو مـه نـاڤێ قووناغـا مـالا ئەرقـەمی ل سـەر دانـای) ل سـالا شەشێ پشتی دەسپێكرنا گازییا ئیسلامێ ب دوومـاهی هاتبوو، و بـەلكی تشـتێ بوویـه سـویچێ ئێكسـەر یـێ دەسـپێكرنا بـەرهنگارییێ د ناڤبـەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و مللەتێ وی دا، دو ئایـەتێن قورئـانێ بـن، ئـەو ژی ئەڤەنە:

ئایەتا ئێكێ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ۝ ﴾ (الشعراء: ٢١٤).

ئایەتا دویێ: ﴿ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ۝ ﴾ (الحجر: ٩٤).

ئاشكەرایه كو ئایەتا ئێكێ فەرمان ل پێغەمـبەری -سلاڤ لێ بـن- كـر كـو ئـەو ژ ئویجاخا خۆ یا نێزیك دەست پێ بكەت، و ئایـەتا دویـێ فـەرمان ل وی كر ئەو وێ گازییێ ئاشكەرا بكەت یا فەرمان پێ لێ دئێتـەكرن، و وی هەردو ئایەت ب تمامی ب جهئینان وەكی دێ بۆ مە ئاشكەرا بت.

**دەسپێكێن بەرهنگارییێ:**

ل وی دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن خۆ د مـالا ئەرقـەمی ڤە دڤەشارتی، و پشتی هژمـارا وان بوویـه سیهـ و هەشـت زەلام، ئـەبوو بـەكر گەلـەك جـاران مـا ب پێغەمبـەری ڤـە كـو ئـەو دەسـتویرییێ بـدەتێ دا ئـەو دەركەفتە ناڤ خەلكی و ب ئاشكەرایی بەرێ وان بدەتە ئیسلامێ، بەلێ هەر جار پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دگۆتە وی: هێشـتا ئـەم دكێمـین! و ئـەو بـوو رۆژەكـێ پێـغـەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هندەك هـەڤالێن وی چوونـه كـەعبێ، ل دەسـپێكا وان بڕیـار دای خـۆ ئاشـكەرا بكـەن، پێغەمبـەر ل قورنەتـەكێ مزگەفتێ یێ روینشتی بـوو، ئـەبوو بـەكر د نـاڤ خـەلكی دا ڕابووڤـه و گـازی كـر، و ب ئاشكەرایی داخوازا ژ وان كر كو ئەو بێنە د ئیسلامێ دا.. و ژ بەر كو ئەو ئێكەمین كەس بوو ب ڤی كاری ڕادبت، قورەیشییان كـارێ وی مـەزن

دیت، و حسێب کر ئەو بستەییەکا کرێت و نە د جهێ خۆ دایە، و ئەو گەلەک ژێ ڤـەجـنـقـیـن! لـەو هەر زوی هندەک ژ وان ب ئـەبوو بـەکری وەرهاتن، و ب کولم و دار و بەران دانایێ.. و دوژمنێ خودێ (عوتبەیێ کورێ رەبیعـەی) دو کتێن شمکان هلگرتن و قیت کره ئـەبوو بـەکری، و ئـەو ل سـەر و چاڤێن وی دان، و دویماهـیـیـێ وی ئـەبـوو بەکر کره د بن دەست و پیێن خۆ ڤـە و ل سـەر زکـی روینشـت و دانـا سـەر و چاڤێن وی حـەتا ئـەبوو بـەکر دلگرتـی بـووی، و دبێـژن: وی هنـد لـێ دان مرۆڤـی دفـن و چـاڤێن وی ژێـک جـودا نەدکرن.

دەمێ مالباتا (تەیمییان) کو مالباتا ئـەبوو بـەکری بـوو، دیتـی خـەلک یێ ب ئـەبوو بـەکری وەرهـاتین، وان گـازی ئێـک و دو کـر و د هـەوارا ئـەبوو بەکری هاتن، و ئەو ژ ناڤ دەستێن کافران ئینادەر، و برە مال، پاشـی زڤرینـە مزگەفتێ و گۆتن: بـەس تشـتـەک ل ئـەبوو بـەکری بێـت ئـەم هنگـی ڕادوسـتین حەتا عوتبـەی پێشـڤە بکوژین! و پشـتـی دەمـەکی هشـێن ئـەبوو بـەکری هاتنـە سەری، و پسیار کر کانێ حالێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چییە؟ و کـافران چو ب سەرێ وی ئینایە؟

پشتی وی زانی کو پێغەمبـەر یێ ب سلامەتە، و ئـەو د گـەل هـەڤالێن خۆ یێن ڤەگەڕیاینە مالا ئەرقەمی، وی داخواز ژ دەیکا خۆ کـر ئـەو و ژنکـەکا دی ملێن وی بگرن و وی ببەنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- دا ئـەو وی ببـیـنـت و پشـتـڕاسـت ببت کو چو ل وی نەهاتییـە.. ل وێ ڕۆژێ پێغەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- وەکـی موسـلمانێن دی ژ دەسـت و دەڤـێن بـێ بـاوەران یـێ پاراسـتـی نـەبوو، مـەزنێ قورەیشـییان (عـەمرێ کـوڕێ هیشـامێ مـەخزوومی) ئەوێ وان دگۆتێ: (أبو الحکم) یان: (أبـو جهـل) وەکـی موسـلمانان دگـۆتێ، هاتـە بەرانبـەر پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- و گەلـەک ئـاخفتنێن کرێـت و

سەقەت گۆتنێ، و نەخۆشییەکا مەزن گەهاندێ، و ئەڤ رویدانە بوو بەرێ حەمزەیێ مامێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دایە ئیسلامێ.

## حەمزە دگەهتە کاروانێ خودان باوەران:

ل ئێڤارا وێ رۆژا ئەبوو بەکر ب دەستێن بێ باوەر و کافرێن قورەیشییان هاتییە قوتان و نەخۆشییەکا مەزن گەهشتییە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و خودان باوەران، حەمزەیێ کورێ عەبدلموطەلبی مامێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەگەڕیا مال.. حەمزە مرۆڤەکێ زیرەک و ب هەیبەت بوو، گەلەک رۆژان تیر و کڤانێن خۆ و شیرێ خۆ هل دگرتن، و قەستا دۆر و رەخێن مەکەهێ دکر بۆ نێچیرێ، پشتی ئەو دزڤڕی مەکەهێ ئەو نەدچوو مال حەتا دهاتە کەعبێ و طەواف ل دۆر دکر، و ل وێ رۆژا ئەو سەرهاتی ل کەعبێ چێ بووی یا مە بەحس ژێ کری، حەمزە ل مەکەهێ نەبوو، ئێڤاری ئەو زڤڕی باژێری، و پشتی وی طەواف ل دۆر کەعبێ کری و چوویە مال، ژنکا وی ئەو سەرهاتی بۆ وی ڤەگێڕا یا ل کەعبێ چێبووی، و گۆتێ: ئەبوولحەکەمی گەلەک قەسێن کرێت یێن گۆتینە برازایێ تە..

بەری حەمزە خۆ بشەلینت، زڤڕی کەعبێ و بەر ب دیوانخانەیا قورەیشییان ڤە چوو و دیت ئەبوو جەهل د ناڤ هندەک مرۆڤان دا یێ روینشتییە، حەمزەی ئێکسەر قیت کرێ و کڤانێ خۆ ژ ملێ خۆ ڤەکر، و هندی ژێ هاتی د ناڤ چاڤێن وی وەرکر حەتا کو سەرێ وی شکاندی و خوین تێ هاڤێتی، پاشی گۆتێ: وە لێ هات تو ئەزمانێ خۆ د دەرحەقا برازایێ من دا درێژ بکەی، ڕابە ئەگەر تو زەلامی ل بەر سنگێ من ڕاوەستە.

دبێژن: هندەک مرۆڤان خۆ کارێ خۆ کر دا بچنە حەمزەی، ئەبوو جەهلی گۆتە وان: بهێلن (ئەبوو عومارە) یێ حەقە، من گەلەک ئاخفتنێن کرێت ئەڤرۆ یێن گۆتینە برازایێ وی.

هندەکان گۆتە حەمزەی: هەر وەکی تو ژی یێ ژ دینێ خۆ دەرکەفتی؟

ئەوی گۆت: ما چ قەیدییە ئەگەر حەقی بۆ من دیار بوو ئەز باوەرییێ ب پێغەمبەری بینم، ئەز ب خودێ کەمە یا ئەو دبێژت ڕاستییە.

وێ شەڤێ هەمییێ حەمزە یێ دودل بوو باوەرییێ بینت و قەستا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت، یان ژی لەزێ نەکەت و ژ دینێ باب و باپیران دەرنەکەڤت؟

سپێدێ بڕیارا وی بوو ئەو بچتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و باوەرییێ ل سەر دەستێ وی بینت. و موسلمانبوونا حەمزەی نە تشتەکێ بچویک بوو ل نک خەلکێ مەکەهێ، چونکی وان دزانی حەمزە بۆ موسلمانان گەلەکە، حەتا هنگی ژی وان دگۆت: ئەڤە هندەک جحێلێن خوین گەرم و نەزانن ب دویڤ موحەممەدی کەفتین، بێ دەنگکرنا وان نە شۆلەکا ب زەحمەتە، بەلێ قەهرەمان و پێشکێشەکێ وەکی حەمزەی دەمێ بگەهتە وان مەعنا وێ ئەوە ئێدی کەس نەوێرت د مایێ وان باخڤت.

بەلێ تشتێ پتر بێ باوەرێن مەکەهێ هژاندی و ترس ئێخستییە دلێن وان، ئەو سەرهاتی بوو یا پشتی موسلمان بوونا حەمزەی ب سێ ڕۆژا ڕویدای.

## چیایێ کوفرێ عومەرێ دئێتە د ئیسلامێ دا:

ل چارشەنبییەکێ، دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالێن خۆ ل مالا ئەرقەمی دروینشتی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستێن خۆ سەر ئەڤرازکرن و دوعایەک ژ خودێ کر، و گۆت: ئەی خودا تو ئیسلامێ ب عومەرێ کوڕێ خەططابی، یان عەمرێ کوڕێ هیشامی سەرفەراز بکە.

عومەرێ کوڕێ خەططابی، ژ چ لایی ڤە تو بەرێ خۆ بدەیێ دێ بینی مرۆڤەکێ عنتیکەیە.. پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ئەوێ ب دورستی خەلک

دنیاسین، د گوتنەکا خۆ دا بەحسێ عومەری دکەت و دبێژت: ﴿ لم أر عبقرياً يفري فريه ﴾ یەعنی: من نەدیتییە عەبقەرییەک وێ بکەت یا عومەر دکەت[1].

ئەڤ عومەرە یێ مە ب ئیسلامێ نیاسی، نە ئەو عومەر بوو یێ بەری ئیسلامێ خەلکی دنیاسی، عومەر مرۆڤەکێ زڤر و دژوار بوو، تە دگۆت دلێ وی پارچەیەکە ژ وان کەڤرێن ل چیایێن مەکەهێ هەین، ل نک عومەری ب تنێ تشتەک یێ پیرۆز بوو: ئەو دینێ باب و باپیرێن وی ل سەر چووین دڤێت کەس بەحس ژێ نەکەت، وی ژی وەکی هەر ئەندامەکی د لەشێ جڤاکا جاهلی دا عەبدینییا عەدەتێن باب و باپیران دکر، و پێلێدانا ڤان عەدەتان ل نک وی گونەهەک بوو چو جاران نەدهاتە ژێبرن.

تشتێ عومەر ژ خەلکێ دی یێ مەکەهێ جودا دکر ئەو بوو، وی باوەری هەبوو کو نەرمی تشتەکێ نە ژ هەژی زەلامانە، مێر ل نک وی ئەو بوو یێ سستییێ نەکەت د رێکا پاراستنا بیر و باوەرێن خۆ دا.. لەو دەمێ هاتییە گوهێن وی زەلامەک د ناڤ بنەمالا هاشمییان دا یێ رابووی دبێژت: ئەو دینێ هوین ل سەر دچن یێ پویچ و پەلاچەیە، و صەنەمپەرێسییێ چو خێر تێدا نینە. ئەوی نەشیا تەحەممولا ڤێ گوتنێ بکەت، بەری بچتە نک خودانێ ڤێ گۆتنێ و راستییا گازییا وی بزانت نەیارەتییا وی کر و هەر کەسەکێ ب دویڤ وی کەفتی ژ تاوانباران د دەرحەقا رێکا باب و باپیران دا هژمارت..

خەلکێ مەکەهێ عومەر باش دنیاسی، و دزانی تشتێ وی د تبلا خۆ بێنا، ئەو دەست ژێ بەرنادەت، یان دێ خۆ د رێکا وی دا دەتە کوشتن، لەو

(١) بوخاری ڤەدگوهێزت.

کەیفا بێ باوەران گەلەک پێ دهات و هیڤییا وان ئەو و یێن وەکی وی بوون، ژ لایەکێ دی ڤە خودان باوەر گەلەک ژێ دترسییان چونکی هەچییێ ژ وان عومەری گرتبا ب سلامەتی ژ دەستان دەرنەدکەفت.

دویر نینە نوکە گەلەک ژ هەوە پسیار بکەن: ئەرێ چاوا پەردەیێن تارییێ ژ سەر دلێ ڤی عومەری هاتنە لادان حەتا ئیسلامێ رێکا خۆ بۆ دیتی؟

وەرن پێکڤە گوهدارییا عومەری بکەین دەمێ ئەو ب خۆ ڤێ چەندێ بۆ مە ڤەدگێرت[1].. ئیمام ئەحمەد ژ عومەری ب خۆ ڤەدگوهێزت، دبێژت: ئەز مرۆڤەک بووم من خۆ ژ ئیسلامێ دویر دکر، و من هندەک هەڤال هەبوون ئەم پێکڤە ل جهەکی کۆم دبووین مە ڤەدخوار و دەمێ خۆ دبۆراند.. شەڤەکێ ئەز هاتم من چو هەڤالێن خۆ نەدیتن.. ئینا من گۆتە خۆ: دا بچمە کەعبێ طەوافێ بکەم، ئەز هاتم من دیت پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ راوەستایە نڤێژێ دکەت، من گۆت: باشە، ئەڤ شەڤە ئەز دێ گوهێ خۆ دەمە موحەممەدی کانێ ئەو چ دبێژت. من خۆ نێزیک کر، و خۆ د ناڤ پاتێ کەعبێ را ڤەشارت دا ئەو من نەبینت، ئینا وی دەست ب خواندنا سوورەتا (الحاقة) کر، من گوهێ خۆ دایێ کەیفا من گەلەک ب ڤەهاندنا قورئانێ هات، من د دلێ خۆ دا گۆت: قورەیشی راست دبێژن: ئەڤە شاعرە، ئینا من هند گوهـ لێ بوو وی ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ۝٤٠ وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَاعِرٖۚ قَلِيلٗا مَّا تُؤۡمِنُونَ ۝٤١ ﴾ ئینا من گۆت: پا دیارە ئەو گۆتنا کاهنانە، ئینا وی خواند: ﴿ وَلَا بِقَوۡلِ كَاهِنٖۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ۝٤٢ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٤٣ وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ۝٤٤ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ۝٤٥ ثُمَّ لَقَطَعۡنَا مِنۡهُ ٱلۡوَتِينَ

---

(١) ژیانا عومەری ژی ب بەرفرەهی مە د کتێبا خۆ دا (د گەل صەحابییان) ڤەگێرایە، هەچییێ بڤێ دشێت لێ بزڤرت.

﴿ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ ﴾ كاڤا عومەری گوهـ ل قورئانێ بووی، دلێ وی نەرم بوو، و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە عومەر دبێژت: هنگی گرییا من هات و ئەز هاتمە د ئیسلامێ دا.

مەعنا عومەری حسێب دکر ئەڤ ڕۆژە ڕۆژا هاتنا وی یا د ئیسلامێ دا بوو.. بەلێ هەر د وان ڕۆژان دا سەرهاتییەکا دی ژی چێ بوو پتر عومەر ب قورئانێ ڤە گرێدا و بوو ئەگەرا هندێ ئەو ئێکسەر قەستا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت و ل سەر دەستێ وی شاهدە بدەت.

وی دەمی -وەکی مە گۆتی- پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالێن خۆ ب دزی ڤە ل مالا ئەرقەمی کۆم دبوون، پشتی حەمزە موسلمان بووی ب سێ ڕۆژان و ب دورستی ل شەڤا چارشەنبێ ل سەر پێنجشەنبێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل مالا ئەرقەمی دوعایەک کر و گۆت: یا ڕەببی تو ئیسلامێ ب عەمرێ کوڕێ هشامی (ئەبوو جەهلی) یان ب عومەرێ کوڕێ خەططابی عەزیز بکە.

ل پێنجشەنبێ عومەر ب بێنتەنگیێ حەسیا ژ گازییا ئیسلامێ، ڕابوو شیرێ خۆ هلگرت و قەستا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر و گۆت: ئەز هنگی دزڤرم حەتا وی بکوژم. مرۆڤەک کەتە ڕێکا وی گۆتێ: دێ چ کەی؟ وی گۆت: دێ چم موحەممەدی کوژم ئەوێ قورەیشی ژێکڤە کرین، و عەیب د دینێ وان دا دەرێخستی وگۆتنێن سەقەت د دەرحەقا خوداوەندێن وان دا گۆتین[1].

ئینا وی مرۆڤی گۆتێ: ئەی عومەر ئەز ب خودێ کەمە تو خۆ گەلەک دبینی، ئەگەر تە موحەممەد کوشت دێ ژ بەر (بەنی هاشمی) و (بەنی

---

(١) ئەڤە بوو عومەر کرییە دوژمنێ ئیسلامێ: غیرەت و عارا وی ل سەر دینێ قورەیشییان.

زوهره) کیڤه رەڤی؟ ما ئەو دێ هێلن تـو ل سەر عەردی ب رێڤـە بچی؟ کانێ تو هەرە جارێ مالا خۆ دورست کە.. عومەری گۆت: کی ژ مالا مـن؟ گـۆتێ: زاڤـایێ تـە و پسـمامێ تـە سـەعیدێ کـورێ زەیـدی و خویشـکا تـە فاطمایا کچا خەططابی.

عومەری رێکا خۆ گوهارت، قەستا مالا خویشکا خۆ کر.. ل وی دەمی (خەبابێ کورێ ئەرەتتی) ل مالا وان بوو قورئان نیشا سەعیدی و فاطمـایێ ددا، دەنگـێ وی گەهشـتە عومـەری، و دەنگـێ عومـەری ژی گەهشـتە وان، خەببابی ژ ترسان دا خۆ ڤەشارت، فاطمایێ ئەو پەرێ قورئـانێ ژێ وەرگرت، و د ناڤ کراسێ خۆ دا ڤەشارت، عـومەر ب زۆر کەفت و ل وان خورِی: ئەو چ دەنگ بوو دهاتە من؟ وان گۆتێ: تە چ گوه لێ بوویە؟ وی گۆت: بەلـێ، مـن یـێ زانـی هـوین یێن ب دویـڤ موحەممەدی کەفتین، و کـولـمـەک ل سەعیدی دا، فاطما چوویێ دا وی ژ سەعیدی ڤەکەت، عومـەری کولـمـەک دانا وێ ژی خوین ژ دەڤ و دفنێ هات. گاڤا عومـەری دیتی خویشـکا وی بریندار بوو ڕاوستییا و هێدی گۆتێ: ئەو چ بوو ڤ تە کا بدە مـن، عومـەری ژێ وەرگرت، و د گـەل خـۆ خـوانـد: ﴿ طه ۝١ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْـقَىٰٓ ۝٢ ﴾ و عومەر پێدا چوو حەتا گەهشتیە ڤێ ئایەتێ: ﴿ إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِى وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ۝١٤ ﴾ ل ڤێـرێ عومـەر ژ خواندنێ ڕاوەستییا، پێ حەسیا هەر وەکی سنگێ وی بەرفرەه بوو.. ئەڤە چ گۆتنە ئـەو دخوینت؟ پاشی هەر زوی وی بۆ خۆ گۆت، و ئـەو کەسێن ل نـک گوهـ ل ئاخفتنا وی بـوو، عومـەری گۆت: خودانێ ڤێ گۆتنێ دڤێت پەرستنا کەسێ د گـەل وی نەئێتەکرن، و.. ئەو دەرگەهێ گرتی ڤەبوو، گرفتارییـا عومـەری ئـەو بـوو وی دوژمناتییا ئیسلامێ دکـر بـێـی گوهێ خۆ بدەتێ کـانێ ئیسـلام چ دبێژت و چ دڤێت، گاڤا ئەڤ گرفتارییە ژ رێکێ ڕابووی و وی ژ نێزیک گوهـ ل گازییا

ئیسلامێ بووی ئێکسەر وی قەستا ئیسلامێ کر، ئیسلامێ -ب ساناهی- عومەر کەسب کر، و ڕۆژا ئیسلامێ عومەر کەسب کری جیهانا مرۆڤینییێ هەمییێ عومەر کەسب کر.. کەسبەکا وەسا حەتا زەمان هەبت و ڕۆژ و شەڤ بزڤڕن دێ هەبت.

د پشت پەردەیێ ترسێ ڕا خەبابی بەرێ خۆ ددا عومەری، گاڤا وی دیتی عومەر نەرم بوو ئێکسەر خۆ ئاشکەرا کر و گۆت: مزگینی ل تە بت ئەی عومەر، هیڤییا من ئەوە تو ب بەر دوعایا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەفتبی، دوهی من گوهـ ل وی دبوو وی دوعایەک ژ خودێ دکر کو خودێ ئیسلامێ ب (ئەبولحەکەمێ کوڕێ هیشامی) یان (عومەرێ کوڕێ خەططابی) عەزیز بکەت.

عومەر لێ زڤڕی و گۆتێ: موحەممەدی نیشا من بدە.. خەبابی مالا ئەرقەمی نیشا وی دا، عومەری شیرێ خۆ ڕاکر، و قەستا مالا ئەرقەمی کر.. و چەند دەلیڤەیەک بوون عومەر گەهشتە بەر دەرگەهی، دەرگەهـ قوتا، ئێکی د کونا دەری ڕا بەرێ خۆ دایێ و ب ترس ڤە زڤڕی و گۆت: ئەڤە عومەرە شیرێ وی یێ د دەستان دا، بەری پێغەمبەر بەرسڤێ بدەت، شێرێ خودێ حەمزە ڕابوو سەر پییان و گۆت: دەرگەهی بۆ وی ڤەکەن ئەگەر وی خێر دڤێت ب خێر بێت ئەگەر نە.. ب شیرێ وی دێ وی کوژین.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: دەرگەهی بۆ وی ڤەکەن. و پێغەمبەر ب بەرڤە چوو و بەر سنگێن وی گرتن و هژاند و گۆتێ: کوڕێ خەططابی تو هاتییە چ؟ عومەری ب دەنگەکێ نەرم ڤە گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز یێ هاتیم دا باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێ وی بینم.

خافلەتی ب مرۆڤێن حازر کەفت، وان هزرەکا دی دکر، و ئەڤە تشتەکێ دی چێ بوو.. پێغەمبەری و صەحابییان پێکڤە گۆت: (اللە أکبر) حەتا دەنگێ وان ب سەر خانی کەفتی.

(الله أکبر) عومەر موسلمان بوو، عومەر ئەوێ ڕۆژەکێ موسلمانەکی گۆتی: کەرێ خەططابی دێ موسلمان بت و عومەر موسلمان نابت.. (اللە أکبر) عومەر ئەوێ شیرێ خۆ بۆ کوشتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕویس کری، نوکە یێ دەستێ خۆ دکەتە د ناڤ دەستێ وی دا و دبێژتێ: (.. و أشهد أنک رسول الله).

ئەڤ سەرهاتییە ل هەیڤا (ذو الحجە)یێ بوو ل سالا شەشێ پشتی هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ژییێ عومەری هنگی بیست و حەفت سال بوو.

عەبدوللاهێ کوڕێ مەسعوودی دبێژت: دەمێ عومەر موسلمان بووی مە هەست ب سەرفەرازی یێ دکر.

عومەر ب دورستی هاتە گوهارتن تو دا بێژی ئەو دەهـ سالە یێ د گەل موسلمانان دژیت، ب ڕەخ پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- روینشت و گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ما ئەم نە ل سەر حەقییێنە؟

وی گۆت: بەلێ.

گۆتێ: ما نەیارێن مە نە ل سەر نەحەقییێنە؟

گۆت: بەلێ.

عومەری گۆت: ڤێجا بۆچی دینێ مە یێ ڤەشارتی بت؟ بۆچی ئەم دەرناکەڤینە ژ دەرڤە و بەرێ خەلکی نادەینە ڤی دینی؟

چەند دینەکێ عەجێبە ئەڤ ئیسلامە! چ زوی ئەو خەلکی دگوهۆڕت! عومەر ئەوێ بەری بیست خەبەران دڤیا خوینا موسلمانان فرکەت، نوکە

حەویا وی خۆ ناگرت دڤێت دەرگەهان ژ بن ببەت، و دیواران بهەرفینت، و بێژتە خەلکی هەمییێ: وەرنە خێرێ، وەرنە سەرفەرازییێ وەرنە ئیسلامێ!

بەلێ خودێ هێشتا دەستویری نەدابوو پێغەمبەری خۆ -سلاڤ لێ بن- کو وێ بکەت یا عومەر ژێ دخوازت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عومەر تێ گەهاند کو بڕیارەکا ب ڤی ڕەنگی دڤێت ژ نک خودێ ڤە بێت.

## دەرکەفتن ژ مالا ئەرقەمی:

و بڕیار هات.. وەکی بەری نوکە ژی مە گۆتی، گەلەک زانایێن دیرۆکێ ل وێ باوەرێنە کو قووناغا مالا ئەرقەمی ژ ژییێ گازییا ئیسلامێ کو ب قووناغا نهێنی دئێتە ب ناڤکرن، ب موسلمانبوونا عومەرێ کوڕێ خەططابی و هاتنە خوارا ڤێ ئایەتێ: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾ (الحجر ٩٤) ب دویماهی هات، کو ل سالا شەشێ بوو پشتی دەسپێکرنا ئیسلامێ.

ل ڤێ دیرۆکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا هەڤالێن خۆ کو ب ئاشکەرایی ئەو بەرێ خەلکی بدەنە ئیسلامێ، و پێغەمبەری ب خۆ ژی -سلاڤ لێ بن- بەری هەمییان ئەڤ چەندە کر..

# رۆناهی ئاشکەرا دبت ..

## پێغەمبەرێ گازیا ئویجاخا خۆ دکەت:

پشتی ئایەتا ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتییە خوارێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا ئویجاخا خۆ یا نێزیک ب ئاشکەرایی بۆ ئیسلامێ ڤەخوینت.. عەبدللاهێ کوڕێ عەبباسی دبێژت[1]:

دەمێ خودایێ مەزن فەرمان ل پێغەمبەرێ خۆ کری کو ئویجاخا خۆ یا نـزیـک ژ بـێ ئەمرییا خودێ بدەتە پاش، ئەو ب سەر گرێ صەفایێ کەفت ل نێزیکـی کـەعبێ و گـازی کـر: گـەلی (بـەنـی فهرییـان) گـەلی (بـەنـی عـەدیـیـان).. و وی ئێـک ئێکە گازی بابکێن قورەیشییان کر، حەتا هەمی ل دۆرا کۆم بووین، و یێ نەشیای بێت ژی مرۆڤەک ل شوینا خۆ هنارت.

ل سـەری پێغـەمبـەری -سلاڤ لـێ بن- گۆتـە وان: گـەلی قورەیشـییان، ئەگـەر ئـەز بێژمـە هـەوە: لەشـکەرەکێ د نهـالێ دا دڤێت هێرشێ بدەتـە سـەر هەوە، هوین دێ باوەر ژ من کەن؟ یەعنی: ئەگەر تشتەکێ هوین د پێ نەزان ئەز بۆ هەوە بێژم هـوین دێ بـاوەر ژ مـن کـەن؟ پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- دڤـیـا وان بـجـەڕبینت و گۆتنـا وان ل سـەر وان بکـەتـە مـال.. وان هـەمییان ب ئێـک دەنگـی گـۆت: بـەلێ، مـە ژ ڕاسـتییێ پێڤـەتر چـو ژ تـە گوهـ لـێ نەبوویە. وی گۆت: باشە، ئەز پێغەمبەرێ خودێمە بۆ هەوە، ئەزێ هاتیم هـەوە ژ عەزابەکا دژوار دترسینم و دەدەمە پاش. و د ریوایەتـەکا دی دا هاتییـە: وی

---

(١) وەکی بوخاری ژێ ڤەدگوهێزت.

گۆت: من نەزانییە جحێلەکێ عەرەب ب وێ چێتر هاتبت یا ئەز بۆ هەوە پێ هاتیم، من خێرا دین و دنیایێ بۆ هەوە ئینایە.

د ریوایەتەکا دی دا[1] هاتییە دبێژیت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گازی وان کر و گۆت: مەتەلا من و هەوە مەتەلا وی مرۆڤییە یێ دوژمنی دبینت و دکەتە هەوار.. مرۆڤێن خۆ هشیار دکەت و دترسینت.. بەلێ ئەڤ گۆتنە ل دلێ وان نەهات، ئەو تێک هاتن و تێک چوون، و بەری کەس ژ وان بەرسڤێ بدەت، مامێ وی ئەبوو لەهەبی ب دەنگەکێ زڤر ڤە گۆتێ: تێچوون بۆ تە بت ئەی موحەممەد! تە ئەم بۆ ڤێ چەندێ کۆم کربووین؟

د بەرسڤا ئەبوو لەهەبی دا سوورەتا (المسد) هاتە خوارێ: ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ① مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ② سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ③ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ④ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ⑤ ﴾.

بەرسڤا ئویجاخا وی بۆ وی ئەو بوو یا وی هزر کری، ئەو مللەتێ جاهلییەت د گەل خوینا وی گەریای هۆسا زوی دلێ خۆ بۆ ئیسلامێ ڤەناکەت، لێ د سەر هندێ ژی را پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بێ هیڤی نەبوو.

عەلی دبێژیت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- رۆژەکێ هنارتە ب دویڤ من را و گۆت: خودێ فەرمان ل من کرییە ئەز ئویجاخا خۆ یا نێزیک بۆ ئیسلامێ داخواز بکەم، رابن کار بکەن خوارنەکا باش بلێنن، پاشی بنەمالا عەبدلموطەلبی ڤەخویننە مالا مە.. گۆت: من ب یا وی کر، نێزیکی چل زەلامان ل مالا وی کۆم بوون، چار ژێ مامێن وی ب خۆ بوون: ئەبوو طالب، حەمزە، عەبباس، و ئەبو لەهەب، و پشتی وان هەمییان زاد خواری

(١) یا موسلم ڤەدگوهێزت.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ وان خواست ئەو باوەرییێ پێ بینن. بەلێ دیسا بارا پتر ژ وان باوەری پێ نەئینا، نە چونکی وان باوەری ب موحەممەدی وەک شەخص نەدهات، بەلێ چونکی ل بەر وان گەلەک یا ب زەحمەت بوو ئەو دینێ باب و باپیرێن خۆ بهێلن.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شەڤ و ڕۆژێن خۆ کرنە ئێک، و زەحمەتەکا زێدە مەزن ب بەلاڤکرنا ڤی دینی ڤە دیت، و بێ گومان طبیعەتێ ڤی دینی هندێ دخوازت مرۆڤ زەحمەتێ پێڤە ببینت، دوژمنێن ڤێ گازییێ گەلەکن، و ڕۆژەکا ب تنێ ژی ئەو نەیارەتییا خۆ بۆ ئیسلامێ بەس ناکەن، ئەو کەسێن دخوازن رحەت ڕوینن و چو زەحمەتێ نەبینن دڤێت ب کارێ بەلاڤکرنا ڤی دینی ڕانەبن.

## هندەك ژ وێ زەحمەتا پێغەمبەرێ دیتێ:

ئێکەمین دەرس مرۆڤ بۆ خۆ ژ ژینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل مەکەهێ وەردگرت بێنفرەهییە، بێنفرەهییا د ڕێکا بەلاڤکرنا گازییا ئیسلامێ دا ب رەنگەکێ وەسا کو بێ هیڤی جهێ خۆ د دلی دا نەکەت، چی جهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ددیت خەلکێ مەکەهێ لێ کۆم دبن ئەو دا چتێ و گازییا خۆ لێ گەهینتە وان، ئەو دچوو بازارێن وان، ل جڤات و کۆمبوونێن وان ئامادە دبوو، و حەقی بۆ وان دگۆت، هەچییێ چووبا نک وی ئەو دا بێژتێ: (قولوا لا إله إلا الله تفلحوا) هوین بێژن: (لا إله إلا الله) دێ ئیفلەحێ بینن.

بەلێ وان ئیفلەح نەدڤیا، ئێکێ وەکی ئەبوو لەهەبی کارێ خۆ کربوو ئەو ب دویڤ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکەفت، چی جهێ ئەو دچوویێ دا گازییا ئیسلامێ لێ بەلاڤ بکەت، ئەبوو لەهەبی ددا ب دویڤ ڤە و دگۆتە خەلکی: ئەڤە د سەرداچوویەکێ دەرەوینە، گوهێ خۆ نەدەنە وی.

عوثمان دبێژت: رۆژەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە کەعبێ دا طەوافێ بکەت، ئەبوو جەهل و ئومەییەیێ کوڕێ خەلەفی و عوقبەیێ کوڕێ ئەبوو موعیطی د ژۆرا کەعبێ ڤە دروینشتی بوون، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- سێ جاران ل دۆر کەعبێ زڤڕی وان هندەک گۆتنێن کرێت و سەقەت گۆتنێ، پێغەمبەری پویتە نەدا گۆتنێن وان، جارا چارێ ئەو ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەرهاتن، ئەبوو جەهلی دڤیا بەرسنگێ پێغەمبەری بگرت، من ئەو پالدا و خۆ دا بەر پێغەمبەری ژ لایێ دی ڤە ئومەییەی قیت کرە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا بێشینت، ئەبوو بەکری خۆ دا بەر..

د حەدیسەکا دی دا عەبدللاهێ کوڕێ عەمری دبێژت: رۆژەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نڤێژ ل کەعبێ دکر، عوقبەیێ کوڕێ ئەبوو موعیطی هاتێ لفکا عەبایێ خۆ د ستوییێ وی ئالاند و ڤیا وی بخەندقینت، د وی دەمی دا ئەبوو بەکر ب ژۆر دکەڤت، خۆ د دەستێن وی وەردکەت، وی پاشڤە دبەت و دبێژتێ: (أتقتلون رجلا أن يقول: ربي الله؟) ئەرێ هوین دێ زەلامەکی کوژن چونکی ئەو دبێژت: خودایێ من ئەللاهە؟

و عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی دبێژت: رۆژەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل کەعبێ نڤێژ دکر، ئەبوو جەهل و هندەک هەڤالێن وی ل وێرێ دروینشتی بوون، ئەبوو جەهلی گۆت: کی ژ هەوە دێ چت عویر و ریڤیکێن حێشترەکا سەرژێکری ئینت و دانتە سەر سەرێ موحەممەدی دەمێ ئەو سەرێ خۆ دچەمینتە عەردی؟

پیسترینێ وان عوقبەیێ کوڕێ ئەبوو موعیطی گۆتێ: ئەز!

و ئەو رابوو چوو هندەک عویر و ریڤیک ئینان، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرێ خۆ بۆ خودێ دانایە عەردی، وی مرۆڤی ئەو پیساتی هاڤێتە سەر سەری و سەر پشتێ، ئبن مەسعوود دبێژت: بەرێ من لێ بوو و

چو ژ من نەدهات ئەز بکەم، بوو حیلحیلا کافران و بۆ تڕانە ئێکی دگۆتە یێ دی: خەتاییێن تە بوون.. و وان بۆ خۆ ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکرە کەنی! و سەرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل عەردی بوو.. ل وی دەمی کچا وی فاطما -و هنگی ئەو هێژ یا بچویک بوو- هات و گاڤا وێ بابێ خۆ د وی حالی دا دیتی، وێ ئەو تشت ژ سەر پشتێ هاڤێتن و ل کەنکەنێن کافران زڤڕی و هندی ژێ هاتی خەبەر گۆتنە وان، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشتی هنگی سەرێ خۆ ڕاکر، کەس نەبوو هەوارێن خۆ بگەهینتێ ژ وی پێڤەتر یێ هەوار دچنە نک، وی دەستێن خۆ سەرئەڤراز کرن و گۆت: ئەی خودا تو د گەل ڤان بکە.. و ئێک ئێکە نفرین ل وان کرن.

ئبن مەسعوود دبێژت: من دیت ئەوێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نفرین لێ کرین هەمی ل ڕۆژا بەدرێ ب دەستێ موسلمانان هاتنە کوشتن.

ب ڤی ڕەنگێ کرێت بێ باوەرێن مەکەهێ پێشوازی ل پێغەمبەرێ خۆ کر، ئەوێ هاتی دا ڕێکا باشییێ و قەنجییێ نیشا وان بدەت، و د سەر ڤێ نەخۆشییێ هەمییێ ڕا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- قەت ژ گازییا خۆ سست نەبوو.

## پێغەمبەر و ئاستەنگێن ڕێکا درێژ:

بێ باوەرێن قورەیشییان ب گەلەک ڕێکان هاتنێ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بێ دەنگ بکەن و نەهێلن گازییا وی د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ ببت، بەلێ مجدییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سەر بەلاڤکرنا ڕۆناهییا ئیسلامێ ڕۆژ بۆ ڕۆژێ بۆ وان دیار کر کو ئەڤ گازییە ژ هندێ مەزنترە کو ب گەف و گورێن وان ڤەمینت یان ل ڕێیا خۆ یا پیرۆز لێڤە ببت، ئەوان گەلەک درەو د دەر حەقا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- بەلاڤکرن، هندی ژ وان هاتی وان گۆتگۆتەک ل دۆر ڤەهاندن، گۆتن: سێرەبەندە، گۆتن:

درەوینە، گۆتن: ئەو مرۆڤەکێ سەرداچوویە، نەیارێ باب و باپیرانە، دژی عورف و عەدەتێن ئویجاخێیە.. و وان قەت تەخسیری د ڤی لایی دا نەکر، ئارمانجا وان ژ ڤێ چەندێ ئەو بوو: ئەو وی د چاڤێن خەلکی دا کێم بکەن؛ دا کەس گوهێ خۆ نەدەتێ و د گازیا وی نەچت!

ڤێ رێکێ چو پێڤە نەهات، وان دیت رۆژ بۆ رۆژێ کاروانێ خودان باوەران یێ ب هێزتر لێ دئێت، رابوون ل رێکەکا دی گەریان، ڤیان پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکرن، هندەکان گۆتە عوتبەیێ کورێ وەلیدی: تو ئێک ژ ریهسپییێن مەیی، تو هەرە د گەل موحەممەدی باخڤە، عوتبە هاتە نک وی، گۆتێ: برازا، تو مرۆڤەکێ خودان عەسلی د ناڤ مە دا، و ئەڤ تشتێ تو دبێژی یێ مەزنە، تە دینێ باب و باپیرێن خۆ درەو دەرێخست و هەمی بێ مەژی هژمارتن، گوهێ خۆ بدە من دا تشتەکی بێژمە تە..

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: باخڤە بابێ وەلیدی.

عوتبەی گۆت: ئەگەر تە مال دڤێت، ئەم دێ مالەکێ بۆش بۆ تە کۆم کەین، حەتا کو تو ژ مە هەمییان زەنگینتر لێ بێی، ئەگەر تە مەزنی دڤێت ئەم دێ تە کەینە مەزنێ خۆ، ژ خۆ ئەگەر ئەڤە رەنگەکێ دیناتییێیە ل نک تە پەیدا بووی ئەم دێ باشترین حەکیمی بۆ تە ئینین دا تە دەرمان بکەت.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تو خلاس؟ وی گۆت: بەلێ. گۆتێ: دێ ڤێجا تو گوهێ خۆ بدە من، و دەست ب خواندنا سوورەتا (فصلت) کر:
﴿ حمٓ ۝١ تَنزِيلٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٢ كِتَٰبٞ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ۝٣ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ۝٤ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٖ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٞ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٞ فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ۝٥ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُۗ وَوَيۡلٞ لِّلۡمُشۡرِكِينَ ۝٦ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ

﴿٧﴾ حەتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گەهشتییە ڤێ ئایەتێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ۩ ﴿٣٨﴾ ﴾ فصلت (٣٧-٣٨). ل ڤێرێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوو سوجدێ پاشی سەرێ خۆ ڕاکر و گۆتێ: تە بەرسڤا من دیت بابێ وەلیدی، ڤێجا تو یێ ب کەیفا خۆیی.

وان دڤیا پێغەمبەری ب مالی بکڕن، یان وی ب مەزنییا دنیایێ د سەر دا ببەن، بەلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ل ڕاستییەکا مەزن هشیار کرن، ئەو ڕاستییا –مخابن- گەلەک جاران ژ بیرا مە موسلمانان ژی دچت، هندی ئیسلامە دینێ خودێیە، ڕێکەکا پیرۆزە، نە بۆ هندێیە مرۆڤ خۆ پێ زەنگین بکەت یان خۆ پێ بگەهینتە کورسیکێن بلند! دیسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نیشا وان دا کو گازییێن پیرۆز نە یێن هندێنە ب بهایێن ئەرزان بێنە فرۆتن، یان (موساوومە) ل سەر بێتەکرن!

ڤێ ڕێکێ ژی چو پێڤە نەهات، پەرلەمانێ جاهلیەتی -کو هنگی (دار الندوة) بوو- پرۆژەکێ دی دانا بەر پێغەمبەرێ ئیسلامێ -سلاڤ لێ بن- وەک چارەسەرکرنەکا تەکتیکی بۆ ڤەکێشانا ئیسلامخوازان بۆ ناڤ ڕێزێن خۆ.. ئەوان دزانی موسلمان زوی ب زوی ل دینێ وان نازڤڕن، ئینا شیطانی (چارەیەکا ناڤنجی) نیشا وان دا: وان هندەک مرۆڤ هنارتنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا دان و ستاندنێ د گەل بکەن، و بگەهنە ئەنجامەکێ مفایێ هەردو لایان تێدا، گۆتن: ئەی (موحەممەد) ئەم پسمامێن ئێکین، و یا تازە نینە ئەم بەر ببینە سەر و چاڤێن ئێک و دو، پیچەکێ تو ل دویڤ مە بەردە و پیچەکێ ئەم دێ ل دویڤ تە بەردەین، سالەکێ تو وەرە سەر دینێ

مه، و سالەکێ ئەم دێ ئێینە سەر دینێ تە، ئەڤە مەصلحەتا مە هەر دووان برێڤە چوو![1]

رێکەکا شەیطانییە کافرێن مەکەهێ گەهشتینێ! حەتا ئەڤرۆ ژی جاهلیەت پێگیرییێ پێ دکەت، ئەگەر وان ڤیا گازیکەرێن ڤی دینی بێ دەنگ بکەن، و بۆ وان ئاشکەرا بوو کو ئەو نەدئامادەنە زوی ب زوی دەڤ ژ گازیا خۆ بەردەن، دێ رابن (حەللێن ناڤنجی) ددانن بەر سنگێ وان، ب ناڤێ مللەتینییێ.. پسامینییێ.. مەصلحەتا گشتی، ئەو دێ وان ئاختیڤن و پیچ پیچە کێشنە ناڤ کۆم و جڤاتێن خۆ، پیچەکێ دێ ل دویڤ وان بەردەن دا ئەو گەلەکێ ل دویڤ بەردەن، ئامانێ کوفرا خۆ دێ ب رەنگێ ئیسلاما وان تام دەن، و پشتی هنگی دێ بێژنە نیڤ موسلمانان: هەوە چ تشتێ دی دڤێت؟!

بێ باوەرێن مەکەهێ حەز دکر ل نیڤا رێ موسلمانان ڤەگەرینن ئەگەر نە ب ناڤێ زڤرینا ل کوفرێ ژی بت، بلا ب ناڤێ مللەتینییێ و بەرژەوەندییا گشتی بت.

بەلێ دیسا سەرتیرا وان ب بەری کەفت دەمێ دەنگێ قورئانێ پەردەیێن گوهێن وان ب ڤێ گازییێ هژاندی: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ① لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ② وَلَآ أَنتُمْ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ③ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ④ وَلَآ أَنتُمْ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ⑤ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ⑥ ﴾ ئەی پێغەمبەر تو بێژە وان ئیسلاما مە تشتەکە، و جاهلییەتا هەوە تشتەکێ دییە، و قەت نابت هەردو د ئێک ئامانی دا بێنە بشافتن!

---

(١) هندەک زانا دبێژن: ئەڤ رەنگێ (موساوەمێ) ب سەنەدەکا دورست نەگەهشتییە مە.

پشـــتی ڤــێ پێـگـــاڤێ ژی، کــافر ب رێکــەکا دی هاتنـــە پێغەمبـــەرێ ئیسلامێ.. گۆتن: ئەبوو طـالبێ مـامێ وی هێـژ یـێ ل سـەر دینـێ مـە، مـا بۆچی ئەم د رێکا وی را ناچینـە (موحەممـەدی)؟ بـەلکی مـامێ وی بشـێت وی لێڤە کەت!

یەعنی: ئەو لێگەریان ب رێکا (پەیوەندییێن جڤاکی) کاری لێ بکـەن، رابـوون هنـدەک مـرۆڤ هنارتنـە نـک ئـەبـوو طـالبی و گـۆتنێ: تـو مرۆڤـەکێ پێشکێشی د ناڤ مە دا و مە هیڤییەکا مەزن ب تە هەیە و برازایێ تـە بێنـا مە گەلەکا تەنگ کری، ل مزگـەفت و دیوانخانـەیێن مـە نەخۆشـییێ دگەهینتـە مە، بێژێ دا بەلا خۆ ژ مە ڤەکەت.

ئەبوو طـالبی کورێ خۆ عەقیـل هنارتـە ب دویـڤ وی را و گـۆتێ: بـرازا پسمامێن تە یێن هاتینە نک من و گازنـدە یـێن ژ تـە کرین، بـەلا خـۆ ژ وان ڤەکـە، پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- سـەرئەڤراز بـەرێ خـۆ دا رۆژێ و گـۆت: ئەگەر هـەوە شـیا چریسـکەکێ ژ ڤـێ بـۆ مـن بینـن، ئـەز دێ شـێم وێ کـەم یـا هوین ژ من دخوازن.

بـەرێ وان مـا ل ئێـک و دو، و ئـەو مانـە ل هیڤییـا بەرسـڤا ئـەبـوو طـالبی، ئەبوو طـالـب ل وان زڤـری و گـۆت: بزڤـرن، برازایـێ مـن چـو جـاران درەو نەکرینە.

پشتی ڤێ هەمییێ کـافران بریـار دا دەسـت ب شـەرێ خـۆ بکـەن د گـەل موحەممەدی و هەر کەسەکێ پشتا وی بگرت..

## ئیسلام و جاهلییەت یان ڕاستییا هەڤڕکییێ د ناڤبەرا پێغەمبەری و مللەتێ وی دا

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نێزیکی سێ سالان د مالا ئەرقەمی ڤە گیانەکێ نوی بۆ هەڤالێن خۆ چێ دکر، ئەو کەسێن قەستا ڤی جهی کری، هەر ئێک ژ وان ژییەک د جاهلیەتێ دا بۆراندبوو، بارا پتر ژ وان ئەو بوون یێن واقعێ جاهلی ب هەمی کێم و کاسێن خۆ ڤە پێ بەست ل هزر بیرێن وان کری، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب فەر زانی ئێکەمین جار وان بگوهۆرت، جاهلیەتێ ب هەمی ڤەرێژێن وێ ڤە د دلێن وان دا بهەرِفینت و ل شوینێ ئیسلامەکا پاک و بژوین ئاڤا بکەت.

ئەڤ کارە یێ ب ساناهی نەبوو، ب زەحمەتترین چێکرن چێکرنا مرۆڤانە، حەتا تو مرۆڤەکێ باش و لیکدای ژ پارچەیێن خرابەکی دروست بکەی دێ گەلەک وەستیانێ بینی.. حەتا ئەڤرۆ ژی ئەم گەلەک کەس و دەستەکان دبینین ب ناڤێ دورستکرن و چێکرنا مرۆڤێن چاک دئاخڤن، و هندەک ژ وان دوریشمێ ئیسلامێ ژی هل دگرن، بەلێ پشتی وەستیانەکا زێدە مەزن و خۆماندیکرنا ب دەهان سالان دێ بەرێ خۆ دەیێ بەرهەمەکێ خرش یێ ب دەست وان کەفتی.

بوچێ؟

چونکی وان پشتا خۆ یا دایە وی مەنهەجی یێ دەرکەفتییێن مالا ئەرقەمی ل سەر ب رێڤە دچۆن، کانییا زەلالا پێغەمبەرینییێ یا هێلای و مخابن قەستا هندەک جۆکێن شێلی و بێ خێر یا کری!

بەری ئەم بەردەوامی یێ ب دیرۆکا پێغەمبەرینییێ بدەین، ئەم دبینین یا د جهێ خۆ دایە ب رەنگەکێ کورت ڕاستیيا ئیسلامێ بدەینە خویاکرن، ئەو گازییا ئەڤ دەستەکا پیرۆز ل سەر هاتییە پەروەردەکرن و پاشی پێ هاتییە هنارتن..

هەر کەسەکێ بەحسێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، یان دەسپێکا هاتنا گازییا ئیسلامێ بکەت، ئێکەمین جار دێ بەحسێ وی دەمی دکەت یێ ئیسلام تێدا هاتی، و وی سەروبەری یێ ئیسلامێ کار بۆ گوهارتنا وی کری، ئەوێ ب ناڤێ (جاهلییەتێ) هاتییە نیاسین، و ئەڤە تشتەکێ سورشتییە، بەلێ تشتێ بەرچاڤ ل نک گەلەک ژ وان ئەوە ئەو جاهلییەتێ ب ڕێکا (مەظاهرێن) وێ یێن ماددی، نە کو جەوهەرێ وێ یێ حەقیقی، ددەنە نیاسین.. جاهلییەتێ وەسا ددەنە نیاسین کو ئەو قوناغەکا دیرۆکییە، دەمەکی هاتبوو و چوو و نەمایە، و ڕاستی ئەوە جاهلییەت دیاردەکە د ناڤ مرۆڤان دا پەیدا دبت هەر جارەکا ئیسلام هاتە لادان، و حەتا مەسەلە ل بەر مە یا ئاشکەرا بت دڤێت بەری هەر تشتەکی ئەم ڕاستییا وێ هەڤڕکییێ بزانین یا د ناڤبەرا پێغەمبەری و مللەتێ وی دا پەیدا بووی، کانێ ئەو ژ بەر چ بوو؟ و ل سەر چ بناخەی هاتبوو ئاڤاکرن؟ بۆچی قورەیشییان نێزیکی بیست سالان بەرهنگارییا ئێک ژ کوڕێن خۆ کر، و ل بەر نەهاتن باوەرییێ پێ بینن، و پشتا وی بگرن؟

پشتی بۆرینا نێزیکی شەش سەد سالان د سەر نەمانا پێغەمبەرینییێ دا د ناڤ ئسرائیلییان دا، و ژ ناڤ دووندەها ئیسماعیلێ کوڕێ ئیبراهیمی، خودایێ مەزن بنەمالا (کینانەیێ کوڕێ خوزەیمەی) هلبژارت، و ژ ناڤ بنەمالا کینانەی ئویجاخا قورەیش هلبژارت، و ژ ناڤ قورەیشییان بنەمالا هاشمی هلبژارت، و ژ ناڤ بنەمالا هاشمی وی عەبدێ خۆ موحەممەدێ

کورێ عەبدللاهی -سلاڤ لێ بن- بۆ پێغەمبەرینییێ هلبژارت، و خودێ چێتر دزانت کانێ ئەو کێ بۆ پەیاما خۆ دێ هلبژێرت، و وی فەرمان ل پێغەمبەرێ خۆ کر کو ئەو -ل دەسپێکێ- گازییا ئیسلامێ د ناڤ ئویجاخا خۆ دا ژ قورەیشییان بەلاڤ بکەت، پاشی فەرمان لێ کر کو ئەو گازییا خۆ بۆ هەمی مرۆڤان پێشکێش بکەت..

پسیار ل ڤێرێ ئەڤەیە: ئەرێ ڕاستییا وێ هەڤرکییێ چ بوو ئەوا د ناڤبەرا پێغەمبەرێ -سلاڤ لێ بن- و ئویجاخا وی دا ڕویدای؟

و بۆچی ئویجاخا وی ژ قورەیشییان ئێکەمین جار، و مللەتێ وی یێ عەرەب پشتی هنگی، ئەڤ هەلویستێ توند و دژوار بەرانبەر وی و گازییا وی وەرگرت؟

ئەو جهێ باوەرێ نەبوو ل نک وان؟ یان ئەو گازییا ئەو پێ هاتی زیانا وان تێدا هەبوو؟ یان ژ بەر چ؟!

و حەتا مەسەلە پتر ل بەر مە ئاشکەرا ببت دڤێت ب هویربینی بەرێ خۆ بدەینە وی واقعێ یێ گازییا ئیسلامێ ئێکەمین جار لێ بەلاڤبووی، و وی سەروبەرێ قورەیشی -ب تایبەتی- و عەرەب -ب گشتی- تێ دبۆرین.

دیرۆک بۆ مە ڤەدگێڕت کو بەری هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ل دەمێ هاتنا وی ژی، ل نیڤا ئێکێ ژ سەدسالا حەفتێ زایینی، مللەتێ عەرەب ئەوێ ل جزیرا عەرەبان و دەور وبەرێن وێ دژیا، مللەتەکێ بژالە بوو، چو شارستانی (حەضارەت) و پێشکەفتن د ناڤ دا نەبوو، و وی چو سەنگ و (کیانێن سیاسی) ژی نەبوون، و چو حسێب بۆ وان نەدهاتەکرن بەرانبەر وان هەردو هێزێن هنگی ل دنیایێ ددەسهەلات: هێزا فورسێ ل ڕۆژهەلاتێ و یا رۆمێ ل ڕۆژئاڤایێ، ئەڤە ژ لایێ دەرڤەیی ڤە.. و ژ لایێ ناڤخۆیی ڤە عەرەبان ئێکەتییەکا وەسا نەبوو هەمی ئویجاخێن وان بگەهینتە ئێک، یان

گۆتنا وان چونه د مەسەلێن گرنگ و مەصیری دا بکەتە ئێک، بەلکی ئەو ل سەر هژمارەکا ئویجاخان دلێکڤەکری بوون، و هەر ئویجاخەکێ ژ وان خۆ نەددا ب کەسێ؛ چونکی وان خۆ بلندتر و مەزنتر ژ هەر ئویجاخەکا دی ددیت، و گەلەک جاران ڤان ئویجاخان ب ئەزمانێ شاعرێن خۆ فەخر و شانازی ب خۆ دبر، و وەسا خۆ ددا نیاسین کو ئەو ئەصل و هێڤێنێ هەمی عەرەبانە، و بۆ زانین شعر هنگی د ناڤ وان دا ب هێزترین ئامیرەتێ ڕاگەهاندنێ بوو، و شاعر پشتی فێرس و عەگیدان یان هندەک جاران بەری وان ل مەرتەبا ئێکێ دهاتن، ژ بەر کو ئەو ئەزمانێ عەشیرەتێ بوون، و ئەو دشیان ب شعرێن خۆ -یێن کو هەر زوی د ناڤ خەلکی دا بەلاف دبوون- سەرێ عەشیرەتێ بلند بکەن، و باشی و زیرەکییێن وێ خۆ د ناڤ دوژمنێن وێ ژی دا بەلاف بکەن، ل سەر ڤی بناخەیی دەمێ شاعرەک د ناڤ ئویجاخەکا عەرەبان دا پەیدا ببا، و شعرێن وی گەهشتبانە وێ دەرەجێ خەلک ڤەگێرن، ئویجاخا وی خۆ پێ سەربلند ددیت؛ لەو ئویجاخ دا ب گێرانا ئاهەنگەکێ ڕابت، و دا شێخ و ماقویلێن عەشیرەتێن دی ڤەخوینتە ڤێ ئاهەنگێ، و شاعرێ وان دا د ناڤ خەلکێ ئامادەبوویی دا ڕابتەڤە و شعرێن خۆ بێژت، و عەشیرەتا وی دا پێ خورت و بێژت: ئەم ژی ژ ئەڤرۆ وێڤە بووینە خودان ئەزمان!

د ناڤ عەرەبان دا عەشیرەتەک هەبوو دگۆتنێ: (قورەیش)، و ئەڤ عەشیرەتە هەر د کەڤن دا ل باژێرێ مەکەهێ دژیا، و تشتێ ڤێ عەشیرەتێ فەخر بۆ خۆ پێ دبر و خۆ پێ ژ عەشیرەتێن دی بلندتر ددیت ئەو بوو، ئەو ژ دووندەها ئیسماعیلێ کوڕێ ئیبراهیمی بوون، ئەوێ باژێرێ مەکەهێ ئاڤاکری، جهێ ئەو مزگەفت دکەفتێ یا عەرەبان هەمییان ب چاڤێ پیرۆزیێ بەرێ خۆ ددایێ، ژ بەر کو ئەو ڕووگەهـ و جهێ قەستکرنا حەجێ بوو بۆ

خەلکی هێشتا ژ زەمانێ ئیبراهیمی و ئیسماعیلی وەرە.. ڤێ چەندا هە بلندییەک دابوو قورەیشییان ل سەر هەمی عەشیرەتێن دی یێن عەرەبان، یان ئەگەر ئەم ب زمانێ ئەڤرۆ باخڤین دێ بێژین: ڤێ چەندێ دەسهەلاتەکا سیاسی و یا ئابۆری ژی دابوو قورەیشییان، بەلێ د گەل ڤێ هەمییێ قورەیشی د وێ مەسەلێ دا یا مە بەری نوکە بەحس ژێ کری: مەسەلا کەیفهاتنا ب پەیدابوونا شاعرەکی د ناڤ وان دا، یا جودا نەبوو ژ عەشیرەتێن دی یێن عەرەبان، و هلاویستنا قورەیشییان بۆ هندەک شعرێن ب هێز ئەوێن د دیرۆکا ئەدەبێ عەرەبان دا ناڤێ: (المعلقات) ل سەر هاتییەدانان، ب دیوارێ کەعبێ ڤە کو پیرۆزترین جهـ بوو ل نک وان، نیشانا هندێیە کو وان ژی شاعر ل جهەکێ بلند ددانان، و حەز دکر کو شاعرەکێ وەسا د ناڤ وان ژی دا هەبت شعرێن وی ب ڕەخ شعرێن خودانێن (موعەللەقان) ڤە بێنە هلاویستن.. و دەمێ شاعرەک د ناڤ وان دا پەیدا دبوو وان ب کەیف و شاهی ڤە پێشوازی لێ دکر.

**ئەڤێ گۆتنێ ژ بیر نەکەن چونکی دێ لێ زڤڕینەڤە!**

دەمەکی.. و د ڤی واقعێ هە دا یێ مە بەحس ژێ کری، خودێ وەسا حەز کر ژ ناڤ قورەیشییان، و ژ مالەکا ب قەدر و قیمەت و خودان ڕوی، کو مالا هاشمییە، زەلامەک هلبژارت و کرە پێغەمبەر، و پێغەمبەر ب دیتنا عەرەبێن وی دەمی مەرتەبەکا گەلەک بلندتر بوو ژ مەرتەبا شاعری، و خودێ ئاخفتنەک بۆ ڤی پێغەمبەری هنارت ب ئعترافا عەرەبان هەمییان ئەو ئاخفتن -ئەوا ناڤێ: (قورئان) ل سەر هاتییەدانان- ژ هەمی وان شعران یێن وان گوهـ لێ بووین ب هێزتر و تامتر و خۆشتر بوو. ل دویڤ عورف و عەدەتێن ئویجاخکانێ یێن عەرەب ل سەر ب ڕێڤە دچوون یا بەرعەقل و (موتەوقع) ئەو بوو قورەیشی پێشوازییەکا گەرم ل ڤی پێغەمبەری بکەن، و بۆ خۆ

ب فـەخـر بـزانـن کو ئێک ژ وان بۆ ڤی کارێ مەزن هاتییە هلبژارتن، و خۆ د ناڤ هەمی ئویجاخێن دی دا سەربلند ببینن.. بەلێ ئەڤ چەند چێ نەبوو، نە بەس چێ نەبوو، بەلکی قورەیشی بەری هەر ئویجاخەکا دی دژی کورێ خۆ رابوون ئـەوێ ب وی، ئـەو دا ژ هـەمی ئویجـاخێن دی بلنـدتر لـێ ئـێن، و هـنـدەک جـاران مـەسـەلە گەهشتە وی حەددی قورەیشییان دەستێ خۆ کرە د دەسـتێ هنـدەک ئویجـاخێن دی دا و پێکڤـە بوونـە ئێـک چەپـەر دژی موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی، کو بارا پتر ژێ هەر قـورەیشـی بوون!

ئەگـەر مـرۆڤ ب چـاڤێ عەرەبـەکێ وی دەمـی بـەرێ خـۆ بدەتـە ڤـێ مـەسـەلـێ، دێ بینت کـو ئەڤ کـارێ قـورەیشـییان کـری گەلـەکێ عنتیکـە و ب شەرم بـوو، قـورەیشـییان دەمـێ دوژمناتییـا پێغەمبـەری و دینـێ وی دکـر، هێجەتا خۆ دکرە ئەو دگۆتن: ئەم یێ بەرەڤانییێ ژ رێبـازا عەشیرەتێ و بـاب و باپیـران دکـەیـن، و رێبازا عەشیرەتێ و یا باب و باپیران دگـۆت: ئێـک ژ ئویجاخا تە ئەگەر یێ نەحەق ژی بت چێ نابت تـو پشـتا وی بـەردەی، و بەرەڤـانییێ ژ ئێکێ دی بکـەی، ڤێجا حەتا تـو بچی د گـەل ئێکێ دی یێ عەشـیرەتەکا دی ببیـە ئێـک قولـپ، و دژی کـورێ عەشـیرەتا خـۆ رابـی! و قاعیدەیێ جاهلی یێ هەمی ئویجاخێن عەرەبان باوەری پـێ دئینـا ئـەڤـە بـوو: ((**انصر أخاک ظالما أو مظلوما**)) یەعنی: تو پشتا برایێ خۆ بگرە چ ئـەو زالـم بت چ مەزلووم بت.

هەر وەسا رێبازا عەشیرەتێ و یا باب و باپیران دگۆت: ئەگەر مرۆڤـەکێ مەزن -وەکی شاعرەکی- د ناڤ ئویجاخێ دا پەیدابوو دڤێت ئویجاخ ب کەیف و ئاهەنگ ڤە پێشوازییێ لێ بکەت، چونکی ئەو دێ سەرێ ئویجاخێ د ناڤ هـەمی عـەرەبان دا بلنـد کـەت، د گـەل هنـدێ ژی، قـورەیشـی ئـەوێن ب نـاڤێ

عورف و عەدەتان دئاخفتن پشتەڤانییا کورێ خۆ یێ قورەیشی نەکر، و کەیفا خۆ ب هاتنا وی نەئینا، و هەڤالینییا هندەک ئویجاخێن بیانی کر و د گەل وان شەرێ کورێ خۆ کر، ل وی دەمێ دو عەشیرەتێن بیانی (کو ئەوس و خەزرەج بوون) ل کورێ وان بووینە خودان و پشتەڤانییا وی کری! و د سەر ڤێ هەمییێ ژی ڕا قورەیشییان ئەڤ کارێ خۆ یێ دژی عورف و عەدەتێن عەشیرەتێ بۆ خۆ ب شەرم نەزانی، لەو جهێ هندێیە مرۆڤ پسیارەکێ بکەت:

ئەرێ ئەو چ ئەگەر بوو د پشت ڤی هەولویستێ قورەیشییان ڕا هەی حەتا ئەو ڤی هەلویستی بستینن، ب ناڤێ بەرەڤانییا ژ عورف و عەدەتێن عەشیرەتێ باخڤن و هەر ئەو ب خۆ پێ ل عورف و عەدەتێن عەشیرەتێ بدانن؟

ئەڤە مەسەلەک.. مەسەلەکا دی، ئەگەر ئەم بەرێ خۆ بدەینە ئویجاخا قورەیشیان، یان خەلکێ مەکەهێ ب گشتی ل وی دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب گازییا ئیسلامێ هاتی دێ بینین خەلک ب ڕەنگەکێ گشتی ژ دو تەخەیان پێک دهاتن:

**تەخەیا ئێکێ:** مرۆڤێن مەزن ژ ڕێبەر و ماقویل و دەولەمەندان، و بارا پتر ژ ڤان ئەو بوون یێن مال و دەسهەلات هەی، و ئەڤە هەمی ئەندام بوون د وێ جڤاتێ دا ئەوا دگۆتنێ: (دار الندوة) کو بنگەهێ وێ ل نێزیکی کەعبێ بوو، ل لایێ باکوورێ، و نێزیکە ئەو وەکی پەرلەمانەکی بت ب زاراڤێ سیاسی یێ ئەڤرۆ، و ئەو خەلکێ ل ڤێ جڤاتێ کۆم دبوو دگۆتنێ: (أهل الملأ)، و بڕیار بڕیارا وان بوو، و چو گۆتن دڤیا د سەر گۆتنا وان ڕا نەبان.

**تەخەیا دووێ:** تەخەیا نزم ژ مرۆڤێن هەژار و بێ رێ و فەقیر و بەنییان پێک دهات، و ئەڤان مافێ ئاخفتنێ نەبوو، و یا ل سەر وان ئەو بوو ئەو خزمەتا تەخەیا ئێکێ بکەن، زەحمەتێ ببینن دا مەزن رحەت ببن، و خۆ برسی کەن دا (أهل الملأ) تێر ببن.

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتی، دیسا دێ بێژین: یا بەرعەقل و (موتەوقع) ئەو بوو چونە چونە ئەڤ تەخەیا دویێ پێکڤە باوەرییێ پێ بینن، و خۆ بدەنە د گەل وی؛ چونکی وی بۆ هندێ گازی دکر کو دادییا جڤاکی و یەکسانی د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ ببت.. بەلێ ئەڤە ژی چێ نەبوو، و سێ چارێکێن ڤێ تەخەیێ ژی یان پتر دژی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گازییا وی ڕاوەستیان!

و ئەو ب خۆ تشتەکێ غەریبە ئەو تەخەیا زۆرداری لێ دهاتەکرن، و مافێ وان دهاتە خوارن ل شوینا کو پشتەڤانییا وی کەسی بکەن یێ هاتی داخوازا مافێ وان بکەت و پشتەڤانییێ ژ وان بکەت، ڕابن دژی وی ڕاوەستن و هاریکارییا نەیارێ وی (و یێ خۆ ژی) بکەن، و ل ڤێرێ ژی جهێ هندێیە مرۆڤ پسیار بکەت:

ئەگەر هێجەتا (أهل الملأ) د دوژمنییا پێغەمبەری دا ئەو بت ئەو ژ (مەنصب و کورسیکێن خۆ) ترسییابن کو ژ دەست وان دەرکەڤن، ئەرێ هێجەتا تەخەیا هەژار و بێ رێ و ستەملێکری د نەگوهدانا گازییا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- دێ چ بت؟

ئەگەر ئەم ل قورئانێ بزڤرین، دێ بینین ئەو سێ ئەگەران دەسنیشان دکەت کو د پشت هەلویستێ ڤێ تەخەیێ ڕا هەبووینە:

**ئەگەرا ئێکێ:** ئەڤ توخمێ مرۆڤان، یێن ل سەر سێنیکا دویڤەلانکییا مەزنان هاتینە ب خودانکرن، بێنا وان بێ دویڤەلانکی نائێت، و ئەو ب خۆ

ڕۆژا قیامەتێ ئعترافێ ب ڤێ چەندێ دکەن دەمێ دبێژنە وان مەزنان یێن وان د دنیایێ دا دویڤەلانکییا وان دکر: ﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ﴾ (إبراهيم: ٢١) ئەو ل ئاخرەتێ دبێژن: د دنیایێ دا ئەم دویڤ دویڤکێن هەوە بووین، ئەرێ نوکە هوین دێ شێن فایدەیەکی دەنە مە و هندەکێ ژ عەزابا خودێ ژ مە هلگرن؟

**ئەگەرا دووێ:** ترسا ڤێ تەخەیا هەژار ژ غەزەب و کەربڤەبوونا مەزنان نێکا هند ژ وان چێکر ئەو خۆ ژ وێ گازییێ بدەنە پاش یا خێرا وان تێدا هەی، و هەڤالینی و دویکەفتنا وان کسان بکەن یێن نەخۆشییێ بۆ وان چێ دکەن.. خودێ ل سەر ئەزمانێ ڤان کسان دبێژت: ﴿ وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ ﴾ (القصص: ٥٧) گۆتن: ئەگەر ئەم دویکەفتنا هیدایەتێ د گەل تە بکەین، ئەم دێ ژ عەردێ مە ئێینە ڕەڤاندن.

**ئەگەرا سێیێ:** ئەڤ توخمێ مرۆڤان ژی وەکی مەزنان، ل هەمی جهـ و هەمی دەمان، حەتا ستوکورێ د دەریایا شەهوەتان دا دنقۆنە، و ئەو دترسن ئەگەر وان جاهلییەتا خۆ هێلا و هاتنە د ئیسلامێ دا، ئەو ژ ڤان شەهوەتان دویرکەڤن، و ژێ زڕیار ببن، لەو وان ژی ب توندی نەیارەتییا گازییا ئیسلامێ کر.

ئەڤە ب کورتی ئەو ئەگەر بوون یێن ئەڤ تەخەیە ژی دژی گازیا ئیسلامێ ڕاکرین.. و خودێ ژ هەمیان چێتر شۆلێ چێ دکەت، ئەگەر قورەیشیان هەر ژ دەسپێکێ پێشوازی ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کربا، حەتا ئەڤرۆ ژی گەلەک کەس دا هەبن بێژن: مەسەلە ئویجاخکانێ بوو، و ئەگەر تەخەیان هەژاران ژی هەمییان دویکەفتنا وی کربا، دا بێژن: ئیسلام شۆڕەشەکا طەبەقی بوو؟

و ل ڤێرێ پسیارا بەری نوکە مە هلێخستی دێ دوبارە کەینەڤە:

ئەرێ ڕاستییا وێ هەڤڕکییێ چ بوو ئەوا د ناڤبەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئویجاخا وی ومللەتێ وی دا چێبووی؟

دیرۆک بۆ مە ڤەدگوهێزت کو بەری هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قورەیشیان گەلەک حەز ژ وی دکر، و باوەرییەکا باوەری پێ هەبوو، حەتا وان ناسناڤێ: ڕاستگۆیێ دەسپاک (الصادق الأمین) ل سەر دانابوو، و خۆ پشتی ئەو بوویە پێغەمبەر ژی، و مللەتێ وی نەیارەتییا وی کری، گەلەک ژ وان کافرێن باوەری پێ نەدئینا ئێمانەتێن خۆ دبرن ددانانە نک وی دا ئەو بۆ وان بپارێزت، و ڕۆژا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب دزی ڤە ژ مەکەهێ دەرکەفتی و مشەختبووی، وی پسمامێ خۆ عەلی هێلا ل جهێ خۆ، ل مال، و گۆتێ: ئەڤان ئێمانەتان بۆ خودانان بزڤرینەڤە پاشی وەرە بگەهە مە ل مەدینێ! مەعنا: خۆ ل دەمێ هەڤڕکی د ناڤبەرا وان و پێغەمبەری دا گەهشتییە گۆپیتکێ ژی، وان هند باوەری ب ئەمانەتا وی هەبوو کو ئەو ئێمانەتێن خۆ بدانن نک، و ب ڕاستی ئەو ل مستەوایێ وێ باوەرییێ بوو وەکی ژ سەرهاتییا هجرەتێ بۆ مە ئاشکەرا دبت..

و خۆ دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گازییا ئیسلامێ بەلاڤکری و ئویجاخا وی نەیارەتییا وی کری ژی، وان زوی ب زوی نەدگۆتێ: ئەم باوەرییێ ب تە نائینین چونکی تو مرۆڤەکێ درەوینی، بەلکی وان هندەک هێجەتێن دی بۆ خۆ دگرتن، و وان باش دزانی ئەو مرۆڤێ حەتا عەمرێ وی بوویە چل سال درەو نەکرین، و د ناڤ خەلکی دا ب ڕاستگۆیێ هاتییە نیاسین، یا بەرعەقل نینە پشتی چل سالییێ ژ نوی درەوان بکەت، ئایەتەکا قورئانێ ئیشارەتێ ددەتە ڤێ مەسەلێ ودبێژت: ﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَـٰكِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ۝ ﴾ (الأنعام:

٣٣) خـودێ دبـێژت: ئەم باش دزانین کو درەوین دەرێخستنا مللەتێ تە یا ب سەرڤە بۆ تە دلێ تە تژی خەم دکەت، ڤێجا تو بێهنا خۆ فرەهـ بکە و پشتڕاست بە، چونکی د دلێ خۆ دا ئەو تە درەوین دەرنائێخن، بەلکی ئەو باوەر دکەن تو مرۆڤەکێ ڕاستگۆیی، بەلێ ئەو ژ زۆرداریا خۆ کوفرێ ب وان دەلیلێن ئاشکەرا دکەن یێن ڕاستییا تە دیار دکەن.

مەعنا: مەسەلە یا گرێدایی نەبوو ب شەخصێ پێغەمبەری ڤە، و هەر کەسەکێ دی ژی ل شوینا وی با، وان هەر باوەری پێ نەدئینا و دا هەڤڕکییا وی کەن..

- بۆچی؟

خودێ د ئایەتەکێ دا دبێژتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴿٤٣﴾ ﴾ (فصلت: ٤٣) ئەو تشتێ ئویجاخا تە و مللەتێ تە دبێژتە تە، هەر ئەوە یا بۆ پێغەمبەرێن بەری تە ژی هاتییە گۆتن.. مەعنا: مەسەلە نە مەسەلا ڤی پێغەمبەرییە یان وێ هە، مەسەلە هەڤڕکییا جاهلییەتێیە د گەل ئیسلامێ، ئەو جاهلییەتا مرۆڤان بۆ خۆ چێکری، و ئەو ئیسلاما خودێ بۆ وان هنارتی، ئەو هەڤڕکییا بەردەوام یا بۆ دوو ئەگەرێن سەرەکی دزڤڕت:

**ئەگەرا ئێکێ:** نزمبوونا مرۆڤی ژ وی ئاستێ بلند یێ خودێ ئەو ل سەر دای.

**ئەگەرا دویێ:** بەزینا مرۆڤی ل دویڤ شەهوەت و دلچوونێن نزم.

و هەر جارەکا مرۆڤی پێ ل وێ (فطرەتێ) دانا یا خودێ ئەو ل سەر دای، ئەو دێ ژ وی ئاستێ مرۆڤینییێ ئێتە خوارێ یێ پێتڤییە ژێ نەئێتە خوار، و دێ بەر ب حەیوانیەتێ ڤە چت، بێ ئارمانج دێ ژیت، و دێ باوەرییێ ب وی تشتی ب تنێ ئینت یێ ئەو ب چاڤ دبینت.

و مرۆڤ ئەگەر ژ وی ئاستی هاتە خوار یێ خودێ ئەو ل سەر دای ئەو دێ بتە بەنییێ دلچوون و شەهوەتێن خۆ یێن ئەرزان، لەو چی گاڤا وی دیت کەسەک هات دا بەرێ وی بدەتە وێ حەقییێ یا کو دبتە ئاستەنگ د ناڤبەرا وی و دلچوونێن وی دا، ئەو دێ دوژمناتییا وی کەت.. ما بەرێ هندەک ژ ڤی توخمێ مرۆڤان نەگۆتبوو پێغەمبەرەکێ خۆ: ﴿قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ٨٧﴾ (هود: ٨٧) شوعەیب! ئەرێ نڤێژا تە هندێ ژ مە دخوازت کو ئەم رێکا باب و باپیرێن خۆ بهێلین و وێ نەکەین یا مە دڤێت؟

**(وێ نەکەین یا مە دڤێت)**!!

ئەڤەیە گرفتارییا مەزن ل نک وان.

ئیسلام دەمێ هاتی بەرگەریان کر مرۆڤی ل ئاستێ وی یێ دورست بزڤرینت، تەرازیەکا راست ل بەر وی بدانت دا ئەو کێشانێ پێ بکەت، ئیسلامێ خواست حوکمداری هەمی بۆ خودێ بت، و مرۆڤ ژینا خۆ هەمیێ ل دویڤ مەنهەجێ خودێ ب رێڤە ببەت.. و ئویجاخا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و مللەتێ وی ژی هەر وەسا باش دزانی کو نەمانا جاهلیەتا وان د هاتنا ئیسلامێ دایە، لەو هەر ژ دەسپێکێ وان هەڤرکیا ئیسلامێ کر ئەگەر خۆ ئەڤ هەڤرکیە هندێ بخوازت ئەو هندەک جاران پێ ل عورف و عەدەتێن وێ ئویجاخکانێ یان مللەتینیێ ژی بدانن یا ئەو پێ دئاخفتن!

وەکی بەری نوکە ژی مە گۆتی، گەلەک کەس دەمێ بەحسێ جاهلییەتێ دکەن، وەک قووناغەکا دیرۆکی یا بەری ئیسلامێ، گرنگییێ ددەنە هندەک (مەظاهرێن) جاهلییەتێ، و تەرکیزێ ل سەر جەوهەرێ جاهلییەتێ ناکەن، لەو د ئەنجام دا تێگەهشتنا خەلکی بۆ جاهلییەت (وەک زاراڤەکێ فکری) دئێتە (تەشویهکرن)، و خەلک ب دورستی تێ ناگەهن.. دبێژن: جاهلییەت

هەما ئەو دەم بوو یێ پەرستنا صەنەمان تێدا دهاتەکرن، خەلکی کچێن خۆ ب ساخی بن ئاخ دکرن، دزی و جەردە یا بەلاڤ، و هندەکان هندەک تالان دکرن.. و ئەڤە هەمی ڕاستە، بەلێ جاهلییەت ئەڤە ب تنێ نینە، جاهلییەت د جەوهەرێ خۆ دا ئەوە: مرۆڤ خودێ ب دورستی نەنیاست، و ژیانا خۆ ل دویڤ مەنهەجێ وی ب ڕێڤە نەبەت. و گاڤا مرۆڤی خودێ ب دورستی نەنیاسی مسۆگەر دێ دویڤەلانکیا ئەفسانە و چیڤانۆکان کەت، و دڤێت ژبیر نەکەین کو هندەک جاران ئەو چیڤانۆک و (خورافە) خۆ د کراسەکێ علمی یێ پێشکەفتی ژی دا نیشا خەلکی ددەت، و جاهلییەت هەردەم حالەتەکێ نەفسییە (خورافەتێ) ل نک خودانی پەیدا دکەت، لەو دێ بینی ئەو چو جاران دلێ خۆ بۆ ڕاستییێ ڤەناکەت، و یێ بەرهەڤ نینە گوهدارییا چو ژ وان گۆتنان بکەت یێن ئەفسانە و چیڤانۆکێن وی یێن شرین ژ سەرێ وی ڤەدرەڤینت!

و جاهلییەت دەست و دارەکێ جڤاکی پەیدا دکەت، و ڕێکخستنەکا سلووکی یا وەسا ل نک خودانێ خۆ دئینتە حالێ کو ئەو ب توندی بەرگرییا هەر گازییەکێ بکەت یا بەرێ مرۆڤی ددەتە خودێ، و د سەر هندێ ژی ڕا وان ب توندییێ تاوانبار بکەت یێن داخوازا حوکمێ خودێ دکەن..

بۆچی؟ چونکی ڕۆژا ئیسلامێ یا گەش، وێ جەمەدا درەوێ یا کو د سەرێ وان دا کەفتیە سەرێک دحەلینت!

و دەمێ ئەم بەحسێ جاهلییەتێ دکەین، دو خالێن گرنگ هەنە دڤێت ئەم ژ بیرا خۆ نەبەین:

**یا ئێکێ:** هەر چەندە جەوهەرێ جاهلییەتێ ل هەمی جه و هەمی دەمان ئێکە ژی، بەلێ دەست و دار و (مەظاهرێن) وێ ژ جهەکی بۆ جهەکی، و ژ دەمەکی بۆ دەمەکی دئێنە گوهارتن، ل دەمەکی خەلکی خۆ بۆ صەنەمان

دچەماند، و دگۆتن: فیرعەون خودایێ مەیە.. و دەمەکێ دی وان خۆ بۆ هەوایێ نەفسێ و شەهوەتان دچەماند، و دگۆتن: مەصلحەتا مە خودایێ مەیە! رێ و شێوە دئێنە گوهارتن، بەلێ ئەنجام هەر ئێکە: دویرکەفتنا ژ رێکا خودێ.

**یا دووێ:** جاهلییەت -وەک زاراڤەکێ فکری- مەعنا وێ ئەو نینە مرۆڤ یێ نەخواندەڤان بت، و چو بار د پێشکەفتنا علمی دا نەبت، نەخێر! جاهلییەت ل پتریا دەمێن ژیێ خۆ یا بێ بار نەبوویە ژ زانین و پێشکەفتنا علمی و صناعی، ئەو مللەتێ (ئەهرام) ئاڤاکرین، و خانی و کارگەهـ د کەڤران صمتین، دنەزان نەبوون، ئەو مللەتێن سەرێ خۆ بۆ پرتەکا بەری دچەماندن، یان خودایینی د ناڤبەرا خودێ و کەسەکێ ئەفسانەیی دا لێکڤەدکر، دڤالا نەبوون ژ حەضارەتێ و پێشکەفتنا علمی، با پۆچی ئەم ناڤێ جاهللیەتێ ل سەر وان ددانین؟

چونکی وان خودێ ب دورستی نەنیاسیە، و عەبدینیا وێ ب تنێ نەکریە: ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ (الزمر: ٦٧)، ب ڤی رەنگی دڤێت ئەم د جاهلییەتێ بگەهین؛ دا پشتی هنگی ئەم بزانین کانێ ئیسلام چ دەوری د ژیانا مە دا دگێرت..

تشتێ هەڤپشک د ناڤبەرا هەمی رەنگێن جاهلییەتێ دا ئەوە: مرۆڤ خودایێ خۆ ب دورستی نەنیاست، و ژیانا خۆ ل دویڤ مەنهەجێ وی ب رێڤە نەبەت.. و چونکی ئیسلام روییێ بەرانبەرە بۆ جاهلییەتێ، ئیسلام د جەوهەرێ خۆ دا ئەوە: مرۆڤ خودایێ خۆ ب دورستی بنیاست، و ژیانا خۆ ل دویڤ مەنهەجێ وی ببەت. موسلمانان ئەڤە باش دزانی، و خەلکێ جاهلییەتێ ژی ئەڤە باش دزانی، لەو هەر دەمێ پێغەمبەرەک هات

بت (یان: ئێک ژ دویکەفتیێن وان)، و بەرێ خەلکی دابتە ئیسلامێ، خەلکێ جاهلییەتێ ب دژواری بەرگرییا وان کرییە، و پێ ل هەمی عورف و عەدەتێن مللەتینییێ و عەشیرەتینییێ (بەلکی مرۆڤینییێ ژی) دانایە، و هەر رێکەکا هەبت ب کار ئینایە دا وی دەنگی نەهێلن، بێ ترس یان شەرم!!

بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بێژتە ئویجاخا خۆ یا نێزیک: ئەز پێغەمبەرم بۆ هەوە هاتیمە هنارتن. وی ئەو هەمی ل نک گرکێ صەفایێ کۆمکرن، و ل سەر جهەکێ بلند رابووڤە، و گۆتە وان: گەلی قورەیشیان، ئەگەر ئەز بێژمە هەوە ل پشتا ڤی چیایی لەشکەرەکێ دئێت دێ هێرشەکێ ئیننتە سەر هەوە، هوین دێ باوەر ژ من کەن؟ وان گۆت: بەلێ، مە چو جاران درەو ژ تە نەدیتیە.. وی گۆت: پا بزانن ئەز پێغەمبەرەکم بۆ هەوە هاتیم؛ دا هەوە ژ عەزابەکا دژوار بترسینم.

بەرسڤا وان چ بوو؟

بەرسڤا جاهلییەتێ بوو ل هەمی جهـ و هەمی دەمان، گاڤا دبتە هەڤرکی دبێژن: هەمی تشت ب دان و ستاندنێ و رێکێن دیموقراتی چارەسەر دبن، و گاڤا ب وان رێکان یێن ئەو پێ دئاخڤن ئەو شکەستن، وەکی (ئەبوو لەهەبی) دکەن، بەران (یان فیشەکان) د هەڤرکان وەردکەن، و دبێژن: واجبێ مە ئەوە ئەم میراتێ عەشیرەتێ، و رێبازا باب و باپیران ژ ڤان نەزانان بپارێزین!

ئەڤە ئەو راستییە یا کو دڤێت ئەم ژ بیرا خۆ نەبەین دەمێ ئەم بەحسێ راستییا وێ هەڤرکییێ دکەین ئەوا د ناڤبەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئویجاخا وی دا پەیدا بووی، مەسەلە هەڤرکییا جاهلییەتێ بوو د گەل ئیسلامێ، ئەگەر نە.. چاوا هوین تەفسیر دکەن ئویجاخەکێ کەیف

ب پەیدابوونا شاعرەکی بێت، یێ کو ناڤێ وان د ناڤ چار پێنج ئویجاخەکان دا بەلاڤ بکەت، و کەیڤ ب پەیدابوونا پێغەمبەرەکی نەئێت یێ کو ناڤێ وان ل دنیایێ هەمییێ بەلاڤ دکەت؟!

ئیسلام ب هاتنا خۆ تارییا جاهلییەتێ ژ سەر روییێ عەردی ڤەدمالت، تەوحیدێ بنەجھ دکەت، و مرۆڤان ژ هەمی ڕەنگێن عبوودییەتا بۆ مرۆڤان ڕزگار دکەت، ئیسلام نەفسێن مرۆڤان دگوهۆڕت، بەرێ خۆ بدە کەسەکی دەمێ د جاهلییەتێ دا دژیت، پاشی بەرێ خۆ بدێ دەمێ دلێ وی بۆ ئیسلامێ ڤەدبت، دێ بێژی نە هەر ئەو کەسە یێ بەری هنگی..

و مەسەلە د ڤێرێ ڕایە.. جاهلییەت دەمێ بەرهنگارییا ئیسلامێ دکەت، وێ دڤێت دەسهەلاتا خۆ بپارێزت، ئەڤە ڕاستە، بەلێ ئەو چ دەسهەلاتە یا وێ دڤێت بپارێزت؟

دەسهەلاتا سیاسی، و یا تجاری، ب تنێ؟ نە..

ئەگەر وەسا با، قورەیشیان باش دزانی کو ئیسلام -ئەگەر ب سەرکەفت- دەسهەلاتا وان یا سیاسی و یا تجاری دێ زێدەتر لێ کەت، با بۆچی ئەو بوونە مەزنترین ئاستەنگ د ڕێکا ئیسلامێ دا، حەتا گەلەک جاران وان پێخەمەت ڤێ چەندێ پێ ل قانوونا ئویجاخێ ژی ددانا؟!

بەرسڤ: ئەو دەسهەلاتا ئەو دترسیان ژ دەست وان دەرکەڤت، ئەو دەسهەلات بوو یا وان ژ خودێ ستاندی و دایە خۆ، دەسهەلاتا خوداینییێ، یا بەری وان و پشتی وان ژی هەر جاهلییەتەکا هەبت ددەتە خۆ.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نە ب تنێ بۆ هندێ هاتبوو دا بێژتە خەلکی: سەرێ خۆ بۆ صەنەمان نەچەمینن ئەوێن ژ دار و بەران یان خورمێ دئێنە چێکرن. دیسا نە ب تنێ ژ بەر وێ ئێکێ دا ئەو بەرێ خەلکی بدەتە پاقژییێ و ئەخلاقێ باش و بێژتێ: نڤێژا بکەن و ڕۆژیان بگرن.. و چو ددی

نە! ئەگەر ئیسلام ئەڤە ب تنێ با، ب بەر نەدکەفت نێزیکی بیست سالان قورەیشی بەرهنگارییا ڤی دینی و ئالا هلگرێن وی بکەن!

مەسەلە ژ ڤێ چەندێ هەمی یێ مەزنتر بوو.. و نەیار و دوژمنێن ئیسلامێ ئەڤ چەندە باش دزانی، لەو هندی ژێ هاتی بەرگەریان کر -و هێشتا یێ دکەن- دا کو ئیسلامێ ژ ژینا مرۆڤینییێ لادەن.

ئێکەمین پەیڤ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و بەری وی هەمی پێغەمبەرێن دی ژی بەرێ خەلکی دایێ (لا إله إلا الله) بوو، بەرسڤا مللەتێن وان ژی هەمییان ئێک بوو: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ﴾ (إبراهيم: ١٣) یان ئەم دێ هەوە ژ وەلاتێ خۆ دەربێخین، یان هوین دێ ل دینێ مە زڤرن!

هەلویستێ قورەیشییان ژ گازییا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- نە هەلویستەکێ تایبەت بوو ب دەمێ وان ڤە یان ب جهێ وان ڤە، دیرۆکا بەری قورەیشییان بخوینن و یا پشتی وان ژی دێ بینن هەلویست هەر ئێکە نائێتە گوهارتن.

**ب کورتی مەسەلە هەر ئێکە:**

هەڤرکییا جاهلیەتێ ئەوا هەر دەم دڤێت مرۆڤی ژ خودایێ حەق دویر بکەت، و گرنگ نینە پشتی هنگی ئەو ل کیڤە بت، و ئیسلام ئەوا دڤێت مرۆڤی ب خودایێ وی ڤە گرێ دەت.

# کاروانێ باوەرییێ و نەخۆشییێن بەردەوام

بەری نوکە مە گۆتبوو: پشتی موسلمانبوونا عومەری، و هاتنەخوارا وێ ئایەتێ یا کو فەرمان ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری کو ئەو ب ئاشکەرایی خەلکی بۆ ئیسلامێ گازی بکەت، قووناغا مالا ئەرقەمی ب دووماهی هات، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی (ئەوێن ب زاراڤێ صەحابی دئێنە نیاسین) دەرکەفتنە کۆلان و مال و دیوانخانەیێن خەلکی ل مەکەهێ، و هندەک جاران ژ دەرڤەی مەکەهێ ژی، و بۆ وان بەحسێ دینێ خۆ یێ نوی کر و ئایەتێن قورئانێ خواندن، و ب ئاشکەرا ئەو بۆ ئیسلامێ داخوازکرن.. و رۆژ بۆ رۆژێ گازییا وان بۆ پێڤە دچوو، و خەلک پتر دهاتنە د ئیسلامێ دا، تشتێ بوویە جهێ بێنتەنگییا کافرێن مەکەهێ، ئەوێن گەلەک رێ ب کارئینایین و بزاڤ کرین دا بەرێ خەلکی ژ ڤی دینی بدەنە پاش، و چو پێڤە نەهاتی..

ل سەری ئەو ب گەلەک رێکان هاتنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا وی لێڤە کەن، وەکی بەری نوکە مە بەحس ژێ کری، و ئەو لێڤە نەبوو.. دان و ستاندن د گەل مامێ وی ئەبوو طالبی کرن، و هنگی ئەو مەزنێ هاشمییان بوو، و وی د گەل کوفرا خۆ وەک مەسەلەکا عەشیرەتێ بەرەڤانی ژ پێغەمبەری دکر، و ژ بەر وی کافر نەدشیان نەخۆشییەکا زێدەتر بگەهیننە پێغەمبەری، گەلەک جاران کافران داخواز ژ وی کر کو ئەو بەرەڤانییا ژ دینێ خۆ و دینێ باب و باپیران ب پێش بەرەڤانییا ژ برازایێ خۆ بێخت، بەلێ وی گوهدارییا وان نەکر، ئێدی چو ب وان نەما وان بەرێ خۆ دا صەحابییێن

پێغەمبەری، ب تایبەتی یێن بێ خودان و لاواز ژ وان، و توندی دژی وان ب کارئینا، و عەزابەکا دژوار دا وان، بەلێ ئەو لێڤە نەبوون، و بەردەوامی دا کاروانێ باوەرییێ. و ب ڕاستی دەمێ مرۆڤ سەرهاتییێن وان دخوینت و خۆڕاگرییا وان بەرانبەر زڕتەکییا کافران دبینت، ئەو زێدەتر د چاڤێن مرۆڤی دا بلند دبن، و مرۆڤ دزانت کو ئەو (جیلەکێ نموونەیی) بوون خودێ بۆ هەڤالینییا پێغەمبەرێ خۆ هلبژارتین، دا د گەل وی و پشتی وی ژی ب دورستی ملێ خۆ بدەنە بەر بارێ گرانێ بەلاڤکرنا ڕۆناهییا ئیسلامێ ل هەمی لایێن جیهانێ.

و ل ڤێرێ مە دڤێت هندەک نموونەیێن کورت و جودا جودا ژ خەباتا صەحابییان و خۆڕاگرییا وان دژی پێلا کوفرێ بەرچاڤ بکەین، دا بزانین کانێ وان ژی چەند زەحمەت ب بەلاڤکرنا ڤی دینی ڤە دیتییە.. خودێ خێرا وان مەزن بکەت.

### عومەر قەبخوازێ ئێکێ:

پشتی عومەر هاتییە د ئیسلامێ دا ب وی ڕەنگێ بەری نوکە مە بەحس ژێ کری، ئێکەمین تۆڤ ئیسلامێ د دلێ وی دا چاندی پشتی باوەرییا ب خودێ، تۆڤێ عەدالەتێ بوو، عومەری هزرێن خۆ کرن ئەوی گەلەک نەخۆشی بەری هنگی گەهاندبوو موسلمانان سەرا ئیسلامێ، هەست ب تاوانبارییا خۆ کر، وی د گەل خۆ گۆت: دڤێت ئەز تشتەکی بکەم ڤێ گونەهێ ژ سەر ستویێ خۆ ڕاکەم.. چاوا ئەڤ گونەهـ دێ ڕابت، عومەری گۆت: کانێ چاوا من سەرا ئیسلامێ نەخۆشی گەهاندبوو هندەکان، دڤێت نەخۆشی بگەهتە من ژی ژ هندەکێن دی سەرا ئیسلامێ، و ب تنێ هنگی دێ ب تەناهییا وژدانێ حسییێم.

هـەر ژ دەليڤـەيا ئێكـێ عومــەر هاتييــە د ئيســلامێ دا وی بڕيــار دا داديـێ ب جـهـ بينت، دەمێ وی زانی کو بێـی دەستويرييا خودێ پێغەمبـەر -سلاڤ لێ بن- نەشێت ڕێ بدەتە موسلمانان کو ئەو خۆ ئاشکەرا بکەن، وی ژێ خواست کو ئەو ڕێ بدەتـە وی کـو ئـەو ب تنـێ دەرکـەڤت و موسـلمانەتييا خۆ بۆ کافران ديار بکەت.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بـن- ڕێ دايـێ، عومـەری بڕيـار دا هـەر جهـەکێ وی دوژمناتييا خۆ بـۆ ئـيسلامێ لـێ ديـارکری، بچـتێ و ب دەنگـەکێ بلند ئيسـلاما خۆ لـێ ديـار بکـەت، ل سـەری وی قەسـتا مـالا خـالێ خـۆ (ئـەبوو جەهلی) کر، گۆتێ: دا بۆ تە بێژم، ئەز يێ چوويمە سەر دينـێ موحەممـەدی و کانێ تو چ دکەی ژی بکە!

پاشـی ژ نـک وی زڤـڕی دا بچـت ڤـێ مزگينييـێ ئێـک ئێـک بدەتـە کەنکەنێن قورەيشييان پاشی ما هزرێن خۆ کرن، گۆت: حەتا ئـەز مـال مـال دچم دێ گەلـەک دەم پێڤە چيت، و زوی بەحسـێ ئيسـلاما مـن بـەلاڤ نابـت، ڕابـوو قـەسـتـا زەلامــەکـێ خەلکێ مەکەهێ کـر، دبێـژن: گۆتنـا گەهشـتبا وی د گاڤێ دا ل مەکەهێ هەمييێ بەلاڤ دبوو، عومەری گۆتێ: تە زانييە چ يێ قەومی؟ وی گۆت: خێرە؟ عومەری گۆتێ: ئەزێ موسلمان بوويم، ڤـی مرۆڤـی نەشيا خۆ بگرت حەتا دچتە جهـەکێ دی و بێژت: عومـەر يێ خڕيـای، هـەما هەر ل جهێ خۆ وی گازی کر: عومەر يـێ د سـەردا چـۆی.. عومـەر يـێ چۆيـە سەر دينێ موحەممەدی.

و ئـەو ل کـۆلانێـن مـەکـەهــێ گـەڕيـا و سـوحبەت بـەلاڤکر.. گەلـەکان ژ گوهێن خۆ باوەر نەکر، عومەر بچتە سـەر دينـێ موحەممـەدی! ئەگـەر ڕاسـت بت ئەڤە دێ نەخۆشترين خەبـەر بـت وان گوهـ لـێ بـووی.. بـەلێ ڕاسـت بـوو، چونکی عومەری ب دويڤ وی مرۆڤی ڤە دکـرە غـار ل کۆلانـان، و دەمـێ وی

دگۆت: عومەر یێ خڕیای. عومەری دگۆت: درەوا دکەت ئەز نەخڕیایمە ئەز یێ موسلمان بوویم!

خەلک پێ داجڕیان، و ل دۆران کۆم بوون عومەری گۆتێ: دینێ هەوە یێ پویچە! عومەری دڤیا ب ڤێ گۆتنێ کەربێن وان ڤەکەت، دا بەلکی پێ وەربێن.. و ئەو چێ بوو یا عومەری ڤیای، کافران (تەحەمملا) گۆتنێن وی نەکر پێ وەرهاتن، عومەری و وان دانا ئێک و دو، ل وی دەمی خالێ وی (ئەبوو جەهل) هات، دیت خەلک یێ ل مرۆڤەکی کۆم بووین و پێ داددەن، پسیار کر: ئەڤە چیە؟ هندەکان گۆتێ: ئەڤە عومەرە یێ دسەرداچووی!

بۆ وی نەخۆش بوو ئەڤ چەندە د گەل خوارزایێ وی بێتەکرن، وی خۆ گەهاندە جهێ قەرەبالغێ و خەلک دانە پاش و گۆت: عومەر یێ ل سەر بەختێ من کەس دەستێ خۆ نەکەتێ!!

بەری خەلک ژ عومەری دویر کەڤن، عومەری ب هەمی دەنگێ خۆ گازی کر: گوهێ خۆ بدە من، نە مـن بەختێ تە دڤێت و نە ئەز دئێمە سەر بەختێ تە. دەمێ وی ئەڤ گۆتنە گۆتی خەلک جارەکا دی پێ وەرهاتن!

### بیلالێ حەبەشی و سرۆدا (أحد أحد):

بیلال عەبدەکێ حەبەشی بوو، ئێغبالا وی ئەو بلند کربوو و هاڤێتبوو و هاڤێتبوو مەکەهێ، دا ببتە عەبدێ ئێک ژ مەزن و ماقویلێن مەکەهێ کو ئومەییەیێ کوڕێ خەلەفێ جومەحی بوو.

ڕۆژا خودێ ڤیای دلێ (بیلالی)[1] بۆ جارا ئێکێ بۆ ڕۆناهیا ئیسلامێ ڤەبیت، بەرێ وی دا مرۆڤەکێ وەکی وی هەژار.. یێ چو مال و مەنصبێن

---

(١) هەچییێ بڤێت سەرهاتییا بیلالی ب بەرفرەهی بخوینت دشێت ل کتێبا مە (چیرۆک و دیرۆک) بزڤرت.

مەزن د ناڤ قورەیشیان دا نەهەین، عەمماریٚ کوڕیٚ یاسری، و هنگی هژمارا وان کسان یێن خۆ داینە د گەل پێلا ڕۆناهییێ هێشتا ب تبلێن دەستان دهاتنە هژمارتن، عەمماری بۆ بیلالی (تەئکید) کر کو ئەو دینێ موحەممەد پێ هاتی هەر ژ وێ ڕۆناهییێیە یا دینێ نووحی و ئیبراهیمی و مووسای و عیسای ژێ هاتی، و ئەو هەر یێ ل سەر وێ ڕێکێ یا پێغەمبەرێن بەری وی ل سەر چووین، ڕێکا ئازادکرنا مرۆڤان، نە ب تنێ ژ قەید و زنجیرێن وێ کۆلەتییێ یا (مەزن و سەییدان) ئەو پێ گرێداین، بەلکی ژ وان هزر و بیرێن ڕزی ژی یێن هێلینێن خۆ د سەرێن وان دا چێکرین، و دلێن وان بن دەست کرین، و گاڤا بیلالی گۆتییێ:

- ئەو کییە بەرێ تە دایە ڤێ ڕێکێ؟

عەمماری گۆتێ:

- پشتی خودێ، ئەبووبەکر ئێکەمین کەس بوو بەرێ من دایە ڕۆناهییا خودێ..

- ئەبووبەکر؟ هەڤالێ موحەممەدی یێ نێزیک؟ ئەو زەلامێ دەولەمەند و خێرخواز یێ قورەیشی هەمی ئعترافێ ب قەنجی و دلپاکییا وی دکەن؟

- بەلێ.. و ئەگەر تو حەز بکەی جارەکێ ئەز و تو دێ چینە نک وی؛ دا ئەو ڕاستییا ڤی دینی بۆ تە بێژت، و پشتی هنگی ئەگەر تە دل تێ هەبوو بێیە د گەل مە، ئەم دێ تە بەینە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا ل سەر دەستێ وی موسلمان ببی..

و ب ڤی ڕەنگی بیلال پێ حەسیا کو ڕۆناهییا خودێ وەکی ئاڤەکا سار یا مرۆڤەکێ تێهنی ل ڕۆژەکا گەرم ب سەر هناڤێن خۆ دا دکەت و ب خۆشییێ بحەسییێت، وەسا خۆش و شرین یا ب سەر دلی دا دئێت، دەمێ وی گوهدارییا گۆتنێن ئەبوو بەکری دکر ئیسلام ب وی ددا نیاسین و بەرێ

وی ددایێ، هەست پێ دکر هەر وەکی نەفسا وی یا دئێتە گوهارتن، ئەو یێ دبتە مرۆڤەکێ دی، مرۆڤەکێ دژیت بۆ ئارمانجەکا مەزن.. یێ هیڤییەکا بلند د دلی دا هەی، پشتی سەرپەشکێن باوەریێ گەهشتینە دلێ وی ژیان د چاڤێن وی دا هاتە گوهۆڕین، بوو خودان تامەکا دی یا تایبەت، و چەند کەیفا وی یا زێدە بوو دەمێ وی د گەل ئەبوو بەکری و عەمماری قەستا مالا ئەرقەمی کری ل سەر گرکێ صەفایێ، و ل دیوانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئامادە بووی، و بوویە حەفتەمین کەس ل سەر دەستێ پێغەمبەری هاتییە د ئیسلامێ دا..

و گاڤا سەییدێ بیلالی مەزنێ بابکێ جومەحیان ژ قورەیشیان (ئومەییەیێ کوڕێ خەلەفی) ب ڤێ چەندێ حسیای دین و هار بوو!

عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی دبێژت: ئێکەمین کەسێ ئیسلاما خۆ ئاشکەرا کری حەفت بوون: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و ئەبوو بەکر و عەممار و دەیکا وی سومەییا و صوهەیب و بیلال و میقداد.. هندی پێغەمبەرێ خودێ بوو -سلاڤ لێ بن- خودێ ئەو ب مامێ وی ئەبوو طالبی پاراست، و ئەبوو بەکر ب ئویجاخا وی، و ئەوێن دی کافران گرتن هندەک کراسێن ئاسنی کرنە بەر و ل بەر ڕۆژێ حەلاندن، کەس ژ وان خۆ ل بەر ڤێ نەخۆشییێ نەکرت و یا دلێ وان دخواست گۆت، بیلال تێ نەبت، وی نەفسا خۆ گۆری خودێ کر..

مەعنا: وی ب تنێ خۆ ل بەر عەزابێ گرت، و تشتەک نەگۆت کەیفا کافران پێ بێت.

گاڤا ئومەییەی زانی بیلالێ موسلمان بووی وی ب گەف و گوڕ ڤە گۆتێ: ئەز ب لات وعوززای کەمە، ئەز ناهێلم ڕۆژا ئەڤرۆ ل تە ئاڤا ببت، یان دێ ل دینێ مە ڤەگەڕییێ، یان دێ تە کەمە عیبرەت بۆ خەلکێ مەکەهێ

هەمییێ!! بیلالی گۆتی: هەچییا ژ تە دئێت بکە.. ب تنێ تو دشێیە لەشی!

ئومەییەی بڕیار دا جلک ژ بەر عەبدێ وی بیلالی بێنەکرن، و ل شوینێ کراسەکێ ئاسنی بکەنە بەر، و ببەنە بەر حەتاڤا مەکەهێ یا گەرم، ل سەر خیزێ شاریای ڕازینن، حەتا کەل بێتە لەشێ وی، و د گەل هندێ ژی هندەک جاران د بەر ڕا وی ئاسنەک ل سەر ئاگری سۆر دکر و لەشێ بیلالی پێ داخ دکر.. دگۆتێ:

- یان تو دێ کوفرێ ب خودایێ موحەممەدی کەی، و باوەریێ ب خوداوەندێن مە ئینی یان حەتا مرنێ ئەز دێ تە هێلمە د ڤێ عەزابێ دا.

بەلێ بیلالی داخوازا وی ب جه نەئینا، و گوهـ نەدایێ.. و خۆ ل بەر عەزابا وی گرت، نە هشێن وی ژ سەری چوون، و نە ژی گۆتنەک گۆت یا وی پێ خۆش بت، لەو عەقل ژ سەرێ ئومەییەی فڕی و گاف بۆ گاڤێ عەزاب ل سەر وی دشداند، و گۆتنا ئێکانە یا بیلالی وەکی چەکوچێن ئاسنی ل سەرێ ئومەییەی و زڕتەکێن وەکی وی ددا ئەڤە بوو:

- أحد.. أحد..

خودایێ ب حەق یێ من باوەری پێ هەی خودایەکێ ب تنێیە، و ئەو گەلەک صەنەمێن هەوە باوەری پێ هەی و هوین هزر دکەن ئەو شریکێن خودێنە، ئەو دباطلن، و چو ڕاستی بۆ وان نینە..

- أحد.. أحد..

ئەو ملحەم بوو یێ دەرد و برینێن بیلالی پێ دەرمان دبوون، و ئەو دریێ کوژەک بوو یێ وی دوەشاندە غوروور و دفنبلندیا ئومەییەی و هەر زالمەکێ وەکی وی.. و ئومەییە باش ب دژوارییا ڤی دربی دحسیا، لەو ب دلەکێ تژی کەرب و کین ڤە دگۆتە بیلالی:

- ما چو گۆتنێن دی نینن تو بێژی ژبلی ڤێ پەیڤێ؟

بیلالی دگۆتێ:

- ئەگەر من زانیبا پەیڤەکا دی یا ژ ڤێ نەخۆشتر ل بەر تە هەیە، ئەز دا وێ بێژم!!

و چەند عەزابا وی ل سەر بیلالی دژوارتر لێ دهات، صەبر و خۆڕاگرییا بیلالی ژی پتر لێ دهات.. و دویماهیێ شەیتانێن جاهلیەتێ دا پتر دلێ خۆ ب ئێشاندنا وی هوین بکەن، وان زنجیرەک ئێخستە ستویێ بیلالی، وەکی هەڤساری! و سەرێ وێ کرە د دەستێ هندەک زارۆک و بێ عەقلان دا و گۆتە وان:

- وی ل کۆلانێن مەکەهێ بینن و ببەن، ل پێش چاڤێن خەلکی؛ دا ئەو بۆ خۆ پێ بکەنە کەنی!

و ڤێ ژی چو ژ هێز و خۆڕاگریا بیلالی کێم نەکر.. بیلال، ئەوێ بەری چاڤێن وی ب ئیسلامێ روهن ببن، و دلێ وی ب باوەرییا تەوحیدێ ئازاد ببت، هەر هەست ب هەبوونا خۆ نەدکر، نوکە پێ دحەسییێت کو چەند هێزا دنیایێ هەمی یا وییە، بەرێ.. وی ژی وەکی هەر عەبدەکێ دی ل مەکەهێ، هزر دکر بەس ژیانا وی مرۆڤی ژیانە یێ دەستێ وی ژ مالێ دنیایێ یێ تژی بت، بەس وی کەسی حەقێ هەی بێژت: ئەز مرۆڤم، یێ ملک و ئەملاک و سەلتەنەت هەی، و چونکی ئەو عەبدەکێ بێ مال و حالە، وی هزر دکر ئەو ژیانا ئەو دبۆرینت نە ژیانە.. بەلێ نوکە و پشتی ئەو ب سەر رۆناهییا ئیسلامێ هلبووی، ژ نوی وی زانی کو مرۆڤ ب ئارمانجا خۆ -نە کو ب مال و دەولەمەندیا خۆ- دئێتە هلسەنگاندن، و ئارمانجا تە د ڤێ ژیانێ دا چەند یا مەزنتر و پیرۆزتر بت بهایێ تە دێ یێ پتر بت، و ما چ ئارمانج ژ وێ پیرۆزترە کو تو بۆ خودێ بژی؟

و پشتی صەبرەکا درێژ و تەحەممولەکا مەزن خودێ وەسا حەز کر بیلال ژ لایێ ئەبوو بەکری ڤە بێتە کڕین و ئازاکرن.. جارا ئێکێ ئەبوو بەکری عەقلێ وی ئازاد کر دەمێ بەرێ وی دایە ئیسلامێ، و جارا دوییێ لەشێ وی ئازاد کر دەمێ ئەو ژ سەییدێ وی یێ کافر کڕی.. و منەت بەراهییێ و دووماهییێ هەر بۆ خودێیە.

**مالباتا یاسرؓ.. و شەهیدا ئێکێؓ:**

یاسر زەلامەکێ خەلکێ یەمەنێ بوو، ژ عەشیرەتا عەنسییان، هێشتا بەری ئیسلامێ دەمێ ئەو یێ جحێل، برایەکێ وی بەرزە بوو، ئەو و دو برایێن خۆ هاتنە مەکەهێ دا کو ل برایێ خۆ بگەڕیێن، پشتی دەمەکی هەردو برایێن وی زڤڕینە یەمەنێ، و یاسر ما ل مەکەهێ، و ل دویڤ دەست و دارێن عەشیرەتکانێ وی پەیمان د گەل زەلامەکێ مەخزوومی گرێدا و بوو حەلیفێ وی..

ڤی زەلامێ مەخزوومی جارییا خۆ سومەییایا کچا خەییاطی، دا حەلیفێ خۆ یاسرێ عەنسی، و د ئەنجام دا وان کوڕەک بوو ناڤێ وی کرنە عەممار، هەر وەسا کوڕەکێ دی ژی وان هەبوو ناڤێ وی عەبدللاه بوو، گاڤا ئیسلام هاتی یاسر و خەلکێ مالا خۆ هەمی موسلمان بوون، و ئەڤ چەندە ب دلێ حەلیفێن وان یێن مەخزوومی نەبوو، لەو وان ئەو گرتن و عەزابدان، وان ئەو ژی وەکی بیلالی ل نیڤرۆیا گەرم دبرنە بەر حەتاڤا شاریای، و ل سەر خیزی درێژ دکرن، و لەشێن وان ب ئاسنێن سۆرکری داخ دکرن.

د ڤێ عەزبا دژوار دا، فیرعەونێ ئوممەتێ ئەبوو جەهلی هاتە نک وان، و هندەک گۆتنێن وەکی خۆ گۆتنە سومەییایێ، سومەییایێ ب توندی بەرسڤا وی دا، وی ژ کەربێن خۆ دا ڕمەک ل ژێرییا زکێ وێ دا و ئەو کوشت.. و ب ڤێ چەندێ سومەییا بوو ئێکەمین مرۆڤ ڕحا خۆ بۆ ئیسلامێ پێشکێش

کری. و ئەگەر ئێکەمین کەس باوەری ب ئیسلامێ ئینای خەدیجا بت، و ئەو ژن بوو، ئێکەمین شەهید ژی رحا خۆ گۆری ئیسلامێ کری سومەییا بوو، و ئەو ژن بوو!

عوثمان دبێژت: ئەز و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل بەطحائێ دچووین، من دەستێ وی گرتبوو، ئەم هاتینە نک عەممارى و مالباتا وی و کافران ئەو گرتبوون و عەزاب ددان، بابێ عەممارى گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ.. ئەڤە حالێ زەمانییە. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: صەبرێ بکێشە، پاشی گۆت: یا رەببی تو مالباتا یاسری بغەفرینە و تە یێ وە کری!

و د ریوایەتەکا دی هاتییە وی گۆت: مالباتا یاسری صەبرێ بکێشن، ژڤانێ هەوە بەحەشتە.

و وان صەبر کێشا.. سومەییا هاتە کوشتن، و یاسر ل بن عەزابا دژوار مر.

عەممار هند هاتە عەزابدان حەتا وە لێ هاتی ژ بەر باخڤت.. و جارەکێ عەممارى هندەک گۆتنێن ب دلێ وان گۆتن، ئینا وان ئەو بەردا.. و دەمێ وی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دیتی و پسیارا ڤێ چەندێ ژێ کری، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تو چاوا دلێ خۆ دبینی؟ وی گۆت: یێ تژی باوەرییە. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەگەر ئەو ل تە زڤڕین تو ژی ل وان گۆتنا بزڤڕە.

مەعنا: ئەو گۆتن چو زیانێ ناگەهینن باوەریا تە، مادەم دلێ تە یێ تژی ئیمانە و هەما تە بۆ هندێیە بەلایا وان ژ خۆ دویر بێخی.

و هۆسا رۆژ بۆ رۆژێ کافر دژوار بوون.. و هەر جارەکا موسلمانان گازندەیێن خۆ گەهاندبانە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ب ڕەنگەکێ ئێکسەر یان نە ئێکسەر وان ژێ خواست با ئەو دەستویرییێ بدەتە وان کو ئەو ژی

ڕوی ب ڕوی بەرانبەر کافرا ڕاوەستن، و شەڕێ وان بکەن، وی ئەو ژ ڤێ چەندێ ددانە پاش، و فەرمان ب صەبرێ ل وان دکر، وەکی د ئایەتەکێ دا هاتی: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓاْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ (النساء: ٧٧).

خەبابێ کوڕێ ئەرەتتی دبێژت: ژ بەر وێ نەخۆشییا دژوار یا مە ژ کافران ددیت، مە گازندەیا خۆ گەهاندە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەوی خۆ ل بەر سیبەرا کەعبێ درێژ کربوو و کراسێ خۆ دانابوو بن سەرێ خۆ، مە گۆتێ: ما تو دوعایەکێ بۆ مە ناکەی کو خودێ مە ب سەر بێخت؟

وی گۆت: بێن بەری هەوە زەلامەکی دا ئینن و چالەکێ بۆ د عەردی کۆلن، و وی هاڤێنە تێدا، پاشی دا مشاری ئینن داننە سەر سەرێ وی و وی کەنە دو پرت، و ب شەیێن ئاسنی گۆشتێ وی ژ لەشی ڤەدکر، و ڤێ چەندێ هەمییێ ئەو ژ دینێ وی نەددا پاش. و ئەز ب خودێ کەمە خودێ ڤی دینی دێ تمام کەت، حەتا سویار ژ صەنعائێ دێ چتە حەضرەمەوتێ و ئەو ژ تشتەکی ناترست ژ بلی خودێ، و گورگی ل سەر پەزێ خۆ.. بەلێ هوین لەزێ دکەن.

ب ڤی ڕەنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرێ صەحابییێن خۆ ددا صەبرێ، و خۆڕاگرتنێ، و وی مزگینییا سەرکەفتنێ و بەلاڤبوونا ڤی دینی ژی د بەر ڕا ددا وان.

# کافر هندەك
# موعجزەیان دخوازن

کافرێن مەکەهێ ب گەلەک ڕێکان هاتنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی دا ئەو وان ژ ڤی دینی لێڤەکەن.. ل سەری ئەو د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەفتنە دان و ستاندنێ، دا بزانن کانێ وی ئارمانجەکا ڤەشارتی د پشت ڤێ گازییێ ڕا هەیە یان نە، گۆتنێ: مەخسەدا خۆ ژ ڤێ چەندێ بۆ مە بێژە، ئەگەر تە مال و مەنصب و ژن و پێشکێشی دڤێت، ئەم دێ مەخسەدا تە بۆ تە ب جهـ ئینین و زێدەتر ژی، بەس تو بەحسێ دینێ مە و صەنەمێن مە نەکە، گاڤا وان دیتی ئەو لێڤە نابت، وان داخواز ژ وی کر کو ئەو هندەک کارێن نەعەدەتی و پەردەدڕ نیشا وان بدەت؛ دا ئەو باوەر بکەن کو ئەو پێغەمبەرە، وەکی ئایەتەک بەحسێ ڤێ چەندێ دکەت، و دبێژت: ﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ﴾ (الإسراء: ٩٠-٩٣) کافران گۆت: ئەی موحەممەد، ئەم باوەرییێ ب تە نائینین و کاری ب گۆتنا تە ناکەین حەتا تو عەردێ (مەکەهێ) بۆ مە نەکەیە کانییێن ئاڤێ، یان حەتا تە باغەک هەبت هەمی ڕەنگێن دارقەسپ و مێوێن تری لێ هەبن، و تو هندەک ڕوبارێن بۆش د ناڤ ڕا دبەی، یان حەتا تو پارچەیێن عەسمانی ب سەر مە دا بینی وەکی تو ژ درەو دبێژی، یان ژی تو خودێ و فریشتەیێن وی بۆ مە دئینی، ڤێجا ئەم وان ب چاڤ دبینین، یان تە

خانییەکێ ژ زێڕی هەبت، یان تو ب پەیسکەکێ ب سەر عەسمانی بکەڤی، و پشتی تو ب سەر دکەڤی ژی ئەم باوەرییێ ب تە نائینین حەتا تو نەزڤڕی و کیتابەکا ڤەکری ژ نک خودێ بۆ مە نەئینی ئەم تێدا بخوینین کو ڕاستە تو پێغەمبەرێ خودییی..

خودێ دبێژتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ﴿ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ۝ ﴾ یەعنی د بەرسڤێ دا تو -ئەی پێغەمبەر- بێژە وان: یێ پاک و پیرۆز بت خودایێ من!! هەما ئەز بەنییەکم ژ بەنییێن وی ئەز پەیاما وی دگەهینم؟ ڤێجا چاوا ئەز دێ شێم وێ کەم یا هوین ژ من دخوازن؟

و ئەڤ شێوەیێ وان ب کارئینانای بەری وان هەمی کافران د گەل پێغەمبەرێن خۆ ب کار ئینابوو، گاڤا وان نەشیای ب چو ڕەنگان پێغەمبەرێن خۆ درەوین دەربێخن، وان دەست دا هندەک داخوازێن عنتیکە یێن چو پەیوەندی ب کاکلکا هەڤرکییێ ڤە نەبت.. پێغەمبەران نەدگۆتە وان: هەر تشتەکێ هەبت ئەم دشێین بکەین، و وان چو سالۆخەتێن خودایی بۆ خۆ دەسنیشان نەکربوون، ڤێجا مەعنا وێ چییە ئەو بێژن: فلان تشتێ نەعەدەتی بۆ مە بکە؛ دا ئەم باوەرییێ ب تە بینین؟!

و هەر چەندە خودێ دزانی ئەو د ڤێ داخوازا خۆ دا ددرەوینن، و ئەو باوەرییێ نائینن ئەگەر خۆ ئەو موعجزەیان ب چاڤ ژی ببینن، وەکی د ئایەتەکێ دا هاتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ۝ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ۝ ﴾ (یونس: ٩٦-٩٧) هندی ئەون یێن پەیڤا خودایێ تە ل سەر ب جهـ هاتی کو ئەو وان ژ دلۆڤانییا خۆ دەربێخت و عەزاب بدەت، ئەو باوەرییێ ب دەلیلێن خودێ نائینن، ئەگەر خۆ هەمی ئایەت و نیشان بۆ وان بێن ژی، حەتا ئەو ب چاڤێن خۆ عەزابا ب ئێش نەبینن.

بەلێ د گەل هندێ ژی جار جاران خودێ هندەک موعجیزە ل سەر دەستێ پێغەمبەرێ خۆ پەیدا دکرن، و وان ئەو ب چاڤ ددیتن، د گەل هندێ ژی وان باوەری پێ نەدئینا، و بەری ئەم ئیشارەتێ بدەینە هندەک ژ وان موعجزەیێن مەزن یێن ل دەمێ مەکەهێ ل سەر دەستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پەیدا بووین، دەمێ کافران هەڤرکی و دان و ستاندن د گەل وی دکر، مە دڤێت ب کورتی ئیشارەتێ بدەینە مەسەلا (موعجیزەیێن پێغەمبەری) -سلاڤ لێ بن-.

ئەگەر ئەم کتێبێن سیرەتێ بخوینین، دێ بینین هندەک ژ وان گرنگییەکا تایبەت ددەنە بابەتێ (موعجیزەیان)، حەتا دەرەجەیەکێ هندەک ژ وان هند سستییێ د وەرگرتنا (ریوایەتان) دا دکەن، و حەدیسێن ضەعیف و هندەک جاران یێن بێ بناخە ژی وەردگرن، و بەلکی ئنیەتا وان ب ڤێ چەندێ ئەو بت وان دڤێت بهایێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د چاڤێن خەلکی دا زێدە بکەن، و تشتێ رێکا وان بۆ ڤێ چەندێ خۆش دکەت ئەوە: (موعجیزە) کارەکێ پەردەدڕە و ناکەفتە ژێر مقیاس و پیڤانێن عەقلی، و ب ڤێ چەندێ ئەو خۆ پاراستی دبینن ژ وێ (ئعتراضێ) یا کەسەک لێ بکەت، ئەگەر هات و گۆتێ: ئەڤە تشتەکێ مەعقوول نینە!

و ژ تشتێن مەعلوومە د دینێ مە دا کو باوەری ئینانا ب موعجیزەیێن پێغەمبەران (هەر وەسا کەرامەتێن وەلییان ژی) پشکەکە ژ باوەرییا موسلمانی، بەلێ مەعنایا ڤێ ئەو نینە هەر کەسەکێ بێت درەوەکێ ژی بۆ مە بکەت، و ب ناڤێ موعجیزەیێ یان کەرامەتێ بەلاڤ بکەت ئەم باوەرییێ پێ بینین، ب هێجەتا هندێ کو مانێ موعجیزە تشتەکێ بلندترە ژ پیڤانێن عەقلی.. بەلێ، موعجیزە -وەکی دئێتە نیاسین- کارەکێ نەعەدەتییە، یێ پەردەدڕە، ل دویڤ وان رێ و رێبازان ناچت یێن خودێ تبیعەت ل سەر

دای، و ژین پێ ب ڕێڤە بری، و ئەگەر چ ئەو تشتەکێ وەسا نینە عەقل تێ بچت، بەلێ ئەو تشتەکێ موستەحیل ژی نینە، خودێ ئەوێ بۆ هەر تشتەکی سەبەبەک دانای، هەر گاڤەکا ڤیا دشێت تشتی بێ سەبەب ژی بینت، یان ئەگەر سەبەب هات ژی تشتێ دی د دویڤ دا نەئێت.

بەرانبەر ڤێ چەندێ ئەم دبینین هندەک نڤیسەرێن دی یێن سیرەتێ هەنە، هندی ژێ دئێت خۆ ژ بابەتێ موعجیزەیێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ددەنە پاش، و بەحس ژێ ناکەن، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەکی مرۆڤەکێ (عەبقەری) یان سەرۆکەکێ شارەزا نیشا مە بدەن، کو وی هەر تشتەک ب تەرازییا عەقلی و سەربۆران کێشایە، دویر ژ پشتەڤانی و عینایەتا خودێ یا (موعجز).. و ئەڤ هەردو لایە ددویرن ژ ڕاستییێ.

بەلێ، خودێ پشتەڤانییا پێغەمبەرێن خۆ ب هندەک کارێن موعجیزە و نە عەدەتی کرییە، بۆ هندێ دا کافرێن ئامادە باوەرییێ پێ بینن، بەلێ شەرت نینە هەر موعجیزەیەکا خودێ دابتە پێغەمبەرەکی، ئێکا وەکی وێ دابتە پێغەمبەرێ مە ژی، وەکی هندەک نڤیسەرێن سیرەتێ دبێژن، و شەرت نینە ئەو موعجیزەیێن ب ڕێکێن ڕاست ژی بۆ مە هاتینە ڤەگوهاستن، ئەم ڤەشێرین و ڤەنەگێڕین، ب هێجەتا هندێ کو ئەو تشتەکێ (مەعقوول) نینە، چونکی موعجیزە ب خۆ تشتەکە ناکەفتە بن تەرازییا عەقلی، و د مەسەلا موعجیزەیان دا دڤێت مرۆڤ بیرا خۆ ل دو تشتان بینتەڤە:

١- پیڤەرێ دورستێ وەرگرتن و نەوەرگرتنا (موعجیزەیان)، دورستییا (سەنەدا) حەدیسێیە، و چو مەجال بۆ ڕەخنەگرتنا ل (مەتنی) نینە، چونکی موعجیزە وەکی مە گۆتی ناکەفتە بن پیڤانێن عەقلی، بەلکی ل سەر بناخەیێ باوەرییێ ڕادوەستت.. (بوخاری) ژ ئەبوو هورەیرەی ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: جارەکێ زەلامەکی چێلەک دهاژۆت،

بارەک لێ کربوو، ئینا چێل ل وی زڤڕی و گۆتێ: ئەز نە بۆ ڤی کاری هاتیمە ئافراندن، بەلێ ئەز بۆ کێلانێ یا هاتیمە ئافراندن. ئینا خەلکی گۆت: (سبحان الله)! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: پانێ ئەز و ئەبوو بەکر و عومەر باوەرییێ ب ڤێ چەندێ دئینین.. و د ریوایەتەکا دی دا هاتیە، ئەبوو هورەیرە دبێژت: و هنگی ئەبوو بەکر و عومەر دحازر نەبوون.

ژ ڤێ حەدیسێ بۆ مە ئاشکەرا دبت کو دەمێ صەحابی ژ ڤێ گۆتنێ عەجێبگرتی ماین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ وان ئاشکەرا کر کو ئەڤ مەسەلە یێن باوەرییێنە، ئەصل تێدا دورستییا سەنەدێیە، لەو گۆت: ئەز و ئەبوو بەکر و عومەر باوەرییێ پێ دئینین.. و گاڤا وی وە گۆتی، صەحابییان پێکڤە گۆت -وەکی د ریوایەتەکێ دا ل نک ئبن حبانی هاتی-: مە باوەری ب وی تشتی ئینا یێ پێغەمبەرێ خودێ باوەری پێ هەی.

٢- موعجیزە بۆ هندێیە باوەرییا مرۆڤی ب پێغەمبەری موکمتر لێ بێت، مەعنا: موعجیزەیێ پەیوەندی ب عەقیدێ ڤە هەیە، و تشتێ پەیوەندی ب عەقیدێ ڤە هەی دڤێت ب رێکا حەدیسێن دورست بگەهتە مە، چونکی زانا ل سەر هندێ پێکهاتینە کو حەدیسێن ضەعیف د مەسەلێن عەقیدێ دا نائێنە وەرگرتن.

و ئێک ژ وان موعجزەیێن کافران ل ڤی دەمی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خواستین کەرکرنا هەیڤێ بوو، و قورئان ب خۆ ئیشارەتێ ددەتە ڤێ مەسەلێ دەمێ دبێژت: ﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ۝ وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ۝ ﴾ (القمر: ١-٢) جوبەیرێ کورێ موطعمی دبێژت: ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەیڤ بۆ دو کەر، کەرەک ل سەر ڤی چیایی و کەرەک ل سەر ڤی چیایی، ئینا کافران گۆت: موحەممەدی سێربەندی ل مە کر. و ئبن مەسعوود دبێژت: دەمێ هەیڤ بوویە دو کەر

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە مە هوین شاهد بن[1]. د گەل ڤێ موعجزەیا مەزن، و هژمارەکا دی یا موعجزەیان یێن کو پێغەمبەری نیشا کافرێن مەکەهێ داین، وان باوەری نەئینا، و گۆتن: ئەڤە سحرە موحەممەد ل مە دکەت.

پشتی ڤی رەنگێ دان و ستاندنێ ژی یێ بێزارییا کافران ئاشکەرا کری، وان هندەک شێوەیێن دی (یێن وەریادان تێدا) ب کارئینان، و ئارمانجا وان پێ ئەو بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- موژیل بکەن، و ب لایێ خۆ ڤە بکێشن، ژ وان: هندەک جاران دگۆتنە پێغەمبەری: چەند هەیڤەکان تو پەرستنا صەنەمێن مە بکە، ئەم ژی چەند هەیڤەکان دێ پەرستنا خودایێ تە کەین.. ئەڤێ فایدە نەکر! گۆتن: ئەڤان عەبد و هەژار و مرۆڤێن لاواز، یێن وەکی بیلالی و صوهەیبی و عەممماری ژ دیوانا خۆ دەربێخە، ئەم دێ ئێینە دیوانا تە و گوهدارییا تە کەین.. ڤێ ژی چو پێڤە نەهات!

کافران بەرگەریان کر دا کو پێغەمبەری بێ پشتەڤان بهێلنە ل مەیدانێ، د گەل مەزنێ مالباتا هاشمییان ئەبوو طالبی کەفتنە دان و ستاندنێ بۆ هندێ دا ئەو بەرەڤانییێ ژ برازایێ خۆ نەکەت، و بەرائەتا خۆ ژێ بدەت، بەلێ ئەبوو طالبی ب گۆتنا وان نەکر..

پشتی ڤێ هەمییێ چو ب وان نەما ژ بلی هندێ کو شەری د گەل دویکەفتییێن ڤی دینی راگەهینن، بگرن.. مالێ وان دەستەسەر کەن.. بێشینن.. یان حەتا بکوژن ئەگەر ئەو لێڤە نەبن، و بارا موسلمانێن هەژار ژ وان یێن عەبد و مەوالی و نە قورەیشی ژ ڤێ نەخۆشی و عەزابێ پتر بوو. د ڤی سەروبەرێ بەرتەنگ دا، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا هندەک صەحابییێن خۆ کو بۆ خۆ ژ مەکەهێ برەڤن و مشەخت بن.

---

(١) ترمذی ژێ ڤەدگوهێزت.

## مشەختبوونا صەحابییان یا ئێکێ
## بۆ وەلاتێ حەبەشە

ل وی دەمێ هێشتا صەحابی د مالا ئەرقەمی ڤە دڤەشارتی، پێغەمبەری دەستویرییا هندەک هەڤالێن خۆ دا کو ژ مەکەهێ دەرکەڤن، و ئەو بوو ل سالا پێنجێ پشتی دەسپێکرنا گازییا ئیسلامێ و ب دورستی ل هەیڤا رەجەبێ، هژمارەکا موسلمانان خۆ ژ مەکەهێ ڤەدزی، و ب رەنگەکێ نهێنی دەرکەفتن ب لایێ دەریایێ ڤە چوون، و ئارمانجا وان وەلاتێ حەبەشە بوو.

بۆچی وان حەبەشە هلبژارت؟ و چاوا چوون و ئەو کی بوون چووین؟

د ریوایەتێن دورست دا هاتییە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ جهە بۆ وان هلبژارتبوو، دەمێ وی دیتی نەخۆشی یا دگەهتە هەڤالێن وی، و ئەو نەشێت وان بپارێزت، وی گۆتە وان: ل وەلاتێ حەبەشە شاهەکێ عادل هەیە، ل نک وی زۆرداری ل کەسێ نائێتەکرن، هەرنە وەلاتێ وی حەتا خودێ رێکەکێ بۆ هەوە دبینت.

و هندەک هەڤالێن وی ئەڤ فەرمانا وی ب جهئینا، و هەر چەندە هژمارا وان چاردە یان پازدە کەس ب تنێ ژی بوون، بەلێ د گەل هندێ ئەو جودا جودا ژ مەکەهێ دەرکەفتن؛ دا کافر ب وان نەحەسیێن، و ئێکەمین کەس ب مەشەختی ژ مەکەهێ دەرکەفتی عوثمانێ کورێ عەففانێ ئەمەوی بوو، و ژنکا وی روقەییایا کچا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و دبێژن: پشتی ئەو ژ مەکەهێ دەرکەفتین دەمەکی ئەو د بێ دەنگ و باس بوون، پاشی ژنکەکا قورەیشی هاتە مەکەهێ و پێغەمبەر دیت، گۆتێ: ئەی موحەممەد! من زاڤایێ تە دیت ژنکا وی د گەل دا بوو، پێغەمبەری -سلاڤ

لێ بن- گۆتێ: حالێ وان چ بوو؟ وێ گۆت: وی ژنکا خۆ ل کەرەکی سویار کربوو و ئەو ل بەراهییێ دچوو، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: خودێ د گەل وان بت، عوثمان ئێکەمین کەسە پشتی لووطی ب عەیال ڤە مشەختبووی[1].

و ژ وان کەسێن دی یێن مشەختبووین ژ بلی عوثمانی و ژنکا وی:

عەبدللاهێ کورێ عەوفێ زوهری، زوبەیرێ کورێ عەووامێ ئەسەدی، ئەبوو حوذەیفەیێ کورێ عوتبەیێ کورێ رەبیعەی و ژنکا وی سەهلایا کچا سوهەیلێ کورێ عەمری، موصعەبێ کورێ عومەیری، ئەبوو سەلەمەیێ مەخزوومی و ژنکا وی ئوم سەلەمە هندا مخزوومی، عوثمانێ کورێ مەظعوونێ جومەحی، عامرێ کورێ رەبیعەیێ عەزنی (حەلیفێ مالباتا خەططابی بوو) و ژنکا وی لەیلایا کچا ئەبوو حەثمەی، و سوهەیلێ کورێ وەهەبی، ئەبوو سەبورەیێ کورێ ئەبوو روهمی و ژنکا وی ئوم کولثووما کچا سوهەیلێ کورێ عەمری.

ئەڤە ئەو هەر پازدە مرۆڤ بوون (دەهـ زەلام و پێنج ژن) یێن کو مشەختبووین، و وەکی ئەم دبینین ئەڤ کەسێن مشەختبووین هەمی (دو سێکەک تێ نەبن) ژ مالێن مەزنێن قورەیشییان بوون، و ژ بابکێن جودا جودا، و کەس ژ وان ئەو نەبوو یێ لاواز و بێ خودان، تشتێ هندێ دگەهینت کو مەسەلا مشەختبوونا وان نە ڕەڤینەک بوو ژ تەنگاڤییێ هندی کو ئەو پەیامەکا سیاسی بوو، و ڕەنگەکێ خۆ نەرازیکرنێ بوو ژ ڕەنگێ سەرەدەرییا قورەیشییان د گەل ڤێ گازییا نوی.

د ناڤ وان دا هاشمی هەبوون، ئەمەوی هەبوون، زوهری هەبوون، ئەسەدی هەبوون، مەخزوومی هەبوون.. و ئەڤە بابکێن قورەیشییان یێن مەزن

---

(١) بەیهەقی ژ ئەنەسێ کورێ مالکی ڤەدگوهێزت.

بوون، و دەمێ ئەڤە دچنە وەلاتێ حەبەشە، و دەسهەلاتا سیاسی یا حەبەشە ڤێ چەندێ ژ وان دبینت، و بۆ زانین قورەیشییان پەیوەندییێن بازرگانی یێن بەرفرەهـ د گەل حەبەشییان هەبوون، حەتا هندەک ژ وان (وەکی عەمرێ کورێ عاصی) هەڤالینی د گەل مەلکێ حەبەشە هەبوو، ڤێجا دەمێ مەزنێن حەبەشە دبینن ئەو کەسێن ژ مەکەهێ پەنا برییە نک وان، نە ژ مالباتەکا ب تنێنە، دێ زانن هاتنا وان نە مەسەلەکا شەخصی یان لێککەفتنەکا عەشائرییە، هەر وەسا ئەگەر هات و قورەیشییان ڤیا ب رێکا پەیوەندییێن خۆ نەخۆشییەکێ بگەهیننە وان مشەختییان، هژیان دێ ب هەمی ئویجاخێن قورەیشییان کەڤت، و مەسەلە ب بێ دەنگی دەرباس نابت.

بەلێ دیارە کو ئەڤ مشەختبوونە ژ کێمییا هژمارا مشەختییان، و ژ بەر کێمییا دەمێ ئەو ماینە ل حەبەشە، گەلەک جهێ بالکێشانێ نەبوویە ل نک قورەیشییان، دەمێ ئەڤ کەسە ژ مەکەهێ دەرکەفتین، ئەو کت کتە و ب دزی ڤە چووبوون، و پشتی ئەو چووین ب چەند هەیڤەکان گوهۆرینێن بەرچاڤ ب سەر کاروانێ پێشڤەچوونا گازییا ئیسلامێ دا هاتن، هندەک مرۆڤێن ب هێز و مەزن موسلمان بوون وەکی حەمزەی و عومەری.. و هژمارا موسلمانان زێدە بوو، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بریار دا موسلمان خۆ ئاشکەرا بکەن، گاڤا ئەڤ دەنگ و باسێن نوی گەهشتینە مشەختییان ل حەبەشە، وان هزرکر سەروبەر یێ هاتییە گوهارتن، لەو یا باشتر بۆ وان ئەوە ئەو بزڤرنە مەکەهێ، و ئەو بوو ئەو زڤرین، و بت زڤرینا وان ل دووماهییا سالا پێنجێ بت، یان ل دەسپێکا سالا شەشێ بت، ل وێ سالا کافران بریار دای دۆرپێچا ئابۆری بدانن سەر بابکێ هاشمییان ئەوێن ل بەر نەهاتین پشتا پێغەمبەری بەردەن.

## دۆرپێچا ئابۆری
## ل سەر مالباتا هاشمییان

ل سالا حەفتێ ژ هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و پشتی قورەیشی ب هەمی رێکان هاتینێ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ژ ڤی دینێ نوی لێڤەکەن یێ وان بۆ خۆ هلبژارتی، و چو ب دەست وان ڤە نەهاتی، بریارا وان یا دووماهییێ ئەو بوو ئەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکوژن، و گاڤا ئەبوو طالبی زانی کو ئەو د ڤی کارێ خۆ دا دمجدن، ئەو رابوو زەلامێن مالباتا هاشمی و موططەلبی هەمی کۆمکرن، و گۆتە وان: قورەیشییان دڤێت موحەممەدی بکوژن، و ئەڤە بۆ مە کێماسییە ئەم وێ ل سەر خۆ قەبویل ناکەین، هوین هەمی کۆم ببن و موحەممەدی بکەنە د ناڤبەرا خۆ دا، و قەستا گەلی بکەن، و نەهێلن کەس نێزیکی وی ببت.

وان هەمییان -موسلمانێن وان و کافرێن وان- گوهدارییا ئەبوو طالبی کر، و دەعیا وان نەگرت بهێلن قورەیشی ئێک ژ وان بکوژن، لەو وان هەمییان خۆ ڤەکێشا وی گەلی ئەوێ دکەفتە رۆژهلاتێ باکوورێ مەکەهێ، د ناڤبەرا چیایێ ئەبوو قوبەیس و قوعەیقوعانی دا، ئەو گەلییێ دبێژنی: گەلییێ بەنی هاشمییان، و ژ مالباتا هاشمییان ب تنێ ئەبوو لەهەب ما خۆ نەدا د گەل وان.

دەمێ دبوو شەڤ و هەر ئێکی جهێ خۆ ددانا دا بنڤت، ئەبوو طالب دچوو پێغەمبەر ژ جهێ وی رادکر و برایەکێ خۆ یان کورەک یان پسمامەکێ خۆ ددانا سەر جهێ وی و ئەو دبر ل جهەکێ دی دنڤاند، ژ ترسێن هندێ دا کو ئێک د ناڤ وان دا هەبت دلێ وی بچتە غەدرێ!

گاڤا قورەیشییان ئەڤ چەندە ژ هاشمی و موطـطـەلبییان دیتی، و زانی کو ئەو هەمی پێکڤە پشتا موحەممەدی بەرنادەن، ئەو ل سەر هندێ کۆمبوون کو دۆرپێچێ (حیصارێ) بدانن سەر مالباتا هاشمی و موطـطـەلببی، و وان پەیمان ب ڤێ چەندێ دا ئێـک و دو، و ل سـەر هـندێ پێکهـاتن کو کڕین و فرۆتنێ د گەل وان نەکەن، ژنان نەدەنێ و ژێ نەئینن، و د گەل وان نـەئاخڤن، و تێکـەلییا وان نەکـەن، چـو صـولحان ژ وان قـەبویل نەکـەن حـەتا ئـەو موحەممەدی تەسلیم بکەن.

و ژ بەر کو ئەڤ کۆمبوون و پەیمانا وان ل سـەر بڕینا مرۆڤینییێ بـوو، وان بسـتە نـەکر ئـەو وێ ل حـەرەما مەکـەهێ بکـەن، لـەو ئـەو چوونـە نهـالا کینانـەی ئـەوا دکەفتـە نێزیکـی مینـایێ و مـوزدەلیفێ، ژ دەرڤـەی حـەرەما مەکـەهێ، و وان ل وێـرێ پـەیمانا خۆ نڤیسـی، پاشـی ئـەو ئینـا ب دیـوارێ کەعبێ ڤە هلاویست.

قـورەیشـیـان هـزر کـر ئـەڤ گڤاشـتـنا ئـابۆری دێ کـاری ل هاشـمی و مـوطـطـەلبـیـان کـەت، و دەمـەکـێ درێژ پێڤە ناچت ژ برسان دا ئـەو دێ ژ ڕکدارییا خۆ لێڤەبن، و ب وێ کەن یا قورەیشییان دڤێت، بەلێ وەسا چێ نەبوو، سێ سالان وان خۆڕاگرت، و د ڤان سێ سـالان دا نەخۆشـییەکا مـەزن هاتە سـەرێ وان و ئـەو سسـت نـەبوون، مەسـەلە گەهشـتـە هنـدێ وان بـەلگێن داران خـوارن، و چـەرمـێ حێـشـتـران دهێرا حەتا وەکـی ئـاری لـێ دهـات و ب ئاڤێ دخوار، و گەلەک جاران زارۆکان ژ برسان دا دکرە گری حـەتا دەنگـێ گرییا وان ب سەر گەلی دکەفت!

ل وی دەمی پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- نفرینـەک ل قورەیشـییان کـر، عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی دبێژت: دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ پشـتددانە ژ وان دیتـی گۆت: یـا ڕەببـی تـو خەلایـەکا وەکـی یـا یووسـفی یـا

حەفت سالی ب سەر وان دا بینی! ئینا سالەکا خەلایێ ب سەر خەلکێ مەکەهێ دا هات وان مرار خوارن.. هنگی ئەبوو سوفیان هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ئەی موحەممەد، تو دبێژی تو یێ هاتییە هنارتن رەحم، ئەڤە مللەتێ تە چوونە هیلاکێ، دوعایەکێ بۆ وان ژ خودێ بکە!

هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعا کرن، ئینا باران باری!

گاڤا ئەبوو طالبی -و هنگی عەمرێ وی حەشتێ و پێنج سال بوو- ئەڤ دلرەقییە ژ پسمامێن خۆ یێن قورەیشی دیتی دلێ وی گەلەک هاتە گڤاشتن، ئینا وی چەکەکێ ژ هەمییان پتر کار ل جڤاکا عەرەبان دکر ل وی دەمی ب کارئینا.. چەکێ شعرێ، وی هندەک مالکێن شعرێ چێکرن، و ئەو شاعر بوو، تێدا عاطفەیا مرۆڤێن خۆ یێن نێزیک ئاخاڤت، کانێ چاوا ئەو رازی دبن ئەڤ زۆرداریە ل هندەکان ژ خوینا وان بێتەکرن، ئەو شعرا ب ڤان مالکان دەست پێ دکەت:

لما رأيت القوم لا ود بينهم وقد قطعوا كل العرى و الوسائل

و قد صارحونا بالعداوة و الأذى و قد طاوعوا أمر العدو المزايل

و قد حالفوا قوماً علينا أظنةً يَعَضّون غيظاً خلفنا بالأنامل

و ڤێ شعرێ دلێ هندەک زەلامێن قورەیشی هژاند، و عارا وان لڤاند، لەو وان خۆ دا ئێک، ل دەسپێکێ د ناڤبەرا خۆ دا گۆتن: چاوا ئەم شەرم ژ خۆ ناکەین مام و پسمامێن هندەک ژ مە، و خال و خوارزایێن هندەک ژ مە د ڤی گەلی دا ل پێش چاڤێن مە ژ برسان دا بمرن، و ئەم ل مالێن خۆ دتێر؟! پاشی وان پێکڤە خۆ دا ئێک، و چوون ل پێش چاڤێن ئەبوو جەهلی و هەڤالێن وی ل بەرانبەر کەعبێ راوەستیان و گۆتن: هنگی ئەم رادوەستین حەتا ئەم ڤێ پەیمانا هەوە ددرینین، و گاڤا کافران دیتی ئەو دمجدن گۆتنە

نێـک و دو: ئەڤـە شـۆلەکە ب شـەڤێ یـێ هاتییـە دورسـتکرن! و ئـەو چـوون پەیمان ژ دیوارێ کەعبێ ڤەکر و دڕاند.. و هندەک دبێژن: گاڤا ئەو چووین دا وێ ژ کەعبێ ڤەکەن، وان دیت کرمی ئەو چەرمێ قورەیشییان پەیمان ل سـەر نڤیسـی هەمـی یـێ خواری ب تنێ پەیڤا (بسـمک اللهـم) تـێ نـەبت ئـەو مابوو.

و پشتی نێزیکی سێ سالان ژ مانا پێغەمبەری و موسلمانان، د گەل کافرێن مالباتا هاشمی و موططەلبییان، د گەلی دا ل ژێر حیصارێ، سالا حـەفتێ و هەشـتێ و نـەهێ، کـافرێن قورەیشـییان ل ژێـر گڤاشـتنا هنـدەک زەلامـێن قورەیشـی (یـێن کـافر) دۆرپـێچ ڕاکـر، و هـەر ئێـک زڤـڕی مـالا خۆ وەکی بەرێ.

# مشەختبوونا صەحابییان یا دویێ
# بۆ وەلاتێ حەبەشە

بۆری د گەل مە کو ل سالا پێنجێ پشتی هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەمێ هێشتا موسلمان د مالا ئەرقەمی ڤە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا هندەک صەحابیین خۆ کو دەرکەڤنە حەبەشە.. و پشتی چەند هەیڤەکان ژ مانا وان ل حەبەشە (هندەک دبێژن: سێ هەیڤان) خەبەرەکێ نەدورست گەهشتە وان کو حالێ موسلمانان ل مەکەهێ وەکی بەرێ نەمایە، و ئێدی کافر نەشێن وێ نەخۆشییێ بگەهیننە وان یا بەری نوکە دگەهاندێ، لەو وان بریار دا بزڤرنە ڤە..

دەمێ ئەو گەهشتینە مەکەهێ وان دیت مەسەلە خرابترا لێ هاتی، و حالێ موسلمانان پتر یێ تەنگاڤ بووی، پشتی کو وان گازییا خۆ ئاشکەرا کری، لەو پشتی دەمەکی ئەو نەچاربوون جارەکا دی دەستویرییێ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بخوازن کو بزڤرنە حەبەشە، و ئاشکەرا نینە کانێ دەرکەفتنا وان یا دوییێ ل سالا شەشێ بوو بەری قورەیشی دۆرپێچێ بدانن سەر مالباتا هاشمی و موطەلبی، یان ژی ل سالا حەفتێ بوو پشتی دۆرپێچێ، و هەر چاوا بت مشەختبوونا ڤێ جارێ پتر دەنگڤەدان هەبوو، ژ بەر کو هژمارا مشەختییان زێدەتر بوو، و مانا وان درێژتر بوو، و قورەیشییان بزاڤا زڤراندنا وان یا ب کوتەکی کربوو.

ڤێ جارێ پتر ژ حەشتێ زەلامان مشەختبوونە وەلاتێ حەبەشە، هندەک دبێژن: ئەو حەشتێ و دو بوون، و هندەک دبێژن: حەشتێ و سێ بوون، و خیلاف د عەمماری کورێ یاسری دایە، کانێ ئەو ژی مشەخت بووبوو یان

نە، و بەلکی یا دورستتر ئەو بت کو ئەو د گەل وان نەبوو، و هەژدە ژن ژی د گەل مشەختییان بوون، یازدە ژێ قورەیشی بوون، مەعنا هژماران وان پێکڤە سەد کەس بوون، ژ بلی زارۆکان.

دەمێ قورەیشییان زانی کو ئەڤ هژمارا مەزن ژ خودان باوەران یێن چووینە حەبەشە، وان گەلەک پێ نەخۆش بوو، لەو وان بڕیار دا کو هندەک مرۆڤان ژ خۆ بهنێرنە نک نەجاشی، دا داخوازێ ژێ بکەن کو ئەو موسلمانان ژ وەلاتێ خۆ دەربێخت، بەلێ ڤێ بزاڤا وان چو پێڤە نەهات، بەلکی وێ پتر مفا گەهاندە موسلمانان، چونکی ب رێکا ڤێ بزاڤێ ژ شاندا قورەیشییان، موسلمان شیان گازییا خۆ ئێکسەر بگەهیننە نەجاشی، و ئەڤ چەندە بوو ئەگەر کو نەجاشی ب خۆ ژی موسلمان ببت.

## بزاڤا قورەیشییان بۆ زڤڕاندنا موسلمانان:

دەمێ قورەیشییان زانی کو موسلمان ل حەبەشە درەحەتن، و ئەو ب دلێ خۆ دینێ خۆ ب رێڤە دبەن، ئەڤ چەندە چوو د پەڕاسییا وان ڕا، لەو وان دو زەلامێن شارەزا و ب دەڤ و ئەزمان، یێن دبلۆماسی -ب زمانێ ئەڤرۆ- هنارتنە حەبەشە، و گەلەک تێرک و دیاری بۆ نەجاشی و هەڤالێن وی دانە ڤێ، و ئەو هەردو: عەمرێ کوڕێ عاصێ سەهمی بوو، و عەممارەیێ کوڕێ وەلیدی، و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو ئەو عەبدللاهێ کوڕێ ئەبوو رەبیعەیێ مەخزوومی بوو.

گاڤا ئەو گەهشتینە حەبەشە، ئەو چوونە کۆچکا نەجاشی، و پشتی پێکێشکرنا دیارییان، وان گۆتە نەجاشی: هندەک بچویک و جحێلێن مە یێن بێ عەقل یێن ژ دینێ خۆ دەرکەفتین، و نەهاتینە د دینێ هەوە ژی دا، دینەکێ نوی ژ نک خۆ یێ چێکری، نە ئەم دزانین ئەو چ دینە نە هوین، و ماقویلێن مە ژ مرۆڤێن وان ئەم یێن هنارتینە نک تە دا تو وان تەسلیمی مە

بکەی.. و بەری هنگی وان ب دیاری و بەرتیلان هندەک ژ هەڤالێن نەجاشی قانع کربوون، کو بۆ رازیکرنا نەجاشی ئەو هاری وان بکەن، لەو وان گۆتە مەلکی: ئەڤە ڕاست دبێژن، ئەو مرۆڤێن وانە و ئەو چێتر وان دنیاسن، وان دەربێخە بلا بزڤرنە وەلاتێ خۆ. نەجاشی ب ڤێ گۆتنا وان نەخۆش بوو، و گۆت: نە ب خودێ، ئەز وان تەسلیم ناکەم، و ئەز ژ کەسێ ژی ناترسم، هندەک مرۆڤان ئەز هلبژارت بم، و قەستا وەلاتێ من کربت، ئەز وان تەسلیم ناکەم، حەتا نەهنێرمە ب دویڤ وان ڕا و پسیارا ڤێ مەسەلێ ژ وان ب خۆ بکەم.

و تشتێ ژ هەمییێ نەخۆشتر ل بەر عەمری و هەڤالێ وی ئەو بوو نەجاشی بهنێرتە ب دویڤ وان ڕا؛ چونکی ترسا وان ئەو بوو نەجاشی ب گۆتنێن وان قانع ببت.

## د ناڤبەرا نەجاشی و جەعفەری دا:

پاشی نەجاشی هنارتە ب دویڤ موسلمانان ڕا؛ دا بزانت کانێ ئەو چنە و سوحبەتا وان چیە، و گاڤا ئەو هاتین جەعفەرێ کوڕێ ئەبوو طالبی گۆتە وان: کەس ژ هەوە نەئاخڤت، بەس ئەز ئەڤرۆ دێ ئاخڤم.. گاڤا نەجاشی هاتی خەلکێ دیوانێ هەمییان، و د گەل وان عەمری و هەڤالێ وی، خۆ چەماند، و موسلمان سەربلند مان!

نەجاشی گۆتە وان: بۆچی هوین خۆ ناچەمینن؟

جەعفەری گۆت: ژبلی خودێ ئەم خۆ بۆ کەسێ ناچەمینین.

نەجاشی گۆتێ: بۆچی؟

جەعفەری گۆت: خودێ پێغەمبەرەک د ناڤ مە دا هنارتییە، ئەو پێغەمبەرە یێ عیسایێ کوڕێ مەریەمێ مزگینی ب هاتنا وی دای، ناڤێ وی ئەحمەدە، وی فەرمان ل مە کرییە کو ئەم پەرستنا خودێ ب تنێ بکەین، و

چو شریکان بۆ وی چێ نەکەین، و نڤێژان بکەین، و قەنجییێ نیشا خەلکی بدەین، و بەرێ وان ژ خرابییێ وەرگێرین.

کەیفا نەجاشی ب ڤێ گۆتنا جەعفەری هات، گاڤا عەمری ئەڤ چەندە ژ وی دیتی، ڤیا کەربێن وی ڤەکەت، لەو گۆت: ئەی مەلک! ئەو گۆتنا تو د دەر حەقێ عیسای دا دبێژی، ئەو وێ نابێژن.

نەجاشی گۆتە جەعفەری: هەڤالێ هەوە بۆ کورێ مەریەمێ چ دبێژت؟

جەعفەری گۆت: ئەو دبێژت عیسا عەبدێ خودێ و پێغەمبەرێ وییە، خودێ ئەو بێ باب یێ دایە دەیکا وی یا پاقژ، ئەوا چو مرۆڤ نێزیک نەبووین. و جەعفەری هندەک ئایەت ژ سوورەتا (مەریەمێ) ژی بۆ وان خواندن.. چاڤێن نەجاشی و وان قەشێن ل وێرێ تژی رۆندک بوون، و هنگی نەجاشی دارکەک هلگرت و خیچەک پێ ل عەردی چێکر و گۆت: یا ئەڤە د دەر حەقا کورێ مەریەمێ دا دبێژن، هندی ڤێ خیچێ ژی یا جودا نینە ژ وێ یا ئەم دبێژین. پاشی وی گۆتە عەمری و هەڤالێ وی: هەرن، ب خودێ ئەز ڤان تەسلیمی هەوە ناکەم. و وی فەرمان ل زەلامێن خۆ کر کو ئەو دیارییێن وان بۆ بزڤڕیننە ڤە.

## نەجاشی کێ بوو؟

ناڤێ نەجاشی یێ دورست وەکی د هندەک ریوایەتان دا هاتی (ئەصحەمە) بوو، و نەجاشی لەقەبێ وی بوو، و ئەو مرۆڤەکێ شارەزا و تێگەهشتی و عادل بوو، و هەر ژ بەر هندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەڤالێن خۆ هنارتنە نک وی، و د ریوایەتێن دورست دا هاتییە کو نەجاشی موسلمان بووبوو، بەلێ وی ژ بەر مللەتێ خۆ ئیسلاما خۆ ئاشکەرا نەدکر، و رۆژا ئەو مری، ل سالا نەهێ مشەختی -یان هەشتێ ل دویڤ ریوایەتەکێ-، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خەبەرێ مرنا وی گەهاندە صەحابییان، و گۆتە

وان: ئەڤرۆ زەلامەکێ چاک مر، ڕابن نڤێژێ ل سەر برایێ خۆ ئەصحەمەیی بکەن.

ئەڤە، چونکی جهێ ئەو لێ مری، چو موسلمان لێ نەبوون نڤێژێ ل سەر بکەن، ژ بلی کو موسلمانەتییا وی یا ڤەشارتی بوو، و ژ بلی وان موسلمانێن ل وێرێ کەس پێ نەدحەسیا.

**ئەبوو بەکر و مشەختبوونا حەبەشە:**

ل وی دەمێ کافرێن قورەیشییان مالباتا هاشم و موطەلبی د گەلی دا دۆرپێچکرین و تەنگاڤی ل موسلمانان زێدە بووی، و پشتی مشەختبوونا موسلمانان یا دویێ بۆ وەلاتێ حەبەشە، سەرێن رێکان ل ئەبوو بەکری بەرزەبوون، لەو وی دەستویری ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خواست کو ئەو ژی مشەخت ببتە حەبەشە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دایێ، و ئەبوو بەکر ب مەشەختی ژ مەکەهێ دەرکەفت، و بەر ب حەبەشە ڤە چوو، و دەمێ ئەو گەهشتییە جهەکێ دبێژنێ: (برک الغماد) کو رێکا رۆژەکێ دووان ژ مەکەهێ یا دویرە، وی (ابن الدغنة) دیت، و (ابن الدغنة) مەزنێ بەنووحارثییان بوو، کو چەقەکێ مالباتا (کینانە)یە دبێژنێ: (ئەحابیش)، گاڤا وی ئەبوو بەکر دیتی، گۆتێ: تە خێرە، تو دێ کیڤە چی؟

ئەبوو بەکری گۆتێ: مللەتێ من ئەزێ دەرێخستیم و ئێشاندیم و ل سەر من کرییە تەنگاڤی. وی گۆتێ: بۆچی؟ ب خودێ تو مرۆڤەکێ خێرخوازی، و تو قەنجییێ دکەی، بزڤرە ڤە تو یێ ل سەر بەختێ من..

ئەبوو بەکر زڤری و گاڤا ئەو هەردو گەهشتینە مەکەهێ، (ابن الدغنة) د ناڤ قورەیشییان دا ڕابوو ڤە و گۆت: گەلی قورەیشییان، کورێ ئەبوو قوحافەیی یێ ل سەر بەختێ من، وە نەبت کەس نەخۆشییێ بگەهینتێ.

هنگی وان بەلایا خۆ ژێ دویرکر.

کچا ئەبوو بەکری، عائیشا دبێژت: ئەبوو بەکری ل بەر دەرێ مالا خۆ ئەوا ل تاخێ بەنوو جومەحییان، جهەکێ نڤێژان بۆ خۆ چێکربوو، هەر جار نڤێژ ل وێرێ دکرن، و ئەو مرۆڤەکێ دلنازک بوو، دەمێ وی قورئان دخواند گرییا مرۆڤی دئینا، ڤێجا بچویک و ژنک و عەبد ل دۆر وی کۆم دبوون، و ب عەجێبی ڤە بەرێ خۆ ددانێ..

ئینا هندەک زەلامێن قورەیشییان چوونە نک (ابن الدغنە)ی و گۆتنێ: ما تە بەختێ خۆ دایە ڤی زەلامی دا ئەو نەخۆشییێ بگەهینتە مە؟! دەمێ ئەڤ زەلامە نڤێژان دکەت، دکەڤتە د حالەتەکێ وەسا دا ئەم دترسین عەیالێ مە پێ ب فتنە بچن، ڤێجا بێژێ بلا ئەو بچتە د مالا خۆ ڤە، و وی چ دڤێت بلا ل وێرێ بۆ خۆ بکەت.

(ابن الدغنە) هاتە نک ئەبوو بەکری، و سوحبەتا قورەیشییان بۆ وی ڤەگێرا، ئەبوو بەکری گۆتێ: ئەگەر تو حەز بکەی، ئەز دێ بەختێ تە ل تە زڤرینم، دا چو نەخۆشی بۆ تە چێ نەبن.. وی گۆتێ: بلا.. و هنگی (ابن الدغنە) د ناڤ قورەیشییان دا ڕابوو ڤە و گۆت: گەلی قورەیشییان، کوڕێ ئەبوو قوحافەیی بەختێ من ل من زڤڕاند، ژ ئەڤرۆ وێڤە ئەو نە ل سەر بەختێ منە، و هوین و ئەو پێک دزانن. ب ڤێ چەندێ ئەبوو بەکر ما ل مەکەهێ حەتا تەنگاڤی ب سەر موسلمانان دا چووی و دەرباس بووی، و ئەو ژ گەلییێ ئەبوو طالبی دەرکەفتین.

ئەو موسلمانێن جارا دویێ چووینە حەبەشە، کو هژمارا وان ژ سەدان پتر بوو -وەکی مە گۆتی- چەند سالەکان مانە ل وێرێ، و هندەک ژ وان بەری مشەختبوونا بۆ مەدینێ زڤڕینە مەکەهێ، و هندەک مان بوون سالا حەفتێ و هەشتێ ژی پشتی مشەختبوونا بۆ مەدینێ، لەو دەمێ ئەو زڤڕین، ئەو ئێکسەر چوونە مەدینێ.

# مرنا ئەبوو طالبی
# و خەدیجایێ

**مرنا ئەبوو طالبی**:

ل دووماهییا سالا دەهێ ژ هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و پشتی ب دووماهی هاتنا دۆرپێچکرنا کافرێن مەکەهێ بۆ مالباتا موطلەلبی ب دەمەکی، مامێ پێغەمبەری ئەبوو طالب عەبدمەنافێ کوڕێ عەبدلموطلەلبی مر.. و ئەبوو طالب ئەو بوو یێ ل درێژییا دەهـ سالان بەرەڤانی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری و ئەو ژ کافران پاراستی، و ژ بەر کو مەزنێن قورەیشییان ڕێزەکا مەزن ل وی دگرت، و ژ بەر خاترا وی، وان چو نەخۆشییێن ئێکسەر نەدگەهاندە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و پێغەمبەری ب خۆ ژی -سلاڤ لێ بن- گەلەک حەز ژ مامێ خۆ دکر، و ئەو وەکی بابێ خۆ ددیت، و دەمێ ئەبوو طالب کەفتییە بەر مرنێ، و هنگی ژییێ وی حەشتێ و پێنج سال بوون، هندەک زەلامێن قورەیشی ژ مال خالانێن وی ژ بەنی مەخزوومییان هاتنە نک، سەرەدانا وی بکەن، و ئەو ژی ئەڤەبوون: ئەبوو جەهلێ کوڕێ هیشامی، و عەبدللاهێ کوڕێ ئەبوو ئومەییەی، و موسەییەبێ کوڕێ حەزنی.. ل وی دەمی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە نک مامێ خۆ، و گاڤا دیتی ئەو یێ کەفتییە سەکەراتێ، وی ب دلەکێ تژی رەحم ڤە گۆتێ:

- ئەی مام، کەسێ هندی تە حەق ل سەر من نینە، و پتر قەنجی ل من نەکرییە، بەس تو پەیڤەکێ بێژە دا ڕۆژا قیامەتێ ئەز بشێم مەهدەرێ بۆ تە بکەم، بەس بێژە: (لا إله إلا الله) ئەز دێ بەرەڤانییێ پێ ژ تە کەم ل نک

خودێ. هنگی ئەبوو جەهلی گۆتە وی: ما تو دێ دینێ عەبدلموطـەلبی هێلی؟ بەری ئەبوو طالب بەرسڤەکێ بدەت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جارەکا دی گۆتێ: ئەی مام، بێژە: (لا إله إلا الله) دا ئەز شاهدەییێ بۆ تە پێ بدەم ل نک خودێ. و ئەبوو جەهلی ژی گۆتنا خۆ دوبارەکر و بیرا وی ل دینێ عەبدلموطـەلبی ئینا ڤە.

جارا سێیێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتنا خۆ دوبارەکر، ڤێ جارێ بەرسڤ ژ ئەبوو طالبی دەرکەفت، وی گۆت: برازا، ئەگەر نە ژ بەر هندێ با قورەیشی دێ لۆمەی من کەن، وبێژن: وی ژ ترسێن مرنێ دا ئەو ئاخفتن گۆت، ئەز دا چاڤێن تە پێ روهن کەم.. پاشی بەری رحا وی دەرکەڤت، وی گۆت: ئەز یێ ل سەر دینێ باپیران، ئەز یێ ل سەر دینێ عەبدلوطـەلبی!

و ئەبوو طالب مر.. و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ نک وی دەرکەفت، چاڤێن وی تژی رۆندک، و دلێ وی تژی خەم.. و هێدی گۆت: ب خودێ ئەز دێ داخوازا لێبۆرینی بۆ تە ژ خودێ کەم، ئەگەر ئەز ژ وێ چەندێ نەئێمە پاشڤەبرن.

و د وێ سەرهاتییێ دا خودێ ئەڤ ئایەتە بۆ وی هنارت: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ۝١١٣ وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ۝١١٤ ﴾ (التوبة: ١١٣-١١٤) یەعنی: نەبوویە بۆ پێغەمبەری و ئەوێن باوەری ئینای کو داخوازا ژێبرنا گونەهان بۆ بوتپەرێسان بکەن، ئەگەر خۆ ئەو مرۆڤێن وان یێن نێزیک ژی بن پشتی کو ئەو ل سەر شرک و صەنەمپەرێسییێ مرین، و بۆ وان ئاشکەرا بووی کو ژ بەر مرنا وان ل سەر شرکێ ئەو جەهنەمینە، و خودێ گونەهێ بۆ بوتپەرێسان ژێ نابەت، و داخوازا ئیبراهیمی بۆ بابێ وی یێ

بوتپەرێس کو خودێ گونەهێن وی ژێ ببەت، هەما ژ بەر هندێ بوو چونکی وی سۆز دابوویێ، دەمێ گۆتییێ: ﴿ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا ۝٤٧ ﴾ (مريم: ٤٧) ڤێجا دەمێ بۆ ئیبراهیمی ئاشکەرابووی کو بابێ وی دوژمنێ خودێیە و گۆتن و وەعز چو کاری لێ ناکەن، و کو ئەو دێ ل سەر کوفرێ مرت، ئیبراهیمی ئەو هێلا و دوعا بۆ نەکرن، و خۆ ژێ بەریکر. هندی ئیبراهیم بوو گەلەک هەوار دکرە خودێ، و گەلەک یێ دلفرەهـ و ئارام بوو.

و بۆ خەمرەڤینی ئەڤ ئایەتە ژی بۆ وی هاتە خوارێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ۝٥٦ ﴾ (القصص: ٥٦) یەعنی: هندی تویی -ئەی پێغەمبەر- تو تەوفیقا وی بۆ هیدایەتێ نادەی یێ تە هیدایەتا وی بڤێت، بەلکی ئەو چەندە ب دەستێ خودێیە هەچییێ وی بڤێت ئەو بەرێ وی بدەتە ئیمانێ ئەو وی ب هیدایەت دئینت، و تەوفیقا وی ددەت، و ئەو ب وی زاناترە یێ هێژای هیدایەتێ بت لەو وی ب هیدایەت دئینت.

و هەر چەندە ئەگەر ب دیتنا عەقلی و لێکدانا مرۆڤان بت، یا ژ هەمییێ پتر بەرهەزر ئەو بوو ئەبوو طالب بەری هەر ئێکی باوەرییێ ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بینت؛ چونکی وی ژ هەر کەسەکێ دی پتر پێغەمبەر دنیاسی، بەلێ د گەل هندێ ژی گازییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل درێژییا دەهـ سالان، چو کار ل وی نەکر، و ئێکا هند ژێ چێ نەکر ئەو باوەرییێ بینت، تشتێ هندێ دگەهینت کو (هیدایەت) دانا خودێیە، و ئەگەر حەزکرنا خودێ ل سەر نەبت کەس نەشێت هیدایەتێ بدەتە کەسێ.

### مرنا خەدیجایێ:

پشتی مرنا ئەبوو طالبی ب دەمەکێ کێم، هندەک دبێژن: ب سێ رۆژان دەیکا موسلمانان خەدیجایا کچا خوەیلدی ژی ژ ڤێ دنیایێ بارکر، و

هندەک دیرۆکڤان دبێژن: مرنا ئەبوو طـالبی و خەدیجایێ هەردووان ل هەیڤا ڕەمەزانێ بوو ژ سالا دەهێ ژ هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-.

خەدیجا نێزیکی بیست و پێنج سالان د گەل پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بن- مابوو، و ئەگەر ژیـێ وێ دەمـێ شوی ب پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- کری بیست و هەشت سال بن، وەکی د ڕیوایـەتێن دورسـتتر دا هـاتی، مـەعنا دەمێ ئەو مری ژییێ وێ دێ پێنجی و سێ سال بن.

گـەلـەک حـەدیـس د خێر و بهایێ خەدیجایێ دا هاتینـە، و ئـەو ئێـک ژ وان صەحابییان بـوو یـێـن مزگینییا بەحەشتێ ب ساخی بۆ هاتییـەدان، و ژ تایبەتمەندییێن وێ ئەو بوو عەیالێ پـێـغـەمـبـەری -سلاڤ لێ بن- هـەمـی، کچ و کـوڕ، ئـیـبـراهیم تێ نەبت، هەمی ژ وێ بوون، و هـنـدی ئـەو یـا سـاخ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چو ژن ل سەر نـەئـینـابوون، و وەکی ژ عائیشایێ دئێتە ڤەگوهاستن پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- هند مـەدحێن ئێکی نـەدکرن، هندی مەدحێن خەدیجایێ دکرن.

# پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن-
# پشتی مرنا ئەبوو طالبی

بـۆری د گـەل مـە کـو ل دووماهییا سـالا دەهێ ژ هنارتنا پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- مـامـێ وی و پشتەڤانێ وی یێ مەزن ئـەبوو طـالـب مـر، و ب مرنا ئەبوو طـالبی خەم و تەنگاڤییەکا زێدە ب سەر پێغەمبـەری دا هات؛ چونکی کـافرێن قورەیشـییان ل سـەر وی بسـتە بـوون، و رێکـا خـۆ دیـت کـو نەخۆشییێ بگەهیننێ.

و ئەو ریوایەتێن د کتێبێن سیرەتێ دا هـاتین ژ بسـتەییا کـافران ل سـەر شەخصێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەمی، یـان پـتر -وەکـی زانـایێ ناڤدار ئبن کەثیر دبێژت- ل ڤی دەمی چێ بووبوون، ژ وان بۆ نموونە:

دەمـێ کـافران عـویر و رویڤیکـێن حێشـترەکا سـەرژێکری هاڤێتینـە سـەر پشتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەختێ ئەو چوویە سوجدێ؛ ڤێجا کچا وی فاطـما هاتی ئەو ژ سەر پشتێ هاڤێتی.

و دەمێ هندەک کافر هاتین، و دەست حـەفکا پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بن- دانای، و ڤیای وی بخندقینن، هنگی ئەبوو بەکر هـات ئـەو پاشڤەبرن، و پێغەمبەر ژ ناڤ دەستێن وان رزگارکری.

و دەمێ ئەبوو جەهل چووی دا پییێ خۆ بدانتـە سـەر سـەرێ پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- دەمێ ئەو چوویە سوجدێ، و ملیاکەت هاتی ئەو پاشڤەبری..

یەعنی: هندی ئەبوو طـالب یێ ساخ، نەزان و بێ فـامێن کـافران د خـۆ را نەدیت و نەدوێریان نەخۆشییەکێ بگەهیننە پێغەمبەری، بەلێ پشتی ئـەبوو طـالب نەمای، ژ نوی وان بستەیی ل سەر وی کر.

# پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن-
# ل باژێرێ طائیفێ

مە گۆت: بەری سالا دەهێ ب دویماهی بێت خودێ وەسا حەزکر ئەبوو طالب مر، و پشتی مرنا وی ب کێمتر ژ حەفتییەکێ خەدیجا ژی مر، و ب مرنا وان هەردووان نەخۆشییێ ل سەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەست پێ کر، هندی خەدیجا بوو وەکی چەپەرەکێ ناڤخۆیی بوو بۆ وی، پشتەڤانییا وی دکر، و دلێ وی ل سەر حەقییێ موکم دکر، و تەشجیعا وی دکر کو ئەو سست نەبت، و هندی ئەبوو طالب بوو بۆ وی ئەو چەپەر بوو یێ نەخۆشییا قورەیشییان ژ وی دویر دکر، ڕۆژەکێ -پشتی مرنا ئەبوو طالبی- پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل ڕێکەکێ دچوو بێ عەقلەکێ قورەیشییان هات کولمەکا ئاخێ ب سەر سەرێ وی دا کر، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زڤڕی مال، کچا وی فاطما هات ئاخ ژ سەر سەری داقوتا و کرە گری، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: کچا من! نەکە گری، خودێ دێ بابێ تە ژ وان پارێزت.. پاشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: قورەیشی نەشییان تشتەکێ من پێ نەخۆش بت بگەهیننە من هندی ئەبوو طالب یێ ساخ.

ل ژێر ڤی کاودانێ نەخۆش، و ڤێ بستەییا بۆ کافرێن مەکەهێ چێ بووی دژی وی، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ خەلکێ مەکەهێ بێ هیڤی بوو، لەو وی هزر د هندێ دا کر ئەو گازییا خۆ ژ مەکەهێ دەربێخت، و بەرێ خۆ ژ قورەیشییان وەرگێڕت..

بەلێ ئەو کیڤە بەرێ خۆ بدەت؟

پشتی مرنا ئەبوو طالبی و خەدیجایێ ب هەیڤەکێ، و ب دورستی ل هەیڤا شەووالێ (هەیڤا دەهێ) ژ سالا دەهێ ژ دەسپێکرنا ئیسلامێ، و بەری مشەختبوونێ ب سێ سالان، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل خۆ بریار دا ژ مەکەهێ دەرکەڤت و قەستا بارژێرەکێ نێزیکی مەکەهێ بکەت کو بارژێرێ طائفێ بوو..

طائف بارژێرەکێ بچویک و تەنا بوو دکەفتە رۆژهەلاتا مەکەهێ، و ژ بەر هەبوونا ئاڤێ و کەسکاتییێ ئەو وەکی هاڤینگەهەکێ دهاتە هژمارتن، حوکمێ ڤی بارژێری د دەستێ دو ئویجاخێن عەرەبان یێن بچویک دا بوو، ئەو ژی (بەنوو مالک و ئەحلاف) بوون، کو ژ ثەقەفییان دهاتنە هژمارتن، و ژ بەر کو ئەڤ هەردو ئویجاخە نە ژ ئویجاخێن عەرەبان یێن مەزن و ب هێز بوون، و ژ بەر وان خێر و خێراتێن ل طائفێ هەین، کو جهەکێ ستراتیجی و چاندنێ بوو، دو ئویجاخێن دی یێن عەرەبان یێن مەزن دلێ خۆ دبرە هندێ دەستێ خۆ بداننە سەر بارژێرێ طائفێ، ئەو ژی (هەوازن) و (قورەیشی) بوون، هەوازن ل رۆژهەلاتا طائفێ دژیان، و قورەیشی ل رۆژئاڤایا وێ دژیان، و ژ بەر لاوازییا مالکی و ئەحلافان -خۆجهێن طائفێ- ئەو نەچار بووبوون هندەک پەیمانان د گەل ڤان هەردو ئویجاخێن مەزن گرێدەن؛ دا خۆ ژ خرابییا وان بپارێزن، مالکی هەڤپەیمانێن هەوازن بوون، و ئەحلاف هەڤالبەندێن قورەیشییان بوون، و ل دویڤ ڤان پەیمانان هەوازن و قورەیشی هەردو خودان مەصلحەتێن تجاری بوون ل طائفێ و دەستێ وان زێدە ب ناڤ بارژێری و خەلکێ وی دا دچوو، حەتا گەلەک ژ دەولەمەندێن قورەیشییان هەبوون ملک و رەز و بیستان ل طائفێ هەبوون، هاڤینێ دچوون دمانە ل وێرێ حەتا دبوو زڤستان ژ نوی دزڤرینە مەکەهێ..

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا قەستا طائفێ بکەت، و هیڤیا وی ئەو بوو خەلکێ طائفێ وی بحەوینن و پشتەڤانییا وی بکەن، و حەتا مەسەلا چوونا وی بۆ قورەیشییان ئاشکەرا نەبت؛ دا ئەو چو ئاستەنگان بۆ وی چێ نەکەن، وی بڕیار دا چوونا وی یا ب دزی ڤە بت، پییان دەرکەفت، دا قورەیشی چو شکان ژێ نەبن، و وی کوڕێ خۆ یێ (تەبەنییێ) زەید ب تنێ د گەل خۆ بر، دیسا دا کەس چو شکان ژێ نەبەت، و چوو حەتا گەهشتییە طائفێ، و دەمێ ئەو گەهشتییە باژێڕی ل سەری وی قەستا مالا مەزنێ نەحلافان کر، کو هەڤپەیمانێن قورەیشییان بوون، و نەچوو نک بەنوو مالک هەڤپەیمانێن هەوازنییان، چونکی ئەو ل وێ باوەرێ بوو کو ئەگەر ئەو شیا پشتەڤانێن قورەیشییان ب لایێ خۆ ڤە بکێشت ئویجاخا دی دێ یا ب ساناهیتر بت، و ژبلی ڤێ چەندێ ژی بنەمالا مەزنێن ئەحلافان خزماینی د گەل قورەیشییان هەبوو، ژنکەکا وان قورەیشی بوو، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- طەمەعییا هندێ کر کو ئەگەر ئەو باوەرییێ پێ نەئینن ژی ژ بەر مرۆڤاینییێ نەخۆشییێ نەگەهینێ.. بەلێ ئەو ل دویڤ وێ هزرێ نەبوون یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژێ کری، ترسا وان ژ قورەیشییان ئەو ژ هندێ دانە پاش کو ئەو باوەرییێ ب پێغەمبەری بینن، و بێ ئەدەبییا وان ئێکا هند ژ وان چێ کر ئەو کرێت د گەل وی باخڤن، و وان ژ عەبد و بێ عەقل و زارۆکێن خۆ خواست ئەو بدەنە دویڤ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و بەران تێ وەربکەن و وی ژ تاخێ خۆ دەربێخن، و وان ئێکا هند کر خوین د پییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بهاڤێت، و سەرێ زەیدی ژی شکاند..

دەهـ ڕۆژان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ما ل طائفێ، و وی خۆ بۆ گەلەک ژ بابک و ئویجاخێن وان پێشکێش کر، و بەرسڤا هەمییان ئێک بوو، لەو ئەو ژ وان بێ هیڤی بوو.. بوخاری و موسلم ژ عائیشایێ

ڤەدگوهێزن، کو جارەکێ وێ پسیار ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کانێ ڕۆژەکا نەخۆشتر ژ ڕۆژا ئوحودێ د سەر وی ڕا بۆرییە یان نە؟ وی د بەرسڤا خۆ دا بۆ وێ ئاشکەرا کر کو ئەوا وی ژ خەلکێ طائفێ دیتی نەخۆشتر بوو، حەتا دەرەجەکێ وە ل وی هات دەمێ ئەو ژ طائفێ دەرکەفتی ل شوینا کو ئەو ب لایێ ڕۆژئاڤایێ ڤە بچت دا بچتە مەکەهێ، ئەو بێی های ژ خۆ هەبت ب لایێ ژۆرییا ڕۆژهەلاتێ ڤە چوو حەتا گەهشتییە دەڤەرا (قرن الثعالب).

ل وی جهێ دویر ژ مەکەهێ، و ل وی دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د حالەتەکێ نەفسی یێ بەرتەنگ دا دژیا، وی سەرێ خۆ ب نک عەسمانی ڤە بلند کر، وی هند دیت عەوروەک هاتە هنداڤ، و جبریل د ناڤ دا بوو، جبریلی گۆتێ: خودێ گوهـ ل گۆتنا مللەتێ تە بۆ تە بوو، و کانێ وان چ بەرسڤ دا تە، و خودێ ملیاکەتێ چیایان بۆ تە هنارت؛ دا تو وێ فەرمانێ لێ بکەی یا تە دڤێت، و ملیاکەتێ چیایان گازی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر و سلاڤ دایێ، و گۆتێ: ئەی موحەممەد، خودێ گوهـ ل گۆتنا مللەتێ تە بۆ تە بوو، و کانێ وان چ بەرسڤ دا تە، و ئەز ملیاکەتێ چیایانم، خودێ ئەز بۆ تە هنارتیمە، دا تو وێ فەرمانێ ل من بکەی یا تە دڤێت، ڤێجا ئەگەر تە بڤێت ئەز دێ هەردو چیایان ب سەر وان دا ئینمە خوارێ؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: نە، هیڤییا من ئەوە خودێ هندەک مرۆڤان ژ پشتا وان بینتە دەر پەرستنا خودێ ب تنێ بکەن، و چو شریکان بۆ وی چێ نەکەن.

ل دەڤەرا (قرن الثعالب) ژ نوی هشێن وی هاتنە سەری، و وی زانی ئەوی ڕێکا خۆ یا خەلەت کری، و جارەکا دی زڤڕی ڕێکا دورست و بەر ب مەکەهێ ڤە چوو.

نوکە ئەو چ بکەت؟

خەلکێ طائفێ ب کرێتترین ڕەنگ بەرسڤا وی دا، و ئەو ژ بـاژێرێ خـۆ دەرێخسـت، بێـی ئعتبـارەکێ بدەنـە وان ئـەخلاق و عـورف و عـەدەتان یـێن عەرەب پێ هاتینە نیاسین د قەدرگرتنا مێڤانی دا..

جـارەکا دی بـزڤـڕتـە مەکەهێ؟ ئاخری مەکەهـ هەر ئەو مەکەهە یا ئـەو ژ بەر خەلکێ وێ ڕەڤی، و نوکە پشتی ئەقەفییان ئەو ئینایە سەری یا ئینایـە سەری، چاوا ئەو دێ زڤڕتـە مەکـەهێ؟ مسـۆگەر قورەیشـی پتـر دێ لـێ بسـتە بـن، و ئـەبوو طـالـب نەمایـە بـەرەڤانییێ ژێ بکـەت، ڤێجـا ئـەو چ بکـەت؟ مەکەهێ و طـائفێ هەردووان بهێلت و بـۆ خـۆ قەستا جهـەکێ دی ل عـەردێ خودێ یـێ بەرفرەهـ بکەت؟ و زەیدی ئیشـارەت بـۆ ڤـێ چەنـدێ دایـێ دەمـێ دیتـی ئـەو یـێ بـەر ب مەکـەهێ ڤـە دزڤـڕت، ئینـا گـۆتێ: چاوا تـو دێ زڤڕیـە مەکەهێ و تو ژ بەر خەلکێ وێ یێ دەرکەفتی؟ پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- گۆتێ: ئەی زەید! خودێ ڕێکەکێ بۆ ڤـێ یـا تـو دبینـی دێ بینـت، و ئـەو هـەر دێ دینێ خۆ و پێغەمبەرێ خۆ ب سەرئێخت.

بڕیارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو بـوو ئـەو بزڤڕتـە مەکـەهێ، بـەلێ چاوا بزڤڕت، ئەگەر هۆسا ئەو بزڤڕت قورەیشـی دێ پتـر نەخۆشـییێ گـەهیننێ، و دویر نەگرە ئـەو هەر نەهێلن ئەو بچتە د مەکـەهێ دا، مـانێ ب (قیاسـاتێن سیاسی) نـوکـە ئـەو یێ د سەر و بـەرەکێ زێدە لاواز دا دبـۆرت، پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- ب شارەزاییا خـۆ ئـەڤ چەندە دزانی، لـەو دەمـێ ئـەو دچتـە د مەکەهێ دا دڤێت وی هێـزەک هـەبت ل پشـتا وی بـت، مـەنعا قورەیشـییان ژێ بکەت، چ بکەت؟

وی بـڕیار دا بەری بێتە د باژێرێ مەکـەهێ دا ئـەو هێزەکا (موعتـەبـەر) ل نک قورەیشییان ب لایێ خۆ ڤە بکێشـت، جهـێ ئـەبوو طـالبی بگرت؛ دا

قورەیشی هزر نەکەن ئەو شکەستی یێ زڤڕی، ڤێجا وان چ بڤێت د گەل وی بکەن.. پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل زەیدی چوو شکەفتنا (حرائێ) ب ڕەخ مەکەهێ ڤە، پاشی وی ب دزی ڤە هنارتە ب دویڤ زەلامەکێ (خوزاعی) ڕا، و ئەو هنارتە نک (موطعمێ کوڕێ عەدی) مەزنێ بابکێ (نەوفەلییان) ژ قورەیشییان، و گۆتێ: بێژێ موحەممەد دخوازت ل سەر بەختێ تە بێتە د مەکەهێ دا، کانێ تو چ دبێژی؟

و بەری ئەز بەرسڤا وی بۆ هەوە ڤەگێڕم، من دڤێت سەرهاتییەکا کورت بۆ هەوە ڤەگێڕم، دا شارەزاییا سیاسی یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ هەوە ئاشکەرا ببت، و بزانن کانێ وی چاوا شۆل دئێخستنە بەرێک..

ل سەر زەمانێ باپیرێ پێغەمبەری عەبدلموطەلبی، هەڤڕکییەک د ناڤبەرا نوفەلی (مەزنێ بابکێ نەوفلییان) و عەبدلموطەلبی (مەزنێ بابکێ هاشمییان) دا چێبوو، مەسەلە گەهشتە هندێ عەبدلموطەلبی هەوارێن خۆ گەهاندنە خالێن خۆ یێن خەزرەجی ل یەثربێ، خەزرەجی چەکدار هاتنە مەکەهێ و ب ڕەخ کەعبێ ڤە دانا و هنارتە ب دویڤ نەوفەلی ڕا و گەف لێ کرن و داخواز ژێ کر ئەو نێزیکی خوارزایێ وان عەبدلموطەلبی نەبن، و ل وی دەمی گاڤا خوزاعییان (دوژمنێن دیرۆکی یێن قورەیشییان) دیتی خەزرەجی د هەوارا خوازرایێ خۆ هاتن، ئەو چوون پەیمانەک د گەل مەزنێ هاشمییان عەبدلموطەلبی گرێدا، و بوونە حەلیفێن وی؛ دا کەربێن (بەنوو نەوفلییێن قورەیشی) پتر ڤەبن. گاڤا نەوفەلییان دیتی پشت بوو عەبدلموطەلبی ل مەکەهێ و ژ دەرڤەی مەکەهێ ژی چێبوو ئەو نەوێریان ئێدی نەیارەتییا عەبدلموطەلبی بکەن، و خۆ بۆ وی چەماند.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گاڤا ڤیای بێتە د مەکەهێ دا چ کر؟

وی زەلامەکێ خوزاعی هنارتە نک مەزنێ نەوفەلییان، و گۆتێ: موحەممەدی دڤێت تو بەختێ خۆ بدەیێ دا سەربەست بێتە د مەکەهێ دا. و دانا بەختی (یان: ئیجارە) ئێک ژ وان عورف و عەدەتان بوو یێن عەرەبان ب گشتی و قورەیشییان ب تایبەتی پێگیری پێ دکر، یەعنی: هەر وەکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دڤیا ب ڤێ قاصدییێ ئیشارەتەکێ بدەتە قورەیشییان ب گشتی و نەوفەلییان ب تایبەتی کو بلا ئەو هزر نەکەن موحەممەد یێ مایە بێ خودان و وان چ دڤێت دێ وێ د گەل وی کەن، خوزاعی ئەوێن دوهی بووینە پشت بوو عەبدلموطەلبی، و خەزرەجی ژی ئەوێن ب چەک ڤە هاتینە حەوشا کەعبێ -و ئەو تشتەکێ مەزن بوو ل بەر قورەیشییان- هێشتا دساخن، و پەیمانا وان د گەل عەبدلموطەلبی ژی هێشتا نەهاتییە شکاندن.. ڤێجا ئەی مەزنێ نەوفەلییان تو چ دبێژی؟

بەلکی ئێک بێژت: مادەم وەسا بوو ما بۆچی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئێکسەر بەختێ خوزاعییان نەدخواست؟ ما دا بۆچی بەختێ نەوفەلییان خوازت؟

د بەرسڤێ دا دێ بێژین: د عورف و عەدەتێن عەشیرەتێ دا بابکێن هاشمی و عەبدشەمس و نەوفلی ل ئێک ڕێزێ بوون، و ئەو بلندتر بوون ژ خوزاعییان، و پشتی ئەبوو طالب نەمای مەزنییا مەکەهێ ب تمامی کەفتە دەستێ ئەبوو سوفیانی کو نەڤیچرکێ عەبدشەمسی بوو، و ئەو کەسێ بێت بەرانبەر ئەبوو سوفیانی ڕاوەستت دڤێت ل دویڤ عورفێ عەشیرەتێ یێ ژ وی کێمتر نەبت، لەو پێغەمبەری موطعمێ کوڕێ عەدی یێ نەوفەلی هلبژارت دا ل مستەوایێ ئەبوو سوفیانی بت.. و موطعم ب شارەزاییا خۆ د مەسەلێ گەهشت، لەو ئێکسەر و بێ ڤەمان گۆتە زەلامێ خوزاعی: هەرە بێژە موحەممەدی بلا بێتە مالا من!

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ شکەفتا حرائێ هاتە مالا موطعمی، ب شەڤێ ما ل وێرێ، گاڤا بوویە سپێدە موطعمی هنارتە ب دویڤ هەر حەفت کورێن خۆ را و گۆتە وان: شیرێن خۆ هلگرن، و د گەل من وەرن، پاشی گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: وەرە دا بچینە کەعبێ، گاڤا گەهشتینە کەعبێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- طەواف کر پاشی دو رکاعەتێن سوننەت کرن، و موطعمی ب هەر حەفت کورێن خۆ ڤە حەرەسی لێ دکر.. گاڤا ئەبوو سوفیانی ئەڤ چەندە ژێ دیتی، ب نک ڤە چوو و گۆتێ: تە باوەری پێ ئینایە یان تە بەختێ خۆ دایێ؟ وی گۆت: من بەختێ خۆ یێ دایێ. ئەبوو سوفیانی گۆتێ: مادەم وەسایە کەس بەختێ تە ناشکێنت.

و موطعمی د ناڤ قورەیشییان دا گازی کر: گەلی قورەیشییان! من بەختێ خۆ یێ دایە موحەممەدی کەس نێزیکی وی نەبت. پاشی ئەوی ب کوڕ ڤە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بر گەهاندە مالا وی، و ئێدی کەس نەوێریا خۆ نێزیکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت.. و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ هەلویستێ موطعمی ژ بیر نەکر، ڕۆژا شەڕێ بەدرێ چێبووی، و موسلمانان حەفتێ قورەیشی ئێخسیر کرین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەگەر موطعمێ کوڕێ عەدی یێ ساخ با و وی داخواز ژ من کربا ئەز ڤان ئێخسیران هەمییان بەردەم، سەر خاترا وی ئەز دا وان هەمییان بەردەم!

بەلێ موطعم بەری هنگی ل سەر کوفرێ مربوو.

# موعجزەیا ئیسراء و میعراجێ

پشتی مرنا ئەبوو طالبی و خەدیجایێ، و پشتی زڤڕینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ بازێڕێ طائیفێ، حال ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زێدەتر بەرتەنگ بوو، و کافران پتر نەخۆشی گەهاندنێ، و ل وی دەمی خودێ وەسا حەز کر ئێک ژ مەزنترین موعجیزەیان نیشا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بدەت، ئەو ژی موعجیزەیا (ئیسراء ومیعراجێ) بوو.

## موعجیزەیا ئیسراء ومیعراجێ:

ئەڤ موعجیزە وەکی هندەک زانایێن سیرەتێ ڤەدگوهێزن، ل هەیڤا رەجەبێ ژ سالا دووازدێ پشتی دەسپێکرنا گازییا ئیسلامێ چێبووبوو، و ئەگەر پترییا موعجیزەیێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سەر داخوازا هەڤڕکان پەیدا ببن، موعجیزەیا ئیسراء و میعراجێ قەدرگرتنەک بوو ژ لایێ خودێ ڤە بۆ پێغەمبەری بێی ئەو یان کەسەکێ دی وێ چەندێ بخوازت. و موعجیزەیا ئیسراء و میعراجێ ب قورئانێ و سوننەتێ ثابت بوویە، و گەلەک حەدیسێن دورست د ڤێ دەربارەیێ دا هاتینە ریوایەتکرن.

## ڕاوەستانەک د گەل ڤێ موعجیزەیێ:

ئیسراء و میعراج، ژ هەر لایەکی ڤە یێ مرۆڤ بەرێ خۆ بدەتێ، گەشتەکا عنتیکە و پەردەدڕ بوو، ب تایبەتی ل نک وان مرۆڤان یێن باوەرییا وان نە یا دورست، و ئەصلێ گرێکێ ل نک وان ئەوە ئەو عەقلێ خۆ دکەنە تەرازی بۆ کێشانا مەسەلێن عەقیدێ، و ئەو ژ بیرا خۆ دبەن کو (عەقل) تشتەکێ سنۆردایە خودێ یێ ئافراندی، و نە تشتەکێ (مەنطقییە) ئەم (مەخلووقەکی) بکەینە تەرازی بۆ کێشانا کارێن (خالقی).. و حەتا کو

ئەوێن ب عەقلی دخوڕن، بزانن کو نابت عەقل ببتە تەرازی بۆ کێشانا ڕاستییێن شەرعی و یێن کەونی ژی، ئەم دێ پسیارەکێ کەین: ئەرێ ل وی دەمێ موعجیزەیا ئیسراء و میعراجێ چێبووی، ئەگەر مە گۆتبا مرۆڤێ ژ هەمییان عەقلدارتر: دەمەک دێ ئێت مرۆڤ دێ شێت ب دەمەکێ کێمتر ژ سەعەتەکێ ژ مەکەهێ فڕت و چتە قودسێ.. بەرسڤا وی دا چ بت؟

مسۆگەر ئەو دا بێژت: ئەڤە تشتەکێ بەرعەقل نینە.. و ئەو ب خۆ ل ڤی زەمانێ مە بچویک ژی باوەرییێ ب ڤێ مەسەلێ دئینن، چونکی ئەو تشتەکێ گەلەکێ بەرعەقلە.

مەعنا: حوکمێ عەقلێ دوهی و یێ ئەڤرۆ د ئێک مەسەلێ دا هاتە گوهارتن.

تشتەکێ دی: علمێ مە یێ نوکە دبێژت: ئەڤ عەردێ ئەم ل سەر پشتێ دژین، د گەل ڤێ هەمی گرانییا خۆ، د سالەکێ دا وێ (مەسافێ) دبڕت یا مرۆڤەکێ وەکی مە، د گەل سڤکییا خۆ، د (٢٥) هزار سالان دا دبڕت..

ئەرێ ئەگەر تە ئەڤ گۆتنە گۆتبا مرۆڤێ ژ هەمییان عەقلدارتر بەری چەند سەد سالەکان ئەو چ بەرسڤێ دا دەتە تە؟

نموونەیەکا دی یا پتر بەرچاڤ: ئەڤ سەعەتێن ئەم دکەینە دەستێن خۆ، سێ میل تێدا هەنە، ئەو (مەسافا) ئەو دبڕن هندی ئێکە، بەلێ حەتا میلێ سەعەتان جارەکێ ڤێ مەسافێ دبڕت، میلێ دەقیقان دوازدە جاران وێ مەسافێ دبڕت، و حەتا میلێ دەقیقان جارەکێ ڤێ مەسافێ دبڕت، میلێ ثانییان شێست جاران وێ مەسافێ دبڕت..

مەعنا: د شەڤ و ڕۆژەکان دا، میلێ سەعەتان ب تنێ (٢) جاران ڤێ مەسافێ دبڕت، و یێ دەقیقان (٢٤) جاران وێ مەسافێ دبڕت، و یێ

ثانییان (١٤٤٠) جاران عەینی مەسافێ دبڕت، و دا ڤێ مەسافێ د خەیالا خۆ دا مەزن بکەین، هزر بکەن سەعەتەکا مەزن یا هەی، و مرۆڤەک یێ ل سەر میلێ سەعەتان یێ ڕوینشتیە، و ئێکێ دی ل سەر میلێ ثانیان، و هەردووان پێکڤە دا ڕێ، د بیست و چار سەعەتان دا یێ ئێکێ ب تنێ دو جاران دێ زڤڕت، و یێ دووێ (١٤٤٠) جاران دێ زڤڕت، و مەسافە عەینی مەسافێیە.

هەر کەسەکێ تو ڤێ نموونەیێ بێژییێ، دێ بێژتە تە: ئەڤە تشتەکێ بەرعەقلە و نە یێ موستەحیلە.. باشە، ئەو مەسافا ئێک ژ مە ب پییان د هەیڤەکێ دا دبڕت، ئێکێ دی یێ ل تورمبێلێ سویار ب ڕۆژەکێ دبڕت، و ئەوێ ل طەیارێ سویار ب سەعەتەکێ دبڕت، ئەڤە ژی تشتەکێ بەرعەقلە، چونکی (لەز) چەند یا زێدەتر بت (مەسافە) دێ یا کورتتر بت.. قاعیدەیێ علمێ مە ڤێ چەندێ (ئیسبات) دکەت، باشە هێزا خودێ یا بێ توخویب دەمێ لەزێ ب ڕێڤە دبەت هەوە دڤێت (مەسافە) چەند یا کورت بت؟ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پشتی ژ سەفەرا خۆ یا عنتیکە زڤڕی، دبێژت: من دیت هێشتا جهێ من یێ گەرمە و سار نەبوویە!!

و دەمێ وی بەحسێ ڤێ سەرهاتیا عنتیکە بۆ خەلکی کری، ئێک ژ وان زوی چوو نک ئەبوو بەکری و گۆتێ: هەڤالێ تە یێ دبێژت کو ئەو شڤێدی یێ چوویە قودسێ و یێ زڤڕیەڤە ژی.. ئەبوو بەکری گۆتێ: ئەگەر وی وە گۆت بت، ئەو ڕاست دبێژت! بەلێ، ئەبوو بەکر باوەر دکەت کو وەحی بۆ موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- د گاڤێ دا ژ عەسمانی دئێتە خوار، ڤێجا بۆچی ئەو باوەر ناکەت کو د شەڤەکێ دا ئەو بۆ قودسێ دێ ئێتە برن، و جارەکا دی دێ زڤڕتەڤە؟

## ئیسرائێ ژ کیڤە دەست پێ کربوو؟

ل دۆر دەستنیشانکرنا جهێ ئیسرائێ ژێ دەست پێ کری، چەند گۆتنەک هەنە، ژ وان:

- بوخاری حەدیسەکێ ژ ئەنەسێ کورێ مالکی ڤەدگوهێزت، و تێدا هاتییە کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د مزگەفتێ ڤە بوو، ل نێزیکی بەرێ ڕەش..

- د ریوایەکا دی دا ژ (ئەبوو ذەرری) هاتییە ڤەگوهاستن، تێدا هاتییە کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مالا خۆ بوو ل مەکەهێ دەمێ جبرێل هاتی و ئەو برییە ئیسرائێ.

- و د ریوایەتەکێ دا ل نک واقدی هاتییە کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل گەلییێ (ئەبوو طالبی) بوو، ل وی جهی یێ کافران ئەو و مالباتا وی لێ کۆمکرین و (حصار) دانایە سەر.

- و طەبەرانی ل جهەکی ژ دۆتماما پێغەمبەری (أم هانئ)ێ ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- شەڤا ئیسرائێ ل مالا مە بوو.

و کۆمکرن د ناڤبەرا ڤان هەمی ریوایەتان دا -وەکی زانایێ ناڤدار ئبن حەجەر دبێژت- ب ڤی ڕەنگییە: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مالا (أم هانئ)ێ بوو، و مالا وێ ل گەلییێ (ئەبوو طالبی) بوو، و دەمێ پێغەمبەر دبێژت: (مالا من) مەخسەد پێ ئەو مالە یا ئەز لێ.. ل وێرێ جبریل هاتێ، بانێ خانی شەقکر، و ئەو ژ مەزلێ هلاند و برە کەعبێ، و هێشتا خەوێ چاڤێن وی بەرنەدای وی ئەو ڕاکرە ڤە، و ل (بوراقێ) سویار کر، و بەر ب قودسێ ڤە بر. و بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل بوراقێ بێتە سویارکرن، موعجیزەیەکا دی یا مەزن ب سەرێ وی هات، ئەو ژی

موعجیزەیا ڤەكرنا سنگێ وی و پاقژكرنا دلێ وی بوو.. ڤێ چەندێ ئیمامێ بوخاری ژ (مالكێ كوڕێ صەعصەعەی) ڤەدگوهێزت، دبێژت: جبریلی تستەكا زێڕی یا تژی باوەری ئینا و سنگێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- كەركر و دلێ وی ئینادەر، شویشت و تژی باوەری كر، پاشی زڤڕاندە جهێ وی.. و د ریوایەتەكێ دا ل نك موسلمی دبێژت: دلێ من ب ئاڤا زەمزەمێ شویشت..

و هەر چاوا بت، شویشتنا دلی نیشانا پاقژی و زێدەكرنا باوەرییێیە.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: پاشی ئەز ل دەوارەكا سپی هاتمە سویاركرن، و پاشی جبریلی ئەز برم.. و ئەڤ دەوارە ئەو بوو یا كو دبێژنێ: (بوراق) و دبێژنێ (بوراق) ژ بەر ئێك ژ دو مەعنایان: بوراق یەعنی: خودان بەریق، ژ بەر كو ئەو یا سپی بوو ئەوێ گەش دكر و دلەمعی. یان ژی ژ بەر لەزا وێ یا زێدە ئەو وەكی بوریسییێ (بەرقێ) بوو.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێ وی جبریل ژ مەكەهێ دەركفتن، و ئەو دەوارا خودێ بۆ پێغەمبەرێ خۆ چێكری (بوراقێ) خۆشتڤییێ وی گەهاندە (بەیتولمەقدسێ) و وی ل وێرێ دو ركاعەتێن نڤێژێ ل بەراهییا پێغەمبەران كرن.

و نڤێژكرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل قودسێ تشتەكێ مەشهوور بوو ل نك صەحابییان، لەو عومەرێ كوڕێ خەططابی دەمێ چوویە شامێ؛ دا كلیلێن قودسێ وەرگرت، ئەو چوو پێشییا مزگەفتێ و گۆت: ئەز دێ نڤێژێ ل وی جهی كەم یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نڤێژ لێ كری.

و هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مزگەفتا (ئەقصایێ) جبریلی ئامانەكێ مەیێ و ئێكێ شیری بۆ وی ئینا، و ژێ خواست ئەو ئێك ژ هەردووان بۆ خۆ هلبژێرت، وی ئامانێ شیری هلبژارت، هنگی جبریلی

گۆتىٚ: بەرىٚ تە بۆ فطرەتىٚ هاتەدان، و ئەگەر تە مەى هلبژارتبا ئوممەتا تە دا دسەردا چت. پشتى هنگى جبريلى دەستىٚ پێغەمبەى -سلاڤ لىٚ بن- گرت و بەر ب عەسمانى ڤە بلندكر..

## دەستپێكرنا معراجێ:

د حەديسا بوخارى دا ئەوا ژ مالكىٚ كورىٚ صەعصەعەى ڤەدگوهێزت، هاتييە: پێغەمبەر -سلاڤ لىٚ بن- دبێژت: ئەز ل بوراقىٚ هاتمە سوياركرن، و جبريلى ئەز بەر ب عەسمانىٚ دنيايىٚ ڤە بلندكرم، (و د هندەك ريوايەتان دا هاتييە كو معراج ب بوراقىٚ نەبوو، وەكى بەيهەقى ژ ئەبوو سەعيدى ڤەدگوهێزت) دبێژت: جبريلى ئەز بەر ب عەسمانى ڤە برم، و دەمىٚ ئەم گەهشتين جبريلى خواست دەرگەهـ بێتە ڤەكرن، گۆتن: تو كى يى؟ وى گۆت: ئەز جبريلم، گۆتن: كى د گەل تەيە؟ وى گۆت: موحەممەد، گۆتن: هاتييە هنارتن ب دويڤ وى را؟ گۆت: بەلىٚ.. وى گۆت: ب خێر بێت، چێترين مێڤانە.. پاشى دەرگەهـ ڤەكر.

ژ ڤىٚ حەديسىٚ دئێتە زانين كو عەسمانى (سومك) يەعنى: ستويراتى بوو هەيە، و ئەو خودان دەرگەهە، و ملياكەت زێرەڤانييىٚ لىٚ دكەن.

## ل عەسمانێ ئێكێ:

پێغەمبەر -سلاڤ لىٚ بن- دبێژت: دەمىٚ ئەز ب ژۆركەفتيم من زەلامەك ديت رەشاتييەك ل رەخىٚ وى يىٚ راستىٚ هەبوو، و رەشاتييەك ل رەخىٚ وى يىٚ چەپىٚ، دەمىٚ ئەو ل رەخىٚ خۆ يىٚ راستىٚ دزڤرى وى دكرە كەنى، و دەمىٚ ئەو ل رەخىٚ خۆ يىٚ چەپىٚ دزڤرى وى دكرە گرى. گاڤا وى ئەز ديتيم، وى گۆت: ب خێر بێت پێغەمبەرىٚ چاك و كورىٚ چاك.. من پسيارا جبريلى كر: ئەڤە كييە؟ وى گۆت: ئەڤە **ئادەمە**، ئەو رەشاتييا ل رەخىٚ وى يىٚ راستىٚ و يىٚ چەپىٚ رحێن عەيالىٚ وينە، ئەوىٚ ل رەخىٚ

راستێ خەلکێ بەحەشتینە، و ئەو ڕەشاتییا ل ڕەخێ وی یێ چەپێ خلکێ جەهنەمێنە، ڤێجا گاڤا بەرێ وی ب لایێ ڕاستێ دکەڤت، ئەو دکەتە کەنی، و گاڤا بەرێ وی ب لایێ چەپێ دکەڤت، ئەو دکەتە گری.

و دبت کەسەک ل ڤێرێ پسیار بکەت وبێژت: چاوا پێغەمبەرێ مە هەمی پێغەمبەرێن دی -سلاڤ لێ بن- ل عەسمانان ساخ دیتن و ئەو ب خۆ ل عەردی بێن مرین، و هاتینە ڤەشارتن؟

بۆ بەرسڤ دێ بێژین: خودێ رحێن وان ل عەسمانان ئامادە کرن، و ب ڕەنگێ لەشێن وان ئینانە بەرچاڤ.. یەعنی: لەشێن وان هەر د قەبرێن وان دا بوون، و ئەو لەشێن ل عەسمانی هاتینە دیتن خودێ -خودانێ شیانێن بێ توخویب- بۆ رحێن وان هنگی ئامادە کرن، دا پێشوازییا پێغەمبەرێ مە -سلاڤ لێ بن- بکەن، وەک (تەشریف) و قەدرگرتن بۆ پێغەمبەری.

و د حەدیسا ئەنەسی دا هاتییە: ((وبعث له آدم فمن دونه من الأنبياء)) یەعنی: ئادەم و ئەو پێغەمبەرێن د بن وی دا بۆ وی هاتنە زێندیکرن.

### ل عەسمانێ دووێ:

پاشی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالێ خۆ جبریلی چوو عەسمانێ دووێ، و ب وی ڕەنگێ دەرگەهێ عەسمانێ دنیایێ بۆ وان ڤەبووی، دەرگەهێ عەسمانێ دووێ ژی بۆ وان ڤەبوو، و ئەو چوونە ژۆر، ل وێرێ وان عیسا و یەحیا دیتن، و ئەو هەردو کوڕ خالەتێن ئێکن، پێغەمبەری سلاڤ دا وان، وان گۆت: ب خێر بێت برایێ چاک و پێغەمبەرێ چاک.

و د حەدیسەکێ دا یا ئەحمەد و موسلم و ئبن حبان ڤەدگوهێزن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- سالۆخەتێ عیسای ئاشکەرا دکەت، و دبێژت:

ئەو زەلامەكێ سۆر و سپی بوو، دێ بێژی وێ گاڤێ ژ سەرشۆیێ دەركەفتبوو، یێ زلام باش بوو، سەرێ وی یێ خەلەک بوو، و چاڤێن وی دگر بوون، و ناڤملێن وی دپان بوون.

## ل عەسمانێ سێیێ:

پاشی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆ عەسمانێ سێیێ هاتە بلندكرن، جبریلی داخوزا ڤەكرنا دەرگەهی كر، گۆتنە وی: تو كی یی؟ وی گۆت: ئەز جبریلم، گۆتنێ كی د گەل تەیە؟ وی گۆت: موحەممەد، گۆتنێ: جابا وی هاتییە هنارتن؟ وی گۆت: بەلێ، گۆتن: ب خێر بێت، چێترین مێڤانە بۆ مە دئێت، پاشی دەرگەه بۆ هاتە ڤەكرن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: دەمێ ئەز ب ژۆر كەفتیم، من یووسف پێغەمبەر دیت، جبریلی گۆت: ئەڤە یووسفە سلاڤێ بدێ، من سلاڤ دایێ، وی بەرسڤا من دا، و گۆت: ب خێر بێی برایێ چاك و پێغەمبەرێ چاك.. موسلم ژ ئەنەسی ڤەدگوهێزت، دبێژت: من دیت هە وەكی نیڤەكا جوانییێ خودێ دابوو وی.

## ل عەسمانێ چارێ:

پاشی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێ خۆ جبریل چوونە عەسمانێ چارێ، و پشتی دەرگەه بۆ وان هاتییە ڤەكرن، و ئەو ب ژۆر كەفتین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئدریس پێغەمبەر ل وێرێ دیت، گۆت: جبریلی گۆتە من: ئەڤە ئدریسە سلاڤێ بدێ، من سلاڤ دایێ، وی بەرسڤا من دا و گۆت: ب خێر بێی برایێ چاك، و پێغەمبەرێ چاك.

## ل عەسمانێ پێنجێ:

ل عەسمانێ پێنجێ، و هەر ب رەنگێ بۆری، وی هاروون پێغەمبەر دیت.

### ل عەسمانێ شەشێ:

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مووسا پێغەمبەر دیت، بوخاری ریوایەت دکەت، دبێژت: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: جبریلی گۆت: ئەڤە مووسایە سلاڤێ بدێ، من سلاڤ داییێ، وی بەرسڤا من دا، پاشی گۆت: ب خێر بێی برایێ چاک و پێغەمبەرێ چاک، پشتی ئەم ژێ بۆرین، وی کرە گری، هندەکان گۆتێ: بۆچی تو دکەیە گری؟ وی گۆت: ئەز پێ دگریم چونکی پشتی من گەنجەک پێ هاتییە هنارتن، ئەوێن ژ ئوممەتا وی دچنە بەحەشتێ پترن ژ وان پێن ژ ئوممەتا من دچنە بەحەشتێ.

و دڤێت نەئێتە هزرکرن کو مووسای حەسویدی ب پێغەمبەرێ مە بر، چونکی حەسویدی بۆ مرۆڤەکێ نە پێغەمبەر بت چێ نابت، ڤێجا چاوا ئەگەر ئەو پێغەمبەر بت، بەلێ خەما وی ئەو بوو مللەتێ وی ب دورستی گوهدارییا وی نەکر لەو بارا پتر ژ وان بوونە ژ جەهنەمییان، و دەمێ وی مللەتێ خۆ هەڤبەری مللەتێ پێغەمبەرێ نوی دکر، دلێ وی دما ب مللەتێ وی ڤە و کرە گری، کا چاوا ئادەمی بۆ وی عەیالێ خۆ دکرە گری ئەوێن دچنە جەهنەمێ، وەکی بەری نوکە د گەل مە بۆری.

### ل عەسمانێ حەفتێ:

پاشی ئەو بەر ب عەسمانێ حەفتێ ڤە چوون، و ل وێرێ وان ئیبراهیم دیت، جبریلی گۆتێ: ئەڤە بابێ تە ئیبراهیمە، سلاڤێ بدێ، وی گۆت: من سلاڤ داییێ، وی بەرسڤا من دا و گۆت: ب خێر بێی کوڕێ چاک و پێغەمبەرێ چاک..

و د سالۆخەتێ ئیبراهیمی دا، موسلم حەدیسەکێ ڤەدگوهێزت، تێدا هاتییە: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ئەز ژ هەمی عەیالێ وی پتر پێ ب وی ڤە چوویم. و ترمذی ژ ئبن مەسعوودی ڤەدگوهێزت، دبێژت: ل شەڤا

معراجێ من ئیبراهیم دیت، وی گۆت: ئەی موحەممەد، سلاڤێن من بگەهینە ئوممەتا خۆ، و بێژێ: ئاخا بەحەشتێ یا خۆشە، و ئاڤا وێ یا شرینە، و تۆڤچینێ وێ ئەڤ گۆتنەیە: (سبحان الله والحمد لله و لا إله إلا الله و الله أكبر).

ل (سدرة المنتهى):

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەسمانێ حەفتێ ژی هێلا، و بەر ب (سدرة المنتهى)یێ ڤە چوو.. و ئەو جهەکە -وەکی ئیمامێ نەوەوی دبێژت- علمێ ملیاکەتان لێ ڕادوەستت، و کەس ژ پێغەمبەری پێڤەتر -سلاڤ لێ بن- ژێ نەبۆرییە.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: پاشی ئەز هاتمە بلندکرن، بۆ (سدرة المنتهى)، من دیت فێقییێ وێ هندی جەرکێن بازێرێ هەجەرێنە، و بەلگێن وێ هندی گوهێن فیلانە، سویارەک ل بن سیبەرا وێ سەدسالان دێ چت حەتا خلاس بکەت، جوانییا وی جهی ژ خودێ پێڤەر کەس نەشێت سالۆخ دەت، ل وی جهی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هند هاتە بلندکرن حەتا وی گوهـ ل دەنگێ قەلەمێن قودرەتێ بووی، هەر وەسا ل وی جهی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جبریل ل سەر ڕەنگێ وی یێ دورست دیت، دبێژت: شەش سەد پەڕ پێڤەبوون، و جلکەکێ قودرەتی ل بەر بوو و وی ناڤبەرا عەرد و عەسمانان تژی کربوو. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: من چار ڕوبار دیتن، دو دئاشکەرا بوون، و دو دڤەشارتی، من گۆتە جبریلی: ئەڤە چییە؟ وی گۆت: ئەو هەردوییێن ڤەشارتی دو ڕوبارێن بەحەشتێنە، و یێن ئاشکەرا نیل و فوراتن. و مەخسەد ب نیل و فوراتی ئەوە ئەصلێ وان ژ وێرێیە، نەکو نوکە ئەو ژ وێرێ دزێن، وەکی تو ئیشارەتێ بدەیتە ئامانەکێ تژی ئاڤ و بێژی: ئەڤە ژ کانییێیە.

## ل بەحەشتێ:

ئیمام ئەحمەد حەدیسەکێ ڤەدگوهێزت، تێدا هاتییە کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆ بەحەشتێ هاتەبرن، وی هندەک گومبەتێن لوئلوئی تێدا دیتن، ئاخا وێ مسک بوو، دەنگەک ژ رەخی هاتێ، وی پسیار کر: ئەڤە چییە؟ گۆتنێ: ئەڤە بیلالە..

و بوخاری ژ ئەنەسی ڤەدگوهێزت کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- رویبارەک ل بەحەشتێ دیت، ل هەردو رەخان، ل بەر لێڤا ئاڤێ خیڤەتێن لوئلوئی دڤەدای بوون، ئاخا وێ مسک بوو، وی پسیار کر: ئەڤە چییە؟ جبریلی گۆتێ: ئەڤە کەوثەرە ئەوا خودێ دایە تە.

و د حەدیسەکا دی دا یا ئیمام ئەحمەد ڤەدگوهێزت هاتییە کو بێهنەکا خۆش هاتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی پسیار کر: ئەڤە چ بێهنە؟ جبریلی گۆت: ئەڤە بێهنا خداما کچا فیرعەونییە، جارەکێ شە ژ دەستی کەت، وێ گۆت: ب ناڤێ خودێ.. کچا فیرعەونی گۆتێ: تە بەحسێ بابێ منە؟ وێ گۆت: من بەحسێ خودێیە، خودایێ من و یێ تە و یێ بابێ تە. وێ گۆت: ما ژبلی بابێ من تە خودایەکێ دی هەیە؟ وێ گۆت: بەلێ (ئەللاهـ) خودایێ من و یێ بابێ تەیە! گاڤا فیرعەونی سوحبەتا وێ زانی، هنارتە ب دویڤ را، و گۆتێ: ژبلی من تە خودایەکێ دی هەیە؟ وێ گۆت: بەلێ، ئەللاهـ خودایێ من و خودایێ تەیە.. هنگی فیرعەونی بریار دا ئاگرەک بێتە خۆشکرن، و عەیالێن وێ ئێک ئێکە ل بەر چاڤان هاڤێتنە د وی ئاگری دا، پاشی دۆرا وێ هات، وێ گۆتە فیرعەونی: من داخوازەکا ژ تە هەی، گۆتێ: چییە؟ وێ گۆت: ئەز حەز دکەم تو هەستیکێن من و یێن عەیالێ من کۆم کەی، و ل جهەکی ڤەشێری! وی گۆت: باشە.. و گاڤا دۆرا وێ هاتی، و ئەو هاتین دا وێ ژی بهاڤێنە د ئاگری دا، وێ بچویکەکێ

ب شیر هەبوو، هەر وەکی ئەو ژ بەر بچویکێ خۆ یێ ساڤا پیچەکێ دودل بوو، ئینا خودێ بچویکێ وێ ب ئەزمان ئێخست و وی گۆتە دەیکا خۆ: دادێ! خۆ بهاڤێژە ناڤ ئاگری، عەزابا دنیایێ ژ یا ئاخرەتێ ب ساناهیترە.

د حەدیسەکا دی یا دورست دا هاتییە: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: د بەحەشتێ دا دەنگێ خواندنەکێ هاتە من، من پسیار کر: ئەڤە کییە؟ گۆتن: ئەڤە حارثێ کورێ نوعمانییە، ئەڤەیە باشی، ئەڤەیە باشی.. و دبێژن: ئەو باشترین مرۆڤ بوو بۆ دەیکا خۆ، و گەلەک قەدرێ وێ دگرت.

و بوخاری وموسلم ژ جابری ڤەدگوهێزن، کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەسرەکا سپی ل بەحەشتێ دیت، وی پسیار کر: ئەڤ قەسرە بۆ کێیە؟ جبریلی گۆتێ: ئەو بۆ عومەرێ کورێ خەططابییە.

ل جەهنەمێ:

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: من سەرپەرشتکارێ جەهنەمێ دیت، ئەو ملیاکەتە دبێژنێ: (مالک، خازن جهنم).

و ئیمام ئەحمەد حەدیسەکێ ریوایەت دکەت کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل جەهنەمێ هندەک مرۆڤ دیتن، گۆشتێ کەلەخێن مرار دخوار، وی پسیار کر: ئەی جبریل، ئەڤە کینە؟ وی گۆت: ئەڤە ئەون یێن گۆشتێ مرۆڤان دخون، یەعنی: غەیبەتا مرۆڤان دکەن.

هەر وەسا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د بەر کۆمەکا مرۆڤان ڕا بۆری، ئەو دهاتنە عەزابدان: هندەک نینۆکێن سفری ب وان ڤە هەبوون، وان سەر و چاڤێن خۆ پێ دسەلخاندن و چەرم ژێ ڤەدکر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پسیار کر: ئەڤە کینە؟ جبریلی گۆت: ئەڤە ئەون یێن گۆشتێ خەلکی دخون، یەعنی: غەیبەتێ دکەن، و بەحسێ نامویسا وان دکەن. و وی هندەک زەلامێن دی دیتن، لێڤێن وان ب مەقەسێن ئاگری دهاتنە شەقکرن، گۆت: من پسیار

کر: ئەڤە کینە؟ جبریلی گۆت: ئەڤە خوتبەخوینێن ئوممەتا تەنە، ئەوێن باشییێ نیشا خەلکی ددەن، و خۆ ژبیر دکەن.

## حەدیسەك و خەونەك:

ب هلکەفتنا چوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ جەهنەمێ و بەحسکرنا وی ژ هندک رەنگێن عەزابا جەهنەمییان، مە دڤێت ل ڤێرێ حەدیسەکێ بینین یا بوخاری و موسلم ژ (سەمورەیێ کورێ جوندوبی) ڤەدگوهێزن، تێدا بەحسێ خەونەکێ دئێتەکرن، یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیتی، و خەونێن پێغەمبەران وەحییە، و بەلکی هندەک کەس هزر بکەن، ئەڤ سەرهاتییە ل شەڤا معراجێ چێبووبوو، و ئەو ب خۆ وەسا نینە، بەلکی ئەو خەونەک بوو بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتییە نیشادان..

سەمورە دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: شڤێدی من ددیت هەر وەکی دو زەلامان ئەز بەر ب عەردێ پیرۆز ڤە دبرم، من دیت زەلامەک یێ روینشتی بوو، و ئێکێ دی ل هنداڤ سەرێ وی بوو، کەللابەکێ ئاسنی د دەستان دا بوو، دکرە د گەلالیشکا وی را و دکێشا و لاما وی شەق دکر، و حەتا پاتکێ دبر، پاشی دئینا دەر و رەخێ دی ژی وە لێ دکر، حەتا ئەڤ رخە شەق دکر، رەخێ دی خۆ لێکددا.. من گۆت: ئەڤە چییە؟ وان هەردو زەلامان گۆتە من: ببۆرە.

ئەز د گەل وان دچووم، من دیت زەلامەک یێ درێژکرییە ل سەر پشتێ، و ئێکێ دی ل هنداڤ سەرێ وی یێ راوەستای بوو، بەرەک یان کەڤرەکێ مەزن د دەستان دا بوو ل سەرێ وی ددا، بەرێ وی دکەت، حەتا ئەو دچوو بەری سەرێ وی مرۆڤێ رازای ساخ دبووڤە، جارەکا دی وی ئەو بەر لێ دداڤە.. و کارێ وی هەر ئەڤە بوو، من پسیار کر: ئەڤە چییە؟ وان هەردو زەلامان گۆتە من: ببۆرە. و ئەز د گەل وان دچووم..

من دیت ئاڤاهییەک وەکی تەنوپرێ هاتبوو ئاڤاکرن، سەرێ وی یێ تەنگ بوو، و بنێ وی یێ فرەهـ بوو، د بن دا ئاگرەکێ هلکری هەبوو، و تژی وی ئاڤاهی ژن و مێرێن رویس بوون، گاڤا ئاگر دهاتە خۆشکرن ئەو بلند دبوون، حەتا نێزیک بوو دەرکەڤن، و دەمێ ئاگر کێم دبوو جارەکا دی ئەو دکەفتنە بنی.. من گۆت: ئەڤە چییە؟ وان هەردو زەلامان گۆتە من: ببۆرە.

ئەز چووم، من رویبارەکێ ژ خوینێ ددیت زەلامەک تێدا بوو، و ئێکێ دی ل هنداڤ وی ل سەر لێڤا ئاڤێ یێ راوەستای بوو، تژی د دەستی دا بەر هەبوون، گاڤا وی زەلامێ د ئاڤێ دا خۆ نێزیک دکر دا ژ رویباری دەرکەڤت، وی بەر ددانانێ، حەتا دزڤڕاندنە جهێ وی یێ بەرێ.. من گۆت: ئەڤە چییە؟ هەردووان گۆتە من: ببۆرە.

ئەز دچووم، من مێرگەگا کەسک ددیت، دارەکا مەزن د ناڤ دا هەبوو، و پیرەمێرک ل بن قورمێ وێ یێ روینشتی بوو، تژی دۆر و رەخێن وی زارۆک بوون، ژ وی وێڤەتر زلامەک یێ روینشتی بوو، ئاگرەک ل بەر دەستان هەبوو، وی هەر ئاگر خۆش دکر..

هەردووان ئەز ب سەر دارەکێ دئێخستم، و ئەز دبرمە د خانییەکی ڤە، خانی ژ وی خانی من تازەتر نەدیتینە، من دیت ئەو یێ تژی پیرەمێر و گەنج و ژن و زارۆک بوو، وان ئەز دەرێخسم و بلندکرم، و ئەز کرمە د خانییەکێ دی یێ خۆشتر ڤە، ئەو یێ تژی پیر و گەنج بوو.

من گۆتە هەردووان: هەوە ئەڤ شەڤە ئەز باش گێڕاندم، بۆ من بێژن ئەڤە چ بوو من دیتی؟ وان گۆت: بەلێ! زەلامێ ئێکێ یێ تە دیتی مرۆڤێ درەوینە، درەوەکێ دێ کەت درەوا وی د ناڤ خەلکی دا دێ بەلاڤ بت، ڤێجا ئەڤە حالێ وییە حەتا رۆژا قیامەتێ، پاشی یا خودێ بڤێت دێ د گەل وی کەت.

ئەو مرۆڤێ ل سەر پشتێ درێژکری، مرۆڤەکە خودێ قورئان یا نیشا دای، نە ئەو ب شەڤ وێ دخوینت، و نە ب ڕۆژ عەمەلێ پێ دکەت، ڤێجا ئەوا تە دیتی د گەل وی دئێتەکرن حەتا ڕۆژا قیامەتێ.

ئەوێن د تەنویرێ دا ئەون یێن زنایێ دکەن.

ئەوێ د ڕویبارێ دا تە دیتی ئەوە یێ ڕیبایێ دخوت.

و ئەو پیرەمێرێ ل بن قورمێ دارێ ئیبراهیمە -سلاڤ لێ بن- و ئەو زارۆکێن ل دۆر وی کۆمبووین عەیالێ خەلکینە.

ئەو زەلامێ ئاگر خۆش دکر، ئەو زێرەڤانێ ئاگرییە، و ئەو ئاگر جەهنەمە.

ئەو خانییێ ئێکێ یێ تو چوویێ خانییێ عامییێن موسلمانانە، و خانییێ دی یێ شەهیدانە، و ئەز جبریلم، و ئەڤە میکائیلە.. پاشی وان گۆتە من: سەرێ خۆ ڕاکە، من سەرێ خۆ ڕاکر وەکی عەورەکی من دیت، وان گۆتە من: و ئەڤە مالا تەیە. من گۆتە وان: بهێلن دا ئەز بچمە مالا خۆ، وان گۆت: هێشتا عەمرێ تە یێ مای، ئەگەر ئەو ب دویماهی هات، تو دێ چییە مالا خۆ.

### فەرکرنا نڤێژان:

ژ تشتێن مەزن یێن ل شەڤا معراجێ چێبووین فەرکرنا هەر پێنج نڤێژان بوو.. د حەدیسەکێ دا یا بوخاری و موسلم ڤەدگوهێزن، هاتییە کو خودایێ مەزن فەرمان ل پێغەمبەرێ خۆ کر کو ل شەڤ و ڕۆژەکان وی پێنجی نڤێژ ل سەر ئوممەتا وی فەرکرن، پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زڤڕی د بەر مووسای ڕا بۆری، مووسای پسیار ژێ کر: ئەرێ چ ئەمر ل تە هاتەکرن؟ وی گۆت: ڕۆژێ پێنجی نڤێژ. مووسای گۆتێ: ئوممەتا تە نەشێت ڕۆژێ پێنجی نڤێژان بکەن، ئەز ب خودێ کەمە من بەری تە خەلک یێن

جەرپاندین، و من نەخۆشییێن مەزن ژ ئسرائیلییان دیتینە، بزڤرە پسیارێ ژ خودایێ خۆ بکە دا ئەو بارێ ئوممەتا تە سڤک بکەت، ب ڤی رەنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ناڤبەرا خودایێ خۆ و مووسایی دا هات و چوو حەتا پێنج نڤێژێن فەرز ماین، مووسای گۆتێ: بزڤرە داخوازێ ژێ بکە ئەو هێشتا کێم بکەت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: من هند داخواز ژ خودایێ خۆ کرن ئێدی ئەز شەرم دکەم، هەما هندە بەسە، ئەز دێ رازی بم و خۆ تەسلیم کەم.

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆری، خودایێ وی گۆتێ: ئەی موحەممەد، د شەڤ و رۆژکان دا پێنج نڤێژن، و هەر نڤێژەک ب دەهانە، ئەڤە پێنجی، هەچییێ دلێ خۆ ببەتە خێرەکێ و نەکەت خێرەک دێ بۆ وی ئێتە نڤیسین، و ئەگەر وی ئەو کر دەهـ خێر دێ بۆ ئێنە نڤیسین، و هەچییێ دلێ خۆ ببەتە گونەهەکێ و نەکەت چو گونەهـ بۆ وی نائێنە نڤیسین، و ئەگەر وی ئەو کر گونەهەک دێ بۆ وی ئێتە نڤیسین.

## پشتی معراجێ:

ئەڤە هندەک ژ سەرهاتییا معراجێ بوو، وەکی د قورئان و حەدیسێن دورست دا هاتی، و پشتی ئەو ب دویماهی هاتی، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- جارەکا دی زڤری (بەیتولمەقدسێ) و ل وێرێ جارەکا دی خودایێ مەزن پێغەمبەر هەمی بۆ وی کۆمکرن، و دوبارە وی نڤێژ ل بەراهییا وان کر.، و دیسا ئەو ل بوراقێ سویار بوو و بەر ب مەکەهێ ڤە زڤری. و پشتی ئەو گەهشتییە مالا خۆ، و لێ بوویە سپێدە، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مال دەرنەکەفت، و خۆ ڤەدەر کر، ژ بەر کو وی دزانی ئەگەر ئەو ڤێ سەرهاتییا خۆ بۆ مللەتێ خۆ ڤەگێرت، ئەو ژ وی باوەر ناکەن.

ئیمام ئەحمەد حەدیسەکێ ژ ئبن عەبباسی ڤەدگوهێزت، دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مایە ب تنێ د مال دا، دوژمنێ خودێ ئەبوو جەهل د بەر مالا وی ڕا بۆری، هاتە نک و ب ترانەڤە گۆتێ: تشتەکێ نوی بۆ تە هاتییە؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بەلێ، وی گۆت: چییە؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: شەڤێدی ئەزێ هاتیمەبرن.. گۆت: بۆ کیڤە؟ وی گۆتێ: بۆ بەیتولمەقدسێ، ئەبوو جەهلی گۆت: و سپێدێ تو زڤرییەڤە؟ وی گۆت: بەلێ.

ئەبوو جەهلی نەڤیا بێژتێ: درەوە، ئەو ترسییا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل گۆتنا خۆ لێڤە ببت ئەگەر وی ئەڤ سوحبەتە د ناڤ خەلکی دا بەلاڤکر، گۆتێ: باشە ئەگەر من مللەتێ تە کۆمکر، ئەڤا تە بۆ من گۆتی تو دێ بۆ وان ژی بێژی؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بەلێ..

ئەبوو جەهل ڕابوو دەرکەفت، و خەلک لێ کۆمکرن، و گاڤا خەلک کۆمبووین، ئەبوو جەهلی گۆت: ئەوا تە بۆ من گۆتی بۆ مللەتێ خۆ ژی بێژە. گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سوحبەتا خۆ بۆ وان ڤەگێڕای، خەلک عەجێبگرتی مان، هندەکان ژ حێبەتییان دا دەستێن خۆ لێکدان، و هندەکان مست ل سەرێ خۆ دان، و کەسێ باوەر نەکر.

## نیشانێن ڕاستگۆییا پێغەمبەرﷺ:

هندەک ژ وان مرۆڤان چووبوونە قودسێ و وان دزانی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چو جاران نەچوویە وێرێ، لەو وان گۆتێ: باشە تو دشێی سالۆخەتێن مزگەفتێ بۆ مە بێژی؟ و چونکی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب شەڤ چووبوو قودسێ و وی هزر نەدکر پسیارەکا ب ڤی ڕەنگێ دێ ژ وی ئێتەکرن، لەو ئەڤ پسیارە ل نک وی یا غەریب بوو. د حەدیسەکێ دا یا موسلم ڤەدگوهێزت، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: چو جاران وەکی وێ

جارێ ئەز تەنگاڤ نەبوویمە.. بەلێ خودایێ عەرد و عەسمانان، ئەوێ شیای پێغەمبەرێ خۆ د شەڤەکێ دا ببەتە قودسێ و ژ وێرێ ڕاکەتە عەسمانان، و بزڤڕینتەڤە، ل بەر وی ئاسێ نابت مزگەفتێ بینتە بەرچاڤان دا ئەو سالۆخەتێن وێ ب دورستی بۆ کافرێن مللەتێ خۆ بێژت.. مزگەفت هاتە بەر چاڤان و وی ب بەرفرەهی سالۆخەتێن مزگەفتێ بۆ وان گۆتن، و چو ب وان نەما وان گۆت: ب خودێ وەصفکرنا وی یا دورستە.

نیشانەکا دی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دانا بەر چاڤێن مللەتێ خۆ ڕاستگۆییا وی ئاشکەرا کر.. ئیمامێ بەیهەقی ڤەدگوهێزت، دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ قودسێ زڤڕییە مەکەهێ، ئەو د بەر کاروانەکێ قورەیشییان ڕا بۆری، پشتی ئەو زڤڕی و وی چیرۆکا خۆ بۆ خەلکێ مەکەهێ ڤەگێڕای، و وان باوەر نەکری، وی گۆتە وان: نیشانا من ئەڤەیە ئەز ل فلان جهی یێ د بەر کاروانەکێ هەوە ڕا بۆریم، وان حێشترەکا خۆ بەرزە کربوو، بەلێ فلان کەسی ئەو دیت و ل وان زڤڕاند، هندە ڕۆژێن دی ئەو دێ گەهنە مەکەهێ، و حێشترەکا ڕەنگ ئەسمەر یا ل بەرا کاروانی، جلەکێ ژ مووی چێکری د گەل دو هاڤڕانان یێن ل سەر پشتێ.. و دەمێ ئەو ڕۆژ هاتی یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی، حەتا نیڤرۆ خەلک ل سەرێ ڕێکێ مانە ل هیڤییێ، بەری ببتە نیڤرۆ کاروان گەهشت و ب وی ڕەنگی یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی، بەلێ د گەل هندێ ژی قورەیشییان باوەری ب گۆتنا وی نەئینا!!

### باشبەندەکا فەر:

پشتی سەرهاتییا ئیسراء و معراجێ ب کورتی بۆ مە ئاشکەرا بووی، چەند خالەکێن گرنگ هەنە ل دویماهییێ مە دڤێت ئیشارەتێ بدەینێ:

**ئێک:** گێرانا ئاهەنگان ل شەڤا معراجێ ب چی ناڤێ هەبت کارەکێ دورست نینە، و دورست نینە مرۆڤ ڕۆژ یان شەڤا معراجێ بۆ کرنا چو عیبادەتان تایبەت بکەت.

**دو:** ئەو کتێبا ب ناڤێ معراجا ئبن عەبباسی دئێتە نیاسین، یا دورست نینە، و ئەو ژ درەو بۆ ئبن عەبباسی دئێتە پالدان، و ئەو یا تژییە ژ تشتێن نەدورست و بێ بناخە.

**سێ:** ئێک ژ مەزنترین حکمەتێن ڤێ موعجیزەیا مەزن ئەو بوو موسلمان و خودان باوەر -بەری کافران- بێنە جەڕباندن، کانێ باوەرییا وان ب گۆتنا خودێ و پێغەمبەرێ وی چەندە، و د ڤێ سەرهاتییێ دا خودان باوەرێن دورست ئاشکەرا بوون.. هندەک کافر چوونە نک ئەبوو بەکری، گۆتنێ: هەڤالێ تە یێ هۆ دبێژت، وی گۆت: ئەگەر ڕاست بت وی وە گۆتبت ئەو ڕاست دبێژت! گۆتنێ: یەعنی تو باوەر دکەی ئەو د شەڤەکێ دا دێ چتە قودسێ و زڤڕتەڤە؟ وی گۆت: بەلێ یا ژ وێ مەزنتر ئەز باوەر دکەم، ئەو یێ دبێژت: وەحی بۆ من ژ عەسمانان دئێت ئەز باوەر دکەم..

مەعنا: ئەگەر تە باوەری هەبت کو ئەو پێغەمبەرە و وەحی بۆ دئێت، ل بەر تە یا ب زەحمەت نابت باوەرییێ بینی کو ئەو چووبتە قودسێ، یان چووبتە عەسمانان، مەسەلە باوەرییە!

چار: موعجیزەیا ئیسراء و معراجێ ب لەشی و ڕحێ بوو، و ئەو ب هشیاری بوو نە کو د خەوێ دا.. و ئەگەر ئەو ب ڕحێ ب تنێ با، یان د خەوێ دا با ئەو نەدبوو موعجیزە، و کافران ژی کوفر پێ نەدکر، چونکی هەر کەسەک ژ مە د خەوێ دا دبینت ئەو دچتە جهەکێ دویر.

## سەودەیا کچا زەمعەیی
## ل مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-

ژ بلی خەمێن بەلاڤکرنا دینی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خەمەکا دی ژی هەبوو، ئەو ژی خەما عەیالی بوو، دەمێ ژبیێ وی پێنجی سال ژنکا وی خەدیجا مر، و هندەک عەیالێ خەدیجایێ دەمێ ئەو مری یێ هویر بوو، و وان هەوجەیی ب چاڤدانێ هەبوو، و مرنا خەدیجایێ ڤالاتییەکا مەزن ئێخستە مالێ، تشتێ بوویە ئەگەرا بژالەبوونا هزرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ناڤبەرا خەمێن مالێ و ب خودانکرنا عەیالی و خەمێن بەلاڤکرنا گازییا ئیسلامێ دا.

و دیارە ئەڤ حالێ وی بۆ مرۆڤێن نێزیکی وی یێ ئاشکەرا بوو، لەو رۆژەکێ خەولایا کچا حەکیمی ژنکا هەڤالێ وی عوثمانێ کورێ مەضعوونی ژێ خواست ئەو ژنەکێ بۆ وی بخوازت؛ دا چاڤدێرییێ ل مالا وی بکەت، و گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرسڤ ب ئەرێنی دایێ، وێ ئاگەهدارییا وی کر کو وێ سەودەیا کچا زەمعەیی یا بۆ دیتی، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل بەر هات.

و (سەودە) کچا زەمعەیێ کورێ قەیسێ کورێ عەبدشەمسێ عامری بوو، ئەو و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل عامرێ کورێ لوئەیێ کورێ غالبی دگەهنە ئێک، و بەری ئەو شوی ب پێغەمبەری بکەت وێ شوی ب پسمامێ خۆ سەکرانێ کورێ عەمری کربوو، و ئەو هەردو ژ موسلمانێن دەسپێکێ بوون، یێن ل جارا ئێکێ مشەختبووینە حەبەشە، و بەری مشەختبوونا موسلمانان بۆ مەدینێ ئەو زڤرِیبوونە مەکەهێ، و هندەک دبێژن: زەلامێ وێ

هێشتا ل حەبەشە مربوو، و هندەک دبێژن: پشتی ئەو زڤرییە مەکەهێ ژ نوی مربوو.. هەر چاوا بت دەمێ سەودەیێ شوی ب پێغەمبەری کری ئەو بێژن بوو، و عەمرێ وێ ژ یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پتر بوو، و ل سالا دوازدێ پشتی دەسپێکرنا ئیسلامێ، دەمێ ژییێ پێغەمبەری پێنجی و دو سال، پێغەمبەری ئەو مارەکربوو، یەعنی: عەمرێ وێ هنگی ژ پێنجی و دویێ پتر بوو.

هەر وەکی مارەکرنا وێ پتر بۆ هندێ بوو ئەو مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب رێڤە ببەت، و عەیالێ وی یێ هویر ب خودان بکەت..

سەودە پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مابوو حەتا ب ناڤ سال ڤەچووی، و دبێژن ل دووماهییا زەمانێ عومەری ئەو مربوو، و ل بەقیعێ هاتبوو ڤەشارتن.

# پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن-
# د گەل ئویجاخێن عەرەبان

ل مەکەهێ، دەمێ شەڕ تێدا یێ بەردەوام د ناڤبەرا (تەوحید) و (شرکێ) دا، د ناڤبەرا چاکسازی و هشکاتییێ دا، د ناڤبەرا موحەممەدی و قورەیشییان دا.. قورەیشییان هەمی هێزا خۆ لێکدابوو، و چی مالێ هەی بەرهەڤ کر، و دنیایا خۆ هەمی پێشکێش کر پێخەمەت ب جهئینانا ئارمانجەکا ب تنێ، ئارمانجەکا گەلەکا مەزن -د چاڤێن وان دا- کو ئەو بشێن ڤێ خێرا ژ نوی ل بازێرێ وان سەرهلدای ژ خەلکی مەنعەکەن!

موحەممەد -سلاڤ لێ بن- ئەوێ وان ب خۆ حەتا هنگی دگۆتێ: (ڕاستگۆیێ دەستپاک) ب دەنگەکێ بلند ژ وان دخواست کو: (ڕێکێ بدەنە من، دا ئەز ب سەربەستی دەنگێ خۆ بگەهینمە خەلکی، کەسێ لاواز ب سەربێخم، و پشتەڤانییا وی بکەم یێ زۆرداری لێ هاتییەکرن، و بهایێ مرۆڤینییێ لێ بزڤرینم، و دەسهەلاتێ بۆ عەقلی ڤەگەڕینم)، بەلێ ئەو ل بەر نەهاتن..

وی داخواز ژ ئویجاخا خۆ دکر کو: (دەلیڤەیێ بدەن گازییا من ب ئەزمان بکەڤت، بەلاڤ ببت، ئاستەنگان نەدانە د ڕێکێ دا، چونکی ئەو نە بۆ دەمەکێ ب تنێ یان جهەکێ ب تنێیە)، بەلێ وان ب هەمی ڕوی قائیمییا خۆ ڤە گۆتێ: نەخێر! وەرە ئەگەر تە بڤێت ئەم دێ تە کەینە مەزنێ خۆ، ئەگەر تە بڤێت ئەم هەمی دێ مالی بۆ تە کۆم کەین، حەتا تو ژ مە هەمییان زەنگینتر لێ بێی، و ئەم دێ تە کەینە مەزنێ مەکەهێ هەمییێ..

چەند خودان دیتنەکا نزم بوون ئەو قورەیشییێن ئەڤ بەرسڤە دایە وی کەسێ یێ بەرێ وان ددا سەربلندییێ! موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- سەروەرییا عەردی و مەزنییا دنیایێ هەمییێ بۆ وان دخواست، کلیلێن هەر خزینەیەکا هەبت دکرنە د دەستێن وان دا، و وان مەزنییا ڤی بازێڕکێ نڤستی د ناڤ ڤان چیایێن ئاسێ ڕا ل ڤێ صەحرایا هشک پێشکێشی وی دکرا!

پشتی ڤێ دان و ستاندنا رحەت، قورەیشییان دەست دا دارێ زۆردارییێ، ل سەری گەفێن دژوار ل وی و هەڤالێن وی کرن، وان هزرکر کو بەلکی گەف کاری ل وان بکەت مادەم طەمەعکرنێ فایدە نەکر، ستری کرنە د ڕێکا وان دا، گورییا ئاگرێ کەربا خۆ ل بەراهییا وان گەش کر، عویر و ڕویڤیکێن حێشتران ب سەری داکرن دەمێ ئەو دچوو سوجوودێ، ل طائفێ بچویک و دین و بێ عەقلێن خۆ پێڕا بەردان، و دا بەر بەران، خوین د لەشێ وی ئینا و تڕانە پێ کرن.. و یا غەریب ئەو بوو ڤێ هەمییێ کەربێن وی ڤەنەکرن! وەکی هەر مرۆڤەکی ئەو عێجز بوو، دلێ وی یێ مەزن تژی خەم بوو، بەلێ گاڤەکا ب تنێ ژی ئەو ل وان ب غەزەب نەهات، دلپێڤەبوونەکا مەزن وی ل سەر وان بچویکان هەبوو یێن بەر ل وی دباراندن، و ب عەقلی بەرانبەری وان دینان ڕادوەستییا یێن ئاستەنگ دکرنە د ڕێکا وی دا، و بەرسڤا وی هەردەم ئەڤە بوو: ((**اللهم اهد قومي فإنهم لا يعلمون**)) یا ڕەببی تو هیدایەتێ ب رزقێ مللەتێ من بکە، ئەو نزانن.. بەرێ خۆ بدەنە ڤێ هێجەتا مەزن یا وی بۆ مللەتێ خۆ گرتی، و ژ ڤێ بزانن کانێ دلپێڤەبوونا وی ل سەر مللەتێ وی یێ کافر چەند بوو: یا ڕەببی تو ل مللەتێ من نەگرە، غەەزیا خۆ ل وان نەبارینە، ئەڤ دوژمناتییا وان بۆ وێ حەقییێ یا ئەز پێ هاتیم ژ نەزانینا وانە!

و ڤێ هەمییێ بەرێ وی ژ وێ ڕێکێ وەرنەگێڕا یا وی دایە بەر سنگێ خۆ، وەکی هەیڤێ ئەوا هەر و هەر ڕێکا خۆ د ناڤ تارییێ دا دبڕت، و ڕێکێ ل بەر بەرزەبوویان ڕوهن دکەت. و چەند مرۆڤەک ل هژمارا موسلمانان زێدە ببا، قورەیشی پتر هار دبوون، ل سەر خیزێ مەکەهێ یێ شارپای، ئەوێ نێزیک بوو گۆشت ل سەر بێتە براژتن، موسلمان تێنی و ڕویس و خواس درێژ دکرن، و دگۆتنە ئێک ژ وان: ئەگەر تە بڤێت ئاڤێ بدەینە تە، یان تە ببەینە بەر سیبەرێ، ئێک پەیڤا ب تنێ بێژە، یا ل تە ئەو بت ئەم داخوازا تە ب جهـ بینین، بێژە: من کوفر ب وێ کر یا موحەممەد دبێژت.. بەلێ (أحد.. أحد) ئەو سروود بوو یا وان پێشوازییا عەزابا کافران پێ دکر.. د سەر هندێ ژی ڕا وان گەلەک ڕەنگێن نەخۆشییان ژ دەستێ ملەتێ خۆ یێ کافر دیتن: لێدان، گرتن، مال وێرانکرن، برس، ترس، و حەتا کوشتن ژی.. و ل دویماهییێ ئەو هات یا ل سەر نەفسا مرۆڤی وەکی کوشتنێ نەخۆش.. و بەلکی هندەک ژ هەوە بێژن: ئەرێ ما تشتەک هەیە ل سەر نەفسێ وەکی کوشتنێ نەخۆش؟

### هژرا دەرکەفتنا ژ مەکەهێ:

د ئایەتەکا قورئانێ دا خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴾ (النساء: ٦٦) یەعنی: ئەگەر مە ل سەر وان واجب کربا کو هندەک ژ وان هندەکان بکوژن، یان ئەو ژ وارێ خۆ دەرکەڤن، هژمارەکا کێم ژ وان تێ نەبا کەسێ ئەو نەدکر، و ئەگەر وان ب وێ کربا یا شیرەت پێ ل وان دئێتەکرن ئەو دا بۆ وان چێتر بت، و دا باوەرییا وان پێ ب هێزتر لێ ئێت.

ژ ڤێ ئایەتێ ئاشکەرا دبت کو دەرکەفتنا ژ وەلاتی (یان: مشەختبوون) ل ریزا خۆکوشتنێ دئێت، و پێ نەڤێت بێژین: خۆکوشتن ژ کوشتنێ ب خۆ ژی نەخۆشترە.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل ژێر وی کاودانێ نەخۆش یێ کافرێن مەکەهێ ل درێژیا دەه سالان ئینایە سەرێ خودان باوەران، داخواز ژ دویکەفتییێن خۆ کر وەلاتێ خۆ بهێلن، و پشت بدەنە مرۆڤ و کەس و کارێن خۆ، و دینێ خۆ برەڤیننە وەلاتەکێ بیانی یێ دویر ژ وان، ل دەسپێکێ وان -دو جاران- قەستا وەلاتێ حەبەشە کر، بەلێ زولما قورەیشییان ب دویڤ وان دا چوو حەبەشە ژی، و ئەگەر پاراستنا خودێ بۆ وان نەبا، پاشی عەدالەتا مەلکێ حەبەشە، دویر نەگرە ئەو رۆناهییا ئەو پێ هاتین هەر زوی ڤەمریبا.. و چەرخا زەمانی ڤەگەرییا ڤە، و زۆرداریا قورەیشییان جارەکا دی چەق و طا ژ خۆ دان، و ڤێ جارێ ستێرا فەرەجێ ژ جهەکێ دی هەلات، ژ باژێرکەکێ ناڤێ وی د ناڤ صەحرایا عەرەبان دا بەرزەبووی، لەو چو سەنگێ خۆ د تەرازییا باژێرێن دنیایێ دا نەهەی، چەند زەلامەکێن کێم دەرکەفتن، و سنگێ خۆ دا وێ دەشتا بەرفرەهـ ئەوا دکەفتە ژێریا باژێرێ وان، ب ئنیەتا قەستکرنا مەکەهێ بۆ کرنا حەجێ و طەوافا ل دۆر کەعبێ..

ل سەر هزرا وان نەبوو کو د ڤێ سەفەرا وان دا، ئەوا ل سالا دەهێ ژ هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چێبووی، رویدانەک دێ ئێتە پێشییا وان، دیرۆکا وان و یا باژێرێ وان دێ گوهۆرت، باژێرێ وان ئەوێ چو سەنگێ خۆ نەهەی -وەکی مە گۆتی- دێ بتە ماکا باژێران، و پایتەختا دنیایێ، و سەرەکانییا وێ رۆناهییێ یا کو دێ عەردی هەمییێ ڤەگرت.. ل دەمێ کۆمبوونا ئویجاخێن عەرەبان ل مەکەهێ و دەور و بەرێن وێ بۆ کرنا حەجێ، هەر رۆژ ل ئێڤارا درەنگ، دەمێ رۆژێ چاڤێ خۆ ژ وێ شەرمزارییێ دگرت یا

کـافـر ل دۆر و ڕەخـێـن کەعبـێ دکەن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بـن- ب دزی ڤـە ژ مال دەردکەفت، و خۆ بۆ ئویجاخان پێشکێش دکر، و دگۆتێ: (کی ژ هـەوە دێ پشـتەڤانییا مـن کـەت؟ قورەیشـی نـاهێلن ئـەز گۆتنـا خـودایێ خـۆ بـەلاڤ بکەم؟).

و بەرسـڤێـن وان دژێـک جـودا بـوون.. یـێـن ژ هـەمییان خرابتـر دگـۆتن: ئەگەر خێرەک د تە و گازییا تە دا هەبا ئویجاخا تە دا گوهێ خـۆ دەتـە تـە، و یـێـن ژ هـەمییان بـاشتـر دگۆتن: ئەم دێ جارێ خۆ گـرین کـانێ هـەڤڕکییا تـە د گەل ئویجاخا تە دێ ل سەر چ ڕاوەستت پاشی ئەم دێ بڕیارا خۆ دەین!!

## د گەل کندییان:

مـە گـۆت: پشـتی ئـەو بەرهـەم ب چوونـا طـائفێ پێڤـە نـەهاتی یـێ پێغەمبــەری -ســلاڤ لــێ بــن- هیڤــی دکــر، وی بڕیــار دا شــێوەیێ خــۆ پێشکێشکرنا بـۆ ئویجاخان چـەنـدەکـێ بگـوهـۆڕت، ل شـوینا کـو ئـەو بچتـە ژ دەرڤەی مەکەهێ و داخوازێ ژ ئویجاخێن عەرەبان بکـەت کـو بـاوەرییێ پـێ بیـنن، و ئـەو بێتـە سـەری یـا ل طـائفێ هاتییـە سـەری، یـا باشـتر ئـەوە ئـەو مەوسـمێ حـەجێ بـۆ خـۆ ئسـتغلال بکـەت، دەمـێ ئویجـاخێن عـەرەبان هـەمی دئێنە مەکەهێ بۆ کرنا حەجێ و هنگـی گازییـا خـۆ بگەهینتـە وان، ئەگـەر ئـەو باوەرییێ پێ نەئینن ژی چونە چونە ئەو نەشێن نەخۆشییێ بگـەهیننێ، و ئـەو بوو ل سالا دەهێ ژ گازییا ئیسـلامێ و بـۆ جـارا ئێکـێ وی مەوسـمێ حـەجێ ئسـتغلال کـر، و گازییـا خـۆ گەهانـدە هنـدەک ئویجـاخێن عـەرەبان، و داخـوازا پشتەڤانییێ بۆ خۆ ژ وان کر.

ل سەری ئەو چوو نک ئویجاخا (کندییان) کو خەلکێ یەمەنێ بـوون، و گۆتە وان: خێرەک ل نک مـن هەیـە، ئەگـەر هـەوە بڤێت دێ دەمـە هـەوە! وان گـۆتـێ: ئـەو چییە؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گـۆت: شـاهـدە بـدەن کـو

ژ خودێ پێڤەتر چو خودایێن ب حەق نین، و نڤێژان بکەن، و باوەرییێ ب وی تشتی بینن یێ ژ نک خودێ هاتی، ئینا ئەو روینشتن و گوهداریا وی کر، و پشتی چەند دەلیڤەیەکان وان گۆتێ: ئەگەر مە پشتەڤانییا تە کر، و تو ب سەرکەفتی، دێ حوکمی ئێخییە دەستێ مە؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: حوکم یێ خودێیە، یێ وی بڤێت ئەو دێ ئێختە دەستی، وان گۆت: مادەم وەسایە مە چو هەوجەیی ب وێ نینە یا تو دبێژی..

## د گەل عامرییان:

و ژ وان ئویجاخێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەست کرییێ ئویجاخا (عامرییان) بوو، کو ئێک ژ ئویجاخێن عەرەبان یێن مەزن بوو، و دبێژن: ئەو ئێک ژ پێنج ئویجاخان بوون یێن چو جاران ژنکێن وان نەهاتینە ئێخسیرکرن، و چو جاران خویک و باج نەداینە چو شاهـ و مەلکان، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل ئەبوو بەکری چوو جهێ وان، و پشتی چەند پسیارەک ژ وان کرین، وەکی: هوین کینە؟ هژمارا هەوە چەندە؟ هوین دشێن پشتەڤانییا کەسەکی بکەن ئەگەر هاتە د ناڤ هەوە دا؟ و دەمێ وان خۆ دایە نیاسین، و گۆتی: ئەم ژ کەسێ ناترسین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: ئەز پێغەمبەرێ خودێمە، و ئەزێ هاتیم داخوازێ ژ هەوە بکەم هوین پشتەڤانییا من بکەن؛ دا ئەز گازییا خودایێ خۆ بگەهینمە خەلکی، و هوین ب کەیفا خۆنە..

وان گۆتێ: تو کیی؟ و پشتی وان ئەو نیاسی و زانی ژ کیژ مالێیە، و کو قورەیشی وی دەرەوین دەردئێخن، و باوەرییێ پێ نائینن، هندەک ژ وان گۆت: ئەم باوەرییێ ب تە نائینین، بەلێ ئەگەر تو بێیە د ناڤ مە دا ئەم تە دەرنائێخین، و دێ بەرەڤانییێ ژ تە کەین.. و هنگی مەزنەکێ وان هات، و پشتی ب گۆتنا وان زانی، وی گۆت: هوین دزانن چەند شۆلەکا مەزنە هوین

دێ ئێخنە د ستوییێ خۆ دا؟ ئەگەر هوین ڤی د گەل خۆ ببەن، عەرەب هەمی دێ هەوە بۆ تیرێن خۆ کەنە ئارمانج، ئویجاخا وی وی چێتر دنیاست، ئەگەر خێرەک د وی تشتی دا هەبا یێ ئەو دبێژت، ئەو دا باوەرییێ پێ ئینن.. و وی مرۆڤێن خۆ سارکرن، حەتا ئەو ژ گۆتنا خۆ لێڤەبووین، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ژی هێلان، و قەستا ئویجاخەکا دی کر..

## د گەل شەیبانییان:

شەیبانی ئێک ژ ئویجاخێن عەرەبان یێن زێدە مەزن و ب هێز بوون، ل ژێرییا عیراقێ دژییان، و هندەک پەیوەندی و پەیمان د ناڤبەرا وان و کیسرای دا هەبوون، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و ئەبوو بەکر نێزیکی وان بوون، پشتی سلاڤکرنێ ئەبوو بەکری گۆتە ئێک ژ مەزنێن وان: هژمارا عەگیدێن هەوە چەندە؟ وی گۆت: ئەم ژ هزاران پترین، ئەبوو بەکری گۆتێ: پشتەڤانییا هەوە بۆ وی یێ بێتە د ناڤ هەوە دا یا چاوایە؟ وی گۆت: دەمێ ئەم دەست ددەینە چەکی کەس وەکی مە یێ دژوار نینە، و ئەم هەسپێن خۆ ب پێش عەیالێن خۆ دئێخین، و پێدا چوو.. پاشی ئەو ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زڤڕی و گۆتێ: نەکو تو ئەو زەلامێ قورەیشی بی؟ ئەبوو بەکری گۆتێ: ئەو پێغەمبەرێ خودێیە ئەگەر سوحبەتا وی گەهشتبتە تە.. ئینا وی گۆت: برایێ قورەیشی! تو بەرێ خەلکی ددەیە چ؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیسلام بۆ وان ئاشکەرا کر و هندەک ژ قورئانێ بۆ خواند، و بۆ وی دیارکر کو قورەیشی وی درەوین دەردئێخن و باوەرییێ پێ نائینن، ئینا وی زەلامێ شەیبانی گۆتێ: ب خودێ تو بەرێ خەلکی ددەیە ئەخلاقێ باش، و ئەو مللەتێ تە درەوین دەربێخت درەوینێن مەزن ئەون.. پاشی ئیشارەت دا پیرەمێرەکی و گۆت: ئەڤە (هانئە) مەزنێ مەیە، و ئەم ژ گۆتنا وی دەرناکەڤین، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- لێ زڤڕی،

وی گۆت: برایێ قورەیشی! من گوهدارییا تە کر، و ئەز دبێژم هێلانا مە بۆ دینێ مە ژ بەر ڕوینشتنەکا هۆسا یا کورت نە ژ ڕەئییەکا دورستە، و لەزێ پەشێمانی یا د گەل، و ئەڤە (موثەننایێ کوڕێ حارثەیە) مەزنێ مەیە و فێرسێ مەیە، بلا ئەو ژی باخڤت، موثەنناى گۆت: ئەز ژی وەکی هانئی دبێژم، پشتی هنگی مە هندەک پەیمان د گەل کیسرای هەنە، و ئەم نەشێین بێی وی کەسێ بحەوینین، و ئەز دبینم ئەڤ تشتێ تو بەرێ مە ددەیێ ژ وان تشتانە یێن مەلکان پێ نەخۆش، و ئەگەر تە بڤێت ئەم تە بحەوینین و پشتەڤانییا تە بکەین ئەم دێ وە کەین بەلێ ل ژێریا ئاڤا عەرەبان نە ل لایێ فورسێ.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: هەوە بەرسڤەکا خراب نەدا من دەمێ هەوە ڕاستی گۆتی، و ئەو کەس دێ شێت دینێ خودێ ب سەرئێخت یێ ژ هەمی لایان ڤە وی بگرت.

و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زانی ئەڤ مرۆڤە ب هندەک پەیمانان ڤە دگرێدایە د گەل کیسرای، و ئەو نەشێن خۆ ژ وان پەیمانان ڕزگار بکەن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕێز ل زەلامینییا وان گرت، و مزگینی دا وان کو ئەگەر ئەو مانە ساخ و باوەری ب ڤی دینی ئینا ڕۆژەک دێ ئێت ملکێ کیسرای دێ بۆ وان مینت.

# پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن-
# و خەلکێ یەثربێ

## د گەل خەزرەجییان:

مە گۆت: ل سالا دەهێ ل دەمێ حەجێ پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- خۆ بۆ ئویجاخێن عەرەبان پێشکێش کر، ل (مینایێ) ل رۆژهەلاتا بازێرێ مەکەهێ، و ب دورستی ل بنارا وی چیایی یێ جەمرا مەزن (جهێ رەجما شەیطانی) دکەفتێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شەش زەلام دیتن، ژ سەر و بەرێ وان زانی کو ئەو نە ژ خەلکێ مەکەهێنە، پشتی ئەو ب نک وان ڤە چووی و سلاڤ دایێ، پسیار ژ وان کر و گۆت: هوین ژ کیژ ئویجاخێنە؟ وان گۆت: ئەم خەزرەجینە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: هوین ژ پشتەڤانێن جوهیانە؟ وان گۆت: بەلێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هوین دێ روینن پیچەکێ ئەز د گەل هەوە باخڤم؟ وان گۆت: بەلێ، و پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیسلام پێشکێشی وان کری، ئەو ل ئێک و دو زڤرین و گۆتن: ئەڤە ئەو پێغەمبەرە یێ جوهی گەفان پێ ل هەوە دکەن، ڤێجا وە نەبت ئەو بەری هەوە راکەن..

پاشی وان گۆتە پێغەمبەری: ئەم درازینە ب گۆتنا تە، و مە مللەتێ خۆ یێ ل پشت خۆ هێلای خرابی و دوژمنی د ناڤ وان دا یا بەلاڤ، و بەلکی خودێ ب تە وان بگەهنتە ئێک، ئەم دێ زڤرینە نک وان، و دێ بەرێ وان دەینە گازییا تە، ڤێجا ئەگەر خودێ ئەو ل دۆر گازییا تە کۆم کرن، کەس یێ سەرفەرازتر نابت ژ تە..

پشتی ڤان زەلامێن خەزەرجی حەجا خۆ کری، ئەو زڤڕینە بـاژێڕێ خۆ، و کارێ خۆ کرە بەلاڤکرنا دینێ نوی د ناڤ خەلکی دا..

و ئـەو هـەر شـەش زەلامـێن خـەزرەجی ئەڤـە بـوون: ئەسـعەدێ کـوڕێ زورارەی، عـەوفێ کـوڕێ حـارثی، رافعـێ کـوڕێ مـالکی، قوطبـەیێ کـوڕێ عامری، عوقبەیێ کوڕێ عامری، و جابرێ کوڕێ عەبدللاهی.

## د گەل خەزرەجێ و ئەوسییان:

سـال ڤەگـەڕیـا، بـوو سـالا یـازدێ پشـتی هاتنـا گازییـا ئیسـلامێ، و جـارەکـا دی هـەر ل وی جهی ل مینـایێ پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- چاڤ ب دووازدە زەلامان ژ خـەلکێ (یـەثربێ) کـەفت: دەهـ خـەزەرجی بـوون، و دو ئەوسی بوون، ئەو ژی ئەڤە بوون:

ئەسعەدێ کوڕێ زورارەی، عەوفێ کوڕێ حارثی، رافعێ کـوڕێ مـالکی، عوقبەیێ کوڕێ عامری، و قوطبـەیێ کـوڕێ عـامری، و ئـەڤ هـەر پێنجـە ئـەو بوون یێن سالا بـەری هنگـی موسلمان بـووین، ذەکـوانێ کـوڕێ عەبدقەیسـی، عوبادەیێ کوڕێ صامتی، یەزیدێ کوڕێ ثەعلەبەی، عەبباسێ کوڕێ عوبـادەیێ کوڕێ نەضلی، و موعاذێ کوڕێ حارثی، ئەڤە هەر دەهـ زەلامێن خـەزرەجی، و هەردو زەلامێن ئەوسی ئەڤە بوون: عوەیمێ کوڕێ سـاعدەی، و مـالکێ کـوڕێ تەیهانی.

ژ ڤێ چەندێ دیار دبت کو بەلاڤبوونا ئیسلامێ ل مەدینێ، ل دەسپێکێ پـتـر د نـاڤ ئـویـجـاخا خەزرەجییان دا بوو، چونکی ئەو هـەر شـەش زەلامـێن ل سالا دەهێ پێغەمبەر دیتی و موسلمان بووین خەزرەجی بوون.

ڤـان هـەر دووازدە زەلامـێـن یـەثـربـی ل گـەلـیـێ عەقەبـەیێ چاڤ ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەفت، و وان پێکڤـە (بەیعـە) دا پێغەمبـەری کو ئەو پێگیرییێ ب ئەمر و فەرمانێن دینێ نوی بکەن، و هندی ژ وان بێت

کاری بۆ بەلاڤکرنا ڤی دینی د ناڤ مللەتێ خۆ دا بکەن، عوبادەیێ کوڕێ صامتی دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە مە: وەرن بەیعێ (یەعنی: سۆزێ) بدەنە من کو هوین تشتەکی بۆ خودێ نەکەنە شریک، و دزییێ نەکەن، و زنایێ نەکەن، و زارۆکێن خۆ نەکوژن، و چو بێبەختییان نەکەن، و د قەنجییێ دا بێ ئەمرییا من نەکەن، و هەچییێ ژ هەوە ڤێ ب جهـ بینت خێرا وی ل سەر خودێیە، و هەچییێ ژ هەوە تشتەکی ژ ڤان بکەت، و د دنیایێ دا هاتە جزادان ئەو دێ بۆ وی بتە کفارەت، و هەچییێ تشتەکی ژ وان بکەت و خودێ وی ستارە بکەت، کارێ وان د دەست خودێ دایە، ئەگەر وی بڤێت ئەو دێ وان جزا دەت، و ئەگەر بڤێت دێ وان عەفی کەت. و ل سەر ڤێ مە چەندێ مە بەیعە دا وی.

و ئەڤ بەیعەیە یا دبێژنێ: بەیعا عەقەبەیێ یا ئێکێ.

پشتی ئەڤ زەلامە ژ خەلکێ باژێرێ یەثربێ ئەوێ دکەفتە ژۆرییا مەکەهێ ب دویراتییا رێکا هەشت رۆژان ب پییان، ژ کارێ و بارێ حەجێ خلاصبووین، و وان ب رەنگەکێ ڤەشارتی پێغەمبەر دیتی و پەیمان دایێ، وان کارێ زڤڕینێ کر.

### مصعەب ئێکەمین سەفیرێ ئیسلامێ:

گاڤا وان دوازدە زەلامان ژ خەزرەجی و ئەوسییێن خەلکێ یەثربێ ڤیای بزڤڕنە باژێرێ خۆ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەڤالەکێ خۆ یێ شارەزا ب دینی، و ب شێوەیێ دان و ستاندنێ و گازیکرنا خەلکی، هلبژارت، دا د گەل وان بهنێرتە باژێرێ وان بۆ هندێ دا ئەو قورئانێ بۆ وان بخوینت، و نڤێژێ ل بەرا وان بکەت، و دینێ نوی نیشا وان بدەت، هەر وەسا کاری بۆ بەلاڤکرنا ئیسلامێ د ناڤ خەلکی ژی دا بکەت، و ئەو صەحابی مصعەبێ کوڕێ عومەیرێ کوڕێ هاشمێ کوڕێ عەبدمەنافێ کوڕێ عەبدداری کوڕێ

قوصەیێ کوڕێ کیلابێ قورەیشییە، هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د مالا ئەرقەمی ڤە بوو دەمێ ئەو موسلمان بووی، و ئەو ئێک ژ وان بوویێن مشەختبووینە حەبشە، و وەسا دیارە کو ئەو زڤڕی بوو مەکەهێ، دەیک و بابێن وی ددەولەمەند بوون، و ئەو ئێک ژ جحێلێن تازە و حەز ژ خۆ کەرێن مەکەهێ بوو، و دبێژن: دەیکا وی گەلەک ب وی ڤە یا گرێدای بوو، و ئەو گەلەک نازدار دکر، و دەمێ ئەو موسلمان بووی و دەیکا وی ژ زڤڕینا وی ل کوفرێ بێ هیڤی بووی، وێ هەر تشتەک ژێ بڕی لەو مصعەب زێدە فەقیر بوو، حەتا دەمێ ئەو ل ڕۆژا ئوحودێ شەهید بووی، تشتەک نەبوو ئەو پێ بێتە ڤەشارتن!

مصعەب ئێکەمین سەفیر بوو هاتییە هلبژارتن و هنارتن بۆ باژێرێ یەثربێ دا ئیسلامێ بەلاڤ بکەت، و دەمێ ئەو د گەل خەلکێ بەیعەتا عەقەبەیێ یا ئێکێ ل سالا یازدێ پشتی هاتنا ئیسلامێ چوویە یەثربێ، ئەو د گەل هەڤالێ خۆ یێ خەزرەجی ئەسعەدێ کوڕێ زورارەیی چوو مالا وی، و وان هەدویان پێکڤە دەست ب بەلاڤکرنا ئیسلامێ کر، د گەل وێ کۆما دی ژی یا خودان باوەران ئەوێن سالا بەری هنگی موسلمان بووین، مصعەبی قورئان بۆ وان دخواند، و دینێ نوی نیشا وان ددا، و نڤێژ ل بەرا وان دکر، و وان ناسناڤێ مصعەبی کربوو (المقرئ).

د کێمتر ژ سالەکێ دا مصعەب و هەڤالێن وی شیان هژمارەکا نە یا کێم ژ ئەوسی و خەزرەجییان قانع بکەن کو بێنە د ئیسلامێ دا، حەتا نێزیک بوو مالەک نەمای ئەگەر ئێک یان پتر ژێ موسلمان نەبن، نە بەس هندە، بەلکی ئەو شیان هندەک مەزن و ماقویلێن مالباتێن خەلکێ یەثربێ ژی موسلمان بکەن، وەکی سەعدێ کوڕێ موعاذی، و ئوسەیدێ کوڕێ حوضەیری..

و هەر چەندە نەیارەتی د ناڤبەرا وان هەردو ئویجاخان دا یێن ل باژێرێ یەثربێ دژیان (ئەوسی و خەزرەجییان) یا بەردەوام بوو، و جوهی ئەوێن ل دەور و بەرێن باژێرى دژیان دەستەکێ درێژ د بەردەوامی و زێدەکرنا وێ نەیارەتییێ دا هەبوو، حەتا هندەک جاران دگەهشتە شەرِ و کوشتنێ، بەلێ پشتی هاتنا وان د ئیسلامێ دا، ئەو ب خێرا ڤێ نعمەتا مەزن بوونە برایێن ئێک، و ئەو نەیارەتییا بەرێ هاڤێتە پشت خۆ.

بەرى سال تمام ببت، و دەمێ حەجێ بزڤرِتە ڤە، مصعەب زڤرِى مەکەهێ، و مزگینییا بەلاڤبوونا ئیسلامێ یا بەرفرەهـ ل باژێرێ یەثربێ گەهاندە پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن-، و گاڤا بۆ پێغەمبەرى مسۆگەر بووى کو جهەکێ تەنا بۆ هەڤالێن وی دویر ژ دەستێ کافرێن مەکەهێ پەیدابوو، وی دەستویرى دا هەڤالێن خۆ کو ئەو ب دزى ڤە بچن و قەستا یەثربێ بکەن.

## مشەختگەها صەحابییان (یەثرب)
## یان باژێڕێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-

بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- خەلکێ مەدینێ ل عەقەبەیا (میناییێ) ببینت، و ئەو باوەرییێ پێ بینن، و سالا دی هژمارا وان زێدەتر لێ بێت و بەیعێ بدەنێ، و بزڤرن و دینێ نوی د ناڤ مرۆڤێن خۆ دا بەلاڤ بکەن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د خەونا خۆ دا دیتبوو -و خەونێن پێغەمبەران وەحینە- کو ئەو ژ مەکەهێ مشەخت دبوو، و دچوو عەردەکێ دی، ئەبوو مووسایێ ئەشعەری -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: من د خەونێ دا دیت ئەز ژ مەکەهێ مشەخت دبوومە عەردەکێ دارقەسپ لێ هەین، ڤێجا هزرا من بۆ هندێ چوو کو ئەو عەردێ (یەمامە)ییێیە، یان هەجەرە.. پاشی ئەو دەرکەفت باژێڕێ یەثربێ[1].

و دیارە پشتی ڤێ خەونێ وی خەونەکا دی دیتبوو مشەختگەها وی و هەڤالێن وی پتر تێدا بۆ وی هاتبوو ئاشکەراکرن، عائیشا -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: جهێ مشەختبوونا هەوە هاتە نیشادان بۆ من (یەعنی: من د خەونێ دا دیت) من دیت ئەو عەردەکە ئاخا وی یا هویرە و یا ب خوێیێیە، دارقەسپ لێ هەنە، دکەفتە د ناڤبەرا دو لاتان دا یێن کەڤرێن وان دڕەش[2].

---

(١) بوخاری و موسلم ڤەدگوهێزن. و یەمامە باژێرکەکێ تژی دارقەسپ بوو دکەفتە دەڤەرا ریاضێ، و هەجەر ئەوە یا نوکە دبێژنێ: ئەحساء، و ئەو هەردو نوکە دکەفتە وەلاتێ سعوودییێ.

(٢) بوخاری ڤەدگوهێزت.

ب ڤێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زانی کو ئەو جهـ باژێرێ یەثریبێیە، وەکی وی ب خۆ د حەدیسا ئێکێ دا گۆتی، و پشتی ئەو چێبووی یا بەری نوکە مە ڤەگێڕای ژ موسلمانبوونا هژمارەکا نە یا کێم ژ خەلکێ وی جهی د ناڤبەرا سالێن یازدێ و دوازدێ دا ژ هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابیێ خۆ مصعەب هنارتییە مەدینێ دا ژ لایەکی ڤە دینی نیشا وان بدەت، و ژ لایەکێ دی ڤە دا ئەو ژ نێزیک بەرێ خۆ بدەتە وی باژێری و خەلکێ وی کانێ ڕاستە ئیسلام لێ بەلاڤبووی وەکی ئەو زەلام دبێژن ئەوێن ژ وێرێ هاتین، یان نە؟

و گاڤا مصعەب پشتی چەند هەیڤەکان زڤڕی و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پشتڕاست کری کو بەلێ ئیسلام ل وێرێ یا بەلاڤبووی، و خەلک یێ ئامادەیە پێشوازییێ ل موسلمانێن خەلکێ مەکەهێ بکەن، و وان د ناڤ خۆ دا بحەوینن و بەرەڤانییێ ژێ بکەن.. هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا صەحابییێن خۆ کو ئەو بەر ب باژێرێ (یەثریبێ) ڤە مشەخت ببن.

و گەلەک ژ وان موسلمانێن مشەخت بووینە حەبەشە ژی گاڤا ب ڤێ چەندێ زانی، زڤڕینە مەکەهێ، و بەر ب باژێرێ یەثریبێ ڤە چوون، و هندەک ژی ئێکسەر هەما چوونە وێرێ، و چەند صەحابییەک مانە ل حەبەشە، حەتا پشتی هنگی ب شەش حەفت سالەکان ژ نوی زڤڕینە مەدینێ.

**یەثرب**:

باژێرێ گەشێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- (المدينة المنورة)، بەری موسلمان ب مشەختی بچنێ، عەرەبێن جەزیرێ دگۆتنێ: (یەثرب)، و ئەو ژی وەکی مەکەهێ باژێرەکە دکەفتە وەلاتێ (حیجازێ) و ئەو دکەفتە باکوورێ مەکەهێ ب قووناغا هەشت ڕۆژان ئەگەر مرۆڤ پییان بچت، و ب پیڤانێن

نڤرۆ (٤٣٠) کم د ناڤبەرا وان هەردو باژێران دا هەنە، و ژ لایێ رۆژئاڤایێ ڤە د ناڤبەرا مەدینێ و دەریایا سۆر دا (١٥٠) کم هەنە.

دبێژن: ئێکەمین جار مرۆڤ ل ڤی جهی ئاکنجی بووین، جیلێ شەشێ یان یێ هەشتێ بوو پشتی نووحی، و دەمێ شاهێ بابلی (بختونصری) ل سەدسالا شەشێ بەری زایینێ هێرش کرییە سەر ئسرائیلییان ل فلسطینێ، و جهێن وان وێران کرین، هندەک کەسێن کێم ژ وان بەر ب ڤی جهی ڤە مشەخت بوون، و لێ ئاکنجی بوون، و ل سەدسالا دویێ زایینی هندەک ئویجاخێن دی یێن وان پێکڤە هاتن، و ل دەور و بەرێن ڤی جهی ئاکنجی بوون، دەمێ دەولەتا رووومانی ئەو کوشتین و نەخۆشی گەهاندییێ، ژ وان ئویجاخان: (بەنوو نەضیر، و بەنوو قورەیضە، و بەنوو قەینوقاع) و هندەک دبێژن: هاتنا وان بۆ ڤی جهی ژ بەر هندێ بوو وان د کتێبێن خۆ یێن پیرۆز دا دخواند کو پێغەمبەرێ دووماهییێ دێ ژ ڤی جهی رابت، و چونکی وان هزر دکر پێغەمبەرێ دووماهییێ دێ ژ وان بت ئەو هاتن ل وێرێ ئاکنجی بوون، گۆتن: دا ئەو پێغەمبەر ژ مە بت.

پاشی ل سەدسالا سێیێ زایینی، پشتی ئاڤبەندا (مەئربێ) ل یەمەنێ خراب بووی، دو ئویجاخێن عەرەبێن (قەحطانی) ژ یەمەنێ مشەختبوون و هاتن قەستا وەلاتێ حیجازێ کرن، و ل وی جهی ئاکنجی بوون، یێ نوکە باژێرێ مەدینێ دکەفتێ، و ئەو هەردو ئویجاخ (ئەوس و خەزرەج) بوون، (ئەوس) و (خەزرەج) دو برا بوون، کورێن حارثەیێ کورێ ثەعلبەیی بوون، و ئەو د نەسەبا خۆ دا دگەهنە (قەحطانی)، نە وەکی قورەیشییان ئەوێن د نەسەبا خۆ دا دگەهنە عەدنانی.

و هندەک ئیشارەت و دەلیلێن دیرۆکی هەنە کو بەری ئەڤ هەر سێ ئویجاخێن جوهییان ژ فلسطینێ، و هەردو ئویجاخێن قەحطانی ژ یەمەنێ

بێنە ڤی جهی، و لێ ئاکنجی ببن، هندەک کۆمێن مرۆڤان ژ (بەنوو قوضاعە)یێن عەرەب ژ شامێ هاتبوون و ل ڤی جهی دانابوو و دبێژن: ئەو ئێکەمین کەس بوون ئەڤ جهە ئاڤاکری.

هەر چاوا بت، بەری هاتنا ئیسلامێ سێ ئویجاخێن ئسرائیلییان یێن کێم، و دو ئویجاخێن عەرەبان یێن بۆش ل ڤی جهی دژیان، عەرەب ل سەنتەری کو دەشتەکا بەرفرەهـ بوو دژیان، و جوهی ل لایێ باشووری و رۆژهەلاتێ د هندەک کەل و ئاسێگەهان ڤە دژیان. و هژمارا خەلکێ ڤی باژێری بەری هاتنا موسلمانان ب (١٢-١٥) هزار کەسان دئێتە تەخمینکرن.

(یەثرب) کو ئەو ناڤ بوو یێ عەرەبان دانایە سەر باژێری، د ڕاستییا خۆ دا باژێر نەبوو، بەلکی هژمارەکا تاخێن ژێک دویر بوو، هەر تاخەک یێ بابکەکی بوو ژ بابکێن وان ئویجاخان یێن ل وێرێ دژیان، و پێکڤە دگرێدای نەبوون، پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوویێ، ژ نوی وی شکلێ باژێرەکێ پێکڤە گرێدای دا، و ل دۆر ناڤێ باژێری هندەک دبێژن: یەثرب ناڤێ وی زەلامی بوو یێ ئێکەمین جار ئەڤ جهە ئاڤاکری، و هندەک دبێژن: ژ بەر کو ئەڤ جهە یێ ئێشەوی بوو، هەچییێ چووبایێ و لێ ئاکنجی ببا ئێش دهاتێ و نساخ دبوو، عەرەبان ناڤێ جهی کرە (یەثرب) و (یەثرب) ب زمانێ عەرەبان بۆ نەخۆشییێ دئێتە گۆتن. دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن خۆ چووینە وێرێ هندەک ژ وان نساخ بوون، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعا ژ خودێ کر ئێش ل وێرێ نەمینت، و ژ هنگی وەرە ئێش نەما.

ژ بەر هندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناڤێ باژێری کرە (طەیبە) یەعنی: خۆشی، کو پەیڤەکە دژی (یەثربە) ئەوا ب مەعنا نەخۆشی دئێت[1].

پشتی ئویجاخا ئەوس و خەزرەج هاتین و ل (یەثربێ) ئاکنجی بووین، و عەرد ڤەگرتی، جوهییان ب ڤێ چەندێ نەخۆش بوو، و گەلەک جاران هەڤرکی د ناڤبەرا هەردو لایان دا چێ دبوو و هندەک جاران دگەهشتە شەڕی، و دەمێ شەڕ چێ دبوو ئەوس و خەزرەجییان هەوارێن خۆ دگەهاندە هندەک ئویجاخێن دی یێن عەرەب ژ مرۆڤێن خۆ و ئەو دهاتنە هاری بۆ کرنا شەڕی د گەل جوهییان.. نێزیکی سەد و پێنجی سالان بەری هاتنا ئیسلامێ، جوهییان سیاسەتا خۆ گوهاڕت و ل شوینا هەڤڕکییەکا ئێکسەر د گەل عەرەبان بکەن، ڕابوون ب ڕێکێن خۆ یێن گەنی شەڕ و هەڤڕکی د ناڤبەرا ئەوس و خەزرەجان دا پەیدا کر، و ئەو لێک کرنە نەیار، و هەر هندەک ژ وان پشتا لایەکی دگرت و چەک دفرۆتێ، و شەڕ د ناڤبەرا وان دا گەرم دکر.. و ژ بەر کو ئەوس و خەزرەجی موشرک و صەنەمپەرێس بوون، و جوهی خودان کیتابەکا ئەسمانی بوون، و دویکەفتییێن پێغەمبەران بوون، گەلەک جاران وان گەف دکرن و دگۆتنە ئەوس و خەزرەجییان: کتێبێن مە دبێژن: نێزیکە

---

(١) د کتێبا (حەببەقووق) دا کو ئێک ژ ئەسفارێن کیتابا پیرۆزا ئسرائیلییانە، هاتییە: ((خودێ ژ تیمانێ دێ ئێت، و یێ پیرۆز دێ ژ چیایێ فاران ئێت، مەزنییا وی ئەسمان ڤەگرتن، و ژ بۆ کەیفهاتنا ب وی عەرد تژی بوو. وەکی گەشاتییا بروسییێ ئەو دێ ئێت، و ڕۆناهی ژ دەستێ وی ڤەدپەشت، و هێزا وی د وێ دا یا ڤەشارتییە. ل بەراهییا وی ئێشست دچت، و ل دویڤ پێ وی مرنە..)) (سفر حبقوق: ٣/٣-٥)، و ئەڤ دەقە مزگینیدانە ب هاتنا پێغەمبەرێ ئیسلامێ، و ئەو هندێ دگەهینت کو (ئێش و نەخۆشی) ل بەر دەستێ ڤی پێغەمبەری دچت و نامینت.. بۆ بەرفرەهی بزێنە کتێبا مە: (پەرتووکا پیرۆز و مزگینیدان ب موحەممەد پێغەمبەری سلاڤ لێ بن) کو ئەڤ مەسەلە ب بەرفرەهی مە تێدا ئاشکەرا کرییە.

پێغەمبەرەک بێت و گاڤا ئەو هات ئەم دێ باوەرییێ پێ ئینین، و ئەم و ئەو پێکڤە دێ شەرێ هەوە کەین.. و ئەڤە ئێک ژ وان ئەگەران بوو کو خەلکێ مەدینێ زوی باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینای، وان گۆت: ئەم دێ بەری جوهییان ڕاکەین، دا ئەو چێ نەبت یا ئەو گەفێ پێ ل مە دکەن.. و جوهییان هزر نەدکر کو ئەو پێغەمبەرێ دێ ئێت ژ وان نابت.

پشتی هژمارەکا هەڤڕکی وشەڕێن گران د ناڤبەرا ئەوس و خەزرەجییان دا ل درێژییا سەد و پێنجی سالان چێبووین، و ئەو وەستیاین، هندەک عەقلدارێن وان تێ ئینادەر کو ئەڤە جوهینە شەڕی د ناڤبەرا وان دا خۆش دکەن، دا وان بێخنە بن دەستێ خۆ، لەو وان بڕیار دا پێکڤە ڕوینن و خۆ بکەنە ئێک، و مەزنەکی بۆ خۆ دەسنیشان کەن، و بڕیارا وان ئەو بوو عەبدللاهێ کوڕێ ئوبەیێ کوڕێ سەلوولی کو ئێک ژ مەزنێن خەزرەجییان بوو، بکەنە مەلک بۆ خۆ و تاجێ بدانن سەر سەری، و هێشتا وان ئەڤ بڕیارا خۆ ب جهـ نەئینای، خودێ وەسا حەز کر ئیسلام هات، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەستا مەدینێ کر.. و هەمی تشت هاتنە گوهاڕتن، وەکی دێ بۆ مە ئاشکەرا بت.

## خەزرەجی.. مالخالانێن پێغەمبەری:

دەمێ مە بەحسێ باپیرێ پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- عەبدلموطەلبێ کوڕێ هاشمی کری، مە ئاشکەرا کربوو کو دەیکا وی سەلما کچا مەزنێ مالباتا نەجارییان عەمرێ کوڕێ زەیدی بوو، و بەنوئەلنەججار ئێک ژ بابکێن خەزرەجییان بوون، و ل باژێڕێ یەثربێ دژیان، و جارەکێ بابێ عەبدلموطەلبی هاشم د گەل کاروانێ قورەیشییان یێ بازرگانی دەرکەفتە شامێ، و وی ژنکا خۆ سەلما د گەل خۆ بر، و ب ڕێڤە هێلا ل مالبابا وێ، و سەلمایێ هنگی بچویکەک د زکی دا بوو، و ئەو چاڤەڕێی زەلامێ خۆ ما

حەتا ژ کاروانی بزڤڕت دا د گەل بزڤڕتە مەکەهێ، بەلێ دەمێ کاروانی زڤڕین هاشم د گەل دا نەبوو.. چونکە ئەو ب ڕێڤە مربوو، لەو سەلمایێ بڕیار دا ل مالبابا خۆ بمینت و نەزڤڕتە مەکەهێ. و ل مالبابا وێ کوڕێ وێ عەبدلموطەلب هاتە سەر دنیایێ، و ئەو ل نک خالێن خۆ مەزن بوو، حەتا گەهشتییە حەفت سالییێ، هنگی مامێ وی موطەلب چوویێ و ئەو زڤڕاندە مەکەهێ.

ئەڤە بەری نوکە مە گۆتبوو، مەعنا خال و خوارزایینی د ناڤبەرا مالباتا پێغەمبەری و بابکەکێ خەزرەجییان دا هەبوو، و ئاشکەرایە کو بابێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەبدللاه ل نک خالێن بابێ خۆ یێن خەزرەجی مربوو، و قەبرێ وی ل نک وان بوو، و دەمێ پێغەمبەر یێ شەش سالی ئەو د گەل دەیکا خۆ چووبوو یەثربێ و نێزیکی هەیڤەکێ مابوو ل وێرێ، و ل دەمێ زڤڕینا وان دەیکا وی ب ڕێکێ ڤە مربوو.

مە دڤێت ڤێ بێژین؛ دا ل بیرا مە بێتە ڤە کو مرۆڤاینی ئەوا د تەرازییا پەیوەندییێن جڤاکی دا هزر بۆ دئێتەکرن د ناڤبەرا پێغەمبەری و خەلکێ مەدینێ دا هەبوو.

## صەحابێ مشەخت دبنە یەثربێ:

پشتی مصعەب زڤڕییە مەکەهێ، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ئاگەهدارکری کو ئیسلام ب ڕەنگەکێ بەرچاڤ ل مەدینێ بەلاڤبوویە، و هژمارەکا مەزن ژ ئەوس و خەزرەجییان یێن هاتینە د ئیسلامێ دا، و ئەو دئامادەنە پێشوازییێ ل موسلمانان بکەن، و پشتەڤانییا وان بکەن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا صەحابییێن خۆ کو ئەو مشەخت ببن و بچنە مەدینێ.

مەخسەد ب مشەختبوونێ ب تنێ ئەو نەبوو موسلمان ژ زولم و زۆرداریيا قورەيشييان رزگار ببن، و بچنە جهەکی بشێن ب ئازادی پەرستنا خودێ ل وێرێ بکەن، بەلکی ئارمانج ژێ ئەو ژی بوو ئەو بناخەیەکێ بۆ دەولەتا ئیسلامێ بدانن، ئەوا دێ بتە بنەکۆک بۆ بەلاڤکرنا رۆناهییا خودێ ل عەردی، و پشتی دەستويری ب مشەختبوونێ ژ لایێ خودێ ڤە بۆ موسلمانان هاتییەدان، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو گەهاندە وان، و ل سالا دوازدێ پشتی هاتنا ئیسلامێ کاروانێ مشەختبوونا بەر ب مەدینێ ڤە دەست پێ کر.

و ئێکەمین کەس ژ مەکەهێ مشەختبووی صەحابییێ پێغەمبەری ئەبوو سەلەمە بوو، ئەوێ بەری هنگی مشەختبوویە حەبەشە، ئەبوو سەلەمە یێ مەخزوومی ژنکا خۆ ئوم سەلەمە د گەل کورێ خۆ یێ زارۆک سەلەمە برن و ب لایێ مەدینێ ڤە چوو، گاڤا مالباتا ژنکا وی هندا کچا ئەبوو ئومەیەیێ مەخزوومی ئەوا ب ناسناڤێ (أم سلمة) دئێتە نیاسین، زانی کو زاڤایێ وان ب مال ڤە دێ مشەخت بت، ئەو چوونە د رێکا وی دا، و گۆتنێ: ئەگەر ئەم نەشێینە تە، ما ئەم نەشێینە ژنکا خۆ ژی؟ ئەم قەبویل ناکەین تو وێ ببەی.. و وان ژنک ژێ ستاند.

ئەبوو سەلەمە چوو، و مرۆڤێن ژنکێ ئەو گرت و نەهێلا د گەل وی بچت، گاڤا مرۆڤێن زەلامی ب ڤێ چەندێ حەسیاین، چوون زارۆکێ خۆ ژ وان ستاند، و گۆتن: مادەم هەوە نەهێلا کچا هەوە د گەل کورێ مە بچت، ئەم ژی قەبویل ناکەین نەڤییێ مە ل نک هەوە بت، ئوم سەلەمە دبێژت: مرۆڤێن من و مرۆڤێن زەلامێ من کورێ من یێ زارۆک کێشا حەتا دەستێ وی خلاندی! پاشی مرۆڤێن ئەبوو سەلەمەی سەلەمە بر، و هەر رۆژ دەیکا وی دەردکەفتە رەخێ بازێری و درووینشتە خوارێ و دکرە گری..

نێزیکی سالەکێ ئەڤە حالێ وێ بوو، حەتا ڕۆژەکێ پسمامەکێ وێ ئەو د ڤی حالی دا دیتی، دلێ وی ما پێڤە لەو چوو نک مرۆڤێن وێ و گۆتێ: کەنگی هوین دێ رەحمێ ب ڤێ ژارێ بەن؟ هەوە ئەو و زەلامێ وێ و کوڕێ وێ ژێکڤەکرن. هنگی دلێ وان ما ب من ڤە، و کوڕێ من بۆ من زڤڕاند و گۆتنە من: هەرە بگەهە زەلامێ خۆ.

مەعنا ئێکەمین صەحابی ژ مەکەهێ مشەختبوویە مەدینێ ئەبوو سەلەمە بوو، و پشتی وی عامرێ کوڕێ رەبیعەیی د گەل ژنکا خۆ لەیلایا کچا ئەبوو حەثمەیی -و ئەو ئێکەمین ژنە مشەختبوویە مەدینێ- ئەو ژی چوون، و پشتی وان هێدی هێدی و ب ڕەنگەکێ ڤەشارتی صەحابی ژ مەکەهێ دەرکەفتن و قەستا مەدینێ کرن.. و مە گۆت: یەثرب -یان مەدینە وەکی پشتی هنگی هاتییە نیاسین- ل وێ دەمی بازێڕەکێ ب سەرک ڤە نەبوو، بەلکی ئەو هژمارەکا تاخێن ژێکجودا بوو، ل هەر تاخەکی بابکەک ژ ئویجاخا ئەوسی یان خەزرەجی لێ دژیان، و ئەو پتریا وان صەحابییێن گەهشتینە مەدینێ ل گوندێ (قوبائێ) ئاکنجی بوون، و هنگی ئەو گوندەک بوو دکەفتە باشوورێ مەدینێ، و ل وێرێ سالمێ مەولایێ ئەبوو حوذەیفەی نڤێژ ل بەرا وان دکر.

گاڤا موسلمان ب نەپەنی ژ مەکەهێ دەرکەفتین، و چووینە مەدینێ، کافر ب چوونا وان حەسیان، لەو وان کەرب و کینا خۆ ل سەر موسلمانێن مایی دژوارتر لێ کر، و هندی ژێ هاتی نەخۆشی زێدەتر گەهاندێ، بەلێ دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو مەکەه ژ موسلمانان هەمییان ڤالا بوو، هژمارەکا کێم یا صەحابییان تێ نەبت، ئەو ژی ئەو بوون یێن عوزرەکێ ئەو گرێداین، و نەشیاین دەرکەڤن.

هەر وەسا ژ وان يێن ماين پێغەمبەر بوو -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێ وی يێ نێزيک ئەبوو بەکر و پسمامێ وی عەلی.. پێغەمبەر چونکی هێشتا خودێ دەستويری نەدابوويێ، و ئەبوو بەکر و عەلی چونکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ بەر ئارمانجەکێ گۆتبوويێ نەچن، وەکی دێ بۆ مە ئاشکەرا بت.

## خەلکێ مەدینێ
## و (بیعة العقبة) یا دویێ

دەمێ موسلمانان قستا مەدینێ کری، و هژمارەکا مەزن ژ وان ل وێرێ کۆمبووین، دەنگ و باس دگەهشتنە وان کو کافر رۆژ بۆ رۆژێ حالێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ێ نەخۆشتر لێ دکەن، لەو موسلمانێن خەلکێ مەدینێ گۆتنە ئێک و دو: حەتا کەنگی ئەم دێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هێلینە د ڤی حالی دا، کافر نەخۆشییێ بگەهیننێ؟

پاشی بریارا وان بۆ ئەو ل سالا دوازدێ (ژ هنارتنا ئیسلامێ) ل دەمێ حەجێ ئەو ب هێجەتا کرنا حەجێ بچنە مەکەهێ، و ب دزی ڤە خۆ بگەهیننە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و داخوازێ ژێ بکەن کو ئەو ژی بێتە مەدینێ، و بەرهەڤییا خۆ بۆ وی ئاشکەرا بکەن کو هەر تشتەکێ وی بڤێت ئەو دێ بۆ وی کەن.

**بەیعەتا عەقەبێ یا دویێ:**

حەجییێن مەدینێ کو گەلەک ژێ هێشتا کافر بوون، گەهشتنە مەکەهێ، و د ناڤ وان دا پتر ژ حەفتێ مرۆڤان دموسلمان بوون، پشتی ئەو ب کار و بارێن حەجێ رابووین، هندەک موسلمانان ژ وان خۆ گەهاندە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا ژڤانەکی ژێ وەربگرن کو ئەو ئێک و دو ببینن، و ژڤانێ وان هەر ل دەرێ وی گەلی بوو ئەوێ دکەفتە پێشییا مینایێ ژ لایێ مەکەهێ ڤە، ل نێزیکی وی جهی یێ رەجما شەیطانی لێ دئێتەکرن.. و ژ ڤانێ وان نیڤا شەڤا سێزدێ بوو ژ هەیڤا (ذو الحجة) دەمێ حەجی دمیننە ل مینایێ.

ل دەمێ ژڤانی حەفتێ و سێ زەلامـان د گـەل دو ژنكـان ژ موسلمانێن خـەلكێ مـەدینێ، كـو پتـر ژ دو پشـكێن وان خـەزرەجی بـوون، و نێزیكـی پشـكەكێ ئەوسـی بـوون، خۆ ژ كـافرێن ملـلەتێ خۆ ڤـەدزی و ل نیڤـا شـەڤێ چوونە جهێ ژڤانی، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گـەل مـامێ خۆ عەبباسـی ئـەو ژی هاتنـە وی جهـی. عـەبباس هنگـی یێ كـافر بـوو، بـەلێ ئـەو د گـەل برازایێ خۆ هاتـە ژڤـانی؛ دا خـەلكێ مـەدینێ وە هزر نەكـەن كو ئـەو یێ بێ خودانە، و چو مرۆڤێن وی پشتا وی ناگرن.

ئێكەمین كەس ئاخفتی عەبباس بوو، عەبباسی گۆتـە وان: هـوین دزانـن جهێ موحەممـەدی د نـاڤ مـە دا چەنـدە، ئـەم ل ڤێـرێ یێ بـەرەڤانییێ ژ وی دكـەین، و ئـەم نـاهێلین كـەس چـو نەخۆشـییێ بگەهینتـە وی، بـەلێ ئـەو حـەز دكـەت بێتـە نـك هـەوە، ڤێجـا ئەگـەر هـوین د خـۆ ڕا نـەبینن كـو دێ شـێن بەرەڤانییێ ژێ كەن، هەر ژ نوكە وی بهێلن.

وان گۆت: یا تە مە گوهـ لێ بوو، ئەی پێغەمبەرێ خودێ، تو باخڤـە، و بێژە كانێ تە چ ژ مە دڤێت، و خودایێ تە چ دڤێت؟

پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- هندەك ژ قورئـانێ بـۆ وان خواند، پاشـی گۆت: ئەز دخوازم هوین پەیمانێ بدەنە من كو هـوین بـەرەڤانییێ ژ مـن بكـەن ئەگەر ئەز هاتمە نـك هـەوە وەكـی كـو هـوین بـەرەڤانییێ ژ ژن و عـەیالێ خۆ دكەن.

بەررائێ كوڕێ مەعروورى ڕابـوو چـوو دەسـتـێ وی و گۆت: بەلـێ سـویند ب وی یێ تو ب حەقییێ هنارتی ئەم دێ وەسا بەرەڤانییێ ژ تـە كـەین كـانێ چاوا ئەم بەرەڤانییێ ژ خۆ دكەین، ڤێجا تو ئەی پێغەمبەرێ خودێ بەیعێ بدە مـە، چـونكی ب خـودێ ئـەم زەلامـێن شـەڕی و چەكینـە، مـە ئـەو ژ بـاب و باپیران وەرگرتییە.

ئـەبوو هەیثــەمێ کـورێ تـەییهانی گۆتنـا وی بـڕی، و گـۆت: ئـەی پێغەمبەرێ خودێ، د ناڤبەرا مـە و جوهییـان دا پـەیمان هەنـە، و ئـەم دێ وان پەیمانان بڕین، ڤێجا ئەگەر مە وە کر پاشی خودایێ تـە تـو ب سەرئێخسـتی، نە کو تو بزڤڕییە نک مرۆڤێن خۆ و مە بهێلی؟

پێغەمبەر -سلاڤ لـێ بـن- گرنژی و گۆت: نـە.. خـوین ب خوینێیـە، و مـرن ب مرنـێ، ئـەز ژ هەوەمـە و هـوین ژ مـنن، ئـەز دێ شـەڕێ وی کـەم یـێ هوین شەڕێ وی دکەن، و دێ ژ وی ئاشت بم یێ هوین ژێ ئاشت دبن.

هنگـی زەلامـەکێ خـەزرەجی (ئەسـعەدێ کـوڕێ زورارەی، یـان عـەبباسـێ کوڕێ عوبادەی) ڕابوو ڤە و گۆتە مللەتێ خۆ: گـەلی خـەلکێ یـەثربێ، لـەزێ نەکەن، هوین دزانن هوین یێ پەیمانێ ل سەر چ ددەنە ڤی مرۆڤی؟ هـوین یـێ پەیمانێ ددەنێ کو شەڕێ مرۆڤێن سۆر و ڕەش بکەن، ڤێجا ئەگـەر هـوین ئـەو بن یێن کو گرفتاری هەوە سست دکەن، هەر ژ ڤێ گاڤێ پـەیمانێ نـەدەنێ، دا شەرمزارییا دین و دنیـایێ نەئێتـە ڕێکـا هـەوە، ژ خۆ ئەگـەر هـوین خۆ ل بـەر کـوشـتـنـێ و مـال تالانکرنێ بگرن، هـوین وی ببەنـە نـک خـۆ، چـونکی ئـەز ب خودێ کەمە خێرا دین و دنیایێ یا د گەل وی.

وان گۆت: ئەم دئامادەینە هەچییا بێتە سەرێ مە بلا بێت.

پاشی وان گۆت: ئـەی پێغەمبـەرێ خـودێ، ئەگـەر مـە سـۆزا خۆ ب جهـ ئینا دێ چ گەهتە مە؟

وی گۆت: بەحەشت.

هنگی هەمی چوونە دەستێ وی و بەیعە دایێ، ب تنێ هەردو ژنک تـێ نەبن، بەیعـەتا وان بـەس ب دەڤـی بـوو؛ چونکی پێغـەمبـەر -سلاڤ لـێ بـن- نەدچوو دەستێ ژنکان.

پاشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: هوین دوازدە مرۆڤان ژ خۆ هلبژێرن؛ دا کارێ مللەتێ وان د دەستێ وان دا بت.

و ئەڤ دوازدە زەلام ئەون یێن دبێژنێ: (النقباء)، نەهـ ژێ خەزرەجی بوون، و سێ ئەوسی بوون، ژ بەر کو خەزرەجی د ناڤ ئامادەبوویان دا پتر بوون، ئەو شێست و دو زەلام بوون، و ئەوسی ب تنێ یازدە بوون، و یێن دی خەزرەجی بوون، و ئەو نەقیب ژێ ئەڤە بوون:

ژ خەزرەجییان: ئەسعەدێ کورێ زورارەی، سەعدێ کورێ رەبیعی ل ئوحودێ هاتە کوشتن، عەبدللاهێ کورێ رەواحەی ل موئتە هاتبوو کوشتن، رافعێ کورێ مالکی، بەررائێ کورێ مەعروری، عەبدللاهێ کورێ عەمری ل ئوحودێ هاتبوو کوشتن، عوبادەیێ کورێ صامتی، سەعدێ کورێ عوبادەی، مونذرێ کورێ عەمری ل شەرێ بئرمەعوونە هاتبوو کوشتن.

و ژ ئەوسییان: ئوسەیدێ کورێ حوضەیری، سەعدێ کورێ خەیثەمە ل بەدرێ هاتبوو کوشتن، روفاعەیێ کورێ عەبدلمونذری.

و پشتی بەیعە ب دووماهی هاتی، موسلمانێن خەلکێ مەدینێ زڤرینە وی جهی یێ مرۆڤێن وان یێن کافر لێ دنڤستی، بێی ئەو ب چوون و هاتنا وان بحەسیێن.

و سەرژمارەک ل دۆر ڤان صەحابییان ژ ئەنصارییان ئەوێن ل ڤێ شەڤێ پەیمان دایە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مرۆڤی ئاشکەرا دکەت کو سیهـ و سێ کەس ژ وان د هەمی شەڕان دا د گەل پێغەمبەری بوون -سلاڤ لێ بن-، و نێزیکی حەفتێ ژ وان د شەڕێ بەدرێ دا دئامادە بوون، و پتر ژ بیست ژ وان د جیهادێ دا شەهید بووبوون.. مەعنا: ئەو د پەیمانا خۆ دا د گەل خودێ و پێغەمبەرێ وی دڕاستگۆ بوون.

### هەلویستێ كافرێن مەكەهێ:

هەر چەندە موسلمانێن خەلكێ مەدینێ ب شەڤ و دویر ژ چاڤێن خەلكی بەیعە دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، لێ دیارە ژ بەر هژمارا وان یا زێدە و دەركەفتنا وان یا ل نیڤا شەڤێ، و كۆمبوونا وان ل جهەكی ژ عەقەبەیا مینایێ، كو گەلەك حەجی لێ دمینن، بوو جهێ گومانێ ل نك كافران، لەو رۆژا د دویڤ دا كۆمەك ژ كافرێن قورەیشییان چوونە نك حەجییێن مەدینێ، و گۆتنێ: چكچكەك مە ژ هەوە گوهـ لێ بوویە، كو هەوە بەیعە و پەیمان یا دایە موحەممەدی.. و تشتەكێ غەریب نینە كو وان ب هویری زێرەڤانی ل حەجییێن خەلكێ مەدینێ و هاتن و چوونێن وان كریت، چونكی سالا بەری هنگی هندەك زەلامان ژ خەلكێ مەدینێ بەیعە دا بوو پێغەمبەری، و پێغەمبەری مصعەب هنارتبوو نك وان، و گەهشتبوو وان كو گەلەك ژ خەلكێ مەدینێ یێن چووینە سەر دینێ موحەممەدی، و هژمارەكا مەزن ژ هەڤال و دویكەفتییێن موحەممەدی ب فەرمانا وی یێن مشەختبووینە باژێرێ وان.. ڤێ چەندێ گومان ل نك كافرێن مەكەهێ پەیدا كربوو، لەو دبت وان ب رەنگەكێ تایبەت دویچوونا سەح و سوییێن وان كریت، و گاڤا هندەك كافرێن مەكەهێ هاتینە نك حەجییێن مەدینێ و پسیارا وی تشتی ژێ كری یا د ناڤبەرا وان و موحەممەدی دا چێبووی، ئەوێن كافر ژ وان، و وان ئاگەهـ ژ وی تشتی نەبوو یێ شەڤا بەری هنگی چێبووی، چونكی ئەو دنڤستی بوون، وان سویند بۆ كافرێن قورەیشییان خوار كو تشتەكێ وەسا چێ نەبوویە، و یێن موسلمان ژ وان خۆ بێ دەنگ كر.

هنگی ئەو زڤرینە ڤە بێی تشتەك ژ زانینان ب دەست وان بكەڤت.. بەلێ د گەل هندێ ژی وان ب تمامی باوەر ژ گۆتنا وان نەكر، لەو وان بەردەوام دویچوونا مەسەلێ كر، حەتا بۆ وان مسۆگەر بووی كو وان پەیمان یا

دایە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، هنگی ئەو ب دویڤ وان دەرکەفتن، بەلێ هنگی ئەو ژ مەکەهێ دەرکەفتبوون و چووبوون، ب تنێ دو کەس ژ وان ل نێزیکی مەکەهێ مابوون، ئەو ژی سەعدێ کورێ عوبادەی و مونذرێ کورێ عەمری بوون، مونذر شیا برەڤت و ئەو ڤێرا نەگەهشتن، بەلێ وان سەعد گرت و ئینا مەکەهێ، بەلێ دو زەلامان ژ کافرێن مەکەهێ بەختێ خۆ دا وی و نەهێلا کافر چو لێ بکەن؛ چونکی وی ژی پشتەڤانییا وان دکر دەمێ بازرگانییا وان د مەدینێ را دەرباس دبوو.

# مشه‌ختبوونا پێغه‌مبه‌ری
# -سلاڤ لێ بن-

باراپتر ژ صه‌حابییان د ناڤبه‌را به‌یعا عه‌قه‌به‌یێ یا ئێکێ و دوییێ دا، یه‌عنی: ل سالا دوازدێ پشتی هاتنا ئیسلامێ، ژ مه‌که‌هێ مشه‌ختبوونه مه‌دینێ، پشتی پێغه‌مبه‌ری -سلاڤ لێ بن- ده‌ستویری ب وێ چه‌ندێ دایێ، و هژماره‌کا گه‌له‌کا کێم ژ وان مابوون، ژ به‌ر هنده‌ک ئه‌گه‌رێن تایبه‌ت، و پشتی به‌یعا عه‌قه‌بێ یا دوییێ ل نیڤا هه‌یڤا یازدێ ژ سالا دوازدێ چێبووی، پێغه‌مبه‌ری ب خۆ ژی دل تێ هه‌بوو مشه‌خت ببت، به‌لێ ژ به‌ر کو ده‌ستویری ب وێ چه‌ندێ ژ لایێ خودێ ڤه هێشتا بۆ نه‌هاتبوو دان، ئه‌و ما.. وه‌کی وی گه‌میڤانێ شه‌ریف ئه‌وێ ده‌مێ گه‌مییا وی دکه‌فته به‌ر پێلێن دژوار، ڤێجا ئه‌و خۆ ل سه‌ر پشتا گه‌مییێ بگرت، حه‌تا ببینت هه‌می رێڤنگ قورتال بوون، و وه‌کی وی شڤانێ ئه‌مین یێ ل ده‌راڤێ ته‌نگ خۆ دگرت حه‌تا پشتڕاست ببت کو په‌زه‌کا ب تنێ ژی نه‌ڤه‌ڕستییه.. موحه‌ممه‌د -سلاڤ لێ بن- ژ مه‌که‌هێ ده‌رنه‌که‌ڤت، هه‌ر چه‌نده وی دزانی کو مانا وی ل مه‌که‌هێ پشتی ده‌رکه‌فتنا هه‌ڤالێن وی خه‌طه‌رێ پتر ل سه‌ر وی دژوار دکه‌ت.. به‌لێ وی سنگێ خۆ بۆ ڤێ خه‌طه‌رێ ڤه‌کر، و پاشڤه نه‌چوو!

و ده‌م گه‌له‌ک پێڤه نه‌چوو پشتی به‌یعا عه‌قه‌به‌یێ یا دوییێ ده‌ستویری ژ لایێ خودێ ڤه بۆ وی هاته‌دان کو ئه‌و ژی قه‌ستا مه‌دینێ بکه‌ت..

**به‌رێ ده‌رکه‌فتنێ**:

نێزیکی دو هه‌یڤ و نیڤان پشتی به‌یعا عه‌قه‌به‌یێ یا دوییێ پێغه‌مبه‌ر -سلاڤ لێ بن- ما ل مه‌که‌هێ، و ئه‌ڤ ده‌مه ژ هه‌ر ده‌مه‌کێ دی ل سه‌ر وی

پتر یێ خەطـەر و دژوار بـوو؛ چونکی کـافرێن مەکـەهێ زانیبـوو کـو خـەلکێ مەدینێ ژ ئەوس و خەزرەجییان پەیمان یـا دایـە وی کـو ئـەو وی بحـەوینن، و پشتەڤانییێ لێ بکەن، و هـەڤالێن وی ژی هـەمییان مـال و حـال و خـانی و مرۆڤێن خۆ یێن هێلاین و چووینە مەدینێ.. مەعنا دبت ل هـەر دەمـەکی ئـەو ژی بچـت بگەهتـە هـەڤالێن خـۆ یـێن مشـەخت و پشـتەڤانێن خـۆ ژ خـەلکێ مەدینێ، و موسـلمانبوونا خـەلکێ مـەدینێ گەفـەکا دژوارا دینـی و سیاسـی و ئابۆرییـە بـۆ وان، چونکی ئـەو دزانن دەمێ موسلمان ل بـەر تەنشـتا وان و د رێکا کاروانێ وان یێ بازرگانییێ دا بنەکۆکەکێ بۆ خۆ ددانن، و دەولـەتەکێ ئاڤا کەن، مەعنا وێ ئەوە گەف ژ هەمی لایان ڤـە دێ ل وان ئێتـەکرن، ڤێجا ئەو چ بکەن؟ و چ پێگاڤێ بهاڤێژن بەری ئەڤ گەفە ل وان بێتەکرن؟

## بڕیارا کافرێن مەکەهێ:

د قورئانا پیرۆز دا ئایەتەک هەیە تێدا هاتییـە: ﴿وَإِذۡ يَمۡكُـرُ بِـكَ ٱلَّذِيـنَ كَفَرُواْ لِيُثۡبِتُوكَ أَوۡ يَقۡتُلُوكَ أَوۡ يُخۡرِجُوكَۚ وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِـرِينَ ٣٠﴾ (الأنفال: ٣٠) د ڤێ ئایەتێ دا خودایێ مەزن بیرا پێغەمبـەری -سـلاڤ لێ بن- ل نعمەتەکێ دئینتە ڤە یا وی د گەل وی کری و دبێژتێ: تو بینە بیرا خۆ دەمێ کافرێن مللەتێ تە ل (مەکەهێ) پیلان د دەرحەقا تە دا دگێـڕان؛ دا ئەو تـە بگـرن، یـان بکـوژن، یـان ژی تـە ژ بـاژێرێ تـە دەربـێخن.. وان پـیلان دژی تـە دگێـڕان، بـەلێ خـودێ پیلانـێن وان ب سـەرێ وان دا شـکاندن، و دژواریا ڤێ چەندێ ل سەر وان زێدەتر بـوو، وئەگـەر ئـەو ب نەحـەقیێ پیلانـێ بگێڕن، خودێ وێ ب حەقیێ دگێڕت.

ئیمام ئەحمەد ژ ئبن عەبباسی ڤەدگوهێزت دبێژت: شەڤەکێ قورەیشـییان دان و ستاندن کر کانێ ئەو چ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەن؟ هنـدەکان گـۆت: ئـەم دێ وی ب وەریسـان گرێـدەین، و هنـدەکان گـۆت: دێ کـوژین، و

هندەکان گـۆت: دێ وی ژ بـاژێـڕێ خۆ دەرێخین. ئینا خودێ پێغەمبەرێ خۆ -سلاڤ لێ بن- ب پـیلانا وان ئاگەهدار کر، لەو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل سەر جهێ خۆ نەنڤست، بەلکی عەلی هێلا ل جهێ خۆ و ئەو دەرکەفتە شکەفتێ..

ئەڤ پیلانا وان بوو ئەگەرا ئێکسەر بۆ دەرکەفتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ مەکەهێ و مشەختبوونا وی بۆ مەدینێ.

و د هندەک کتێبێن سیرەتێ دا بەحسێ ڤێ پیلانا وان ب بەرفرەهی دئێتەکرن، دبێژن: ئەو ل (دار الندوة) ل نێزیکی کەعبێ کۆمبوون، (و هندەک دبێژن: شەیطانی خۆ ئینابوو سەر شکلێ زەلامەکێ نەجدی، و ل دیوانا وان ئامادە بووبوو) و پشتی هندەکان گۆتی: ئەم دێ وی زنجیر کەین و گرین، و هندەکێن دی گۆتی: ئەم دێ وی دەرێخین و ئەو کیڤە دچت بلا بچت، ئەبوو جەهلی (یان زەلامێ نەجدی) گۆت: یا باشتر ئەوە ئەم وی بکوژین؛ دا بەلا وی ئێکجار ژ مە ڤەببت!

پاشی دەمێ هندەکان بیرا وان ل مالباتا عەبدمنافی ئینایە ڤە و کو ئەو ڤێ چەندێ قەبویل ناکەن، ئەبوو جەهلی گۆت: ئەم دێ ژ ناڤ هەر بابکەکێ قورەیشییان جحێلەکی هلبژێرین، دا ب کارێ کوشتنا وی ڕابن، و هنگی مالباتا عەبدمەنافی نەشێت نەیارەتییا قورەیشییان هەمییان بکەت، و هۆسا خوینا وی دێ د ناڤ مە دا بەلاڤ بت..

گاڤا زەلامێن ئامادە گوهـ ل گۆتنا وی بووی، وان گۆتێ: تو ڕاست دبێژی، و ئەم دێ ب گۆتنا تە کەین.

بەلێ زانایێن حەدیسێ و سیرەتێ دبێژن: هەر چەندە ئەڤ مەسەلە د کتێبێن سیرەتێ دا یا بەلاڤە ژی بەلێ ئەو ب ڕێکێن دورست نەهاتییە ڤەگوهاستن، لەو مرۆڤ نەشێت خۆ ژێ پشتڕاست بکەت.. بەلکی هندەک

ژ وان کربته دلێ خۆ کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بگرن یان بکوژن یان دەربێخن، وەکی ئایەت ئیشارەتێ ددەتێ، بەلێ مسەلا هلبژارتنا جحێلان و چوونا وان بۆ بەر دەرگەهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب شەڤێ، و نڤستنا عەلی ل جهێ وی.. ئەڤە چو دەلیلێن مرۆڤ ژێ پشتڕاست بت ل سەر نینن.

## ڕۆژا دووماهییێ ل مەکەهێ:

پتر ژ جارەکێ ئەبوو بەکری داخواز ژ پێغەمبەری کربوو ئەو دەستویرییا وی بدەت کو ئەو ژی وەکی صەحابییێن دی مشەخت ببت و بچتە مەدینێ، بەلێ هەر جار پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دگۆتێ: بێنا خۆ فرەهـ بکە، بەلکی خودێ هەڤالەکی بۆ تە چێ کەت. ئەبوو بەکری ژ ڤێ گۆتنا وی وە تێ دگەهشت کو ئەوی بەحسێ خۆیە، لەو هەر ژ هنگی ئەبوو بەکری دو دەوارێن باش بۆ ڤێ چەندێ ئامادە کربوون، و بەرێ وی لێ بوو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ڕۆژەکێ فەرمانا دەرکەفتنێ لێ بکەت.. و وەسا چێبوو، عائیشا -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: هەر ڕۆژ جارەکێ -سپێدێ یان ئێڤاری- پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دهاتە مالا ئەبوو بەکری، حەتا ئەو ڕۆژ هاتی یا دەستویری ب مشەختبوون و دەرکەفتنا ژ مەکەهێ تێدا بۆ وی هاتییەدان، ئەو نیڤرۆ هاتە مالا مە، ل دەمەکێ وەسا یێ چو چاران ئەو تێدا نەدهات، گاڤا ئەبوو بەکری ئەو دیتی، گۆت: تشتەکێ هەی لەو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل ڤی دەمی یێ هاتی.. و گاڤا ئەو هاتییە د مال ڤە، ئەبوو بەکری جهێ خۆ دایێ، و ئەز و خویشکا خۆ ئەسماء ب تنێ ل وێرێ بووین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بلا ئەز و تو بمینینە ب تنێ، ئەبوو بەکری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەو هەردو کچێن منن، هەما کانێ تە چ دڤێت بێژە. وی گۆت: دەستویری ب دەرکەفتنێ و مشەختبوونێ

بۆ من هاتەدان. ئەبوو بەکری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەم دێ هەڤالێن ئێک بین؟ وی گۆت: دێ هەڤالێن ئێک بین!

عائیشا دبێژت: ب خودێ بەری وێ ڕۆژێ من نەدزانی کو ئێک ژ کەیفان دا دکەتە گری، حەتا من ئەبوو بەکر دیتی ژ کەیفان دا کرییە گری، پاشی وی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، دو دەوار من بۆ ڤێ ڕۆژێ یێن ئامادە کرین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: یا من ب حەقێ خۆیە!

عائیشا دبێژت: ئینا مە بەرهەڤییەکا ب لەز بۆ وان کر، و مە هندەک خوارن بۆ وان کرە د مێدەکەکێ دا، و ئەسمائێ شیتکا خۆ کرە دو قەد، قەدەک د پشتا خۆ ئالاند و قەدا دی مێدەک پێ گرێدا، لەو دبێژنێ: خودانا دو شیتکان، پاشی پێغەمبەر سلاڤ لێ بن و ئەبوو بەکر چوونە شکەفتا چیایێ (ثەور)..

## دەسپێکا دەرکەفتنا وان کەنگی و ژ کیڤە بوو؟

ریوایەتا بوخاری ژ عائیشایێ ئەوا مە هندەک ژێ ڤەگوهاستی بۆ مە ئاشکەرا دکەت کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نیڤرۆ چوو مالا ئەبوو بەکری، و وان ب لەز کارێ وان کر، و ئەو ژ دەرگەهەکێ نە یێ بەرچاڤ کو دکەفتە پشتا مالا ئەبوو بەکری دەرکەفتن، و چوونە شکەفتێ، و سێ ڕۆژان مانە ل وێرێ.

مەعنا: دەسپێکا دەرکەفتنا وان ل نیڤرۆ بوو، و ژ مالا ئەبوو بەکری بوو.. هۆسا ژ وێ ریوایەتێ دئێتە وەرگرتن، یا بوخاری ژ عائیشایێ ڤەگوهاستی.

ژ بلی ڤێ ریوایەتێ، ریوایەتەکا دی یا مەشهوورتر ل نک ڤەگێڕێن سیرەتێ هەیە، بەلێ ئەو ب ڕێکێن دورست نەهاتییە ڤەگوهاستن، لەو مرۆڤ نەشێت خۆ ژێ پشتڕاست کەت، ئەو ژی ئەوە یا (ئبن ئیسحاق) د سیرەتێ

دا ڤـەدگوهێزت، کـو ب شـەڤێ هژمارەکـا جحێلـێن قورەیشـی ل دویـڤ وێ پیلانێ یا ئەبوو جەهلی دانای، و ب ئنیـەتا کوشتنا پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- ل بـەر دەرێ وی بەرهـەڤ بوویـوون، و ل دەمـەکێ شـەڤێ ئـەو ژ مـال دەرکەفت دەستێ خۆ تژی ئاخ کر و ب سەر و چاڤێن وان وەرکر، چاڤێن وان پێ تاری بوون، و ئەو د بەر وان ڕا دەرباس بوو و چوو بێی ئەو وی ببینن، و هنگی وی دەسپێکا سوورەتا (یاسینێ) خواند حەتا گەهشـتییە ڤـێ ئایـەتێ:

﴿ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ ﴾

(یس: ٩) یـەعنی: مـە ل بـەراهییا وان و ل پشـت وان ژی پەرژانـەک دانـا، ڤێجا ئەو وەکی وی لێ هاتن یێ ل بەر و پشـت ڕێ لـێ هاتییـەگرتن، و مـە چاڤێن وان کۆرە کرن، لەو ئەو چو نابینن.

و پشتی هنگی ب دەمەکی وان ئاگەهـ ژ خۆ بوو، و دەمێ ئـەو چووینـە د مالا وی ڤە؛ دا وی بکوژن، وان دیت ئەو یێ ل سەر جهێ خۆ، بەلێ گاڤا وان پاتە ژ سەر وی هلدای وان دیت عەلییێ کوڕێ ئەبوو طـالبی یێ ل جهێ وی رازایە، وان گۆتە عەلی: کانێ موحەممەد؟ وی گۆت: ئەز نزانم..

ژ ڤـێ ریوایـەتێ دئێتـە وەرگرتن کـو دەرکـەفتنا پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بن- ب شەڤ بوو، و ئەو ژ مالا خۆ دەرکەفتبوو، و ئەبوو بەکر ژ مـالا خـۆ، و پـشـتـی هنگی ئەو گەهشتنە ئێک و چوونە شکەفتێ. بـەلێ ئـەڤ ریوایەتـە ژ بلی کو (سەنەدا) وێ یـا دورست نینـە، ئـەو دژی وێ ریوایـەتا دورسـتە یـا بوخاری ڤەگوهاستی.

### ل شەکفتا ثەور:

ل باشوورێ مزگەفتا حەرام ب دویراتییا چار کیلۆمتران، چیایەکـە هەیـە دبێژنێ: (چیایێ ثەور) چونکی شکێ وی ژ لایێ باشوورێ ڤـە وەکـی سـەرێ گایەکییە، بلندییا وی (٤٥٨) مترە، و ڕەنگێ وی نێزیکە یێ گرۆڤـر بت، و

فرەهییا وی دەهـ کیلۆمترێن چارگۆشەیە، و ل سەرێ وی شکەفتەکا بچویک هەیە فرەهییا وێ سێ متر و نیڤە و پانییا وێ ژی هەر وەسا، و بلندییا وێ مترەک و چارێکەکە، و دو دەر لێ هەنە ئێک ل لایێ رۆژهەلاتێ، و ئەڤە فرەهترە، و یێ دی ل لایێ رۆژئاڤایێ، و ئەڤە تەنگترە و حەتا مرۆڤ بشێت ژێ دەرباس ببت دڤێت خۆ بچەمینت و ل سەر زکی بچت، و ئەڤ دەرە بوو یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێرا چوویە د شکەفتێ ڤە، و ب سەرکەفتنا ڤی چیایی کارەکێ ب ساناهی نینە، نێزیکی سەعەت و نیڤان پێڤە دچت حەتا مرۆڤ دگەهتە شکەفتێ.

ئەڤ شکەفتەیە یا بەحسێ وێ د ڤێ ئایەتێ دا هاتی: ﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَـٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ۝ ﴾ (التوبة: ٤٠)
یەعنی: ئەگەر هوین د گەل وی دەرنەکەڤنە شەڕی، و پشتەڤانییا وی نەکەن، ب ڕاستی خودێ پشتەڤانییا وی کر و ئەو ب سەرئێخست ڕۆژا کافران ئەو ژ (مەکەهێ) دەرێخستی، و ئەو ئێک ژ دووان بوو (ئەو و ئەبوو بەکر) دەمێ کافران ئەو نەچار کرین قەستا شکەفتێ بکەن، دەمێ وی دگۆتە هەڤالێ خۆ (ئەبوو بەکری) دەمێ وی ترس ژێ دیتی: ب خەم نەکەڤە، هندی خودێیە ب سەرکەفتن و هاریکارییا خۆ یێ د گەل مە، ئینا خودێ تەناهی ب سەر دلێ پێغەمبەرێ خۆ دا -سلاڤ لێ بن- ئینا، و ب هندەک لەشکەرێن چو مرۆڤان ئەو ب چاڤ نەدیتین کو فریشتە بوون هاریکارییا وی کر، و وی پەیڤا ئەوێن کافر بووین کرە یا نزمتر. و پەیڤا خودێیە یا بلند، و خودێ د ملکێ خۆ دا یێ زالە، و د ڕێڤەبرنا کارێن بەنییێن خۆ دا یێ کاربنەجهە.

گاڤا ئەو گەهشتینە بەر دەرێ شکەفتێ، ئەبوو بەکر بەری پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چوو د شکەفتێ ڤە، دا بەرێ خۆ بدەتێ کانێ چو تشتێن خراب ل وێرێ نینن وەکی مار و دوپشکان، پاشی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د دویڤ وی دا چوو.. و ئەو سێ رۆژان ل وێ شکەفتێ مان.

## دەورێ عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی:

مە گۆت: ئێک ژ وان صەحابییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری نەدایێ کو مشەخت ببتە مەدینێ، پسمامێ وی عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی بوو، و ئارمانجا سەرەکی ژ مانا وی ئەو بوو دا ئەو وان ئێمانەتان بۆ خودانان بزڤرینت یێن کو ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ب راستی ئەڤە مەزنی و دەستپاکییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مە ئاشکەرا دکەت، ل وی دەمێ خەلکێ مەکەهێ ژ کافران دگۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تو مرۆڤەکێ سێرەبەند و درەوینی، وان ئێمانەتێن خۆ دبرن ددانانە نک وی؛ دا ئەو وان بپارێزت! ما نە تشتەکێ غەریبە؟! و گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤیای ژ بەر وان ژ مەکەهێ دەرکەڤت، و مشەخت ببت، پێغەمبەری خیانەت ل وان نەکر، و ئێمانەتێن وان ئێک ئێکە بۆ زڤراندن، بەلێ ئەگەر بەری دەرکەفتنێ وی ئەو ئێمانەت بۆ خودانان زڤراندبان، ئەو دا شکێ ژێ بەن کو دیارە وی دڤێت مشەخت ببت، لەو وی دیت یا باشتر ئەوە ئەو پسمامێ خۆ عەلی بهێلت دا عەلی پشتی مشەختبوونا وی ببتە وەکیلێ وی بۆ زڤراندنا ئێمانەتێن خەلکی.

ئەڤە مەزنترین دەرسە بۆ خودان باوەران کو دڤێت ئەو دئەمین بن، و خیانەتێ خۆ ل دوژمنێن خۆ یێن کافر ژی نەکەن.

و مه گۆت کو ریوایەتەکا لاواز ژ لایێ سەنەدێ ڤە هەیە کو ل شەڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەرکەفتی، عەلی ل سەر جهێ وی نڤستبوو؛ دا مەسەلێ ل بەر کافران بەرزە کەت.

## سێ رۆژێن لێگەڕیانێ:

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێ خۆ ئەبوو بەکر ژ بازێڕی دەرکەفتین، و چووینە شکەفتێ، چ ل نیڤرۆ بت ژ مالا ئەبوو بەکری، یان ب شەڤ بت، هەر ئێک ژ مالا خۆ و پشتی هنگی گەهشتبنە ئێک، هەر زوی کافر پێ حسیبان، و وان ب ڤێ چەندێ نەخۆش بوو، و ئێکەمین جهێ وان هزر لێ کری کو بچنێ و تەفتیش بکەن، مالا ئەبوو بەکری بوو.. ئەسمائا کچا ئەبوو بەکری دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و ئەبوو بەکر دەرکەفتین، هندەک قورەیشی هاتنە مالا مە، و ئەبوو جەهل د گەل وان بوو، وان ل بەر دەری پسیار ژ من کر: کانێ بابێ تە؟ من گۆتێ: ئەز نزانم، هنگی ئەبوو جەهلی -و ئەو مرۆڤەکێ پیس و فەحش بوو- دەستێ خۆ بلند کر و شەقەکا وەسا دانا من گوهارک ژ گوهێ من فڕی! پاشی چوون.

ئەڤ کارێ بێخێرێ ئەبوو جەهلی کری نیشانا دلتەنگیا وی بوو ژ دەرکەفتن و چوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەبوو بەکری.

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و ئەبوو بەکر ژ مەکەهێ دەرکەفتین، یا بەرهزر ئەو بوو ئەو ب لایێ باکوورێ ڤە بچن، چونکی مەدینە دکەفتە باکوورێ مەکەهێ، بەلێ تشتێ وان کری ئەو بوو ئەو ب لایێ باشوورێ ڤە چوون، ئەو جهێ ڕێکا یەمەنێ دکەفتێ، و گاڤا کافران زانی ئەو یێ دەرکەفتی، ئێکەمین جار ئەو ب لایێ باکوورێ ڤە چوون، وان هزرکر نوکە پێغەمبەر و ئەبوو بەکر یێ ب لایێ مەدینێ ڤە دچن، و پشتی موغدارەکا درێژ ئەو چووین، و ب هویری لێ گەڕیاین وان چو سەر و شوین بۆ وان

نەدیتن، ل وی دەمی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالێ خۆ شیابوو خۆ ب وی جهێ ئەمین ڕا بگەهینن یێ وان بەری هنگی بۆ خۆ دەسنیشان کری، کو شکەفتا (ثەور) بوو، و خۆ لێ ڤەشێرن.

### سێ ڕۆژێن خۆڤەشارتنێ:

پشتی دەرکەفتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەبوو بەکری ژ مەکەهێ، و گەهشتنا وان بۆ شکەفتا (ثەور)، نەخشەیەکێ ب ڕێک و پێک وان دانابوو، هەر شەڤ دەمێ دنیا تاری دبوو عەبدللاهێ کوڕێ ئەبوو بەکری دهاتە نک وان ل شکەفتێ دەنگ و باسێن بازێری بۆ وان دئینان، و درەنگی شەڤ دزڤڕی مال؛ دا کافر ب هاتن و چوونا وی نەحەسیێن، و ئەبوو بەکری مەولایەک هەبوو دگۆتنێ: عامرێ کوڕێ فەهیرەی، شڤانییا پەزێ ئەبوو بەکری دکر، ئێڤاری وی پەز دئینا و نێزیکی شکەفتێ دکر، و دەمێ دنیا بەر ب تاریبوونێ ڤە دچوو، وی پەز ددۆت و شیر و خوارن بۆ پێغەمبەری و ئەبوو بەکری دبرە شکەفتێ، پاشی پەزێ خۆ دهاژۆت و دزڤڕی مەکەهێ.

د ڤان هەر سێ ڕۆژان دا کافران گەلەک خۆ وەستاند دا تشتەکی ژ وان بزانن، بەلێ ئەو ب سەر چو هل نەبوون، حەتا دوومـاهییێ وان هاریکاری ژ مرۆڤەکی خواست یێ کو شوین پێیان دخوینت و ل دویڤ دچت، ئەڤ زەلامە ل دویڤ شوین پێیێن وان چوو حەتا نێزیکی شکەفتێ بووی، و گۆت: ژ ڤێرێ وێ ڤە چو تشت بۆ من یێ ئاشکەرا نینە!

ئەو ل دەور و بەرێن شکەفتێ گەڕیان، چو نەدیت، چوونە سەر پانێ وێ، و ژ بەر کو ئەو شکەفت ب دورستی شکلێ شکەفتێ نادەت، و پتر وەکی چالەکێ یان کونەکێیە د ناڤ کەڤران ڕا، وان هزر نەکر ئەو یێن چووینە د ناڤ کەڤران ڕا.. و ئەو ب خۆ دەمێ ئەو گەهشتینە سەر بانێ شکەفتێ، ئەگەر وان باش بەرێ خۆ دابا بن پێیێن خۆ ئەو دا وان بینن، بەلێ خودێ

چاڤێن وان تاری کرن و وان بەرێ خۆ نەدا خوارێ.. ل وی دەمی ئەبوو بەکری گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەگەر ئێک ژ وان نوکە بەرێ خۆ بدەتە بن پێیێن خۆ دێ مە بینت! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دلەکێ رحەت ڤە گۆتێ: ئەبوو بەکر! تو چ هزر دکەی بۆ دو کەسان یێ سێیێ د گەل وان خودێ بت؟ و د ریوایەتەکا دی دا هاتییە، گۆتێ: ئەبوو بەکر دەنگی نەکە، ئەم دوینە سێیێ مە خودێیە. و ئایەتا سوورەتا (التوبة) ئەوا بەری نوکە مە ڤەگوهاستی ئەڤ رویدانە بۆ مە تۆمارکرییە، دەمێ دبێژت: ﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ۝ ﴾ و کافر ژ وی جهی زڤرین بێی وان ببینن.

یا ناڤدار د کتێبێن سیرەتێ دا ئەوە کو تەڤنپیرکەکێ تەڤنێ خۆ ب دەرێ شکەفتێ ڤە راچاندبوو، و دو کۆترکێن کیڤی ژی هێلینا خۆ ل وێرێ دانابوو، و گاڤا کافران ئەڤ چەندە دیتی گۆتنە ئێک و دو: ئەگەر ئەو هاتبانە د شکەفتێ ڤە ئەڤ تەڤنە دا خراب بت، و ئەڤ کۆترە نەدمانە ل ڤێرێ. لەوا ئەو زڤرین و نەچوونە د شکەفتێ ڤە.. بەلێ ئەڤ چەندە -وەکی زانایێن حەدیسێ دبێژن- ب رێکێن دورست نەگەهشتییە.

پشکەک ژ وی نەخشەیی یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەبوو بەکری بۆ مشەختبوونا خۆ دانای ئەو بوو، وان مرۆڤەکێ باوەرێ و شارەزا ب رێکێن صەحرائێ ب کرێ بۆ خۆ گرتبوو، و ژڤان دابوویێ کو پشتی سێ رۆژان ئەو وان هەردو دەواران یێن ئەبوو بەکری بەرهەڤکرین د گەل خۆ بینت و بێتە شکەفتێ، دا ئەو دەست ب چوونێ بکەن. و هەر چەندە ئەو زەلام یێ کو دگۆتنێ: عەبدللاهێ کورێ ئورەیقطی، مرۆڤەکێ کافر ژی بوو، بەلێ

چونكی یێ ئەمین و شارەزا بوو بۆ رێكێ پێغەمبەری باوەرییا خۆ پێ ئینا، و هاریكاری ژێ خواست، و نهێنییا خۆ بۆ گۆت.

### دەركەفتن ژ شكەفتێ:

پشتی سێ رۆژان ژ لێگەریانێ، كافر ژ دیتنا وان بێ هیڤی بوون، و ل لێگەریانێ سست بوون، و تشتێ ب وان مای ئەو بوو وان راگەهاند كو هەر كەسەكێ موحەممەدی بۆ مە بگرت، ئەم دێ سەد حێشتران دەینێ.. و ل رۆژا سێیێ دەلیلێ وان عەبدللاهێ كورێ ئورەیقطێ دوئەلی هاتە شكەفتێ و هەر دو دەوار بۆ پێغەمبەری و هەڤالێ وی ئینان، و دەست ب مشەختبوونێ كر، و ژ بلی وان هەر سێیان، مەولایێ ئەبوو بەكری عامرێ كورێ فەهیرەی ژی د گەل وان دەركەفت، و ب ڤی رەنگی ئەو بوونە چار كەس، و دەلیلێ وان ئەو ل وێ رێكێ نەبرن یا خەلك لێ دئێن و دچن؛ دا كەس وان نەبینت، بەلكی د رێكەكا دی را ئەو برن، یا كو نوكە ب رێكا مشەختبوونێ دئێتە ناڤكرن.

ل سەری ئەو ب لایێ باشوورێ مەكەهێ ڤە چوون، پاشی وان رێكا خۆ گوهارت و ب سەمتا دەریایێ ڤە چوون كو دكەفتە باكوورێ رۆژئاڤایێ، پاشی ب لایێ رۆژهەلاتێ ڤە چوون حەتا گەهشتینە عوسفانێ، پاشی جوحفە، و دەمێ ئەو گەهشتینە (رابغ ئەررەمل) ئەو ژ بن دەسهەلاتا قورەیشییان دەركەفتن، و ئێدی پشتراست بوون، و لەز ل چوونێ نەكر، حەتا ئەو گەهشتینە دەڤەرا مەدینێ.

### ب رێ ڤە:

كتێبێن سیرەتێ دو سەرهاتییێن بەرچاڤ د وەغەرا مشەختبوونێ دا بۆ مە ڤەدگێرن، كو ب رێڤە چێبووینە، ئێك ژ وان سەرهاتییا (ئوم مەعبەدە) ئەوا ل دەڤەرا (قودەید)ێ ل باكوور مەكەهێ چێبووی، ل وی جهێ ئویجاخا

خوزاعییان لێ دئاکنجی، دبێژن: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەر سێ هەڤالێن رێکێ گەهشتینە ڤێ دەڤەرێ، وان هەست ب برسێ کر، لەو وان چاڤێ خۆ لێ گێرا کانێ دێ کەسەکی بینن تشتەکی بۆ خۆ ژێ بکڕن یان نە، و هنگی وان پیرەژنەک دیت ل بەر خیڤەتەکێ یا ڕوینشتی بوو، ئەو ب نک ڤە چوون دا هندەک گۆشتی و قەسپان بۆ خۆ ژێ بکڕن، بەلێ پیرەژنێ ئەوا دگۆتنێ: (دەیکا مەعبەدێ خوزاعی) ئەو ئاگەهدارکرن کو ژ بەر هشکاتییێ گرانی ل نک وان پەیدا بوویە، و وان تشتەکێ فرۆتنێ نینە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ڕەخ خیڤەتا وێ ڤە بزنەک دیت، گۆتێ: دەیکا مەعبەدی، ئەڤە چ بزنە ل ڤێرێ؟ وێ گۆتێ: ئەو بزنەکا لەغەرە، ژ بێخێری ئەو نەشیایە د گەل تەرشی دەرکەڤتە چەروانی.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: شیر تێ هەیە یان نە؟ وێ گۆت: ئەو و شیر، شیر و ئەو!! ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تو دێ دەستویرییێ دەیە من ئەز وێ بدۆشم؟ وێ گۆت: کەرەم کە.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعایەک کر و گوهانێ وێ ڤەمالی و دۆت، ئینا شیرەکێ زێدە ژێ هات، حەتا ئامانەک تژی کری، و شیر دا پیرەژنێ، پاشی دا هەڤالێن خۆ، و دووماهییێ وی ژی ژێ ڤەخوار، پشتی هنگی جارەکا دی بزن دۆت حەتا ئامان تژی بووی، و ئەو شیر هێلا ل نک پیرەژنێ، و چوو.

گاڤا ئێڤاری زەلامێ وێ هاتییە ڤە، و ئەو شیر دیتی، پسیار ژێ کر: ئەڤ شیرە تە ژ کیڤە ئینایە؟ وێ گۆت: حال و مەسەلێن من و زەلامەکێ پیرۆز ئەڤە بوون، هنگی زەلامێ وێ گۆت: هەبت نەبت ئەو دێ ئەو زەلام بت یێ ل مەکەهێ پەیدابووی، ئەوێ مە گوهـ ل سوحبەتا وی بووی، ئەگەر ئەز ڕێکەکێ بۆ خۆ ببینم ئەز دێ گەهمە وی.

ئـەڤ سـەرهاتییە ئـەوا ب نـاڤێ سـەرهاتییا خیڤـەتا (أم معبـد) دئێتـە نیاسین، ب چەند رێـک و ریوایـەتان دئێتـە ڤەگوهاسـتن، بـەلێ ئـەو ریوایـەت هەمی گەلەک ب هێز نینن، لـەو هندەک زانـا وێ ب ریوایەتـەکا (ضـەعیف) ددەنە نیاسـین، و هنـدەک دبێـژن: ئـەو ب کۆمبوونـا هـەمی ریوایـەتان دگەهتـە (دەرەجەیا حسەن).

سەرهاتییا دویێ: سەرهاتییا سوراقەیێ کورێ مالکێ مودلجییە، و ئەو ئێـک ژ مـەزنێن مللـەتێ خۆ بـوو، ئـەو دبێـژت: رۆژەکـێ ئـەز د نـاڤ هنـدەک مـرۆڤێن خۆ دا یـێ روینشـتی بـووم، زەلامـەک هاتـە نـک مـە و گـۆت: مـن رەشتییا سێ مرۆڤان ل بـەر لێڤـا ئـاڤێ (کنـارێ دەریـایێ) دیـت دچوون، ئـەز دبێژم ئەو موحەممەد و هەڤالێن وینە.

و سـوحبەتا دەرکـەفتنا پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ژ مەکـەهێ د نـاڤ عــەرەبان دا بــەلاڤبووبوو پشــتی کــو قورەیشــییان راگەهانــدی کــو هــەچییێ موحەممەدی یان ئەبوو بەکری بۆ وان بگرت پێش هەر ئێکی ڤە ئـەو دێ سـەد حێشتران دەنێ.

سوراقە دبێژت: گاڤا وی ئەڤ ئاخفتنە گۆتی، من ڤیـا ل بـەر وی بـەرزە کەم، لەو من گۆتێ: نە.. ئەو فـلان وفلانـن مـە ژی ئـەو دیتبـوون دەمـێ ئـەو چووین، پاشی من بێنەکێ خۆ موژیل کر و ئەز درکـەفتم، مـن گۆتـە جارییـەکا خۆ: هەسپێ من بەرهەڤ بکە، و من رما خۆ هلگرت و ئەز ب دویڤ وان دا چووم، دەمێ ئەز نێزیکی وان بوویم، هەسپێ من هلنگڤت و ئـەز تێـدا کـەتم، ئەز رابووم من تیرێن خۆ دەرێخستن و من تیرکێشان کر (کو رەنگەکێ زانینا تالعی بوو ل نک وان) ئەو دەرکەفت یا نە ب دلێ من، بەلێ من گوهدارییا تیران نەکر و ئەز ب نک وان ڤە چووم، حەتا ئـەز هند نێزیـک بـوویم کـو مـن گوه ل دەنگێ خواندنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بـوو، وی دخوانـد و ل خـۆ

نەدزڤڕی، بەلێ ئەبوو بەکر گەلەک ل خۆ دزڤڕی، ڤێ جارێ هەردو دەستێن هەسپێ من د عەردی دا چوونە خوارێ، و ئەز ژێ کەتم، گاڤا ئەز ڕابوویم من دیت تشتەکێ وەکی دوکێلێ ژ دەستێن هەسپی بلندبوو و بەر ب عسمانی ڤە چوو، جارەکا دی من تیر کێشان ئەوا من ڤیای دەرنەکەفت، هنگی کەفتە دلێ من کو ئەو دێ ب سەرکەڤت، لەو من گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: مللەتێ تە سەد حێشتر یێن داینە وی کەسی یێ تە بگرت، لەو خەلک یێ ل تە دگەڕیێت دا تە بگرن.. پاشی من گۆتێ: ئەگەر هەوە خوارن یان تشتەک دڤێت ئەز یێ ئامادەمە، بەلێ وان داخوازا چو تشتان ژ من نەکر، ب تنێ گۆتە من: مە نیشا کەسێ نەدە.

سوراقە دبێژت: هنگی من داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کو ئەو ئەمانەکێ بۆ من بنڤیست، ئینا وی فەرمان ل عامرێ کوڕێ فەهیرەی کر کو ئەو وێ بۆ من بنڤیست، و وی ئەمانەک ل سەر پرتەکا چەرمی نڤیسی، و ئەو چوون.

ئەڤەیە ریوایەتا دورست یا سەرهاتییا سوراقەیێ مودلجی، و ئەوا ناڤداربووی کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگینی دایێ کو ڕۆژەک دێ ئێت ئەو دێ بازنکێ کیسرایی کەتە دەستێ خۆ، ب ڕێکەکا دورست نەگەهشتییە مە. و پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن خۆ چووین، سوراقەیی کارێ خۆ کرە ئەو هەچی کەسێ ل وێ دەڤەرێ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی گەڕیابا، ئەو دا وی زڤڕینت و بێژتێ: ئەو د دەڤەرا مە ڕا دەرباس نەبووینە!

## دیرۆکا دەرکەفتنا ژ مەکەهێ و گەهشتنا مەدینێ:

زانایێ ناڤدار (ئبن کەثیر) ئاشکەرا دکەت کو مشەختبوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل هەیڤا (رەبیعولئەووەلا) سالا سێزدێ ژ هنارتنا وی بوو، و

دبێژت: ژ ئبن عەبباسی دئێتە ڤەگوهاستن کو دەرکەفتنا وی ژ مەکەهێ ل ڕۆژا دوشەنبێ بوو، و گەهشتنا وی ژی بۆ مەدینێ هەر ل ڕۆژا دوشەنبێ بوو[1].

و ئەگەر مەخسەد ب دەرکەفتنا وی ل ڤێرێ، دەرکەفتنا ژ شکەفتێ بت، دڤێت بەری هنگی ب سێ ڕۆژان (ل پێنجشەنبێ یان ئەینییێ) ئەو ژ مال دەرکەفت بت، وقەستا شکەفتنا (ثەور) کر بت، و دەسپێکا دەرکەفتنێ وەکی د هندەک ژێدەران دا هاتی ل سەرێ هەیڤا (ڕەبیعولئەووەلێ) بوو.

و گەهشتنا وی بۆ (قوبائێ) جهێ خەلکێ مەدینێ پێشوازی لێ کری، ل دویڤ هزرا گەلەک دیرۆکنڤیسان ل ڕۆژا دوشەنبێ بوو ل دوازدەی ڕەبیعولئەوولێ.

و ریوایەت د دەسنیشانکرنا ڤان دیرۆکان دا دژێک جودانە، و زانا ل سەر وێ چەندێ پێک نەهاتینە، و چونکی چو ریوایەتێن (صەحیح) د ڤێ دەربارەیێ دا د دەست مە دا نینن لەو ل ڤێرێ ژی ئەم دبینین یا باشتر ئەوە مرۆڤ ل گۆتنا زانایێن فەلەکێ و سالنامەیان بزڤرت، کانێ ئەو چ دبێژن.

ئێک ژ ڤان زانایان پشتی دویچوون و ڤەکۆلینەکا درێژ ل دۆر هندەک دیرۆکێن سیرەتێ، و ب ڕێکا هندەک ریوایەتێن صەحیح و هەڤبەرکرنا وان د گەل هندەک ڕویدانێن سالنامەیێ و علمێ فەلەکێ هژمارەکا دیرۆکێن بنەجه د سیرەتێ دا بۆ مە دەسنیشان دکەت، و ئێک ژ وان دیرۆکا دورستا گەهشتنا پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن- بۆ مەدینێ، کو -ل دویڤ بۆچوونا وی- ڕۆژا دوشەنبێیە هەشتی هەیڤا ڕەبیعولئەوولێ ئەوا دکەفتە بەرانبەر (٢٠) ئەیلوولا سالا ٦٢٢ زایینی، هەر وەسا دکەفتە بەرانبەر (١٠) هەیڤا تشری کو هەیڤا ئێکێیە ژ سالنامەیا جوهییان، و ئەو ڕۆژ ل نک جوهییان

---

(١) البداية و النهاية، ١٧٧/٣.

ئەو رۆژ بوو یا وان دگۆتێ: (عاشووراء)، و دگۆتن: خودێ د ڤێ رۆژێ دا مووسا و هەڤالێن وی ژ دەریایێ رزگار کربوون، و فیرعەون خندقاندبوو[1].

**عاشوورائا جوهییان:**

ب ڤێ هلکەفتنێ مە دڤێت ئیشارەتێ بدەینە گۆتنەکا عەبدللاهێ کورێ عەبباسی ئەوا تێدا دبێژت: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ المَدِينَةَ وَالْيَهُودُ تَصُومُ عَاشُورَاءَ، فَقَالُوا: هَذَا يَوْمٌ ظَهَرَ فِيهِ مُوسَى عَلَى فِرْعَوْنَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِأَصْحَابِهِ: ((أَنْتُمْ أَحَقُّ بِمُوسَى مِنْهُمْ فَصُومُوا)) یەعنی: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە مەدینێ، و جوهییان رۆژا عاشوورائێ دگرت، و گۆتن: ئەڤە ئەو رۆژە یا خودێ مووسا تێدا ب سەر فیرعەونی ئێخستی، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە هەڤالێن خۆ: هوین حەقترن ب مووسای ژ وان، ڤێجا رۆژییێ بگرن[2].

بەری مەسەلا علمێ فەلەکێ و زانینا سالنامەیان پێش بکەڤت زانایێن مە سەرڤە سەرڤە د ڤێ حەدیسێ دگەهشتن، و دگۆتن: مەعنا وێ ئەوە دەمێ پێغەمبەر هاتییە مەدینێ وی زانی کو جوهی ل رۆژا عاشوورائێ ب رۆژی دبن، و دبێژن: ئەڤە ئەو رۆژە یا مووسا تێدا رزگاربووی.. و وان هزر دکر کو جوهی ل دەهی هەیڤا موحەررەمێ ب رۆژی دبوون، و ئەو ب خۆ وەسا نینە، و دەلیل ل سەر ڤێ چەندێ ئەو گۆتنە یا طەبەرانی د (المعجم الكبير) دا ژ خارجەیێ کورێ زەیدی ڤەدگوهێزت، دبێژت: بابێ من گۆت: ((لَيْسَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ بِالْيَوْمِ الَّذِي يَقُولُهُ النَّاسُ، إِنَّمَا كَانَ يَوْمَ تُسْتَرُ فِيهِ الْكَعْبَةُ، وتَقْلِسُ فِيهِ الحَبَشَةُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكَانَ يَدُورُ فِي السَّنَةِ، فَكَانَ النَّاسُ يَأْتُونَ فُلَانًا الْيَهُودِيَّ،

---

(١) محمود پاشا الفلكي: (نتائج الأفهام في تقويم العرب قبل الإسلام)، ص ١٨.

(٢) بوخاری ڤەدگوهێزت.

فَيَسْــأَلُونَهُ، فَلَـمَّا مَـاتَ الْيَهُـودِيُّ أَتَـوْا زَيْـدَ بْـنَ ثَابِـتٍ فَسَـأَلُوهُ)) يـەعنى: ڕۆژا عاشـووراێ نـە ئـەو ڕۆژە یـا خـەلک دبێـژن (مەخسـەدا وی ئـەوە: ڕۆژا عاشووراێ یا جوهییـان دگـرت و دگـۆتن: مووسا تێـدا یـێ ڕزگـاربووی، نـە عاشوورائا مەیە ئەوا ل دەهی هەیڤا موحەڕڕەمێ) بەلکی ئەو ڕۆژەک بوو پاتە تێدا ب سـەر کـەعبێ دا بـەردڤا، و (بـۆ یـاری) حەبەشـییان تێـدا ل نـک پێغەمبەری -سلاف لـێ بن- ڕم دهاڤێتن، و ئـەو د سالـێ دا دزڤـڕی، ڤێجا خەلک دهاتن پسیارا وێ ژ فلانـێ جوهی دکر کانی ئـەو کیژ ڕۆژە، و گاڤا ئەو مری وان پسیارا وێ ژ زەیدێ کوڕێ ثابتی دکر.

و حەتا مەعنا گۆتنا وی (د گەل سالێ دزڤڕی) بۆ مـە ئاشکەرا ببت، دێ شـەرحا زانـایێ فەلـەکی مـەحموود پاشـایی بـۆ ڤـێ حەدیسـێ ب کـورتی ڤەگێڕم؛ چونکی وێ پەیوەندی ب ڕۆژا گەهشـتنا پێغەمبـەری ڤـە -سلاف لـێ بن- بۆ مەدینێ هەیە.

ئـەو دبێـژت: هنـدی سالنامەیا جوهییـان بـوو سالنامەیەکا شەمسـی بـوو، یـەعنی: ئـەو ب ڕۆژێ و زڤڕینـا وێ ڤـە یـا گرێـدای بـوو، نـە وەکـی سالنامەیا عەرەبان ئەوا ب هەیڤێ ڤە گرێدای، و ئاشکەرایە کو ئەڤ هەردو سالنامە د گەل ئێک ب ڕێڤە ناچن، بەلکی هەیڤـەکا ڤـێ سالنامەیێ ل سەر هەمی هەیڤێن سالنامەیا دی دگەڕیێت، و هەیڤا ئێکێ د سالنامەیا جوهییان دا ئـەو هـەیڤ بوو یا وان دگۆتێ: (تشری)، و ئـەو ل وێ بـاوەرێ بـوون کـو د ڕۆژا دەهـێ ژ ڤـێ هـەیڤێ دا خـودێ فیرعـەون خندقانـدبوو، و مووسـا و مللەتێ وی ڕزگـار کربـوون، لـەو هـەر سال ل ڤـێ ڕۆژێ ئـەو ب ڕۆژی دبوون وەک شـوکر بۆ خودێ، و وان دگۆتـە وێ ڕۆژێ: (عاشـوورا)[1]، و ئەگـەر ئـەم

---

(١) هندەک زمانزانێن عەرەب ل وێ باوەرێنە کو پەیڤا (عاشووراء) ئەوا عـەرەب ب کـار دئینن د بناخەیێ خۆ دا پەیڤەکا عبرییە.

ل دویڤ دەست و دارێ علمێ فەلەكێ و سالنامەیان بەرێ خۆ بدەینە سالا (٤٣٨٣) عبری كو دكەفتە بەرانبەر سالا (١) هجری و (٦٢٢) زایینی، دێ بۆ مە ئاشكەرا بت كو ل وێ سالێ رۆژا عاشوورائا جوهییان دكەفتە دوشەنبێ (٨) هەیڤا رەبیعولئەووەلێ ل دویڤ سالنامەیا عەرەبان، و (٢٠) هەیڤا ئەیلوولێ ژ سالا (٦٢٢) زایینی، و ئەڤە ئەو رۆژ بوو یا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا گەهشتییە قوبائێ[1].

و بەلكی ل ڤێرێ پسیارەك بێتەكرن و كەسەك بێژت: باشە مادەم وەسایە، ئەرێ بۆچی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل مە كر كو ئەم ل دویڤ سالنامەیا قەمەری ل دەهی موحەررەمێ رۆژییا عاشوورائێ بگرین، نە كو ل دویڤ سالنامەیا شەمسی ل دەهی هەیڤا (تشری) یا جوهییان؟

هەر چەندە چو بەرسڤێن بنبڕ بۆ ڤێ پسیارێ د دەست مە دا نینن كو ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یان صەحابییان بۆ مە هاتبنە ڤەگێڕان، بەلێ هزر بۆ هندێ دچت كو ل وێ سالێ یا خودێ مووسا تێدا ژ فیرعەونی رزگار كری، سالا شەمسی و قەمەری د گەل ئێك دەست پێ كربن، و ل درێژییا زەمانی ئەڤ دیاردە گەلەك جاران چێ دبت، پاشی سالێن دی هەر دو رۆژ (عاشوورائا سالا شەمسی و یا قەمەری) ژێكڤەبوون، و بۆ زانین ل سالا دووماهییێ ژ ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- كو سالا یازدێ مشەختییە جارەكا دی هەردو رۆژ گەهشتنە ئێك، وەكی دێ بەحس ژێ كەین دەمێ ئەم خوتبەیا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل حەجا خاترخواستنێ ڤەدگێڕین، ئەگەر خودێ حەز بكەت.. و چونكی د ئیسلامێ دا عیبادەت ب سالا قەمەری ڤە دگرێدایینە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل مە كر كو ئەم ل دەهی موحەررەمێ رۆژییا عاشوورائێ بگرین.

---

(١) محمود پاشا الفلكي: (نتائج الأفهام في تقويم العرب قبل الإسلام)، ص ١١.

ب هزرا مـن ئـەڤ تەفسـيرە يـان بەرسڤە يـا ژ هـەمييان بەرعـەقلترە بـۆ پسيارا بۆری.

### پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دگەهیتە قوبائێ:

ژ گۆتنا بۆری ئاشکەرا دبت کو رۆژا پێغەمبـەر -سلاڤ لـێ بـن- تێدا گەهشتییە قوبائێ، کو رۆژا دوشەنبێ بوو، جوهی ب رۆژی بوون؛ چونکی ئەو رۆژ عاشوورائا وان بوو.. و ئەڤ دوشەنبە ل دویڤ سالنامەیێ دکەفتە هەشـی هەیڤا رەبیعولئەووەلێ، و ئبن ئیسحاق ل وێ باوەرێیە کو پێغەمبـەر -سـلاڤ لێ بن- دوشەنبێ گەهشتبوو قـوبائێ، و سێشەنب و چارشەنب و پێنجشەنبێ مـابوو ل وێـرێ، و ل رۆژا ئـەینییێ ئـەو چـوو مـەدینێ ب خـۆ و ل ئێڤـاری گەهشـتە وێـرێ. مـەعنا: پێغەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- ل رۆژا (٨) گەهشـتە قوبـائێ، و ل رۆژێـن (٩ و ١٠ و ١١)یێ مـا ل قوبـائێ، و ل رۆژا ئـەینییێ (١٢) هەیڤا رەبیعولئەووەلێ ئـەو گەهشـتە مـەدینێ.. و ئەڤـە وێ گرێکـێ بـۆ مـە ڤـەدکـەت یا ئەم ل نک راوییان دبینین دەمێ هندەک دبێژن: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل هەشتێ یان دوازدەی رەبیعـێ گەهشـتبوو مـەدینێ، ل رۆژا دوشەنبێ یان ئەینییێ.

و (قوبـاء) ل سـەردەمێ پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- گونـدەک یـان تاخەکێ پچویک بوو، دکەفتە باشووری باژێرێ یـەثربێ، ب دویراتییـا (٢-٣) کیلـۆمـتران ژ سـەنتەری، ئـەوێ مزگـەفتا پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- لـێ هاتییـە ئاڤـاکرن، و هنگـی بـابکێ (عـەمرێ کـورێ عـەوفی) کـو ژ ئویجاخـا ئەوسییان بوون ل وێرێ دئاکنجی بوون.

و هەژییە بێژین کو بەری هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بـۆ یـەثربێ، ئەو باژێرەکێ پێکڤە گرێدای نـەبوو، بـەلکی ئـەو کۆمـەکا تـاخێن ژێکجـودا و بەلاڤە بوو، ل هەر تاخەکی بابکەکێ ئەوسی یان خەزرەجییان دژیان، و ژ بلـی

وی بـابکی کەسـێ دی د گـەل وان ل تـاخێ وان نـەدژییا، و ل باشـووریێ ڕۆژهـەلاتا سـەنتەرێ بـاژێری سێ ئویجـاخێن جوهییـان ژی ل سـێ تـاخێن ژێکجودا دژییان، بەلێ تاخێن وان د شویرهەکری و ئاسێ بوون، لەو دگۆتنێ: ئاسێگەهـ (حصن).

دەمێ صەحابی ژ مەکەهێ مشـەختبووین و بەر ب مـەدینێ ڤـە هـاتین، ئێکەمین تاخێ ئەو گەهشتینێ (قوبـاء) بـوو، ل قوبائێ ئەو هەمی گەهشـتنە ئێک و کۆمبوون، و مانە ل هیڤییا پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- حەتا دئێت کـانێ دێ چ کـەت، و ل قوبـائێ وان مزگـەفتـەکـا بچویـک بـۆ خـۆ ل مـالا سەعدێ کوڕێ خەیثەمـەی چێکربـوو، و وان نڤێـژێن خـۆ ل وێرێ ب جماعـەت دکرن، و ئەڤ مزگەفتە دکەفتە وی جهی یێ نوکە گۆشەیێ باشووریێ ڕۆژئاڤایا مزگەفتا قوبائێ دکەفتێ.

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێ وی ئەبوو بەکر ب مشـەختی ژ مەکەهێ دەرکـەفتین و بـەر ب مـەدینێ ڤـە چووین، خەبـەرێ دەرکـەفتنا وان گەهشتە خەلکێ مـەدینێ، لـەو هـەرڕۆ پشـتی نڤێـژا سپێدێ ئەو دەردکەفتنـە سەر ڕێکێ چاڤەڕێیی هاتنا وان دکر، حەتا ڕۆژ دهاتە نیڤـا عسـمانی و دنیـا گـەرم دبـوو و چـو سـیبەر نـەدمان، ئـەو دزڤڕینـە مـالێن خـۆ.. ل وێ ڕۆژێ یـا پێغەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- تێدا گەهشـتییە قوبـائێ، کـو ڕۆژا دوشـەنبێ بـوو (هەشتێ ڕەبیعولئەووەلێ) دەم بووبـوو نیڤـرۆ، و خـەلـک ژ گـەرمان دا ژ سـەر ڕێکێ ڤەگەڕیابوونە مـالێن خۆ، و ئێکـەمین کەسێ دیتـی پێغەمبـەر -سـلاڤ لێ بن- بەر ب قوبائێ ڤە دئێت زەلامەکێ جوهی بـوو، ئینـا وی ب دەنگـەکێ بلند گازی کر: گەلی نەڤیێن قەیلەیێ (و قەیلە ناڤێ داپیرا خەلـکێ مەدینـێ بوو) ئـەڤـە ئێغبالا هـەوە یا هوین چاڤەڕێ هات! و گاڤا موسلمانان گـوهـ

ل دەنگێ وی بووی هەمی پێکڤە ب کەیف و خۆشی دەرکەفتنە بەراهییا وی، دا پێشوازییێ لێ بکەن.

**ل قوبائێ**:

گاڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالێن خۆ گەهشتییە ژێرییا باژێرێ یەثربێ، وی ب لایێ ڕاستێ ڤە بەرێ خۆ دا، و ئەو ژی وەکی صەحابییێن بەری خۆ قەستا دەڤەرا قوبائێ کر، و چوو تاخێ بەنی عەمرێ کوڕێ عەوفی، و گەهشتنا وی بۆ قوبائێ -وەکی مە گۆتی- ل نیڤرۆ بوو، دەمێ دنیا یا گەرم، و گاڤا ئەو گەهشتینە ناڤ مالان، ئەبوو بەکر ڕابوو ژ پییان ڤە و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب بێ دەنگی ڤە ڕوینشتە خوارێ، خەلکێ مەدینێ ئەوێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هێشتا نەدیتی، ئەو نەنیاسی، و نەزانی کانێ کیژکە پێغەمبەر، لەو هندەک ژ وان سلاڤ دا ئەبوو بەکری و چوونە دەستی یا ژ وان ڤە ئەو پێغەمبەرە، حەتا دەمێ حەتاڤێ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دای، ئەبوو بەکر چوو کراسێ خۆ ل هنداڤ وی ڤەگرت دا سیبەرێ بۆ چێ بکەت، هنگی ژ نوی خەلکی ئەو نیاسی و زانی کییە پێغەمبەر!

و پشتی هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوو مالا کولثوومێ کوڕێ هەدمی، کو ئێک ژ زەلامێن بەنوو عەمرێ کوڕێ عەوفی بوو، و هندی ئەو ل قوبائێ ئەو مێڤانێ وی بوو، و دەمێ دبوو وەختێ نڤێژێ ئەو دهاتە مالا سەعدێ کوڕێ خەیثەمەی ل وی جهێ صەحابییان مزگەفتەک بۆ خۆ لێ چێکری، و وی نڤێژ ل بەرا وان دکر..

ل دۆر دەمێ مانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل قوبائێ دو گۆتن هەنە: هندەک دبێژن: ئەو چاردە ڕۆژان مابوو ل وێرێ، و هندەکێن دی دبێژن: ئەو پشتی نیڤرۆیا دوشەنبێ گەهشتبوو وێری، و سپێدەیا ئەینییێ بەر ب مەدینێ

ڤە چووبوو، ژ بەر کو وی نڤێژا ئەینییێ کو ئێکەمین ئەینی بوو د ئیسلامێ دا هاتییە کرن، ل نهالا (رانوونائێ) د ناڤبەرا قوبائێ و مەدینێ دا، ل تاخێ سالمێ کورێ عەوفی کربوو، ل وی جهێ نوکە مزگەفتا (الجمعة) دکەفتێ.

و ئەو دبێژن: ئەگەر پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- حەتا ئەینییێ مابا ل قوبائێ ئەو دا نڤێژا ئەینییێ ل وێرێ کەت، و صەحابی دا وێ چەندێ بۆ مە ڤەگێڕن، بەلێ ئەڤ چەندە چێ نەبووبوو.

## مزگەفتا قوبائێ:

ل دویڤ گۆتنا ئبن ئیسحاقی ئەوا د سیرەتێ دا هاتی، ل وێ پێنجشەنبییا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مایە ل قوبائێ، پشتی گەهشتنا وی ب دوسێ رۆژان، وی ل سەر (میربەدا کولثوومێ کورێ هەدمی)[1] مزگەفتەک ئاڤاکر، ب ناڤێ مزگەفتا قوبائێ دئێتە نیاسین، کو دبتە ئێکەمین مزگەفت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ئیسلامێ دا ئاڤاکری، و ئەڤ مزگەفتە ئەوە یا بەحسێ وێ د قورئانێ دا هاتی دەمێ خودایێ مەزن دبێژت: ﴿لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ (التوبة: ١٠٨) یەعنی: ئەو مزگەفتا ژ رۆژا ئێکێ ل سەر تەقوایێ هاتییە دانان فەرترە کو تو نڤێژێ لێ بکەی، د ڤێ مزگەفتێ دا هندەک زەلام هەنە حەز دکەن کو خۆ ب ئاڤێ ژ هەمی پیساتییان پاقژ بکەن، کا چاوا ئەو ب تەقوایێ خۆ ژ گونەهان پاقژ دکەن. و خودێ حەز ژ وان دکەت یێن خۆ پاقژ دکەن.

---

(١) میربەد عەردەکێ پان و مەیدانەکا بەرفرەهە، خەلکێ مەدینێ قەسپێن خۆ لێ هشک دکرن.

و ژ بلى ڤێ ئايەتێ، د قەدر و بهايێ ڤێ مزگەفتێ دا حەديسەكا دورست هەيە تێدا هاتييە پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژت: ((مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ، ثُمَّ أَتَى مَسْجِدَ قُبَاءٍ ، فَصَلَّى فِيهِ صَلاَةً ، كَانَ لَهُ كَأَجْرِ عُمْرَةٍ))[1] يەعنى: هەچييێ ل مالا خۆ خۆ پاقژ بكەت (دەسنڤێژا خۆ بشۆت) پاشى بێتە مزگەفتا قوبائێ و نڤێژەكێ لێ بكەت بۆ وى ب خێرا عومرەكێيە.

### عەلى دگەهتە قوبائێ:

دەمێ مە بەحسێ دەركەفتنا پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- ژ مەكەهێ كرى، مە گۆتبوو: وى پسمامێ خۆ عەلى ل جهێ خۆ هێلابوو؛ دا ئەو ئێمانەتێن خەلكى بۆ وان بزڤرينتە ڤە، و پشتى دەركەفتنا پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- ژ مەكەهێ ب سێ چار ڕۆژەكان و پشتى وى ئێمانەت هەمى بۆ خەلكى زڤراندين، ئەو ژ مەكەهێ دەركەفت، و بەر ب مەدينێ ڤە مشەختبوو، و دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل قوبائێ، و هيشتا ئەو نەچوويە مەدينێ، پسمامى وى عەلى گەهشتێ.

### سەلمانێ فارسى و پێغەمبەرێ ئيسلامێ:

سەلمان زەلامەكێ فارسى بوو، خەلكێ گوندەكێ ئەصفەهانێ بوو دگۆتنێ: (جى)، بابێ وى مەزنێ گوندى بوو و مرۆڤەكێ ئاگرپەرێس بوو، جارەكێ ئەو ل لايێ گوندى د بەر دێرەكا فەلان ڕا چوو، ديت دەمێ ئەو عيبادەتى دكەن، كەيفا وى ب وان هات، و حەزكر بچتە سەر دينێ وان، گاڤا بابێ وى ب ڤێ چەندێ زانى ئەو گرێدا و د مال دا حەبس كر، وى ب دزى ڤە هنارتە نك خەلكێ دێرێ كو گاڤا هەوە زانى كاروانەك دێ چتە شامێ بێژنە من دا ئەز بڕەڤم و د گەل وان بچمە وێرێ، و وەسا چێبوو.. ئەو شيا

---

(١) ئبن ماجە ژ سەهلێ كوڕى حەنيفى ڤەدگوهێزت.

ژ حەبسا بابێ خۆ بڕەڤت و بەر ب شامێ ڤە مشەخت ببت؛ دا ل وێرێ و دویر ژ دەسهەلاتا بابێ خۆ پەرستنا خودێ ل سەر ڤی دینێ نوی بکەت.

ل شامێ من پسیارا خەلکی کر: کی ژ هەوە هەمییان زاناترە ب دینی؟ وان گۆت: ئوسقوفێ کەنیسێ، ئەز چوومە نک، و من خزمەتا وی کر، من دیت ئەو مرۆڤەکێ خرابە، خێرێن خەلکی کۆم دکرن و بۆ خۆ دبرن..

و هۆسا سەلمان سەرهاتییا خۆ ب درێژی ڤەدگوهێزت، حەتا پشتی هنگی چوویە موسلێ و ل نک قەشێ وێ مای، و بەری قەشە بمرت وی بەرێ سەلمانی دا نصێبینێ ل نک قەشێ وێ، و وی ژی بەری مرنێ بەرێ وی دا قەشێ عەمووریە ل شامێ، و گاڤا ئەڤ قەشە کەفتییە بەر مرنێ، سەلمانی گۆتێ: پشتی تە ئەز بچمە نک کێ؟ وی گۆت: ئەز پێ ناحسییێم ئێکێ وەکی من مابت، بەلێ زەمانێ وی پێغەمبەری یێ نێزیک بووی ئەوێ دێ ب دینێ ئیبراهیمی ئێت، و ئەو دێ ل جهەکی پەیدا بت دکەفتە ناڤبەرا دو لاتان بەرێ وان یێ ڕەشە، و ئەو جهـ یێ تژی دارقەسپە، ئەو دیارییان وەردگرت و زێ دخوت، بەلێ ژ خێران ناخوت، ختما پێغەمبەرینییێ یا ل ناڤ ملێن وی، ئەگەر تو بشێی خۆ بگەهینییە وی جهی هەڕە وێرێ..

پشتی مرنا وی قەشەی سەلمانی د گەل کاروانەکێ بازرگانان قەستا وەلاتێ عەرەبان کر، ب ڕێڤە وان غەدرە ل وی کر و ئەو وەک عەبد فرۆتە زەلامەکێ جوهی، و وی ئەو فرۆتە پسمامەکێ خۆ ژ خەلکێ مەدینێ ژ ئویجاخا بەنوو قورەیضە، و گاڤا سەلمان گەهشتییە وی جهی دیت ئەو جهـ ئەوە یێ سەیداێ وی قەشێ عەمووریێ سالۆخەتێن وی بۆ وی گۆتین، لەو کەیفا وی ب ڤێ چەندێ هات..

ڕۆژەکێ سەلمان د ناڤ بیستانێ سەیدێ خۆ دا ل سەر دارقەسپەکێ بوو کار دکر، سەیدێ وی ل بنێ دارقەسپێ بوو، پسمامەکێ وی هاتە نک و

گۆتیێ: خودێ بەنوو قەیلە بکوژت (مەخسەدا وی پێ ئەوس و خەزرەجی بوون و قەیلە ناڤێ داپرەکا وانە) ئەو هەمی نوکە ل قوبائێ پێن کۆمبووین ل دۆر زەلامەکی ژ مەکەهێ یێ هاتی، دبێژن: ئەو پێغەمبەرە.. سەلمان دبێژت: گاڤا من گوهـ ل گۆتنا وی بووی، تەزینکەک ب سەر لەشێ من دا هات نێزیک بوو ئەز د دارێ دا بکەڤم، ئەز هاتمە خوارێ و من گۆتە پسمامێ سەییدێ خۆ: تە چ گۆت؟ هنگی کەربێن سەییدێ من ڤەبوون و کولمەک دانا من و گۆت: تە چ شۆل ب ڤێ گۆتنێ هەیە.. هەرە کارێ خۆ بکە.

پشتی سەلمان ژ کارێ خۆ خلاصبووی، ئێڤاری وی هندەک تشت برن و چوو نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل قوبائێ، و گۆتێ: من یێ زانی تو مرۆڤەکێ چاکی، و هەڤالێن تە دغەریب و هەوجەنە، و هوین ژ هەر کەسەکێ دی فەرترن، لەو من ئەڤ خێرە بۆ هەوە یا ئینای، سەلمان دبێژت: من دیت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو نێزیکی هەڤالێن خۆ کر و گۆتێ: بخۆن.. و وی دەستێ خۆ نەکرێ و ژێ نەخوار! من د دلێ خۆ دا گۆت: ئەڤە ئێک. پاشی پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خۆ ڤەگوهاستییە مەدینێ، رۆژەکێ من تشتەکێ دی ئینا و ئەز هاتمە نک و من گۆتێ: من دیت جارا دی تە ژ خێرا من نەخوار، لەو ڤێ جارێ من دیارییەک بۆ تە ئینا، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژێ خوار، و گۆتە هەڤالێن خۆ ژێ: ژێ بخۆن. من د دلێ خۆ دا گۆت: ئەڤە دو. پاشی پشتی دەمەکی جارەکا دی ئەز هاتمە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەو ل زیارەتێن (بەقیعێ) بوو د ناڤ هندەک هەڤالێن خۆ دا یێ روینشتی بوو، ئەو د گەل جەنازەیێ هەڤالەکێ خۆ دەرکەفتبوو وێرێ، ئەز چوومە پشت وی من گۆت: بەلکی نیشانا پێغەمبەرینییێ ببینم، گاڤا وی ئەز دیتیم وی زانی ئەز یێ ل تشتەکی دگەرییم، لەو وی کراس ژ سەر ملێێن خۆ ئینا خوارێ و ناڤملێن خۆ نیشا من

دان، گاڤا من نیشان دیتی، من خۆ تێ وەرکر و ماچی کر و کره گری، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆته من: کانێ هێرڤه وەر، بزڤڕه.. ئەز چوومه بەر سنگی و من سەرهاتییا خۆ بۆ وی ڤەگێڕا، کەیفا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب گۆتنا وی هات کو صەحابییان گوهـ لێ بووی.

و هۆسا ئەم دبینین دەسپێکا پەیوەندییا سەلمانی د گەل ئیسلامێ هنگی دەست پێ کربوو دەمێ هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل قوبائێ.. وتمامییا وێ پشتی هنگی ل مەدینێ چێببووبوو.

**بەر ب مەدینێ ڤە:**

پشتی چەند ڕۆژەکان ژ مانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل قوبائێ، کو ژ دوشەنبێ حەتا ئەینییێ بوو ل دویڤ بۆچوونەکێ، وی هنارته ب دویڤ مالخالانێن خۆ ڕا ژ بەنوو نەججارییان (دەیکا باپیرێ وی عەبدلموطەلبی ژ وان بوو) دا بێنە نک وی، و ئەو د گەل وان بەر ب مەدینێ ڤە بچت، و ڤێ چەندێ ل نک عەرەبان مەعنایا خۆ د فەرهەنگا (ئویجاخکانێ) دا هەبوو! خالێن وی خۆ چەکدار کرن، و هاتنە قوبائێ، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل حێشترا خۆ ئەوا دگۆتنێ: (القصوی) سویار بوو، و ئەبوو بەکر ل پشت خۆ سویار کر، و زەلامێن بەنوو نەججار ب چەکێ خۆ ڤە ل دۆر وی کۆمبوون، ل لایێ ڕاستێ و یێ چەپێ و ل پشت وی، د گەل صەحابییێن دی بەر ب باکووری ڤە بۆ سەنتەرێ مەدینێ ب ڕێ کەفتن.

پشتی نێزیکی کیلۆمەترەکێ ئەو ژ قوبائێ دویرکەفتین، ژ لایێ باکووری ڤە، ئەو گەهشتنە نهالا (ڕانوونائێ) ئەو جهێ تاخێ بەنوو سالمێ کوڕێ عەوفی، کو بابکەکێ خەزرەجییانە لێ، وان داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کو ئەو ل نک وان بمینت، دەمەکی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ما ل نک وان، بوو نیڤرۆ و دەمێ نڤێژا ئەینییێ هات، پێغەمبەری -سلاڤ لێ

بن- ئەو کۆمکرن و خوتبەک بۆ وان خواند و نڤێژا ئەینییێ ل بەرا وان کر، و ئەڤە ئێکەمین نڤێژا ئەینییێ بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری.

ل وی جهی یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خوتبە خواندی و نڤێژ کری مزگەفتەک هاتە ئاڤاکرن، و ناڤێ وێ بوو مزگەفتا ئەینییێ (مسجد الجمعة).

پشتی هنگی هندەک زەلامێن بەنوو سالمی گوتنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بمینە ل نک مە ئەم دێ تە پارێزین. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیشارەت دا حێشترا خۆ و گۆتە وان: رێکا وێ بەردەن، ئەو یا فەرمان لێکرییە.

پاشی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و ئەو مرۆڤ د گەل دا بەر ب سەنتەرێ نوکە یێ مەدینێ ڤە چوون، و هەر تاخەکێ ئەو دگەهشتێ، خەلک ب کەیف ڤە دهاتنە بەراهییا وان، و داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر کو ئەو ل نک وان بمینت، بەلێ هەر جار وی ئیشارەت ددا حێشترا خۆ و دگۆت: رێکا وێ بکەن، ئەو یا فەرمان لێکرییە.. یەعنی: خودێ بەرێ وێ دێ دەتە وی جهی یێ وی دڤێت.. و هۆسا ئەو چوو حەتا دەمێ بوویە شەڤ ئەو گەهشتە تاخێ بابکێ مالکێ کورێ نەججاری، ل وێرێ، و ل وی جهێ نوکە مزگەفتا وی لێ، حێشترا وی نیخیا، و کاروانێ مشەختییان ل وێرێ دانا، و ژ وێرێ هێرڤە ئەو جهـ بوو سەنتەرێ بارژێرێ (مەدینا مونەوەر).

## سێزده سال.. سێزده نیشان

هەر ژ دەسپێکا گازییا ئیسلامێ و حەتا سالا سێزدێ، دەمێ موسلمان تێدا ژ مەکەهێ مشەختبووینە مەدینێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و دویکەفتییێن وی ژ خودان باوەران سێزده سال ل ژێر زۆرداریا بێ باوەرێن قورەیشییان بۆراندن، ئەڤ هەر سێزده ساله، سێزده نیشانێن ئاشکەرا بوون ل بەر چاڤێن دیرۆکێ هاتینە دانان کو ئەڤ مرۆڤێ ب ڤێ گازییێ رابووی پێغەمبەرە، هنارتییێ عەسمانییە بۆ عەردی، رێنیشاندەرێ مرۆڤینییێیە، و نە مەزنەکێ دنیاییێیە دڤێت ب رێکا دینی هندەک ئارمانجێن دی یێن تایبەت ب دەست خۆ بێخت، و نە ژ وان کەسانە یێن ب رێکا سیاسەت ودنیادارییێ دڤێت خەلکێ بێ رێ و هەژار بهاژۆت.

ئەڤ هەر سێزده ساله مرۆڤی فێری گەلەک دەرسێن پێتڤی و گرنگ دکەت، ژ وان:

* ئێکەمین جار ئەو مرۆڤی فێری هندێ دکەت کو ئەو یێ بێنفرەهـ بت.

سێزده سالان نەخۆشی دهاتنە رێکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەلێ دێمێ وی هەر یێ گەش بوو. سێزده سالان وی ئێک ئارمانج هەبوو، چەند ل دویڤ دگەڕیا هند ئارمانج ژێ دویر دکەفت، بەلێ ئەو قەت و قەت بێ هیڤی نەدبوو. سێزده سالان هەر رۆژ سپێدێ ئەو ژ مال دەردکەفت، و کانێ چاوا رۆژ ب تنێ دچوو ئاڤا، وەسا ئەو ب تنێ ڤەدگەڕیا، بەلێ ئەو سست و خاڤ نەدبوو، و رۆژا دی ئەو د گەل هەلاتنا رۆژەکا نوی زویتر دەردکەفت؛ دا ب رۆناهییا ئیسلاما خودێ تارییا شەڤێن جاهلییەتێ ڤەرەڤینت.

* ل ڤان سێزده سالان موسلمان ل مەکەهێ وەکی زارۆکەکێ ساڤا پێتڤی شیرڤەکرنێ بوون، حەتا بشێن ڕابنە سەر پییان، و ئەو دەمەکێ درێژ هاتنە پەروەردەکرن -نە ب تنێ ب گۆتنێن نەظەری، بەلکی ب کریار و مەنطقێ عەمەلی ژی- دا ئەو بزانن کو زەنگینی زەنگینییا دلییە، و هێز هێزا باوەرییە، و هنگی تو دێ بییە مرۆڤەکێ ژێهاتی ئەگەر تو شیای ببییە زەلامێ بیر و باوەران.

* سێزده سالێن بەری مشەختێ موسلمان فێری هندێ کرن ئەو بزانن کو دنیا ب هەمی خۆشییێن خۆ ڤە نابتە بهایێ ئێک (تەنازول) و خۆچەماندنێ ئەگەر ل سەر حسێبا دینی بت. موسلمان فێری هندێ بوون، کو وەلات و جهـ و وار ئەگەر چەند دشرین و ب بها ژی بن، ئەو نائێنە ڕێزا ڤیانا خودێ، یان ڤیانا ب جهئینانا شریعەتێ خودێ ل سەر ڕوییێ عەردی.. ئەو کەسێ مستەکا ئاخێ، یان پرتەکا کەڤری، یان پارچەیەکا زەڤییێ چێتر ژ هندێ ببینت کو ئەو قەستا خودێ بکەت، ئەو مرۆڤ دێ مرۆڤەکێ ئاخپەرێس بت، ڤێجا دویر نەبینە ڤیانا ئاخێ دلێ وی دەستەسەر بکەت، و جهی بۆ ڤیانا خودێ نەهێلت، سەرهاتییا مشەختبوونێ جەریاندنەکا مەزن بوو کەفتییە بەر سنگێ خودان باوەران، خودێ دڤیا وان بجەرێینت دا ل پێش چاڤ ئاشکەرا بکەت کانێ ئەو دێ چ ژ هەردو ڕێکان بۆ خۆ هلبژێرن؟

ب ڤێ مەعنایێ مشەختبوون دبتە ئەو نیشان یا خودان باوەران جیهان پێ ئاگەهدار کری کو ئەو خودێ و ب تنێ خودێ هل دبژێرن.

* سێزده سالێن بەری مشەختبوونێ موسلمان -ب تایبەتی ئالاهلگرێن ڤێ گازییێ- وە تێ گەهاندن کو عەقیدەیە ئەو پێگاڤا دڤێت ئێکەمین جار خودانێن ڤی دینی گازییا خۆ ژێ دەست پێ بکەن، و کاروانێ خۆ ژێ بدەنە ڕێ.. سێزده سالان ل مەکەهێ، ل وی دەمێ موسلمان ل بن دەستێ بێ

باوەران دژیان، ل وی دەمێ غەرببیا ئیسلامێ گەهشتییە کلۆڤانکێ، پێغەمبەرێ سەرکێش و پێشەوا -سلاڤ لێ بن- هەڤالێن خۆ ب عەقیدێ و ل سەر عەقیدێ پەروەردەکرن، پێگاڤ پێگاڤ ئەو د گەل وان چوو حەتا شیای -ب ئانەهییا خودێ- باوەرییەکا موکم بکەتە د سەر و دلێن وان دا، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەڤالێن خۆ ب مەسەلێن (هامشی) و نەگرنگ ڤە موژیل نەدکرن، ئەو وەسا تێ نەدگەهاندن کو ئەو (ب پلەکێ دێ چنە سەرێ ملەکێ) وەکی هندەک ژ مە ئەڤرۆ تێ دگەهن! وی ئەو وەسا تەربیەت نەکرن کو پێخەمەت بەرژەوەندی و مەصلەحەتێن خۆ یێ تایبەت دەستێن خۆ بکەنە د ناڤ دەستێن کافر و بێ دینان دا، ب هێجەتا هندێ کو ئەڤ چەندە ژ پێتڤییێن (مەصلحەتا دینی و دەعوتێ!) وەکی ((هندەک)) ئیسلامخوازێن مە ئەڤرۆ هەڤال و هۆگرێن خۆ تێ دگەهینن. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەڤالێن خۆ ب قورئانێ پەروەردە دکرن، لەو جیلەک ژ وان پەیدا بوو ژ قورئانێ پێڤەتر چو رێباز و پێشەوا بۆ خۆ نەدنیاسین.. جیلەکێ خەما خۆ یا بەراهی و دووماهییێ کرییە بەرەڤانییا ژ ئیسلامێ، و جیهادا د رێکا بیر و باوەران دا.

* ئەو مرۆڤێن ل ژێر سیستەما ئویجاخکانێ هاتینە پەروەردەکرن، و دەست و دارێن جاهلییەتێ گڤاشتن ل گیان و هەست و بیر و باوەرێن وان دکر، ل سێزدە سالان ژ هەمی کارلێکرنێن جاهلییەتێ هاتنە رزگارکرن، لەو ئەو بوونە نموونەیێن پاک و بلند بۆ گازیکەرێن ڤی دینی هندی دنیا هەبت، ئیسلامێ ئەڤ مرۆڤە (ئەوێن ئەم دبێژینێ: صەحابی) تێکدا گوهارتن، و هندەک کەسێن دی یێن نوی ژێ دورستکرن، ئەگەر تە ئێک ژ وان دیتبا بەری ئەو موسلمان ببت و پشتی ئەو موسلمان بووی، دا سەد سویندان خۆی کو ئەڤە نە ئەو کەسە یێ تە بەری هنگی دیتی.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابییێن خۆ ل مەکەهێ ل سەر پەیڤا (لا إلـه إلا اللـه) پەروەردەکرن، و کانێ چاوا هویرکێ ئاسنی دەمێ دئێتەلێکدان طبیعەتێ ئاسنی تێدا دئێتەگوهارتن و دبتە مەغناتیسەکێ خودان هێز بۆ ڤەکێشان و کارلێکرنێ، وەسا عەقیدەیا تەوحیدێ ئەو دوبارە لێکدان و گیانەکێ نوی د لەشێن وان دا پەیدا کر، لەو ئەو شیان هەر زوی خەلکی ب نک خۆ ڤە بکێشن و کاری لێ بکەن.

* سێزدە سالان ل مەکەهێ زۆرداری ل خودان باوەران دهاتەکرن، ئەو دهاتنە گرتن و ئازاردان، دهاتنە دەرێخستن و کوشتن، د گەل هندێ ژی خودایێ مەزن فەرمان ل وان دکر: ﴿ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ ﴾ (النساء: ٧٧) دەستان داهێلن و شەڕی نەکەن.. ئەو مرۆڤێن موسلمانبووین ل مەکەهێ هەمی دەهژار و لاواز نەبوون، د ناڤ وان دا هندەک هەبوون -ئەگەر دەستویری بۆ هاتبا دان- دشیان شیرێن خۆ هلگرن و کەڤرێن مەکەهێ ب خوینا کافران سۆر بکەن! د ناڤ وان دا هندەک هەبوون دجحێل و خوین گەرم، ئەگەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دابایێ ئەو دبەرهەڤبوون هێرشێ بکەنە سەر صەنەمێن قورەیشییان و هویر هویر بکەن، یان حەتا کت کتە سەر و گرگرێن کافران ل ڤێرێ و وێرا هە بکوژن، ب دزی ڤە یان ژی ب ئاشکەرا.. ئەو دشیان ڤێ چەندێ بکەن، و ئەگەر وان ئەڤ چەندە کربا کافر دا هزرەکێ بۆ کەن.. بەلێ وان ئەو نەکر! هندەک جاران مرۆڤ بەرانبەر ڤێ چەندێ حێبەتی ڕادوەستت، موسلمان ڕۆژ بۆ ڕۆژێ دهاتنە گرتن و کوشتن، و ل شوینا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بێژتە وان: ڕابنە سەر خۆ، و دەستی بدەنە چەکێ خۆ دا سەرهلدان و شۆڕەشەکێ دژی زۆرداریا کافرێن مەکەهێ بکەین، وی گۆتە وان: دەستا بداهێلن، و صەبرێ بکێشن! خودایێ وان، یێ ئەو ژ نوی ب سەرهلبووین، دڤیا عەدەت و دەست و دارێ وان یێ

جاهلی، دفنبلندی و سەرگەرمییا نە ژ بۆ خودێ، رێ و رەسمێن باب و باپیران، د دلێن وان دا بگوهۆرت.. ژ تشتێن مەعلوومە کو نە ژ عەدەتێ عەرەبان بوو -ل وی دەمی- کو زۆرداریێ ل سەر خۆ قەبویل بکەن، هندەک جاران نێزیکی چل سالان شەرەکێ خوینەلۆ د ناڤبەرا ئویجاخان دا پەیدا دبوو؛ چونکی ئێکی تیرەک ل گوهانێ حێشترا ئێکێ دی ددا، ئەگەر زۆرداری ل مرۆڤەکی هاتباکرن ئویجاخا وی هەمی د هەوارێ دهات، یێ حەق با یان ژی یێ نەحەق با، و وان قەبویل نەدکر تەعدایی ل کورێ وان بێتەکرن، بەلێ ئەڤە چەندە پتر جاران د دەر حەقا موسلمانان دا نەدهاتە ب کارئینان، و تشتێ عنتیکە ئەو بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب خۆ ژی بەری مشەختبوونێ ل مەکەهێ، رێ نەددا موسلمانان کو ئەو دەست بدەنە هێزێ و بەرەڤانییێ ژ خۆ بکەن، بەلکی دگۆتە وان: بێنا خۆ فرەهـ بکەن!

عورف و عەدەتێن ئویجاخێ ژ وان دخواست ئەو ڤێ کێماسییێ ل سەر خۆ قەبویل نەکەن، و دەستان دانەهێلن، بەلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تشتەکێ دی ژ وان دخواست، هەر وەکی وی دڤیا ب ڤێ چەندێ بزانت کانێ ئەو دێ گوهداریا فەرمانا وی کەن، یان ژی دێ ل دویڤ عەدەتێن ئویجاخکانێ چن؟

هەر وەکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دڤیا بەرچاڤ بکەت کانێ دلێن وان ب تنێ خودێ تێدا مایە، یان ژی هێشتا عەشیرەتکانێ و جاهلییەتێ پشک و بار تێدا هەنە.. پشتی بۆ وی دیاربووی کو ب تنێ وان بەرێ ل خودێ، هنگی گۆتە وان: دەرکەڤن، وەلاتێ خۆ بهێلن، و مشەخت ببن و قەستا خودێ بکەن.

* ل ڤێرێ تشتەکێ دی ژی هەیە دڤێت مرۆڤ ل بیرا خۆ بینتە ڤە دەمێ سەرهاتییا مشەختبوونێ دخوینت.. دژوارترین جزا ئویجاخا عەرەبان

ددا کورێ خۆ یێ نەگوهدار، ئەو بوو وان د ناڤ ئویجاخێن دی دا بەلاڤ دکر کو مە فلان کورێ خۆ ژ ناڤ خۆ دەرێخست، و ئێدی مە و وی چو د گەل ئێک نینە، ئەو نە ژ مەیە! ئەڤ چەندە ل نک مرۆڤێ عەرەب گەلەک ژ قنارەکرنێ نەخۆشتر بوو؛ چونکی پشتی ئویجاخا وی ئەو دەردئێخست، ئویجاخەک نەبوو وی بحەوینت.. موسلمانان، ئەوێن گەلەک ژ ژییێ خۆ ل بەر سیبەرا ڤی عەدەتی بۆراندی، دەمێ باوەری ئینای ئەو د خەمێ نەبوون ئویجاخ پشتا خۆ بدەتە وان، یان ژی وان ژ ناڤ خۆ دەربێخت، بەلکی بەری ئویجاخ پشتا خۆ بدەتە وان، وان پشتا خۆ دا ئویجاخێ، مشەختبوونە وەلاتێ حەبەشە.. پاشی چوونە مەدینێ، بێی هزرەکێ بۆ وی عەدەتی بکەن یێ ئویجاخێ ئەو ل سەر پەروەردە کرین.

* تشتێ بەرچاڤ د ڤان سێزدە سالێن نەخۆشییێ دا ئەو بوو، خودایێ مەزن ب ئاشکەرایی سۆز نەدا پێغەمبەرێ خۆ کو ئەو دێ وی ب سەرێخت و نەیارێن وی شکێنت و ئێختە بن دەستێ وی، بەلکی دگۆتێ: ﴿ فَإِمَّا نَذۡهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنۡهُم مُّنتَقِمُونَ ۝ أَوۡ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِي وَعَدۡنَٰهُمۡ فَإِنَّا عَلَيۡهِم مُّقۡتَدِرُونَ ۝ ﴾ (الزخرف: ٤١-٤٢) یەعنی: ئەگەر مە تو مراندی بەری ئەم تە ب سەر کافرێن مللەتێ تە بێخین، هندی ئەمین ئەم ل ئاخرەتێ دێ تۆلێ ل وان ڤەکەین، یان ئەم دێ وێ عەزابا مە ژڤان پێ دایە وان نیشا تە دەین، هندی ئەمین ئەم دشێین تە ب سەر وان بێخین، و وان ب دەستێن تە و خودان باوەران رەزیل بکەین.

هەر وەکی خودێ دڤیا پێغەمبەری و دویکەفتییێن وی ل هندێ هشیار بکەت کو ئەوێ دئێتە د ئیسلامێ دا دڤێت ئارمانجا وی یا مەزن خودێ و بەحەشت بت نە کو مەزنی و دنیاداری.

* مشەختبوون ژ مـەکەهێ بەر ب مەدینێ ڤە نە ب تنێ رەڤینـەک بـوو ژ زولـم و زۆردارییێ؛ چونکی ئەگەر مـسـەلە رەڤین با، یێن وەکی عومـەری و حەمزەی مشـەخت نەدبوون.

* مشـەختبوون دیسا نە بۆ خۆ زەنگینکرنێ بوو؛ چونکی ئەگەر مـسـەلە ئەو با، یێن وەکی ئەبوو بەکری و عوثمانی پێتڤی ب چوونێ نەبوو.

* مشـەختبوون ب جهێینانا فەرمانا خـودێ بـوو؛ دا کۆمـا خـودان بـاوەر دەولـەتا قورئانێ ئاڤاکەن، دا بنەکۆکێ بۆ چڤاتا ئیسلامێ بدانن، ئەو ئیسلاما دنیا و دین.

* مشـەختبوون بـۆ هنـدێ بـوو دا ئـەو بیـر و بـاوەرێن سـێزدە سـالان موسلمان ل سەر هاتینە پەروەردەکرن، ل سەر عەردی و ب رەنگـەکێ عەمـەلی کار پێ بێتەکرن.

# سالا ئێکێ ل مەدینێ
# سالا خۆبنەجهکرنێ

ڕۆژا ئەینییێ، دوازدەی هەیڤا رەبیعولئەووەلێ ژ سالا ئێکێ مشەختی، ل ئێڤارەکا درەنگ، کاروانێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی ژ خودان باوەران گەهشتە تاخێ بابکێ مالکێ کوڕێ نەججارێ خەزرەجی، جهێ مالخالانێن عەبدلموطـطەلبی، ل وێرێ -وەکی مە گۆتی- حێشترا وی نیخیا، ل وی جهێ نوکە مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکەفتێ.

ئەو کەسێن وێ ڕۆژێ ل مەدینێ دئامادە، دبێژن: چو ڕۆژێن وەکی وێ ڕۆژێ ب کەیف و خۆشی ب سەر مەدینێ و خەلکێ وێ دا نەهاتینە، دا بێژی جەژنە، خەلکی جلکێن نوی کربوونە بەر خۆ، و چووبوونە د ڕێکێ دا، و ژن ل سەر بانان ڕوینشتبوون، دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ببینن دەمێ ئەو دئێت.. و هەر جهەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دگەهشتێ و هەر تاخەکێ ئەو د بەر ڕا دچوو، بەلکی هەر مالەکا ئەو د بەر ڕا دچوو، خەلکێ وێ گازی دکرێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەی موحەممەد، ل نک مە بە، ل ڤێرێ بمینە..

و هۆسا ئیسلام، و پێغەمبەرێ ئیسلامێ، و دویکەفتییێن ئیسلامێ، ژ جهەکێ وەکی مەکەهێ یێ بەرتەنگ، و تژی نەخۆشی و ئاستەنگ، دەرکەفتنە جهەکێ وەکی مەدینێ یێ بەرفرەه، ئەو مەدینەیا ب مشەختبوونێ بوویە پایتەختا ڕۆناهییێ ل جیهانەکا تاریستان، و ژێدەرێ تەوحید و خودێناسییێ ل دەمەکێ تژی کوفر و شرک، و بنگەهێ ڤیانێ ل دنیایەکا تژی کەرب و کین.

ب هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مەدینێ، مەدینە بوو ئەو قاعیدە یێ مرۆڤێن خودێ کارێ خۆ ژێ دەست پێ کری، و گازییا خۆ ژێ بلندکری، ئەو گازییا دخوازت مرۆڤ ژ بەرتەنگییا کۆلەتییا مرۆڤان دەرکەڤنە بەرفرەهییا عەبدینییا خودێ..

## پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مالا ئەبوو ئەییووبێ ئەنصاری:

پشتی حێشترا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل جهەکی ژ تاخێ بەنوو نەججارییان نیخیای، وی گۆت: ئەگەر خودێ حەز بکەت ئەڤە دێ جهێ مە بت.. و وی بڕیار دا کو ئەو ل وی جهی ئاکنجی ببت، و ئەو جهـ (میربەد) بوو، و مەخسەد پێ ئەو جهێ ڕاست و فرەهە یێ مشتاخەیێن قەسپان بۆ هشککرنێ لێ دئێنە دانان، هەر وەسا دبێژن: هندەک قەبرێن موشرکان ژی ل وی جهی هەبوون، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پسیارا وی جهی ژ خالێن خۆ کر کانێ ئەو یێ کێیە؟ وان گۆتێ: ئەو بیستانێ سەهل و سوهەیلییە، و ئەو دو ئێتیم بوون ئەسعەدێ کوڕێ زورارەیی ب خودان دکرن، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتە ب دویڤ وان ڕا و گۆتێ: مە دڤێت ڤی عەردی ژ هەوە بکڕین.. وان گۆت: ئەم دێ وی عەردی بۆ تە کەینە دیاری، ئەی پێغەمبەرێ خودێ. پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل بەر نەهات، و گۆت: ئەم دێ وی ژ هەوە کڕین..

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو عەرد ژ وان کڕی، بڕیار دا مزگەفت و مالا وی ل وێرێ بێنە ئاڤاکرن، و حەتا مزگەفت هاتییە ئاڤاکرن، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتییە ب دویڤ عەیالێ خۆ ڕا دا کو ژ مەکەهێ بێنە مەدینێ، وی پسیار کر: کیژ مال ژ هەمییان نێزیکترە بۆ ڤی جهی؟ ئەبوو ئەییووبی گۆتێ: مالا من ئەی پێغەمبەرێ خودێ. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: هەڕە جهەکی بۆ مە حازر بکە.

ئەبوو ئەییووبێ ئەنصاری، و ناڤێ وی یێ دورست خالدێ کوڕێ زەیدێ نەججاری یێ خەزرەجییە، مالا وی ژ دو قاتان پێک دهات، ئەبوو ئەییووب دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بوویە مێڤانێ مە، ئەز و دەیکا ئەییووبی چوونە قاتێ سەری، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل قاتێ بنی ئاکنجی بوو، ئینا من گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەز ب دای و باب ڤە گۆری تە ببم، ل بەر من گەلەکا گرانە ئەز د سەر تە-دا بم، تو وەرە قاتێ سەری، و ئەم دێ ئێینە قاتێ بنی؛ دا تو د سەر مە دا بی! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەم ل خوارێ بین بۆ مە و مێڤانێن مە ب ساناهیترە.

ب ڤی ڕەنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مالا وی ما، حەتا مزگەفتا وی و مالا وی هاتییە ئاڤاکرن.

### ئاڤاکرنا مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-:

ئێکەمین کار پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری پشتی گەهشتییە تاخێ بەنوو نەججارییان، ئەوێ پشتی هنگی بوویە سەنتەرێ باژێرێ مەدینێ، ئەو بوو وی مزگەفتا خۆ ئاڤاکر، ل وی جهێ مە بەری نوکە بەحس ژێ کری کو عەردێ دو ئێتیمێن خەلکێ مەدینێ بوو.

ئەنەسێ کوڕێ مالکی د گۆتنەکا خۆ دا ئاشکەرا دکەت کو ل ڤی جهی دارقەسپ، و هندەک قەبرێن موشرکان، و خرابەیەک هەبوو، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان دا دارقەسپ بێنە بڕین، و قەبر بێنە ڤەگوهاستن، و خرابە بێتە ڕاستکرن، پاشی وان قورمێن دارقەسپان ب ڕێزکرنە بەر قیبلێ و وەکی دیوارەکی ژ وان چێکر، و بۆ زانین قیبلەیا مزگەفتێ ل دەسپێکێ ل باکوورێ مزگەفتێ بوو چونکی موسلمانان ل وی دەمی د نڤێژێن خۆ دا بەرێ خۆ ددا قودسێ، و وان بناخەیێن مزگەفتێ ژ بەران دانان، و ئێکەمین

ماهۆلک بۆ کۆلانا بناخەیێن مزگەفتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل عەردی دا، و دیوارێن مزکەفتێ ژ لبەنیێن ئاخێ بوون، و بانێ وێ چەقێن دار قەسپان بوون. و ستوین ژ قورمێن دارقەسپان بوون، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل صەحابییان بەر و لبنە بۆ ئاڤاکرنا مزگەفتێ دکێشان، و وان د بەر ئاڤاکرنێ ڕا ئەڤ مالکە ڤەدگێڕا:

(اللهم لا خير إلا خير الآخرة

فاغفر للأنصار و المهاجرة)

سێ دەرگەهـ بۆ مزگەفتێ هاتنە دانان: دەرگەهەک ل پشتا مزگەفتێ، ل لایێ باشوورێ کو نوکە لایێ قیبلەیا مزگەفتێیە، و دەرگەهەک ل لایێ ڕۆژهەلاتا مزگەفتێ بەرانبەر مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د وی دەرگەهی ڕا دهاتە نڤێژێ، و دەرگەهێ سێیێ ل لایێ ڕۆژئاڤایێ.

مزگەفت ل دەسپێکێ یا درێژکانی بوو، یەعنی: درێژیا وێ ژ فرەهییا وێ پتر بوو، بەلێ پشتی هنگی، و هەر ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سالا حەفتێ مشەختی پشتی ڤەکرنا خەیبەرێ، و ژ بەر کو هژمارا موسلمانان زێدە بوو و ئێدی مزگەفتێ تێرا وان نەکر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگەفت ل سەر ڕەنگێ چارگۆشە فرەهـ کر، حەتا درێژیا هەر لایەکێ مزگەفتێ بوویە پێنجی مەتر، یەعنی: مەساحەتا مزگەفتێ هەمی بوو (٢٥٠٠ م) و بانێ وێ سێ مەتر و نیڤان هاتە بلندکرن، و ئەو ب خۆ بەری هنگی بان یێ وەسا بوو ئەگەر مرۆڤەکێ درێژ دەستێ خۆ بلند کریا دا گەهتە بانی. و دەمێ مزگەفت هاتییە فرەهکرن ل سالا حەفتێ، قیبلە هاتبوو گوهاڕتن، لەوا مزگەفت ژ لایێ باشوورێ ڤە (کو لایێ قیبلێ بوو) نەهاتە زێدەکرن.

و. ژ وان حەدیسێن دئێتە ریوایەتکرن کو ل دەمێ ئاڤاکرنا مزگەفتێ هاتینە گۆتن یێن کو دبنە ژ نیشانێن پێغەمبەرینییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو بوو دەمێ موسلمانان لبنە بۆ ئاڤاکرنا مزگەفتێ دکێشان، هەر ئێکی لبنەیەک دئینا، عەمماڕێ کوڕێ یاسری تێ نەبت، وی دو دووە لبنە دئینان، جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیت ئەو یێ دئێت دو لبنە یێن ڤێ، و یێ وەستیای و تۆزەوییە، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تۆز ژێ ڤەمالی و گۆت: وەی بۆ کوڕێ سومەییایێ، ئەو دەستەکا زێدەگاڤییێ دکەت دێ وی کوژت.

و ئەو بوو پشتی هنگی ل سەر دەمێ خیلافەتا ئیمام عەلی، عەممار د شەڕێ صەففینێ دا ب دەستێ لەشکەرێ شامێ هاتە کوشتن، و هنگی هندەک صەحابییان، وەکی عەبدللاهێ کوڕێ عەمری ئەڤ حەدیسە بۆ خۆ کرە دەلیل کو ئیمام عەلی حەقتتر بوو ژ موعاویەی د وێ هەڤڕکییێ دا یا د ناڤبەرا وان دا پەیدا بووی.

دەمێ مزگەفت هاتییە ئاڤاکرن، چو میحراب و منارە و مینبەر نەبوون، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل عەردی خوتبە دخواند، و وی پالێ خۆ ددا قورمێ دارەکێ، پاشی دەمێ مینبەرەک ژ سێ دەرەجان بۆ وی هاتییە دورستکرن، وی ئەو قورم هێلا و ل سەر مینبەرێ خوتبە دخواند، و ب ڕێکێن دورست دئێتە ڤەگوهاستن کو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو قورمێ دارێ هێلای، دەنگەکێ وەسا ژ قورمی هات وەکی دەنگێ ئاخینکا وی مرۆڤی یێ ژ خەریبییان دا دنالت، ئینا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب نک وی قورمی ڤە چوو و ئەو دا بەر سنگێ خۆ حەتا ئەو تەنابووی.

و وەکی ئاشکەرا ئەڤ مزگەفتە ئەوا ب ناڤێ مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دئێتە نیاسین دووەمین مزگەفت بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ

بن- د ژیانـا خۆ دا ئاڤاکری، پشتی مزگەفتا قوبائێ، و ئاڤاکرنا هەردویان ل هەیڤا (رەبیعولەووەلێ) بوو ژ سالا ئێکێ.

## ئاڤاکرنا مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-:

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مەکەهێ مشەختبوویە مەدینێ، وی و هەڤالێ وی ئەبوو بەکری ژی هەردویان عەیالێ خۆ هێلا ل مەکەهێ، یەعنی: ئەو بەری عەیالی دەرکەفتن، چونکی ئەگەر وان مال و عەیالێ خۆ هنارتبا، کافر دا پێ حەسییێن و زانن کو ئەڤە دەسپێکە بۆ دەرکەفتنا وان ب خۆ ژی، و هنگی ئەو دا وان گرن، و ئەو نەشیان عەیالێ خۆ د گەل خۆ ژی ببەن؛ چونکی دەرکەفتنا وان ب خەطەر و دزی ڤە بوو، و نە یا ب رەنگەکێ سورشتی بوو، ڤێجا ئەو نەدشیان وان ب خۆ ڤە بکەنە بەلا، و ئەو بوو ئەو چوون و عەیالێ وان ما ل مەکەهێ.

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگەفتا خۆ ل مەدینێ ئاڤاکری، هندەک مەزەلکێن بچویک ژی بۆ خۆ و عەیالێ خۆ ل لایێ رۆژهەلاتا مزگەفتێ ئاڤاکرن، و ئەڤ مەزەلکە ژی وەکی مزگەفتێ ژ لبنەیێن ئاخێ هاتنە چێکرن، و بانێ وان ب چیتەکێ ژ چەقێن دارقەسپان چێکری هاتە رائێخستن، و ئاخەبان ل سەر هاتەکرن، و بلندییا بانی یا وەسا بوو، حەسەنێ بەصری -ئەوێ د مەزەلکا دەیکا موسلمانان (أم سلمه)یێ ڤە مەزن بووی- دبێژت: دەمێ من دەستێ خۆ درێژ دکر دەستێ من دگەهشتە بانی!

و بەلا کەس هزر نەکەت بێژت: مانێ خانییێن هەمییان وی دەمی دوەسا بوون.. نەخێر! تشتێ مەزن و ماقویلێن مەدینێ وی دەمی شانازی پێ دبر ئەو بوو وان ل سەر گرگ و جهێن بلند ئاڤاهییێن مەزن و بەرفرەه ئاڤا دکرن، و شویرهەیێن بلند ددانێ، و دگۆتنێ: (حصن) یەعنی: ئاسێگەهـ، بۆ هندێ دا ل دەمێ شەڕان کەس نەشێت بگەهتە وان، و ل دەمێ تەناهییێ ژی

دا خۆ پێ مەزن بکەن.. و هەر ئێکی ناڤەک ژی ددانا سەر حصنێ خۆ، و مەدحە بۆ خۆ پێ دکرن، و عەبدللاهێ کورێ ئوبەییێ کورێ سەلوولی، ئەوێ خەلکێ مەکەهێ کارێ وی دکر دا وی بکەنە مەلکێ خۆ بەری هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مەدینێ، حصنەکێ مەزن هەبوو ناڤێ وی کربوو: (موزاحم)، و حەسسانێ کورێ ثابتی یێ شاعر حصنەک هەبوو ناڤێ وی کربوو: (فارع).. و هۆسا وان مەدحە بۆ خۆ د ئاڤاهیێن مەزن و بلند و ئاسێ دا دکر. بەلێ چونکی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نە زەلامێ دنیایێ بوو، وی فەرمان کر هندەک مەزەلکێن بچویک ب ئاخێ ب رەخ مزگەفتێ ڤە بۆ وی و عەیالێ وی بێنە ئاڤاکرن، مەزنێن وی جهی و وی دەمی دگۆتنە خانیێن خۆ (حصن) یەعنی: ئاسێگەهـ، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دگۆتە خانیێن خۆ (حجرات) یەعنی: مەزەل.. بەلێ ئاسێگەهـ ب خودانێ خۆ ڤە چوون، و مەزلک ب خودانێ خۆ ڤە ما!

## عەیالێ پێغەمبەری و ئەبوو بەکری ل مەدینێ:

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مەدینێ ئاکنجی بووی، وی مزگەفت و مالەک بۆ خۆ ئاڤاکر، وەکی مە گۆتی، پاشی وی هەردو مەزلاییێن خۆ: زەیدێ کورێ حارثەی (کورێ خۆ یێ تەبەنییێ)، و ئەبوو رافع، د گەل دەلیلێ خۆ عەبدللاهێ کورێ ئورەیقطێ دوئەلی هنارتنە مەکەهێ، و دو حێشتر د گەل پێنجسەد دەرهەمان دانە ڤێ، دا ئەو ژنکا وی سەودەیا کچا زەمعەی، د گەل هەردو کچێن وی (ئوم کولثووم و فاطمایێ)، و دەیکا وی یا شیری بەرەکەیا حەبەشی ئەوا دبێژنێ: ئوم ئەیمەن، د گەل کورێ وێ ئوسامەیێ کورێ زەیدی بیننە مەدینێ.. ئەڤە ئەندامێن مالا پێغەمبەری بوون، و ئەندامێن مالا ئەبوو بەکری ئەڤە بوون: ژنکا وی (أم رومان)، و کچا وێ عائیشا، و ئەو هنگی خواستییا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، و ئەسمائا کچا ئەبوو

بەکری، و ئەو یا شویکری بوو، شوی ب زوبەیرێ کورێ عەووامی کربوو، و یا ب حەملە بوو ب کورێ خۆ عەبدللاهێ کورێ زوبەیری، و عەبدللاهێ کورێ ئەبوو بەکری.. ئەڤە هەمی پێکڤە دەرکەفتنە مەدینێ، و گەهشتنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەبوو بەکری.

مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یان مەزەلکێن وی، وەکی مە گۆتی ل لایێ ڕۆژهەلاتا مزگەفتێ هاتنە ئاڤاکرن، و مالا ئەبوو بەکری ل لایێ ڕۆژئاڤایا مزگەفتێ هاتە ئاڤاکرن، و د ناڤبەرا وان هەردویان دا مزگەفت بوو.

ل دەسپێکێ هندەک صەحابییێن چەکدار حەرەسی ل مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر، و ئەو ل نک ستوینەکێ ژ ستوینێن مزگەفتێ کۆم دبوون، د گۆتنێ: (اسطوانة الحرس) یەعنی: ستوینا زێرەڤانان، پشتی دەمەکی خودایێ مەزن ئایەتەک بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارت تێدا گۆتی: ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ ﴾ (المائدة: ٦٩) یەعنی: خودێ تە ژ مرۆڤان دپارێزت. هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل وان کر ئەو ڤەرەڤن، و هەر ئێک بچتە مالا خۆ.

## مشەختبوون دەسپێکا دیرۆکا ئیسلامییە:

بەری هاتنا ئیسلامێ عەرەبان سالێن خۆ ب زڤرینا هەیڤێ دهژمارتن، و سالنامەیا وان ب هەیڤێ ڤە یا گرێدای بوو، و هندەک مللەتێن دی هەبوون سالنامەیا خۆ ب زڤرینا ڕۆژێ ڤە گرێ ددا.

سالنامەیا عەرەبان ژ دوازدە هەیڤان پێک دهات، و هەیڤا ئێکێ موحەررەم بوو، بەلێ وان چو سالێن دەسنیشانکری نەبوون دیرۆکێن خۆ پێ بهژمێرن، و بەری هاتنا ئیسلامێ ب چەند سالەکان سەرهاتییا فیلێ ئەبرەهەیی ڕوویدا، و چونکی ئەو ل بەر عەرەبان تشتەکێ غەریب بوو وان

دیرۆکێن خۆ پێ دهژمارتن، دگۆتن: هنده سالان بەری فیلی و هنده سالان پشتی فیلی..

پشتی ئیسلام هاتی، و حەتا سەردەمێ خیلافەتا عومەری ژی -خودێ ژێ رازی بت- ل سالا شازدێ هەڤدێ مشەختی، چو سالێن دەسنیشانکری بۆ دەسپێکا دیرۆکێ د ناڤ موسلمانان دا نەبوون، جارەکێ کاغەزەک بۆ ئیمامێ عومەر هاتە بلندکرن زەلامەکی تێدا ئعتراف ل سەر خۆ کربوو کو ل هەیڤا شەعبانێ فلان حەق دێ کەفتە سەر وی.. عومەری گۆت: شەعبانا کیژ سالێ؟

هنگی عومەری هەست ب گرنگییا هەبوونا دیرۆکەکێ بۆ موسلمانان کر؛ دا ئەو کار و بار و تاریخا خۆ پێ بزانن، لەو وی صەحابی کۆمکرن، و پسیارا خۆ پێ کر کانێ ئەم موسلمان دیرۆکا خۆ ژ چ سالێ دەست پێ بکەین، پتر ژ بۆچوونەکێ هاتە گۆتن، هندەکا گۆت: ئەم دێ کاری ب دیرۆکا فورسێ کەین، و هندەکان گۆت: ب یا رۆمێ. عومەری ئەڤ هەردو بۆچوونە قەبویل نەکرن! پاشی هندەکان گۆت: ئەم دێ تاریخا خۆ ژ سالا بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەست پێ کەین، و هندەکان گۆت: نە، ئەم دێ ژ سالا هنارتنا وی دەست پێ کەین، هندەکێن دی گۆت: ژ سالا مشەختبوونا وی، و هندەکان ژی گۆت: ژ سالا مرنا وی.. ئەڤ هەر چار بۆچوونە صەحابییان هەبوون، پاشی ئەو ل سەر سالا مشەختبوونێ پێکهاتن چونکی ئەو دیرۆک ژ هەمییان ئاشکەراتر بوو، و ئەو ئەو سال بوو یا دەولەتا ئیسلامێ تێدا هاتییە دامەزراندن، و موسلمان تێدا بووینە خودان عەرد و حوکم و دەسهەلات.

هەر وەسا ئەو ب خیلاف چوون کانێ ئەو سالا خۆ ژ کیژ هەیڤێ دەست پێ بکەن، هندەکا گۆت: ئەم دێ ژ رەمەزانێ دەست پێ کەین، و هندەکان

گوّت: ئەم دێ ژ موحەررەمێ دەست پێ کەین، پاشی ئەو ل سەر هندێ پێکهاتن کو ژ موحەررەمێ دەست پێ بکەن.. و هوّسا ل سالا (١٦) یان (١٧) یان (١٨) ل سەر دەمێ ئیمامێ عومەر بوّ جارا ئێکێ سالا مشەختبوونێ ژ لایێ صەحابییان ڤە هاتە هلبژارتن کو ببتە دەسپێک بوّ هژمارتنا دیروّکێ ژ لایێ موسلمانان ڤە.

و هەر چەندە مشەختبوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل دەسپێکا هەیڤا رەبیعولئەووەلێ بوو، کو هەیڤا سێییێیە، بەلێ سال ژ هەیڤا موحەررەمێ دەست پێ دکەت، ل سەر ڤێ بناخەیێ ئەم دبێژین: ل دەسپێکا هەیڤا سێیێ ژ سالا ئێکێ مشەختی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مەکەهێ بەر ب مەدینێ ڤە مشەختبوو. و هەیڤا سێیێ ژ سالا ئێکێ مشەختی ب سەر موسلمانان دا دەرباس نەبوو حەتا ئەو پێکڤە د گەل پێغەمبەرێ خوّ -سلاڤ لێ بن- ل مەدینێ ئاکنجی بوون، و شەنگستەیێ موکم بوّ دەولەتا ئیسلامێ دانا.

## هنده‌ك ژ به‌رچاڤترین سه‌رهاتیێن
## سالا ئێكێ مشه‌ختی

ل هه‌یڤا سێیێ ژ سالا ئێكێ پێغه‌مبه‌ر -سلاڤ لێ بن- ل مه‌دینێ ئاكنجی بوو، و د وان نه‌هـ هه‌یڤێن مایی دا ژ سالا ئێكێ یا مشه‌ختی، هژماره‌كا سه‌رهاتییان ڕویدابوو، ئه‌م ل ڤێرێ دێ ئیشاره‌تێ ده‌ینه هنده‌ك ژ گرنگترین وان سه‌رهاتییان.

**دانا بانگێ**:

هێشتا پێغه‌مبه‌ر -سلاڤ لێ بن- مشه‌خت نه‌بووینه مه‌دینێ، و ب دورستی پشتی سه‌رهاتییا ئیسراء و میعراجێ، خودایێ مه‌زن پێنج نڤێژ د شه‌ڤه‌ك و ڕۆژه‌كێ دا ل سه‌ر موسلمانان فه‌ركرن، به‌لێ ژ به‌ر سه‌ر و به‌رێ موسلمانان یێ به‌رته‌نگ ل مه‌كه‌هێ ئه‌و نه‌دشیان كۆم ببن و پێكڤه نڤێژێن خۆ بكه‌ن.. به‌لێ پشتی ئه‌و مشه‌ختبووینه مه‌دینێ، و هێشتا پێغه‌مبه‌ر -سلاڤ لێ بن- ل مه‌كه‌هێ، ئه‌و موسلمانێن گه‌هشتینه مه‌دینێ ل ده‌مێ نڤێژان ل جهه‌كی كۆم دبوون و نڤێژێن خۆ ب جماعه‌ت دكرن، و پشتی پێغه‌مبه‌ر -سلاڤ لێ بن- ب خۆ گه‌هشتییه مه‌دینێ، و ئێكه‌مین كار ل وێرێ پێ ڕابووی مزگه‌فت ئاڤاكری، ئه‌و هه‌می بۆ كرنا نڤێژێ لێ كۆمبوون، به‌لێ بۆ ده‌مه‌كی ئه‌و حێبه‌تی مان كانێ چاوا ل ده‌مێن نڤێژان ئه‌و دێ خه‌لكی ئاگه‌هدار كه‌ن كو بێن ل مزگه‌فتێ كۆم ببن؟

ژ به‌ر كو چو ژ وه‌حییێ د ڤێ ده‌رباره‌یێ دا نه‌هاته خوارێ، پێغه‌مبه‌ری -سلاڤ لێ بن- دان و ستاندن د گه‌ل صه‌حابییێن خۆ كر كانێ ئه‌و چ بكه‌ن دا خه‌لكی پێ ل ده‌مێ نڤێژێ ئاگه‌هدار بكه‌ن، د مه‌دینێ دا سێ ئویجاخێن

جوهییان هەبوون، و وان ل تاخێن خۆ هندەک کنیشتە بۆ کرنا عیبادەتی هەبوون، و عەدەتێ وان بوو ل دەمێ کرنا عیبادەتی وان ل بۆری دا، یەعنی: بۆق لێ ددا، دا خەلک بزانن دەمێ نڤێژێیە، ژ بەر ڤێ چەندێ هندەک صەحابییان گۆت: ئەم ژی وەکی وان دێ بۆرییێ لێ دەین، و هندەکێن دی گۆت: فەلە ل دێر و کەنیسەیێن خۆ زەنگلێ لێ ددەن، ما بۆچی ئەم وەکی وان ناکەین؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەیف ب ڤان هەردو گۆتنان نەهات؛ چونکی وی دڤیا موسلمان د مەسەلێن خۆ د جودا بن ژ کیتابییان، و چاڤ ل وان نەکەن، و هندەکان گۆت ئەم دێ ئاگرەکی ل سەر جهەکێ بلند هلکەین، بەلێ ئەڤە ژی ب دلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەبوو.. پاشی وەسا چێبوو پتر ژ صەحابییەکی د خەوێ دا دیت گاڤا دبوو دەمێ نڤێژێ، ئەو رادبوو بانگ ددا، سپێدێ ئەو هاتن و هەر ئێکی خەونا خۆ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەگێرا، و ئەو پەیڤ گۆتن یێن وی د خەونێ دا گۆتین، و خەونێن وان هەمییان وەکی ئێک بوون، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەڤ خەونە ددورستن. و وی گۆتە ئێک ژ وان صەحابییێن خەون دیتی: ئەو گۆتنێن تە گۆتین نیشا بیلالی بدە، دەنگێ وی خۆشترە، بلا ئەو گازی کەت..

و بیلال چوو سەر جهەکێ بلند ل مزگەفتێ و بۆ جارا ئێکێ د ئیسلامێ دا بانگ دا، و ژ بلی بیلالی صەحابییەکێ دی ژی هەبوو ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هندەک جاران بانگ ددا ئەو ژی عەبدللاهێ کورێ ئوم مەکتوومی بوو.

### براینییا مشەخت و پشتەڤانان:

بەری نوکە مە ئاشکەرا کریوو کو ل باژێرێ مەدینێ، بەری هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دو ئویجاخێن عەرەبان یێن مەزن دژیان،

خەزرەجی و ئەوسی، و ئەو پسمامێن ئێک بوون، بەلێ ئەو نێزیکی سەد و پێنجی سالان بوو نەیارەتی د ناڤبەرا وان دا پەیدابووی، ئەو نەیارەتییا پتر ژ جارەکێ بوویە ئەگەر کو شەڕ و کوشتن و خوینداری د ناڤبەرا وان دا چێ ببت، و جیرانێن وان یێن جوهی دەستەکێ درێژ د زێدەکرن و بەردەوامیدانا ڤێ نەیارەتییێ هەبوو، ژ بلی ڤێ چەندێ بازێڕێ مەدینێ ب خۆ ژ لایێ ئاڤاهییان ڤە بازێڕەکێ پێکڤە گرێدای نەبوو، و ل هەر جهەکی تاخێ بنەمالەکێ هەبوو، و ئەو یێ جودا و ڤەدەر بوو ژ تاخێ بنەمالا دی، ئەگەر خۆ ئەو هەردو بنەمال ژ ئێک ئویجاخێ ژی بن.. و ئەڤێ ژێک دویراتییێ پتر ئەو ژێک جودا دکرن، دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن خۆ ژ قورەیشییان و هندەک ئویجاخێن دی ژی یێن عەرەبان، بەلکی ژ هندەک مللەتێن دی یێن نەعەرەب ژی، هاتییە بازێڕێ ئەوس و خەزرەجییان، سەر و بەرێ بازێڕی چەندەکێ هاتە گوهاڕتن ژ لایێ مرۆڤان ڤە و ژ لایێ جهی ژی ڤە، ئەو کەسێن ژ دەرڤەیی مەدینێ هاتین، ژ کی بن ژ کی نەبن، خودێ د قورئانێ دا ناڤێ وان کرە: (موهاجر) چونکی ئەو ئەو بوون یێن بۆ خودێ مشەختبووین و مال و حال و جه و مرۆڤێن خۆ هێلاین، و ئەوێن خەلکێ مەدینێ بن، چ خەزرەجی بن چ ئەوسی بن، خودێ ناڤێ وان کرە: (ئەنصار) یەعنی: پشتەڤان؛ چونکی وان ب مالێ خۆ و رحا خۆ پشتەڤانییا دینێ خۆ کر، و دەرگەهێ بازێڕێ خۆ و مالێن خۆ بۆ وان برایێن خۆ یێن خودان باوەر ڤەکر ئەوێن قەستا خودێ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری، خودێ د ئایەتەکێ دا دبێژت: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ﴾ (التوبة: ١١٧) موهاجر و ئەنصار، ئێدی بوونە ئەو ناڤ یێن خودان باوەر پێ هاتینە نیاسین، ئەو دو ناڤێن وان ب دینێ وان ڤە گرێ ددەن، و بیرا وان ل باوەرییێ دئینتە ڤە.

خەلكێ مەدینێ ئەوێن بەری هنگی قەبویل نەدكر پسمامەكێ وان یێ كو ژ عەینی ئویجاخا وان، بێت و ل تاخێ وان ئاكنجی ببت، مادەم نە ژ بابكێ وانە، ب ڕویەكێ گەش و دلەكێ فرەهـ ڤە دەرگەهێ باژێرێ خۆ و تاخێ خۆ و یێ مالێن خۆ بۆ هندەک كەسێن دی یێن بیانی، یێن هەر نە ژ ئویجاخا وان، بەلكی خۆ نە ژ مللەتێ وان ژی ڤەكر..

بۆچی؟ ئاخری ئەڤە تشتەكێ غەریبە د جڤاكەكا وەكی جڤاكا عەرەبی یا وی سەردەمی دا! ئەو چ بوو ئەڤ گوهۆڕینە ل نک وان پەیدا كری، و ئەو ژ گرێكا تەعەصصوبا بۆ ئویجاخ و مالباتان ڕزگار كرین؟

بەرسڤ: ئەو ئیسلام بوو.. ئیسلام ئەو نعمەتا خودێ د گەل وان كری: ﴿ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ﴾ (آل عمران: ١٠٣) هوین وێ قەنجییێ ل بیرا خۆ بینن یا خودێ د گەل هەوە كری: كو هوین -گەلی خودان باوەران- بەری ئیسلامێ نەیارێن ئێک و دو بوون، ئینا خودێ دلێن هەوە ل سەر ڤیانا خۆ و ڤیانا پێغەمبەرێ خۆ كۆمكرن، و ڤیانا هەوە هاڤێتە دلێن ئێک و دو، ڤێجا ژ قەنجییا وی هوین بوونە برایێن خۆشتڤی، و هوین ل سەر لێڤا ئاگرێ جەهنەمێ بوون، ئینا وی بەرێ هەوە دا ئیسلامێ و هوین ژ ئاگری ڕزگاركرن.

ل مەدینێ.. پایتەختا دەولەتا ئیسلامێ، جڤاكەكا نوی ل سەر بناخەیێ باوەرییێ هاتە دانان، و ب هێزترین پەیوەندی یا ئەندامێن ڤێ جڤاكێ گەهاندییە ئێک پەیوەندییا برایینییا دینی بوو، دویر ژ فەرق و جوداییێن نەسەبێ و عەشیرەتێ و دەولەمەندییێ، و ڕیوایەتێن كتێبێن حەدیسێ و سیرەتێ ل سەر هندێ كۆم دبن كو پشتی ئاكنجیبوونا مشەختان ل باژێرێ مەدینێ، و پێخەمەت نەهێلانا جوداییان د ناڤبەرا موسلمانان دا، پێغەمبەری

-سلاڤ لێ بن- بڕیار دا (سیستەمێ براینییێ) د ناڤبەرا موهاجر و ئەنصاران دا بدانت، براینییەکا ژ ڕاستی یا ئاڤاکری ل سەر بناخەیێ گرێبەستەکا موکم، نە کو گۆتنەکا دەڤی یا ڤالا ژ مەعنا و ڕاستییێ، ل دویڤ ڤی سیستەمی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەر موهاجرەک کرە برایێ ئەنصارییەکی، و کانێ برایێن دەیبابی چ حەق ل سەر ئێک و دو هەبوون، ڤان برایان ژی عەینی حەقی ل سەر ئێک و دو هەبوون، حەتا ئەگەر ئێک ژ وان مربا، برایێ وی میراتگرییا وی دکر..

و هزر بکەن چەند کارەکێ مەزن بوو باوەرییێ ب وان دایەکرن، مرۆڤەکێ د جڤاکەکا گرتی دا هاتییە پەروەردەکرن، جڤاکەکا پەیوەندییا نەسەبێ و عەشیرەتکانێ د سەر هەر تشتەکی ڕا دبینت، یێ کو ل نک وی مانعی نەبوو نفشێ خۆ بقەلینت دا بهوستەکا بیستانێ وی نەگەهتە کەسەکێ، ڕازی ببت مرۆڤەکێ بیانی بێت و ببتە شریکێ وی د مالێ وی هەمییێ دا، نە ژ بەر چو.. ب تنێ ژ بەر هندێ چونکی وی باوەری ب دینێ نوی ئینایە، و ڕازیبوویە بێت ل بەر سیبەرا دەولەتا نوی یا ڤی دینی دانای بژیت!

ئەڤە ئێکەمین (مەبدەئێ دەولەتینییێ) بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل نک صەحابییێن خۆ پەیداکری، کو وەلائا وان بۆ وێ پەیوەندییێ بت یا دەولەتا وان ل سەر هاتییە ئاڤاکرن، پەیوەندی و براینییا دینی.

هەر ل سەری، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی مزگەفت ئاڤا دکر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخواز ژ صەحابییێن خۆ کر کو هەر مرۆڤەکێ ئەنصاری ببتە برایێ مرۆڤەکێ موهاجر، پاشی پشتی هنگی ل مالا ئەنەسی ژی ئەڤ کارە دووبارە بوو، و ئەو هنگی نێزیکی سەد مرۆڤان بوون، پێنجی موهاجر و پێنجی ئەنصار، و ب ڤێ چەندێ هەر ئەنصارییەکی

مالێ خۆ و ملکێ خۆ ب نیڤی کر: نیڤەک بۆ وی و نیڤەک بۆ برایێ وی یێ موهاجر، تشتێ بوویە ئەگەرا ب هێزکەفتنا پەیوەندییان د ناڤبەرا ئەندامێن جڤاکێ دا، و بەلاڤبوونا ڤیانێ.

ب راستی ئەڤ سیستەمێ براینییێ یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د جڤاکا مەدینێ دا دانای، د دیرۆکا مرۆڤینییێ هەمییێ دا چێ نەبوویە و دوبارە نەبوویە، کو براینییەک د ناڤبەرا دو کەسان دا ل سەر بناخەییێ باوەرییێ بێتە ئاڤاکرن، حەتا وێ دەرەجێ ئێک میراتگرییا یێ دی بکەت.. و هەڤژییە بێژین: کار ب ڤی سیستەمی د جڤاکا موسلمانان دا، و مەخسەدا مە میراتگرییا ب رێکا براینییا باوەرێ، بۆ دەمەکێ بەروەخت بوو، و پشتی موهاجران پییێن خۆ ل عەردی موکمکرین، و خودێ ئەو بێ منەتکرین ئێدی ئەڤ رەنگێ میراتگرییێ نەما، و مەسەلە زڤری ل سەر ئەصلێ خۆ، کو میراتگری ب نەسەب و خزمایینییێ بت، بەلێ شوینوارێن دی یێن ڤێ سیستەمێ، وەکی پشتەڤانی و هاریکارییێ ئەو هەر مان.

### دستوورێ مەدینێ:

د گەل دەسپێکا ئاڤاکرنا دەولەتا ئیسلامێ ل باژێرێ مەدینی، و پشتی گەهشتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ پایتەختا ڤێ دەولەتێ ب دەمەکێ کورت، وی فەرمان دا دستوورەک بۆ ڤێ دەولەتا نوی بێتە نڤیسین، و هەر کەسەکێ د توخوبێن ڤێ دەولەتێ دا پێ بێتە ئاگەهدارکرن؛ دا پێگیرییێ پێ بکەت، و ئەڤ دستوورە ئەوە یێ د کتێبێن سیرەتێ دا دبێژنێ: (الوثيقة) یان (الصحيفة)[1].

---

(١) گەلەک ژ وان رێکێن ئەڤ دستوورە پێ هاتییە ریوایەتکرن ژ لایێ سەنەدێ ڤە د (ضعیفن) بەلێ هندەک زانا ل وێ باوەرێنە کو ئەو هەمی پێکڤە دگەهنە دەرەجا

ئبن ئیسحاق د سیرەتێ دا ڤەدگوهێزت، کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کیتابەک (نڤیسینەک) د ناڤبەرا موهاجر و ئەنصارییان دا نڤیسی، و تێدا پەیمان د گەل جوهییان گرێدا، کو ئەو مایێ خۆ د دینێ وان و مالێ وان نەکەت، و هندەک شەرت ل سەر وان و هندەک بۆ وان دەسنیشانکرن..

و دەمێ مرۆڤ بەرێ خۆ ددەتە دەقێ ڤێ پەیمانێ، مرۆڤ تێ دئینتەدەر کو ئەو (وەثیقەیەکا) زێدە پێشکەفتی بوو بۆ وی سەردەمی، و ئەو وەک دستوورەکێ مەدەنی یێ مافێن وەلاتییان دەسنیشان کرین و پاراستین دئێتە نیاسین، د ڤی دستووری دا ئەرک و مافێ هەر ئێکی ژ ئەندامێن دەولەتا ئیسلامی یا نوی دئێنە ئاشکەراکرن، چ ئەو ئێک موسلمان بت یان نە، ل سەری ئەو (تێگەهێ ئوممەتێ) یان (مللەتی) وەکی نوکە دئێتە گۆتن، ئاشکەرا دکەت، و دبێژت: موسلمان هەمی چ قورەیشی بن (یان موهاجر) چ ژی خەلکێ یەثربێ بن (یان ئەنصار) و هەر ئێکێ ب دویڤ وان بکەڤت و بگەهتە وان و د گەل وان جیهادێ بکەت، ئەو ئوممەتەکن ژ بلی مرۆڤێن دی.. ب ڤێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- موسلمانان هەمی ل بن ئێک ناڤی کۆمکرن ناڤێ (ئوممەتا ئیسلامێ) و ئەو جوداکرن ژ خەلکێ دی هەمییێ، بۆ هندێ دا وەلاتا وان بۆ ئێک و دو بت، و ل بن ئالایێ دەولەتا وان یا نوی بت. بەلێ مەعنایا ڤێ ئەو نینە ئەو کەسێ باوەری ب دینێ موسلمانان نەئینابت، وی جهـ د ڤێ دەولەتێ دا نابت، یان دڤێت شەرێ وی د دینێ وی و مالێ وی دا بێتەکرن.. نەخێر! د ڕێزەکێ ژ ڕێزێن ڤی دستووری دا هاتییە: هەر جوهییەکێ د گەل مە بت، وی ل سەر مە هەیە ئەم بەرەڤانییێ ژێ بکەین و وی بپارێزین، دا زولم لێ نەئێتەکرن، و شەڕ دژی

---

(صەحیح)، و مرۆڤ دشێت خۆ پێ پشتڕاست بکەت، و هندەک زانایێن دی دبێژن: نەخێر، ئەو ریوایەت هەمی دضەعیفن و دمینن ضەعیف!

وی نەئێتەکرن. و ژ ڤێ ژی پتر د ڕێزەکا دی دا هاتییە کو جوهیین بەنوو عەوفییان ئوممەتەکن د گەل خودان باوەران.. و دەمێ دبێژت: ئوممەتەکن، وەکی ئەم نوکە دبێژین: وەلاتینە.

مەعنا: ئەو کەسێن موسلمان نەبن ژی، بەلێ ل ژێر سیبەرا دەولەتا ئیسلامێ بژین، مافێ وەلاتینییێ هەیە، و چێ نابت زۆرداری لێ بێتەکرن، هندی کو ئەو بەرانبەر وەلاتی و دەولەتێ ب ئەرکێ خۆ ڕابن.

دستووریَ مەدینێ ب ڕەنگەکێ بەرفرەهـ و ئاشکەرا ئەرک و مافێن وان هەمی کۆمان دیارکرن یێن کو ل مەدینێ دژین، و ب روهنی ژی ئاشکەرا کر کو پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- سەرۆکێ ڤێ دەولەتێیە، و دەسهەلاتا تەشریعی و تەنفیذی ژی (یەعنی: دانانا قانوونێ و ب جهئینانا وێ) د دەستێ وی دایە، و نابت بۆ لایەکی کو ژ نک خۆ مافێ دەرکەفتنا ژ بن بەندێن ڤی دستووری بدەتە خۆ، ئەگەر نە.. هنگی ئەو وەک دوژمن بۆ دەولەتێ دێ ئێتە هژمارتن.

و دستووریَ مەدینێ د ڕێزەکا خۆ دا ئاشکەرا دکەت کو ژ مافێ جوهییانە ئەو د وان مەسەلان دا یێن پەیوەندی ب وان ب خۆ ڤە هەی ل مەزن و زانایێن خۆ بزڤڕن، ول دویڤ دەست و دارێ دینی خۆ حوکمێ خۆ بکەن.

و هۆسا ئەم دبینین دەلەتا ئیسلامێ هەر ژ ڕۆژا ئێکێ یا کو تێدا هاتییە ئاڤاکرن، دەولەتەکا مەدەنی و پێشکەفتی بوو، یا کو مافێن هەر وەلاتییەکی تێدا دئێنە پاراستن و ئەرکێن وی ژی دئێنە دەسنیشانکرن، و ئەگەر ئەم ل وان قانوون و دستووران بزڤڕین یێن حەتا ئەڤرۆ ژی دەولەتێن پێشکەفتی دخوازن و گازییێ بۆ دکەن، ئەم دبینین ئەو تشتەکێ چێتر و

پێشکەفتیتر ژ وی یێ دەولەتا ئیسلامێ ئەوا ب دەستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتییەدانان نابێژن و ناخوازن.

## هەلویستێ جوهیان ژ پێغەمبەرێ -سلاڤ لێ بن-:

هەر ژ ڕۆژا ئێکێ یا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا گەهشتییە قوبائێ، و بەری ئەو بگەهتە مەدینێ، جوهییان ب هاتنا وی گەلەک نەخۆش بوو، ژ بەر دو ئەگەران:

**یا ئێکێ**: حەتا بەری پەیدابوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جوهی ل وێ باوەرێ بوون کو نێزیکە پێغەمبەرێ دووماهییا زەمانی دێ ئێت، یێن کتێبێن وان بەحس ژێ دکەت، دێ ئێت، و هەر چەندە کتێبێن وان ب ئاشکەرایی دگۆت ئەو پێغەمبەر دێ ژ وەلاتێ عەرەبان بت، بەلێ وان دلێ خۆ ب هندێ خۆش دکر کو ئەو دێ ژ ناڤ وان جوهییان پەیدا بت یێن کو ل وەلاتێ عەرەبان دژین، وەکی جوهییێن مەدینێ، بەلێ پشتی پێغەمبەر هاتی و وان ب نیشانان زانی کو سەدا سەد ئەڤە ئەو پێغەمبەرە یێ تەوراتا وان بەحس ژێ دکەت، شوینا ئەو ب گۆتنا تەوراتا خۆ بکەن، وان ژ حەسویدی باوەری پێ نەئینا و هندی ژێ هاتی دوژمناتییا وی دکر، جار ڤەشارتی و جار ئاشکەرا.

**یا دویێ**: بەری هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مەدینێ، وان خۆشی و رحەتی و مفایێ خۆ د لێککەفتنا ئەوسی و خەزرەجییان دا ددیت، لەو هندی ژ وان دهات وان نەیارەتی د ناڤبەرا خەلکێ مەدینێ دا گەش دکر، گاڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتی، بەلکی هێشتا ئەو نەهاتی ژی، دەمێ خەلکێ مەدینێ ژ خەزرەجی و ئەوسییان باوەری ب ئیسلامێ ئینای، نیشانێن هندێ ل سەر وان دیاربوون کو ئێدی ئەو دێ بنە ئێک، و نەیارەتی د ناڤبەرا وان دا نامینت، مەعنا ئەو دێ بنە هێزەک بەرانبەر جوهییان، و

ژ بەر کو هژمارا وان ژ یا جوهییان پترە، ئێدی جوهی دێ بنە یێن کێمتر و لاوازتر، ڤێ ژی بۆ جوهییان گەلەک نەخۆش کر.

بەری نوکە دەمێ مە سەرهاتییا سەلمانێ فارسی ڤەگێڕای، مە گۆت: ڕۆژەکێ سەلمان د ناڤ بیستانێ سەییدێ خۆ دا ل سەر دارقەسپەکێ بوو کار دکر، و سەییدێ وی ل بنێ دارقەسپێ بوو، سەلمان دبێژت: پسمامەکێ سەییدێ من هاتە نک وی ل ناڤ بیستانی و گۆتێ: **خودێ بەنوو قەیلە بکوژت** (و مەخسەدا وی پێ -وەکی مە گۆتی- ئەوس و خەزرەجی بوون و قەیلە ناڤێ داپیرەکا وانە) ئەو هەمی نوکە ل قوبائێ یێن کۆمبووین ل دۆر زەلامەکی یێ ژ مەکەهێ هاتی، دبێژن: ئەو پێغەمبەرە..

ئەڤە ڕۆژا ئێکێیە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا گەهشتییە قوبائێ، و هێشتا چو چێ نەبوویە، و ئەڤە زەلامەکێ عامییە ژ جوهییان، ب تنێ وی گوه لێ بوویە کو مرۆڤەکێ هاتییە مەدینێ دبێژت: ئەز پێغەمبەرم، و خەلک یێ ل دۆر کۆمبووین، هند بۆ وی نەخۆش بوو حەتا ئەو چوویە ناڤ بیستانێ پسمامێ خۆ دا ڤی خەبەرێ هندێ نەخۆش بگەهینتێ، و ب ڤێ گۆتنێ دەست پێ بکەت یا کەربا دلێ وی ئاشکەرا دکەت: (خودێ بەنوو قەیلە بکوژت)!!

## موسلمانبوونا عەبدللاهێ کوڕێ سەلامی:

و دا هێشتا هەلویستێ جوهییان بۆ مە ئاشکەرا ببت، و هەلویستێ وان ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گازییا ئیسلامێ، ئەم دێ سەرهاتییەکێ ژ سەرهاتییێن وان ڤەگێڕین یا کو ل سالا ئێکێ مشەختی چێبووی، ل ڕۆژێن ئێکێ یێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا گەهشتییە مەدینێ، ئەو ژی سەرهاتییا موسلمانبوونا زانایێ جوهییان یێ مەزن عەبدللاهێ کوڕێ سەلامییە.

مە گۆت: پەیدابوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هاتنا وی ب مشەختی بۆ مەدینێ، ڕویدانەکا گەلەکا گرنگ بوو ل بەر جوهییێن مەدینێ، و وان ئەو گەلەک ب خەم ڤە وەرگرت، چونکی زانایێن وان گەلەک جاران دگۆت: نێزیکە پێغەمبەرێ دووماهییا زەمانی دێ پەیدا بت، و وان گەلەک سالۆخەتێن ڤی پێغەمبەری ژی دگۆتن، گاڤا کەسەک پەیدابووی و گۆتی: ئەز پێغەمبەرم، بۆ وان بوو مەرەق بزانن کانێ ئەڤە چ مرۆڤە ڤێ گۆتنێ دبێژت یا بەری وی کەسێ نەگۆتی، هەر چەندە وان پێشوەخت بڕیارا خۆ دابوو کو ئەو کەسێ دێ بتە پێغەمبەر دڤێت ئسرائیلی بت، ئەگەر نە.. ئەو باوەرییێ پێ نائینن خۆ ئەگەر یێ ڕاستگۆ ژی بت!

بەلێ کتەکا کێم د ناڤ وان دا هەبوو ئەڤ بڕیارا دویر ژ عەقلی نەدابوو، و وان د گەل خۆ بڕیار دابوو کو هەر جارەکا بۆ وان دیاربوو کو ئەڤ مرۆڤە پێغەمبەرە ئەو باوەرییێ پێ بینن، و ئێک ژ وان کەسان یێن ئەڤ بڕیارە دای عەبدللاهێ کوڕێ سەلامی بوو، و ناڤێ عەبدللاهی بەری موسلمان ببت (ئەلحوصەین) بوو، بابێ وی سەلامێ کوڕێ حارثێ قەینوقاعی بوو، ئەو و بابێ وی ژی ژ زانایێن دینی یێن جوهییان بوو، و وی قەدر و بهایەکێ مەزن ل نک وان هەبوو، عەبدللاه دبێژت: گاڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتییە مەدینێ، خەلک هەمی لێ کۆمبوون، و ئەز ژی ئێک ژ وان بووم یێن لێ کۆمبووین، گاڤا من ئەو دیتی من زانی ڕوییێ وی ڕوییێ درەوینان نینە.. و هندەک زانایێن سیرەتێ ل وێ باوەرێنە کو ئەو ل قوبائێ هاتبوو نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەری ئەو بگەهتە مەدینێ، و هندەک دبێژن: دەمێ ئەو گەهشتییە مەدینێ و مزگەفت ئاڤاکری عەبدللاه هاتە نک وی، و گۆتێ: ئەز دێ هندەک پسیاران ژ تە کەم، ژ پێغەمبەران پێڤەتر کەس بەرسڤا وان نزانت، و پشتی وی پسیارێن خۆ کرین، و پێغەمبەری -سلاڤ

لێ بن- بەرسڤا وی دای، وی گۆت: ئەز شاهدە ددەم کو تو پێغەمبەری، و هنگی ئەو موسلمان بوو، و زڤڕی مالا خۆ و داخواز ژ وان کر کو ئەو ژی موسلمان ببن..

عەبدللاهی ئەڤ چەندە ب دزی ڤە کر، پاشی هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، هندی جوهینە مللەتەکێ بێبەختن، ئەگەر ئەو بزانن ئەز یێ موسلمانبوویم ئەو دێ بێبەختییان ب دویڤ من ڤەنن، ڤێجا ئەز حەز دکەم تو پسیارا من ژ وان بکەی بەری ئەو بزانن کو ئەز یێ موسلمانبوویم، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتە ب دویڤ هندەک ژ سەر و گرگرێن بەنوو قەینوقاعییان ژ جوهییان، کو ئویجاخا عەبدللاهی بوون، و عەبدللاهـ چوو پشت تشتەکی دا ئەو وی نەبینن، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: عەبدللاهێ کوڕێ سەلامی چ زەلامە د ناڤ هەوە دا؟ وان گۆت: ئەو زاناترێ مەیە و کوڕێ زاناترێ مەیە، و یێن وەکی وی د ناڤ مە دا نینن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: پا هوین چ دبێژن ئەگەر ئەو موسلمان ببت؟ وان گۆت: حاشای وی ئەو ڤێ چەندێ بکەت! هنگی عەبدللاهـ دەرکەفتە نک وان و گۆت: گەلی جوهییان، ژ خودێ بترسن، ئەز ب وی کەمە یێ چو خودایێن ب حەق ژ وی پێڤەتر نەهەین، هوین باش دزانن ئەڤە پێغەمبەرێ خودێیە، و یێ ب حەقییێ هاتی، و ئەز شاهدەییێ ددەم کو ئەو پێغەمبەرە.

گاڤا وان ئەڤ چەندە ژ وی دیتی، وان گۆت: تو پیسترینێ مەیی و کوڕێ پیسترینێ مەیی! و دەست پێ کر و پێبەختی و درەو ب دویڤ وی ڤەنان.

عەبدللاهـ ئێک ژ وان کەسان بوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ساخی مزگینییا بەحەشتێ دایێ، و ئەو حەتا سالا (٤٣) مشەختی مابوو

و ل مەدینێ مربوو، و دبێژن: ئەو ئێک ژ وان کەسان بوو یێن پشکداری د ڤەکرنا قودسێ دا کری.

### زێدەبوونا رکاعەتێن نڤێژێ:

پشتی هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مەدینێ ب نێزیکی هەیڤەکێ، ل دوازدەی هەیڤا (رەبیعولئاخەرێ) نڤێژا نیڤرۆ و ئێڤاری و عەیشا ژ دو رکاعەتان بوونە چار رکاعەت، چونکی نڤێژ ل دەسپێکێ دەمێ فەرض بووین دو رکاعەت دو رکاعەت بوون، پاشی ل ڤێ دیرۆکێ -وەکی هندەک زانا دبێژن- ئەو بوو مرۆڤێ ئاکنجی بوونە چار رکاعەت و بۆ مرۆڤێ رێڤنگ هەر مان دو رکاعەت.

### ڤەگوهاستنا دەیکا موسلمانان عائیشایێ:

عائیشایا کچا ئەبوو بەکری ژنکا ئێکانە بوو یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەگوهاستی و ئەو کچ و یا بچویک، هێشتا ل مەکەهێ و پشتی مرنا خەدیجایێ ب دەمەکێ کێم، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ژ بابێ وێ خواستبوو، بەلێ ڤەگوهاستنا وێ هاتە پاش ئێخستن حەتا پشتی مشەختبوونێ ب حەفت هەشت هەیڤەکان، ل مەدینێ و ب دورستی ل هەیڤا شەووالێ کو هەیڤا دەهێیە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ڤەگوهاست، و هەژی گۆتنێیە کو بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- وێ ژ بابێ وێ بخوازت، موطعەمێ کورێ عەدی ئەو بۆ کورەکێ خۆ خواستبوو، بەلێ هێشتا نەڤەگوهاستبوو، پاشی موطعەم لێڤە بوو گۆت: نە کو ئەبوو بەکر کورێ مە وەکی خۆ لێ بکەت، و د سەر دا ببەت! پشتی هنگی ژ نوی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو خواست.

عائیشا د ئیسلامێ دا هاتبوو سەر دنیایێ، دبێژت: هندی من فامکری دەیک و بابێن من موسلمان بوون، و ئەو هەشت سالان ژ فاطمایا کچا

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بچویکتر بـوو، و عائیشا دئێتە هژمارتن ئێک ژ زانـاییێن مـەزنێن صـەحابییان، و زانـینـا وێ ب ئـەدەب و زمـانێ عـەرەبان ژی گەلەک بوو، و وێ ب هـزاران شعرێن عەرەبان ژ بەر بوون، و ئـەو ئێک ژ وانە یێن ب ساخی مزگینی ب بەحەشتێ بوو هاتییەدان، و گەلـەک فقهـ و علمێ شەرعی ب رێکا وێ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ گەهشتییە مە، حەتا هندەک زانا دبێژن: چارێکا ئەحکامێن شەرعی ب رێکا وێ یێن هاتینە ڤەگوهاستن، و ئەو حەدیسێن وێ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ریوایـەتکرین (١٢١٠) حەدیسن.

و فەضل و بهایێ وێ گەلەکە ئەم نەشێین ل ڤێرێ دۆرێ لێ بگـرین، و هـەمـا بەسی وێیە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ هەمی کەسـان پـتر حـەز ژ وێ دکـر، و وی ئـەڤ چەنـدە نەڤەدشـارت، حـەتا جـارەکێ صـەحابییێ وی عـەمـرێ کـورێ عاصی -وەکی بوخاری ژێ ڤـەدگوهێزت- پسیار ژێ کـر: ژ هەمی مرۆڤان پتر تو حەز ژ کێ دکەی؟ وی گۆت: عائیشایێ..

و تشتێ باش و پاقژ و بژوین نەبت پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- حـەز ژێ ناکەت. و ئەو منافقێن کەرب ژ عائیشایێ ڤەدبت، و بێبەختییان د دەر حەقا وێ دا دکەن و دبێژن، خودێ رویێن وان یێن رەش کرین، لەو تـو دبینـی هـەر سـال جـارەکێ ئـەو ب خـۆ ب دەسـتێن خـۆ خـۆ جەلـدە ددەن، و د شـریعەتێ ئیسلامێ دا جەلدە حەددێ بێبەخت و موفتەرییانە! عائیشا ل سالا پێنجی و هەشتێ مشـەختی ل مـەدینێ مربـوو، و ژیـێ وێ هنگی نێزیکی شێـست و هەشت سالان بوو، و ل بەیقعێ هاتبوو ڤەشارتن.

## مشەختێ و نساخێ:

ژ تشـتێن ناڤـدار ل نـاڤ عـەرەبان ئـەو بـوو عـەردێ مـەدینێ عـەردەکێ ئێشەوی بوو، یەعنی: ئەو کەسـێ دهاتـە مـەدینێ و لـێ ئاکنجی دبـوو، تـایێ

دگرت و نساخ دبوو، و دەمێ صەحابی مشەختبووینە مەدینێ، هندەک ژ وان تاوی بوون، و نساخ بوون، ژ وان: ئەبوو بەکر و بیلال بوون، حەتا دبێژن: ئەو ژ بەر دئاخفتن.. ودبێژن: ژ بەر نساخییێ گەلەک صەحابییان ل وی دەمی نەدشیان د نڤێژێ دا ڕابنەڤە، لەو وان ڕوینشتی نڤێژ دکر.

عائیشا دبێژت: ئەز چووم من سەرا بابێ خۆ و بیلالی دا دەمێ ئەو نساخبووین، من دیت ئەو یێ ژ بەر دئاخڤن.. گاڤا ئەز زڤڕیمە مال، من سوحبەتا وان بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر، وی بەرێ خۆ ب نک عەسمانی ڤە بلندکر و گۆت: یا ڕەببی کا چاوا تە مەکەهـ ل بەر مە شرین کرییە، تو وەسا یان پتر مەدینێ ل بەر شرین بکە، و تو نەخۆشییێ ژ مەدینێ ڤەگوهێزە جوحفە.. و ئەو جهەک بوو ژ دەرڤەی مەدینێ.

بوخاری ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزت، دبێژت: من د خەونێ دا دیت هەر وەکی ژنەکا ڕەش و سەر ڤژاڤژ ژ مەدینێ دەرکەفت و دچوو مەهیعەیێ (کو جوحفەیە) ومن ئەو ب ئێشێ تەئویل کر.

و بەری نوکە دەمێ مە بەحسێ باژێرێ یەثربێ کری مە ئاشکەرا کربوو د کتێبا (حەببەقووق)ی دا کو ئێک ژ ئەسفارێن پیرۆزێن ئسرائیلییانە هاتییە کو پێغەمبەرێ دوومـاهییێ دەمێ دئێت، ئێش ل بەراهییا وی دچت، و بەلکی ئەڤە ئیشارەت بت بۆ ڤێ سەرهاتییێ یا د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چێبووی.

## ئێکەمین کەس مری ژ موسلمانان پشتی مشەختێ:

ئێکەمین کەس ژ موسلمانان مری پشتی مشەختبوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مەدینێ -وەکی زانایێن سیرەتێ دبێژن- ئەسعەدێ کوڕێ زورارەیێ خەزرەجی یێ نەججاری بوو، دبێژن: مرنا وی هنگی بوو دەمێ هێشتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییان مزگەفتا مەدینێ ئاڤا دکر،

و ئەسعەد زەلامەکێ جحێل بوو، ل هەر سێ سالێن بەری مشەختبوونێ هاتبوو مەکەهێ بۆ کرنا حەجێ، و ژ وان خەزەرجییان بوو یێن چاڤ ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەفتی و باوەری پێ ئینای، ل هەردو بەیعێن عەقەبێ یێ ئامادە بوو، و ئێک ژ دوازدە نەقیبان بوو.

و هندەک دبێژن: ئێکەمین صەحابی ل قوبائێ مری کولثوومێ کورێ هەدمی یێ ئەوسی بوو، و ئەو ئەو بوو یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چەند رۆژەکان ل مالا وی ئاکنجی بووی دەمێ گەهشتییە قوبائێ، و ئەو مرۆڤەکێ پیرەمێر بوو.

**و ئێکەمین بچویك بووی:**

و ئێکەمین بچویک د ناڤ موسلمانان دا بووی پشتی مشەختێ عەبدللاهێ کورێ زوبەیرێ کورێ عەووامی بوو، بابێ وی زوبەیر کورێ مەتا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، و دەیکا وی ئەسمائا کچا ئەبوو بەکری بوو.. دەمێ ئەسماء مشەختبووی ئەو یا ب حەملە بوو ب عەبدللاهی، و پشتی ئەو گەهشتینە مەدینێ ب چەند هەیڤەکان، و ب دورستی ل هەیڤا شەووالێ ژ سالا ئێکێ، ل وێ هەیڤێ یا خالەتا وی عائیشایێ تێدا شوی ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری، ئەو هاتە سەر دنیایێ.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل هەیڤا رەبیعولئەووەلێ (هەیڤا سێیێ) گەهشتە مەدینێ، و حەتا هەیڤا شەووالێ (هەیڤا دەهێ) چو بچویک ل مەدینێ نەبوون، لەو جوهییان کرە دیعایەت کو مە سحرەکا ل خەلکێ مەدینێ کری، لەو ئێدی وان چو بچویک نابن! بەلێ خودێ ئەو درەوین دەرێخستن و ل هەیڤا شەووالێ عەبدللاه هاتە سەر دنیایێ، لەو دەمێ ئەو بووی ژ کەیفان دا موسلمانان پێکڤە و ب دەنگەکێ بلند تەکبیرات دان.

گاڤا عەبدللاهـ هاتییە سەر دنیایێ دەیکا وی ئەو هنارتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، پێغەمبەری قسپەک جوی و کرە د دەڤێ وی دا لەو ئێکەمین تشت چوویە هناڤێن وی تەڕاتییا دەڤێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، و ئەڤ عەبدللاهە دەمێ یێ بچویک پتر جاران ل نک خالەتا خۆ عائیشایێ بوو، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناسناڤێ عائیشایێ کرە: دەیکا عەبدللاهی.. و ئاشکەرایە کو وێ چو عەیال نەبوون.

تشتێ عەبدللاهی ژ هەمی صەحابییان جودا دکەت ئەوە عەبدللاهـ، و دەیکا وی ئەسماء، و باپیرێ وی ئەبوو بەکر، و بابێ باپیرێ وی ئەبوو قوحافە هەمی صەحابی بوون، یەعنی: چار جیلێن مرۆڤان پێکڤە صەحابی بوون، و ئەڤە بۆ کەسێ دی ژ بلی وی چێ نەبوویە[1].

---

(١) دیرۆکا عەبدللاهی مە د کتێبا خۆ دا (چیرۆک و دیرۆک) ڤەگوهاستییە.

## پەیدابوونا دەستەکا دوڕوییان

بەری نوکە مە بەحسێ حالێ خەلکێ مەدینێ کربوو بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بێت و قەستا باژێرێ وان بکەت، و مە دیار کربوو کو هەڤرکی ل درێژییا سەد و پێنجی سالان د ناڤبەرا خەزرەجی و ئەوسییان دا هەبوو، تشتێ بوویە ئەگەرا پەیدابوونا هژمارەکا شەڕان د ناڤبەرا وان دا، و پشتی ئەو ب ڤێ هەڤرکییێ ڤە وەستیاین، هندەک عەقلدارێن وان ل سەر هندێ پێکهاتن کو ئەو پێکڤە ڕوینن و خۆ بکەنە ئێک، و مەزنەکی بۆ خۆ دەسنیشان بکەن، و بڕیارا وان ئەو عەبدللاهێ کوڕێ ئوبەیێ کوڕێ سەلوولی -و ئەو ئێک ژ مەزنێن خەزرەجییان بوو- بکەنە مەلکێ خۆ و تاجێ بدانن سەر سەری، و ل دەمێ وان خۆ بەرهەڤ دکر دا ڤێ بڕیارا خۆ ب جھ بینن، و بەری ئەو وێ ب جھ بینن، سەرپەشکێن موسلمانان گەهشتنە مەدینێ، پاشی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب خۆ ژی هات، و ب هاتنا وی مەسەلا دانانا تاجێ ل سەر سەرێ (مەلکێ خەزرەجی) هاتە ژبیرکرن! تشتێ بوویە ئەگەرا هندێ مەزنێ خەزرەجی هزر بکەت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تاجا وی ژێ ستاند، و بوو ڕێگر د ناڤبەرا وی و گەهشتنا خەونا مەلکییێ دا، و ڤێ هزرێ بەرێ وی دا هندێ ئەو کەربا خۆ بهاڤێتە ئیسلامێ و پێغەمبەرێ ئیسلامێ، بەلێ دەمێ وی دیتی موسلمانبوونا خەلکێ مەدینێ بوو تشتەکێ واقع، وی د خۆ ڕا نەدیت ڤێ کەربا خۆ ئاشکەرا بکەت، و ڕوی ب ڕوی دژی ئیسلامێ ڕاوەستت، لەو وی شێوەیەکێ دی بۆ نەیارەتییا خۆ ب کار ئینای، و بڕیار دا (دوڕیاتییێ) ب کار بینت!

دیاردا دوڕویاتییێ (نیفاقێ) دەمێ د جڤاکا موسلمانان دا پەیدا دبت، ئەو هندێ دگەهینت کو ئیسلام یا ب هێزە، لەو ئەو کەسێن دلێ وان تژی کوفر و کەرب و نەڤیان نەچار دبن کافرییا خۆ ڤەشێرن، و ب سەر ڤە خۆ ب موسلمانەتییێ بیننەدەر، و هەر چەندە دیاردا نیفاقێ -وەکی مە گۆتی- نیشانا هێزدارییا موسلمانانە، بەلێ ئەو ژ لایەکێ دی ڤە خەطەرەکا دژوارە ژی ل سەر جڤاکێ، ژ بەر کو منافق د چەپەرێ ناڤخۆیی دا کاری بۆ تێکدانا سەر و بەرێ جڤاکێ دکەن، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم دبینین ئەو قورئانا ل مەدینێ هاتییە خوارێ گرنگییەکا زێدە ددەتە مەسەلا ئاشکەراکرنا سالۆخەتێن منافقان، دا موسلمان وان بنیاسن، و خۆ لێ هشیار بکەن.

پشتی گەهشتنا پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی بۆ مەدینێ، و موسلمانبوونا پترییا خەلکێ مەدینێ، هژمارەکا زەلام و ژنان ژ خەلکێ مەدینێ، ئەوێن هاتنا ئیسلامێ بەرژەوەندییێن وان تێکداین، ب دزی ڤە خۆ گەهاندنە ئێک، و بڕیار دا ب سەر ڤە خۆ ب موسلمانەتییێ بیننەدەر، و ژ بن ڤە ل سەر کوفرا خۆ بمینن، و ئێک ژ بەرچاڤترینێ وان عەبدللاهێ کوڕێ ئوبەیێ کوڕێ سەلوولی بوو، و هەر ژ دەسپێکێ ڤێ دەستەکێ بڕیار دا ب ڕەنگەکێ ڤەشارتی پەیوەندییان د گەل کافرێن مەکەهێ و جوهییێن مەدینێ گرێدەن، دا هەر سێ لا پێکڤە دوژمناتییا ئیسلامێ بکەن.. و دیارە کافرێن مەکەهێ (و جوهییان ژی) باوەر دکر کو دبت کوڕێ سەلوولی ژ هەر کەسەکێ دی پتر نەیارەتییا ئیسلامێ بکەت؛ چونکی ئەو ژ هەر کەسەکێ دی ب هاتنا ئیسلامێ (خوسارەت) بوو! لەو هەر ژ دەسپێکێ وان هیڤییێن مەزن ب ڤی (ماقویلێ خەزرەجی) ڤە گرێدان.. (ئەبوو داوود) ڤەدگوهێزت کو پشتی مشەختبوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مەدینێ و هێشتا شەڕێ بەدرێ چێ نەبووی، کافرێن قورەیشییان

کاغەزەک بۆ عەبدللاهێ کوڕێ ئوبەیی و هەڤالێن وی ژ وان یێن صەنەم دپەرێسین ژ ئەوس و خەزرەجییان نقیسی و هنارت، و تێدا گۆتە وان: هەوە هەڤالێ مە یێ حەواندی، و ئەم ب خودێ سویند دخۆین یان هوین دێ شەڕێ وی کەن و وی ژ ناڤ خۆ دەرێخن، یان ئەم هەمی پێکڤە دێ ئێینە هەوە و زەلامێن هەوە کوژین و ژنێن هەوە بەین!

گاڤا کاغەزا وان گەهشتییە کوڕێ ئوبەیی و هەڤالێن وی، وان خۆ کۆم کر و کرە دلێ خۆ شەڕێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەن، گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو چەندە زانی، چوو نک وان و گۆتێ: گەفا قورەیشییان ئێکا هند ژ هەوە چێ کر! تشتێ وان گەف پێ ل هەوە کری، مەزنتر نینە ژ وێ یا هەوە دڤێت هوین د گەل خۆ بکەن، هەوە دڤێت شەڕێ کوڕێن خۆ و برایێن خۆ بکەن؟!

دەمێ وان ئەڤ گۆتنە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بهیستی ئەو ژ ئنیەتا خۆ لێڤەبوون و ڤەرەڤین، ژ ئنیەتا شەڕکرنێ لێڤەبوون، نە کو ژ ئنیەتا نەیارەتییا ئیسلامێ، چونکی ئەو ما ل سەر نەیارەتییا خۆ بۆ ئیسلامێ حەتا ڕۆژا دووماهییێ ژ ژییێ خۆ.

و ژ بلی ڤێ چەندێ کافرێن مەکەهێ کاغەزەک بۆ موسلمانان ب خۆ هنارت و تێدا گەف ل وان کر کو دبت ل هەر دەمەکی ژ شەڤێ یان ڕۆژێ ئەو هێرشێ بدەنە سەر مەدینێ و موسلمانان ببرینن، و ژ بەر ڤێ گەفێ بوویە ل دەسپێکا مشەختبوونێ هژمارەکا صەحابییان ب شەڤێ حەتا سپێدێ زێرەڤانی ل مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر، ژ ترسێن هندێ دا کو کافرێن مەکەهێ ب خۆ یان ب ڕێکا منافق یان جوهییێن مەدینێ نەخۆشییەکێ بگەهیننە وی، یان بەرگەریانا کوشتنا وی بکەن. و ئەو بوو پشتی ئایەتا (٦٧) حەفتێ ژ سوورەتا (المائدة) هاتییە خوارێ، و خودایێ

مەزن تێدا گۆتییە پێغەمبەرێ خۆ: خودێ تە ژ مرۆڤان دپارێزن. وی گۆتە زێرەڤانێن خۆ ژ صەحابییان: گەلی مرۆڤان، هەرن.. خودێ دێ من پارێزت[1].

(١) وەكی ترمذی ڤەدگوهێزت.

# سالا دویێ مشەختی
# سالا دەسپێکرنا جیهادا د ڕێکا خودێ دا

پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- ل هەیڤا سێیێ ژ سالا ئێکێ، کو هەیڤا رەبیعولئەووەلێ بوو، ب مشەختی گەهشتبوو مەدینێ، و ژ هەیڤا سێیێ و حەتا دووماهییا سالا ئێکێ، کو دبنە نەهـ هەیڤ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ژ مشەخت و پشتەڤانان کار پتر بۆ هندێ دکر کو بناخەیێن دەولەتا خۆ یا نوی بنەجهـ بکەن، و جڤاکا خۆ ڕێک بێخن و ب هێز بکەن.. و هەر چەندە ل وی دەمێ موسلمان ل مەکەهێ دژیان، زۆرداریيەکا دژوار ل وان دهاتەکرن، و مافێ وان دهاتە بنپێکرن، بەلێ بەردەوام خودێ و پێغەمبەرێ وی -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل وان دکر کو ئەو بێنا خۆ فرەهـ بکەن، و بەرسڤا شەڕ و تەعداییا کافران نەدەن، و پشتی دەولەتا ئیسلامێ ل مەدینێ هاتییە دانان، و موسلمان بووینە خودان جڤاکەکا سەربخۆ و تایبەت، موسلمانان هزر ل هندێ کر کو ئەو هێزەکا وەسا بۆ خۆ پەیدا بکەن کو خۆ پێ بپارێزن؛ چونکی وان باش دزانی -و ئەڤ چەندە بۆ وان ژ هندەک نیشانان ژی ئاشکەرا بوو، وەکی بۆری د گەل مە- کو نە کافرێن مەکەهێ و نە کافرێن دی ژی ل سەر ڤێ ڕویدانا نوی چێبووی خۆ بێدەنگ ناکەن، و دێ کاری بۆ هندێ کەن کو دەولەتا ئیسلامێ یا نوی پەیدابووی ژ بن ببەن.

هەر ژ دەسپێکا گەهشتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مەدینێ، وی بریارا ئاڤاکرنا مزگەفتێ دا، هەر وەسا کار ب سیستەمێ براینییێ د ناڤبەرا موهاجر و ئەنصاران دا کر، و پەیمانەک د گەل جوهییێن مەدینێ گرێدا، ل دویڤ بنەماییێن ڤێ پەیمانێ ل سەر هەردو لایان فەربوو کو ژ بۆ بەرەڤانییا باژێری ئەو ببنە دەستەک، مەعنا: ب زمانێ ئەڤرۆ ئەم دشێین بێژین: ئێکەمین تشت موسلمانان هزر تێدا کری، ل مەدینێ، ئەو بوو ئەو چەپەرێ خۆ یێ ناڤخۆیی موکم بکەن؛ دا بشێن پشتی هنگی بەرهنگارییا هەر دوژمناتییەکێ بکەن یا کو دبت ژ دەرڤە گەفێ ل وان بکەت.

**بەرێ جیهاد بێتە دورستکرن:**

بەری خودێ دەستویرییێ بدەتە خودان باوەران کو ئەو بەرەڤانییێ ژ خۆ بکەن، گەلەک جاران کافران ب ئاشکەرایی گەف ل خودان باوەران دکرن کو ئەو دێ هێرشێ دەنە سەر وان ل مەدینێ، و ئەو ناهێلن موسلمان ل چو جهان رحەت روینن، ژ بەر ڤێ چەندێ موسلمانان پتر ژ جارەکێ داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر کو ئەو دەستویرییێ بدەتە وان دا ئەو دەست بدەنە خەباتا چەکی و بەرانبەر کافران ڕاوەستن، بەلێ بریارەکا هۆسا نە ب دەستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بوو، لەو وی خۆ گرت حەتا دەستویری ژ لایێ خودێ ڤە هاتی.

دەستویردانا خودێ بۆ خودان باوەران کو ئەو جیهادێ بکەن، د چەند قووناغەکان ڕا بۆری:

یا ئێکێ: دەستویری بۆ وان هاتەدان کو ئەو بەرەڤانییێ ژ خۆ بکەن، دژی وان کەسان یێن شەڕێ وان دکەن و زۆردارییێ لێ دکەن، دەمێ گۆتی: ﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴾ (الحج: ٣٩) یەعنی: دەستویری ب کرنا شەری بۆ وان هاتەدان یێن کو شەڕێ وان

دئێتـەکرن؛ ژ بـەر کـو زۆرداری و تەعـدایی یـا ل وان هاتییـەکرن، و هنـدی خودێیە دشێت وان ب سەربێخت و دوژمنێ وان ڕەزیل بکەت.

یا دویێ: فەرمان ل وان هاتەکرن کو ئەو شەڕی د ڕێکا خودێ دا بکەن، یەعنی: بۆ سەرێخستنا دینێ خودێ د گەل وان کسان بکـەن یێن شـەڕی وان دکـەن، و تەعـداییێ نەکـەن، دەمـێ گـۆتی: ﴿ وَقَٰتِلُـواْ فِي سَـبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيـنَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ۝ ﴾ (البقرة: ١٩٠) یەعنی: هوین د ڕێکا خودێ دا شەڕێ وان بکەن یێـن شەڕێ هەوە دکەن، و تەعدایێ د ڤێ چەندێ دا نەکەن..

یـا سێیێ: فـەرمان ل وان هاتـەکرن کـو ئـەو ژ دەسپێکێ هێرشـێ بدەنـە سـەر وان کافرێن شـەڕکەر، ئـەوێن دخـوازن بۆ خـەلکی ببنـە فتنـە، و ڕێکـێ د ناڤبەرا وان و باوەری ئینانا ب حەقییێ دا بگرن، دەمـێ گـۆتی: ﴿ وَقَٰتِلُـواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ۝ ﴾ (التوبـة: ٣٦) یەعنی: هوین شەڕێ بوتپەرێسان هەمییان بکەن کانێ چاوا ئـەو شـەڕێ هەوە هەمییان دکەن، و هوین بزانن خودێ یێ د گەل تەقواداران.

و دەمێ گـۆتی: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ ﴾ (الأنفال: ٣٩) یەعنی: هوین شەڕێ بوتپەرێسـان بکـەن دا شـرک و پاشڤەبرنا ژ ڕێکا خودێ نەمینت، و دا پەرستنا خودێ ب تنێ بێتەکرن، ڤێجا تـەنگاڤی ژ سـەر بـەنییێن خـودێ ل عـەردی ڕابـیت، و حـەتا دیـن و پەرسـتن و گوهـدان هەمی بۆ خودێ ب تنێ بت نە بۆ کەسێ دی.

و کرنا شـەڕی د زاراڤـێ ئیسـلامێ دا ئـەوێ ئارمـانج ژێ دبتـە بلنـدکرنا دینـێ خـودێ، و سەرێخسـتنا حـەقییێ، دبێژنـێ: (جیهـاد).. و ژ بـەر دورستکرنا شریعەتێ ئیسلامێ بۆ جیهادێ، و ڕابوونا موسلمانان ل درێژییا دیرۆکێ ب ڤی کاری، گەلەک کەس ژ هەڤرکێن ئیسلامێ وەسا نیشا خەلکی

ددەن کو ئیسلام دینەکە حەز ژ شەڕی و خوینڕێتنێ دکەت، و ئەو ب ڕێکا شیری و سەربڕینێ بەلاڤبوویە، لەو ئەم ل ڤێرێ خۆ نەچارِ دبینین، چەندەکێ د گەل ڤێ مەسەلێ ڕاوەستین..

## جیهاد: بۆچی و چاوا؟

ئەو کەسێن ڤەکۆلین ل دۆر مرۆڤی و تبیعەتێ وی کرین یێ خودێ ئەو ل سەر ئافراندن، د بۆچوون و بەرێخۆدانا خۆ دا بۆ ڤی مرۆڤی ل سەر دو بۆچوونان ژێک جودابووینە: ئەرێ خوڕستییا مرۆڤی ل سەر خرابکارییێ هاتییە دورستکرن، و شەڕ و جەنگ حالەتێ سورشتی یێ پەیوەندییانە د ناڤبەرا مرۆڤان دا، هنگی تێ نەبت دەمێ شەڕ وان دوەستینت ڤێجا ئەو نەچار دبن پەنایێ بۆ ئاشتییێ ببەن.. یان ژی مرۆڤ ب تبیعەتێ خۆ چێکرییەکێ باشە، و حەز ژ تەناهییێ دکەت، وەسا تێ نەبت ئەو ژ ترس و هەوجەییێ نەچار ببت بەر ب دوژمنکاری و شەڕی ڤە بچت، و تەناهییا خۆ ژ دەست بدەت، و بەر ب شەڕی ڤە بچت؟

ئیسلامێ وەک دینەکێ خودایی یێ هاتی دا پەیوەندییێن خەلکی ل سەر بناخەیەکێ ساخلەم ئاڤاکەت، و بەرێ وان بدەتە وی تشی یێ مفایێ دینێ وان و دنیایا وان بکەت، لەو د ڤێ مەسەلێ ژی دا ئیسلامێ گۆتنا خۆ هەیە، فەرە ل سەر مە موسلمانێن ئەڤرۆ پتر ژ هەر دەمەکێ دی ئەم خۆ پێ ئاگەهدار بکەین، ئێکەمین جار دا خەلەت د ئیسلاما خۆ نەگەهین، و پشتی هنگی دا ب گۆتنێن وان کەسان ژی نەئێینە خاپاندن یێن دخوازن ب ڕێکا هندەک نموونەیێن کرێتێن واقعێ مە زەلالییا ئیسلامێ ل بەر چاڤێن مە شێلی بکەن.

هەر کەسەکێ شارەزایی د شریعەتێ ئیسلامێ دا هەبت باش دزانت کو دیتن و بۆچوونا ڤی شریعەتی ل سەر وێ ئێکێ بنەجهـ بوویە کو بناخەیێ

پەیوەندییێ د ناڤبەرا مرۆڤان دا ئاشتی و تەناهییە، و شەڕ و جەنگ حالەتەکێ نە یێ سورشتییە مرۆڤ نەچار دبت پەیایێ بۆ ببەت، ئەگەر هات و ئەو نەچار بوو بەرەڤانییێ ژ خۆ بکەت، یان رێکێ ل نەیارەتییا دوژمنەکی بگرت، یان دەلیڤەیێ بۆ گوتنا خێرێ ڤەکەت، هنگی ئیسلام فەرمانێ ب کرنا شەڕی ددەت، و کرنا شەڕی (ئەوێ ئیسلام ناڤێ وی دکەتە جیهاد) ل سەر موسلمانان دکەتە واجبەکێ وەسا یێ کو دڤێت سستی تێدا نەئێتەکرن، مە گۆت: ئیسلام شەڕی واجب دکەت، بەلێ د گەل هندێ ژی ئەو هندەک رێنیشانێن ئاشکەرا دەربارەی پەروەردەیا شەڕی -ئەگەر ئەڤ ناڤە یێ د جهێ خۆ دا بت- بۆ موسلمانی ددانت..

بەری هەر تشتەکی ئیسلام بەرێ موسلمانی ددەتە وێ حیکمەتێ یان ئارمانجێ ئەوا د کۆمبوون و پێکڤە ژیانا مرۆڤان دا هەی، ئەرێ بۆچی خودێ مرۆڤ وەسا داینە ئەو پێکڤە د چەند خەلەکەکێن جڤاکی دا بژین، ژ بچویکترین خەلک بگرە کو بنەمالە، حەتا مەزنترین خەلەک کو گەل و مللەتن؟

ئیسلام دبێژت: ئارمانج و حیکمەت ژ دانا هەر زارۆکەکی ژ دەیک و بابەکی ئەوە (مرۆڤاینی و خزماتی) پەیدا ببت، قورئان دبێژت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ﴾ (الفرقان: ٥٤) یەعنی: خودێیە ژ ئاڤا زەلامی و ژنێ دووندەها مرۆڤی ئافراندی، ڤێجا ژ ڤێ چەندێ مرۆڤاینی و خزماینی چێبوو.

و ئارمانج ژ کۆمبوونا هەر چەند مرۆڤەکان د چارچووڤەیێ مالەکێ دا ئەوە (ڤیان و دلۆڤانی) پەیدا ببت، قورئان دبێژت: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴾ (الروم: ٢١) یەعنی: ئێک ژ نیشانێن مەزنی و شیانا خودێ ئەوە وی هەر ژ نفشێ

هەوە ب خۆ -گەلی زەلامان- ژن بۆ هەوە ئافراندن؛ دا دلێن هەوە ل نک وان رحەت و ئاکنجی ببن، و وی ڤیان و دلۆڤانی کرە د ناڤبەرا هەوە (ژن و مێران) دا.

و ئارمانج ژ دانا مرۆڤان د چارچووڤەیێ گەلەک گەل و مللەتان دا (نیاسینە)، قورئان دبێژت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ﴾ (الحجرات: ١٣) یەعنی: گەلی مرۆڤان، مە هوین ژ بابەکێ ب تنێ کو ئادەمە، و دەیکەکا ب تنێ کو حەووایە ئافراندینە، و ژ لایێ دووندەهێ ڤە مە هوین کرنە گەلەک مللەت و ئویجاخ؛ دا هوین ئێک و دو بنیاسن.

و ئەگەر ئێکدو نیاسین ئارمانجا ئافراندنا مللەتان بت، و ڤیان و دلۆڤانی ئارمانجا دورستبوونا مالباتێ بت، و مرۆڤاینی و خزماینی ئارمانجا هەبوونا مرۆڤی ژ دەیک و بابەکی بت، وەکی قورئان دبێژت، ئەرێ دەلیڤەیا دوژمنی و شەرِ جەنگێ ل کیڤە دمینت؟

ئیسلام دبێژت: شەرِ و نەیارەتی بەلایەکە خودێ ب دەستێن مرۆڤان ب سەر وان دا دئینت دەمێ ئەو ژ وێ رێکێ لاددەن یا خودێ بۆ وان دانایی، و دویکەفتنا وێ رێکێ دکەن یا دوژمنێ وان یێ ئەزەلی، کو شەیطانە، بەرێ وان دایێ، خودێ دبێژت: ﴿ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًا ۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ ﴾ (المائدة: ٦٤) یەعنی: گەلەک ژ وان مرۆڤان ژ بەر سەرداچوون و کوفرا خۆ دێ هندەکێ ل وێ یا بۆ تە هاتی ژ خودایێ تە زێدە کەن.. و مە حەتا رۆژا قیامەتێ نەیارەتی و کەرب و کین هاڤێتە ناڤبەرا وان. مەعنا: دەرباسکرنا وان توخویبان یێن خودێ بۆ مرۆڤان دانایین، ئەو دبتە ئەگەرا پەیدابوونا کەرب و نەڤیانێ د ناڤبەرا وان دا، تشتێ سەری دکێشتە شەرِ و لێکدانێ.

پشتی بنەجهکرنا ڤێ ڕاستییا نەلڤ، ئیسلام ژ موسلمانی دخوازت کو دەمێ ئەو نەچار دبت ڕێکا شەڕی هلبژێرت ژی، دڤێت ئەو هندێ ژێ هلبژێرت هندی نەخۆشی و خرابییێ ژێ بدەتە پاش، و هندی ئەو بشێت بێنا خۆ فرەهـ بکەت و صەبرێ بکێشت و شەڕی پاشدا ببەت و گیرۆ بکەت، ئەو چێترە.. و بەرێ خۆ بدەنە ئایەتێن جیهادێ د قورئانێ دا، دا ببینن کو هەر جارەکا فەرمان ب کرنا جیهادێ هاتبتەکرن، د گەل وێ فەرمان ب صەبرێ و پەنابرنا بۆ ئاشتییێ ژی هەیە.

و دەمێ شەڕ دبتە ڕێکا ئێکانە یا موسلمان نەچاری هلبژارتنا وێ دبت، ئیسلام فەرمانێ ل موسلمانی دکەت کو ئەو تەعداییێ نەکەت، چونکی شەڕ دەمێ پەیدا دبت یا بەرهزر ئەوە تەعدایی ژ لایێ شەڕکەران ڤە بێتەکرن، قورئان دبێژت: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾ (البقرة: ١٩٠) یەعنی: گەلی خودان باوەران هوین د ڕێکا خودێ دا شەڕێ وان بکەن یێن شەڕێ هەوە دکەن، و تەعداییێ نەکەن، هندی خودێیە حەز ژ وان ناکەت یێن تەعداییێ دکەن.

و هندی د پەیوەندییا موسلمانان دا د گەل نەموسلمانان دو ڕێک هەبن، ئێک یا شەڕی بت، و یا دی یا ئاشتییێ، ئیسلام ل سەر وان واجب دکەت کو ئەو ڕێکا ئاشتییێ هلبژێرن، قورئان دبێژت: ﴿ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴾ (النساء: ٩٠) یەعنی: ئەگەر وان دەست ژ کرنا شەڕێ هەوە ڤەکێشان و خۆ ژ هەوە ڤەدەر کر و شەڕێ هەوە نەکر، و ئاشتی هاڤێتە بەر هەوە، هەوە چو حەق ل سەر وان نینە کو هوین شەڕێ وان بکەن.

نەبەس هەوە چو حەق ل سەر وان نینە کو هوین شەڕێ وان بکەن، بەلکی دڤێت هوین د سەرەدەرییا خۆ دا د گەل وان دادی و قەنجییێ د گەل

وان ب كار بينن، و دوژمناتييا وان نەكەن، قورئان دبێژت: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ (الممتحنة: ٨) يەعنى: خودێ هەوە ژ وان كافران پاشڤەنابەت يێن شەڕێ هەوە سەرا دينى نەكرى، و هوين ژ وارێ هەوە دەرنەئێخستين كو هوين باشييێ د گەل وان بكەن، و ب قەنجى دادييێ د گەل بكەن، هندى خودێيە حەز ژ وان دكەت يێن د گۆتن و كريارێن خۆ دا دادييێ دكەن.

و د قانوونا ئاشتى و شەڕى دا، ل نك هەمى مرۆڤان، وەلات ل سەر ئێك ژ دويان دئێنە لێكڤەكرن: ئەو وەلاتێ خەلكێ وێ باوەرى ب وێ هەبت يا تە باوەرى پێ هەى، و هنگى ئەو وەكى وەلاتێ تە دئێتە هژمارتن، يان ژى ئەو وەلاتێ خەلكێ وێ باوەرى ب وێ نەبت يا تە باوەرى پێ هەى، و ئەڤ وەلاتە ژى ل سەر دو پشكان دئێنە لێكڤەكرن: يان ئەو ژ وان وەلاتانە يێن خەلكێ وێ پەيمان دايە تە كو نەيارەتييا تە نەكەن، و ب چو ڕەنگان پشكدارييێ د شەڕێ تە دا نەكەن، و پشتەڤانييا نەيارەكى دژى تە نەكەن، يان ژى ئەو ژ وان وەلاتانە يێن نە ئەڤە كرى و نە ئەڤە كرى، يەعنى: نە باوەرى ب وێ ئينناى يا تە باوەرى پێ هەى، و نە پەيمان دايە تە كو نەيارەتييا تە نەكەت. و ئيسلام ب ڤى ڕەنگێ سورشتى يێ بۆرى دنيايێ و وەلاتان لێكڤە دكەت، ب ديتنا ئيسلامێ هەر وەلاتەكێ هەبت: يان (دار الإسلام)ە، يان (دار العهد)ە، يان (دار الحرب)ە..

و دەمێ مەسەلە دگەهتە هندێ كو شەڕ پەيدا ببت، ئيسلام دبێژتە موسلمانى: بۆ تە دورستە ب تنێ تو شەڕێ وى كەسى بكەى يێ شەڕێ تە دكەت، ژ بەر ڤێ چەندێ هەر جارەكا پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن-، يان جێگرێن وى پشتى وى، كۆمەكا مرۆڤان بۆ كرنا شەڕى هنارتبا، بەرى هەر

تشتەکی شیرەت ل وان دکر کو: (بلا غەدر و خیانەت ژ هەوە پەیدا نەبت، و شەڕێ وان نەکەن یێن شەڕێ هەوە نەکەن، بچویک و ژن و پیران نەکوژن، دار و باری نەبڕن، و حەیوانەتی سەرژێ نەکەن، و هوین دێ هندەک مرۆڤان بینن یێن خۆ ژ خەلکی ڤەدەر کرین و کەفتینە دێر و کنیشتەیان، نێزیکی وان نەبن..).

و ئەگەر شەڕ د ناڤبەرا موسلمانان و نەیاران دا ب گرێدانا پەیمانەکێ ب دوومـاهـی هـات، ئیسلام موسلمانان نەچار دکەت کو ئەو ب وەفا بن، و ژ بەر چ ئەگەرەکا هەبت پێ ل وێ پەیمانێ نەدانن یا وان دایە لایێ بەرانبەر..

ل وێ سالا پەیمانا حودەیبییێ د ناڤبەرا موسلمانان و کافرێن مەکەهێ دا هاتییە گرێدان، ئێک ژ بەندێن پەیمانێ ئەو بوو: ئەگەر ئێک ژ خەلکێ مەکەهێ هات گەهشتە موسلمانان دڤێت ئەو وی بزڤڕیننە مەکەهێ، بەلێ ئەگەر ئێک ژ موسلمانان هات گەهشتە کافرێن مەکەهێ ئەو وی نازڤڕینن! و هێشتا شاندێ کافرێن مەکەهێ ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مرۆڤەک ژ خەلکێ مەکەهێ موسلمان بوو و خۆ گەهاندە خیڤەتگەها موسلمانان، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وی: مەسەلە د ناڤبەرا مە و وان دا پێکهات، و ئەم غەدرێ ناکەین.

و دەمێ خەلیفێ ئیسلامێ عومەرێ کوڕێ خەططابی وەلاتێ شامێ و باژێرێ قودسێ وەرگرتی، وی پەیمان دا خەلکێ باژێری، و ئێک ژ بەندێن پەیمانێ ئەو بوو (ئەو دێ دئەمین بن ل سەر نەفس و مال و کەنیسە و خاچێن خۆ، و چێ نابت کەس دێرێن وان خراب بکەت، یان لێ ئاکنجی ببت و خۆ لێ ئاسێ بکەت..)، و هێشتا عومەر ل نک قەشێ وان یێ مەزن ل کەنیسێ، بوو دەمێ نڤێژێ، هنگی خەلیفە ژ کەنیسێ دەرکەفت، و چوو

ل وێ مەیدانا ب ڕەخ ڤە نڤێژ ب جماعەت ل بەرا هەڤالێن خۆ کر، پاشی زڤڕی نک قەشەی و سوحبەتا خۆ تمام کر، و دەمێ قەشەی داخواز ژ وی کری ئەو و هەڤالێن خۆ ل کەنیسێ نڤێژا خۆ بکەن، وی گۆت: هەر چەندە ل نک مە دورستە کو ئەم نڤێژێ ل ڤێرێ بکەین، بەلێ ئەز دترسم ڕۆژەک بێت موسلمان ڤێ نڤیژا مە بۆ خۆ بکەنە هێجەت و کەنیسا هەوە ژ هەوە بستینن و بێژن: ئەڤە ئەو جهە یێ عومەری نڤێژ لێ کری!

پشتی کرنا جیهادێ بۆ موسلمان هاتییە دورستکرن، و د وان نەهـ دەهـ سالێن مایین دا ژ ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، قانوونەکا دەولەتی یا تمام بۆ سەروبەرێ کرنا شەڕی، ژ لایێ شریعەتی ڤە هاتەدانان، ئەو قانوونا حەتا ڤێ گاڤێ (جڤاکا دەولەتی) و (مللەتێن ئێککگرتی) ل دەمێ تەناهییێ نەشیاین خۆ بگەهیننە نیڤەکا وێ، و ل دەمێ شەڕی پێڤە نەهاتی دەهێکا وێ ب کاربینن!

**بەلاڤبوونا ئیسلامێ و شیر:**

بەری ئیسلام ل سەدسالا حەفتێ زایینی بێت، و دەولەتا خۆ ل دەسپێکێ ل مەدینێ ئاڤا بکەت، پاشی توخویبێن ڤێ دەولەتێ بەرفرەهـ ببن، و ئەو چەق و طایێن خۆ بهاڤێتە سێ کیشوەرێن جیهانێ، دو دینێن دی (یێن عسمانی) ل وێ دەڤەرێ ئەوا هندەک جاران دبێژنێ: (ڕۆژهەلاتا ناڤین) هاتبوون، ئەو ژی: جوهیاتی و فەلاتی بوون، و ئەڤ هەردو دینە ژی ب تایبەتی جوهیاتی -وەکی ئیسلامێ- بووبوونە خودان دەولەت و دەسهەلات، و دەولەتێن وان ژی ل سەر ئاخا هندەک وەلاتان هاتنەدانان، بەری هنگی خەلکێ وان وەلاتان باوەری ب هندەک دینێن دی یێن جودا جودا هەبوون، و دیرۆک ب ئاشکەرایی بۆ مە ڤەدگێڕت کو حەتا ئەو شیاین دەولەتێن خۆ ئاڤاکەن، و دەسهەلاتا خۆ ل سەر خەلکی بنەجهـ بکەن، وان

پەنا بربوو بەر شەڕی، ئەو شەڕێ وان ب کارەکێ دینی یێ پیرۆز دزانی، و حەتا ئەو ب رێکا ڤان شەرێن خۆ گەهشتینە ئارمانجێ وان خوینەکا نە یا کێم رێت.. ئەڤە ڕاستییەکە د دیرۆکێ دا نائێتە ڤەشارتن، بەلێ د گەل هندێ ژی، دەمێ بەحسێ ئیسلامێ و بەلاڤبوونا وێ دئێتەکرن، و سوحبەت دبتە سوحبەتا بەرفرەهبوونا دەولەتا ئیسلامێ، هندەک ژ دویکەفتییێن ڤان هەردو دینێن ناڤێ وان هاتی، د گەل هندەک ژ چاڤلێکەرێن وان ژ مە ب خۆ ژی، ئێکسەر و بێی ب دورستی دیرۆکێ بخوینن، دبێژن: ئیسلام دینەکە ب شیری یێ بەلاڤبووی، و دەولەتا ئیسلامی ل سەر کلۆخێن مرۆڤان هاتبوو ئاڤاکرن!

و بەری ئەم بەرسڤا ڤێ بێبەختییا وان بدەین، مە دڤێت بیرا خواندەڤان ل گۆتنا فەیلەسووفێ ئنگلیز بینینە ڤە، ئەو ژی تۆماس کارلیلە (١٧٩٥ - ١٨٨١ ز)، ئەوێ پێغەمبەرێ ئیسلامێ -سلاڤ لێ بن- هلبژارتی وەک نموونە بۆ مرۆڤێ قەهرەمان، ئەڤ نڤیسەرە دەمێ دئێتە سەر بەحسێ وێ گۆتنێ ئەوا هندەک دبێژن کو موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- دینێ خۆ ب شیری یێ بەلاڤکری، دبێژت: ((بۆ کەسەکێ مەدەنی ژ کورێن دەمێ مە یێ نوکە شەرمزارییە ئەگەر ئەو گوهدارییا وێ هزرێ بکەت، کو دینێ ئیسلامێ درەوە و کو موحەممەد مرۆڤەکێ خاپینۆک بوو، و دەم هات کو ئەم شەرێ گۆتنێن هۆسا یێن لەوچە و ب شەرم بکەین، چونکی ئەو پەیاما وی پێغەمبەری گەهاندی ئەڤە هزار و دوسەد سالە بوویە چرا بۆ نێزیکی دوسەد ملیوون مرۆڤێن وەکی مە خودێ ئافراندین.. و گونەهبارکرنا وی ب هندێ کو وی پال دابوو سەر شیری دا خەلکی نەچار بکەت کو د بەرسڤا گازییا وی بێن، لەوچەییەکە مرۆڤ تێ ناگەهت! چونکی عەقل قەبویل ناکەت کو زەلامەکێ ب تنێ شیرێ خۆ ڕاکەت دا خەلکی پێ بکوژت یان ژی وان نەچار کەت ئەو باوەرییێ ب وی بینن، و ئەگەر هند کەسان باوەری ب وی ئینا یێن کو بشێن

شەڕێ هەڤڕکێن وی بکەن، مەعنا وان ب دلێ خۆ باوەری پێ ئینایە و ئەو ڕاستگۆ دەرێخستییە، و تووشی شەڕێ نەیارێن خۆ بووینە بەری ئەو بشێن بەرسنگێ وان بگرن)).

و ئەڤ مەسەلا ئەڤ فەیلەسووفێ ئنگلیز ئیشارەتێ ددەتێ، مخابن گەلەک جاران ئەم موسلمان ل بیرا خۆ نائینینەڤە، هەر چەندە ئەم بەردەوام سیرەتا ڤی پێغەمبەری و گازییا وی دخوینین ژی.. ل درێژییا سێزدە سالان ژ دەسپێکا پەیدابوونا گازییا ئیسلامێ ل مەکەهێ، هەڤڕکێن ئیسلامێ هەمی ڕێک و تەرز ب کارئینان دا موسلمانان نەهێلن، ژ ئێشاندن و گرتن و برسیکرن و دەرێخستن و حەتا کوشتنێ ژی، و ئێک موسلمانی دەستێ خۆ ل بەر وان ڕانەکر. و پشتی موسلمان ژ جهـ و وارێ وان هاتینە دەرێخستن ژی، و ئەو مشەختبووینە جهەکێ بیانی و دویر و ل وێرێ بناخەیێ دەولەتا خۆ دانای ژی ب نێزیکی سالەکێ ئێک موسلمانی شیر ل بەرانبەر هەڤڕکەکێ خۆ ڕانەکر، و چیکەکا خوینێ نەڕێت، بەلکی ل درێژییا ڤی دەمی هەمییێ ئەو قوربانییێن زۆرداری و ئازاردانا کافران بوون، و خۆ دەمێ ئەو بۆ خۆ ڕەڤین و مال و حالێ خۆ هەمی بۆ کافران هێلای ژی کافران بەلایا خۆ ژێ ڤەنەکر، و دەم بۆ دەمی گەف و گوڕ ل وان دکرن، و قاصد بۆ دهنارتن کو نێزیکە ئەم دێ ب سەر هەوە دا گرین و کتێ ژ هەوە ناهێلین، و لێ دگەڕیان پەیوەندییان د گەل جوهی و منافقێن مەدینێ گرێدەن، دا ئەو هەمی پێکڤە هێرشێ بدەنە سەر موسلمانان، و وان بنبڕ بکەن..

ئەرێ بەرانبەر ڤێ هەمییێ چ ڕێ ل بەرانبەر موسلمانان هەبوو ژ بلی کو بەرگرییا هێزێ ب هێزێ بکەن؟ و کەنگی عەقل دبێژت: دەمێ تو ب شەڕی شەڕێ دوژمنی ژ خۆ بدەیە پاش تاوانە؟

ئێكەمین ئایەتا قورئانێ هاتییە خوارێ دا دەستوپرییێ ب كرنا (جیهاد) بدەتە موسلمانان ئیشارەتێ ددەتە ڤێ مەسەلێ یا دیرۆكێ بۆ مە ڤەگێڕای و فەیلەسووفێ ئنگلیز ئیشارەت دایێ، دەمێ دبێژت: ﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ۝ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ ﴾ (الحج: ٣٩-٤٠) یەعنی: دەستویری ب كرنا شەڕی بۆ وان هاتەدان یێن كو شەڕێ وان دئێتەكرن؛ ژ بەر كو زۆرداری و تەعدایی یا ل وان هاتییەكرن، و هندی خودێیە دشێت وان ب سەربێخت و دوژمنێ وان ڕەزیل بكەت. ئەوێن نەچار بووین كو ژ وارێ خۆ دەركەڤن، نە ژ بەر چو ب تنێ ژ بەر هندێ كو ئەو موسلمان بوون و وان گۆت: ئەللاهـ ب تنێ خودایێ مەیە.

و كەسێ وژدانەک هەبت، یان د خواندنا دیرۆكێ دا یارییان بۆ خۆ ب عەقلێ خەلكی نەكەت، چێ نابت دەستێ خۆ بدانتە سەر خالا ئێكێ دا ژ بەر چاڤێن خەلكی ڤەشێرت، و ئێكسەر خالا دویێ بخوینت، و حوكمەكێ زۆردار ل سەر ئاڤاكەت!

دەمێ موسلمانان دەست دایە جیهادێ ژی -وەكی دیرۆک ئاشكەرا بۆ مە ڤەدگێڕت- وان شەڕێ ئویجاخەكێ یان مللەتەكی نەكر ئەگەر بەری هنگی وێ ئویجاخێ یان وی مللەتی شەڕ د گەل موسلمانان نەكربت، یان گەفێن شەڕی ل وان نەكربن، یان دەست نەدابتە بزاڤ و لڤینێن شەڕی ل بەرانبەر وان، بۆچی موسلمانان شەڕێ فورسێ و ڕۆمێ كر و شەڕێ حەبەشییان نەكر، هەر چەندە ئمبراتۆرییا حەبەشییان یا نێزیكی وان بوو؟ چونكی كیسرای داخواز ژ والییێ ل یەمەنێ كر ئەو بچت پێغەمبەری (ئەدهب) بدەت یان سەرێ وی ژێڤەكەت و بۆ وی بهنێرتە پایتەختا وی، و چونكی ڕۆمییان لەشكەرێ خۆ كۆمكر و بەر ب تەبووكێ ڤە چوون و گۆتن: دڤێت ئەم

موسلمانان د جهێ وان دا نەهێلین.. بەلێ پا چو بزاڤێن نەیارەتییێ ژ دەولەتا حەبەشە پەیدا نەبوون؟ و د گەل هندێ ژی دەمێ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرابووی کو رۆمی هێرشێ نادەتە سەر جهێ موسلمانان ئەو ژ تەبووکێ ڤەگەڕییا و شەڕێ خۆ نەفرۆتە وان!

و د وەلاتێ عەرەبان ب خۆ ژی دا، گەلەک ئویجاخێن کافر هەبوون، ژ قورەیشییێن مەکەهێ پتر نێزیکی مەدینێ بوون، بەلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چو شەڕ د گەل وان نەکرن، وەکی کو د گەل قورەیشییان کرین، بۆچی؟

چونکی وان وەکی قورەیشییان دوژمناتییا گازییا ئیسلامێ نەدکر، و پشتی قورەیشی ژ مەیدانا هەڤرکییێ رابووین و ل سالا هەشتێ مشەختی هاتینە د ئیسلامێ دا، هندەک ئویجاخێن دی یێن عەرەبان ئالایێ دوژمناتییا ئیسلامێ هلگرت، و خۆ دانە ئێک دا هێرشێ بدەنە سەر موسلمانان، هنگی موسلمانان بەر سنگێ وان گرت..

مەسەلەکا دی یا روهنتر ل سەر درەوا وێ گۆتنا دبێژت: ئیسلام ب شیری بەلاڤبوویە، هەر ئێک ژ مە ئەگەر بەرێ خۆ بدەتە نەخشەیێ جیهانێ ئەڤرۆ، دێ بینت رێژەیا هژمارا موسلمانان ل وەلاتێن ئاسیا یا ناڤین، ئەوێن دیرۆک دبێژت: پێلا (فوتووحاتێن ئیسلامێ) قەت نەگەهشتبوویێ، و لەشکەرەکێ موسلمان یێ ب تنێ نەچووبوویێ -وەکی ئەندۆنیسیا و مالیزییا بۆ نموونە- گەلەک و گەلەک پترە، ژ رێژەیا موسلمانان ل وان وەلاتێن ژ ئەنجامێ (فوتووحاتان) هاتینە ستاندن.. ئەڤێ چ مەعنا بۆ هەیە؟

ئەگەر ئەم ئەڤرۆ بەرێ خۆ بدەینە پێکهاتا مرۆڤێن وان وەلاتان ژی یێن ب رێکا (فوتووحاتێن ئیسلامی) هاتینە ستاندن، و بووینە پشکەک ژ جیهانا ئیسلامی -وەکی ئیرانێ و شامێ بۆ نموونە- دێ بینین

ب مليوونـان مـرۆڤ هەنـە هێشـتا يـێن ماينـە ل سـەر دينـێن خۆ يـێن بـەری ئیسلامێ ل دەڤەرێ هەین، و جهێن وان یێن عیبادەتی هێشتا وەکی خۆنە، و د دەسـت وان دانە.. بەلێ ئەگەر ئەم بەرێ خۆ بدەینە جهەکێ وەکی ئەورووپا -بـۆ نموونـە- ئـەوێ بـەری هاتنـا ئیسـلامێ ب کێمتـر ژ سێسـەد سـالان (فوتووحـاتێن مەسـیحی) ل وەلاتـێن وێ بـەلاڤبووین، ئـەم مرۆڤـەکێ ب تنـێ ژی نـابینین ل سـەر دینـێ خـۆ یـێ بـەری هنگـی مابـت، نـە بـەس هنـدە.. موسلمان دەمێ چووینە ئەندەلوسێ و دەولـەتـەکا ئیسـلامی لـێ ئاڤاکری، کـو ب سەدان سالان مـای و حوکم کری و شارسـتانی ئاڤاکری، هنگی و پشـتی هنگی ژی ب مليوونـان خـەلک ل سـەر دینـێ خـۆ یـێ بـەرێ کـو فـەلاتی بـوو مابوون، و کەسێ کـوتـەکی ل وان نەدکر ئەو مـوسلمان ببن، و پشـتی دەولـەتا ئیسـلامێ ل وێـرێ هلوەشـیای ب چەنـد سـالـەکێن کـێم و ژ ئـەنجامێ وێ ئیرهابـا دەولـەتا نـوی ب رێکـا (مەحکـەمێن تەفتێشـێ) ب کارئینـای موسلمانەکێ ب تنێ ل وێرێ نەما.. ئەڤێ چ مەعنا بۆ هەیە؟[1]

## بەرێ شەرێ بەدرێ بێتەکرن:

ئـێـک ژ وان کارێن پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- کری، پشـتی ئـەو ب مـشـەختی گەهشتییە مەدینـێ ب دەمەکێ کێم ئـەو بـوو وی داخواز ژ صەحابییێن خۆ کر کو ئەو وان کەسان بۆ وی بهژمێرن یێن موسلمان بووین کانێ چەندن، و پشتی ئەو ب ڤی کاری رابووین، بۆ وان دیاربوو کـو ب تنـێ ئەو زەلامێن دشێن چەکی هلگرن و شەری بکەن (١٥٠٠) زەلامـن، و گاڤـا ئـەنجامێ ڤـێ هژمـارتنێ هاتییـە راگەهانـدن، رەنگـەکێ دلرحـەتییێ ل نـک

(١) بـۆ پتـر بـەرفرەهی، بـەرێ خـۆ بـدە کتێبـا (حقـائق الإسلام وأباطيـل خصـومه) يـا (عبـاس محمـود العقـاد)، چاپـا سـێیێ سـالا ١٩٨٦، دار الكتـاب اللبنـاني، بـپ (٢١٣-٢٣٦).

موسلمانان پەیدا بوو، و ئەو پشتڕاست بوون، و گۆتن: هزار و پێنج سەد زەلام د ناڤ مە دا هەنە دشێن چەکی هلگرن، و ئەم بترسین؟ ئەڤە چێ نابت!

و بەری هنگی ئەو ژ خۆ دترسییان، خۆ دەمێ دنڤستن ژی چەکێ خۆ ددانا ب ڕەخ خۆ ڤە، چونکی وان نەدزانی کانێ هەلویستێ کافرێن مەکەهێ، و هەلویستێ جوهییان، و یێ وی خەلکێ مای کافر ل مەدینێ ب خۆ ژی، دێ چ بت. و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ بوو -وەکی بەری نوکە ژی مە گۆتی- هندەک صەحابییان زێرەڤانی ل مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دگرت، و ئەو ل نک وێ ستوینا مزگەفتێ ڕادوەستیان ئەوا د گۆتنێ: (اسطوانة الحرس) یەعنی: ستوینا زێرەڤانان، و پشتی ئایەتا: ﴿ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ ﴾ (المائدة: ٦٧) هاتییە خوارێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل وان صەحابییان کر ئەو ڤەرەڤن، و هەر ئێک بچتە مالا خۆ.

و پشتی هژمارا خۆ یا مەزن زانی، وان پتر باوەری ب خۆ ئینا، و قەناعەت بۆ وان چێبوو کو ئێدی وان هەوجەیی ب ترسا ژ دوژمنی نینە، و د شیانا وان دایە کو ئەو -پشتی تەوەککولا ل سەر خودێ- دشێن خۆ ل بەر هەر گەفەکێ بگرن یا ژ لایێ دوژمنان ڤە بێت، چ دوژمنێ ژ دەرڤە بت، یان یێ ناڤخۆیی بت.

چەند ریوایەتەک ژ صەحابییان دئێنە ڤەگوهاستن ژێ دئێتە زانین کو هەر ژ دەسپێکا مشەختبونا موسلمانان و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مەدینێ، و حەواندنا خەلکێ مەدینێ بۆ وان، ئەڤ کارێ وان ژ لایێ کافرێن مەکەهێ ڤە وەک کارەکێ دوژمنکارییێ هاتە هژمارتن، و ب تنێ ڕویدانا مشەختبوونێ، بەری هەر تشتەک چێ ببت، ئێکا هند ژ خەلکێ مەکەهێ چێکر ئەو مەدینێ وەک (دار الحرب) ببینن، و خەلکێ مەدینێ ژی وەک دوژمن بنیاسن، و وان ئەڤ هەلویستێ خۆ ژ خویانی و بیانییان نەدڤەشارت،

هندەک جاران وان کاغەز بۆ هندەک مەزنێن مەدینێ دهنارتن، تێدا گەف لێ دکرن کو: (مادەم هەوە موحەممەد حەواندییە، ئەم دێ ب سەر هەوە دا گرین و ئێک ئێکە هەوە کوژین، یان ژی هوین دێ شەڕێ وی کەن و وی ژ ناڤ خۆ دەرێخن)[1].

هەر وەسا دەمێ وان ئێک ژ خەلکێ مەدینێ دیتبا (ب تایبەتی دەمێ ئەو بۆ حەجێ یان عومرێ چووبانە مەکەهێ) وان گەف لێ دکرن، و دگۆتنێ: چاوا هوین بستە دکەن سەرداچوویێن مە بحەوینن، و هۆسا پشتڕاست بێنە مەکەهێ؟ ئەڤە بۆ هەوە چێ نابت!

دەمێ موسلمانان ئەڤ هەلویستە ژ کافرێن مەکەهێ ددیت، عارا وان قەبویل نەدکر ئەو بێ دەنگ و بێ هەلویست بەرانبەر گەفێن مەکەهییان ڕاوەستن، لەو وان پتر ژ جارەکێ داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کو ئەو دەستویرییێ ب کرنا شەڕی بدەتە وان، بەلێ چونکی بڕیارەکا ب ڤی ڕەنگی نە ژ کارێ پێغەمبەری بوو، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەر دگۆتە وان: صەبرێ بکێشن، و دەستان ژ کرنا شەڕی بەردەن!

و ئەو بوو فەرمان ژ لایێ خودێ ڤە هات، و حەتا خەلکێ مەکەهێ هزر نەکەن موسلمان ل مەدینێ کۆمەکا مرۆڤێن لاوازن گەهشتینە ئێک، و چی گاڤان وان ڤیا ئەو دێ ب سەر دا گرن، ئێکسەر پشتی هاتنا دەستویرییێ ب کرنا شەڕی ژ لایێ خودێ ڤە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زەلامێن چەکدار ژ صەحابییێن خۆ بەرهەڤ کرن، و دەم بۆ دەمی هندەک ژ وان دهنارتنە دەور و بەرێن مەدینێ، دا دەنگ و باسێن وان بگەهنە کافرێن مەکەهێ و کافرێن دی ژی، حەتا ئەو هزر نەکەن موسلمان د بێ هێزن، و نەشێن بەرەڤانییێ ژ خۆ بکەن، و عەدەتێ دیرۆکڤانێن سیرەتێیە ئەو ناڤێ (غەزوە) ددانە سەر

---

(١) د ڤێ دەربارێ دا ئەبوو داوود (٣٠٠٤) ریوایەتەکێ ژ صەحابییەکی ڤەدگوهێزت.

هــەر دەرکەفتنەکا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب خــۆ د گەل صەحابیێن خۆ ب ئنیەتا جیهادێ دەرکەفت بت، ڤێجا چ شەڕ د وێ دەرکەفتنێ دا هاتبتەکرن یـان نــە، و ئــەو ناڤێ (سەرییە) ددانـنــە سەر هەر کۆمـەکێ یا پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- بۆ جیهادێ هنارت بت، و ئەو ب خۆ د گەل درنەکـەفت بت، دیسا شەڕ تێدا هاتبتەکرن یان نە.. و نڤیسـەرێن سیرەتێ ئاشکەرا دکەن کو پێغەمبـەر -سلاڤ لـێ بـن- د ژیانا خۆ دا ب (٢٧) غـەزوەیان ڕابووبـوو، و (٣٨) سەرییە هنارتبوون.

د سالا دویێ یا مشەختی دا، و بەری شەڕێ بـەدرێ ل هـەیڤا رەمـەزانێ چێ ببت، چار غەزا و چار سەرییە ژ مەدینێ دەرکەفتبوون:

**غەزایا ئێکێ:** (غەزایا ئەبوائێ) بـوو، ئەوا ل هەیڤا دویـێ (صـەفەرێ) ژ سـالا دویـێ چێبـووی، دەمـێ پێغەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- د گـەل دوسـەد چەکداران دەرکەفتی، و سەعدێ کوڕێ عوبادەیی ل جهێ خۆ هێلای، و چووی حەتا گەهشتییە وی جهی یێ دبێژنـێ: (ئـەبواء) و جهـەکێ دی یێ دبێژنـێ: (وەددان).. د ڤـێ غـەزایێ دا چـو شـەڕ چـێ نـەبوون، ب تنـێ پەیمانــەکا ئاشتییێ د ناڤبەرا موسلمانان و ئویجاخا (بەنوو ضەمورەی) دا هاتە گرێدان، و ئەڤ پەیمانە بۆ موسلمانان گەلەک یا گرنگ بوو؛ چونکی پـێـغـەمـبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ب وێ پـەیمانێ بێلاییـا ڤـێ ئویجاخێ د وێ هـەڤڕکییێ دا بنەجهـ کر یا کو دبت د ناڤبەرا موسلمان و قورەیشییان دا چێ ببت.

**غــەزایا دویــێ:** (غــەزایا بــواطێ) بــوو، و ئەڤــە ل هــەیڤا ســێیێ (رەبیعولئــەووەلێ) بــوو، و د ڤــێ غــەزایێ ژی دا دوســەد زەلام د گــەل پێغەمبەری بوون، و وی سائبێ کوڕێ عوثمانێ کوڕێ مەظعوونی ل جهێ خۆ هێلابوو ل مەدینێ، و د ریوایەتەکێ دا هاتییە کو وی سەعدێ کوڕێ موعـاذی ل جهێ خۆ هێلابوو. و د ڤێ غەزایێ ژی دا چو شەر چێ نەبووبوون.

**غەزایا سێیێ:** (غەزایا ئەلعوشەیرە) بوو، و ئەڤە ل هەیڤا پێنجێ و هندەکێ ژ شەشێ (جومادایا ئێکێ و دویێ) بوو، و چو شەڕ تێدا چێ نەبووبوو، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەبوو سەلەمە ل جهێ خۆ هێلابوو ل مەدینێ.

**غەزایا چارێ:** (غەزایا بەدرێ یا ئێکێ)، و ئەڤە ل هەیڤا شەشێ بوو، پشتی غەزایا (ئەلعوشەیرە) ب چەند ڕۆژەکان، و وی زەیدێ کوڕێ حارثەی ل جهێ خۆ هێلابوو، و د ڤێ غەزایێ ژی دا چو شەڕ چێ نەبووبوو.

و هەر چار (سەرییە) ئەڤە بوون:

یا **ئێکێ:** سەرییا عوبەیدەیێ کوڕێ حارثی، و ئەڤە ژ شێست زەلامان پێک دهات، و پسامێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عوبەیدە ئەمیرێ وان بوو، و هندەک دبێژن: ئەڤە ل هەیڤا دەهێ ژ سالا ئێکێ بوو، و د ڤێ سەرییێ دا هندەک شەڕێ سڤک د ناڤبەرا موسلمان و کافرێن مەکەهێ دا چێبوو، و سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی هندەک تیر هاڤێتنە کافران، و ئەو ئێکەمین تیر بوون د ئیسلامێ دا هاتینە هاڤێتن.

یا **دویێ:** سەرییا مامێ پێغەمبەری حەمزەیێ کوڕێ عەبدلموطەلبی بوو، و ئەڤە د غەزایا ئەبوائێ دا بوو، یان پشتی وێ ب دەمەکێ کورت، د ڤێ سەرییێ دا سیهـ زەلام د گەل حەمزەی بوون، و چو شەڕ تێدا چێ نەبوون.

یا **سێیێ:** سەرییا سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی، و ئەڤە د غەزایا (ئەلعوشەیرە) دا بوو، یان پشتی وێ ب دەمەکێ کێم، د ڤێ سەرییێ دا هەژدە زەلام د گەل سەعدی بوون، و چو شەڕ تێدا چێ نەبوون.

یا **چارێ:** سەرییا عەبدللاهێ ئەسەدی، و ئەڤە ل دووماهییا هەیڤا ڕەجەبێ بوو، و هەشت زەلام د گەل عەبدللاهی بوون، د ڤێ سەرییێ دا شەڕ

د ناڤبەرا موسلمان و هندەک قورەیشییان دا چێ بوو، ژ وان یێن کو د گەل کاروانەکێ بازرگانی دەرکەفتین، و موسلمانان (عەمرێ کورێ حەضرەمی) کوشت، و دو زەلام ئێخسیرکرن، ئەو ژی ئەڤە بوون: (عوثمانێ کورێ عەبدلاهی و حەکەمێ کورێ کەیسانی) و وان ئەڤ هەردو ئێخسیرە د گەل هندەک دەسکەفتییان د گەل خۆ برنە مەدینێ، و ژ بەر کو ئەڤ رویدانە ل هەیڤا رەجەبێ چێبووبوو، و ئەو ئێک ژ هەیڤێن حەرام بوو یێن شەڕ تێدا چێ نەدبوو ل نک عەرەبان، مەسەلا حوکمێ ئیسلامێ د کرنا شەڕی د ڤان هەیڤان دا د ناڤبەرا موسلمانان هاتە ئازراندن، حەتا ئایەتا (٢١٧)ێ ژ سوورەتا (البقرة) هاتییە خوارێ، وەکی مە د تەفسیرێ دا دیارکری.

# هندەك ڕویدانێن سالا دویێ
# ژ بلی شەڕێ بەدرێ

مەزنترین ڕویدان ل سالا دویێ مشەختی چێبووی شەڕێ بەدرێ بوو، ئەوێ ل هەیڤا نەهێ (رەمەزانێ) چێبووی، وەکی دێ بۆ مە ئاشکەرا بت، ژ بلی ڤێ ڕویدانێ هندەک ڕویدانێن دی یێ گرنگ چێ بووبوون، ل ڤێرێ ئەم دێ بەحسێ هندەک ژ وان کەین:

## ١- ڤەگوهاستنا ڕووگەهێ:

ل مەکەهێ و سالەک و نیڤان ل مەدینێ ژی، دەمێ موسلمانان نڤێژ دکرن، وان بەرێ خۆ ددا مزگەفتا ئەقصایێ ل قودسێ، کو ڕووگەها جوهی و فەلەیان ژی بوو، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د دل دا حەز دکر ئەو د نڤێژێ دا بەرێ خۆ بدەتە کەعبێ، چونکی ئەو ڕووگەها بابێ وی ئیبراهیمی بوو، بەلێ دانا فەرمانەکا ب ڤی ڕەنگی دڤێت ژ لایێ خودێ ڤە بێت، و هندی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مەکەهێ دەمێ وی نڤێژ دکر وی کەعبە دئێخستە ناڤبەرا خۆ و قودسێ دا؛ دا بەرێ وی بکەفتە هەردویان، بەلێ پشتی ئەو چوویە مەدینێ، ئەو نەدشیا ڤێ چەندێ بکەت، لەو وی پشتا خۆ دا کەعبێ و بەرێ خۆ دا قودسێ، و هەر ل سەر ڤی بناخەیی ژی وی قیبلەیا مزگەفتا خۆ ل مەدینێ چێکر.

ل هەیڤا ڕەجەبێ ژ سالا دویێ، پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ غەزایا بەدرا بچویک زڤڕییە مەدینێ ب دەمەکی، فەرمان ژ خودایێ مەزن ب ڤەگوهاستنا ڕووگەهێ ژ مزگەفتا ئەقصایێ بۆ مزگەفتا حەرام هات، ئایەتا (١٤٤)ێ ژ سوورەتا (البقرة) هاتە خوارێ، ئەوا خودایێ مەزن تێدا

دبێژت: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ ﴾.

ل رۆژەکێ ژ رۆژێن هەیڤا رەجەبێ ل دانێ نیڤرۆ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب سەر مینبەرێ کەفت، و صەحابی ئاگەهدارکرن کو خودایێ مەزن فەرمان ل وی کر ئەو رویێ خۆ بەر ب مالا خودێ یا حەرام ل مەکەهێ وەرگێڕت، و ژ بەر کو ئەڤە ئێکەمین جار بوو حوکمەک د ئیسلامێ دا دئێتە (نەسخکرن)، یەعنی: کار ب حوکمەکێ بۆری دئێتە راکرن و حوکمەکێ نوی دئێتەدان، دوژمنێن ئیسلامێ ژ جوهی و منافقان ئەو بۆ خۆ ب دەلیڤە زانی کو گومانێ بۆ موسلمانان چێ کەن، و گۆتگۆتکان د ناڤ وان دا بەلاڤ بکەن، و بێژن: ئەڤە چییە هەرۆ (موحەممەد) حوکمەکی رادکەت و ئێکی ددانت؟! حەتا ڤێ گاڤێ وی دگۆت: د نڤێژێ دا بەرێ خۆ بدەنە قودسێ، ڤێ گاڤێ ئەو یێ دبێژت: بەرێ خۆ بدەنە مەکەهێ.. باشە پا ئەو موسلمانێن ئەڤە هندە سالە نڤێژ کرین و بەرێ خۆ تێدا دایە قودسێ، نڤێژێن وان دێ چ لێ ئێن؟ و ئەوێن مرین بەری رووگەه (قیبلە) بێتە ڤەگوهاستن، حالێ وان دێ چ بت؟

ژ بەر ئەوا بۆری، قورئانێ (د سوورەتا بەقەرە دا) بەحسێ ڤێ مەسەلێ ب فرەهی کر[1]، و موسلمان د راستییا مەسەلا (نەسخکرنێ) گەهاندن، و بۆ وان ئاشکەرا کر کو ئێک ژ مەزنترین ئارمانج و حیکمەتێن ڤی حوکمێ نوی ئەوە موسلمان د دینێ خۆ دا خودان کەسینییەکا سەربخۆ و تایبەتن، و

(١) ئەڤ مەسەلە ژی مە ب بەرفرەهی د تەفسیرا سوورەتا (البقرة) دا بەحس ژێ کرییە، برێنە کتێبا مە: (رێبازا ژیانێ) ١٦٧/١.

ئەو دویڤەلانکێن کەسێ نینن.. و جوهییان ئەڤ چەندە باش دزانی، لەو وان گەلەک ب ڤی حوکمی نەخۆش بوو.

ئێکەمین نڤێژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرێ خۆ تێدا دایە کەعبێ نڤێژا ئێڤاری بوو، چونکی دەمێ ئایەتا گوهۆڕینا قیبلێ هاتییە خوارێ، وی نڤێژا نیڤرۆ کربوو، و تشتێ بالکێش ئەو بوو خەلکێ قوبائێ حەتا ڕۆژا دی سپێدێ نەزانیبوو قیبلە یا هاتییە ڤەگوهاستن، عەبدللاهێ کوڕێ عومەری دبێژت: ل وی دەمێ خەلکی ل قوبائێ نڤێژا سپێدێ ب جماعەت دکر، مرۆڤەک هات دیت بەرێ وان هێشتا یێ شامێ، وی گۆتە وان: دوهی ئایەتەک بۆ -پێغەمبەری سلاڤ لێ بن- هاتییە فەرمانێ ل وی دکەت کو ئەو بەرێ خۆ بدەتە مەکەهێ، هنگی وان ئێکسەر بەرێ خۆ ژ شامێ ب نک مەکەهێ ڤە دا، بێی نڤێژا خۆ ڕاوەستینن. و ئەڤ ڕویدانە لایەکێ ژ قەدر و بهایێ صەحابییان دگەهینت، و کو ئەو هەردەم پێگیرێن فەرمانێن پێغەمبەری بوون -سلاڤ لێ بن-.

**٢- فەربوونا ڕۆژیگرتنا ڕەمەزانێ:**

فەرکرنا گرتنا ڕۆژییێن هەیڤا ڕەمەزانێ، کو هەیڤا نەهێیە ژ سالنامەیا قەمەری، و هژمارتنا ڤی کاری وەک ستوینەک ژ پێنج ستوینێن ئیسلامێ، ل هەیڤا شەعبانێ ژ سالا دویێ مشەختی چێبووبوو، و د ڤێ دەربارێ دا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ (البقرة: ١٨٥).

بەری ڕۆژییێن ڕەمەزانێ بێنە فەرکرن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ڕۆژا عاشوورائێ دگرت، بەلێ پشتی ڕەمەزان فەربووی ڕۆژیا عاشوورائێ بوو سوننەت، و د گەل فەرکرنا ڕۆژییێن ڕەمەزانێ، دانا زەکاتا فتران، هەر وەسا نڤێژا جەژنێ ژی هاتنە دورستکرن و (تەشریعکرن).

### ٣- فەركرنا زەكاتێ:

ئەڤە پشتی هەیڤا رەمەزانێ بوو، ئیمامێ نسائی ژ هندەک صەحابییان ڤەدگوهێزت کو فەربوونا دانا زەکاتێ پشتی فەربوونا دانا فتران بوو، و جمهوورێ زانایان دبێژن: فەرکرنا زەکاتێ ل سالا دویێ مشەختی بوو ل مەدینێ، و ئەگەر رۆژیگرتنا رەمەزانێ ل سالا دویێ مشەختی بت، وەکی بۆری د گەل مە، مەعنا: فەرکرنا زەکاتێ دڤێت بکەفتە د ئێک ژ وان هەر سێ هەیڤێن پشتی رەمەزانێ دا یێن ڤێ سالێ.

و هۆسا وەکی ئەم دبینین، د قووناغا مەدینێ دا ژ ژیێ گازییا ئیسلامێ، ئەوا نێزیکی دەهـ سالان ڤەکێشای، و پشتی دانانا دەولەتا ئیسلامێ، بارا پتر ژ حوکم و ئەحکامێن شەرعی هاتنە دانان و ب جهئینان.

### ٤- مرنا روقەییایا کچا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-:

روقەییە کچا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ خەدیجایێ بوو، ل دەسپێکا هاتنا ئیسلامێ وێ شوی ب عوثمانێ کورێ عەففانی کربوو، و بەری هنگی بابێ وێ ئەو دابوو پسمامێ خۆ عوتبەیێ کورێ ئەبوو لەهەبی، بەلێ هێشتا عوتبەیی ئەو نەڤەگوهاستی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە هنارتن ب ئیسلامێ، و چونکی ئەبوو لەهەبی نەیارەتی پێغەمبەری کر وی ژ کورێ خۆ داخواز کر ئەو کچا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەردەت، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو دا عوثمانی.. و بەری نوکە مە ئاشکەرا کربوو کو روقەییا و زەلامێ وێ عوثمانی ئێکەمین کەس بوون ب ئەمرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مشەختبووینە وەلاتێ حەبەشە.

ل وی دەمێ موسلمان دەرکەفتینە بەدرێ، ل هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا دویێ، روقەییایا کچا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یا نساخ بوو، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا عوثمانی کو ئەو بمینتە ل مال؛ دا

چاڤدێرییێ ل ژنکا خۆ بکەت. و بەری موسلمان ژ بەدرێ بزڤرنەڤە خودێ وەسا حەزکر روقەییا مر، و گاڤا مزگینییا سەرکەفتنا موسلمانان گەهشتییە مەدینێ عوثمان د گەل چەند زەلامان موژیلی ڤەشارتنا روقەییایێ بوون ل (بەقیعێ).

پشتی مرنا روقەییایێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کچا خۆ یا دی (ئوموکولثووم) دا عوثمانی، و ئەڤە -وەکی دێ ئێت د گەل مە- ل سالا نەهێ مشەختی مربوو. و وان هەردویان چو زارۆک ژ عوثمانی نەبوون، و ئەو هەردو دەمێ مرین ژییێ وان نێزیکی سیهـ سالان بوو.

### ٥- شویکرنا فاطمایا کچا پێغەمبەری:

پشتی مرنا روقەییایێ، ب نێزیکی دو هەیڤان خویشکا وێ یا بچویکتر فاطمایێ شوی ب پسمامێ بابێ خۆ عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی کر، و دەمێ وێ شوی ب عەلی کری ژییێ وێ نێزیکی بیست سالییێ بوو، و ئەو نێزیکی دەهـ سالان ما د گەل عەلی، و پێنج زارۆک خودێ ژێ دانێ، سێ کوڕ و دو کچ: حەسەن و حوسێن و موحسن (و ئەڤە دەمێ هێشتا ساڤا مربوو) و زەینەب و ئوموکولثووم.

## شەڕێ بەدرێ

### چوون بەر ب شەڕی ڤە:

دەنگ و باس گەهشتنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو کاروانەکێ بازرگانی یێ خەلکێ مەکەهێ ب سەرۆکاتییا مەزنێ قورەیشییان (ئەبوو سوفیان) د گەل سیه چل زەلامان ب ڕێڤەنە، و دێ ژ شامێ زڤڕنە مەکەهێ، و ڤی کاروانی مالەکێ مەزنێ خەلکێ مەکەهێ د گەل دا بوو، حەتا دبێژن: ئەو هزار حێشترێن بارکری بوون، و بهایێ پێنجی هزار دیناران مال د گەل بوو..

و دڤێت ئەم ل بیرا خۆ بینین کو ل وی دەمی حالەتێ شەڕی د ناڤبەرا موسلمانان و کافرێن مەکەهێ دا هاتبوو ڕاگەهاندن، و گەلەک جاران قورەیشییان گەف بۆ موسلمانان دهنارتنە مەدینێ، و دگۆتن: نێزیکە ئەم ب سەر هەوە دا بگرین، و کتەکێ ژ هەوە نەهێلین! هەر وەسا دڤێت ل بیرا خۆ بینن کو ئەو گەلەک ژ موسلمانێن ژ مەکەهێ مشەختبووین، پشتی چووینە مەدینێ کافرێن مەکەهێ دەست دانا سەر مال و حالێ وان، و ئەو بۆ خۆ بر، و هندەک ژ وی مالێ د ڤی کاروانێ قورەیشییان دا هەی، ئەو مالێ موسلمانان بوو یێ وان ب زۆرداری بری.. د ڤی حالی دا، و ل دویڤ هەمی عورف و عەدەتێن لەشکەری، موسلمانان ماف هەبوو ڕێکا بازرگانییێ ل دوژمنی بگرن، دا دربەکێ ئابۆری پێ بدانن، و دەلیڤەیێ نەدەنە وان ئەو ڤی مالی د ڕێکا شەڕێ موسلمانان دا خەرج بکەن.. لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ هەڤالێن خۆ خواست کو هەچییێ بڤێت بلا کارێ خۆ بکەت؛ دا ئەو بچن ڕێکێ ل ڤی کاروانێ قورەیشییان بگرن.

بەری موسلمان دەرکەڤن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زەلامەک هنارت؛ دا دەنگ و باسان بۆ وی ل دۆر کاروانێ قورەیشییان کۆم بکەت، و پشتی ئەو زەلام ب دەنگ و باس ڤە زڤڕی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخواز ژ صەحابییێن خۆ کر کو ئەو دەرکەڤن، و ئەو بوو پشتی چەند ڕۆژەک ژ دەسپێکا هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا دویێ مشەختی چوون، ئەو دەرکەفتن و هژمارا وان د ناڤبەرا (٣١٤) حەتا (٣١٩) زەلامان دا بوون ژ موهاجر و ئەنصارییان، و دەمێ ئەو دەرکەفتین پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابییێ خۆ (عەبدللاهێ کوڕێ ئوم مەکتوومی) ل شوینا خۆ هێلا ل مەدینێ؛ دا ئەو نڤێژان ل بەرا موسلمانان بکەت، و ب ڕێڤە وی (ئەبوو لوبابە) ژی زڤڕاندە مەدینێ دا ئەو ببتە مەزنێ باژێری حەتا ئەو دزڤڕت.

مەزنێ قورەیشییان ئەبوو سوفیانی، ئەوێ سەرکێشییا کاروانێ وان یێ بازرگانی دکر، (تەوەققوعا) هندێ دکر کو موسلمان بێنە د ڕێکا وی دا، ژ بەر کو ئەو د حالەتێ شەڕی دا بوون د گەل موسلمانان، لەو وی هەردەم سەح و سوییێن ڕێکێ ژ ڕێڤنگان وەردگرتن، و کانێ چ دەنگ و باس هەنە، و دەمێ وی ژ هندەک ڕێباران زانی کو موسلمانان ل بەرە بێنە د ڕێکا وی دا، وی مرۆڤەک کرێ کر و هەر زوی هنارتە مەکەهێ دا د هەوارا کاروانێ خۆ دەرکەڤن، گاڤا ئەڤ خەبەرێ نەخۆش گەهشتییە خەلکێ مەکەهێ وەکی (نەفیرعامەکێ) د ناڤ وان دا پەیدا بوو، و وان کارێ شەڕی کر، و پێکڤە د هەوارا کاروانێ خۆ دەرکەفتن، و ئەڤە ئەو کار بوو یێ موسلمانان هزر بۆ نەکری، چونکی دەمێ ئەو ژ مەدینێ دەرکەفتین، قەت د هزرا وان دا نەبوو قورەیشی د هەوارا ئەبوو سوفیانی بێن و شەڕەک د ناڤبەرا وان و خەلکێ مەکەهێ دا چێ ببت، و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ بوو هژمارا وان یا کێم بوو، وەکی مە گۆتی ل دۆرێن (٣١٤) کەسان بوو.

د ڤێ دەرکەفتنێ دا، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سێ ئالا هەبوون، ئالایێ مەزن یێ سپی بوو و ئەو د دەستێ (مصعەبێ کورێ عومەیری) دا بوو، و هەردوییێن دی درەش بوون، ئێک د دەستێ (عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی) دا بوو، و یێ دی د دەستێ (سەعدێ کورێ موعاذی) دا بوو، و حەفتێ حێشتر د گەل موسلمانان بوون، هەر سێ چارەک ژ وان ب نۆبە ل حێشترەکێ سویار دبوون، و پێغەمبەر ب خۆ ژی -سلاڤ لێ بن- د گەل عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی و مرثەدێ کورێ ئەبوو مرثەدی ب حێشترەکێ بوون، و هەر گاڤەکێ ئێک ژ وان سویار دبوو.

دەمێ ئەبوو سوفیانی زانی موسلمان یێن دەرکەفتینە د رێکا وی دا، وی ب لەز هنارتە د دویڤ قورەیشییان دا؛ دا ئەو د هەوارا وی بێن، وەکی مە گۆتی، و ژ لایەکێ دی ڤە وی رێکا کاروانی بەروار کر، و خۆ ژ وان رێکان دا پاش یێن وی هزر دکر کو موسلمان دێ تێرا ئێنێ، و وی قەستا لایێ دەریایا سۆر کر، و وی شیا کاروانی دەرباس بکەت، و خۆ ژ دەڤەرێن ب ترس رزگار بکەت.

گاڤا هەوار گەهشتییە خەلکێ مەکەهێ، ئەو پێکڤە رابوونە سەر خۆ، و گۆتن: ئەڤە ئەو بوو یا ئەم ژێ دترسیاین.. و وان لەشکەرەکێ پێکهاتی ژ نێزیکی هزار چەکداران (یەعنی: سێ جاران هندی موسلمانان) ئامادە کر، و مەزنێن وان هەمی د گەل دەرکەفتن: (ئەبوو جەهلێ کورێ هیشامی، ئومەییەیێ کورێ خەلەفی، سوهەیلێ کورێ عەمری، عوتبەیێ کورێ رەبیعەی و برایێ وی شیبە، و عەبباسێ کورێ عەبدلموطەلبی..) و گەلەکێن دی، ب تنێ ئەبوو لەهەبێ کورێ عەبدلموطەلبی تێ نەبت، ئەو هنگی یێ نساخ بوو، لەو وی عاصییێ کورێ هیشامی پێش خۆ ڤە هنارت، بەرانبەر هندێ کو ئەو چار هزار دەرهەمان دەینێ خۆ ب وی بهێلت! لەشکەرێ

قورەیشییان وەکی مە گۆتی نێزیکی هزار کەسان بوو، و دوسەد هەسپ د گەل دا بوون، هەر وەسا وان هژمارەکا سترانبێژ و ژنێن رەقاصی د گەل خۆ برن، دا کەیفێ بۆ خۆ چێ بکەن.

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن خۆ نێزیکی (١٥٠) کیلۆمتران ژ لایێ باشووری رۆژئاڤایێ ڤە ژ مەدینێ دویرکەفتین، و ئەو گەهشتینە گەلییێ (صەفرائێ)، وی هەڤالەکێ خۆ هنارتە (بەدرێ) و بەدر هنگی گوندەک بوو حەفت قویناغان ژ مەدینێ یێ دویر بوو، دا دەنگ و باسێن کاروانێ ئەبوو سوفیانی بۆ بینت، پشتی ئەو زەلام زڤری وی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاگەهدار کر کو ئەبوو سوفیانی کاروان یێ خلاص کری، و قورەیشییان لەشکەرەکێ ئامادە کری و ئەو یێ ب رێڤە.. موسلمان دەمێ ژ مەدینێ دەرکەفتین ئەو ب ئنیەتا شەری دەرنەکەفتبوون، وان تشتەک دڤیا و ئەڤە خودێ تشتەکێ دی ئینا رێکا وان، ڤێجا ئەو چ بکەن و چ بریار بدەن؟

**کۆمبوونەکا فەر بەری شەری:**

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سوحبەتا دەرکەفتنا لەشکەرێ قورەیشییان بۆ صەحابییان ڤەگێرای، و ئەو ب ڤێ چەندێ ئاگەهدارکرین، گۆتە وان: هوین چ دبێژن، ئەم چ بکەین؟

ژ هندەک ئایەتێن سوورەتا (الأنفال) ژ قورئانێ دئێتە زانین کو د ناڤ صەحابییان دا هندەک هەبوون ب دلی نەبوو شەری بکەن؛ چونکی دەمێ ئەو ژ مەدینێ دەرکەفتین ئەو ب ئنیەتا شەری دەرنەکەفتبوون، خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ۝٥ يُجَٰدِلُونَكَ فِى ٱلْحَقِّ بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ ۝٦ ﴾ (الأنفال: ٥-٦)، بەلێ هندەک ژ موهاجران رابوونەڤە و گۆتنە پێغەمبەری

-سلاف لێ بن-: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، وێ بکە یا تە دڤێت، و ئەم هەمی د گەل تەینە. حەتا دبێژن: میقدادی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! ئەم وێ نابێژین یا ئسرائیلییان گۆتییە مووسایی: هەرە تو و خودایێ خۆ شەڕی بکەن، و ئەم دێ ل ڤێرێ دروینشتی بین، بەلکی ئەم دێ بێژینە تە: هەرە، و ئەم ژی دێ د گەل تە بین..

هەر وەکی پێغەمبەری -سلاف لێ بن- ب ڤێ گۆتنێ خۆش بوو، بەلێ جارەکا دی وی گۆتنا خۆ دوبارەکر، هەر وەکی وی دڤیا گۆتنا ئەنصاران ژی ژ خەلکێ مەدینێ بزانت، دیارە ئەنصاران ئەڤ مەخسەدا وی زانی، لەو مەزنێ وان (سەعدێ کوڕێ موعاذی) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ هەر وەکی تە دڤێت گۆتنا مە بزانی؟

وی گۆت: بەلێ..

سەعدی گۆت: ((مە باوەری ب تە و دینێ تە ئینایە، و مە سۆز و پەیمان ژی داینە تە کو پشتا تە بگرین و گوهدارییا تە بکەین، ئەی پێغەمبەرێ خودێ، یێ بەردەوام بە د وی تشتی دا یێ خودێ فەرمان پێ ل تە کری، ئەم د گەل تەینە، ئەز ب وی کەمە یێ تو ب حەقییێ هنارتی ئەگەر تو بەرێ مە بدەیە بەحرێ، ئەم هەمی دێ قەست کەینێ، بێی کو زەلامەکێ ب تنێ ژی ژ مە ڤەمینت، ترسا مە ئەو نینە تو سوباهی سنگێ مە بدەیە دوژمنی، نە.. ئەم د شەڕان دا دخۆڕاگرین، بەردەوام بە بەلکی خودێ چاڤێن تە ب مە روهن بکەت)).

پێغەمبەری -سلاف لێ بن- گەلەک ب گۆتنا وی خۆش بوو، لەو گۆت: بدەنە ڕێ، و مزگینییا من ل هەوە بت، خودێ سۆز دایە من کو ئەم بەرگرییا ئێک ژ هەردو دەستەکان بکەین، ئەز ب خودێ کەمە هەر وەکی نوکە ئەزێ جهێ کەلەخێن وان دبینم.

لەشكەرێ موسلمانان د گازییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەركەفتن، و دانە رێ، حەتا گەهشتینە تەنشت وی چیایی یێ كو دكەفتە نێزیكی (بەدرێ)، ب وێ هیڤییێ كو بەرهنگارییا لەشكەرێ قورەیشییان بكەن.

**شیرەتا ئەبوو سوفیانی بۆ مەزنێن قورەیشییان:**

پشتی ئەبوو سوفیانی ب رێكا هندەك مرۆڤان زانی كانێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی ل كیڤەنە، هندی ژێهاتی وی كاروانێ خۆ ژ وان دەڤەران دویرئێخست یێن وی هزر كری كو دبت موسلمان لێ بن، حەتا ئەو شیای دوومـاهییێ قورتـال ببـت، و ب لایێ كنارێ دەریایێ ڤە بچت.. و دەمێ ئەو پشتراست بووی كو ترسا موسلمانان ل سەر كاروانی نەما، ژ بەر كو ئەو ژ دەڤەرا ب ترس دەرباس بوون، وی مرۆڤەك ب لایێ بەدرێ ڤە هنارت دا ئەو خۆ بگەهینتە مەزنێن قورەیشییان، و بێژتێ: كاروانێ هەوە ب سلامەتی دەرباس بوو، ڤێجا بزڤرن. بەلێ ژ بەر دفنبلندییا خۆ زرتەكێن قورەیشییان ب شیرەتا ئەبوو سوفیانی نەكر، و گۆتن: ب خودێ ئەم نازڤرین حەتا نەچینە بەدرێ و سێ رۆژان ل وێرێ بمینین، و حێشتران سەرژێ بكەین، و سترانبێژ ستranان بۆ مە بێژن، و عەرەبان هەمییان گوهـ ل سوحبەتا دەركەفتنا مە دبت.

ب ڤێ چەندێ لەشكەرێ قورەیشییان بەردەوامی دا چوونا خۆ یا بەر ب بەدرێ ڤە، و ژ لایێ دی ڤە موسلمان ژی ب نك بەدرێ ڤە هاتن.

**ل ژڤانێ ئێك ژ دو دەستەكان:**

پشتی موهاجر و ئەنصاران ئامادەبوونا خۆ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاشكەرا كری كو ئەو دێ د فەرمانا وی دا بن، و هەچییا وی دڤێت ئەو دێ كەن، وی فەرمان دا كو ئەو بەر ب بەدرێ ڤە بچن، دا خۆ ئامادە بكەن بۆ بەرهنگارییا ئێك ژ دو دەستەكان: كاروانێ بازرگانییێ قورەیشییان ئەوێ

ئەبوو سوفیان سەرکێشییا وی دکەت، یان ژی لەشکەرێ قورەیشییان ئەوێ ئەبوو جەهل و چەند کەسەکێن دی ژ مەزنێن مەکەهێ د گەل دا.

گاڤا موسلمان گەهشتینە دەڤەرا بەدرێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێ وی یێ نێزیک ئەبوو بەکری، خۆ ژ کۆما موسلمانان ڤەدەرکر، و چوون ل دەور و بەرێن وێ دەڤەرێ گەڕیان؛ دا دەنگ و باسێن قورەیشییان کۆم بکەن، و بزانن کانێ چ هەیە، ل جهەکی وان پیرەمێرەک دیت، گۆتنێ: چ دەنگ و باسێن لەشکەرێ قورەیشییان و یێن موحەممەدی و هەڤالێن وی ل نک تە هەنە؟ پیرەمێری گۆت: ئەز بۆ هەوە نابێژم حەتا هوین بۆ من بێژن کانێ هوین کینە.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەگەر تو بۆ مە بێژی، ئەم ژی دێ بۆ تە بێژین.

پیرەمێری گۆتێ: باشە.. من یێ زانی کو موحەممەد و هەڤالێن خۆ فلان ڕۆژێ یێن دەرکەفتین، ئەگەر ئەوێ ئەڤ تشتە گۆتییە من ڕاست بێژت، نوکە ئەو ل فلان جهینە -و ئەو جهێ گۆت یێ موسلمان لێ- و من یێ زانی کو قورەیشی فلان ڕۆژێ یێن دەرکەفتین، ئەگەر ئەوێ ئەڤ تشتە گۆتییە من ڕاست بێژت نوکە ئەو ل فلان جهینە، و ئەو جهێ گۆت یێ لەشکەرێ کافران لێ. پاشی گۆت: بێژنە من هوین ژ کێنە؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەم ژ ئاڤێینە.. و ئەو و ئەبوو بەکر چوون.

پیرەمێر ما.. و گۆت: ژ ئاڤێ؟ ئاڤا چ؟ دیارە ئەو ژ ئاڤا عیراقێنە![1]

گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ خەبەرێ گرنگ زانی، زڤڕی ناڤ هەڤالێن خۆ و عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی و سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی

---

(١) ئبن ئیسحاق ڤی خەبەری ڤەدگوهێزت و ژ بەر کو ئەو یێ (مونقەطعە) و خەبەرێ (مونقەطع) پشکەکە ژ یێ (ضەعیف) زانا دبێژن: ئەڤ خەبەرە یێ ضەعیفە.

و زوبەیرێ کورێ عەووامی هنارتنە نک کانیکێن ئاڤێ ل بەدرێ، دا بەرێ خۆ بدەنێ کانێ چ نیشانێن هاتنا لەشکەرێ قورەیشییان هەنە یان نە؛ چونکی وی دزانی ئەگەر قورەیشی دنێزیک بن، مسۆگەر ئەو ئێنە سەر ئاڤێ، ڤان هەر سێ صەحابییان خۆ ل وان دەور و بەران ڤەشارتن، و زێرەڤانی ل وی جهی کر، پشتی دەمەکی وان دیت دو زەلامێن قورەیشی هاتنە سەر ئاڤێ، ئینا وان ئەو گرتن و د گەل خۆ ئینان، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پسیار ژ وان کر: قورەیشییان لەشکەرێ خۆ ل کیڤە دانایە؟ وان گۆت: ئەو یێن ل پشت وی گرێ هە ئەوێ تو دبینی ل لایێ دویر یێ نهالێ. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: هژمارا وان چەندە؟ وان گۆت: ئەم نزانین، ئەو گەلەکن. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: باشە، هەر جار ئەو چەند حێشتران ڤەدکوژن؟ وان گۆت: رۆژەکێ نەهان، و رۆژەکێ دەهان.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: مەعنا ئەو نەهسەد حەتا هزار زەلامانە.

### هەلویستەکێ وەفادارییێ:

دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زانی کو (ئەبوو بەختەرییێ کورێ هشامی) ژی د گەل مەزن و ماقویلێن قورەیشییان یێ دەرکەفتییە شەڕی، وی دزانی کو ئەو ئێک ژ وان کەسانە یێن ژ شەرمان دا -نە کو ژ کەیف- دەرکەفتی، و چونکی ئەبوو بەختەری کافرەکێ ب وژدان بوو، و چو جاران وی نەخۆشی نەدگەهاندە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و موسلمانان، بەلکی بەروڤاژی وێ چەندێ گەلەک جاران وی بەرهنگارییا مەزنێن قورەیشییان دکر دەمێ وان دڤیا نەخۆشییێ بگەهیننە موسلمانان، و ئەو ئێک ژ وان کەسان بوو یێن کارەکێ بەرچاڤ د نەهێلانا وێ (صەحیفێ) دا کری یا کافران نڤیسی و ب کەعبێ ڤە هلاویستی و تێدا بڕیار دای حیصارێ بداننە سەر مالباتا هاشمییان، وەکی بەری نوکە د گەل مە بۆری.

ژ بەر ڤی هەلویستێ جامێرانە یێ ڤی کافری، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە هەڤالێن خۆ: هەچییێ ژ هەوە ئەبوو بەختەرییێ کورێ هشامێ کورێ حارثێ کورێ ئەسەدی دیت بلا نەکوژت! و ئەڤ گۆتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نیشانا وەفادارییا وی بوو.

بەلێ دەمێ شەڕی دەست پێ کری، و صەحابییەک د شەڕی دا هاتیە ڕاستا ئەبوو بەختەری، وی صەحابی ڕوییێ خۆ ژێ وەرگێڕا، و گۆتێ: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل مە کرییە ئەم تە نەکوژین، و هەڤالەکێ وی د گەل بوو، وی گۆت: و ڤی هەڤالێ من ژی؟ صەحابی گۆت: نە.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەحسێ تە ب تنێ یێ کری. وی گۆت: ما دەم وەسایە دڤێت ئەز و ئەو پێکڤە بمرین، دا سوباهی ژنکێن مەکەهێ نەبێژن: ئەبوو بەختەری هەڤالێ خۆ هێلا د دەستێ دوژمنی دا؛ دا بمینتە ساخ! و وی شەڕ کر، و هنگی ئەو صەحابی نەچار بوو وی بکوژت.

**ل سەر کانیکێن بەدرێ:**

دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زانی کو لەشکەرێ قورەیشییان یێ نێزیکە ژ ئاڤا بەدرێ، وی بڕیار دا لەشکەرێ موسلمانان بۆ پێشڤە بچت، و ل نک ئاڤێ بەری کانیکان بدانت، گاڤا ئەو گەهشتینە وی جهی، و وان ڤیای بدانن، صەحابییەکێ دبێژنێ: حوبابێ کورێ مونذری گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەڤە جهەکە خودێ فەرمان ل تە کری ئەم لێ بدانین، و چێ نابت بۆ مە ئەم کاری پێ نەکەین، یان ژی ئەو ژ فەند و فێلێن شەڕییە؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: نە، ئەو ژ ڕەئی و فەند و فێلێن شەڕییە. حوبابی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ڕابە دا ئەم ئاڤێ ل پاش خۆ بهێلین، و برکەکێ ل دۆر کانیکان چێ کەین، دا ئاڤ بۆ کافران نەچت، و ئەو بۆ مە ب تنێ بت، چی گاڤا ئەم تێنی بووین دێ ئاڤێ ڤەخۆین، و گاڤا ئەو تێنی

بوون، ئاڤ ب دەست وان ناکەڤت ئەو ژێ ڤەخۆن. هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب گۆتنا وی کر[1].

ل سپێدەیا ڕۆژا هەڤدێ ژ رەمەزانێ، کافران لەشکەرێ خۆ دا ڕێ و قستا کانیکێن بەدرێ کر، و گاڤا ئەو نێزیک بووین خافلەتی ب وان کەفت دەمێ وان دیتی لەشکەرێ موسلمانان دۆرا ل کانیکان گرتی، و ئاڤا ژ وان بری.

## ل مەیدانا شەڕی:

گەهشتنا موسلمانان بۆ کانیکێن بەدرێ ڕۆژەکێ بەری گەهشتنا کافران بوو، مەعنا: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ل شەڤا هەڤدەی رەمەزانێ ل مەیدانا شەڕی نڤستن، و دەمێ ئەو گەهشتینە مەیدانا شەڕی و وان دۆر ل ئاڤێ گرتی، سەعدێ کوڕێ موعاذی بەرێ خۆ دایێ دیت گرکەکێ پیچەکێ بلند ل هنداڤ مەیدانێ هەیە، وی گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆچی ئەم کەپرەکێ بۆ تە ل سەر ڤی گرکی چێ ناکەین، دا ئەگەر هات و ئەم ب سەرکەفتین چوونە، و ئەگەر ئەم شکەستین تو بشێی بچی بگەهییە وان موسلمانێن کو مە ل پاش خۆ هێلاینە ل مەدینێ؟

و ئەو بوو موسلمانان کەپرەک بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سەر وی گرکی چێکر، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالێ خۆ یێ نێزیک ئەبوو بەکری ل بن کەپرێ ڕوینشتن، و هژمارەکا گەنجێن ئەنصارییان ب سەرکێشییا سەعدێ کوڕێ موعاذی زێرەڤانی ل کەپرێ دکر.

خودێ وەسا حەز کر، ل وێ شەڤێ یا موسلمان تێدا گەهشتینە مەیدانا شەڕی خەوەکا گران ب سەر موسلمانان دا هاتە خوارێ، و ئەو نڤستن، و ڤێ

---

(١) زانایێن حەدیسێ ل وێ باوەرێنە کو ئەڤ خەبەرە یێ ئبن ئیسحاقی د سیرەتێ دا ڤەگوهاستی، و ناڤدار بووی، ب چو ڕێکێن دورست نەگەهشتییە مە.

نڤستنێ ڕۆژا دی -دەمێ ئەو بەرانبەر کافران ڕاوەستیاین- هێزەکا مەزن دا وان، هەر وەسا خودێ وەسا حەز کر دەمەکی ل وێ شەڤێ بارانەک ژی ل وان باری، و ئایەتەک ژ قورئانێ ئیشارەتێ ددەتە ڤێ چەندێ دەمێ دبێژت: ﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴾ (الأنفال: ١١) و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پتربیا وێ شەڤێ ب دوعا و نڤێژان ڤە بۆراند.

### بەرێ شەڕ دەست پێ بکەت:

ل سپێدەیا ڕۆژا ئەینییێ (١٧) هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا (٢) مشەختی کو دکەفتە بەرانبەر (١٣) ئادارا سالا (٦٢٤) زایینی لەشکەرێ ئیسلامێ ب سەرکێشییا پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- و لەشکەرێ کوفرێ ب سەرکێشییا هژمارەکا مەزنێن قورەیشییان ل مەیدانا بەدرێ ل نێزیکی کانیکێن ئاڤێ گەهشتنە ئێک، و ل بەرانبەر ئێک و دو ڕاوەستیان، و عەورێن شەڕی ل هنداڤی وان کۆمبوون، و گاڤا کافران لەشکەرێ موسلمانان ب هژمارا وان یا کێم ڤە ل مەیدانێ دیتی، ب سەرگەمییەکا مەزن حسیان و گۆتن: ب تنێ بیست خەبەرن و ئەم کتێ ژ وان ناهێلین!

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەمێ هژمارا کافران یا مەزن دیتی، و بەرێ خۆ دایە هەڤالێن خۆ و کێمییا وان، ئەو بەرانبەر خودێ ڕابووڤە دو رکاعەتێن نڤێژێ کرن، و هندی ژێ هاتی دوعا ژ خودایێ خۆ کرن: ((ئەی خودا، ئەز هەوارێن خۆ دگەهینمە تە، مە تو یێ هەی نە کەسێ دی، تو د هەوارا مە وەرە، ئەو سۆزا تە دایە من کو تو من ب سەربێخی ئەڤرۆ ب جه بینە، ئەی خودا ئەڤە قورەیشی هەمی ب دفنبلندییا خۆ ڤە یێن هاتین دا هەڤرکییا پێغەمبەرێ تە بکەن، و وی درەوین دەربێخن، ئەی خودا، ئەگەر

تو ڤێ کۆما خودان باوەران ببەیە هیلاکێ ژ ئەڤرۆ وێڤە کەس نابت عەبدینییا تە بکەت.. ئەی خودا، ئەی خودا..)).

هۆسا ب خۆشکاندن ڤە بوو هەوار هەوارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و پشتی وی نڤێژا خۆ ب دوومـاهی ئینـای، ئـەو ڕابـوو ڤـە دەسـتێن خۆ سـەرئەڤرازکرن و دیسـا داخـوازا هاریکـارییێ ژ خـودایێ خـۆ کـر، و وی هنـد دەسـتێن خـۆ بلنـدکرن حـەتا کراسـێ وی ژ سـەر مـلان کـەفتی، هنگـی ئـەبوو بـەکـری ب دلپێڤەبوون ڤە گۆتێ: بلا بەس بت ئـەی پێغەمبـەرێ خـودێ، ئەز ب خودێ کەمە خودێ تە شەرمزار ناکەت، و هەر دێ د هەوارا تە ئێت.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زڤڕی جهێ خۆ و ئەڤ ئایەتـە ب دەنگـەکێ بلند خواند دا هـەڤالێن وی مـوکم ببن: ﴿ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ۝٤٥ ﴾ (القمر: ٤٥)، و دبێـژن: ئـەڤ ئایـەتێن سـوورەتا (الأنفـال) هنگـی هاتنـە خوارێ: ﴿ إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ۝٩ ﴾ حەتا: ﴿ ذَٰلِكُمۡ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝١٤ ﴾.

و ژ بـەر کـو دەمـێ لەشـکەرێ کـافران گەهشـتییە مەیدانێ ئـەو گەلـەک دوەسـتیای و تێنـی بـوون، هنـدەک ژ وان سـویند خـوار ئـەو خـۆ بگەهیننـە کـانیکێن بـەدرێ ئـەوێن موسـلمانان دۆر لـێ گرتـی، دا ئـاڤێ ژێ ڤـەخۆن، و ئێـک ژ وان ئەسـوەدێ مـەخزوومی بـوو، ئـەوی شـیرێ خۆ هلگـرت و قـەسـتا کـانیکان کر، حەمزە هاتە بەراهییێ و شیرەک تێ وەراند پییەکێ وی قـەتکر، ئـەو ل سـەر چالەپکان هات خۆ خشاند حـەتـا نێزیکی کـانیکێ بووی، و ل وێرێ حـەمزە گەهشـتێ و ئـەو کوشـت.. و ئـەو ئێکـەمین کـافر بـوو ل وێ ڕۆژێ هاتییە کوشتن.

## دەسپێکرنا شەڕی:

پشتی ئەسوەدێ مەخزوومی ب دەستێ حەمزەی هاتییە کوشتن، عوتبەیێ کوڕێ ڕەبیعەی گەرمبوو، و ڤیا زیرەکییا خۆ بۆ خەلکی دیار بکەت، لەو وی گازی برایێ خۆ شەیبەی و کوڕێ خۆ وەلیدی کر، و ئەو هەر سێ ژ ناڤ کۆما کافران دەرکەفتن و قەبێ موسلمانان خواست، هنگی سێ گەنجێن ئەنصاری دەرکەفتنە بەر سنگێ وان، و ئەو ژی ئەڤە بوون: عەوفێ کوڕێ حارثی و برایێ وی موعاذ و عەبدللاهێ کوڕێ ڕەواحەی، و ژ بەر کو ئەو دڕاپێچای بوون، عوتبەی و هەڤالێن خۆ ئەو نەنیاسین، لەو پسیار کر: هوین کینە؟ وان گۆت: ئەم ئەنصارینە.. هنگی عوتبەی گۆتە وان: مە هەوجەیی ب هەوە نینە. پاشی گازی کر: ئەی موحەممەد، هندەک هەڤکویفان ژ مللەتێ مە بۆ مە بهنێرە.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل مامێ خۆ حەمزەی و هەردو پسمامێن خۆ عوبەیدەیێ کوڕێ حارثی و عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی کر کو ئەو دەرکەڤن.

د ریوایەتەکا دی دا هاتییە کو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیتی ئەو هەر سێ گەنجێن ئەنصاری دەرکەفتن، وی ب ڤێ چەندێ خۆش نەبوو لەو وی گۆتە وان: بزڤڕن، پاشی وی مامێ خۆ و هەردو پسمامێن خۆ هنارتن.

عوبەیدە -و ئەو ژ هەمییان ب عەمرتر بوو- ل بەر سنگێ عوتبەی ڕاوەستیا، و حەمزە چوو بەرانبەر شیبەی، و عەلی ما د گەل وەلیدی، حەمزەی و عەلی هەر زوی هەڤڕکێن خۆ کوشتن، و عوبەیدە و عوتبە مانە پێکڤە، دووماهییێ هەر ئێکی دربەک دانا یێ دی، حەمزە و عەلی چوونە هاری عوبەیدەی و وان پێکڤە عوتبە کوشت، و عوبەیدە ب برینداری هلگرت و برە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و پشتی هنگی ئەو ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تمام بوو.

گاڤا كافران ديتى سێ ژ مەزنێن وان هاتنە كوشتن، كەربێن وان گەلەك ڤەبوون، لەو وان پێكڤە و ژ كەرب هێرش دا كۆما موسلمان، و شەڕى دەست پێ كر، پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل موسلمانان كر ئــەو ڕێز ڕێزە ل جهێ خۆ ڕاوەستن، و ئەڤە شێوەيەكێ ڕاوەستيانێ بوو د شەڕى دا بەرى هنگى عەرەبان نەديتبوو، و پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: ل جهێ خۆ بمينن و دەمێ ئەو نێزيكى هەوە بوون، تيران د وان وەركەن.

پشتى شەڕەكێ نێزيكى چار پێنج سەعەتان -ب دەمێ مە يێ نوكە- ڤەكێشاى، خودێ وەسا حەز كر لەشكەرێ كافران بشكێت، و ڕەڤ بكەفتە ڕێزێن وان پشتى كوشتنەكا مەزن كەفتييە ناڤ ڕێزێن وان، و هژمارەكا نە يا كێم ژ سەر و گرگرێن قورەيشييان د ناڤ وان كوشتييان دا بوون، يێن وەكى: عوتبەيێ كوڕێ ڕەبيعەى، و ئەبوو جەهلێ كوڕێ هيشامى، و ئومەييەيێ كوڕێ خەلەفى، و ئەبوو بەختەرى، و گەلەكێن دى. و هژمارا كوشتييێن كافران وێ ڕۆژێ حەفتێ بوون.

ژ بلى ئەو حەفتێ مرۆڤێن هاتينە كوشتن، حەفتييێن دى هاتنە ئێخسيركرن، و د ناڤ ئێخسيران دا هندەك مرۆڤێن پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- يێن نێزيك بوون، وەكى: مامێ وى عەبباس، و هەردو پسمامێن وى عەقيلێ كوڕێ ئەبوو طالبى و نەوفەلێ كوڕێ حارثى، و زاڤايێ وى ئەبولعاصێ كوڕێ ڕەبيعى.

و ژ هندەك ئايەتێن قورئانێ، و حەديسێن دورست دئێتە وەرگرتن كو د ڤى شەڕى دا   و بۆ پشتەڤانييا خودان باوەران خودايێ مەزن ملياكەت هنارتن، و ئەگەر نە ژ بەر هندێ با كو د علمێ خودێ دا هەبوو كو گەلەك ژ ڤان مرۆڤان د پاشەڕۆژێ دا دێ موسلمان بن، و بەرەڤانييێ ژ دينێ وى كەن، ئێكێ ب تنێ ژى ژ وان نەدما.

## پشتی شەڕی:

شەڕێ بەدرێ -وەکی مە گۆتی- ل سپێدەیا ڕۆژا ئەینییێ بوو هەڤدەی هەیڤا رەمەزانێ سالا دویێ مشەختی، و پشتی شەڕ ب سەرکەفتنا موسلمانان ب دووماهی هاتی، و حەفتێ زەلام ژ کافرێن مەکەهێ هاتینە کوشتن، و حەفتێ ژی هاتینە ئێخسیرکرن، و هژمارەکا نە یا کێم ژ وان مەزن و ماقویل و سەرێن کوفرێ بوون، ئەوێن مایین ژ لەشکەرێ کافران هەر زوی ژ مەیدانا شەڕی ڕەڤین و زڤڕینە مەکەهێ.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل صەحابییێن خۆ ل ڕۆژا ئەینییێ و شەنبییێ و ئێکشەنبێ ل مەیدانا شەڕی مان، و د ڤان هەر سێ ڕۆژان دا وان شەهیدێن خۆ کو هژمارا وان چاردە بوون، ڤەشارتن، و نەهاتییە ڤەگوهاستن ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو وی نڤێژا مرییان ل سەر وان کریت.

هەر وەسا موسلمانان ل ڤان هەر سێ ڕۆژان کوشتییێن کافران کۆمکرن و ئەو هەمی د چالەکێ دا ڤەشارتن، و ئەو دەسکەفتی ژی کۆمکرن یێن کافران ل پاش خۆ هێلایین.

ل شەڤا دوشەنبێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان دا موسلمان خۆ ژ بەدرێ ڤەکێشن و بزڤڕنە مەدینێ، و بەری زڤڕینێ وی دو کەس ژ صەحابییێن خۆ: عەبدللاهێ کوڕێ رەواحەی و زەیدێ کوڕێ حارثەی، هنارتنە مەدینێ؛ دا مزگینییا سەرکەفتنا موسلمانان بدەنە خەلکێ مەدینێ، و گەهشتنا وان هەردویان بۆ مەدینێ ل تێشتەگەها ڕۆژا ئێکشەنبێ بوو، نۆزدی هەیڤا رەمەزانێ، و دەمێ ئەو گەهشتینە مەدینێ هندەک صەحابی د گەل عوثمانێ کوڕێ عەففانی ل سەر زیارەتان بوون بۆ ڤەشارتنا ژنکا عوثمانی روقەییایا کچا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-.

و بەری موسلمان مەیدانا شەڕی بهێلن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوو هنداڤ وێ چالێ یا کەلەخێن کافران لێ هاتینە ڤەشارتن، و ئێک ئێکە و ب ناڤ گازی مەزنێن وان کر و گۆت: فلانێ کوڕێ فلانی، فلانێ کوڕێ فلانی، ئەو سۆزا خودێ دایە من وی بۆ من ب جهئینا، ئەرێ ئەو سۆزا خودێ دایە هەوە وی بۆ هەوە ب جهئینا؟

هنگی عومەرێ کوڕێ خەطابی گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، پشتی سێ ڕۆژان ژ کوشتنا وان تو گازی وان دکەی، ما وان گوهـ ل تە هەیە؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرسڤا وی دا و گۆت: ئەز ب وی کەمە یێ نەفسا موحەممەدی د دەستان دا، هەوە ژ وان چێتر گوهـ ل من نینە، بەلێ ئەو نەشێن بەرسڤا من بدەن.

## گەهشتنا لەشکەرێ سەرکەفتی بۆ مەدینێ:

ل شەڤا دوشەنبێ بیستی ڕەمەزانێ، موسلمانان د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مەیدانا شەڕی هێلا، و زڤڕینە مەدینێ، و دەمێ ئەو نێزیکی بـاژێری بووین هژمارەکا مەزن یا موسلمانێن مەدینێ دەرکەفتنە بەراهییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و لەشکەرێ وی یێ سەرکەفتی، و وێ ڕۆژێ سەرشۆڕی و شەرمزارییەکا مەزن ب سەر جوهی و منافقان دا هاتە خوارێ؛ چونکی ڕۆژا بەری هنگی دەمێ ئەو هەردو زەلام گەهشتینە مەدینێ یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتین دا مزگینییا سەرکەفتنێ بدەنە خەلکی، گاڤا ئەو گەهشتین و گۆتینە خەلکی: مە فلان و فەلان یێن کوشتین، و فلان و فلان یێن ئێخسیرکرین، جوهی و منافقان ئەڤ گۆتنە باوەر نەکر، لەو وان گۆتە موسلمانان: هەڤالێ هەوە پیس یێ شکەستی، و لەشکەرێ وی یێ تەرا بەڕا بووی، و ئەڤە سەرپەشکێن وانە ڕەڤین، و ژ بەر مەزنییا وێ بەلایا

ب سەرێ وان هاتی ئەو یێ ژ بەر دئاخڤن! گاڤا دەنگ و باسێن نێزیکبوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و لەشکەرێ وی ژ مەدینێ گەهشتییە خەلکی، ئەو ژ مەدینێ دەرکەفتن و چوونە بەراهییا وان، دا پیرۆزییێ لێ بکەن. و ب رێڤە دەمێ موسلمان دهاتنە مەدینێ، خودایێ مەزن سوورەتا (الأنفال) بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارت؛ دا حوکمێ ئێخسیر و دەسکەفتییان بۆ وی ئاشکەرا بکەت.

## حوکمێ ئیسلامێ د دو مەسەلێن نوێ دا:

ژ بەر کو شەرێ بەدرێ ئێکەمین شەڕ بوو د ناڤبەرا موسلمان و کافران دا رویدای، و د ڤی شەڕی دا و بۆ جارا ئێکێ موسلمانان هندەک زەلام ژ کافران ب ئێخسیری گرتن، و هندەک مالێ وان -یێ وان ل پاش خۆ هێلای- کەفتە دەستێ موسلمانان، ئەو حێبەتی مان، کانێ د ڤان هەردو مەسەلێن نوی دا ئەو چ حوکمی بدەن، و ژ بەر کو چو ئایەت ژ لایێ خودێ ڤە د ڤێ چەندێ دا بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەهاتبوونە خوارێ وی نەزانی دێ چ حوکمی دەت، و بۆ ڤێ چەندێ وی دان و ستاندن د گەل صەحابییێن خۆ کر..

### ١- مەسەلا دەسکەفتییان:

دەمێ شکستن کەفتییە رێزێن کافران و ئەو پاشدا رەڤین، موسلمان ل مەیدانا شەڕی بوونە سێ پارچە، هندەک ل دۆر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زڤڕین، دا وی بپارێزن، گۆتن: ئەم دترسین کافر ژ لایەکێ دی ڤە بێن و ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بزڤڕن، و نەخۆشییێ بگەهیننە وی. و هندەکێن دی ب دویڤ کافران دا چوون و ڕاهێلانێ، بۆ گرتن و کوشتنا وان؛ دا ترس بکەفتە دلێن وان و هزرا زڤڕینێ بۆ مەیدانا شەڕی نەکەن. و هندەکێن دی چوون دەسکەفتییێن کافران ژ مەیدانا شەڕی کۆمکرن.

گاڤا شەڕ ب دوومـاهی هـاتی، و سـوحبەتا لێکڤـەکرنا دەسـکەفتییان هاتییە مەیدانێ، هەر دەستەکەکێ ژ ڤان هەر سێ کۆمێن موسلمانان گۆت: ئەم هێژاترین ئەڤ دەسکەفتییە بۆ مە ب تنێ بن.

پشتی هەڤڕکی د ناڤبەرا وان دا دژوار بووی، سوورەتا (الأنفال) هاتە خـوارێ[1]، دەمـێ پسـیارا سـوورەتا (الأنفـال) ژ عوبـادەیێ کـوڕێ صـامتی هاتییەکرن، وی گۆت: ئەو د دەر حەقا مە خەلکێ بەدرێ دا هاتبوو خوارێ، دەما ئەم د دەسکەفتییان دا ب خیلاف چووین، و ئەخلاقێ مە تێدا خراب بووی، هنگی خودێ ئەو ژ دەستێ مە ئینادەر و بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پالدا.

پشتی هاتنە خوارا سوورەتا (الأنفال) پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، وەکی خودێ فەرمان لێ کری، دەسکەفتی د ناڤبەرا لەشکەری دا لێکڤەکرن، و وی ئەو نە ب تنێ دانە وان صەحابییان یێن پشکداری د شەڕی دا کری، بەلکی وی ئەو دانە وان صەحابییێن خودان عوزر ژی یێن ژ بەر هندەک کاودانێن وان یێن تایبەت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دایێ کو نەئێنە شەڕی، و ئەو صەحابییێن د شەڕی دا شەهیدبووین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشکا وان دا میراتگرێن وان.

**٢- مەسەلا ئێخسیران:**

د دەر حەقا ئێخسیران ژی دا، صەحابی ب خیلاف چوون، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دان و ستاندن د گەل هندەک ژ وان کری، کانێ ئەم چ ل ئێخسیران بکەین؟

---

(١) ئەڤ چەندە مە ب بەرفرەهی د تەفسیرا سوورەتا (الأنفال) دا بەحس ژێ کرییە، د کتێبا خۆ (ڕێبازا ژیانێ) دا، بۆ هەچییێ بڤێت لێ بزڤڕت.

ئەبوو بەکری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەڤە هەمی برا و پسمامێن تەنە، ئەز دبێژم ئەگەر تو بەرانبەر هەر ئێکی ژ وان هندەک مالی وەربگری چێترە، ئەم دێ پێ ب هێز کەڤین ل سەر کافران.

عومەری گۆت: ب خودێ ئەز وێ نابینم یا ئەبوو بەکر دبینت، فلان کەس مرۆڤێ منە، ئەگەر تو دەستویرییێ بدەی ئەز دێ وی کوژم، و فلان برایێ عەلییە بلا ئەو وی بکوژت، و فلان برایێ حەمزەیە بلا ئەو وی بکوژت؛ دا کافر بزانن کو دلێن مە قەت د گەل وان نینن، مانێ ئەڤێن هە ئەون یێن هاتین دا مە بکوژن.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتنا ئەبوو بەکری چێتر دیت، لەو وی بڕیار دا هەر کافرەکی هندەک مال ژێ بێتە وەرگرتن بەرانبەر بەردانا وی، و ل سەر هندەک ژ وان کرە شەرت کو هەر ئێک ژ وان دەهـ زارۆکێن موسلمانان فێری خواندن و نڤیسینێ بکەن بەرانبەر بەردانا وان.

## هەلویستەکێ دی یێ وەفادارییێ:

بوخاری ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزت کو دەمێ دان و ستاندن د ناڤبەرا صەحابییان دا هاتییەکرن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەگەر موطعمێ کورێ عەدی یێ زێندی با، و مەهدەرا ڤان کربا، ئەز دا وان بۆ وی بەردەم.

ئەڤ گۆتنە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نیشانا وەفادارییا وییە بۆ (موطعمی) ئەوێ قەنجی ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری، دەمێ ئەو ژ طائیفێ زڤڕییە مەکەهێ، وەکی بەری نوکە مە بەحس ژێکری.

و ژ بەر کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چو گرتیخانە نەبوون ئێخسیران تێدا بگرت، حەتا ئەو خۆ بکرن، وی فەرمان ل صەحابییان کر کو هەر ئێک ژ وان هندەک ئێخسیران ل نک خۆ بهێلت، حەتا ئەو فیدیا خۆ ددەن، و وی

شیرەت ل صەحابییان کر کو ئەو قەدرێ ئێخسیران بگرن، و قەنجییێ لێ بکەن.

## خۆکرینا مامێ پێغەمبەرێ و زاڤایێ وی:

پشتی موسلمانان بڕیار دای کو هەر ئێخسیرەکێ بڤێت بێتە بەردان دڤێت هندەک مالی بدەت، هەر مالباتەکێ ژ قورەیشییێن مەکەهێ ئەو مالێ پێتڤی بۆ موسلمانان هنارتە مەدینێ؛ دا ئێخسیرێن وان بێنە بەردان، و ئێک ژ ئێخسیران عەبباسێ مامێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، عەبباسی گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بەری نوکە من باوەری ئینایە و ئەز موسلمان بوویمە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: خودێ چێتر ب ئیسلاما تە دزانت، ئەگەر گۆتنا تە یا دورست بت خودێ جزایێ تە دێ دەتە تە، بەلێ دیاری چاڤ تو دژی مەبوو، ڤێجا تو ژی خۆ بکڕە و هەردو برازایێن خۆ: نەوفەلێ کوڕێ حارثی، و عەقیلێ کوڕێ ئەبوو طالبی، و حەلیفێ خۆ عوتبەیێ کوڕێ عەمری ژی، وی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من هند مال نینە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: پا کانێ ئەو مال یێ تە و دەیکا فەضلی ڤەشارتی و تە گۆتییێ: ئەگەر ئەز ژ ڤێ وەغەرێ نەزڤڕیم، ئەڤ مالێ مە ڤەشارتی بۆ عەیالێ فەضلی و عەبدللاهی و قوثەمییە؟ عەبباسی گۆت: ب خودێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەز دزانم کو تو پێغەمبەرێ خودێ یی، ژ من و دەیکا فەضلی پێڤەتر کەس ڤی تشتی نزانت، بیست وەقییێن مالێ من هەوە یێ گرتی وی ژی بۆ من حسێب بکە و کانێ چەند دمینت ئەز دێ دەمە هەوە. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەو تشتەکە خودێ یێ دایە مە! هنگی عەبباس نەچار بوو مالی بدەت و خۆ و هەر سێ مرۆڤێن خۆ ژی بکڕت، و بزڤڕتە مەکەهێ، و پشتی ئەو زڤڕی وی

موسلمانبوونا خۆ ژ خەلکێ مەکەهێ ڤەشارت، و ئەو چاڤەکێ موسلمانان بوو ل مەکەهێ.

ئێخسیرەکێ دی ژ ئێخسیرێن کافران زاڤایێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەبوو عاصێ کوڕێ رەبیعی بوو، ئەوێ کچا پێغەمبەری زەینەب ل نک، و ئەبوو عاص کوڕ خالەتێ زەینەبێ بوو، دەیکا وی خویشکا خەدیجایێ بوو، دەمێ موسلمانان فدیە ژێ خواستی ژنکا وی زەینەبێ هندەک مال هنارت و د گەل دا ڕستەکەکا وێ یا زێڕی یا دەیکا وێ خەدیجایێ بوو، دەمێ وێ شوی ب کوڕخالەتێ خۆ کری دەیکا وێ خەدیجایێ ئەو دابوویێ، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕستکا خەدیجایێ دیتی، دلێ وی هاتە گڤاشتن و بیرا وی ل خەدیجایێ هاتە ڤە، و وەک ڕێزگرتن بۆ بیرهاتنا خەدیجایێ وی گۆتە موسلمانان: ئەگەر هوین حەز بکەن ئێخسیرێ وێ بەردەن، و ڕستکا وێ ژی بۆ بزڤڕینن! وان داخوازا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب جهئینا و ئەو بەردا، و ڕستک ژی لێ زڤڕاند.

و ئاشکەرایە کو ئەبوو عاص ئێک ژ وان کەسان بوو یێن چو دوژمناتییا موسلمانان ل مەکەهێ ژ وی نەهاتبوو زانین، بەلکی ئەو مژیلی کار و بازرگانییا خۆ بوو، و پشتی ئەبوو عاص زڤڕییە مەکەهێ و ل سەر داخوازا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی دەستویری دا ژنکا خۆ زەینەبێ کو بچتە مەدینێ ل نک بابێ خۆ، و پشتی هنگی ب چەند سالەکا ئەبوو عاص موسلمان بوو و ب مشەختی چوو مەدینێ، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژنکا وی زەینەب لێ زڤڕاندەڤە.

### عومەیرێ کوڕێ وەهەبی و ئێخسیرێ وی:

عومەیرێ کوڕێ وەهەبێ جومەحی ئێک ژ شەیطانێن قورەیشییان بوو، یێن گەلەک نەخۆشی دگەهاندنە موسلمانان، ل ڕۆژا بەدرێ کوڕێ وی وەهەب

ئێک ژ وان ئێخسیران بوو یێن کەفتینە دەستێ موسلمانان، جارەکێ ئەو و صەفوانێ کورێ ئومەییەی ل کەعبێ درووینشتی بوون، و بەحسێ وێ بەلایا مەزن دکر یا ل رۆژا بەدرێ هاتییە سەرێ وان، و ئەو هەردو ل سەر هندێ کۆمبوون کو چو خۆشی ئێدی د ژیانێ نەمایە!

عومەیری گۆت: ئەگەر ژ بەر هندێ نەبایە کو ئەزێ دەیندارم، و من عەیالێ هەی ئەز دترسم پشتی من ئەو رەزیل بن، ئەز ب هێجەتا ئێخسیرییا کورێ خۆ دا چمە مەدینێ و موحەممەدی کوژم. صەفوانی، ئەوێ بابێ وی ل بەدرێ هاتییە کوشتن، گۆتێ: دەینێ تە ل سەر من، ئەز دێ دەم، و عەیالێ تە ژی خەما من، ئەز دێ وان ب خودان کەم، عومەیری گۆتێ: باشە، ڤێ سوحبەتا مە نەبێژە کەسێ، صەفوانی گۆتێ: سۆز بت!

پاشی عومەیری شیرێ خۆ باش هوسی، و ژەهر تێدا، و چوو قەستا مەدینێ کر، گاڤا ئەو گەهشتییە مەدینێ، وی قەستا مزگەفتێ کر، و حێشترا خۆ ل بەر دەری راوەستاند، و شیرێ وی د بەر را بوو.. عومەرێ کورێ خەطابی و هندەک موسلمان ل وێرێ بوون، بەحسێ شەرێ بەدرێ دکر، گاڤا وان عومەیر دیتی، عومەری گۆت: ئەڤ صەیە دوژمنێ خودێ عومەیرێ کورێ وەهەبییە، ب خودێ ئەو بۆ خرابییەکێ یێ هاتی، پاشی عومەر چو نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەڤە دوژمنێ خودێ عومەیرێ کورێ وەهەبییە، شیرێ وی یێ د بەر را و یێ دئێت.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بینە نک من، عومەری ئەو قائیش گرت یا شیرێ وی پێڤە و ئەو برە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، گاڤا پێغەمبەری ئەو دیتی، گۆتە عومەری: عومەر، وی بەردە.. عومەیر نێزیک بە!

گاڤا ئەو نێزیک بووی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تو هاتییە چ؟ وی گۆت: ئەزێ هاتیمە ئێخسیرێ خۆ ئەوێ د دەستێ هەوە دا، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: پا ئەو چ شیرە د ستویێ تە دا؟ وی گۆت: خودێ وی شیری نەهێلت! ما وی چ مفا گەهاندە مە؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ڕاستییێ بۆ من بێژە، تو هاتییە چ؟ وی گۆت: ئەزێ هاتیمە وێ یا من گۆتی. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: نە، حال و مسەلێن تە و صەفوانی ئەڤەنە.. گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ گۆتنە گۆتی، عومەیری شاهدە دا، و گۆت: ژ من و صەفوانی پێڤەتر کەس ڤی تشتی نزانت، مەعنا خودێ ئەو بۆ تە گۆتییە، و هەر وی ئەزێ ئینایمە ڤێرێ دا بەرێ من بدەتە ئیسلامێ.

هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە صەحابییێن خۆ: دینی نیشا برایێ خۆ بدەن، و قورئانێ بۆ بێژن، و ئێخسیرێ وی بەردەن[1].

---

(١) خەبەرێ عومەیری ئبن ئیسحاق د سیرەتێ دا ڤەدگوهێزت، و زانایێن حەدیسێ ل وێ باوەرێنە کو ئەو خەبەرەکێ (مورسەلە) و (مورسەل) پشکەکە ژ (ضەعیفی).

# رویدانێن هەر سێ هەیڤێن مایین
# ژ سالا دویێ

**غەزایا (بەنێ سولەیم):**

پشتی بیستی هەیڤا نەهێ (رەمەزانێ) ژ سالا دویێ مشەختی، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- سەرکەفتی ژ بەدرێ زڤڕی مەدینێ، و نێزیکی حەفتییەکێ ئەو ما ل مەدینێ، ل وی دەمی دەنگ و باس گەهشتنێ کو ئویجاخا (بەنی سولەیم) یێ کارێ خۆ دکەن، دا شەڕێ موسلمانان بکەن، و دیارە دەمێ وان زانی کو قورەیشی یێن هاتین دا شەڕێ موسلمانان بکەن، وان هزر کر ئەگەر موسلمان د ڤی شەڕی دا ئێکجار ژ ناڤ نەچن ژی، ئەو دێ لاواز بن، لەو دەلیڤەیەکا باشە بۆ وان کو ئەو هێرشێ بدەنە سەر موسلمانان، بەلێ ئەو هزرا وان کری خەلەت دەرکەت؛ چونکی موسلمان د ڤی شەڕی دا ب سەرکەفتن و هێزا وان زێدەتر لێ هات.

دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ئنیەتا ڤێ ئویجاخێ زانی، و پشتی ئەو ژ بەدرێ زڤڕی ب حەفتییەکێ، وی بڕیار دا ئەو ب غەزایەکێ دەرکەفتە دەڤەرا بەنی سولیمییان و هێرشێ بدەتە سەر وان بەری ئەو ب هێرشێ ڕابن، و ب ڤێ چەندێ خافلەتی ب ڤێ ئویجاخێ کەفت، لەوا ئەو ڕەڤین و جهێ خۆ بەردان، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن خۆ سێ ڕۆژان ل سەر ئاڤا وان مان، بەلێ بەنی سولەیمییان د خۆ ڕا نەدیت بێنە شەڕی، هندەک مالێ وان کەفتە دەستێ موسلمانان، و پشتی سێ ڕۆژان ئەو زڤڕینە مەدینێ. و د هندەک ژێدەران دا هاتییە کو ئەڤ غەزایە ل هەیڤا موحەررەمێ بوو ژ سالا سێیێ.

## غەزایا جوهییێن قەینوقاعێ:

پشتی شکەستنا قورەیشییان ل شەڕێ بەدرێ، وان کاغەز بۆ جوهییێن مەدینێ هنارتن، و تێدا داخواز ژ وان کر کو ئەو پشتەڤانییا وان د دوژمناتییا موحەممەدی و هەڤالێن وی دا بکەن، و گەف ل وان کرن کو ئەگەر ئەو پەیمانا خۆ د گەل موسلمانان نەشکێنن، چی گاڤا ئەو شیانە موحەممەدی ئەو دێ وان ژی وەکی وی هژمێرن! و دیارە جوهییان د دل دا ژی حەز دکر پەیمانا خۆ د گەل پێغەمبەری بشکێنن، بەلێ ئەو نەدوێریان ڤێ چەندێ ب ئاشکەرایی بکەن، لەو ئەو لێ دگەڕیان دەلیڤەیەکێ بۆ خۆ ببینن کو دربەکی ژ پشت ڤە بداننە موسلمانان، گاڤا کاغەزێن قورەیشییان گەهشتینە وان، وان د گەل خۆ بڕیار دا کو هێدی هێدی خۆ ژ وێ پەیمانێ ڤەکێشن یا وان دایە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو نەیارەتییا وی نەکەن.

هندەک دیرۆکزان دبێژن[1]: پشتی شەڕێ بەدرێ ب نێزیکی هەیڤەکێ وەسا چێبوو ژنەکا موسلمان چوو تاغێ قەینوقاعییان؛ دا کڕین و فرۆتنەکێ ل بازارا وان بکەت، دەمێ ئەو چوویە دکانا زێڕنگرەکی، ئەو جوهییێن ل دکانێ هەین داخواز ژێ کر ئەو پێچێ ژ سەر دێمێ خۆ هلدەت، وێ گوهدارییا وان نەکر، لەو ئێک ژ وان ڕابوو دەهمەنا کراسێ وێ ب ناڤ ملێن وێ ڤە گرێدا، بێی ئەو پێ بحەسییێت، و دەمێ ئەو ڕابوویە ڤە کراسێ وێ بلند بوو و هندەک ژ لەشێ وێ ئاشکەرا بوو، هنگی وان جوهییێن ل وێرێ پێ کرە کەنی و ترانە بۆ خۆ پێ کرن[2].

---

(١) زانایێن حەدیسێ دبێژن: ئەڤ ریوایەتە یا دیرۆکنڤیس ڤەدگێڕن ژ لایێ سەنەدێ ڤە جهێ باوەرێ نینە، ژ بەر کو ئەو یا (مورسەلە).

(٢) هەر چەندە سەنەدا ڤێ ڕویدانێ -وەکی زانایێن حەدیسێ دبێژن- یا ضەعیفە ژی، بەلێ ئەو ژ ئەخلاق و ڕەفتارێ جوهییان یا دویر نینە!

هنگی وێ ژنکا موسلمان هەوار کر، و زەلامەکێ موسلمان ل وان دەور و بەران بوو، گاڤا ئەو ب ڤی کارێ جوهییان حسیای، وی قەستا جهێ رویدانێ کر و ئێکسەر دکانداری جوهی کوشت، ئەو جوهییێن دی ئەوێن ل وێرێ د هەوارا هەڤالێ خۆ هاتن و ئەو زەلامێ موسلمان کوشت، و ب ڤێ چەندێ سەر و بەر د ناڤبەرا موسلمان و جوهییێن قەینوقاعی دا نەخۆش بوو، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جوهییێن قەینوقاعی ل بازارا وان کۆمکرن، و گۆتە وان: هشیار بن، خودێ دێ وێ ب سەرێ هەوە ئینت یا ب سەرێ قورەیشییان ئینای، دوژمناتییا من نەکەن، و باوەرییێ ب من بینن، چونکی هوین باش دزانن ئەز پێغەمبەرێ خودێمە. جوهییان سڤکی ب گۆتنا وی کر، و گۆتێ: ئەی موحەممەد، بلا گەلەک کەیفا تە ب وێ نەئێت یا هاتییە سەرێ مللەتێ تە، و تو مە وەکی وان حسێب نەکە، ئەو هندەک مرۆڤن وان چو شارەزایی د کرنا شەڕی دا نینە، ئەگەر تو شەڕێ مە بکەی تو دێ زانی کو ئەم زەلامێن شەڕاینە!

و ئاشکەرایە کو ئەڤ گۆتنا وان ڕەنگەکێ بێمنەتی و گەفێ بوو ژ لایێ وان ڤە بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان دا تاخێ وان بێتە دۆرپێچکرن، و پشتی پازدە ڕۆژان ژ دۆرپێچکرنێ، وان زانی کو وان چو ڕێ نینن ژ بلی هندێ کو ئەو ب حوکمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- رازی ببن، لەو وان ئامادەبوونا خۆ ئاشکەرا کر کو ب حوکمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- رازی ببن.

هنگی سەرۆکێ منافقان عەبدللاهێ کوڕێ ئوبەیێ کوڕێ سەلوولی، و ئەو هەڤالێ جوهییێن قەینوقاعی و حەلیفێ وان بوو، داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کو ئەو وان نەکوژت، و لێ ببۆرت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هندەک ژ داخوازا وی ب جهئینا، و فەرمان دا ئەو نەئێنە کوشتن،

بەلێ دڤێت ئەو ژ مەدینێ دەرکەڤن، و دەستویری دایێ کو هەر ئێک بارێ دەوارەکی ب تنێ ژ مالی د گەل خۆ ببەت.

ل سەر ڤێ فەرمانێ وان تاخێ خۆ چۆلکر، و ژ مەدینێ دەرکەفت و چوونە بازێرێ (ئەذروعاتێ) ل شامێ، ئەوێ نوکە دبێژنێ: (دەرعا)، و ل وێرێ ئاکنجی بوون.

ئەڤ ڕویدانە ل نیڤا هەیڤا شەووالێ بوو ژ سالا دویێ مشەختی.

**غەزایا (سووەیق)**:

پشتی شکەستنا قورەیشییان ل بەدرێ، و کوشتن و گرتنا هژمارەکا مەزن ژ سەر و ماقویلێن وان، ئەبوو سوفیانی -ئەوێ کاروانێ بازرگانییێ قورەیشییان ب سلامەتی گەهاندییە مەکەهێ- سۆز دا ئاڤ و بێنێن خۆش ب سەرێ وی نەکەڤن حەتا ئەو تۆلا قورەیشییان نەستینت، و بۆ خاترا ب جهئینانا سۆزا خۆ، وی نێزیکی دوسەد زەلامان دانە د گەل خۆ و ب نک مەدینێ ڤە چوو، و دەمێ ئەو نێزیکی مەدینێ بووی، وی خۆ گرت حەتا بوویە شەڤ، و ب شەڤێ ئەو ب نک تاخێ جوهییێن بەنوو نەضیرییان ڤە چوو و داخواز ژ (حویەیێ کوڕێ ئەخطەبی) کر کو مەزنەکێ وان بوو، کو دەری بۆ وی ڤەکەت، بەلێ ئەو ترسیا و بۆ ڤەنەکر، ئینا ئەبوو سوفیانی داخواز ژ (سەلامێ کوڕێ مشکمی) کر، و ئەو ژی ئێک ژ مەزنێن وان بوو، کو ئەو دەری بۆ وی ڤەکەت، و وی دەر بۆ ڤەکر و وێ شەڤێ ئەو ب مێڤانی هێلا ل تاخێ خۆ، و پشتەڤانییا خۆ بۆ وی ئاشکەرا کر و پاشی ئەو بر حەتا گەهاندییە هەڤالێن وی ژ دەرڤەی مەدینێ، و ئەبوو سوفیانی ب شعرەکا خۆ سوپاسییا وی کر، سەرا ڤێ هاریکارییا وی.

و هێژای گۆتنێیە کو دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب مشەختی گەهشتییە مەدینی وی پەیمانەک د گەل جوهییان گرێدابوو کو ئەو دوژمناتییا

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و مـوسلمانان نەکەن، و دەسـتـێ خـۆ نەکەنە د دەستێ لایەکێ وەسا دا یێ بخوازت هێرشێ بدەتە سەر مەدینێ، و ئەڤ کارێ جوهییێن بەنی نەضیری کری شکاندنەکا ئاشکەرا بوو بۆ وێ پەیمانێ یا بەری هنگی ئەو ل سەر رازیبووین.

ڕۆژا دی ئـەبـوو سوفیان گەهشتە هەڤالێن خۆ ژ دەرڤەی مەدینێ، و ل جهەکی وان ئاگر بەردا مالـەکێ و هندەک دارقەسپ سۆتن، و دو زەلامێن موسـلمان کوشـتن، و رەڤـین، گاڤـا موسـلمانان ب ڤـێ چەنـدێ زانـی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا د دویڤ ئەبوو سوفیانی و هەڤالێن وی دا دەرکەڤن، و گاڤا ئەبوو سوفیانی ئەڤ چەندە زانی زویتر رەڤین، و دا گیرۆ نەبن، وان گەلەک ژ خوارن و وان تشتێ د گەل وان دا هەی هاڤێت؛ دا بارێ وان سڤک ببت، و ئەو تشتێ د گەل وان پتر رەنگەکێ خوارنێ بوو دگۆتنێ: (سووەیق)، لەو دبێژنە ڤێ غەزایێ: (غەزایا سووەیق).

د ڤێ غەزایێ دا موسلمان نەگەهشتنە قورەیشییان، لەو چو شەڕ چێ نەبوو، و ئەبوو سوفیان شیا برەڤت، و ب سلامەتی بگەهتە مەکەهێ، و وی هزر کر کو وی ب ڤێ چەندێ سۆزا خۆ ب جهئینا!

ئەڤ ڕویدانە ل دویڤ بۆچوونا هندەک دیرۆکزانان ل هەیڤا (ذولحججە) بوو ژ سالا دویێ مشەختی.

## دو ڕویدانێ جڤاکی:

ل ڤـی دەمی، ژ دووماهییا سالا دویێ مشـەختی دو ڕویدانێن جڤاکی د ژیانا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- چێبووبوون:

**یا ئێکێ:** مارەکرن و ڤەگوهاستنا وی بوو بۆ حەفصایا کچا عومەرێ کوڕێ خەطابی، و ئاشکەرایە کو حەفصایێ بەری هنگی شوی ب خونەیسێ

کوڕێ حوذافەیێ سەهمی کربوو، و ئەو ئێک ژ صەحابییان بوو، و بەری هنگی ب دەمەکی ئەو مربوو.

**یا دوێ:** شویکرنا فاطمایا کچا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- ب عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی.

و ئەڤە دو ڕویدانێن بەرچاڤن د ژیانا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن-، ل ڤێ سالێ.

# سالا سێیێ مشەختی

بەرچاڤترین ڕویدانێن ڤێ سالێ شەڕێ ئوحودێ و دەرێخستنا جوهییێن (بەنوونەضیر) بوو ژ مەدینێ، و ژبلی ڤان هەردو ڕویدانێن مەزن هندەک ڕویدانێن دی ژی یێن بچویکتر هەبوون، ل ڤێرێ ب کورتی دێ ئیشارەتێ دەینێ.

## ڕویدانێن بەرێ شەڕێ ئوحودێ:

### ١- غەزایا (ذی ئەمەرر):

د هندەک کتێبێن سیرەتێ دا دبێژنێ: (غەزایا غەطەفان)، و (ذو ئەمەرر) جهەکە دکەفتە دەڤەرا نەجدێ، و ئویجاخا (غەطەفان) لێ دژیا، و ئەگەرا ڤێ غەزایێ ئەو بوو دەنگ و باس گەهشتنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو هندەک غەطەفانی کۆمبووینە ب ئنیەتا هندێ کو هێرشێ بدەنە سەر مەدینێ، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا هێزەکا لەشکەری ئامادە بکەت، و قەستا وێ دەڤەرێ بکەت، بەری کو غەطەفانی ئارمانجا خۆ ب جهـ بینن، و ئەو بوو ل هەیڤا صەفەرێ (یان ڕەبیعولئەووەلێ ل دویڤ گۆتنەکێ) وی چارسەد و پێنجی زەلام بەرهەڤکرن، و د گەل وان دەرکەفتە دەڤەرا نەجدێ، و وی عوثمانێ کوڕێ عەففانی ل شوینا خۆ دانا ل مەدینێ.

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و موسلمان گەهشتینە وی جهێ دبێژنێ: (ذی ئەمەرر) چەند ڕۆژەکان ئەو مانە ل وێرێ، بێی کەسەک ژ غەطەفانییان د خۆ ڕا ببینت کو بەرانبەر موسلمانان ڕاوەستت، لەو پشتی چەند ڕۆژەکان موسلمان ب سەرفەرازی زڤڕینە مەدینێ پشتی کو ترسا وان کەفتییە دلێن کافران.

### ٢- كوشتنا کەعبێ کورێ ئەشرەفێ جوهی:

ئەڤە ل هەیڤا سێیێ (رەبیعولئەووەلێ) ژ سالا سێیێ بوو، و کەعبێ کورێ ئەشرەفی ب خۆ عەرەبەکێ ژ ئویجاخا (طەی) بوو، بەلێ دەیکا وی جوهییەکا (بەنوو نەضیری) بوو، و ئەو زەلامەکێ تازە و شاعرەکێ دەسهەل بوو، ل مەدینێ ل حصنێ جوهییێن بەنوو نەضیر دژیا، دەمێ موسلمان ل شەڕێ بەدرێ ب سەرکەفتین، و هژمارەکا مەزن یا سەر و گرگرێن قورەیشییان هاتینە کوشتن، کەعبی ب ڤێ چەندێ گەلەک نەخۆش بوو، و گۆت: ژ ئەڤرۆ وێڤە مرن ژ ژیانێ چێترە!

هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو چوو مەکەهێ و پەیوەندی ب کافران کر، و شعر ب وان و کوشتییێن وان ڤەهاندن، و تێدا هاڤێتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و موسلمانان، و کافر پالدان کو تۆلا خۆ ژ موسلمانان بستینن، و بێ ئەدەبییا وی گەهشتە وێ دەرەجێ وی شعرێن غەزەلێ ب ژنێن موسلمان ڤەهاندن، و ئەڤ کارێ وی کری ڕاگەهاندنا شەڕی بوو ژ لایێ وی ڤە دژی موسلمانان، و دڤێت ئەم ژ بیر نەکەین کو پەیمانەک د ناڤبەرا موسلمان و جوهییێن بەنوو نەضیریان دا هەبوو کو ئەو شەڕێ موسلمانان نەکەن، و پشتەڤانییا قورەیشییان دژی موسلمانان نەکەن، بەلێ کەعبی ب وی کارێ خۆ ئەڤ پەیمانە شکاند، ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرێ خۆ دا ڤی کارێ وی وەک تاوانەک، و بڕیار دا وی ئەدەب بدەت؛ دا ئەو و جوهییێن دی ژی بزانن کو شکاندنا پەیمانان کارەکێ ب ساناهی نینە.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیارا کوشتنا ڤی جوهییێ خائین دا، و موسلمانەکێ ئەنصاری کو موحەممەدێ کورێ مەسلەمەی بوو، ئەو د گەل برایەکێ خۆ چوونە حصنێ جوهییان و قەستا کەعبی کر، و ژ بەر کو ئەو بەری هنگی هەڤال و نیاسێن کەعبی بوون، باوەرییا کەعبی ب وان هات و

پێشوازییا وان کر، وان کەعب کوشت و زڤڕینە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-.

د گەل کو ئویجاخا بەنوو نەضیرییان خۆ ل سەر تاوانا کەعبێ کوڕێ ئەشرەفی بێ دەنگ کربوو، و داخواز ژێ نەکربوو کو ئەو ڕێزێ ل وێ پەیمانێ بگرت یا وان د گەل موسلمانان هەی، بەلێ د گەل هندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ب تاوانا وی نەگرتن، و ب تنێ بڕیار ب جزادانا کەعبی دا، و تشتێ بەرچاڤ ئەو بوو د سەر خیانەتا کەعبی یا بەرچاڤ ڕا و ل شوینا جوهی لۆمەیێ ل وی بکەن کو وی پەیمان شکاندییە، وان خۆ ل سەر کوشتنا وی نەرازی کر، هەر چەندە خۆنەرازیکرنا وان چو پێڤە نەهات ژی.. و پشتی ڕویدانا شەڕێ ئوحودێ جارەکا دی دێ ل سوحبەتا ڤان جوهییان زڤڕین.

**٣- غەزایا بوحرانێ:**

ل دووماهییا هەیڤا چارێ (ڕەبیعولئاخەرێ) پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل سێسەد زەلامان دەرکەفتە وێ غەزایێ ئەوا دبێژنێ: (بوحران)، و ئەو دەڤەرەکە دکەفتە باشوورێ مەدینێ، و د ڤێ غەزایێ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابییێ خۆ عەبدللاهێ کوڕێ ئوم مەکتوومی ل جهێ خۆ دانا.

نێزیکی دەه ڕۆژان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ما ل ڤێ غەزایێ، پاشی بێی شەڕەک چێ ببت، ئەو و صەحابییێن خۆ زڤڕینە مەدینێ.

**٤- بوونا حسەنێ کوڕێ عەلی:**

ل پازدەیی هەیڤا ڕەمەزانێ نەڤییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ فاطمایێ حسەنێ کوڕێ عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی هاتە سەر دنیایێ، و حسەن سەییدێ گەنجێن بەحەشتێ، دەورەکێ مەزن د دیرۆکا ئیسلامێ دا گێڕایە، ب تایبەتی پشتی شەهیدبوونا بابێ وی ئیمام عەلی ب دەستێ خەوارجان، و ئەو دئێتە هژمارتن ئێک ژ صەحابییێن بچویک ب عەمری ڤە.

# شەڕێ ئوحودێ

## ئامادەكرن بۆ شەڕی:

پشتی شەڕێ بەدرێ ب سالەكێ كافرێن مەكەهێ تەنا نەبوون، ژ بەر وێ ئاتافا مەزن یا ب سەرێ وان هاتی، و هندەک ژ مەزنێن مەكەهێ یێن ل بەدرێ كەس و كارێن وان هاتینە كوشتن گۆتن: شەرمە بۆ مە ئەم سەرشۆڕ ل مەكەهێ ڕوینین و تۆلا خۆ ژ موسلمانان نەستینین، لەو ل دووماهییێ ئەو ل سەر هندێ كۆمبوون كو هەر ئێک ژ وان ل دویڤ شیانا خۆ مالی بدەت دا قورەیشی خۆ بۆ شەڕێ موسلمانان ئامادە بكەن.. و دبێژن: ئەو مالێ قورەیشییان بۆ ڤێ ئارمانجێ كۆمكری گەهشتە پێنجی هزار دینارێن زێڕی.

دەمێ قورەیشییان كارێ خۆ كری، و لەشكەرێ خۆ ئەوێ هژمارا وان گەهشتییە سێ هزار شەڕكەران بەرهەڤكری، مامێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەبباسی كاغەزەک ب دزی ڤە د گەل قاصدەكی هنارتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا دەنگ و باسێن قورەیشییان بگەهینتە وی، بۆ هندێ دا موسلمان كارێ خۆ بكەن، و دەمێ قاصدێ عەبباسی گەهشتییە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ل قوبائێ بوو، گاڤا ئوبەیێ كوڕێ كەعبی كاغەزا عەبباسی بۆ پێغەمبەری خواندی، وی داخواز ژ ئوبەیی كر كو ئەو ڤێ سوحبەتێ ل خەلكی ڤەشێرت؛ دا بەلبەلە د ناڤ وان دا بەلاڤ نەبت، و ئەو ب لەز زڤڕی مەدینێ، و دا ئەو پتر مەسەلێ تەئكید بكەت، وی دو زەلام ب لایێ مەكەهی ڤە هنارتن دا گوهدارییا سەح و سوییێن قورەیشییان بكەن، و پشتی ئەو زڤڕین، و خەبەر تەئكیدكری، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابییێن خۆ ل سپێدەیا ڕۆژا ئەینییێ چاردەی هەیڤا شەووالێ ژ سالا

سێیی مشەختی (بەرانبەر ٣٠ ئادارا ٦٢٥ زایینی) ل مزگەفتێ کۆمکرن، و دان و ستاندن د گەل وان کر، کانێ ئەو چ بکەن، و چ هەلویست وەرگرن؟

پشتی دان و ستاندنەکا درێژ ئەو ل سەر دو بۆچوونان ژێکجودا بوون: هندی پێغەمبەر بوو -سلاڤ لێ بن- د گەل زەلامێن ب عەمر و ماقویل بۆچوونا وان ئەو بوو ئەو ژ مەدینێ دەرنەکەڤن، و بمیننە ل بازێڕی، حەتا کافر دئێن و ئەو ل بازێڕی شەڕێ وان بکەن.. و سەرۆکێ منافقان عەبدللاهێ کوڕێ ئوبەیێ کوڕێ سەلوولی ژی خودانێ ڤێ بۆچوونێ بوو، بەلێ هژمارەکا پتر یا موسلمانان ب تایبەتی یێن گەنج و خوین گەرم ژ وان، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ل جاهلییەتێ مە نەهێلایە چو دوژمن ل بازێڕێ مە ب سەر مە دا بگرن، ڤێجا ئەم دێ د ئیسلامێ دا ڤێ چەندێ کەین؟! نە.. بهێلە ئەم دەرکەڤینە بەر سنگێ وان، و تو دێ بینی ئەم دێ چ کەین! و بارا پتر ژ خودانێن ڤێ بۆچوونێ ئەو بوون یێن ل شەڕێ بەدرێ ئامادە نەبووین، هیڤییا وان ئەو بوو ئەو جیهادێ بکەن دا ئەو خێرا گەهشتییە خەلکێ بەدرێ بگەهتە وان ژی.

و ژ بەر کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- سەرۆکەکێ دکتاتۆر نەبوو، و وی دڤیا دەرسەکێ نیشا وان ژی بدەت یێن پشتی وی دئێن و کارێ موسلمانان دکەفتە د دەستان دا کو ئەو گۆتنا مللەتی وەرگرن، و گوهدارییا وان بکەن، ئەو ژ بۆچوونا خۆ هاتە خوارێ، و ب گۆتنا پترییا صەحابییێن خۆ کر هەر چەندە وی د دل دا دزانی کو نەدەرکەفتنا وان ژ مەدینێ چێترە، ب تایبەتی وی بەری هنگی خەونەک دیتبوو کو هەر وەکی ئەو یێ د ناڤ کومزرییەکێ ئاسێ دا، و وی چێلەکا ڤەکوشتی ددیت.. و دەمێ صەحابییان پسیارا تەعبیرا خەونا وی ژێ کری وی گۆت: ئەو کومزرییێ ئاسێ مەدینەیە. د سەر ڤێ هەمییێ ڕا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب گۆتنا هەڤالێن خۆ کر، و

پشتی وی خوتبا نیڤرۆ خواندی ئەو چوو مالا خۆ و جلکێن خۆ یێن شەڕی کرنە بەر خۆ، پاشی دەرکەفتە مزگەفتێ و فەرمان دا لەشکەرێ موسلمانان کارێ خۆ بۆ دەرکەفتنێ بکەت.

هنگی صەحابییان هەست ب پەشێمانییێ کر کو هەر وەکی وان کوتەکی ل پێغەمبەری کر حەتا وی بۆچوونا خۆ گوهارتی، لەو وان گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! نە کو مە کوتەکی ل تە کر بت، ئەگەر تە پێ خۆش نەبت ئەم دەرکەڤین، ئەم دەرناکەڤین، و دێ وێ کەین یا تە دڤێت. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: دەمێ پێغەمبەرەک جلکێن شەڕی دکەتە بەر خۆ بۆ وی چێ نابت ئەو جلکێن خۆ بدانت حەتا خودێ حوکمی د ناڤبەرا وی و نەیارێن وی دا بکەت. و وێ ئێڤارێ یان ڕۆژا د دویڤا دا سپێدێ زوی موسلمان و هژمارا وان هزار شەرکەر بوون بەر ب چیایێ ئوحودێ ڤە دەرکەفتن.

## چیایێ ئوحودێ:

(ئوحود) ناڤێ ئێک ژ چیایێن ناڤدارێن باژێرێ مەدینێنە، چیا دکەفتە لایێ باکوورێ مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دویراتییا نێزیکی چار کیلۆمتر و نیڤان، درێژییا وی هەشت کیلۆمترە، و فرەهییا وی د ناڤبەرا (۲-۳) کیلۆمترانە، و بلندییا وی نێزیکی (۳۰۰) مترانە.

د فەرهەنگا موسلمانان دا ڤی چیایی بهایەکێ بەرچاڤ هەیە، و ئەڤ بهایە ژ دو لایان ڤە دئێت:

یا ئێکێ: ژ بەر وێ حەدیسێ یا تێدا هاتی: ((هَـذَا جَبَـلٌ يُحِبُّنَـا وَنُحِبُّه))[1] یەعنی: ئەڤە چیایەکە حەز ژ مە دکەت، و ئەم حەز ژ وی دکەین،

---

(۱) بوخاری (۲۸۸۹) و موسلم (۳۳۸۷) ژ ئەنەسێ کوڕێ مالکی ڤەدگوهێزن.

و ئەگەر ل بەر هندەک ژ مە یا عەجێب بت تشتەکێ وەکی چیایی هشک خودان هەست بت، ئەو د ڕاستییێ دا تشتەکێ عەجێب نینە؛ چونکی مرۆڤ ب علمێ خۆ یێ کێم ژی نوکە یێ گەهشتییە وێ ڕاستییێ ئەوا دبێژت: (حەیوان و نەبات و جەماد) ژی خودان زمانەکێ تایبەتن، و ئەو ژی ژ هەست و شعوورێ دڤالا نینن.

یا دویێ: ژ بەر وان بیرهاتنێن موسلمانان ل نک ڤی چیایی هەین، ب تایبەتی بیرهاتنا شەڕێ (ئوحودێ)، و هەبوونا زیارەتێن حەفتێ شەهیدێن شەڕێ ئوحودێ، و ناڤدارترینێ وان -وەکی ئاشکەرا- مامێ پێغەمبەری حەمزەیە.

و چیایێ ئوحودێ ب هەمی ڤە دکەفتە د توخوبێن حەرەما مەدینێ دا، و ل لایێ قیبلەیا چیایێ ئوحودێ چیایەکێ بچویک (پتر وەکی گرانە) هەیە دگۆتنێ: چیایێ (عەینەین) و پشتی شەڕێ ئوحودێ ناڤێ وی پتر بوو چیا (یان گرێ) ڕمبازان؛ ژ بەر کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل ڕۆژا شەڕێ ئوحودێ هژمارەکا ڕمبازان دانانە سەر، وەکی دێ بۆ مە ئاشکەرا بت، دەمێ ئەم بەحسێ سەرهاتییا شەڕی دکەین، ئەگەر خودێ حەز بکەت.

ئەڤ گرە کیلۆمترەکێ یێ دویرە ژ چیایێ ئوحودێ، و بلندییا وی بیست مترە، و درێژییا وی (١٧٥) مترە، و فرەهییا وی (٥٥) مترە.

**بەر ب ئوحودێ ڤە:**

د ریوایەتەکێ دا هاتییە کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل موسلمانان پشتی نیڤرۆیا ڕۆژا ئەینییێ چاردەی هەیڤا شەووالێ، ژ مەدینێ دەرکەفت، و بەر ب ئوحودێ ڤە چوو، ئەو جهێ زانین گەهشتینێ کو لەشکەرێ کافران یێ هاتییێ، ل دویڤ ڤێ ریوایەتێ لەشکەرێ موسلمانان ل شەڤا بەری شەڕی -کو شەڤا شەنبییێ بوو- دڤێت ل مەیدانا شەڕی ل ئوحودێ مابن، بەلێ

د ریوایەتەکا دی دا هاتییە کو موسلمان بەری سپێدەیا شەنبییێ هێشتا دنیا زەلال نەبووی لەشکەرێ موسلمانان ژ مەدینێ دەرکەفت و بەر ب ئوحودێ ڤە چوو، و دەمێ ئەو چووین ژی ئەو د رێکا عەدەتی را نەچوون، بەلکی ئەو د ناڤ بیستانان را دەرباس بوون؛ دا لەشکەرێ کافران پێ نەحەسیێن و نەئێنە د رێکا وان دا.

ئبن هیشام د سیرەتێ دا ئاشکەرا دکەت کو ل ڤێ دەرکەفتنێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەبدلاهێ کورێ ئوم مەکتوومی ل شوینا خۆ هێلا ل مەدینێ.

هژمارا لەشکەرێ موسلمانان دەمێ ئەو ژ مەدینێ دەرکەفتین هزار چەکدار بوون، ل نیڤا رێ، سەرۆکێ منافقان عەبدللاهێ کورێ ئوبەیێ کورێ سەلوولی بریار دا بزڤرتە مەدینێ، و دەمێ وی ئەڤ بریارا خۆ ب جهئینای سێسەد زەلام ژ مرۆڤ و دویکەفتیێن وی د گەل وی زڤرین، و هێجەتا ئاشکەرا یا وی بۆ خۆ گرتی ئەو بوو وی -و هەڤالێن وی ژ منافقان- گۆت: ئەم باوەر ناکەین چو شەر چێ ببن، لەو ئەم دێ زڤرین، و ئەگەر ئەم بزانین سەدا سەد شەر دێ چێ بت، ئەم دێ ئێین! تشتێ دی یێ سەرۆکێ منافقان خۆ ژ بەر نەرازی کری ئەو بوو وی گۆت: موحەممەد گوهدارییا زارۆکان دکەت، و ژ بەر گۆتنا وان ژ مەدینێ دەرکەفت، و گوهدارییا مەزن و ریهسپیێن وەکی من ناکەت! و ئەو ب خۆ ئارمانجا وی یا سەرەکی ئەو بوو وی دڤیا سستییێ بێختە ناڤ رێزا موسلمانان، و لەشکەرێ وان لاواز بکەت، و وان فاشل بکەت.. و نیزیک بوو تشتەکێ وەسا چێ ببت، چونکی دەمێ سێسەد زەلام د گەل سەرۆکێ منافقان زڤرین، ئویجاخا (بەنوو سەلەمە و بەرنوو حارثە) دودل بوون، و هزرا زڤرینێ کرن، بەلێ خودێ ئەو پاراستن و

د ریوایەتەکا دی دا هاتییە کو موسلمان بەری سپێدەیا شەنبییێ هێشتا دنیا زەلال نەبووی لەشکەرێ موسلمانان ژ مەدینێ دەرکەفت و بەر ب ئوحودێ ڤە چوو، و دەمێ ئەو چووین ژی ئەو د رێکا عەدەتی را نەچوون، بەلکی ئەو د ناڤ بیستانان را دەرباس بوون؛ دا لەشکەرێ کافران پێ نەحەسیێن و نەئێنە د رێکا وان دا.

ئبن هیشام د سیرەتێ دا ئاشکەرا دکەت کو ل ڤێ دەرکەفتنێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەبدلاهێ کورێ ئوم مەکتوومی ل شوینا خۆ هێلا ل مەدینێ.

هژمارا لەشکەرێ موسلمانان دەمێ ئەو ژ مەدینێ دەرکەفتین هزار چەکدار بوون، ل نیڤا رێ، سەرۆکێ منافقان عەبدللاهێ کورێ ئوبەیێ کورێ سەلوولی بریار دا بزڤرتە مەدینێ، و دەمێ وی ئەڤ بریارا خۆ ب جهئینای سێسەد زەلام ژ مرۆڤ و دویکەفتییێن وی د گەل وی زڤرین، و هێجەتا ئاشکەرا یا وی بۆ خۆ گرتی ئەو بوو وی -و هەڤالێن وی ژ منافقان- گۆت: ئەم باوەر ناکەین چو شەڕ چێ ببن، لەو ئەم دێ زڤرین، و ئەگەر ئەم بزانین سەدا سەد شەڕ دێ چێ بت، ئەم دێ ئێین! تشتێ دی یێ سەرۆکێ منافقان خۆ ژ بەر نەرازی کری ئەو بوو وی گۆت: موحەممەد گوهدارییا زارۆکان دکەت، و ژ بەر گۆتنا وان ژ مەدینێ دەرکەفت، و گوهدارییا مەزن و ڕیهسپییێن وەکی من ناکەت! و ئەو ب خۆ ئارمانجا وی یا سەرەکی ئەو بوو وی دڤیا سستییێ بێختە ناڤ ڕێزا موسلمانان، و لەشکەرێ وان لاواز بکەت، و وان فاشل بکەت.. و نیزیک بوو تشتەکێ وەسا چێ ببت، چونکی دەمێ سێسەد زەلام د گەل سەرۆکێ منافقان زڤرین، ئویجاخا (بەنوو سەلەمە و بەرنوو حارثە) دودل بوون، و هزرا زڤڕینێ کرن، بەلێ خودێ ئەو پاراستن و

موكمكرن، لەو ل دوومـاهييێ ئـەو ژ ڤـێ هـزرێ لێڤـەبوون و مانـە د گـەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-.

تشتێ دی یێ بەرچاڤ و هێژای گۆتنێ رویدای ئەو بوو دەمێ موسلمان بەر ب ئوحودێ ڤە دچوون دەنگ و دۆرەک هاتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی پسیار کر: ئەڤە چییە؟ گۆتن: ئەڤە حەلیفێن عەبدللاهێ کورێ ئوبەیێ کـورێ سەلوولینە ژ جوهییان، یێن هاتینە دا هـاری مە بکەن. پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: بلا بـزڤـڕنـەڤـە، ئەم بۆ شەڕێ موشرکان هاریکارییێ ژ موشرکان ناخوازین.. و ئەگەر ئەڤ رویدانە بەری رویدانا زڤڕینا عەبدلاهێ کورێ ئوبەیی بت، دویر نینە زڤڕینا وی ژ کەربێن ڤێ چەندێ ژی دا بت.

ب خواندنەکا سیاسی -هنگی- بۆ ڤێ رویدانێ، دویر نائێتە دیتن، کو پەیوەندییەکا (مەشبووهـ) د ناڤبەرا سەرۆکێ منافقان و جوهییان دا هەبت کو ئەو د ناڤ ڕێزێن موسلمانان دا ب چەکداری ل مەیدانا شەڕی بەرهەڤ ببن؛ دا ل دەمێ پێتڤی ئەو د گەل کافرێن مەکەهێ هێرشێ بدەنە سەر موسلمانان و وان بنبڕ بکەن؛ چونکی قەت هزرا باش ژ منافق و جوهییان نائێتەکرن و کـو وان حـەز کریت بەرەڤانییێ ژ موسلمانان بکەن، و چونکی پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ چەندە باش ژ وان دزانی، وی قـەبویل نـەکـر جـوهـی ل مەیدانا شەڕی ئامادە ببن، ئەگەر خۆ هێجەتا وان پشتەڤانییا موسلمانان ژی بـت، و گاڤـا هـەڤالێ جوهییـان عەبـدللاهێ منـافق دیتـی ب زڤڕانـدنا چـەکـدارێـن جـوهییان پشکەکا مەزن ژ پلانا وان هـاتـە خرابکرن، ئـەو ل هێجەتەکێ گەڕیا کو ئەو ژی بزڤڕتەڤە، و وەسا چێبوو.

هەر وەسا ب ڕێڤە پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- نێزیکی چاردە کەس زڤڕاندنە مەدینێ و دەستویری نەدا وان کو ئەو شەڕی بکەن؛ چونکی ژییێ وان ژ چاردە سالییێ کێمتر بوو، و عەبدللاهێ کورێ عومەری و ئوسامەیێ

کوڕێ زەیدی و ئەبوو سەعیدێ خودری و چەندەکێن دی ژ وان بوون، د ناڤ وان دا زارۆکەک هەبوو دگۆتنێ: رافعێ کوڕێ خەدیجی، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ژی زڤراندی، هندەکان گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەو بۆ تیرهاڤێتنێ گەلەک زیرەک و سەکڤانە، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا وی کو ئەو بمینت، و وی هەڤالەک هەبوو دگۆتنێ: سەمورەیێ کوڕێ جوندوبی، گاڤا وی دیتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو زڤراند و هەڤالێ وی رافع هێلا، ئەو چوو نک زڕبابێ خۆ سینانی و کرە گری و گۆتێ: بۆ خۆلێکدانێ ئەز دشێمە رافعی، و پێغەمبەری ئەو هێلا و ئەز زڤراندم! زڕبابێ وی چوو نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەڤ سوحبەتە بۆ کر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: کانێ خۆلێکدانێ بکەن، و گاڤا سەمورەیی رافع ئێخستی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا وی ژی کو د گەل وان بچتە شەڕی. ئەڤە هندێ دگەهینت کو ڤیانا صەحابییان بۆ مانا د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و کرنا جیهادێ گەلەک یا مەزن بوویە، حەتا ئێک ژ وان دکرە گری دەمێ زانیبا کو دەستویری بۆ وی نائێتەدان ئەو بچتە جیهادێ.

### ل مەیدانا شەڕی:

پشتی سەرۆکێ منافقان سێئێکیا لەشکەری د گەل خۆ زڤراندی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل نێزیکی حەفت سەد شەڕکەران ل تێشتەگەها رۆژا شەنبییێ پازدەی هەیڤا شەووالێ گەهشتە وێ مەیدانێ ئەوا دکەفتە بەر سنگێ چیایێ ئوحودێ ژ لایێ قیبلێ ڤە، و لەشکەرێ کافرێن مەکەهێ ئەوێ ئەو چەند رۆژەک بوو ژ مەکەهێ دەرکەفتی، گەهشتبوو لایێ باکوورێ باژێڕێ مەدینێ، و دەمێ وان زانی کو لەشکەرێ موسلمانان یێ گەهشتییە بنارێ چیایێ ئوحودێ، ئەو ژی ب نک وان ڤە چوون، و هەردو

لەشکەر ل وێرێ گەهشتنە ئێک، پشتا موسلمانان کەفتە چیایێ ئوحودێ، و بەرێ وان کەفتە بـاژێرێ مـەدینێ، و دەسـتێ وان یـێ ڕاسـتێ کەفتـە وی گـری (یان چیایی) یـێ دگـۆتنێ: (عەینـەین)، و ژ بـەر گرنگییـا وی گـری و جهـێ وی یێ ئستراتیجی پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- پێنجی ژ باشـترین ڕمبـازان هلبژارتن، و عەبدللاهێ کوڕێ جوبەیری کرە ئـەمیرێ وان، و گۆتـە وان: ئەگـەر هوین ببینن طـەیر مە ڤەڕەڤینن، جهێ خۆ بەرنەدەن حەتا ئەز بهنێرمە د دویڤ هەوە ڕا، و ئەگەر هەوە دیت مە ئەو شکاندن و مە دا ب دویڤ وان ڤە جهـێ خۆ بەرنەدەن حەتا ئەز بهنێرمە د دویڤ هەوە ڕا.

ئارمانجـا پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ب وێ چەنـدێ ئـەو بـوو، ئـەو ڕمبـاز گـری زەبـت بکـەن، دا ل سـەر مەیـدانێ ژی و نهـالـێ ژی دزال بـن؛ چونکی ل بەر قیبلەیا وی گری نهالـەک هەبوو ب لایێ ڕۆژئاڤـایێ ڤە دچوو، ب نک وی جهی ڤە یـێ لـەشکەرێ کـافران لـێ دانـای، پشـتا موسـلمانان و هندەک ژ لایێ وان یێ ڕاستێ ژی چیا بـوو، کـافر نەدشیان ل دۆر بزڤـڕن، و لایێ وان یێ چەپێ ئەو گر بوو یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕمباز ل سـەر دانایین، و ئەگەر گر هاتە گرتن، کافران چو ڕێ نابن ل دۆر موسلمانان بزڤـڕن، بـەلێ ژ هـەر لایـەکێ موسـلمانان بڤێـت، ئـەو دێ شـێن ل دۆر کـافران زڤـڕن، چـونکی پشـتا وان یـا بەردایـە، ژ لایـەکێ دی ڤـە ئـەو پلانـا لـەشکەری یـا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دانای یا وەسا بـوو کـو: ئەگـەر کـافر د شـەڕی دا شکەسـتن، چـو تشـت نابـت وان بگـرت یـان بپـارێزت، بـەلێ ئەگـەر ئـەم شکەستین چیـــا دێ مە پارێزت، چـونکی ئـەم دێ خۆ ڤەکێشـینە چیـایی و ب سەرکەڤین، و هنگی ئەم دێ ئێینە پاراستن. بـەلێ یـا ژ هـەمییێ گرنگتـر ئەوە گر نەئێتە بەردان، چونکی هەر جارەکا ئەو هاتە بەردان، دبت کافر ل دۆر بزڤڕن، و ژ لایێ پشتێ ڤـە هێرشـێ بدەنـە موسلمانان، و هنگـی مەسـەلە دێ

تێکچت، ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک تەئکید ل وان ڕمبازان کر کو د چو حالەتان دا ئەو جهێ خۆ بەرنەدەن،.

ل مەیدانا شەڕی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لەشکەرێ موسلمانان ب ڕێز کر وەکی کو ئەو د نڤێژێ دا خۆ ب ڕێز دکەن، و وی لەشکەر کرە سێ (کەتیبە) و کۆم، کۆما موهاجران و ئالایێ وان کرە د دەستێ موصعەبێ کوڕێ عومەیری دا، و کۆما ئەوسییان ژ ئەنصارییان و ئالایێ وان کرە د دەستێ ئوسەیدێ کوڕێ حوضەیری دا، و کۆما خەزرەجییان ژ ئەنصارییان و ئالایێ وان کرە د دەستێ حوبابێ کوڕێ مونذری دا.

لەشکەرێ کافران ب سەرۆکاتییا ئەبوو سوفیانی بوو و مەزنێ لایێ ڕاستێ خالدێ کوڕێ وەلیدی بوو، و یێ لایێ چەپێ عەکرمەیێ کوڕێ ئەبوو جەهلی بوو. ل بەدرێ کوڕێ ئەبوو سوفیانی (حەنظەلە) و بابێ عەکرمەیی (ئەبوو جەهل) کو دبوو مامێ خالدی ژی هاتبوونە کوشتن، لەو هەر ئێک ژ وان دلەکێ تژی کەرب و کین دژی موسلمانان د سنگێ خۆ دا هل دگرت..

و بەری ئەم بەردەوامییێ بدەینە سەرهاتییا شەڕێ ئوحودێ، گوهدارییا ڤێ حنێرێ بکەن ئەوا دیرۆکێ بزڤڕینا خۆ ڤەهاندی.

### هەر سێ مەزنێن کافران:

ئەبوو سوفیان و خالد و عەکرمە.. سێ مەزن و سەرلەشکەرێن کافرێن قورەیشییان بوون، ل ڕۆژا ئوحودێ وان دەستەکێ مەزن د وێ سەرکەفتنا لەشکەری دا هەبوو یا کافران ب دەست خۆ ڤە ئینای، و پشتی دەھ سالان ژ ڤێ ڕویدانێ، و زڤڕینا چەرخا زەمانی، لەشکەرەکێ مەزن یێ موسلمانان ژ مەدینێ دەرکەفت و بەر ب شامێ ڤە چوو دا ئالایێ ئیسلامێ و تەوحیدێ ل وێرێ بلند بکەت، ڤی لەشکەری شەڕەکێ گرنگ و بنبڕ کر، هوین دزانن مەزن و سەرلەشکەرێن موسلمانان د ڤی شەڕی دا کی بوون؟

سەرۆكێ مەزنێ لەشكەری خالد بوو، و سەرۆكێ هێزا مرنێ عەكرمە بوو، و سەرۆكێ هێزا مەعنەوی ئەبوو سوفیان بوو!!

و دەمێ هوین ڤێ زانینێ ل بیرا خۆ دئیننەڤە، مەزنییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل بیرا خۆ بیننەڤە دەمێ داخواز ژێ هاتییەكرن كو خودێ كافرێن مەكەهێ هەمییان تێ ببەت، وی گۆت: نە.. بەلكی خودێ هندەكان ژ پشتا وان دەربێخت بەرەڤانییێ ژ ڤی دینی بكەن!

**هندەك رویدانێن بەرێ شەرێ:**

* ل وی دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- رێزێن موسلمانان دورست دكرن، بەری شەڕ دەست پێ بكەت، وی شیرەک ڕاكر و گۆت: كی دێ ڤی شیری هلگرت؟ گەلەک صەحابییان دەستێن خۆ ب نك ڤە درێژكرن، هەر ئێكی گۆت: ئەز. ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: كی دێ وی هلگرت و حەقێ وی دەتێ؟ هنگی وان دەستێن خۆ ڤەكێشان، گۆتن: نە كو ئەم ژ دەر حەق دەرنەكەڤیت، وێ گاڤێ ئەبوو دوجانە سیماكێ كوڕێ خەرەشەیێ ساعدی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەز دێ وی هلگرم و ژ دەر حەق دەركەڤم.

د ریوایەتەكێ دا هاتییە كو زوبەیرێ كوڕێ عەووامی -كوڕەتێ پێغەمبەری- بەری ئەبوو دوجانەی گۆتێ: ئەز دێ وی شیری هلگرم، بەلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو نەدا وی و گاڤا ئەبوو دوجانەی گۆتی: ئەز، پێغەمبەری ئەو داڤێ.

گاڤا ئەبوو دوجانەی شیر ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەرگرتی، وی پارچەیەكا پاتەیێ سۆر ل ئەنیا خۆ شداند، و دەمێ وی ڤیابا شەڕی بكەت وی وە دكر، پاشی ئەو ب ڕەنگەكێ خۆمەزنكرنێ ڤە دەركەتە ناڤ ڕێزێن شەڕكەران و هات و چو، گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ب وی ڕەنگی

دیتی، گۆت: ئەڤە رێڤەچوونەکە ئەگەر نە ل ڤی جهی بت خودێ حەز ژێ ناکەت[1]. و وێ رۆژێ ئەبوو دوجانەی حەقێ وی شیری دایێ، و هند شەر پێ کر حەتا ئەو د دەستان دا خواربووی. و دبێژن: وێ رۆژێ هندا کچا عوتبەی کەفتە بەر سنگێ ئەبوو دوجانەی و ئەبوو دوجانەی شیر راکرە هنداڤ سەرێ وێ و گاڤا وێ دیتی ئەبوو دوجانە دێ وێ کوژت وێ قێژییەک راهێلا، ئەبوو دوجانەی ژ دەنگێ وێ زانی کو ئەو ژنکە، هنگی وی شیرێ خۆ ڤەکێشا و گۆت: ئەز شیرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب کوشتنا ژنەکێ بێ بها ناکەم!

* زەلامەکێ ئەوسی هەبوو دگۆتنێ: (ئەصرەم) ناڤێ وی عەمرێ کورێ ثابتی بوو، ئەبوو هورەیرەی گەلەک جاران نموونە ب وی دئینا و دگۆت: کی دێ ناڤێ زەلامەکی بۆ من بێژت یێ چوویە بەحەشتێ و نڤێژەکا ب تنێ نەکرییە؟ پاشی دگۆت: ئەو ئەصرەمە، ئەو مرۆڤەک بوو ب ئیسلامێ رازی نەبوو، رۆژەکێ ئەو هاتە مەدینێ دیت مەدینە یا ڤالایە ژ مرۆڤان، وی پسیار کر: کانێ سەعدێ کورێ موعاذی؟ کانێ برازایێن وی؟ کانێ مرۆڤێن مە؟ هندەکان گۆتێ: ئەو هەمی یێن چووینە ئوحودێ، دا شەرێ کافرێن قورەیشییان بکەن. هنگی دلێ وی چوویێ موسلمان ببت، لەو وی جلکێن شەری کرنە بەر خۆ، و شیرێ خۆ هلگرت و قەستا ئوحودێ کر، و چوو نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەو یێ پێچای خۆ گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، شەری بکەم یان موسلمان ببم؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: موسلمان ببە پاشی شەری بکە.. ئەو موسلمان بوو و چوو د ناڤ خەلکی دا و شەرکر، هندەک مرۆڤێن وی ئەو دیت وان هزرکر ئەو ژ تەعەصصوب بۆ ئویجاخا خۆ

---

(١) ئەڤ گۆتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یا دووماهییێ د دەر حەقا رێڤەچوونا ئەبوو دوجانەیی دا، ب رێکێن دورست نەگەهشتییە مە.

يێ هاتييه شەرِی، لەو وان گۆتێ: نێزیکی مە نەبە! وی گۆتە وان: ئەز یێ موسلمان بوویم، و وی شەڕکر حەتا هاتییە کوشتن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەحسێ وی کر و گۆت: ((عَمِلَ قَلِيلًا وَأُجِرَ كَثِيراً))[1] یەعنی: وی کارەکێ کێم کر، و خێرەکا مەزن بۆ هاتەدان.

و سەرهاتییا ڤی زەلامی و هندەکێن دی یێن وەکی وی هندێ دگەهینن کو شەرتێ کاری دووماهییە.

* و وەکی ڤێ سەرهاتییا بۆری یا زەلامێ ئەوسی، سەرهاتییەکا زەلامەکێ جوهی ژی هەیە ئەو ژی موخەیریق بوو، و ئەو جوهییەکێ قەینوقاعی بوو بەلێ د گەل بەنوو نەضیرییان بوو، دەمێ موسلمان دەرکەفتینە ئوحودێ وی گۆتە جوهییان: هوین دزانن کو پشتەڤانییا موحەممەدی یا فەرە ل سەر هەوە، وان گۆتێ: ئەڤرۆ شەنبییە! وی گۆت: نە هوین بن و نە شەنبییا هەوە.. پاشی وی گۆت: ئەڤە ئەز چووم هاری موحەممەدی بکەم، ئەگەر ئەز نەزڤریم مالێ من هەمی بۆ موحەممەدییە وی چ دڤێت بلا لێ بکەت. و ئەو بەر ب ئوحودێ ڤە چوو، و شەڕ کر حەتا هاتییە کوشتن. و ئەڤە ژی هندێ دگەهینت کو ئەگەر خودێ خێرا ئێکی ڤیا دووماهییا وی دێ ل سەر باشییێ بت.

## د ناڤبەرا عەلی و طەلحەی دا:

طەلحەیێ کورێ عوثمانی ئالاهلگرێ کافرێن قورەیشییان بوو ل رۆژا ئوحودێ، بەری شەڕ دەست پێ بکەت، ئەو هاتە مەیدانێ و ب دەنگەکێ بلند گازی کر: کی دێ ئێتە شەرێ من؟ و پشتی وی گۆتنا خۆ چەند جارەکان دوبارەکری و کەسێ بەرسڤا وی نەدای، وی گۆت: گەلی هەڤالێن

(١) بوخاری (٢٨٠٨) ژ بەرائی ڤەدگوهێزت.

موحەممەدی! هوین دبێژن: خودێ ب شیرێن هەوە دێ مە بەتە جەهنەمێ، و ب شیرێن مە دێ هەوە بەتە بەحەشتێ، کی ژ هەوە دێ ئێت من ب شیرێ خۆ هنێرتە جەهنەمێ یان ب شیرێ من خۆ بەتە بەحەشتێ؟

هنگی عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی د گازییا وی چوو و گۆتێ: ئەز ب وی کەمە یێ نەفسا من د دەستان دا، ئەز تە ناهێلم حەتا خودێ تە ب شیرێ من دبەتە جەهنەمێ یان ب شیرێ تە من دبەتە بەحەشتێ.. و عەلی چوویێ، عەلی دربەک دانایێ پییەکێ وی ژێڤەبوو و د هەسپی دا کەفت، و گاڤا عەلی چوویێ دا وی تمام بکەت، وی هەوار کر و گۆت: پسمام، ئەز تە ب خودێ ددەمە سویندێ تو مرۆڤاینییا مە ژ بیر نەکە.. هنگی عەلی ئەو هێلا و زڤڕی!

پشتی ڤێ سەرهاتییێ شەڕی دەست پێ کر.

**دەسپێکرنا شەڕی:**

ئەگەر دوریشمێ موسلمانان ل ڕۆژا بەدرێ (أَحَدٌ، أَحَدٌ) بت، ل ڕۆژا ئوحودێ دوریشمی وان (أَمِتْ، أَمِتْ) بوو، شەڕی دەست پێ کر، و ل سەری شەڕ د مفایێ موسلمانان دا بوو، و ئەو ب هێز بۆ پێشڤە چوون، و دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو شکەستن کەفتە ڕێزێن کافران، و ئەو پاشدا زڤڕین، حەمزە شیا ئالاهلگرێ کافران (ئەرطەئەیێ کورێ عەبد شورەحبیلی) بکوژت، و ئالایێ وان ل عەردی بدەت، پاشی عوثمانێ کورێ ئەبوو طەلحەیی خۆ ل ئالایی دا و هلگرت، حەمزە گەهشتە وی ژی و ئەو ژی کوشت، زەلامەکێ دی ئالا هلگرت، موسلمانان ئەو ژی کوشت.. و هۆسا نەهـ زەلامان ئالا هلگرت، و هەر نەهـ هاتنە کوشتن، پشتی کوشتنا زەلامێ نەهێ، ئێدی ئالایێ وان نەهاتە ڕاکرن، و هنگی کەفتنا ئالایی نیشانا شکەستنا لەشکەری

بوو، كافران دەمێ ئالایێ خۆ ل عەردی دیتی شکەستن کەفتە رێتزێن وان و پاشدا چوون، و موسلمانان دا ب دویڤ وان ڤە.

ل ڤی دەمی بوو نێزیک بوو ئەبوو دوجانە هندا کچا عوتبەی بکوژت، بەلێ دەمێ وی زانی ئەو ژنکە وی شیرێ خۆ ڤەکێشا و گۆت: ئەز چو ژنکان ب شیرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناکوژم، هەر وەسا حەنظەلەیێ کورێ ئەبوو عامرێ ئەنصاری ژی، و ئەو کەسەکێ پەیا بوو، ب نک ئەبوو سوفیانی ڤە چوو، و ئەو یێ سویار بوو ل سەر هەسپی، حەنظەلەی شیرەکێ ب هێز د هەسپێ ئەبوو سوفیانی وەراند، ئەبوو سوفیان کەفتە عەردی، و حەنظەلە چوو هنداڤ سەری و شیرێ خۆ راکر و نێزیک بوو ل ستویێ وی بدەت، ئەبوو سوفیانی کرە هەوار، هنگی شەددادێ کورێ ئەسوەدی یێ نێزیک بوو ژ وان، وی تیرە د حەنظەلەی وەرکر، حەنظەلە لێ زڤری و ب نک ڤە چوو بەلێ وی شیرەک ل حەنظەلەی دا و حەنظەلە کوشت.

و ژ بەر کو خودێ وەسا حەز کربوو ئەبوو سوفیان و ژنکا وی هند پشتی هنگی موسلمان ببن، و بەرەڤانییێ ژ ئیسلامێ بکەن، لەو وی ئەو ژ کوشتنێ پاراستن، و د هندەک ریوایەتێن دورست دا هاتییە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەحسێ حەنظەلەی کر و گۆت: من دیت ملیاکەتان ئەو دشویشت.. ڤێجا پسیارا عەیالێ وی بکەن کانێ مەسەلا وی چییە؟

ل وێ شەڤا سپێدەیا وێ شەرێ ئوحودێ هاتییەکرن، شەڤا زاڤاینییا حەنظەلەی بوو، وی ژنکا خۆ جەمیلایا کچا عەبدللاهێ کورێ ئوبەیی ڤەگوهاستبوو، سپێدێ زوی دەمێ وی زانی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی دەرکەفتنە ئوحودێ بۆ شەرێ کافران، وی لەز کر و خۆ گەهاندە وان، بەری کو خۆ بشۆت، گاڤا حەنظەلە دەرکەفتییە ئوحودێ ژنکا وی چار ژ مرۆڤێن خۆ ل سەر وێ کرنە شاهد یا د ناڤبەرا وان دا چێبووی،

هـنـدەكـان پشتى هنگى گۆتىّ: بـۆچى تە ئەو شاهد گرتن؟ وىّ گۆت: مـن د خەونا خۆ دا ديت هەر وەكى عەسمان ڤەدبوو و حەنظەلـە ب ژۆر دكـەفت و عەسمان لێک دهاتەڤە، ڤێجا من زانى ئـەو دێ شـەهيد بت و نازڤڕتەڤـە، و وەسـا چێبـوو خـودێ كـوڕەک ژ ڤـى شـەهيدى دا ڤـێ ژنـێ نـاڤێ وى كربـوو: عەبدللاه.

ب ڤـى ڕەنگـى خـودايـێ مـەزن د هـەوارا مـوسلمانان هات، و ئـەو ب سەرئێخستن، و شكەستن ئێخستە كۆمـا كـافران، و ڕێزێـن وان ژبـەرك برن، و ئەو ڕەڤين، خودايێ مەزن د ئايەتەكا سوورەتا (آل عمران) دا دبێژت: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ﴾ (آل عمران: ١٥٢) يـەعنى: ب ڕاسـتـى خـودێ پـەيـمـانـا خـۆ د گـەل هـەوە پێكئينا كـو ئـەو هەوە ب سەربێخت، دەمێ هەوە ب ئانەهييا وى ئەو كوشتين..

بەلێ پشتى هنگى چ چێبوو؟

خودێ دبێژت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ ﴾ (آل عمران: ١٥٢-١٥٣) يـەعنى: حەتا دەمـێ هوين فاشلبووين، و هوين ژ كرنا شـەڕى لاوازبـووين، و هـوين د ناڤبـەرا خـۆ دا ژێكجودابـووين، و هـەوە گوهـدارى نەكرى، خودێ شكەستن ئێخستە ڕێزێن هەوە پشتى كو وى ئەو نيشا چاڤێن هەوە داى يا هەوە حەز ژێ دكر كو سەركەفتن بوو، و ئاشكەرا بوو كو هندەک ژ هـەوە دنيـا دڤێـت و هنـدەكان ئـاخرەت.. پاشـى خـودێ بـەرێ هـەوە ژ وان وەرگێـڕا، دا ئـەو هـەوە ب ڤـێ چەنـدێ بجـەڕبينت، و ب ڕاسـتـى خـودێ هـوين عـەفووكرن و ئـەو ل هـەوە بـۆرى، و خـودێ خـودان قەنجييـە ل سـەر خـودان باوەران.

و ئەڤ ئایەتە ڕاستییەکا تەحل ل بەر چاڤێن صەحابییان ددانت، عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی دبێژت: ((حەتا ئەڤ ئایەتە نەهاتییە خوارێ من باوەر نەدکر کو هندەک د ناڤ مە دا هەنە حەز ژ دنیایێ دکەن))! بەلێ ئەو ڕەنگە مرۆڤە هەبوون، و هەبوونا وان -پشتی قەدەرا خودێ- بوو ئەگەرا وێ شکەستنا لەشکەری یا ب سەر صەحابییان دا هاتی، ئەو صەحابییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرکێشییا وان دکر، و هەبوونا وان ڕەنگە مرۆڤان ئەوا حەتا ڕۆژا ئوحودێ یا ڤەشارتی دڤیا بێتە ئاشکەراکرن؛ دا دەرمانەک بۆ بێتەدان.. و ئەڤەیە ڕێباز و مەنهەجێ قورئانێ، ڕاستی دڤێت بێتە دەسنیشانکرن، ئەگەر خۆ ئەو ل بەر هندەک موسلمانان یا نەخۆش ژی بت، ما نە تشتەکێ غەریبە ئەو مرۆڤێن ل گازییا خودێ دەرکەفتین و ل بن ئالایێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کۆمبووین، مال و عەیال و ژن ل پاش خۆ هێلاین و خۆ ل بەر ترس و برس و نەخۆشییێ گرتین، هێشتا د ناڤ وان دا هندەک کەس هەبن حەز ژ دنیایێ بکەن؟

تشتەکێ غەریبە.. و یا غەریبتر ئەو بوو قورئانێ ئەڤ ڕاستییا پەچنی و نخافتی ئاشکەرا هلێڤری و بەرچاڤ کر، بەلێ ژ لایەکێ دی ڤە ئەڤ ئاشکەراکرنە یا غەریب نینە؛ چونکی مەنهەجێ قورئانێ د پەروەردەکرنێ دا یێ ئاشکەرایە: خەلەتی و کێم و کاس دڤێت ب دورستی بێنە بەرچاڤکرن؛ دا ب تمامی بێنە چارەکرن.

موسلمان ل ڕۆژا ئوحودێ شکەستن؛ چونکی خەلەتی ژ وان ب خۆ بوو.. ئەو خەلەتی چ بوو؟ دڤێت بێتە دیارکرن دا دەرمانەک بۆ بێتە دیتن، ئەگەر نە.. پا چاوا ئەو خەلەتی دێ ئێتە دورستکرن؟

قورئانێ ئەڤ چەندە ل سەر وان تۆمارکر، و خەلەتییا وان ب زەلالی روهن و بەرچاڤ کر.

### بەردانا گری ژ لایێ ڕمبازان ڤە:

بەری نوکە مە دیار کربوو کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پێنجی ڕمبازێن زیرەک دانابوونە سەر گرێ (عەینەین) ئەوێ دکەفتە لایێ وان یێ چەپێ، و گۆتبوو وان: چ ل مەیدانا شەڕی چێ ببت، هوین جهێ خۆ بەرنەدەن. بەلێ وان ئەڤ فەرمانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دورستی ب جه نەئینا، دەمێ ئەو د ناڤبەرا خۆ دا ب خیلاف چووین پشتی وان دیتی لەشکەرێ کافران شکەست و ژ مەیدانا شەڕی ڕەڤین، و هندەک مال ل پشت خۆ هێلان، بارا پتر ژ وان گۆت: شەڕ نەما، و چو مەعنا بۆ مانا مە ل ڤی جهی نەما. و وان گۆتە ئەمیرێ خۆ عەبدللاهێ کوڕێ جوبەیری: ئەم دێ چین، دا ئەم ژی دەسکەفتییان کۆم بکەین! و هندی ئەمیرێ وان و چەند کەسەکێن کێم ژ وان گۆتێ: نەچن و جهێن خۆ بەرنەدەن، و بیرا وان ل فەرمانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیناڤە، بەلێ وان گوهداری نەکر، و جهێ خۆ ل سەر گری بەردان. و ئەڤە بوو یا ئایەتێ ئیشارەت داییێ دەمێ گۆتی: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ ﴾.

گاڤا خالدی دیتی وان جهێ خۆ بەردا، وی فەرمان ل هندەک سویاران کر کو ئەو ل دۆر گری بزڤڕن و ژ لایێ پشتێ ڤە بێنە موسلمانان، هەر وەسا وی کەسەک هنارتە نک ئەبوو سوفیانی دا بێژتێ: خۆ ڕاگرن، و بزڤڕنە مەیدانا شەڕی، ئەڤە ئەم چووین ل دۆر موسلمانان بزڤڕین.. و ئەو چێبوو یا خالدی ڤیای.

**دژواربوونا تەنگاڤییێ ل سەر موسلمانان:**

خالد و هەڤالێن خۆ ل دۆر گری زڤڕین، ئەو کەسێن کێم ژ ڕمبازان یێن کو ل جهێ خۆ ل سەر گری مایین نەشیان بەرگرییا هێرشکەران بکەن، لەو ئەو هەمی هاتنە کوشتن، و لەشکەرێ کافران ژ پشتێ ڤە هاتنە موسلمانان، و هەر ل وی دەمی ئەو کافرێن ژ مەیدانا شەڕی ڕەڤین ل دۆر خۆ زڤڕین و دەست ب شەڕێ موسلمانان کر، و ب ڤێ چەندێ خافلەتی ب موسلمانان کەفت، و ئەو کەفتنە دەراڤەکێ تەنگ، و سەر و بەرێ وان تێکچوو و ئەو ژێک ڤەقەتیان، و ئێدی نەما وان ئاگەهـ ژ ئێکدو بمینت، حەتا وە لێ هات ئەو ب خۆ ل بەرێک بوونە ڕەشەک، و هنگی بابێ حوذەیفەیێ کوڕێ یەمانی -کو موسلمان بوو- هەر ب دەستێ موسلمانان ب خەلەتی ڤە هاتە کوشتن!

و هژمارەکا مەزن یا صەحابییان ل وی دەمی شەهید بوون، و ئێک ژ وان حەمزەیێ کوڕێ عەبدلموطەلبی بوو.. حەمزەیی ل ڕۆژا بەدرێ طوعەیمەیێ کوڕێ عەدی کوشتبوو، و برازایێ طوعەیمەی جوبەیرێ کوڕێ موطعمی عەبدەکێ حەبەشی هەبوو دگۆتنێ: وەحشی، ڕمبازەکێ گەلەکێ سەگڤان بوو، بەری شەڕێ ئوحودێ بێتەکرن، جوبەیری گۆتێ: ئەگەر تو حەمزەی پێش مامێ من ڤە بکوژی ئەز دێ تە ئازاد کەم.. لەو گاڤا بوویە شەڕ ئەو د گەل لەشکەرێ قورەیشییان دەرکەفت، و ئارمانجا وی ب تنێ ئەو بوو ئەو حەمزەی بکوژت، گاڤا سەر و بەرێ موسلمانان تێکچووی پشتی خالد و هەڤالێن خۆ ل دۆر گری زڤڕین، وەحشی ب نک گری ڤە چوو و خۆ ل پشت کەڤرەکی ڤەشارت، و ژ دویر ڤە زێرەڤانی ل حەمزەی کر، و گاڤا وی دەلیڤەیا خۆ دیتی وی ڕمەک د حەمزەی وەرکر و کوشت، و گاڤا وی دیتی حەمزە کەفت ئەو ژ مەیدانا شەڕی ڕەڤی و ئێکسەر قەستا مەکەهێ کر.

هەر وەسا ل وی دەمی موصعەبێ کوڕێ عومەیری ژی شەهیدبوو، و موصعەبی ئالایێ موسلمانان د دەستی دا بوو، و ئەو ل بەر سنگێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- ئبن قەمیئەیی ئەو کوشت، و ژ بەر کو موصعەب ب شکلێ خۆ ڤە وەکی پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- ئبن قەمیئەیی هزر کر ئەو پێغەمبەرە، لەو وی گازی کر: من موحەممەد کوشت! و ئەڤ گۆتنە هەر د گاڤێ دا د ناڤ موسلمان و کافران دا بەلاڤبوو، تشتێ بوویە ئەگەرا بلندبوونا مەعنەویاتێن کافران، و شکستنا مەعنەویاتێن موسلمانان.. حەتا ل وی دەمی هژمارەکا موسلمانان ژ مەیدانا شەڕی ڕەڤین و گۆتن: مادەم پێغەمبەر هاتە کوشتن مەسەلە ب دووماهی هات.

و هندەک موسلمانێن دی بێ هیڤی بوون و دەستێن وان ژ شەڕی سست بوون، لەو وان خۆ دا لایەکی و ڕوینشتن، ئەنەسێ کوڕێ نەضری د بەر هندەک ژ وان ڕا بۆری و گۆت: هوین بۆچی ڕوینشتینە ڤێری؟ وان گۆت: پێغەمبەرێ خودێ هاتە کوشتن! وی گۆت: ئەگەر موحەممەد هاتبتە کوشتن، خودایێ موحەممەدی نەهاتییە کوشتن، ڕابن ل سەر وێ ڕێکێ بمرن یا ئەو ل سەر مری، پاشی وی دەستێن خۆ بلند کرن و گۆت: یا ڕەببی ئەزێ بەریمە ژ وێ یا ئەڤان کری -و ئیشارەت ب نک کافران ڤە کر- و تو ل من نەگرە ژ بەر وێ یا ئەڤان گۆتی -و ئیشارەت ب نک وان موسلمانان ڤە کر ئەوێن ڕوینشتین-، پاشی گۆتە سەعدێ کوڕێ موعاذی: ئەی سەعد بێنا بەحەشتێ ژ ئوحودێ ڤە یا دئێتە من.. و چوو خۆ هاڤێتە ناڤ شەڕی و هێرش دا کافران، و پشتی شەڕ ب دووماهی هاتی لەشێ وی هاتە دیتن، حەشتێ و تشتەک برین لێ بوون، و بەس خویشکا وی ئەو ب سەرتبلێن وی نیاسی.

د ئایەتەکێ دا خودایێ مەزن بەحسێ وان صەحابییان دکەت ئەوێن ژ مەیدانا شەڕی ڕەڤین یان ژ کرنا شەڕی سست بووین، و ئاشکەرا دکەت کو

ئەو ل وان بۆری، دەمێ دبێژت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾.

ل وی دەمی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هژمارەکا کێم یا صەحابییان (نەهـ کەس بوون و حەفت ژ وان ئەنصاری بوون) ل مەیدانا شەڕی مانە ل ژێر حیصارا لەشکەرێ کافران، و ئەو تووشی تەنگاڤییەکا مەزن بوون، و وان کار بۆ هندێ کر حیصارا کافران بشکێنن و خۆ بگەهیننە موسلمانێن دی؛ دا پشتی هنگی ل چارەیەکێ بگەڕێن بۆ ڤێ تەنگاڤییا ئەو کەفتینێ، و هەر ل وی دەمی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بریندار بوو، ددانەکێ وی هاتە شکاندن و دێمێ وی شەق بوو، و خوین ژ پیێ وی هات.. و ل نک صەحابییان ئەو بوو کو چو ڕۆژ وەکی ڕۆژا ئوحودێ نەخۆش ب سەر پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- نەهاتبوون، لەو عائیشایێ جارەکێ گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ڕۆژەک وەکی ڕۆژا ئوحودێ نەخۆش ب سەر تە دا هاتییە؟ وی گۆت: بەلێ.. و بۆ وێ بەحسێ وێ ڕۆژێ کر یا ئەو چوویە طائیفێ، و خەلکێ وێ دین و بێ عەقلێن خۆ ڤێڕا بەرداین، و بەر تێوەرکرین.

### ب- دووماهیا هاتنا شەڕێ ئوحودێ:

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و ئەو کۆما کێم یا صەحابییان شیاین ڕێکەکێ بۆ خۆ د ناڤ ڕیزێن کافران ڕا ڤەکەن، و خۆ بگەهیننە هەڤالێن خۆ یێن دی، و پشتی بۆ صەحابییێن دی دیاربووی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نەهاتییە کوشتن، و هێشتا یێ شەڕی دکەت، ئەو هەمی کۆمبوونە سەرێک و بەردەوامی دا شەڕێ خۆ دژی کافران، و ل دویڤ فەرمانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وان هێدی هێدی خۆ ب نک چیایێ ئوحودێ ڤە کێشا، و ب سەر کەفتن، خودێ دبێژت: ﴿ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ

أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمَّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْۗ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾.

دەمێ موسلمان ب سەر چیایی کەفتین، ئەو ڕوینشتن و برینێن خۆ دەرمانکرن، سەهلێ کوڕێ سەعدی دبێژت: ل ڕۆژا ئوحودێ دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بریندار بووی، کچا وی فاطمایێ برینێن وی ژ خوینێ شویشتن، و پاقژکرن، و عەلی ئاڤ لێ دکر، و هندی فاطمایێ ئاڤ لێ دکر پتر خوین ژێ دهات، ئینا وێ پرتەکا حێسیلکێ سۆت و خولییا وێ دانا سەر برینێن بابێ خۆ، حەتا خوین هشک بووی، ل وی دەمی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: غەزەبا خودێ ل سەر وی مللەتی زێدەبوو یێ خوین د ڕوییێ پێغەمبەرێ وی ئینای.. پاشی بێنەکێ خۆ گرت و گۆت: یا ڕەببی تو ل مللەتێ من نەگرە، ئەو دنەزانن.

گاڤا بوویە دەمێ نڤێژا نیڤرۆ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ بەر برینێن خۆ نەشیا نڤێژێ ژ پییان ڤە بکەت، لەو ئەو ڕوینشتە خوارێ و نڤێژ ل بەرا صەحابییان کر، و صەحابییان ژی ل دویڤ وی ڕوینشتی کر.

## ئەنجامێ لەشکەرێ یێ شەڕێ:

ئەگەر مرۆڤ ئەنجامێ هەر شەڕەکی ب وێ چەندێ هلسەنگینت کانێ کیژ لایی شیایە ئارمانجا خۆ ژ شەڕی پێک بینت، مرۆڤ نەشێت بێژت: د شەڕێ ئوحودێ دا کافرێن مەکەهێ ب دورستی ب سەرکەفتینە؛ چونکی ئەو ئارمانجا کافران ڤیای ب ڤی شەڕی بگەهنێ، ئەو نەشیان ب تمامی بگەهنێ..

گاڤا شەڕێ ئوحودێ ڕاوەستیای و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ب سەر چیایی کەفتین، مەزنێ قورەیشییان ئەبوو سوفیان هاتە ڕاستا وان و گازی کر: ئەرێ موحەممەد د ناڤ هەوە دایە؟ پێغەمبەری

-سلاڤ لێ بن- گۆت: بەرسڤا وی نەدەن. پاشی ئەبوو سوفیانی گۆت: ئەرێ کورێ ئەبوو قوحافەیی د ناڤ هەوە دایە، و مەخسەدا وی ئەبوو بەکر بوو، جارەکا دی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: بەرسڤا وی نەدەن. جارا سێیێ وی گۆت: ئەرێ کورێ خەططابی د ناڤ هەوە دایە؟ کەسێ بەرسڤا وی نەدا. هنگی وی گۆت: ئەو تێرا مە هەنە.. یەعنی: وی هزر کر ئەڤ هەر سێیە یێن هاتینە کوشتن، هنگی عومەر نەشیا خۆ بگرت، لەو گازی کر: ئەی دوژمنێ خودێ تو درەوان دکەی، خودێ ئەو ییێن هێلاین یێن تە شەرمزار بکەن.

ژ ڤێ گۆتنا ئەبوو سوفیانی دئێتە زانین کو ئارمانجا سەرەکی یا کافران بەری هەر تشتەکی کوشتنا پێغەمبەر بوو -سلاڤ لێ بن-، پشتێ وێ ئارمانجا وان ئەو بوو ئەو ب سەر بازێرێ مەدینێ دا بگرن، زەلامان بکوژن، و ژنان ئێخسیر بکەن، و دووماهییەکێ بۆ دەولەتا ئیسلامێ بدانن، و موسلمانان ئەڤ ئارمانجا وان باش دزانی، لەو دەمێ کافران مەیدانا شەڕی هێلای، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی د دویڤ وان هنارت، و گۆتێ: هەرە بەرێ خۆ بدێ، ئەگەر ئەو ل حێشتران دسویار بن، مەعنا ئەو دێ چنە مەکەهێ، و ئەگەر ئەو ل هەسپان دسویار بن، مەعنا ئەو دێ چنە مەدینێ، و ئەز ب وی کەمە یێ نەفسا من د دەستان دا، ئەگەر ئەو قەستا مەدینێ بکەن، ئەز دێ ب دویڤ وان دا دەرکەڤم، و شەڕێ وان کەم.

مەعنا: ئارمانجا دی یا کافران ئەو بوو ئەو مەدینێ بستینن، و ئەڤ ئارمانجە ژی بۆ وان ب شەڕێ ئوحودێ ڤە نەهات؛ چونکی ئەو ل حێشتران سویاربوون و زڤڕینە مەکەهێ.

ب تنێ ئارمانجەکا وان ب جهـ هات، ئەو ژی ئەو بوو وان هژمارەکا صەحابییان د ڤی شەڕی دا کوشتن، و پیچەکێ دلێن خۆ ب وێ چەندێ هوین کرن، ب تایبەتی پشتی وان یاری ب لەشێن کوشتییان کرین.

بەلێ دڤێت ژ بیر نەکەین کو هژمارەکا نە یا کێم ژ قورەیشییان ب خۆ ژی د ڤی شەڕی دا هاتنە کوشتن، و هندەک ژ وان ژ مەزن و گرگرێن وان بوون، وەکی ئوبەیێ کوڕێ خەلەفی بۆ نموونە.. و ئاشکەرایە کو ل ڕۆژا ئوحودێ (٧٠) کەس ژ صەحابییان شەهید بوون، کو چار ژێ ژ موهاجران بوون، و بەرانبەر وان (٢٢) کەس ژ کافران ژی هاتنە کوشتن.

ئبن عەبباس دبێژت: دەمێ ئەبوو سوفیان و کافر ژ ئوحودێ ڤەگەڕیاین و گەهشتینە ڕەوحائێ (کو ٧٣ کیلۆمتران یا دویرە ژ مەدینێ) ئەبوو سوفیانی گۆتە هەڤالێن خۆ: نە هەوە موحەممەد کوشت، و نە ژن ئێخسیرکرن، نە چو شۆل بوو هەوە کری!

ژ ڤێ گۆتنا ئەبوو سوفیانی دئێتە وەرگرتن کو کافران ب خۆ ژی هەست ب هندێ نەدکر کو ئەو د ڤی شەڕی دا ب سەرکەفت بن؛ چونکی وان باش دزانی کو وان چو ئارمانجێن خۆ ب جه نەئینانینە.

**شەهیدێن ئوحودێ:**

وەکی مە گۆتی: ل ڕۆژا ئوحودێ حەفتێ صەحابی هاتنە کوشتن، و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییان خۆ ژ مەیدانا شەڕی ڤەکێشای و ب سەر چیایی کەفتین، تەرمێن صەحابییان بۆ دەمەکی کەفتنە دەستێ کافران، هنگی ژنێن کافران، ب تایبەتی ئەوێن ل ڕۆژا بەدرێ مرۆڤێن وان ب دەستێن موسلمانان هاتینە کوشتن، دا کو دلێن خۆ هوین بکەن، هاتن و یاری ب کەلەخێن کوشتییان کرن، گوهـ و دفنێن وان ژێڤەکرن، و بۆ خۆ کرنە ڕستک و د ستویێ خۆ دانان، و هندەک ژ وان -وەکی هندێ- سنگ و زکێ هندەک کوشتیان کەلاشتن و مێلاکێن وان ئینانە دەر و دانە بەرلەڤان![1]

---

(١) ئبن ئیسحاق ڤی خەبەری ڤەدگوهێزت، و زانایێن حەدیسێ دبێژن: ئەو خەبەرەکێ (ضەعیفە).

و ئەڤە کارەکێ کرێت و ب شەرم بوو ل بەر کافران، وی دەمی، لەو پشتی شەڕی ئەبوو سوفیانی گۆتە موسلمانان: هندەک کار یێن چێبووین ب دلێ مە نەبوون بەلێ ژنکان ئەو یێن کرین!

دەمێ کافران خۆ ژ مەیدانا شەڕی ڤەکێشای و زڤڕینە مەکەهێ، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن خۆ هاتنە جهێ شەڕی؛ دا جەنازەیێن شەهیدان کۆم بکەن و ڤەشێرن، و گاڤا وان ئەو دیتی یا کافران د گەل کەلەخان کری، ئەو گەلەک عێجز بوون، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: بۆ من ل حەمزەی بگەریێن، پشتی جەنازێ حەمزەی ژی هاتییە دیتن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە هنداف، دیمەنەکێ زێدە دلئێش بوو بۆ وی، چاڤێن وی تژی رۆندک بوون، و ب دلەکێ پڕ کوڤان ڤە گۆت: ئەگەر ژ بەر هندێ نەبا کو صەفییا دێ عێجز بت، و خەلک دێ چاڤ ل من کەت من ئەو نەدڤەشارت.. پاشی وی سویند خوار چی گاڤا ئەو جارەکێ شیا قورەیشییان دێ کەلەخێن سیه ژ وان وەکی حەمزەی لێ کەت، ئینا ئایەت هاتە خواری: ﴿ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرِينَ ﴿١٢٦﴾ ﴾ (النحل: ١٢٦) یەعنی: ئەگەر هەوە ڤیا تۆلێ ژ وی بستینن یێ تەعدایی ل هەوە کری، هوین ژ وێ زێدەتر نەکەن یا وی د گەل هەوە کری، و ئەگەر هوین صەبرێ بکێشن ئەو بۆ سەرکەفتنا د دنیایێ دا و بۆ خێرا مەزنا ل ئاخرەتێ بۆ هەوە چێترە[١].

ل وی دەمێ پێغەمبەر و هندەک صەحابی ل هنداف جەنازێ حەمزەی، زوبەیر دبێژت: مە دیت صەفییا -دەیکا من- ژ دویر ڤە یا ب نک مەڤە دئێت، پێغەمبەری گۆتە من: هەرە بەراهییێ نەهێلە بێت. هەر وەکی

---

(١) ئەڤ خەبەرە ژی یێ مورسەلە، و ئەڤ ئایەتە -وەکی ئبن کەثیر دبێژت- ل مەکەهێ هاتبوو خوارێ، بەری مشەختبوونێ!

پێغەمبەری نەدڤیا ئەو بێت و برایێ خۆ ب ڤی رەنگی ببینت. گۆت: ئەز چوومە بەراهییێ دا نەهێلم بێت، ئینا وێ پالەک ب من رادا ئەز پاشدا برم، من گۆتێ: پێغەمبەری یێ گۆتییە من نەهێلە بێت. ئینا ئەو د جهـ دا راوەستیا و گۆت: من زانییە وان چ ل برایێ من کرییە، ئەوا ب سەرێ برایێ من هاتی تشتەکێ گەلەکێ کێمە د رێکا خودێ دا بێتە سەرێ مرۆڤی. دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گوهـ ل دەنگێ وێ بووی، گۆت: رێکێ بدەنێ!

پاشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان دا جەنازەیێن شەهیدان بێنە کۆمکرن و هەر ل وی جهی بێنە ڤەشارتن یێ ئەو لێ شەهیدبووین، و گاڤا وی زانی هندەکان جەنازەیێن خۆ یێن رکرین دا ببەنە مەدینێ ڤەشێرن، وی فەرمان دا ئەو بێنە زڤراندن، و ل ئوحودێ بێنە ڤەشارتن، و وی هەر دو دو یان دو سێ د ئێک قەبری دا ڤەشارتن. و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعا بۆ وان کرن و گۆت ل رۆژا قیامەتێ ئەز دێ بمە شاهد بۆ ڤان.. و ژ بەر کو گەلەک جاران پشتی هنگی ژی وی سەرەدانا زیارەتێن وان دکر، سەرەدانا زیارەتێن ڤان شەهیدان بۆ وی کەسێ دچتە مەدینێ ژ سوننەتێ دئێتە هژمارتن.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شەهیدێن ئوحودێ ڤەشارتن بێی کو وان بشۆت یان نڤێژێ ل سەر بکەت. و زانایێ ناڤدار ئبن حەجەر دبێژت: هندەک دبێژن: پشتی ڤەشارتنا ڤان شەهیدان ب رۆژەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نڤێژ ل سەر وان کر.

### غەزایا (حمراء الأسد):

شەرێ ئوحودێ -وەکی بۆری د گەل مە- ل سپێدەیا ئەینییێ (١٥) هەیڤا شەووالێ چێبوو، و پشتی شەڕ ب دووماهی هاتی وێ رۆژێ و شەڤا دی ژی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل صەحابییێن خۆ ما ل ئوحودێ، و

ل ڕۆژا ئێکشەنبیٚ (١٦) هەیڤیٚ ئەو زڤڕینە مەدینیٚ، و خەبەرەک گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لیٚ بن- کو قورەیشی پەشێمان بووینە کو وان قەستا مەکەهیٚ کری بێی کو سەرکەفتنەکا بەرچاڤ ب دەست خۆ ئینا بت، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لیٚ بن- د ناڤ صەحابییان دا ڕاگەهاند کو ئەو دیٚ ب دویڤ قورەیشییان دا چت، و ئەگەر مەسەلیٚ خواست ئەو دیٚ شەڕیٚ وان کەت، و وی فەرمان دا کو ژ بلی وان یێن دوهی چووینە ئوحودیٚ بۆ کرنا شەڕی بلا کەس د گەل وان دەرنەکەڤت، صەحابی د گەل وان برینێن کەفتینە لەشی د بەرسڤا وی دەرکەفتن، و ب لاییٚ باشووریٚ مەدینیٚ ڤە چوون، هژماران وان نێزیکی (٥٤٠) کەسان بوون، و هژمارا کافران (٢٩٧٠) کەس بوون.

د ڤیٚ غەزاییٚ ژی دا پێغەمبەری -سلاڤ لیٚ بن- عەبدللاهیٚ کوڕیٚ ئوم مەکتوومی ل جهیٚ خۆ هێلا ل مەدینی، و ئەو د گەل موسلمانان نێزیکی (٢٠) کیلۆمتران چوون حەتا گەهشتینە وی جهیٚ دبێژنیٚ: (حمراء الأسد)، و ل وێریٚ وان خەبەرەک بۆ ئەبوو سوفیانی هنارت کو ئەم ییٚ ل فلان جهی و ئەگەر هوین ڕاست دبێژن وەرن داخ ۆ ژێک صافی بکەین، و هنگی ئەبوو سوفیانی -بۆ ترساندنا موسلمانان- خەبەرەک هنارت کو ئەم د گەل پشتەڤانێن خۆ دیٚ ئێین و هنگی ئەم دیٚ زڤڕین حەتا کتەکیٚ ژ موسلمانان نەهێلین، گاڤا ئەڤ گەفە گەهشتییە موسلمانان ئەو قەت نەترسیان، و سست نەبوون، بەلکی وان گۆت: خودیٚ تێرا مەهەیە، و ئەو باشترین وەکیلە، و هنگی ئەڤ ئایەتە هاتنە خواریٚ: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ ﴾ (آل عمران: ١٧٢-١٧٣).

سێ ڕۆژان موسلمان مانە ل وی جهی ل هیڤیا کافران، بەلێ وان د خۆ ڕا نەدیت کو بزڤڕن و شەڕێ موسلمانان بکەن، بەلکی وان لەز ل چوونا خۆ کر و زڤڕینە مەکەهێ.. پشتی سێ ڕۆژان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل صەحابییێن خۆ زڤڕی مەدینێ.

## چەند دەرسەك ژ ڕۆژا ئوحودێ:

ل ڕۆژا ئوحودێ موسلمانان سەرکەفتنەکا مەزن ب دەست خۆ ڤە ئینا.. و بەلکی گەلەک کەس ژ ڤێ گۆتنا مە عەجێبگرتی ببن و بێژن: ئەڤە چ گۆتنە؟! یا ئەم دزانین د ڤی شەڕی دا موسلمان شکەست بوون، ڤێجا چاوا هوین دبێژن: وان سەرکەفتنەکا مەزن ب دەست خۆ ڤە ئینابوو؟

د بەرسڤێ دا دێ بێژین: ئایەتێن سوورەتا (آل عمران) ئەوێن بەحسێ شەڕێ ئوحودێ دکەن، هەر وەسا ریوایەتێن دیرۆکێ ژی، بۆ مە ڤەدگێڕن کو ل دەسپێکا ڕۆژا ئوحودێ لەشکەرێ ئیسلامێ ب سەرکەفت، پاشی شکەست، بەلێ سەرهاتی ل ڤێرێ ڕانەوەستا؛ چونکی پشتی ڤێ شکەستنا لەشکەری یا تەحل، سەرکەفتنەکا مەزنتر ب دەست موسلمانان ڤە هات، و بەلکی هوین بێژن: چاوا؟

چونکی گیانێ موسلمانان هاتە هلسەنگاندن، و ڕێزا وان ژی هاتە ڤەوژارتن، باوەرییا ڕاست و دورست ئاشکەرابوو، هەر وەسا باوەرییا ب دەڤی و سەرڤە سەرڤە ژی ئاشکەرابوو، ل فرەهییێ هەر کەسەک دشێت ب ناڤێ ئیسلام و باوەرییێ باخڤت، بەلێ یێ زیرەک ئەوە یێ بشێت ل تەنگاڤییێ خۆ ڕاگرت و لێڤە نەبت.. ل ڕۆژا ئوحودێ بهایێ گوهدارییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ خودان باوەران دیاربوو، و وان باش زانی کو هندی نەگوهدارییا فەرمانا پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن- ئەگەرا سەرەکییە بۆ هلوەشیانا هەر سەرکەفتنەکا هەبت، و پتر بۆ وان ئاشکەرا بوو کو مرۆڤێ

موسلمان دڤێت د هەر پێگاڤەکا خۆ دا یا ئەو د ژینا خۆ دا دهاڤێت پێتڤییە ل دویڤ ڕاستەڕێیا خودێ بچت، و ب ڕاستی ئەڤ چەندە مەزنترین سەرکەفتن بوو دلێن موسلمانان ب دەست خۆ ڤە ئینای ل ڕۆژا ئوحودێ.

سەرکەفتنا د مەیدانا شەڕی دا -ل نک موسلمانی- چو بهایێ خۆ نینە ئەگەر ئەو یا ئاڤاکری نەبت ل سەر بناخەیێ مەنهەجێ خودێ، ئەگەر لەشکەر پێ ل دلچوونێن خۆ یێن ئەرزان نەدانت یێ سەرکەفتی نابت ئەگەر خۆ ئەو بشێتە نەیارێ خۆ ژی، و چەپەرێ وی ب سەرێک دا بینتە خوارێ ژی، لەشکەرێ ئیسلامێ د شەڕێ ئوحودێ دا ب سەرکەفت؛ چونکی ئەو ل دووماهییێ شیا خۆ ژ دلچوونێن نزم و بێبها و پەرتالێ بێخێرێ دنیایێ ڕزگار بکەت، هەر چەندە ژ لایێ لەشکەری ڤە برینەکا نە یا بچویک د لەشێ وی دا هەودابوو ژی.

هەر کەسێ ب هویربینی بەرێ خۆ بدەتە سوورەتا (آل عمران) دێ بینت خودایێ مەزن هژمارەکا دەرسێن گرنگ ژ ڤێ سەرهاتییێ وەردگرت و ددانتە بەرچاڤێن موسلمانان دا ئەو مفایی بۆ خۆ ژێ وەرگرن. خودایێ مەزن دڤیا جڤاتا موسلمانان ئەوا ژ نوی هاتییە نژاندن ب سەربۆر و سەرهاتی پەروەردە بکەت، پشتی موسلمان د شەڕێ بەدرێ دا ب سەرکەفتین، گەلەک کەس د ناڤ موسلمانان دا هەبوون هزر دکر هەر جارەکا شەڕەکێ دی د ناڤبەرا وان و کافران دا چێ ببت، ئەو دێ ب سەرکەڤن، ئەو د چاوا بن د چاوا نەبن!

بۆچی؟

چونکی ئەو موسلمانن و پێغەمبەر سەرۆکێ وانە، و یێ د ناڤ وان دا.

بەلێ ل ڕۆژا ئوحودێ خودایێ مەزن بۆ وان بەرچاڤ کر کو ئەڤ هزرە یا د جهێ خۆ دا نینە، سەرکەفتن نە ب تنێ ب لەشکەری و سەرۆکی و چەکی ڤە یا گرێدایە، نە.. تشتەکێ دی هەیە گەلەک جاران مرۆڤ ژ بیرا خۆ

دبەت، ئەو ژی ئەوە یا د ڤێ ئایەتێ دا هاتی: ﴿ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ ۗ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ ﴾ (آل عمران: ١٢٦) د ڤێ ئایەتێ و یێن بەری وێ دا خودایێ مەزن دڤێت خودان باوەران وە تێ بگەهینت کو سەرکەفتنا وان ل ڕۆژا بەدرێ نە ژ بەر زیرەکییا وان بوو، و شکەستنا وان ل ڕۆژا ئوحودێ نە ژ بەر نەزیرەکییا وان بوو، نە.. بەلکی ئەو ژ بەر هندێ بوو چونکی وان ل بەدرێ تەقوایا خودێ کر و صەبر ل سەر فەرمانا خودێ و پێغەمبەرێ وی کر، ڤێجا خودێ هاریکارییا وان کر و ئەو ب سەرئێخستن، و ل ڕۆژا ئوحودێ هندەک ژ وان صەبر ل سەر فەرمانا خودێ و پێغەمبەری نەکر، دەمێ وان دلێ خۆ برییە مالێ دنیایێ، و فەرمانا سەرلەشکەرێ خۆ شکاندی، ئینا خودێ ئەو سەرکەفتنا وان ل دەسپێکێ دیتی دەرنشیف کر، و شکەستن کرە بارا وان، و برینەکا مەزن ئێخستە لەشێ وان.. مەعنا: سەرکەفتن و شکەستن هەردو ژ خودێنە، هەر چەندە ئەو ب کریارێن مرۆڤی ڤە دگرێداینە ژی.

پشتی بنەجهکرنا ڤی بناخەیێ عەقائیدی، سوورەتا (آل عمران) هندەک حیکمەتێن دی یێن شکەستنا ڕۆژا ئوحودێ بۆ مە دیار دکەت، دەمێ دبێژت: ﴿ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَمْحَقَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ ﴾ (آل عمران: ١٤٠-١٤٢) خودێ دشیا وێ سەرکەفتنێ ب سانahی بپارێزت یا وی ل دەسپێکا ڕۆژا ئوحودێ دایە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی، بێی ئەو زەحمەتەکا مەزن ببینن، بەلێ مەسەلە سەرکەفتنا لەشکەری نەبوو، خودێ دڤیا جیلەکێ وەسا

پەروەردە بکەت یێ خۆڕاگر بت؛ دا بشێت پشتی هنگی ڕۆناهییا دینێ وی ل عەردی بەلاڤ بکەت.

جیهادا د ڕێکا خودێ دا بێنفرەهی پێ دڤێت، و بێنفرەهییا ژ هەمییێ مەزنتر ئەوە مرۆڤ صەبرێ ل سەر فەرمانا خودێ و پێغەمبەری بکەت، حەتا ئەو بشێت دینێ خۆ ژ هەر وەربادانەکێ بپارێزت دڤێت ئەو یێ بێنفرەهـ بت، ڕێکا سەرکەفتنا د دنیایێ دا، و چوونا بەحەشتێ ل ئاخرەتێ ب گول و نێرگزان یا ڕەشاندی نینە، نە.. ئەو ڕێکەکا تژی خوهـ و خوین و ڕۆندکە. خودایێ مەزن دبێژت: ئەوا ل ڕۆژا ئوحودێ هاتییە سەرێ هەوە بۆ هندێ بوویە:

- دا خودان باوەر ژ منافق و دوڕوییان جودا بین، چونکی هەر ئاتافەکا ب سەر موسلمانان دا بێت پەردە ژ سەر ڕوییێ درەوینێ هندەک منافقان دئێتە ڕاکرن ﴿ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾.

- و ژ بلی ڤێ ڤاڤارتنا ژ سەر ڤە ئەوا د ناڤبەرا خودان باوەر و منافقان دا پەیدا دبت، (تەمحیص) ژی دکەفتە ڕێزا خودان باوەران ﴿ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ و تەمحیص کارەکە د ناڤخۆییا مرۆڤی دا پەیدا دبت، تەمحیص کەشفکرنا دلانە، گەلەک جاران مرۆڤ ڕاستییا دلێ خۆ ژ بیر دکەت و ب دورستی ب سەر هل نابت، کەنگی ئەو ب دورستی دێ خۆ نیاست؟ دەمێ ئەو دکەفتە دەراڤەکێ تەنگ.

- و ژ بلی ڤێ ژی خودێ دبێژت: ﴿ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ یەعنی: ئەوا ل ڕۆژا ئوحودێ چێبووی بۆ هندێ بو ودا کافر بێنە شکاندن، و بەلکی ئەڤ (تەعبیرە) بۆ هندەک کەسن یا غەریب بت: موسلمان ل ئوحودێ شکەستن دا کافر بێنە ژ بنبرن، ئەڤە چییە؟

دڤێت ئەم باش بزانین کو هەر جارەکا حەقییێ خۆ ل سەر پیێن خۆ گرت و شیا بەرگرییا نەحەقییێ بکەت، ئەڤە ب خۆ شکەستنەکا ئاشکەرایە بۆ نەحەقییێ، بێی ئەم بەرێ خۆ بدەینێ کانێ کی ژ لایێ لەشکەرێ ڤە د وێ هەڤرکییێ دا ب سەرکەفت، ب تنێ ڕاوەستانا موسلمانان بەرانبەر کافران ل ئوحودێ سەرکەفتن بوو بۆ باوەرییێ؛ چونکی هەبوونا هندەک کەسان -بلا خودان هێزەکا مەزن نەبن ژی- بەرانبەر نەحەقان، هندێ دگەهینت کو ئەڤ نەحەقە بەر ب هلوەشیانێ ڤە دچن. پشتی هنگی ژ بیر نەکەن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب وی لەشکەری ڤە یێ ل ئوحودێ ئامادە بووی، قەستا دەڤەرا (حمراء الأسد)ێ کر و سێ ڕۆژان ما ل هیڤییا لەشکەرێ قورەیشییان کو ئەو بزڤڕنە شەڕی، بەلێ ئەو نەزڤڕین و ب لەز و بەز چوونە مەکەهێ، ئەڤە چ مەعنایێ دگەهینت؟

- هەر وەسا دەمێ خودایێ مەزن بەحسێ حیکمەتێن ڕۆژا ئوحودێ دکەت، دبێژت: ﴿ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ﴾ یەعنی: ئەو بۆ هندێ بوو دا خودێ هندەک کەسان ژ ناڤ هەوە بۆ خۆ هلبژێرت، و پێکا شەهیدبوونێ بدەتێ، و ئاشکەرایە کو شەهیدبوون -وەکی پێغەمبەراتییێ- نە ب زیرەکییا مرۆڤی ب دەست مرۆڤی ڤە دئێت، بەلکی ئەو هلبژارتنەکە ژ لایێ خودێ ڤە بۆ وی کەسی یێ وی دڤێت.

## ل مەدینێ پشتی شەڕێ ئوحودێ:

پشتی لەشکەرێ ئیسلامێ یێ تژی برین زڤڕییە مەدینێ، جوهییان د گەل برایێن خۆ ژ منافقان دەست ب بەلاڤکرنا گۆت گۆتکان کر، مەخسەدا وان ئەو بوو دودلییێ بۆ خودان باوەران چێ بکەن و وان وەسا تێ بگەهینن کو موسلمان ب کێر نائێن، و ئەوێ وان ب ڕێڤە ژی دبەت (کو پێغەمبەرە سلاڤ لێ بن) ب کێر نائێت خەلکی ب ڕێڤە ببەت. جار ژی وان ب یاری

ڤە دگۆتن: ئەگەر مە زانیبا شەڕ دێ ئێتەکرن ئەم ل نیڤا ڕێ نەدزڤڕین؛ ئەم دا مینین وێ شەڕی کەین دا هوین نەشکەستبان، جار ژی وان دگۆت: ئەگەر هەوە ب سەرێ ڕۆژێ گوهێ خۆ دابا مە، و هوین ژی د گەل مە زڤڕیبانە مالا خۆ ئەو ب سەرێ هەوە نەدهات یا ب سەرێ هەوە هاتی.. و د سوورەتا (آل عمران) دا خودایێ مەزن وان گۆتنان ڤەدگێڕت یێن منافق و جوهییان د ناڤ موسلمانان دا بەلاڤ دکرن، و بەرسڤا وان ددەت.

# سەرهاتییێن سالا چارێ مشەختی

ئەو دربێ لەشکەری یێ ل رۆژا ئوحودێ ب موسلمانان کەفتی بۆ ئەگەرا هندێ کو دوژمنێن ئیسلامێ ل ناڤخۆیا مەدینێ و ل دەور و بەران ژی سەرێ خۆ هلدەن، و دلێ خۆ ببەنە ژ بنبرنا دەولەتا ئیسلامێ یا نوی پەیدابووی، چونکی هەمی هزرا وان ئەو بوو کو ئەڤ برینا کەفتییە لەشێ موسلمانان دێ بتە ئەگەرا نەمانا وان، ژ بەر هندێ ل وان پێنج شەش هەیڤێن پشتی شەرێ ئوحودێ هژمارەکا بزاڤ و هاتن و چوونان ژ لایێ منافق و جوهی و کافران پەیدابوون، بۆ هندێ دا ئەو هەبوونا موسلمانان ژ مەیدانێ راکەن.. بەلێ ئەڤ هەمی کار و بزاڤێن وان ژ لایێ موسلمانان ڤە هاتنە ژ ناڤبرن، وەکی دێ ژ هندەک سەرهاتییێن سالا چارێ مشەختی بۆ مە ئاشکەرا بت.

### سەرییا ئەبوو سەلەمەیێ بۆ دەڤەرا ئەسەدییان:

ئویجاخا بەنوو سەدێ کورێ خوزەیمەی، ئێک ژ وان ئویجاخێن عەرەب بوو، یێن ل باکوورێ رۆژهەلاتا مەدینێ دژیان، و ل وی دەمێ ئەم بەحس ژێ دکەین کو سالا چارێ مشەختی بوو، ئەڤ ئویجاخا عەرەبان هێشتا نەهاتبوو د ئیسلامێ دا، پشتی شەرێ ئوحودێ ئەوێ ل هەیڤا دەهێ ژ سالا سێیێ مشەختی رویدای، و ژ بەر وێ شکەستنا لەشکەری یا ب سەر موسلمانان دا هاتی، ئەسەدییان هزر کر موسلمان یێن لاوازبووین لەو د شیانا وان دا هەیە ئەو هێرشەکێ بدەنە سەر مەدینێ و موسلمانان ئێکجار نەهێلن، و بۆ ب جهئینانا ڤێ ئارمانجێ وان دان و ستاندن کرن دا کو هێزێن خۆ کۆم بکەنە سەرێک، و ئەڤ سوحبەتا وان گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل مەدینێ، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بریار دا کو ب لەز سەرییەکا

لەشکەری ئامادە بکەت ژ سەد و پێنجی زەلامان، ب سەرۆکاتییا صەحابییێ خۆ ئەبوو سەلەمەیێ مەخزوومی، دا ئەو بچن ب سەر دەڤەرا ئەسەدییان دا بگرن بەری کو ئەو هێزێن خۆ بۆ کرنا شەڕێ موسلمان لێکدەن. و ئەو بوو ل هەیڤا ئێکێ ژ سالا چارێ ئەو سەرییە ژ مەدینێ دەرکەفت و بەر ب دەڤەرا ئەسەدییان ڤە چوو.

ئەبوو سەلەمە، ژ وان کەسان بوو یێن مشەختبووینە حەبەشە، پاشی مشەختبووینە مەدینێ ژی، و ئەو ل ڕۆژا ئوحودێ بریندار بووبوو، و هەیڤەکێ پشتی هنگی وی برینا خۆ دەرمان دکر حەتا ڕابوویە ڤە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو کرە ئەمیرێ ڤێ سەرییێ، و ئەو د گەل هەڤالێن خۆ چوو حەتا گەهشتییە وی جهێ دبێژنێ: (قەطەن) کو ل نیڤا دەڤەرا ئەسەدییان بوو، و ژ بەر کو هاتنا وان یا ب خافلەتی ڤە بوو، ئەو بۆ ئەسەدییان بوو جهێ حێبەتیبوونێ، ب تایبەتی چونکی وان هزر دکر موسلمانان ئێدی چو هێز نەمایە، گاڤا وان دیتی لەشکەرێ موسلمانان ب سەر وان دا گرتی، ئەو تەڕا بەرا بوون، و هەر زوی ڕەڤین، و وان د خۆ ڕا نەدیت بەرانبەر موسلمانان ڕاوەستن.

پشتی پتر ژ دەهـ ڕۆژان ژ دەرکەفتنا خۆ، ئەبوو سەلەمە د گەل هەڤالێن خۆ زڤڕی مەدینێ پشتی هژمارەکا مەزن یا دەسکەفتییان د گەل هندەک ئێخسیران ب دەسکەفتین، و پشتی زڤڕینێ برینا ئەبوو سەلەمیی جارەکا دی لێ هەودا، و پشتی چار پێنج هەیڤەکان ئەو ب وێ برینا خۆ مر.

**سەرییا شەهیدان:**

ئەڤ سەرییە -وەکی ئیمامێ بوخاری ڤەدگوهێزت- ژ دەهـ صەحابییان پێکهاتبوو، و مەزنێ وان عاصمێ کوڕێ ثابتی بوو، و ئبن ئیسحاق د سیرەتێ دا دبێژت: ئەو ژ شەش کەسان پێک دهاتن و مەزنێ وان مەرثەدێ

غەنەوی بوو، و د ئەگەرا هنارتنا ڤێ سەرییێ ژی دا بوخاری و ئبن ئیسحاق ژێکجودا بووینە، بوخاری دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو هنارتبوون دا ئەو هندەک زانینان ل دۆر دوژمنی کۆم بکەن، و ئبن ئیسحاق دبێژت: ئویجاخا هوزەیلییان ڤیا تۆلا زەلامەکێ خۆ ژ موسلمانان بستینن، پشتی وان ئەو کوشتی، لەو فێلەک ب کارئینا، ئەو چوونە نک ئویجاخا (عەضەل و قارره) و گۆتنێ: ئەم دێ هندەک مالی دەینە هەوە، هوین هەڕنە مەدینێ و بێژنە موحەممەدی: ئەم یێن موسلمان بووین، ڤێجا هندەک صەحابییێن خۆ بهنێرە نک مە دا ئەو قورئانێ نیشا مە بدەن و مە فێری دینی بکەن. ئەو ب گۆتنا هوزەلییان رازی بوون و ئەو کر یا وان ژێ خواستی، و دەمێ ئەو هاتینە مەدینێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شەش صەحابییێن خۆ ژ وان یێن قورئانخوین و زانا ب دینی د گەل وان هنارتن، و دەمێ ئەو گەهشتینە سەر ئاڤەکێ ل وی جهێ دبێژنێ: (الرجیع) کو دکەفتە د ناڤبەرا مەکەهێ و عسەفانێ دا، وان خیانەتا خۆ ئاشکەراکر و ڤیا وان صەحابییان بگرن. هنگی وان صەحابییان خۆ ب دەست وان ڤە بەرنەدا، و ب سەر گرەکی کەفتن ل نێزیکی وێرێ بوو و کارێ شەڕی کرن.

کافران گۆتێ: ئەگەر هوین خۆ ب دەست مە ڤە بەردەن ئەم دێ بەختێ خۆ دەینە هەوە، سێ صەحابییان ژ وان، یان حەفتان -ل دویڤ گۆتنەکێ- قەبویل نەکر و خۆ ب دەست وان ڤە بەرنەدا، و شەڕکر حەتا هاتینە کوشتن، و سێ ژ وان قەبویل کر خۆ ب دەست ڤە بەردەن، ئەو ژی ئەڤە بوون: عەبدللاهێ کوڕێ طارقی و خوبەیبێ کوڕێ عەدی و زەیدێ کوڕێ دەثنەی، گاڤا کافر گەهشتینە وان ڤیا وان زنجیر بکەن، هنگی عەبدللاهی گۆت: ئەڤە دەسپێکا غەدرێیە، لەو وی خۆ ژ دەست وان ئینا دەر و دەست دا شیرێ خۆ و شەڕ کر حەتا هاتییە کوشتن، و هەردو هەڤالێن وی ب ئێخسیری ئینان، و

پشتی هنگی ئەو برنە مەکەهێ و فرۆتنە قورەیشییان، هندی زەید بوو صەفوانێ کورێ ئومەییەی کڕی دا پێش بابێ خۆ ڤە بکوژت ئەوێ ل بەدرێ ب دەستێن موسلمانان هاتییە کوشتن، و خوبەیب ژ لایێ مالباتا حارثێ کورێ عامری ڤە هاتە کڕین؛ دا ئەو وی پێش حارثی ڤە بکوژن، ئەوێ ل ڕۆژا بەدرێ ب دەستێ خوبەیبی هاتییە کوشتن.

دەمێ قورەیشییان ڤیای وان هەردو صەحابییان بکوژن، وان ئەو ژ حەرەما مەکەهێ دەرێخستن و برنە جهەکێ دبێژنێ: (التنعیم)، و خەلک ل دۆر کۆمکرن دا بەرێ خۆ بدەنێ دەمێ ئەو وان دکوژن، بەری ئەو وان بکوژن ئەبوو سوفیانی خۆ گەهاندە زەیدی:

- ئەز تە ب خودێ ددەمە سویندێ بێژە من، تو حەز دکەی ڤێ گاڤێ موحەممەد ل جهێ تەبا و تو ل مالا خۆ بای د ناڤ عەیالێ خۆ دا؟

زەیدی گۆت:

- ئەز ب خودێ کەمە من پێ خۆش نینە سترییەک بچنە د پییێ موحەممەدی ڕا و ئەو ل وی جهی بت یێ نوکە ئەو لێ، ل شوینا ئەز ل مالا خۆ بم د ناڤ عەیالێ خۆ دا.

هنگی ئەبوو سوفیانی ب حێبەتی ڤە گۆت: من نەدیتییە ئێک هند حەز ژ ئێکی بکەت وەکی هەڤالێن موحەممەدی حەز ژ موحەممەدی دکەن![1]

پاشی وان زەید کوشت، و گاڤا وان خوبەیب ئینای دا بکوژن، وی گۆتە وان: ئەگەر هوین دەلیڤەیێ بدەنە من ئەز دێ دو ڕکاعەتێن نڤێژێ کەم. وان گۆتێ: بلا. خوبەیبی دو ڕکاعەتێن سڤک کرن، و دەمێ ژ نڤێژێ خلاصبووی

(١) ئبن ئیسحاق ڤێ چەندێ د سیرەتێ دا ڤەدگوهێزت، بەلێ ئەو وەکی زانایێن حەدیسێ دبێژن: ڕیوایەتەکا (موعضەلە) یەعنی: ئەو یا (صەحیح) نینە.

ل وان زڤڕی و گۆت: ئەگەر نە ژ بەر هندێ با هوین دێ هزر کەن ئەز ژ مرنێ دترسم ئەز دا نڤێژا خۆ درێژتر لێ کەم.. پاشی وی دەستێ خۆ ب کافران ڤە درێژ کر و نفرینەک کر و گۆت: ((اللهم احصهم عددا، واقتلهم بددا، و لا تغادر منهم أحدا)) یەعنی: ئەی خودا تو وان ئێک ئێکە بهژمێرە، و هەمییان بکوژە و ئێکی ژێ نەهێلە.

و دبێژن: دەمێ وی دەستێ خۆ ب نک کافران ڤە درێژکری ئەبوو سوفیانی تێ ئینادەر کو ئەو دێ نفرینەکێ ل وان کەت لەو وی خۆ ژ ناڤ هەڤالێن خۆ ڤەدەر کر و خۆ تەنشت و تەنشت هاڤێتە ئاخێ! و هێشتا سال نەزڤڕییە سالێ ئێک ژ وان مرۆڤان نەما ساخ یێن خوبەیبی ئیشارەت دایێ، ئەبوو سوفیان تێ نەبت!

پشتی هنگی دەمێ وان خوبەیب ب سەر وی دەپی ئێخستی یێ دا وی ل سەر کوژن، وی شعرەک گۆت تێدا هاتبوو:

فلستُ أبالي حين أُقْتَلُ مسلما — على أي شِقٍ كان في الله مصرعي
و ذلك في ذاتِ الإلهِ وإن يَشأ — يُبارِكْ على أوصالِ شلوٍ مُمَزَّعِ
فَلَسْتُ بِمُبْدٍ للعدوِ تَخَشُّعا — ولا جزعاً إني إلى الله مرجعي

پاشی وان خوبەیب ژی کوشت.

ئەڤ ڕویدانە ئەوا د هندەک ژێدەران دا ب غەزایا رجیعێ دئێتە ناڤکرن، ژ بەر ناڤێ وێ ئاڤێ یا هندەک ژ ڤان صەحابییان ل نک هاتینە کوشتن و هندەک ژی هاتینە گرتن، ل هەیڤا صەفەرێ کو هەیڤا دوییێ چێبووبوو. و موسلمانان و پێغەمبەر ژی -سلاڤ لێ بن- گەلەک ب ڤێ ڕویدانێ ئێشان، ژ بەر وێ غەدر و خیانەتا تێدا، حەتا پێکەکێ ناڤێ ئویجاخا (عەضەل و قاررە) پشتی هنگی ل نک موسلمانان وەکی نیشان بۆ

خیانەتێ هاتمدانان، وەکی دێ ژ سەرهاتییا غەزایا خەندەکێ (غزوة الأحزاب) بۆ مە ئاشکەرا بت.

**سەرییا (بئر معونة):**

هەر ل وێ هەیڤا خوبەیب و هەڤالێن وی ب خیانەت هاتینە کوشتن و گرتن، و بەری بەحسێ کوشتنا وان بگەهتە موسلمانان، هندەک کەسێن دی ژ لایێ نەجدێ ڤە، ژ ئویجاخا عامرییان، هاتنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتنێ مە دڤێت تو هندەک هەڤالێن خۆ بهنێرییە وەلاتێ مە دا دینی نیشا خەلکی بدەن، و قورئانێ بۆ وان بخوینن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: ئەز ژ خەلکێ نەجدێ دترسم ل سەر هەڤالێن خۆ.. هنگی مەزنەکێ عامرییان ئەوێ دگۆتنێ: (ئەبوو بەراء) گۆت: ئەو یێ ل سەر بەختێ من، تو نەترسە. و دەمێ وی ئەڤ گۆتنە گۆتی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- حەفتێ ژ هەڤالێن خۆ ب ئەمیراتییا مونذرێ کورێ عەمرێ ساعدی ب لایێ رۆژهەلاتێ ڤە هنارتنە دەڤەرا نەجدێ، و دەمێ ئەو گەهشتینە جهەکێ دبێژنێ: (بئر معونە)، عامرێ کورێ طوفەیلی برازایێ ئەبوو بەرائی هندەک چەکدار ژ ئویجاخا (سولەیمییان) ئینان و هێرش دا سەر وان صەحابییان، و ئەو کوشتن.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و موسلمانان ب ڤێ چەندێ ژی گەلەک نەخۆش بوو، و هنگی بوو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەیڤەکێ قونووت د هەر پێنج نڤێژێن فەرز دا دخواند، و تێدا نفرین ل وان بابکێن سولەیمییان کر یێن پشکداری د وێ خیانەتێ دا کری.

و ئەڤ سەرهاتییە د گەل سەرهاتییا سەرییا رەجیعێ، ئەوا بۆری د گەل مە، هندێ دگەهینت کو پشتی شەڕێ ئوحودێ هندەک ئویجاخێن موشرکێن

عەرەبان ل دەور و بەرێن مەدینێ قەبە بوون، و هزرکرن کو موسلمانان چو هێز نەماینە، لەو وان دەست ب ڤی ڕەنگێ خیانەتێ کر.

## دەرێخستنا جوهییێن بەنوو نەضیر ژ مەدینێ:

د هندەک ژێدەران دا هاتییە کو دیرۆکا ڤێ ڕویدانێ پشتی شەڕێ بەدرێ بوو ب شەش هەیڤان، بەلێ یا دورست ئەوە ئەو ڕویدانا پشتی بەدرێ چێبووی غەزایا جوهییێن (بەنوو قەینوقاع) بوو، وەکی بۆری د گەل مە، و ئەو غەزایا پشتی شەڕێ ئوحودێ ب پێنج شەش هەیڤان چێبووی غەزایا جوهییێن (بەنوو نەضیرییان) بوو.

د سەرهاتییێن سالا سێیێ مشەختی دا دەمێ مە بەحسێ کوشتنا (کەعبێ کوڕێ ئەشرەفێ جوهی) کری، ئەوێ ل تاخێ بەنوو نەضیرییان دژیا، مە ئاشکەرا کربوو کو دەمێ خیانەت ژ کەعبی چێبووی و پێغەمبەری حوکم ب کوشتنا وی دای، ل شوینا جوهییێن بەنوو نەضیری کەعبی ژ خیانەتێ بدەنە پاش، وان خۆ ل سەر حوکمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەرازی کر، و هەر چەندە ئەڤە ڕەنگەکێ پشتەڤانییێ بوو ژ وان بۆ خیانەتا کەعبی و پێلێدانا وی بۆ وێ پەیمانا وان د گەل موسلمانان گرێدای، بەلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ب خیانەت و گونەها کەعبی نەگرتن، و چو جزا نەدانە وان، پشتی کوشتنا کەعبی و حەتا شەڕێ ئوحودێ جوهییێن مەدینێ ب گشتی و ئویجاخا بەنوو نەضیرییان ب تایبەتی د ترس و کەربگرتنەکا مەزن دا دژیان، بەلێ پشتی شەڕێ ئوحودێ ئەوێ حەفتێ صەحابی تێدا هاتینە کوشتن، و پشتی سەرهاتییا (الرجیع و بئر معونە) ئەوێن نێزیکی حەشتێ صەحابییان تێدا هاتینە کوشتن، کەیفەکا مەزن بۆ جوهییان چێبوو ژ لایەکی ڤە، و ژ لایەکێ دی ڤە وان ترسا خۆ هاڤێت و بستەبوون، و هزرکر

موسلمانان ئێدی چو هێز نەمایە بشێن بەرەڤانییێ پێ ژ خۆ بکەن، لەو وان دلێ خۆ برە خیانەتێ، و نیشانێن ڤێ خیانەتێ ژ وان ئاشکەرا بوون.

مەزنترین خیانەتا وان ئەو بوو دەمێ وان کار بۆ کوشتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری، د کتێبێن سیرەتێ دا هاتییە کو جارەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هندەک صەحابییێن خۆ بۆ کارەکی چوو تاخێ بەنوو نەضیرییان، وان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- موژیل کر، و د پشت ڕا چوون ب دزی ڤە پیلانەک دانا، گۆتن: ڤێ گاڤێ موحەممەد ل بەر دیوارێ فلان مالێ یێ ڕوینشتییە، کی ژ هەوە دێ چیتە سەر بانی و باگوردانەکی د سیڤاندەی دا ب سەر سەرێ وی دا بەردەتە خوارێ و وی کوژت؟ زەلامەکێ وان یێ دگۆتنێ: عەمرێ کوڕێ جیحاشێ کوڕێ کەعبی، گۆت: ئەز دێ وە کەم!

دەمێ وی زەلامی کارێ خۆ دکر؛ دا بچیتە سەر بانی، و تاوانا خۆ ب جهـ بینت، وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتە خوارێ، کو جوهییان پیلانەکا ب ڤی ڕەنگی دانایە، لەو ئەو ئێکسەر ژ وی جهی ڕابوو و خۆ ژ سیڤاندەی دا پاش، و گاڤا ئەو زەلام چوویە سەر بانی و باگوردان برییە هنداڤ وی جهی یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بەری هنگی لێ ڕوینشتی، وی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل وێرێ نەدیت، و پیلانا وی ئاشکەرا بوو..

هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ تاخێ وان زڤڕی مەدینێ، و ئەڤ کارێ وان حسێب کر شکاندن بۆ وێ پەیمانێ یا د ناڤبەرا وی و وان دا هەی، و هەڤالێ خۆ موحەممەدێ کوڕێ مەسلەمەیی هنارتە نک مەزنێ بەنوو نەضیرییان حوییەیێ کوڕێ ئەخطەبی و گۆتێ: دڤێت هوین ژ مەدینێ دەرکەڤن، و جیرانییا مە نەکەن. مەزنێ جوهییان ب دفنبلندی بەرسڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا، و گۆت: ئەم ژ جهێ خۆ دەرناکەڤین، و هوین

چ دکەن بکەن! هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا تاخێ وان دۆرپێچ بکەت، و بۆ ڤێ ئارمانجێ موسلمان بەر ب تاخێ وان ڤە چوون و ئەو حیصار دان.

ئەڤە ئەو ئەگەرە یا د پشت سەرهاتییا دەرێخستنا جوهییێن (بەنوو نەضیرییان) دا هەی وەکی (ئبن ئیسحاق) ڤەدگوهێزت، بەلێ زانایێن حەدیسێ ل وێ باوەرێنە کو ئەڤ ریوایەتە ب ڕەنگەکێ (دورست) نەگەهشتییە مە، و زانایێ ناڤدار (ئبن حەجەر)[1] ریوایەتەکا دی دەربارەی ئەگەرا ڕویدانا ڤێ سەرهاتییێ ڤەدگێرێت تێدا هاتییە: کو کافرێن مەکەهێ کاغەزەک بۆ جوهییێن مەدینێ هنارت تێدا گەف لێ کرن کو ئەگەر ئەو نەیارەتییا موسلمانان نەکەن، و شەڕێ موحەممەدی نەکەن، ئەو دێ عەرەبان ل سەر سەرێ وان کۆم کەن، و هەر جارەکا ئەو شیانە موسلمانان، ئەو دێ جوهییان وەکی موسلمانان هژمێرن، و دێ وان ژی ژ بن بەن. هنگی جوهییان کرە دلێ خۆ کو نەیارەتییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەن، و بەنوو نەضیرییان هنارتە ب دویڤ پێغەمبەری ڕا -سلاڤ لێ بن- کو تو د گەل سێ هەڤالێن خۆ وەرە تاخێ مە، و ئەم دێ سێ زانایێن خۆ یێن دی ئینین و هوین دان و ستاندنێ د گەل ئێک بکەن، و هەر جارەکا هوین شیانە زانایێن مە ئەم دێ باوەرییێ ب تە ئینین.. و ئەو ب خۆ ئەو ل سەر هندێ پێکهاتبوون کو دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دئێتە تاخێ وان، ئەو هێرشێ بدەنە سەر و وی و هەڤالێن وی پێکڤە بکوژن، و وان پیلانەکا ب ڕێک و پێک بۆ ڤێ چەندێ ئامادە کربوو.

ل دویڤ داخوازا وان، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل سێ هەڤالێن خۆ دەرکەفتە تاخێ وان، بەلێ ژنەکێ ژ (بەنوو نەضیرییان) برایەکێ

---

(١) فتح الباري (٧/٣٣١).

ئەنصاری هەبوو، وێ خەبەرێ پیلانا جوهییان ب دزی ڤە بۆ ڤەگوهازت و گۆتێ: هشیار بن بلا پێغەمبەر نەئێت؛ چونکی جوهییان ئنیەتا خیانەتێ هەیە.. ب رێڤە خەبەر گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لەوا ئەو و هەڤالێن خۆ زڤرینە مەدینێ، و رۆژا د دویڤ دا لەشکەرێ موسلمانان چوو و تاخێ وان حیصار دا.

ئەڤ رویدانە ل هەیڤا سێیێ (رەبیعولئەووەلێ) ژ سالا چارێ بوو، شەش رۆژان موسلمانان تاخێ جوهییان دۆرپێچ کر، و ل ڤی دەمی هندەک منافقێن مەدینێ، وەکی عەبدللاهێ کورێ ئوبەیێ کورێ سەلوولی، ب دزی ڤە هنارتە نک جوهییان و گۆتێ: گوهدارییا موحەممەدی نەکەن، و خۆ ب دەست وی ڤە بەرنەدەن، ئەگەر وی شەرێ هەوە کر ئەم دێ هاری هەوە کەین، و خۆ ئەگەر وی هوین ژ مەدینێ دەرێخستن ژی ئەم دێ د گەل هەوە دەرکەڤین.

جوهی ب گۆتنا منافقان پشتگەرم بوون، و هزر کر ئەو دێ پشتەڤانییا وان کەن، بەلێ گۆتنا منافقان وەکی هەر جار دەرکەفت درەو، و پشتی شەش رۆژان ژ حیصارێ جوهی ژ سۆز و گۆتنێن منافقان بێ هیڤی بوون، و وان زانی ئەو چو بۆ وان ناکەن، لەو ترسەکا زێدە کەفتە دلێن وان، و دووماهییێ وان کەسەک هنارتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و داخوازا لێبۆرینێ ژێ کر، و گۆتن: ئەم ئامادەینە وێ بکەین یا تە دڤێت کو مەدینێ بهێلین و بچینە خەیبەرێ، ب شەرتەکی تو مە نەکوژی.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخوازا وان قەبویل کر، و ل وان بۆری، و گۆتێ: سێ رۆژ دەلیڤە ل بەر هەوە، هەر ئێک بارێ دەوارەکێ ژ مالی بلا د گەل خۆ ببەت و بچت.. و وان ئەو حوکم ب جهئینا و هندەک ژ وان چوونە

خەیبەرێ و هندەک ژی چوونە شامێ، و مال و ملکێ وان بۆ موسلمانان ما.. و د ڤێ سەرهاتییێ دا سوورەتا (الحشر) ژ قورئانێ هاتە خوارێ.

هەژی گۆتنێیە بێژین: ئەو جوهییێ ئامادەبوونا خۆ دیارکری کو ب کارێ کوشتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕابیت، ئەوێ دگۆتنێ: عەمرێ کوڕێ جیحاشێ کوڕێ کەعبی، پسمامەک هەبوو دگۆتنێ: یامینێ کوڕێ عومەیرێ کوڕێ کەعبی، یامین پشتی هنگی موسلمان بووبوو، و دەمێ یامینی ب کارێ پسمامێ خۆ زانی وی پارە دانە مرۆڤەکی دا کو بچت پسمامێ وی بکوژت، و ب ڤی ڕەنگی ئەو هاتە کوشتن.

## حەرامکرنا مەیێ:

ل وان شەش ڕۆژێن موسلمانان تاخێ جوهییێن بەنوو نەضیرییان حیصار دای، ئەو ئایەتێن سوورەتا (المائدة) هاتنە خوارێ یێن حەرامبوونا ڤەخوارنا مەیێ تێدا هەی، و ب ڤێ چەندێ مەی د ئیسلامێ دا ب ئێکجاری حەرامبوو.

## غەزایا (بەنوو لحیان):

هندەک دیرۆکزان ل وێ باوەرێنە کو ئەڤ غەزایە ل هەیڤا (ڕەبیعولئەووەلا) سالا شەشێ (یان پێنجێ) مشەختی چێووبوو، پشتی شەڕێ خەندەکێ و غەزایا بەنوو قورەیضە، و هندەک ژی ل وێ باوەرێنە کو ئەو پشتی غەزایا (بەنوو نەضیرییان) چێبووبوو، و زانایێ ناڤدار (ئبن کەثیر) ئەو د ناڤ ڕویدانێن ڤێ سالێ دا ئینایە.

پشتی موسلمان ژ غەزایا بەنوو نەضیرییان خلاصبووین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤیا تۆلا وان هەر دەهـ صەحابییان ڤەکەت ئەوێن ب غەدر هاتینە گرتن و کوشتن، یێن مە بەحسێ وان د (سەریا شەهیدان) دا کری، و د ریوایەتەکێ دا ل نک (واقدی) هاتییە کو دەمێ ئەڤ غەزایە چێبووی

(خوبەیبێ کورێ عەدی) د دەستێ کافران دا بوو، و هێشتا ئەو نەهاتبوو کوشتن.

(بەنوو لحیان) ئەو ئویجاخ بوو یا غەدر ل موسلمانان کری، و ب هێجەتا فێربوونا دینی کۆمەکا صەحابییان (کو دەهـ بوون ل دویڤ بۆچوونەکێ) ب نک دەڤەرا خۆ ڤە برن، پاشی لێ قولپین و هندەک ژ وان کوشتن و هندەک گرتن و برن فرۆتنە کافرێن مەکەهێ، و وان ئەو کوشتن. پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل دوسەد زەلامان ژ صەحابییێن خۆ دەرکەفت، و عەبدللاهێ کورێ ئوم مەکتوومی ل جهێ خۆ دانا ل مەدینێ، و دا ئەو مەسەلێ ل بەر کافران ڤەشێرت، وی وەسا کرە دەنگ کو ئەو دێ ب لایێ باکوورێ ڤە چنە شامێ، پشتی دەمەکی ژ رێڤەچوونێ وی رێکا خۆ ڤەگوهاست و ب لایێ باشوورێ ڤە چوو حەتا گەهشتییە نهالا (غورانێ) ل نێزیکی عوسفانێ، ئەوا دکەفتە باکوورێ مەکەهێ، و دەمێ ئویجاخا بەنوو لحیان زانی کو موسلمان بەر ب دەڤەرا وان ڤە هاتن، ئەو رەڤین و خۆ ب چیا را گەهاندن، و موسلمان دو رۆژان ل جهێ وان مان، و کەسێ ژ وان د خۆ را نەدیت ل بەر سنگێ موسلمانان راوەستن.

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالێن خۆ ژ دەڤەرا وان چووی بێی شەرەک چێ ببت، وان چەندەکێ خۆ نێزیکی مەکەهێ ژی کر گۆتن: دا کافرێن مەکەهێ ب دەرکەفتنا مە بزانن. یەعنی: دا ئەو بزانن کو ئەم بێ هێز نەبووینە. پاشی پشتی چاردە رۆژان ئەو زڤرینە مەدینێ.

و دئێتە ڤەگوهاستن کو د ڤێ غەزایێ دا موسلمانان بۆ جارا ئێکێ نڤێژا ترسێ کربوو، و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ هندەک زانا (وەکی ئیمامێ شافعی) بۆ هندێ دچن کو ئەڤ غەزایە پشتی شەرێ خەندەکێ بوو؛ چونکی ئەو دبێژن: ل دەمێ غەزایا خەندەکێ هێشتا نڤێژا ترسێ نەهاتبوو دورستکرن.

**غەزایا** (**ذات الرقاع**):

پشتی چەند رۆژەک ژ هەیڤا (جومادا یا ئێکێ) ژ سالا چارێ بۆرین، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مەدینێ دەرکەفت و ب لایێ نەجدێ ڤە چوو، و د ڤێ غەزایێ دا وی ئەبوو ذەررێ غیفاری (یان عوثمانێ کورێ عەففانی ل دویڤ گۆتنەکێ) ل شوینا خۆ دانا، و وەکی ئەم دزانین کو خەلکێ نەجدێ ژی خیانەتەکا ئاشکەرا ل موسلمانان کربوو دەمێ وان ژی نێزیکی حەفتێ صەحابییان ب غەدر کوشتین، وەکی بۆری د گەل مە.

د ڤێ غەزایێ دا هەر چەندە موسلمان ڕاستی کۆمەکا غەطەفانییان هاتن ژی، بەلێ چو شەڕ چێ نەبوون.. و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو د ڤێ غەزایێ ژی دا نڤێژا ترسێ هاتبوو کرن. د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو ئەڤ غەزایە پشتی شەڕێ خەندەکێ بوو، چونکی د ریوایەتەکا دورست دا هاتییە کو عەبدللاهێ کورێ عومەری د ڤێ غەزایێ دا یێ ئامادە بوو، و ئاشکەرایە کو ئێکەمین جار پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری بۆ کرنا شەڕی دایە کورێ عومەری د شەڕێ خەندەکێ دا بوو، ژ بەر کو ئەو بەری هنگی زارۆک بوو، مەعنا ئەڤ غەزایە دڤێت پشتی شەڕێ خەندەکێ بت[1].

**غەزایا بەدرا پاشییێ**:

یا پاشییێ دا بێتە جوداکرن ژ غەزایا بەدرا پێشییێ ئەوا ل رەمەزانا سالا دویێ مشەختی چێبووی، ئەڤ غەزایە (بەدرا پاشییێ) ل هەیڤا شەعبانێ ژ سالا چارێ بوو، ژ بەر کو ل دەمێ شەڕێ ئوحودێ چێبووی ل سالا سێیێ، موسلمان و کافران ژڤان دا ئێک و دو کو سالەکا دی ل هەیڤا شەعبانێ ئەو بگەهنە ئێک و شەڕی بکەن. ل دویڤ وی ژڤانی موسلمان دەرکەفتن، و د ڤێ غەزایێ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-

---

(١) البداية و النهاية (٨٣/٤).

عەبدللاهێ کوڕێ عەبدللاهێ کوڕێ ئوبەیی ل شوینا خۆ دانا، و ئەو ب لایێ بەدرێ ڤە دەرکەفتن و هەشت ڕۆژان ل هیڤیا لەشکەرێ قورەیشییان مان.

قورەیشی ب سەرۆکاتییا ئەبوو سوفیانی دەرکەفتن، پاشی ب ڕێڤە زڤڕینە ڤە، و گۆتن: ئەڤ ساڵە هشکاتییە و چو خێر تێدا نینە!

پشتی مانا موسلمانان هەشت ڕۆژان ل بەدرێ، و دەمێ خەبەر گەهشتییە وان کو لەشکەرێ قورەیشییان زڤڕی، ئەو ژی زڤڕینە مەدینێ بێی کو چو شەڕ چێ ببن.

## هندەک سەرهاتیین دی یێن ڤێ ساڵێ:

ژ بلی ڤان سەرهاتی و ڕویدانێن مە بەحس ژێ کری، هندەک ڕویدانێن دی یێن جودا جودا د ڤێ ساڵێ دا چێببووبوون، ل ڤێرێ ئەم ب کورتی دێ هندەک ژ وان بێژین:

### ١- مرنا عەبدللاهێ کوڕێ عوثمانێ کوڕێ عەففانی:

ل هەیڤا (جومادا یا ئێکێ) ژ ڤێ ساڵێ نەڤییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ کچا وی روقەییایێ عەبدللاهێ کوڕێ عوثمانێ کوڕێ عەففانی مر، و دەمێ ئەو مری ژییێ وی شەش ساڵ بوون.

### ٢- بوونا حوسەینێ کوڕێ عەلی:

ل هەیڤا شەعبانێ ژ ساڵا چارێ نەڤییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ فاطمایێ ئیمامێ شەهید حوسەینێ کوڕێ عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی هاتبوو سەر دنیایێ، و سەرهاتییا ژینا وی مە ل جهەکێ دی ب بەرفرەهی ڤەگێرایە[1].

---

(١) د کتێبا خۆ (د گەل صەحابییێن پێغەمبەری) دا، بۆ هەچییێ بڤێت لێ بزڤڕت.

### ٣- ڤەگوهاستنا دەيكا موسلمانان زەينەبا كچا خوزەيمەى:

زەينـەبا كچـا خوزەيمـەيێ كـوڕێ حـارثێ هيلالـى، ئـەوا دگـۆتنێ: دەيكـا هـەژاران، ژ بـەر وان خێـر و صـەدەقـاتێـن زێـدە يێـن وێ د گـەل هـەژاران دكـرن، و بـەرى ئـەو شوى ب پێغەمبەرى -سلاڤ لـێ بـن- بكـەت وێ شوى ب پسمامەكێ خۆ كـربوو، و پشتى وێ شوى ب پێغەمبەرى -سلاڤ لـێ بـن- كـرى ب دو هـەيڤان يـان سێيان يـان هەشتان ل دويـڤ گۆتنـەكێ وێ ئـەمرێ خودێ كر، و ژييێ وێ سيه سال بوون، و پێغەمبەرى -سلاڤ لـێ بـن- نڤێـژ ل سـەر كـر، و ئەو و خەديجا ب تنێ ژ وان كابانييێن پێغەمبـەرى بوو يێن ل ساخييا وى مرين.

### ٤- ڤەگوهاستنا ئوم سەلەمەيێ:

ناڤێ وێ هندا كچا ئەبوو ئومەييەيێ كـوڕێ مـوغيرەيێ مەخزوومييـە، و وەكى ئاشكەرا ئەو ژ ئويجاخا قـورەيشييان ژ بـابكـێ مـەخزوومييان بـوو. و بەرى ئەو شوى ب پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- بكەت، وێ شوى ب پسمامێ خـۆ ئـەبوو سـەلـەمەيێ مـەخزوومى كربـوو، و ئـەو د گـەل زەلامـێ خـۆ ئـەبوو سەلەمەيى مشەختبووبوونە حەبەشە و پاشى مەخشـتبووبوونە مـەدينێ، و وێ چەند عەيال ژ ئەبوو سەلەمەيى هەبوون. ل هەيڤا شەووالێ ژ سالا چارێ ئـەو بۆ پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- هاتبوو ڤەگوهاستن.

### ٥- زەيدێ كوڕێ ثابتى و فێربوونا زمانێ جوهييان:

(واقـدى) دبێـژت: ل ڤـێ سـالێ، ئـانكو سـالا چـارێ مشـەختى، پێغەمبـەرى -سـلاڤ لـێ بـن- فـەرمان ل هـەڤالێ خـۆ زەيـدێ كـوڕێ ثـابتێ ئەنصارى كر كو خۆ فێرى زمانێ جوهييان بكەت. بـۆ هندێ دا ئـەو كاغـەزێن جوهييان ئەوێن بۆ پێغەمبەرى -سلاڤ لـێ بـن- دئێن بخـوينـت، و بـەرسـڤـا

وان بدەت. و (ئبن کەثیر) دبێژت: ب ڕێکێن دورست هاتییە کو وی د پازدە ڕۆژان دا خۆ فێری زمانێ وان کر[1].

و ئەڤە گرنگییا خۆ فێرکرنا زمانان بەرچاڤ دکەت، ب تایبەتی زمانێ نەیاران، بۆ هندێ دا مرۆڤ ژ خرابییا وان بێتە پاراستن.

---

(١) البداية و النهاية (٩١/٤).

# سەرهاتیێن سالا پێنجێ مشەختی

**غەزایا (دومة الجندل):**

(دومة الجندل) جهەکە دکەفتە نێزیکی توخوبێن شامێ، ژ لایێ باکوورێ مەدینێ ڤە، ل هەیڤا (رەبیعولئەووەلێ) ژ سالا پێنجێ، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل نێزیکی هزار مرۆڤان دەرکەفتە دەڤەرا (دومەت ئەلجەندەل)ێ پشتی خەبەرەک گەهشتییێ کو خەلکەکێ بۆش ل وی جهی هەیە رێکێ ل وی خەلکی دگرن ئەوێن د دەڤەرا وان را دبۆرن، و وان دل تێ هەیە خۆ نێزیکی مەدینێ بکەن؛ دا گەفێ ل سەر موسلمانان بکەن. ژ لایەکێ دی ڤە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زانی کو ئەگەر لەشکەرێ وی ب لایێ باکوورێ ڤە بچت، و سەربەست د وێ دەڤەرێ را دەرباس ببت، ئەڤ چەندە دێ سەهمێ هاڤێتە دلێ خەلکێ وێ دەڤەرێ، و ئەوێن ل پشت وان ژی ژ خەلکێ شامێ، دا کو ئەو هزرا خۆنێزیککرنا ژ مەدینێ ژ سەرێ خۆ بهاڤێن.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل لەشکەرێ خۆ ئەوێ ژ هزار کەسان پێک دهات دەرکەفت، و وی (سیباعێ کورێ عورفوطەیێ غیفاری) ل شوینا خۆ هێلا ل مەدینێ، و پشتی نێزیکی هەیڤەکێ ئەو زڤری مەدینێ بێی شەرەک د ناڤبەرا وی و کافران دا چێ ببت، چونکی دەمێ خەلکێ وێ دەڤەرێ ب خەبەرێ هاتنا موسلمانان زانی ئەو ژ جهێن خۆ رەڤین و د خۆ را نەدیت ل بەر سنگێ موسلمانان راوەستن.

**غەزایا (بەنوو موصطەلق):**

ئەڤ غەزایە، ل دویڤ بۆچوونا دورستتر ل هەیڤا شەعبانێ بوو ژ سالا پێنجێ مشەختی، و بەنوو موصطەلق بابکەکێ ئویجاخا خوزاعەیە، و جهێ وان دکەفتە رۆژئاڤایا باشوورێ مەدینێ ل نێزیکی دەریایا سۆر.

بەنوو موصطەلق پشتەڤانێن قورەیشییان بوون دژی موسلمانان، و هندەک ژ وان پشکداری د شەڕێ ئوحودێ دا کربوو د گەل کافران، و جهێ وان دکەفتە سەر وێ ڕێکێ ئەوا د ناڤبەرا موسلمان و کافرێن مەکەهێ دا هەی، و خەبەر گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو مەزنێ بەنوو موصطەلەقییان حارثێ کوڕێ ئەبوو ضراری یێ لەشکەری بۆ شەڕێ موسلمانان کۆم کەت، و هێشتا وان هێزا خۆ لێک نەدای، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل صەحابییان کر کو خۆ بۆ غەزایان ڤی دوژمنی ئامادە بکەن، و لەشکەرێ موسلمانان ژ پتر ژ حەفت سەد مرۆڤان پێک دهات.

موسلمانان ب خافلەتی ڤە هێرش دا دەڤەرا وان، و د ڤێ غەزایێ دا شەڕ د ناڤبەرا هەردو لایان دا چێبوو، و شکەستن کەفتە ڕێزا کافران، و هژمارەکا زەلامێن وان هاتنە و کوشتن و گرتن، و چەندەک ژ مالێ وان ژی کەفتە دەستێ موسلمانان، و د ڤی شەڕی دا کچا مەزنێ بەنوو موصطەلقییان حارثی (جوەیریا) هاتە گرتن، و ئەو ئەو بوو یا پشتی هنگی شوی ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری، و بوویە ئێک ژ دەیکێن موسلمانان، وەکی پاشی دێ د گەل مە ئێت.

و دیرۆک ڤەگوهێزت کو پشتی دەمەکی ژ ڤێ غەزایێ مەزنێ ئویجاخا بەنوو موصطەلقییان هاتە مەدینێ؛ و هندەک مال د گەل خۆ ئینا دا ئێخسیرێن ئویجاخا خۆ ژ موسلمانان بکڕت، کو ئێک ژ وان کچا وی بوو،

هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخواز ژ وی کر کو ئەو موسلمان ببت، وی داخوازا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب جهئینا و موسلمانان بوو، و هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کچا وی ژ وی خواست، و سەر خاترا خزمایینیا ڤێ ئویجاخێ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابییان هەمی ئێخسیرێن وان بەردان و مالێ وان بۆ وان زڤڕاند.

**بێبەختیا مەزن:**

یان ڕویدانا (درەوا مەزن) ئەوا ب عەرەبی دبێژنێ: (حادثة الإفک)، ئەڤ ڕویدانە -وەکی زانایێن سیرەتێ و تەفسیرێ دبێژن- پشتی سەرهاتییا غەزایا (بەنوو موصطەلق) ڕویدابوو دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی زڤڕینە مەدینێ، د سوورەتا (النور) دا چەند ئایەتەک هەنە ڕۆناهییێ ددەنە سەر وێ گرفتارییێ یا ب بەلاڤکرنا ڤێ بێبەختییێ ب سەر جڤاکا موسلمانان دا هاتی، ئەو بێبەختیا نێزیک بوو ژ بەر کارتێکرنێن خۆ یێن خراب ئێکەتییا ڤێ جڤاکێ بلەقینت، و باوەرییێ د ناڤ دا نەهێلت! ئەڤ ئایەتە هاتنە خوارێ دا زەلالییا ڤێ جڤاکێ دوبارە ئاشکەرا بکەت، و وان شک و گومانان ڤەرەڤینن یێن منافق و دوڕوییان ب دزی ڤە بەلاڤ دکرن دا دڕێ خۆ یێ ڕەش بوەشیننە ئیسلامێ د ڕێکا کرێتکرنا ناموسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-[1].

ئەڤ سەرهاتییە ب کورتی، وەکی دەیکا موسلمانان عائیشایا کچا ئەبوو بەکرێ صددیق ب خۆ بۆ مە ڤەدگێڕت، ب ڤی ڕەنگییە[2]:

هەر جارەکا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەرکەفتبایە غەزایەکێ وی د ناڤبەرا کابانییێن خۆ دا پشک دهاڤێت، و هەچییا پشکا وێ دەرکەفتبا

---

(١) شەرحا ڤان ئایەتان ب بەرفرەهی مە د تەفسیرا سوورەتا (النور) دا ڤەگوهاستییە.

(٢) بوخاری و موسلم هەردو ڤێ سەرهاتییێ ژ عائیشایێ ڤەگوهێزن.

وی ئەو د گەل خۆ دبر، و دەمێ ئەو دەرکەفتییە غەزایا (بەنوو موصطەلق) وی پشکا هاڤێت و پشکا عائیشایێ دەرکەفت، لەو وی ئەو د گەل خۆ بر، و هنگی ئایەتێن حجابێ بۆ دەیکێن موسلمانان هاتبوونە خوارێ، لەو مەحافەک (کو وەکی گونبەدەکێیە ژ پاتەیی ل سەر پشتا حێشترێ دئێتە دانان، و ژن د ناڤ دا دئێتە ڤەشارتن) بۆ عائیشایێ هاتبوو چێکرن و ئەو د ناڤ دا بوو، پشتی غەزا ب دوومەاهی هاتی، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل صەحابییێن خۆ زڤری و بەری ئەو بگەهنە مەدینێ شەڤ ب سەر وان دا هات، لەو وان ل جهەکی دانا، و سپێدێ بەری لەشکەر بدەتە رێ عائیشایێ هەوجەیی ب دەرکەفتنێ چێبوو، و وێ چەندەکێ خۆ ژ لەشکەری ڤەدەرکر، و پشتی ئەو زڤرییە جهێ خۆ وێ بەرێ خۆ دایێ رستکا وێ یا قەتیای، ئەو زڤری وی جهێ ژێ هاتی دا مۆرکێن رستکا خۆ ڤێدەت، و ئەو ب وێ چەندێ ڤە موژیل بوو، و هێشتا ئەو نەزڤرییەڤە لەشکەری دا رێ، و وان نەزانی کو عائیشا د مەحافێ دا نینە، عائیشا دبێژت: پشتی ئەز زڤریمەڤە من کەس ل وی جهی نەدیت، ئەز چووم ل جهێ خۆ روینشتم، من گۆت: مسۆگەر ئەو دێ زانن کو ئەز نە د گەل وانم لەو دێ ل من زڤرنەڤە، گۆت: پشتی دەمەکی ئەز مایم چاڤێن من چوونە سەرێک، و (صەفوانێ سوللەمی) ل پاشییا لەشکەری مابوو، د دویڤ وان دا هاتە جهێ لەشکەری دا بەرێ خۆ بدەتێ کانێ وان چو تشت ل جهێ خۆ نەهێلایە، دەمێ وی رەشاتییا مرۆڤەکی ژ دویر ڤە دیتی و ئەو نێزیک بووی، وی هزرا من کر، لەو وی گۆت: (إنا لله وإنا إليه راجعون) ئەز ل دەنگێ وی هشیار بووم، من دێمێ خۆ ب کراسێ خۆ پێچا، و ئەز ب خودێ کەمە ئەو پەیڤەکا ب تنێ ژی ئەو د گەل من نەئاخفت، و وی دەوارا خۆ بۆ من هێلا حەتا ئەز سویاربوویم، و ئەو کەفتە بەرا دەوارێ و ئەز برم حەتا وی ئەز گەهاندیمە لەشکەری.

ئەڤـە کورتییـا ڕویـدانێ بـوو.. سـەرۆکێ منافقـان (عەبـدللاهێ کـوڕێ ئوبـەیێ کـوڕێ سـەلوولی) هنگـی د نـاڤ لەشـکەری دا بـوو، گاڤـا وی دیتـی عائیشا سویارا دەوارەکێیە و زەلامەک سەرێ دەوارێ یێ دکێشت و ژ چۆلی دئینت، وی ئەزمانێ خۆ د دەرحەقا عائیشایێ و صەفوانی دا درێژکر و گۆت: ئەو ب سلامەتی نینن!

ئەڤ گۆتنا وی ڕەنگەکێ (قەذفێ) بوو، بەلـێ هنگی هێشتا ئەو ئایـەت نەهاتبوونە خوارێ یێن حوکمێ (قـەذفێ) و حـەددێ وێ ئاشکەرا دکـەن، لـەو پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بن- نـەزانی چ بکـەت، و ئـەو حێبـەتی بەرانبـەر ڤـێ ڕویـدانێ ڕاوەسـتیا، وی بـاوەری هـەبوو کـو ژنکـا وی یـا پـاقژە و ئـەڤ صـەحابییێ وی یـێ منافقـان بێبـەختی ب دویـڤ ڤـەنای مرۆڤـەکێ بـاش و جامێرە، و ئەوی باش دزانی کو سەرێ نفاقێ (کوڕێ سـەلوولی) یێ د پشت ڤـێ بێبـەختییێ ڕا، و مەخسـەد پـێ شـکاندنا وییـە و چـو ددی نـە، بەلـێ گرانییا مـەوقفی ئەو حێبەتی هێلا، ب تایبەتی ئەگەر ئەم بزانین کو پشتی هنگی ب هەیڤەکێ چو ئایـەت د دەر حەقا ڤـێ مەسـەلێ دا نەهاتنـە خوارێ، پشتی لەشکەر زڤرییە مـەدینێ منافقان دەست ب بـەلاڤکرنا ڤـێ گۆتگۆتکێ ب دژی ڤە کر، ورۆژ بۆ ڕۆژێ ئەو گۆتگۆتک هند ب هێز کەفت حەتا هندەک موسلمانێن سادە ژی د مـەسەلـێ دا کەفتنە شکێ، و هندەک ژ وان ب خۆ ژی بوونە ئامیرەتێ بەلاڤکرنا وێ!

پشتی (مەوقف) دژوار بووی و پتر ژ مالـەکێ د مـەدینێ دا ب ئـاگرێ ڤێ فتنێ کەلی: مالا پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- و مـالا هەڤالـێ وی یـێ ئێکـێ ئـەبوو بـەکری بـابێ عائیشـایێ، و مـالا هەڤالـێ وی یـێ ڕاسـتگۆ و موجاهد صەفوانێ سوللەمی. پشتی هەیڤەکێ ژ نوی هندەک ئایەتێن سوورەتا (النـور) هاتنـە خـوارێ دا ڕۆنـاهییێ بدەنـە سـەر ڤـێ مەسەلـێ و حـەقییێ

ئاشكەرا بكەن، و پاقژی و بژوینییا دەیكا موسلمانان ئاشكەرا بكەن، و بكەتە قورئانەكا حەتا قیامەتێ دئێتە خواندن.. هنگی ژ نوی سەر و بەر زڤری حالەتێ خۆ یێ سورشتی. ئایەتان ئێكەمین جار (حەددێ قەذفێ) ئاشكەرا كر و ل سەر بناخەیێ ڤان ئایەتان ئەو كەسێن ئەڤ گۆتگۆتكە گۆتی و بەلاڤكری هاتنە جەلدەدان، پاشی ئایەتان (بەرائەتا) دەیكا موسلمانان عائیشایێ ئاشكەراكر، و گۆت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ۝١١ لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ۝١٢ ﴾ (النور: ١١-١٢) یەعنی: هندی ئەون یێن كرێتترین درەو كری، كو گونەهباركرنا دەیكا موسلمانان عائیشایێ بوو ب تاوانا كرنا خرابییێ، ئەو كۆمەكا ژ هەوە ب خۆنە -گەلی موسلمانان-، هوین حسێب نەكەن ئەڤ گۆتگۆتكا ژ درەو د ناڤ هەوە دا هاتییە بەلاڤكرن یا خرابە بۆ هەوە، بەلكی ئەو بۆ هەوە باشییە؛ چونكی ئەو بوو ئەگەرا ئاشكەرابوونا پاقژی و بێ گونەهییا دەیكا موسلمانان و بلندبوونا ناڤێ وێ، هەر وەسا ئەو بوو ئەگەر كو هندەك ئایەت ژ قورئانێ بێنە خوارێ و هندەك ئەحكامێن نوی بێنە دانان، وبۆ هەر كەسەكێ ب ڤێ درەوێ ئاخفتی جزایێ وی ژ گونەهێ ل دویڤ كارێ وی هەیە، و ئەوێ بارێ مەزنێ ڤێ درەوێ ب ستویێ خۆ ڤە گرتی، كو سەرێ نفاقێ عەبدللاهێ كوڕێ ئوبەیێ كوڕێ سەلوولی بوو، عەزابەكا مەزن ل ئاخرەتێ بۆ وی هەیە، كو مانا د نزمترین دەرەجێن ئاگری دایە هەر و هەر.

پاشی ئایەتێ تۆرەیەك نیشا جڤاكا موسلمانان دا كو پێتڤی بوو ل سەر وان ئەو د ڤان رەنگی حالەتان دا ژ بیر نەكەن، خودایێ مەزن گۆت: یا دورست ل سەر ژن و مێرێن خودان باوەر ئەو بوو دەمێ وان گوهـ ل گۆتنەكا

ب ڤـی ڕەنگـی دبـوو وان هـزرا باشـییێ ژ ئێـک و دو کربـا، و بـاوەر ژ ڤـێ گۆتگـۆتکێ نـەکربا و هـەچییێ ئـەڤ گۆتنـە دگەهشـتێ ئێکسـەر گـۆتبا: ئەڤـە درەوەکا ئاشکەرایە هاتییە گۆتن.

## ڕاوەستانەکا کورت د گەل ڤێ سەرهاتییێ:

ئـەڤ سـەرهاتییە هنـدێ دگـەهینت کـو بـەرێ منافقـان لـێ بـوو هـەر ڕویدانـەکا د نـاڤ جڤاکـا موسـلمانان دا چێ ببـت، یـا بچویـک بـت یـان یـا مەزن، پەیوەندی ب کێ ڤـە بت ب کێ ڤـە نـەبت، ئـەو بـۆ خـۆ (ئسـتیغلال) بکەن، دا بـاوەرییێ د نـاڤ موسلمانان دا نـەهێلن، ب تایبـەتی بـاوەرییـا وان ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ب کێرهاتنا وی بۆ ڕێڤەبەرییا ڤێ جڤاکێ. و ئەڤە نە ب تنێ حـالـێ وان منافقان بوو یێن ل سـەر دەمـێ پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- دژیـان، بـەلکی ئـەو حالێ منافقانـە ل هـەمی دەم و هـەمی جـهـان، وان دڤـێـت دوبـەرەکییێ بێخنـە نـاڤ ڕێـزا موسـلمانان، و طـەعنێ ل نـامویس و ئـەخلاق و دەسپاکییا وان بـدەن؛ دا بگەهنـە ئارمانجـا خـۆ یـا پیس کو خرابکرنا جڤاکا موسلمانانە.

و ل ڤـان دەمـێن هۆسـا، یـا بـەرهـزر ژ موسـلمانی ئـەوە هـەر گاڤـا وی گۆتنەکا خراب د دەر حەقا برایەکێ خۆ دا گوهـ لـێ بـوو، ئـەو بـاوەر نەکـەت و هێجـەتان پـێش وی ڤـە بگـرت، و بزانـت کـو دوژمنـێن حـەقییێ ژ منـافق و دوڕوییان گەلەک جاران لێ دگەڕێن حەقییێ ب ڕێکا تەشویهکرنا سومعەتا مرۆڤێن بـاش بشـکێنن، دڤێـت ئـەڤ ڕاسـتییە ژ بیـرا خـودان بـاوەران نـەچت. ئەڤـە ب نسـبەت خـەلکێ عـامی، و ب نسـبەت دەسـهەلاتێ هـەر جارەکـا کـەسەکی ئێک ب کرنا فاحشـێ گونـەهبار کر دڤێـت دەسـهەلات ب کـارێ خـۆ ڕابـت، ژێ بخوازت ئەو چار شاهدان بینت، ئەگەر نە.. حەددێ قەذفێ ل سەر ب کار بینت، کو جەلدەدانە.

ڤێ بزاڤا منافق پێ ڕابووین نێزیک بوو جڤاکا موسلمانان بهژینت، و ببته ئەگەرا پەیدابوونا دوبەرەکییێ د ناڤبەرا موسلمانان دا، بەلێ ژ بەر هاتنە خوارا هندەک ئایەتێن سوورەتا (النور) ژ لایەکی ڤە، و حیکمەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ لایەکێ دی ڤە، جڤاکێ هەڤسەنگییا خۆ پاراست، و فتنە هاتە مراندن.

# شەڕێ خەندەکێ
# یان شەڕێ ئەحزابان

ئێک ژ مەزنترین سەرهاتییێن سالا پێنجێ مشەختی سەرهاتییا هێرشکرنا قورەیشی و پشتەڤانێن وان بوو ل سەر مەدینێ، ئەو سەرهاتییا گەلەک ئایەتێن قورئانێ تێدا هاتینە خوارێ، بەلکی سوورەتەکا تایبەت ب ناڤێ سوورەتا (الأحزاب) د ڤێ دەربارەیێ دا هاتییە خوارێ. لەو سەرهاتییا ڤێ غەزایێ ژی ب بەرفرەهی د ڤێ ناڤبرێ دا دێ ڤەگێڕین.

**دەم و ئەگەرا ڤێ غەزایێ**:

پشتی جوهییێن (بەنوو نەضیرییان) ژ مەدینێ هاتینە دەرێخستن، وەکی بەری نوکە مە بەحس ژێ کری، و گەلەک ژ وان بۆ خەیبەرێ هاتینە دویرئێخستن، وان ل خەیبەرێ دەست ژ دوژمناتییا خۆ بۆ موسلمانان بەرنەدا، بەلکی وان پتر بەرگەریان کر دا گازییا ئیسلامێ بنبڕ بکەن، لەو هندەک مەزنێن وان وەکی (حویەیێ کوڕێ ئەخطەبی و سەلامێ کوڕێ ئەبوولحەقیقی) بزاڤەکا مەزن کر کو ئویجاخێن عەرەبان هەمییان -نە کو قورەیشییان ب تنێ- دژی موسلمانان ڕاکەن، و هێرشکرنا ل سەر مەدینێ ل بەر وان شرین بکەن، لەو وان وەفدەک ژ خۆ دورست کر، و ل سەر هژمارەکا ئویجاخێن مەزن یێن عەرەبان گەڕیان وەکی (قورەیشی، غەطەفانی، کنانی، و ئەسەدییان) و هندەکێن دی.. و وان گۆتە کافرێن عەرەبان: ئەم دئامادەینە ب هەمی شیانێن خۆ هاریکارییا هەوە بکەین، و

ئەم دێ پەیوەندییێ ب وان براییێن خۆ ڤە کەین یێن ل مەدینێ ماین؛ دا ئەو ژی هاریکارییا مە بکەن، و ئەم هنگی دێ ڕاوەستین حەتا موحەممەدی و دویکەفتییێن وی ژ ڕەهـ و ڕیشالان بینینە دەر.

ژ ئەنجامێ ڤێ بزاڤا وان دەهـ حەتا پازدە هزار کەسان ژ قورەیشییان و وان ئویجاخێن پەیمان د گەل وان گرێدای دەرکەفتن و قەستا مەدینێ کرن ب ئنیەتا بنبڕکرنا موسلمانان، و ئەڤ دەرکەفتنە ل هەیڤا شەووالێ بوو ژ سالا پێنجێ مشەختی. و چونکی هێزا کافران ژ هژمارەکا پارت و دەستەکان پێک دهات، هەر پارتەک ژ ئویجاخەکێ پێک دهات و ل ژێر سەرۆکاتییا مەزنەکی بوو، ناڤێ غەزایێ بوو غەزایا ئەحزابان.

### بزاڤا جوهییان بۆ بەرهەڤکرنا ڤێ غەزایێ:

کۆمەکا مەزن و ماقویلێن جوهییێن خەیبەرێ، وەکی: حویەیێ کوڕێ ئەخطەبی و سەلامێ کوڕێ ئەبولحەقیقی و کینانەیێ کوڕێ ڕەبیعەی و هەوذەیێ کوڕێ قەیسی و چەندەکێن دی دەرکەفتنە مەکەهێ بۆ هندێ دا ئەو وان بۆ شەڕێ موسلمانان پالدەن، قورەیشییان پسیار ژ وان کر: هوین خودان کیتابێن عەسمانینە، بێژنە مە ئەو دینێ ئەم ل سەر چێترە، یان ژی دینێ موحەممەدی؟ وان گۆت: دینێ هەوە گەلەک ژ دینێ موحەممەدی چێتر و حەقترە، هنگی ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ۝٥١ ﴾ (النساء: ٥١). گاڤا وان ئەڤ بەرسڤە دایە قورەیشییان، قورەیشی د شەڕێ خۆ دا مجدتر لێ هاتن، و پشتی ئەڤ جوهییە شیاین قورەیشییان قانع بکەن کو هێرشێ بدەنە سەر مەدینێ، ئەو چوونە نک ئویجاخا غەطەفان و ئەو گۆتە وان یا گۆتییە قورەیشییان، و ئاگەهدارییا وان کر کو قورەیشی دئامادەنە بۆ شەڕی، هنگی وان ژی ئامادەبوونا خۆ ئاشکەرا

کر. قورەیشی ب سەرۆکاتییا ئەبوو سوفیانی دەرکەفتن، و ئویجاخێن غەطەفانییان هەر ئێک ب سەرۆکاتییا مەزنەکێ خۆ دەرکەفتن، فەزاری ب سەرۆکاتییا عویەینەیێ کورێ حصنی، و بەنوو موررە ب سەرۆکاتییا حارثێ کورێ عەوفی، و ئەشجەعی ب سەرۆکاتییا موسەعەر کورێ روخەیلەی.. و هەمی ل سەر هندێ کۆمبوون کو هێرشێ بدەنە سەر مەدینێ.

## خۆبەرهەڤکرنا موسلمانان بۆ ڤێ هێرشێ:

بەری لەشکەرێ کافران بۆ هێرشا ل سەر مەدینێ دەرکەڤن، دەنگ و باسێ دەرکەفتنا وان گەهشتە مەدینێ، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابی کۆمکرن و دان و ستاندن د گەل وان کر کانێ ئەو چ بکەن؟

مەسەلە ڤێ جارێ یا جودا بوو ژ هەر جارەکا دی، ڤێ جارێ موسلمان شەرێ قورەیشییان ب تنێ ناکەن، بەلکی دێ شەرێ هژمارەکا ئویجاخان پێکڤە کەن، و ئەڤە کارەکە دویماهییا وی یا نەدیارە و ئەنجامێ وی یێ (مەضموون) نینە، لەو ترسەکا ئاشکەرا ل مەدینێ هەبوو، نەخاسم دڤێت ژ بیر نەکەین کو ل مەدینێ ب خۆ ژی هژمارەکا منافقان هەبوون ل هیڤییێ بوون موسلمان بکەڤنە د تەنگاڤییەکێ دا؛ دا ئەو ژ لایێ خۆ ڤە دیعایەتان بکەن و وان بترسینن، هەر وەسا هژمارەکا ئویجاخێن جوهییان ژی ل دۆر ورەخێن مەدینێ هەبوون ئەو ژی جهێ باوەرێ نەبوون هەر چەندە وان ب سەر ڤە پەیمان ددا پێغەمبەری کو ئەو هاریکارییا چو کەسان دژی وی ناکەن، بەلێ موسلمانان قەت دویر نەددیت کو ل تەنگاڤییێ ئەو ژی ل سۆزێن خۆ لێڤە ببن و ل وان بقولپن!

وەکی مە گۆتی: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دان و ستاندن د گەل صەحابییێن خۆ کر، کانێ ئەو چ بکەن؟ د کتێبێن سیرەتێ دا وەسا یا ناڤدارە کو صەحابییێ ناڤدار (سەلمانێ فارسی) گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-:

ل وەلاتێ مە، گاڤا نەیارەک هێرشێ بدەتە سەر بـاژێرەکی، و ب خەلکێ وی باژێری ڤـە نەئێت بەرگرییا وان بکەن، ئـەو ڕادبـن خەندەکـەکا مـەزن و کـویر ل دۆرا باژێرێ خۆ دکۆلن دا نـەیـار دەربـاس نەبتە باژێری.. هنگی پێغەمبـەر -سلاڤ لێ بن- ب گۆتنا وی قانع بوو، و کار پێ کر، و فەرمان دا خەنـدەک بێتە کۆلان. و هەر چەندە ئەڤ گۆتنە ل نک زانایێن سیرەتێ یا ناڤدارە ژی، بـەلێ ئـەو ب چـو سـەنەدێن (موتتەصـل) نەگەهشـتییە مـە، وەکـی زانـایێن حەدیسێ دبێژن.

هـەر چـاوا بـت، موسـلمان گەهشـتنە وێ بڕیـارێ کـو پێتڤییـە ئـەو خەندەکەکێ ل لایێ دەشت و بەردای یێ باژێرێ خۆ بکۆلن، کـو لایێ هنـدەک ژ ڕۆژئاڤا و باکوورێ باژێری بوو، د ناڤبـەرا چیـایێ ئوحودێ و چیـایێ سـەلع دا، و ئاشکەرایە کو لایێن دی یێن باژێری چیـا و بیسـتان بـوون، و لـەشـکەر نەدشیا ب ساناهی ژێ دەرباس ببت.

## کۆلانا خەندەکێ و زێرەڤانییا وێ:

نێزیکی هەیڤـەکێ موسـلمان هـەمی ب کۆلانـا ڤـێ خەنـدەکێ ڤـە موژیـل بوون، و خەندەک نێزیکی پێنج کیلۆمتر و نیڤان یا درێژ بـوو، و فرەهییـا وێ ژ چار مـتران پتر بوو، و کویرتییا وێ ژی ژ سێ متران پتر بوو.

بـەری لەشـکەرێ کـافران بگەهتـە دۆرێـن مـەدینێ، و پشـتی کۆلانـا خەنـدەکێ ب دوومـاهی هـاتـی، پێـغەمبەری -سـلاڤ لـێ بـن- بڕیـار دا زەلامـێن موسـلمان چـەکێ خـۆ هلگـرن، و هـەمی ل بنـارێ لایـێ ڕۆژئاڤـایێ چیایێ (سەلع) کۆم ببن، و هژمـارا وان نێزیکـی سێ هزار زەلامـان بـوو، و هەر ل وێرێ و ل سەر گرەکێ بلند خیڤەتا پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- هاتـە ڤەدان، و ژن و زارۆک ژی هەمی ژ مالان دەرێخسـتن و برنـە (حصنێ بـەنوو

حارثە) ل ڕەخێ بازێڕی؛ دا بێنە پاراستن، و هندەک زەلامێن چەکدار دانانە بەر.

## لەشکەرێ کافران و دۆرپێچکرنا مەدینێ:

ل هەیڤا شەووالێ ژ سالا پێنجێ لەشکەرێ ئویجاخێن عەرەبان ب سەرۆکاتییا قورەیشییان گەهشتە دۆرێن مەدینێ، و هژمارا وان ژ دەهـ هزار کەسان پتر بوو، و دەمێ وان خەندەک ل بەرا خۆ دیتی، خافلەتی ب وان کەفت، ژ بەر کو ئەو بۆ وان بوو (موفاجەئەکا مەزن) بوو، لەو وان گۆت: ئەڤە حیلەیەکە عەرەبان بەری نوکە نەزانیە.. و هندی ئەو هاتنێ کو ب سویاری یان پەیا ژ خەندەکێ دەرباس ببن ئەو نەشیان وێ چەندێ بکەن، لەوا ئەو نەچاربوون خیڤەتگەها لەشکەرێ خۆ ل لایێ ڕۆژئاڤایا خەندەکێ دانا، و وان موسلمان حصار دان.

درۆپێچکرنا کافران بۆ مەدینێ، نێزیکی بیست ڕۆژان ڤەکێشا، و د ڤان ڕۆژان دا ژ بەر کێمبوونا خوارنێ و بەلاڤبوونا ترسێ، تەنگاڤی ل موسلمانان زێدە بوو، و تشتێ تەنگاڤی دژوارتر لێ کری ئەو خەبەر بوو یێ د ناڤ موسلمانان دا بەلاڤبووی کو جوهییێن (بەنوو قورەیضە) ئەوێ تاخێ وان ل تەنشت مەدینێ (د ناڤخۆییا وی جهی دا یێ خەندەک ل دۆر هاتییە کۆلان)، خەبەر بەلاڤبوو کو ئەو جوهی ل موسلمانان قولپینە و دەستێ خۆ ب نک کافران ڤە کێشایە، و وان ل بەرە خیانەتێ بکەن و هاریکارییا کافران دژی موسلمانان بکەن. دەیکا خودان باوەران (ئوم سەلەمە) دبێژت: گەلەک دەم ب سەر مە دا هاتن د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەلێ من نەدیت پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەمەکی هند وەستیا بت و موسلمان هند ترسیا بن وەکی ڕۆژا خەندەکێ. ئەڤە واقعێ مەیدانی یێ موسلمانان بوو، و حالێ دلان.. قورئان بۆ مە بەحس ژێ دکەت، دەمێ

دبێژت: ﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ۝ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ۝ ﴾ (الأحزاب: ١٠-١١) یەعنی: گەلی خودان باوەران هوین ل بیرا خۆ بیننەڤە دەمێ ئەو ژ لایێ د سەر هەوە دا و ژ لایێ د بن هەوە ژی دا هاتین، و دەمێ ژ مەندەهۆشی و حێبەتییان دا چاڤ زل بووین، دەمێ ئەڤ هژمارا مەزن یا لەشکەرێ دوژمنان دیتی دۆر ل وان گرتی، و دل ژ ترسان دا گەهشتینە گەرویێ، و هزرێن خەلەت هەوە ژ خودێ دکرن، یا ژ هەوە ڤە ئەو دینێ خۆ ب سەر نائێخت، ل وی دەمی خودان باوەر هاتنە جەرباندن، و ئەو ب ترسەکا دژوار هاتنە هژاندن.

ڤێجا هوین هزر بکەن ترس دێ یا چەند بت حەتا مرۆڤ پێ بحەسییێت کو نێزیکی دلێ وی ژ گەرویا وی دەرکەڤت؟

ئیمام ئەحمەد ژ ئەبوو سەعیدێ خودری ڤەدگوهێزت دبێژت: هنگی مە گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: دلێن مە ژ ترسان دا یێن گەهشتینە گەرویان، ئەرێ تشتەک هەیە ئەم بێژین؟ وی گۆت: بەلێ، هوین بێژن: (اللهم استر عوراتنا وآمن روعاتنا) یەعنی: یا رەبی تو عەوراتێن مە ستارە کەی و مە ژ ترسان ئێمن بکەی.

و دەمێ خەبەرێ خیانەتا جوهییان بەلاڤبووی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هندەک هەڤالێن خۆ ب لایێ تاخێ وان ڤە هنارتن، دا بەرێ خۆ بدەنێ کانێ چ ڕاستی بۆ ڤی دەنگ و باسی هەیە، و گۆتە وان: ئەگەر ئەو خەبەر یێ ڕاست بت دەمێ هوین دزڤرن هوین وی ئاشکەرا نەبێژن، بەس ئیشارەتەکێ بدەنە من کو ئەز پێ بزانم، و ئەگەر ئەو خەبەر درەو بت، هوین ئاشکەرا د ناڤ خەلکی دا بێژن: ئەو درەوە.

دەمێ ئەو چووینە نک جوهییان، جوهییان خۆ بێ منەت کر و گۆت: راستە ئەم یێ ل پەیمانا خۆ د گەل هەوە لێڤەبووین.. و وان هندەک گۆتنێن سەقەت ژی گۆتن!

ئەو صەحابی زڤرینە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و چوونە دەستی و گۆتن: (عەضەل وەلقارره) و وەکی ئاشکەرا ئەو ناڤێ دو ئویجاخێن عەرەبان بوون یێن بەری هنگی خیانەت ل موسلمانان کرین. پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د مەخسەدا وان گەهشت، بەلێ دا کو مسەلێ ل بەر خەلکی ڤەشێرت، وی گۆت: (الله أكبر) مزگینی ل وە بت گەلی موسلمانان. پاشی ئەو چوو ب خەم ڤە بێنەکێ رازا.. خەلکی گۆت: دیارە خەبەرەکێ نەخۆش ژ جوهییان گەهشتە وی لەو ئەو ب خەم کەفت.

پشتی بیست خەبەران، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- رابووڤە و گۆت: گەلی موسلمانان مزگینی ل وە بت، خودێ دێ هەوە ب سەرئێخت. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- حەجمێ تەنگاڤییێ دزانی، بەلێ باوەرییا وی ب خودێ ژ هندێ مەزنتر بوو کو ئەو بێ هیڤی ببت، یان هەڤسەنگییا خۆ ژ دەست بدەت، ب شارەزاییا خۆ ئەو ل رێکەکێ گەریا دا کو خودان باوەران پێ ژ ڤێ تەنگاڤییێ رزگار بکەت، و ل دووماهییێ ئەو گەهشتە هندێ کو دڤێت ئەو کاری بۆ هندێ بکەن رێزێن کافران ژێکڤەکەن، و دوبەرەکییێ بێخنە چەپەرێ وان، دا وان باوەری ب ئێک و دو نەمینت.

## منافق د چەپەرێ ناڤخۆیێ یێ موسلمانان دا:

پشتی خەبەرێ خیانەتا جوهییێن بەنوو قورەیضە بەلاڤبووی، نەخۆشی و تەنگاڤی ل سەر موسلمانان دژوارتر لێ هات، چونکی جهێ وان د کەفتە وی لایێ یێ موسلمان لێ ژ خەندەکێ، مەعنا هەر جارەکا وان بڤێت ئەو دشێن ژ پشتێ ڤە هێرشێ بدەنە سەر موسلمانان، یان ژی ب هاریکارییا

منافقان رێـكـێ بـۆ كافران خۆش بكەن كو ب لایێ موسلمانان ڤـە بێن.. و ل ڤێرێ دەورێ منافقان ژی یێ خراب دئێتـە پێش، و ژ بـەر دەورێ وان یێ خـراب و ب تـرس ئـەم دبینـین بەحسـێ وان مسـاحەیەكا مـەزن ژ ئایـەتێن سـوورەتا (الأحـزاب) ڤەگرتییـە، سـوورەتا (الأحـزاب) د (٢٨) ئایـەتان دا بەحسێ سەرهاتییا خەندەكێ دكەت، ژ ئایەتا (٩-٢٧)، و (٩) ئایەت ژ وان بەحسێ منافق و دەورێ وانە، یەعنی: نێزیكی سێئێكا ئایەتان، تشتێ هندێ دگەهینت كو كارتێكرنا وان یا مەزن و دژوار بوو.

بـەری لەشـكەرێ كـافران بگەهتـە دۆرێـن مـەدینێ، دەمـێ موسـلمانان خەندەك دكۆلا جارەكێ كۆلانا جهەكی ل بەر صەحابیەكی ئاسێ بوو؛ چونكی كـەڤرەك كەفتـە بـەراهییێ، ئینـا پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- بڤـرێ وی ژێ وەرگرت و ل وی كەڤری دا، و كەڤر شكاند، و دەمـێ وی كـەڤر دشـكاند، وی مزگینی دا صەحابییێن خۆ كو خودێ وەلاتـێ فورسـێ و یـێ رۆمـێ دێ ل بـەر وان ڤەكەت.. و ڤێ مزگینییێ كارتێكرنەكا ئیجابی ل سەر صـەحابییان هەبوو لەو هەر زوی ئێكی ئەڤ مزگینییە دا یێ دی، پاشی دەمێ لەشكەرێ كافران دۆر ل مەدینێ گرتـی، و گـەلەك موسـلمان ب ژن و عـەیال ڤـە ژ مـالێن خـۆ دەركەفتـین، و هندەك ژ وان ماینە ل چۆلـی و هنگی زڤـستان بـوو و سـەرمایا یا زێدە بوو (هەیڤا شوباتا سالا ٦٢٧ ز بوو)، و حصارێ نێزیكـی هەیڤـەكێ ڤەكێشـا حالـێ موسـلمانان زێـدە نـەخۆش بـوو ب تایبـەتی پشـتی جوهییـان دەسـت دایـە خیانەتێ و ئاشكەرا خۆ دایە د گـەل كافـران، و ئێـدی گـەف نـە ب تنێ ژ سنگی ڤـە ژ لایـێ خەندەكێ ڤـە ل موسلمانان دهاتـەكرن، بـەلكی ژ پشـتێ ژی ڤـە ژ لایـێ جوهییـان ڤـە، حـەتا مسـەلە گەهشـتە وێ دەرەجـێ شەڤەكێ پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بن- سـێ جاران گۆتـە صـەحابییان: كـی دێ چت بۆ من بەرێ خۆ دەتە كافران و خەبەرێ ئینـت، رۆژا قیامـەتێ خودێ وی

بدەتە د گەل من؟ کەسێ د خۆ ڕا نەدیت بێژت: ئەز! هەر چەندە خەلات گەلەکێ مەزن ژی بوو، ژ بەر ترسێ و سەرمایا دژوار.. حەتا دووماهییێ وی گۆت: حوذەیفە، تو هەرە بەرێ خۆ بدێ و ئێکا هند نەکە ئەو ب تە بحەسیێن، حوذەیفە دبێژت: پشتی وی ناڤێ من گۆتی چو ڕێ ل بەر من نەمان ئینا ئەز چووم.

د ڤی دەمێ بەرتەنگ دا هەلویستێ منافقان چ بوو؟

بەرسڤ: ل وی دەمی منافق ڕابوونە سەر خۆ، و دەست ب بەلاڤکرنا گۆتگۆتکان کر، دا مەعنەویاتێن موسلمانان بشکێنن، ل سەری وان خۆ ژ ناڤ لەشکەرێ موسلمانان ئەوێ زێرەڤانی ل خەندەکێ دکر ڤەکێشا، و گۆتن: موحەممەدی دگۆتە مە خزینەیێن کیسرا و قەیصەری دێ گەهنە هەوە، و ئێک ژ مە ئەڤرۆ نەوێرت بچتە تارەتێ! و هندەک ژ وان چوونە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتنێ: مالێن مە د بێ خودانن، و ئەم دترسین نەخۆشی بگەهتە عەیالێ مە، لەو دەستویرییێ بدەمە کو ئەم بزڤرینە مالێن خۆ!

و هۆسا، وان ب چەند هێجەتەکێن پویچ و پەلاچە خۆ ژ مەیدانێ ڤەکێشا، و چوون ل نک ژنێن خۆ ڕوینشتن و دەست ب بەلاڤکرنا گۆتگۆتکێن وەسا کر یێن سستییێ دئێخنە ناڤ ڕێزێن موسلمانان. و کارێ مەزنێ وان دڤیا بکەن ئەو بوو وان کار بۆ هندێ کر کو باوەرییێ د ناڤبەرا (قیادێ) و (قاعیدەی) دا نەهێلن، چونکی وان باش دزانی هەر جارەکا خەلکی باوەری ب ڕێبەر و سەرۆکێن خۆ نەما دوژمن دێ شێت ب ساناهی دەستێ خۆ کێشتە ناڤ ڕێزێن وان. و پشتی وان دیتی ڤێ (تەشکیکێ) چو پێڤە نەهات وان دەست دا (تەحریضێ) یەعنی: وان ب نیڤ ئاشکەرایی خودان باوەر سستکرن و ژ وان خواست ئەو بەردەوامییێ نەدەنە کۆلانا

خەندەکێ چونکی ئەو کارەکێ ژ قەستایە، و پشتی وان دیتی خەندەک هاتە کۆلان وان خودان باوەر ژ کارێ بەرەڤانییا ژ مەدینێ سستکرن و گۆتن: ئەڤە کارەکە چو پێڤە نائێت، ڤێ جارێ یا مە خلاس!

### پێغەمبەر.. ڕۆناهییا گەش ل دەمێ تارییێ:

د وێ تەنگاڤییا مەزن دا.. دەمێ عەورێن دوژمنان عسمانێ مەدینێ تاری کری، دەمێ دل ژ ترسان دا هژیاین و موسلمان کەفتینە د ناڤبەرا نال و بزمارا کافرێن عەرەب و جوهییێن خائین دا، د ناڤ ڤێ تارییا دژوار دا ڕۆناهییەکا گەش هەبوو دلێن ڕەجفی ل نک تەنا دبوون، و باوەرییا هاتییە لەقاندن ل نک موکم دبوو، ئەو ژی پێغەمبەرێ خودێ بوو -سلاڤ لێ بن-، ئەو نموونەیێ باش یێ سەرۆک هەردەم دڤێت چاڤ لێ بکەن و مفایی بۆ خۆ ژ هەلویستێن وی وەربگرن:

تشتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک گرنگی دایێ ل دەمێ تەنگاڤییێ بلندکرنا (مەعنەویاتێن موسلمانان) بوو، چ ب دانا مزگینییێ بت بۆ وان کو ئەو دێ سەرکەڤن و دنیا دێ ل بەر وان ڤەبت، چ ب ڤەشارتنا دەنگ و باسێن ب ترس بت ل بەر عامییان دا شکەستن نەکەفتە ڕیزێن وان..

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب خیانەتا جوهییان حسیای، وی سێئێکا لەشکەری، یەعنی: هزار زەلامێن چەکدار هنارتنە وی جهی یێ ژنک و عەیال لێ، چونکی وی (تەوەقوعا) هندێ کر جوهی دەسکاتییێ بۆ کافران بکەن و هندەک ژ وان د لایێ خۆ ڕا دەرباس کەنە مەدینێ، و بێن ژنک و عەیالی بکەنە رەهینە، لەو وی ئەو چەکدار هنارتنە بەر ژن و عەیالی..

ژ لایەکێ دی ڤە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پەیڤا نهێنی دا هەڤالێن خۆ و گۆتێ: دەمێ ب شەڤێ هندەک ژ هەوە بکەڤنە بەرانبەر هندەکان بێژن:

(حم، لا ينصرون) دا ئێک و دو بنیاسن.. و گەلەک جاران پێغەمبەر ب خۆ -سلاڤ لێ بن- ب شەڤێ دەردکەفت و ل سەر لەشکەری دگەڕیا و زێرەڤانی ل خەندەکێ دکر.. و موسلمانان چاڤ ل سەرۆکێ خۆ کر، و ژ هیممەتا وی خۆڕاگر مان، و ڤێ هەمی تەنگاڤییێ باوەرییا وان نەلەقاند: د گەل وێ تەنگاڤییا مەزن یا خودان باوەران دیتی.. د گەل وێ هەمی ترس و برسێ ئەوا هەیڤەکێ چەنگێ خۆ یێ ڕەش ب سەر وان دا گرتی دەلیڤەیەکا ب تنێ ژی باوەرییا وان ب خودێ و ب ڕاستییا سۆز و پەیمانا وی نەلەقیا، نە کافران ب لەشکەرێ خۆ یێ وەکی کڤانی بەراهی ل وان گرتی، و نە منافقان ب بەلبەلە و دیعایەتێن خۆ و گۆتنێن خۆ یێن سەقەت، و نە جوهی شیان باوەرییا وان بهژینن، ڕاستە دبت هندەک جاران مەوقف هند یێ دژوار بت دل ژ بەر بهژیێن بەلێ ئەو دلێ ب دورستی تام کربتە باوەرییێ د چو حالەتان دا ژ باوەرییێ نائێتە شویشتن.

دەمێ خودان باوەران ئەو پارت و کۆم دیتین یێن کو ل دۆر مەدینێ کۆم بووین، بیرا وان هاتەڤە کو دەمێ سەرکەفتنێ یێ نێزیک بووی، لەو وان گۆت: ئەڤەیە یا خودێ و پێغەمبەرێ وی سۆز پێ دایە مە ژ تەنگاڤییێ و سەرکەفتنێ، و خودێ سۆزا خۆ ب جهـ ئینا، و پێغەمبەرێ وی ڕاستی گۆت، و دیتنا وان پارتان ژ باوەرییێ و خۆ تەسلیمکرنا بۆ قەدەرا خودێ پێڤەتر تشتەک ل وان زێدە نەکر.. ئەڤە گۆتنا وان بوو نە وەکی منافقان ئەوێن گۆتین: خودێ و پێغەمبەرێ وی ئەم خاپاندین دەمێ ئەم ب هندەک گۆتنێن خۆش و بێ بنیات قانع کرین!!

و ئەڤە یا غەریب نینە ژ خودان باوەران.. ما ئەو نە هەر ئەون یێن بەری هنگی ڕاستگۆیی د گەل خودێ کری و پەیمانا خۆ ب جهـ ئینای، ل ڕۆژا بەدرێ و ل ڕۆژا ئوحودێ و ل وان هەمی دەمێن ئەو بەرانبەر نەیارێن

خودێ ڕاوەستاین، ڤێجا هندەک ژ وان رحا خۆ گۆری کری و هندەک دچاڤەڕێ ئەو ژی وەکی برایێن خۆ بگەهنە شەهادەتێ؟

ئەڤ تەنگاڤییا ل ڕۆژا خەندەکێ ب سەر خودان باوەران دا هاتی، وەکی هەر تەنگاڤییەکا دی یا ب سەر جڤاکا موسلمانان دا بێت یا بێ حیکمەت نەبوو: ئەوا هە چێبوو دا کو خودێ جزایێ خودان باوەرێن ڕاستگۆ بدەتێ ژ بەر ڕاستگۆییی و صەبرکێشانا وان، و دا خودێ دوڕوویان عەزاب بدەت -ئەگەر وی ڤیا وان عەزاب بدەت- کو بەرێ وان نەدەتە تۆبا دورست بەری مرنێ، حەتا ئەو ل سەر کوفرێ بمرن، و هێژای ئاگری ببن، ئەڤە ئەو حیکمەتە یا گەلەک کەس ژ بیرا خۆ دبەن.

## کارکرنا پێغەمبەرێ ﷺ بۆ ژ بەرکبرنا چەپەرێ کافران:

دەمێ تەنگاڤی زێدە دژواربووی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کار بۆ هندێ کر چەپەرێ کافران ژ بەرک ببەت، و دوبەرەکییێ بێختە ناڤ ڕێزێن وان، و بۆ ب جهئینانا ڤێ ئارمانجێ وی دو ڕێک ب کار ئینان:

### ڕێکا ئێکێ: کڕینا غەطەفانییان:

بەری نوکە مە گۆتبوو: ژ بلی قورەیشییان هندەک ئویجاخێن دی ژی یێن عەرەبان ژ بۆ دۆرپێچکرنا مەدینێ هاتبوون، وەکی ئویجاخا غەطەفانییان، و ژ بەر کو ئارمانجا وان یا سەرەکی ژ ڤی کاری ب دەست ئێخستنا مالی و طەمەعی بوو، نە کو مەرەما سیاسی و عەقائدی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤیا وان ب مالێ دنیایێ بکڕت، و ب ڤێ چەندێ چەپەرێ کافران ژ بەرک ببەت.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دزی ڤە پەیوەندی د گەل دو مەزنێن غەطەفانییان کر، و گۆتە وان: ئەگەر ئەم هندەک بەرهەمێ قسپێن مەدینێ بۆ سالەکێ بدەینە هەوە هوین دێ زڤڕنە ڤە؟ وان گۆت: بەلێ.. هنگی

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتە ب دویڤ وان ڕا، و ئەو ب ڕەنگەکێ ڤەشارتی هاتنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، دا کو دان و ستاندنێ ل دۆر ڤێ مەسەلێ بکەن، پشتی دان و ستاندنێ ئەو ل سەر هندێ پێک هاتن کو سێئێکا بەرهەمێ بیستانێن مەدینێ بۆ دەمێ سالەکێ بۆ وان بت، ب وی شەرتی ئەو پشتەڤانییا قورەیشییان نەکەن، و بزڤڕنە جهێ خۆ. و بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پەیمانێ د گەل وان مۆر بکەت، وی بیر و بۆچوونا مەزنێن مەدینێ وەرگرت، سەعدێ کوڕێ موعاذی و سەعدێ کوڕێ عوبادەیی -کو دو مەزنێن خەلکێ مەدینێ بوون- گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەڤە کارەکە تو دێ ژ بەر مە کەی دا مە ژ تەنگاڤییێ خلاص بکەی، یان ئەو فەرمانەکە کو خودێ ل تە کری مە بڤێت نەڤێت دێ کەین؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: نەخێر! ئەو کارەکێ ئەز دێ بۆ هەوە کەم، و من ژ بەر هندێیە چونکی ئەز دبینم عەرەبان ژ هەمی لایان ڤە ب سەر هەوە دا گرتییە، ڤێجا من دڤێت چەپەرێ وان بشکێنم.

هنگی مەزنێن ئەنصارییان گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، دەمێ ئەم و ئەڤە ل سەر شرکێ وان د خۆ ڕا نەددیت قسپەکا مە بخۆن ئەگەر ب مێڤانداری نەبا، ڤێجا پشتی خودێ ئەم ب ئیسلامێ سەرفەراز کرین ژ نوی ئەم دێ مالێ خۆ دەینە وان؟! مە هەوجەیی ب ڤێ چەندێ نینە، شیر د ناڤبەرا مە و وان دا هەیە حەتا خودێ حوکمی د ناڤبەرا مە و وان دا بکەت. ب ڤێ چەندێ وان ئەو ڕێککەفتن قەبویل نەکر، و مەزنێن غەطەفانییان زڤڕینە وی جهێ ئەو ژێ هاتین.

**ڕێکا دویێ: فێلەکا لەشکەری:**

ل وی دەمێ موسلمان ل ژێر حصارێ زەلامەکێ پێشکێش ژ ئویجاخا (غەطەفانییان) ئەوێ دگۆتنێ: (نوعەیمێ کوڕێ مەسعوودی) هاتە

مـەدینـێ.. و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو ئەو موسلمان بوو.. بـەلێ! ل وی دەمێ منافقان حـەز دکـر کـو ئـەو ژ دەرڤـەی مـەدینێ بانە؛ دا ئەو ژ موسلمانان ددویر بان، دەستێ قودرەتێ هندەک مرۆڤ بەر ب مـەدینێ ڤـە پالدان دا ب وان قەلەمی ب وێ قەدەرێ بگێرت یا د علمێ خودێ دا هەی، (نـوعـەیـم) ئـەوێ د نـاڤ ئویجاخا خۆ دا ئەوا ل نەجدێ دویـر ژ حیجازێ د بەرفەرهییێ دا دژیا، هات و قەستا مـەدینێ کر و ب چ حالـێ هەی شیا خـۆ بگەهینتـە نـک پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- و ل سـەر دەسـتێ وی موسـلمان بـوو، و گـۆتێ: ئـەی پێغەمبـەرێ خـودێ، هێشـتا کـەس ب موسلمانەتییا من نەحەسیایە، بێژە مـن کانێ تـە چ دڤێت ئەز دێ بـۆ تـە کەم؟

پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بن- گۆتێ: تو ئێک ژ مەیی، ئەگەر تو بشێی نـەیارێن مـە لێـک بێخـی و دوبـەرەکیێ بێخییـە نـاڤ رێـزێن وان وە بکـە.. چونکی شەڕ فێل و (خدعە)یە.

نوعەیمی زانی مەخسەدا پێغەمبەری چیە لەو گۆتێ: باشە[1].

د ریوایەتـەکا دی دا هاتییـە کـو (نوعـەیم) موسـلمان نـەبوو، و ئـەو مرۆڤەکێ قسە ڤەگوهێز بوو، ئاخفتن ڤەدگوهاستن، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ چەندە ژ وی دزانی، لەو جارەکێ ل نک وی گۆت: جوهییان هنارتە نـک مـن کـو ئەگـەر تـو حـەز بکـەی ئـەم دێ هنـدەک زەلامـێن قورەیشـی و غەطـەفانییان وەک گـەرەو گـرین، پاشـی ئـەم دێ وان دەینـە تـە و تـو وان بکـوژە.. و مەخسـەدا پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- ئـەو بـوو (نوعـەیم) ڤـێ گۆتنێ بۆ غەطـەفانی و قورەیشـییان ڤـەگوهێزت، دا وان بـاوەری ب جوهییـان نەمینت، و ب ڤێ چەندێ چەپەرێ وان ژێکڤە ببت، و گاڤا نوعـەیم چووی دا

(١) ئبن ئیسحاق ڤێ چەندێ (بێ سەنەد) د سیرەتێ دا ڤەدگێرت.

خەبەری ڤەگوهێزت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە هەڤالێن خۆ: (الحرب خدعة) شەڕ فێل و خاپاندنە[1].

هەر چاوا بت، یا ناڤدار د کتێبێن سیرەتێ دا ئەوە دبێژن: نوعەیم ئێکەمین جار چوو نک جوهییێن (بەنوو قورەیضە) ئەوێن خیانەت کری، و گۆتە وان: هوین باش من دنیاسن، و هوین دزانن ئەز د ناڤ ئویجاخا خۆ دا چەندم، و د کەڤن دا ئەز هەڤالێ هەوە بوویمە و من خێرا هەوە ڤیایە.. وان گۆتێ: تو ڕاست دبێژی، نوعەیمی گۆت: گوهێ خۆ بدەنە من، هوین نە وەکی قوریشی و غەطەفانیانە، هوین یێ ل مەدینێ، سوباهی ئەگەر عەقلێ وان بڕی ئەو دێ زڤڕنە جهێ خۆ و دێ هەوە هێلنە د دەستێن موحەممەدی دا، و ئەو دێ هەوە هەمییان کوژت.. وان گۆت: ب خودێ تو ڕاست دبێژی پا چارە چیە؟ نوعەیمی گۆت: ئەز دێ بۆ هەوە ڕێکەکێ بێژم، جابێ بدەنە قوریشی و غەطەفانییان بلا ئەو چەند زەلامەکێن ماقویل ژ خۆ بدەنە ف هەوە، و هوین وان بکەنە گەرەو، دا ئەو سوباهی نەچن و هەوە بهێلنە د دەستێ موحەممەدی دا. وان گۆت: ئەڤە خۆش ڕێکە.

پاشی نوعەیم هات چوو نک قورەیشی وغەطەفانییان و گۆتێ: ئەز ئێک ژ هەوەمە و من خێرا هەوە دڤێت، وان گۆت: ئەم باوەر دکەین، وی گۆتێ: من زانییە جوهی دپەشێمانن کو بووینە هەڤالێن هەوە، و وان یێن گۆتینە موحەممەدی ئەگەر تو ل مە ببۆری ئەم دێ هندەک مەزنێن قورەیشی و غەطەفانییان بۆ تە ئینین دا تو وان بکوژی، ڤێجا هشیاری خۆ بن چو زەلامێن خۆ نەدەنە ف وان..

پاشی نوعەیم زڤڕی نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەو مانە ل هیڤییا بەرهەمێ ڤی کارێ خۆ، ڤی کاری دوبەرەکییەکا مەزن ئێخستە

---

(١) بەیهەقی ڤێ ریوایەتێ ڤەدگێڕت، بەلێ سەنەدا وێ یا ضەعیفە.

ڕێـزێـن کافران، و `مسـەلە گەهانـدە هنـدێ وان بـاوەری ب ئێـک و دو نـەما، ب تایبەتی پشتی حصـار درێژبووی و کافران بڕیار دای ب چی ڕەنگێ هـەبت ئەو هێرشێ بکەنە سـەر مـەدینێ، ڤێجا وان جاب دا جوهییـان کـو کـارێ خۆ بکەن سوباهی ئەم دێ دەست ب شەڕی کەین، ڤێجا هوین ژی ژ لایێ خۆ ڤـە هێرشێ بکەنە سەر موسلمانان و وان موژیل بکـەن؛ دا ئـەم بشـێین ڕێکا خۆ ڤەکـەین و ژ خەنـدەکێ دەربـاس ببـین.. جوهییـان بەرسـڤا وان دا: سـوباهی شەنبییە ئەم چو شەڕان ناکەین، پشتی هنگی باوەریا مە ب هـەوە نائێـت کـی نـابێژت هـویـن دێ ڕەڤـن و مـە هێلنـە د دەسـتێ موحەممـەدی دا؟ هنـدەک زەلامێن خۆ یێن ماقویل بدەنە ف مە رەهینە دا باوەرییا مە ب هەوە بێت.

کـافران گـۆت: ب خـودێ ئەڤـە ئـەوە یـا نوعـەیمی گـۆتی، و ئـەو یـێن لێڤەبووین.

پشتی چەپەرێ کافران بوویە دو پارچە و پلانـا وان د هێرشکرنا ل سـەر مەدینێ فاشل بووی، و حصارا وان درێژ بـووی مـەلـەل بـۆ وان چێبـوو، و ئـەو بـێ هیڤـی بـوون بشـێن خەنـدەکێ دەربـاس بکـەن، وان هـزر د زڤڕینـێ دا کـر، نەخاسم ڕۆژەکێ وان هند دیت هڕەبایەکێ دژوار ڕابوو خیڤـەتێن وان فڕانـدن و ئاگرێن وان ڤەمراندن و ئامـانێن وان دەرنشـیف کـرن و سڕەکا مـەزن ئێخسـتە هناڤێن وان، ئینا ئـەو ب دو ڕوییێن ڕەش ڤـە زڤـڕین و هـەر ئێـک چـوو جهـێ خۆ. و قورئان ئیشارەتێ ددەتە ڤێ چەندێ دەمێ دبێژت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ۞ ﴾ (الأحـزاب: ٩). خـودێ پـارتێن کـوفرێ شەرمزار و دل ب کیـن ژ مەدینێ ڤەگەڕاندن، نە چو خێـرێن دنیـایێ و نـە چـو خێرێن ئاخرەتێ ب دەست وان نەکەفتـن، و خـودێ ئـەو ئەگـەر پەیدا کـرن یـێن شـەڕی ژ خـودان بـاوەران پاشڤەدبـەن. و تشـتێ د ڤـی شـەڕی دا چێبـووی

ب تنێ ئەو بوو هندەک شەڕ ب هاڤێتنا تیران د سەر خەندەکێ ڕا د ناڤبەرا موسلمان و کافران دا چێبوو، و د ئەنجام دا هندەک مرۆڤ بریندار بوون، و ئێک ژ وان سەعدێ کوڕێ موعاذی بوو مەزنێ ئەوسییان ئەوێ پشتی هنگی ژ بەر برینا خۆ مری.

# هندەك سەرهاتييێن دى

# يێن سالا پێنجێ

### ل تاخێ بەنوو قورەيضە:

پشتی ئەو ب سەر كافران دا هاتی یا ب سەر دا هاتی، وان ب لەز و بەز خۆ لێكدا، و ڤەگەڕیانە جهێن خۆ، و موسلمان ژی ڤەگەڕیانە ناڤ باژێری، و ژن و عەیال زڤڕاندە مالێن وان، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چەكێ خۆ دانا، هنگی جبریل -سلاڤ لێ بن- ب وەحییێ ڤە هاتە نك پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، تە كارێ خۆ یێ شەڕی دانایە؟ وی گۆت: بەلێ. جبریلی -سلاڤ لێ بن- گۆت: پانێ مە ملیاكەتان هێشتا كارێ خۆ نەدانایە، ڕابە كارێ شەڕی بكەڤە، خودێ فەرمانێ ل تە دكەت كو تو بچیە تاخێ (بەنوو قورەیضە)، ئەڤە ئەز چووم دێ عەردی ل بن پییێن وان هژینم.

ئەو ڕۆژ ڕۆژا بیست و سێیێ بوو ژ هەیڤا (ذولقەعدە) ژ سالا پێنجێ، و دەم پشتی نیڤرۆ بوو، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاگەهداریا صەحابییان كر كو خودێ فەرمان ل وی كرییە ئەو بچتە جوهییێن بەنوو قورەیضە ئەوێن ل دەمێ حیصاردانا كافران بۆ مەدینێ خیانەت كری، و جزایێ خیانەتا وان بدەتێ، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە صەحابییان: نڤێژا خۆ یا ئێڤاری ل تاخێ بەنوو قورەیضە بكەن.

بەری ڕۆژ ئاڤا ببت، سەرپەشكێن لەشكەرێ موسلمانان گەهشتنە تاخێ جوهییان، د ڤێ دەركەفتنێ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەلییێ كوڕێ ئەبوو طالبی كربوو سەرلەشكەر، و ئالایێ خۆ كربوو د دەستان دا، و

عەلی بەری پێغەمبەری گەهشتە دەور و بەرێن حصنێ جوهییان، گاڤا جوهییان ئەو دیتی، وان زانی ئەڤە موسلمان هاتنە وان دا جزایێ وان بدەنێ سەرا خیانەتا وان، لەو ئەو هەمی چوونە د حصنێ خۆ ڤە، و دەرگەهـ دائێخست. وان هزر کر جهێ وان یێ ئاسێ دێ وان پارێزت، لەو وان خۆ بێ منەت کر و هندەگ گۆتنێن سەقەت گۆتنە موسلمانان، و ئەزمان درێژی د دەر حەقا پێغەمبەری و ناموسا وی دا کرن.

لەشکەرێ موسلمانان ژ سێ هزار کەسان پێک دهات، و وان نێزیکی بیست و پێنج رۆژان تاخێ جوهییان دۆرپێچ کر، و پشتی تەنگاڤی ل جوهییان دژواربووی، و وان زانی کەسەک نینە د هەوارا وان بێت، ئەو نەچاربوون بۆ خۆ ل رێکەکێ بگەرێین، دا خۆ رزگار بکەن.

مەزنێ وان کەعبێ کورێ ئەسەدی سەر و گرگرێن وان کۆمکرن، و گۆتە وان: هوین دزانن رۆژ بۆ رۆژێ تەنگاڤی یا ل مە زێدە دبت، ئەز دێ سێ رێکان دانمە بەر هەوە هوین ئێکێ بۆ خۆ هلبژێرن: هەوە دڤێت ئەم دێ باوەرییێ ب موحەممەدی ئینین؛ چونکی هوین باش دزانن کو ئەو پێغەمبەرە، وب ڤێ چەندێ ئەم دێ خۆ ژ کوشتنێ رزگار کەین. وان گۆت: ئەم قەت باوەرییێ ب وی نائینین، و تەوراتا خۆ ناهێلین.

کەعبی گۆت: باشە، ئەم دێ ژن و زارۆکێن خۆ هەمییان کوژین، دا ئەو نەکەڤنە دەستێ موحەممەدی، و دێ دەست ب شەرێ وی کەین، چ بۆ مە چ بۆ وی. وان گۆت: چاوا ڤان هەژاران بکوژین، ما پشتی وان چ خێر د ژیانێ دا هەیە؟

وی گۆت: مادەم هوین ب ڤێ ژی رازی نابن، ئەڤ شەڤە شەڤا شەنبییێیە، موسلمان ژ مە دئەمینن کو ئەم چو ناکەین، رابن دا ب خافلەتی ڤە هێرشێ بدەینە سەر موسلمانان. وان گۆت: ئەم شەنبییێ خراب ناکەین،

خودێ دێ غەزەبێ ل مە کەت! هنگی کەعبی ب خەم ڤە گۆتە وان: زەلامەکێ کرنێ د ناڤ هەوە دا نینە!

ڕۆژەکێ عەلی ب سویاری ژ ناڤ لەشکەری دەرکەفت و زوبەیرێ کوڕێ عەووامی د گەل دا بوو، و وی ب دەنگەکێ بلند گازی کر: ب خودێ ئەڤرۆ یان ئەز دێ وێ کەم یا حەمزەی کری، یان دێ ب سەر وان دا گرم.. جوهییان گوهـ ل دەنگێ وی بوو، ترسەکا مەزن کەفتە دلێن وان، لەو هەر زوی وان کەسەک هنارتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ئەی موحەممەد، مە قەبویلە سەعدێ کوڕێ موعاذی بێت و حوکمی د ناڤبەرا مە و تە دا بکەت.

سەعد مەزنێ ئەوسییان بوو، و ئەو بەری هنگی حەلیفێ بەنوو قورەیضییان بوو، وان هزر کر دلێ سەعدی دێ مینتە ب وان ڤە، و وان ژ بیر کر کانێ چەند خیانەتەکا مەزن وان ل موسلمانان کربوو ل دەمەکێ زێدە تەنگاڤ، و سەعد ل دەمێ حیصارا کافران بۆ مەدینێ برینداربووبوو، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خیڤەتەک ل مزگەفتا مەدینێ بۆ وی ڤەدابوو و ئەو ل وێرێ دهاتە دەرمانکرن، دەمێ جوهییان گۆتی: ئەم ب حوکمێ سەعدی درازینە. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتە ب دویڤ سەعدی ڕا؛ دا بێت و حوکمێ خۆ بدەت. وان سەعد ل دەوارەکێ سویار کر و ئینا تاخێ جوهییان، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخواز ژ سەعدی کر ئەو حوکمێ خۆ بدەت. سەعدی گۆت: حوکمێ من ئەوە زەلامێن شەڕکەر بکوژن، و یێن دی ئێخسیر بکەن، و مالێ وان لێکڤە کەن.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: تە ب حوکمێ خودێ د گەل وان کر.

ل دویڤ ڤی حوکمی یێ جوهی ب خۆ پێ رازی بووین، چارسەد زەلام ژ جوهییان هاتنە کوشتن، و مالێ وان وەک دەسکەفتی ل سەر موسلمانان

هاتە لێکڤەکرن، و ب ڤێ چەندێ بازێرێ مەدینێ ژ جوهییان هاتە پاقژکرن، و ئێدی چو تاخێن جوهییان ل مەدینێ نەمان.

و ژ قەدەرا خودێ ئەو بوو، بەری موسلمان حیصارێ بدانە سەر تاخێ بەنوو قورەیضە مەزنێ جوهییێن بەنوو نەضیرییان حویەیێ کورێ ئەخطەبی کو هنگی ل خەیبەرێ بوو، و وی دەورەکێ مەزن د ئازراندنا کافرێن عەرەب دا هەبوو، و ئینانا وان بۆ حیصاردانا مەدینێ، ئەڤ سەرێ فتنێ و کوفرێ بەری حیصاردانا تاخێ بەنوو قورەیضە هاتە نک هەڤالێ خۆ کەعبێ کورێ ئەسەدی ل تاخێ قورەیضییان، و دەمێ موسلمانان ئەڤ تاخە حیصار دای ئەو ژی ل وێری بوو، لەو وی ژی جزایێ خیانەتا خۆ وەرگرت، و ئەو ژی د گەل قورەیضییان هاتە کوشتن.

## مرنا سەعدێ کورێ موعاذێ:

دەمێ سەعدێ کورێ موعاذێ ئەوسی ل رۆژا (خەندەکێ) برینداربووی، وی دوعایەک ژ خودێ کر کو وی نەمرینت حەتا ئەو ب چاڤێن خۆ ببینت دەمێ جوهییێن بەنوو قورەیضە سەرا خیانەتا وان رووی رەش دبن.. و خودێ ئەڤ دوعایا وی بۆ ب جهئینا، و وەسا حەز کر جوهییان ب خۆ ستوییێ خۆ دا بەر شیرێ سەعدی، و ب حوکمێ وی رازیبوون.

پشتی موسلمان ژ سوحبەتا جوهییێن قورەیضی خلاصبووین، و سەعد زڤرییە بن وێ خیڤەتێ یا ل مزگەفتێ بۆ وی هاتییە ڤەدان، دا ل بن وێ بێتە دەرمانکرن، وی دوعایەکا دی بۆ خۆ ژ خودێ کر و گۆت: ئەی خودا، ئەگەر تو بزانی شەرەکێ دی د ناڤبەرا مە و قورەیشییان دا دێ ئێتەکرن، تو من بهێلە زێندی، و ئەگەر تو بزانی چو شەرێن دی د ناڤبەرا مە و وان دا نەماینە تو من ب ڤێ برینێ بمرینە. دبێژن: ل وێ رۆژێ دەرێ برینا وی ڤەبوو و خوینێ تێ هاڤێت حەتا ئەو پێ مری.

و دەمێ ئەو مری پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ((اهتز عرش الرحمن لموت سعد بن معاذ)) یەعنی: عەرشێ خودێ ژ بەر مرنا سەعدی هژیا.

## مارەکرنا رەملایا کچا ئەبوو سوفیانێ:

رەملایا کچا ئەبوو سوفیانی، ئەوا ب ناسناڤێ (أم حبيبة) دئێتە نیاسین، ئێک ژ موسلمانێن دەسپێکێ بوو، د گەل زەلامێ خۆ عەبدللاهێ کورێ جەحشی ب مشەختی چوو بوو حەبەشە، و زەلامێ وێ ل وێرێ مربوو، دەمێ ئەو ل حەبەشە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو مارەکر و نەجاشی پێش وی ڤە ب ڤی کاری رابوو و پسمامێ رەملایێ خالدێ کورێ سەعیدی پێش وێ ڤە ب مارەکرنێ رابوو، و پشتی هنگی نەجاشی ئەو هنارتە مەدینێ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ڤەگوهاست.

هندەک زانایێن سیرەتێ ل وێ باوەرێنە کو مارەکرن و ڤەگوهاستنا وێ ل سالا شەشێ بوو، و هندەک دبێژن: ل سالا حەفتێ، بەلێ (ئبن کەثیر) ئەو د سەرهاتییێن سالا پێنجێ دا ئینایە، و هزرا وی پتر بۆ هندێ دچت کو ئەو ل ڤێ سالێ بوویە.

(ئوم حەبیبە) پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مابوو زێندی، و ئەو ل سەر دەمێ خیلافەتا برایێ خۆ موعاویەی مربوو.

## مارەکرنا زەینەبا کچا جەحشێ:

زەینەبا کچا جەحشێ کورێ رئابێ ئەسەدی یێ قورەیشی، دەیکا وێ مەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئومەیمەیا کچا عەبدلموطەلبی بوو، گەلەک زانایێن سیرەتێ ل وێ باوەرێنە کو دیرۆکا ڤەگوهاستنا وێ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل هەیڤا (ذولقەعدە) بوو ژ سالا پێنجێ، پشتی سەرهاتییا جوهییێن بەنوو قورەیضە، و ئبن کەثیر ڤێ گۆتنێ دورستتر دبینت،

و مەسەلا مارەکرنا زەینەبێ د سوورەتا (الأحزاب) دا هاتییە، ئەو سوورەتا بەحسێ سەرهاتییا خەندەکێ و بەنوو قورەیضە تێدا هاتی.

بەری زەینەب شوی ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت وێ شوی ب زەیدێ کورێ حارثەیی کربوو، ئەوێ دگۆتنێ: زەیدێ کورێ موحەممەدی، ژ بەر کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ب خودان کربوو، و بەری ئیسلامێ (تەبەنییا) وی کربوو، و ئەو وەک کورێ بۆ خۆ حسێب کربوو، و ئێک ژ وان عەدەتێن عەرەبان وەک شریعەت بۆ خۆ دزانی و کار پێ دکر ئەو بوو چێ نەدبوو زەلام ژنا کورێ خۆ یێ (تەبەنییێ) پشتی وی مارە بکەت، چونکی ئەو حسێب دبوو بویکا وی.

ل دەسپێکا ئیسلامێ و حەتا سالا پێنجێ مشەختی، موسلمانان ژی کار ب ڤی عەدەتی دکر، پاشی هندەک ئایەت هاتنە خوارێ و عەدەتێ (تەبەنییێ) ڕاکر، و ل سەر بناخەیێ ڤی حوکمێ نوی بۆ زەلامی دورست بوو کو ژنا کورێ خۆ یێ (تەبەنییێ) مارە بکەت؛ چونکی ئەو ب دورستی نە کورێ مرۆڤییە، و ژنا وی ژی نە بویکا مرۆڤییە. و فەرمانا مارەکرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ زەینەبێ ژ لایێ خودێ ڤە د قورئانێ دا هات، ئایەت دبێژت: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْاْ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ ﴾ (الأحزاب: ٣٧).

و زەینەبێ شانازی ب ڤێ چەندێ دکر بەرانبەر هەوییێن خۆ یێن دی و گۆتە وان: هەر ئێک ژ هەوە وەلییێ وێ ئەو یا دایە شوی ئەز تێ نەبم، خودێ ل عەسمانی ئەز دامە شوی! وەکی بوخاری ژ ئەنەسی ڤەدگوهێزت. و پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زەینەب ئێکەمین کابانییا وی بوو مری،

و مرنا وێ ل سالا بیستێ مشەختێ بوو، ل سەر دەمێ خیلافەتا عومەری، و عومەری نڤێژ لێ کربوو، و ئەو ل بەقیعێ هاتبوو ڤەشارتن.

**هاتنەخوارا ئایەتا حیجابێ بۆ ژنێن پێغەمبەری**:

ل رۆژا دویێ ژ ڤەگوهاستنا زەینەبێ ئەو ئایەتا قورئانێ هاتە خوارێ ئەوا ب ناڤێ ئایەتا حیجابێ هاتییە نیاسین، کو ئایەتا (٣٥)یە ژ سوورەتا (الأحزاب) ئەوا تێدا هاتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُوا۟ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ۖ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ ﴾ یەعنی: ئەی گەلی ئەوێن باوەری ئینای، هوین نەچنە د مالێن پێغەمبەری ڤە وەسا تێ نەبت ئەو دەستویرییێ بۆ خوارنەکێ بدەتە هەوە، بێی هوین خۆ ل لێنانا وێ خوارنێ بگرن، بەلێ ئەگەر هوین هاتنە گازیکرن هەرنە ژۆر، و ئەگەر هەوە خوارن خوار دەرکەڤن و خۆ ل هیڤییا سوحبەتێ نەگرن؛ چونکی مانا هەوە پێغەمبەری دئێشینت، و ئەو شەرم دکەت هەوە دەربێخت، و خودێ ژ دیارکرنا راستییێ شەرم ناکەت. و ئەگەر هەوە پسیارا تشتەکی ژ ژنکێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر **هوین ل پشت پەردەیەکی پسیارێ ژێ بکەن**؛ چونکی ئەو بۆ دلێن هەوە و بۆ دلێن وان ژی پاقژترە ژ وان هزرێن دکەڤنە سەر دلێن ژن و زەلامان؛ و چونکی دیتن دبتە دەرگەهێ فتنێ، و نابت بۆ هەوە کو هوین پێغەمبەرێ خودێ بێشینن، یان ژنێن وی پشتی مرنا وی مارە بکەن قەت و قەت؛ چونکی ئەو دەیکێن هەوەنە، هندی ئێشاندنا هەوەیە بۆ پێغەمبەری و مارەکرنا ژنێن وی پشتی وی ل نک خودێ گونەهەکا مەزنە.

# سالا شەشێ مشەختی

بەری نوکە د سەرهاتیێین سالا چارێ مشەختی دا، مە بەحسێ غەزایا (بەنوو لحیان) کریوو، و ل وێرێ مە گۆتبوو کو هندەک زانایێن سیرەتێ ل وێ باوەرێنە کو ئەڤ غەزایە ل هەیڤا رەبیعولئەووەلا سالا شەشێ چێبووبوو، لەوا ئەو بەحسێ ڤێ غەزایێ د ناڤ سەرهاتیێین ڤێ سالێ دا ڤەدگێرن.

هەر وەسا غەزایا (بەنوو موصطەلق) ژی ئەوا مە بەحسێ وێ د ناڤ سەرهاتیێین سالا پێنجێ دا ڤەگێرای، هندەک زانا ل وێ باوەرێنە کو ئەو ل ڤێ سالێ چێبووبوو.

ژ بلی ڤان هەردو غەزایان، هندەک سەرهاتیێین دی ل ڤێ سالێ چێبووبوون، ل ڤێرێ ئەم دێ بەحسێ هندەک ژ وان کەین.

**غەزایا ذوقەرەد:**

یان غەزایا (الغابة) وەکی هندەک جاران دبێژنێ، ئەڤە ل هەیڤا رەبیعولئەووەلا ڤێ سالێ چێبووبوو، و ئەگەرا وێ ئەو بوو عویەینەیێ کورێ حصنێ فەزاری د گەل هندەک سویارێن غەطەفانی هێرش کرە سەر هندەک حێشترێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل جهەکی دبێژنێ: غابە، ل نێزیکی مەدینێ، و برن، پشتی شڤانێ وان کوشتی، هنگی موسلمان د هەوارێ دەرکەفتن، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل پێنجسەد زەلامان ب دویڤ وان دا چوو، حەتا گەهشتینە جهەکێ دبێژنێ: ذوقەرەد، ل باشوورێ مەدینێ، و ئەو شەڤەک و ڕۆژەکێ مانە ل وێرێ، پاشی زڤڕینە ڤە بێی شەڕەک چێ ببت.

**ڕێککەفتنا حودەیبییێ:**

ئەڤ ڕێککەفتنە ناڤدارترین سەرهاتییێن سالا شەشێ مشەختینە، و بەحسێ وێ د هندەک ئایەتێن قورئانێ دا ژ سوورەتا (الفتح) هاتییە، و خودێ ناڤێ وێ کرە (الفتح المبين - ڤەکرنا ئاشکەرا) ژ بەر وێ سەرکەفتنا مەزن یا پێڤە هاتی، وەکی دێ بۆ مە ئاشکەرا بت. و ئەڤ ڕێککەفتنە د بنیات دا ئەنجامێ دەرکەفتنا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی بۆ مەکەهێ بۆ کرنا عومرێ، و ئەگەرا ڤێ دەرکەفتنێ خەونەک بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیتی کو ئەو و صەحابییێن وی ب جلکێن ئیحرامان چوونە مەکەهێ بۆ کرنا عومرێ، و خەونێن پێغەمبەران وەحینە، لەو کەیفا صەحابییان گەلەک ب ڤێ چەندێ هات، و وان مزگینی دا ئێک و دو کو ل نێزیک ئەو دێ د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چنە مەکەهێ.

**دەرکەفتن بۆ عومرێ:**

ل ڕۆژا دوشەنبێ ئێکی هەیڤا ذولقەعدە ژ سالا شەشێ مشەختی (ئادار سالا ٦٢٨ ز) پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هزار و چارسەد کەسان ژ مەدینێ دەرکەفت و بەر ب مەکەهێ ڤە چوو، ب نیەتا کرنا عومرێ، و بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەرکەفت وی د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ کر کو ئەو ب جلکێن ئیحرامان دێ چن، و نیەتا وان کرنا عومرێیە و وان چو شەڕ ل بەر نینن، و ئارمانجا وی ب ڤێ چەندێ ئەو بوو د ناڤ عەرەبان دا هەمییان بەلاڤ ببت کو موسلمان دێ چنە عومرێ، دا ئەگەر سویاهی قورەیشییان ڕێ ل وان گرت، قورەیشی د چاڤێن عەرەبان دا بشکێن؛ چونکی عەرەبان هەمییان دزانی کو کەعبە ملکێ قورەیشییان ب تنێ نینە، بەلکی ئەو ملکێ هەمی عەرەبانە؛ چونکی ئەو میراتێ باپیرێ وان ئیسماعیلییە.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەمێ ژ مەدینێ دەرکەفتی، وی (نومەیلەیێ کورێ عەبدللاهێ لەیثی) ل شوینا خۆ هێلا، و دەمێ گەهشتییە دەڤەرا (ذولحولەیفە) ئەوا دکەفتە باشوورێ مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب نێزیکی (١٢) کیلۆمتران، کو میقاتێ خەلکێ مەدینێیە، یەعنی: ئەو جهە یێ خەلکێ مەدینێ جلکێن ئیحرامان لێ دکەنە بەر خۆ دەمێ وان دڤێت بچنە حەجێ یان عومرێ، ل وی جهی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی ئیحرام کرنە بەر خۆ و ئنیەتا عومرێ ئینا، و قوربانێن خۆ (کو حێشتر بوون) نیشانکرن و د گەل خۆ برن، و بەری ئەو بدەنە رێ و بەر ب مەکەهێ ڤە بچن، عومەری گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: چاوا تو دێ بێ چەک چییە ناڤ هندەک کەسان ئەو شەرکەر و دوژمنێن تەنە؟ هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتە مەدینێ کو هندەک چەک و سیلاحی بارکەن و ب دویڤ وان دا بهنێرن.

هەر وەسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرییەکا لەشکەری ب سەرۆکاتییا بشرێ کورێ سوفیانێ خوزاعی بەری خۆ هنارت؛ دا رێکێ بۆ وی تەئمین بکەت، و ئەگەر تشتەکێ نەچاڤەرێکری چێبوو ئەو جابەکێ بدەنە موسلمانان.

**د ناڤبەرا عوسفان و حودەیبییێ دا:**

موسلمانان دا رێ حەتا گەهشتینە دەڤەرا عوسفانێ ل باکوورێ مەکەهێ، ل وێرێ بشرێ کورێ سوفیانێ خوزاعی گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: قورەیشییان ب هاتنا تە زانییە، و وان سۆز دایە خۆ بدەنە کوشتن و نەهێلن تو بچیە مەکەهێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: وەی بۆ قورەیشییان! شەرێ سەرێ وان خوارییە، ما دێ چ ل وان ئێت ئەگەر ئەو رێکێ د ناڤبەرا من و خەلکی دا ڤەکەن؟ ئەگەر ئەو شیانە من ئەو دێ چێ

بت یا قورەیشییان دڤێت، و ئەگەر ئەز شیامە وان ئەو دێ ئێنە د ئیسلامێ دا و چو ژ وان کێم نابت..

پاشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دان و ستاندن د گەل صەحابییێن خۆ کر کانێ ئەو چ بکەن؟ و دووماهییێ ئەو ل سەر هندێ پێکهاتن کو ئەو ڕوی ب ڕوی لەشکەرێ قورەیشییان نەبن، ئەوێ ب سەرۆکاتییا خالدێ کوڕێ وەلیدی هاتی دا ڕێکێ ل موسلمانان بگرن، و گۆتن: ئەم دێ ڕێکا خۆ گوهۆڕین، و د لایەکێ دی ڕا چینە مەکەهێ.

و وەسا چێبوو.. موسلمانان ڕێکا خۆ گوهاڕت، و د ڕێکەکا نەخۆش و سەخت ڕا دەرباس بوون، و قورەیشییان هند دیت موسلمان گەهشتنە حودەیبییێ ل نێزیکی حەرەما مەکەهێ، و کافران ئەڤ چەندە وەک گەفەکا مەزن بۆ مەکەهێ دیت، و ل حودەیبییێ حێشترا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نیخییا و پێشڤە نەچوو، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابییێن خۆ تێگەهاندن کو ئەو تشتێ حێشترا وی ڕاوەستاندی ئەوە یێ فیل ڕاوەستاندی. یەعنی: قەدەرا خودێ بوو ئەوا ڤیای حەرەما مەکەهێ پاراستی بمینت.

پاشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سویند خوار کو ئەگەر قورەیشی ڕێکەکێ ل بەر وی بدانن و پاراستنا حورمەتا مەکەهێ تێدا بت ئەو دێ ڕازی بت.

## دان و ستاندن د ناڤبەرا پێغەمبەری و قورەیشییان دا:

دەمێ موسلمان ل حودەیبییێ پتر ژ جارەکێ قاصد د ناڤبەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و قورەیشییان دا هاتن و چوون، قورەیشییان دڤیا گەفێ ل موسلمانان بکەن، کو قەت چێ نابت ئەو بێنە د مەکەهێ دا، ئەگەر خۆ ئنیەتا وان عومرە ژی بت، بەلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ڕەنگەکێ

رحـەت ئـەو تێگەهاندن کـو مـە شەڕ نەڤێت، بەلکی مە دڤێت حەقەکی ژ حـەقێن خـۆ ب کـار بینـین کـو سـەرەدانا کەعبێیـە، و ئەڤـە حـەقێ هـەر کسـەکییە، و تشـتێ پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بن- ل بەر سنگێ وان دانـای ئەڤـە بـوو، وی گـۆت: وەرن ئـەم و هـوین صـولحەکێ حـەتا دەمـەکێ دەسنیشانکری بکەین، دا ئەم هەردو لا بەرێ خۆ بدەینێ کانێ دێ چ کەین؟

وان ئەڤ چەندە قەبویل نەکر، و گۆت: مە و تە چو د گەل ئێک نینە.

پاشـی پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- عوثمـانێ کـوڕێ عـەففانی هنارتـە مەکـەهێ؛ دا ئـەو پـەیاما پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- بگەهینتـە خـەلکێ مەکەهێ، و هلبژارتنا عـوثـمـانـی ژ بەر هندێ بوو چونکی قورەیشییان حەز ژ عوثمانی دکـر، و ئویجاخا عوثمانی کو ئەمـەوی بوون هنگی ل مەکـەهێ ب هێـز بـوون، و ئـەبوو سـوفیان کـو ئەمـەوی بـوو مـەزنێ مەکـەهێ بـوو.. عوثمانی گۆتە وان: ڕێکێ بدەنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا بێتە مەکەهێ و طـەوافێ بکـەت. وان گـۆت: ئـەم ڕێکـێ نـادەینێ، و ئەگـەر تـە بڤێـت تـو طەوافێ بکە، و بزڤڕە نک وی. عوثمانی گۆت: حەتا پێغەمبـەر -سـلاڤ لـێ بن- طـەوافێ نەکەت ئەز طـەوافێ ناکەم.

### تێکچوونا سەر و بەری:

دیارە ل وی دەمی، ژ بەر سەررەقیبیا قورەیشـییان سـەر و بـەر تێکچـوو، و هێزەکا قورەیشییان کـو نێزیکی حـەشتێ زەلامـان بـوون، ب چەکداری ڤـە ب نک موسلمانان ڤە چوون، و ڤیان موسلمانان بئازرینن دا شەڕی بکـەن، و پشـتی شـەڕەکێ سڤک موسـلمانان ئـەو هـەمی گـرتن، و ئایەتـەک ئیشـارەتێ ددەتە ڤێ مەسەلێ دەمێ دبێژت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾ (الفتح: ٢٤).

**صەحابی و مویایەعا پێغەمبەری:**

و بەلکی ل ڤی دەمی بوویە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخواز ژ صەحابییێن خۆ کر کو ئەو بەیعێ بدەنە وی کو صەبرێ بکێشن، و پاشدا نەچن، ئەگەر خۆ مسەلە بگەهتە هندێ کو شەڕی ژی بکەن، و صەحابی د داخوازا وی هاتن، و هەمییان بەیعە دایێ، و ژ بەر کو ئەو بەیعە ل بن دارەکێ بوو هندەک جاران دبێژنێ: (بیعة الشجرة) و هندەک جاران ژی دبێژنێ: (بیعة الرضوان) ژ بەر کو خودێ د ئایەتەکێ دا ئاشکەرا کر کو ئەو ژ وان صەحابییان رازیبوویە یێن ل بن دارێ بەیعە دایە پێغەمبەرێ وی -سلاڤ لێ بن- دەمێ دبێژت: ﴿ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ ﴾ (الفتح: ١٨).

و د هندەک کتێبێن سیرەتێ دا هاتییە کو ئەگەرا ڤێ بەیعێ ئەو بوو جاب گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو کافرێن مەکەهێ عوثمان یێ کوشتی، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەم ژ ڤی جهی ناچین حەتا ئەم و قورەیشی خۆ ژێک صافی بکەین، پاشی وی ژ موسلمانان خواست کو ئەو بەیعێ بدەنە وی.

هەر چەندە ئەڤ گۆتنە ل نک نڤیسەرێن سیرەتێ یا بەلاڤە ژی، بەلێ زانایێن حەدیسێ دبێژن: ئەو ب رێکەکا دورست نەگەهشتییە مە.

**رێککەفتنا حودەیبییێ:**

پشتی بۆ قورەیشییان مسۆگەر بووی کو موسلمان دمجدن و ئەو ب ساناهی نازڤڕنەڤە، ب تایبەتی دەمێ سوحبەتا بەیعێ گەهشتییە وان، وان سوهەیلێ کوڕێ عەمری هنارتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: هەرە دان و ستاندنێ د گەل موحەممەدی بکە، و نە وە بت تو د گەل وی

ل سەر هندێ پێک بێی ئەو ئەڤ ساله بێته مەکەهێ؛ دا عەرەب نەبێژن: موحەممەد ل سەر دفنا قورەیشییان چوو مەکەهێ!

و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سوهەیل دیتی، وی گۆت: مادەم وان ئەڤە هنارت مەعنا وان صولح دڤێت.. وی ئەڤ ئاخفتنە گۆت؛ چونکی سوهەیل مرۆڤەک بوو ب عەقلی و سیاسەتێ و رحەتییێ دهاته نیاسین. و پشتی دان و ستاندنەکا گەرم پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و سوهەیل ل سەر چار خالان پێکهاتن، ئەو ژی ئەڤە بوون:

**ئێک:** چێ نابت موسلمان ئەڤ ساله بێنه مەکەهێ، ئەگەر خۆ بۆ کرنا عومرێ ژی بت، بەلکی دڤێت ئەو بزڤرنه مەدینێ، و ئەگەر وان بڤێت بلا ئەو سالەکا دی پێش ئەڤ ساله ڤە بێنه عومرێ.

**دو:** هەر قورەیشییەکێ بێی کەس و کارێن خۆ بێت و بگەهتە موسلمانان دڤێت موسلمان وی قەبویل نەکەن، و وی بزڤریننە ڤە، بەلێ هەر موسلمانەکێ بێت و بگەهتە قورەیشییان، قورەیشی وی نازڤریننە ڤە.

**سێ:** هەردو لایان، موسلمان و قورەیشییان، ماف هەیە پەیمانان د گەل ئویجاخێن عەرەبان گرێدەن، و ئەو ئویجاخا خۆ ددەتە د گەل لایەکی، ئەو ژ وی حسێب دبت.

**چار:** دەهـ سالێن دی، شەڕ د ناڤبەرا موسلمان و قورەیشییان دا نائێتەکرن؛ دا خەلک رحەت ببن، و کارێ خۆ بکەن.

پشتی هەردو لا (پێغەمبەر و سوهەیل) ل سەر ڤان خالان پێکهاتین، وان ئەو نڤیسین، و هندەک زەلام ژ ڤی لایی و هندەک ژ ڤی لایی و هندەک کەسێن بێ لا ژی ل سەر کرنە شاهد. و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخواز ژ عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی کر کو ئەو رێککەفتنێ بنڤیست و گۆتێ: بنڤیسە (بسم الله الرحمن الرحیم) سوهەیلی گۆت: نە.. ئەم ڤێ نزانین،

بنڤیسه (باسمک اللهم). هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆته عەلی: وەکی وی بنڤیسه.

پاشی گۆتێ: بنڤیسه: ئەڤه ئەوه یا پێغەمبەرێ خودێ موحەممەد و سوهەیلی کورێ عەمری ل سەر پێکهاتین. سوهەیلی گۆت: ئەگەر من باوەری هەبا کو تو پێغەمبەرێ خودێ یی من شەرێ ته نەدکر، ناڤێ خۆ و یێ بابێ خۆ بنڤیسه. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆته عەلی وەکی وی گۆتی بنڤیسه.

سوهەیلێ کورێ عەمری کورەک هەبوو دگۆتنێ: ئەبوو جەندەل، ئەو موسلمان بووبوو، و بابێ وی ئەو گرتبوو، ئەبوو جەندەل شیا خۆ ژ دەستێ وان دەربێخت یێن ئەو گرتی، و گاڤا وی زانی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالێن خۆ یێ ل حودەیبییێ، ئەو رەڤی و قەستا حودەیبییێ کر، و دەمێ ئەو گەهشتییە ناڤ موسلمانان هێشتا سوهەیل ل نک پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، گاڤا سوهەیلی کورێ خۆ دیتی وی گۆته پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەی موحەممەد، بەری ئەڤه بگەهته ته ئەم یێن پێکهاتین. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تو راست دبێژی، پاشی گۆته ئەبوو جەندەلی: صولحەک د ناڤبەرا مە و وان دا هەیە، و ئەم غەدرێ ناکەین.. هنگی ئەبوو جەندەلی کره هەوار: گەلی موسلمانان، چاوا دێ بۆ کافران ئێمە زڤڕاندن دا ئەو من د فتنه ببەن؟! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەبوو جەندەل صەبرێ بکێشه، و بۆ خۆ ب خێر حسێب بکە، خودێ رێکەکێ دێ بۆ ته و هەڤالێن ته یێن لاواز بینت.

### بەرهنگارییا صەحابییان:

دەمێ ئەڤ رێککەفتنه د ناڤبەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و قورەیشییان دا هاتییه کرن، گەلەک موسلمان هەبوون ب ڤێ رێککەفتنێ نەخۆش بوو، و وان هزرکر ئەڤه کێماسییه بۆ وان، حەتا ئێکی وەکی عومەری

نەرازیبوونا خۆ ئاشکەرا کر، و گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ما تو نە پێغەمبەرێ خودێ یی؟ وی گۆت: بەلێ، گۆتێ: ما ئەم نە موسلمانین؟ وی گۆت: بەلێ، گۆت: ما ئەو نە کافرن؟ وی گۆت: بەلێ، عومەری گۆت: ڤێجا بۆچی ئەم کێماسییێ د دینێ خۆ دا قەبویل بکەین؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەز پێغەمبەرێ خودێمە، و ئەز بێ ئەمرییا وی ناکەم.

و دەمێ رێککەفتن هاتییەکرن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە صەحابییان: رابن، قوربانێن خۆ ڤەکوژن، و سەرێن خۆ بتراشن.. مەعنا: ئەم دێ ئیحرامێن خۆ ژ بەر خۆ کەین، و زڤرینە مەدینێ. سێ جاران وی ئەڤ گۆتنا خۆ دوبارە کر، کەس ژ وان وە نەکر.. ئینا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب عێجزی ڤە چوو نک کابانییا خۆ (ئوم سەلەمەیێ) و گۆتە وێ: حال و مەسەلێن من و خەلکی ئەڤەنە.

(ئوم سەلەمەیێ) گۆتێ: ئەگەر تە بڤێت ئەو گوهدارییا تە بکەن، تو دەرکەڤە نک وان و د گەل کەس ژ وان نەئاخڤە، قوربانێ خۆ ڤەکوژە، و سەرێ خۆ بتراشە.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەرکەفت و ئەو کر یا وێ گۆتی، و گاڤا صەحابییان ئەو دیتی وی وە کری، ئەو ژی رابوون وە کر. و ب ڤێ چەندێ موسلمان ژ ئیحرامێن خۆ دەرکەفتن، و زڤرینە مەدینێ، و ب رێڤە ب شەڤ دەمێ ئەو دزڤرین سوورەتا (الفتح) هاتە خوارێ، و کەیفا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک ب هاتنە خوارا هات، لەو رۆژا د دویڤ دا وی گۆتە صەحابییان: شڤێدی سوورەت یا بۆ من هاتی ئەو ل نک من خۆشتڤیترە ژ هەر تشتەکێ رۆژ لێ هەلاتی.

دەرکەفتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ مەدینێ بۆ مەکەهێ بۆ کرنا عومرێ، و زڤرینا وی نێزیکی هەیڤەک و نیڤێ ڤەکێشا، و د ڤێ سەفەرێ دا

دەمێ ئەو زڤڕین ب ڕێڤە شەڤەکێ ئەو دەرەنگی شەڤ نڤستن، و بیلال هێلا هشیار دا وان بۆ نڤێژا سپێدێ ڕاکەت، پاشی بیلال ژی د خەو چوو، و وان هند دیت گەرما ڕۆژێ ئەو هشیارکرن، و پشتی ئەو هشیاربووین وان نڤێژا سپێدێ کر هەر چەندە دەمێ وێ چووبوو ژی؛ چونکی وان عوزر هەبوو.

### هندەك سەرهاتیێن دی ل ڤێ سالێ:

گەلەک زانایێن موسلمان ل وێ باوەرێنە کو ل ڤێ سالێ حەج ل سەر موسلمانان هاتبوو فەرزکرن، و هندەکێن دی دبێژن: نەخێر، ئەو ل سالا پێنجێ هاتبوو فەرزکرن، و هەر چاوا بت حەج دووماهی روکن بوو ژ ئەرکانێن ئیسلامێ هاتییە فەرزکرن.

دیسا ژ سەرهاتییێن ل ڤێ سالێ چێبووین -وەکی واقدی دبێژت- پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ حودەیبییێ زڤڕییە مەدینێ، ل هەیڤا ذولحیججە وی شەش کاغەز بۆ مەزنێن سەردەمێ خۆ هنارتن تێدا داخواز ژ وان کر ئەو باوەرییێ ب وی بینن.

# سالا حەفتێ مشەختی

پشتی پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ل دووماهییا سالا شەشێ ژ حودیبییێ زڤڕینە مەدینێ، ب وی ڕەنگێ مە بەری نوکە بەحس ژێ کری، نێزیکی بیست ڕۆژا ئەو مانە ل مەدینێ، و سال بوو سالا حەفتێ، و ل دەسپێکا ڤێ سالێ ل هەیڤا موحەررمێ غەزایا خەیبەرێ چێبوو.

## غەزایا خەیبەرێ:

خەیبەر جهەکە دکەفتە باکوورێ مەدینێ ل سەر ڕێکا شامێ، و ئەو جهەک بوو هندەک ئویجاخێن عەرەبان و هندەکێن جوهییان لێ دژیان، و د سەر خەیبەرێ دا ئویجاخا غەطەفان یا عەرەبان دژیا، و ئاشکەرایە کو ئەڤ ئویجاخە -ب پالدانا جوهییێن خەیبەرێ- ژ وان ئویجاخان بوو یێن د شەڕێ خەندەکێ دا هاریکارییا قورەیشییان کری، و د گەل وان مەدینە دۆرپێچکری.

خەیبەر ئێک ژ دەڤەرێن زێدە دەولەمەند بوو ب چاندن و بیستان و بەرهەمێ خۆ، ژ بەر هەبوونا ئاڤەکا بۆش و عەردەکێ قەلەو، و ئەو جوهییێن ل خەیبەرێ دژیان هژمارەکا قەلعە و حصنێن ئاسێ هەبوون، و بەری نوکە مە ئاشکەراکربوو کو ئویجاخا (بەنوو نەضیر) یا جوهییان ئەوا ل مەدینێ دژیا، پشتی موسلمانان ب سەر دا گرتی و ژ بەر خیانەتا وان ئەو ژ مەدینێ دەرێخستین، هژمارەکا مەزن ژ وان چوون ل خەیبەرێ ئاکنجی بوون، و ئەو ژی وەکی جوهییێن دی ب چاندن و جۆتیارییێ ڤە موژیل بوون، و دەمێ بەنوو نەضیری چوونە خەیبەرێ، جوهییێن خەیبەرێ خۆ ئێخستە بن دەستێ وان، و مەزنێن وان یێن وەکی حویەیێ کوڕێ ئەخطەبی و سەلامێ کوڕێ

ئەبوو حەقیقی وەک مەزن و رێبەر بۆ خۆ نیاسین، و حەتا بەری جوهییێن بەنوو نەضیریان بچنە خەیبەرێ، جوهییێن خەیبەرێ چو دوژمناتییا موسلمانان نەدکر، بەلێ پشتی بەنوو نەضیری چوونە نک وان، ئێکا هند ژ وان چێ کر ئەو ژی دوژمناتییا موسلمانان بکەن، و ئەو بوو بەری شەرێ ئەحزابان جوهییێن خەیبەرێ دەورێ سەرەکی د کۆمکرنا ئویجاخێن عەرەبان دا دژی موسلمانان گێرا، و وان گەلەک مال ژی د ڤێ رێکێ دا خەرج کر، حەتا وان پشکەکا نەیا کێم ژ بەرهەمێ بیستانێن خۆ دانە غەطەفانییان حەتا ئەو قانعکرین کو پشتەڤانییا قورەیشییان د هێرشا وان دا بۆ سەر مەدینێ بکەن.

پشتی موسلمان د گەل قورەیشییان رێککەفتین کو دەه سالێن دی ئەو چو شەران نەکەن، و موسلمان ژ چەپەرێ وان پشتراست بووین، وان ڤیا جزایێ جوهییێن خەیبەرێ بدەنێ سەرا خیانەتا وان کری دەمێ ئەحزاب دژی موسلمانان راکرین و ئەو پالداین کو مەدینێ دۆرپێچ بکەن.. ئەو بوو ل هەیڤا موحەررەمێ ژ سالا حەفتێ مشەختی (خزیرانا سالا ٦٢٨ ز) پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هزار و چارسەد صەحابییێن خۆ دەرکەفتە خەیبەرێ پشتی کو نومەیلەیێ کورێ عەبدللاهێ لەیثی ل شوینا خۆ هێلایە ل مەدینێ، و ئالایێ لەشکەرێ موسلمانان کرە د دەستێ عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی دا.

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چەند قوناغان ب لایێ باکوورێ ڤە چووی، وی چەندەکێ رێکا خۆ گوهارت و ب لایێ رۆژئاڤایێ ڤە چوو، حەتا ژ دەڤەرا خەیبەرێ بۆری پاشی جارەکا دی ب لایێ رۆژهەلاتێ ڤە چوو حەتا چوویە پشت خەیبەرێ، یەعنی: خەیبەر کەفتە د ناڤبەرا وی و مەدینێ دا، و بەلکی وی دو ئارمانج ب ڤێ چەندێ هەبن:

یا ئێکێ: دا جوهییێن خەیبەرێ هزر بکەن ئەو ناچتە وان، ڤێجا کارێ خۆ یێ شەڕی نەکەن.

یا دویێ: دا ڕێکێ د ناڤبەرا خەیبەرێ و دەڤەرا غەطەفانییان دا ببڕت؛ چونکی غەطەفان ل باکوورێ خەیبەرێ دژیان، و ئەو هەڤالێن جوهییان بوون و دژی موسلمانان ڕادوەستان.

گاڤا غەطەفانییان زانی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب لەشکەرێ خۆ ڤە یێ هاتییە باشوورێ دەڤەرا وان، وان بەرێ خۆ دایێ کانێ ئەو دێ چ کەت، و گاڤا وان زانی ئەو بەر ب جوهییێن خەیبەرێ ڤە چوو، و وان زانی کو مەخسەدا موسلمانان خەیبەرە، وان هێزەکا لەشکەری ژ خۆ دورستکر، و گۆتن: ئەم دێ د هەوارا هەڤالێن خۆ یێن جوهی چین. و دەمێ وان چەندەکێ دایە ڕێ، هندەک دەنگ و دۆر ژ پشتێ هاتە وان، لەو وان هزر کر ئەڤە دەنگێ موسلمانایە و ئەو د پشت وان ڕا یێن چوونە جهێ وان، لەو ئەو زوی زڤڕین، و پشتی زڤڕین وان کەس نەدیت.. و گۆتن: مە شۆلە ژ موحەممەدی و جوهییان نینە، و چوونە جهێن خۆ.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب لایێ باشوورێ ڤە هات حەتا گەهشتییە دەڤەرا خەیبەرێ، و وان پێکڤە (تەکبیرات) ددان و دەنگێ وان یێ بلند بوو، و دەمێ ئەو گەهشتینە نهالا (الرجیع) د ناڤبەرا خەیبەرێ و جهێ غەطەفانییان دا بوو شەڤ، وان موعەسکەرێ خۆ دانا وێرێ و ب شەڤێ ل وێرێ نڤستن، و سپێدێ دەمێ جوهی ژ خەو ڕابووین و دەرکەفتین دا بچنە سەر کارێ خۆ د ناڤ بیستانێن خۆ دا، وان لەشکەرەکێ بۆش دیت یێ دانایە ب ڕەخ حصنێن وان ڤە، هنگی وان ب ترس و سەهم ڤە گازی کر: ب خودێ ئەڤە موحەممەد و لەشکەرێ وییە! و هەمی ڕەڤین و چوونە د حصنێن خۆ ڤە و دەرگەهـ ل خۆ گرتن.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دەنگەکێ بلند ڤە گۆت: (الله أكبر الله أكبر) خەیبەر خراب بوو (إنا إذا نزلنا بساحة قوم، فساء صباح المنذرين).

جوهییان هژمارەکا جهێن ئاسێ ل خەیبەرێ هەبوون ئەوێن دگۆتنێ: (الحصون)، وەکی: (ناعم، الصعب، النزار، القموص، الوطيح، السلالم) و هندەک ژ ڤان جهان ب شەڕ هاتنە گرتن، و هندەک ب صولح، و هژمارا کوشتییێن جوهییان د ڤێ غەزایێ هەمییێ دا نۆت و سێ زەلام بوون، و بەرانبەر وێ چەندێ بیست حەتا بیست و پێنج صەحابییان شەهید بوون.

د ڤێ غەزایێ دا مالەکێ مەزن کەفتە دەستێ موسلمانان، و دبێژن: د ڤی شەڕی دا هندەک دانەیێن تەوراتێ ژی کەفتنە دەستێ موسلمانان، و هنگی جوهییان هنارتە نک موسلمانان کو تەوراتا مە بۆ مە بزڤڕینن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە موسلمانان: بدەنە ڤێ.. و ب ڤێ چەندێ جوهییان جامێرییا موسلمانان ب چاڤ دیت، و زانی کو ئەو نە وەکی یێن بەری خۆ نە؛ چونکی دەمێ رۆمانییێن صەنەمپەرێس ئۆرشەلیم ژ دەستێ جوهییان ئینایە دەر وان دانەیێن تەوراتێ هەمی کۆمکرن و ئاگر بەردانێ و ب پییان ڤە چوونە سەر، و فەلان ژی دەمێ جوهی بندەست کرین تەوراتێن وان هەمی سۆتن.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەردێ خەیبەرێ هێلا د دەستێ جوهییان دا کو ئەو وی بکەن، بەرانبەر نیڤا بەرهەمی، و کرە شەرت ل سەر وان هەر جارەکا مە بڤێت ئەم دێ هەوە دەرێخین، و جوهی ل سەر ڤی شەرتی رازی بوون. و ب ڤی شەرتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جوهی گرێدان؛ دا ئەو جارەکا دی خیانەتێ نەکەن، بەلێ د گەل هندێ ژی ئەو ژ خیانەتێ لێڤە نەبوون، و باشترین دەلیل ئەو بوو هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل خەیبەرێ وان موحاوەلا ژەهردانا وی کر وەکی دێ بۆ مە دیار بت.

ژ سەرهاتی و ئەحکامێن د سەرهاتییا غەزایا خەیبەرێ دا چێبووین، ئەم دێ ئیشارەتێ دەینە هندەک ژ وان:

**١- حەرامبوونا خوارنا گۆشتێ کەری:**

بوخاری و موسلم ژ جابرێ کورێ عەبدوللاهێ ئەنصاری ڤەدگوهێزن دبێژت: ل ڕۆژا خەیبەرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەهییا مە ژ خوارنا گۆشتێ کەری کر، و دەستویرییا هسپان دا.

**٢- حەرامبوونا ژنئینانا بەروەخت:**

ئەوا ب عەرەبی دبێژنێ: (نكاح المتعة)، بوخاری و موسلم ژ عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی ڤەدگوهێزن دبێژت: ل ڕۆژا خەیبەرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەهی ژ متعێ کر.

**٣- مارەکرنا صەفییایا کچا حویەیێ کورێ ئەخطەبی:**

حویەیێ کورێ ئەخطەبی مەزنێ جوهییێن بەنوو نەضیرییان بوو، و بەری نوکە دەمێ مە بەحسێ غەزایا بەنوو قورەیضییان کری، مە ئاشکەرا کربوو کو ئەو ب دەستێ موسلمانان هاتبوو کوشتن، و دەمێ موسلمانان حصنێ (ئەلقەمووص) یێ جوهییان ل خەیبەرێ ب شەڕ ستاندنی، هژمارەکا ئێخسیران ژ ژن و مێران کەفتنە دەستێ موسلمانان، و ئێک ژ وان صەفییایا کچا حویەیی بوو، ئەوا پشتی هنگی موسلمان بووی و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئازاکری و مارەکری، و بوویە ئێک ژ دەیکێن خودان باوەران.

**٤- زڤرینا مشەختێن حەبەشە د گەل جەعفەری:**

ل وی دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل صەحابییێن خۆ ل خەیبەرێ، ئەو مشەختێن ماینە ل حەبەشە ب سەرۆکاتییا جەعفەرێ کورێ ئەبوو طالبی زڤرینە مەدینێ، پشتی کو پتر ژ دەهـ سالان ماینە ل وێرێ، و دەمێ ئەو هاتین پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل خەیبەرێ بوو، لەو ئەو چوونە

خەیبەرێ ل نک وی و هند خۆ نەگرت حەتا ئەو بزڤڕتە مەدینێ، و دەمێ ئەو گەهشتینە خەیبەرێ خەیبەر هەمی ل بەر موسلمانان ڤەبوو، و گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جەعفەر دیتی ب ناڤچاڤێن وی ڤە ماچی کر و گۆت: ئەز نزانم کەیفا من پتر ب چ بێت ب ستاندنا خەیبەرێ یان هاتنا جەعفەری.

و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشکەک ژ دەسکەفتییێن خەیبەرێ دانە وان مشەختان ژی پشتی دەستویری ژ صەحابییان وەرگرتی.

## جوهی و ژەهردانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-:

دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خەیبەر ڤەکری، ب وی ڕەنگێ مە گۆتی، ژنەکا جوهی ئەوا دگۆتنێ: زەینەبا کچا حارثی، ژنا سەلامێ کوڕێ مشکمی، پەزەکا قەلاندی ب دیاری بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارت، و پسیارکر کانێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پتر حەز ژ کیژ ئەندامێ پەزی دکەت، و گاڤا گۆتینێ: ئەو پتر حەز ژ شەپیلکێ دکەت، ئەو ڕابوو شەپیلکا وێ تژی ژەهرا دژوار کر، و بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارت، و گاڤا وی د گەل هندەک صەحابییێن خۆ ئەو خواری، وی پارییەک کرە د دەڤێ خۆ دا، پاشی گۆتە هەڤالێن خۆ: هشیار بن ژێ نەخۆن، ئەڤ پارییە یێ دبێژتە من ئەو یێ ژەهرکرییە.. و هەڤالێ وی (بشرێ کوڕێ بەررائی) هندەک ژێ خواربوو، و پشتی دەمەکێ کێم ڕەنگێ وی هاتە گوهاڕتن.

و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی: ئەڤ پەزە یا ژەهرکرییە، هندەک چوون ئەو ژنکا جوهی ئینان، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بۆچی تە ئەڤ کارە کر؟ وی گۆت: من گۆت: ئەگەر تو یێ درەوین بی دێ بەلایا تە ژ مە ڤەبت، و ئەگەر تو پێغەمبەر بی ئەو چو زیانێ ناگەهینتە تە!

هندەکان گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەم وێ نەکوژین؟ وی گۆت: نە.. بەلێ پشتی دەمەکی بشرێ کورێ بەررائی ب وی پارییێ وی خواری مر، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان دا ئەو ژن پێش وی ڤە بێتە کوشتن. و پشتی هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خوینا خۆ بەردا، و د ریوایەتێن دورست دا هاتییە کو ژ بەر دژوارییا وێ ژەهرێ دەم بۆ دەمی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەست ب ئێشانێ دکر، و دەمێ پشتی سێ سالان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- کەفتییە بەر مرنێ، وی گۆت: هێشتا ئەزێ تەئسیرا وێ خوارنێ دبینم یا من ل رۆژا خەیبەرێ خواری.. و ئەڤە دەم هات ئەو ژەهر رەها پشتا من ببرت[1].

ژ بەر هندێ هندەک زانا دبێژن: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب شەهیدی وەغەر ژ ڤێ دنیایێ کربوو.

## کاغەزێن پێغەمبەرێ -سلاڤ لێ بن- بۆ مەزنێن دنیایێ:

د سەرهاتییێن سالا شەشێ مشەختی دا مە دیار کربوو کو (واقدی) ل وێ باوەرێیە کو پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ حودەیبییێ زڤرییە مەدینێ، ل هەیڤا ذولحیججە وی شەش کاغەز بۆ مەزنێن سەردەمێ خۆ هنارتن تێدا داخواز ژ وان کر ئەو باوەرییێ ب وی بینن. و (بەیهەقی) دبێژت: هنارتنا کاغەزان پشتی شەرێ (موئتە) بوو ل سالا هەشتێ مشەختی. و هندەک زانایێن دی یێن سیرەتێ و دیرۆکێ ل وێ باوەرێنە کو ئەڤ رویدانە پشتی ڤەکرنا خەیبەرێ بوو، یەعنی: ئەو ل سالا حەفتێ مشەختی، دویر نینە هنارتنا وان کاغەزان ل هندەک دەمێن جودا جودا بت، و هەمی پێکڤە و ل ئێک دەمی نەبت، لەو ئەڤ جوداهییە د بۆچوونێن زانایان دا هەبت.

---

(١) بوخاری (٤٤٢٨) ڤێ حەدیسێ ژ عائیشایێ ڤەدگوهێزت.

هەر چاوا بت، دیرۆک ڤەدگوهێزت کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کاغەز بۆ هەشت مەزنێن سەردەمێ خۆ هنارتبوون، و ب ڤی ڕەنگی:

١- بۆ مەزنێ ئەسکەندەرییێ یێ قبطی موقەوقسی، و ناڤێ وی یێ دورست جورەیجێ کوڕێ مینایی بوو، حاطەبێ کوڕێ ئەبوو بەلتەعەیی بۆ وی هاتبوو هنارتن:

هەر چەندە وی باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەئینا ژی، بەلێ ئەو د گەل قاصدێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ نەرم بوو، و وی هندەک دیاری بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتن، و ئێک ژ وان جارییەکا قبطی بوو، ناڤێ وێ مارییا بوو، و ئەڤ جارییە ئەو بوو یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کوڕەک ژێ بووی و ناڤێ وی کرییە ئیبراهیم وەکی دێ د سەرهاتییان سالا هەشتێ دا ڤەگێڕین.

٢- بۆ مەزنێ دەولەتا رۆمێ هیرەقلی، دوحیەیێ کەلبی بۆ وی هاتە هنارتن:

هیرەقل یان قەیصەر، هنگی ل قودسێ بوو، ئەو هاتبوو وێرێ دا ل وی جهێ پیرۆز نڤێژێ وەک سوپاسی بۆ خودێ بکەت ژ بەر سەرکەفتنا وی ل سەر فورسێ، و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو دەمێ کاغەزا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەهشتییە وی، قەیصەری گۆت: بۆ من سەحکەنێ کانێ چ مرۆڤێن ڤی زەلامی ل وەلاتێ مە هەنە یان نە؟ دا هندەک پسیاران ژێ بکەم. و هنگی کاروانەکێ قورەیشییان یێ بازرگانی ب سەرۆکاتییا ئەبوو سوفیانی ل قودسێ بوو، لەو وان ئەو برنە نک هیرەقلی، و هیرەقلی هندەک پسیار ل دۆر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ ئەبوو سوفیانی کرن، و دووماهییێ وی گۆتە ئەبوو سوفیانی: ئەگەر ئەو تشتێ تە گۆتییە من ڕاست بت، ئەو جهێ هەردو پییێن من ل سەر دێ کەفتە د دەستێ موحەممەدی دا،

و مـن دزانـی ئـەو دێ دەرکـەڤت، بـەلێ مـن نـەدزانی دێ ژ نـاڤ هـەوە دەرکەڤت، و ئەگـەر مـن زانیبـا ئـەز دێ گەهمـە وی ئـەز دا چمـە نـک وی، و ئەگەر ئەز ل نک وی بامە، ئەز دا ئاڤێ ل پیێن وی کەم!

٣- بۆ مـەزنێ حەبەشـە ئـەوێ دگۆتنێ: نەجاشی، د گـەل عـەمرێ کـوڕێ ئومەییەیێ ضومەری هنارتبوو: و ئەڤ نەجاشییە نە ئەوە یێ حوکم ل حەبەشـە دکـر دەمـێ موسـلمان ب مشـەختی چوونـە وێـرێ، ئـەو نەجاشـی موسـلمان بووبـوو بـەلێ وی موسـلمانەتییا خـۆ ئاشـکەرا نـەکربوو، و دەمـێ ئـەو مـری پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییان نڤێژا (غـائیبی) ل سـەر کربـوو. پشـتی وی کسـەکێ دی هاتـە سـەر حـوکمی و دگۆتنـە وی ژی نەجاشـی، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کاغەز بۆ وی هنـارت، و نەهاتییـە زانـین کـو وی بـاوەری ئیـنـا بـت، یان ژی بـەرسڤـەکا ئیجـابی ل سـەر کاغـەزا پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- دا بت.

٤- بـۆ مـەزنێ فورسـێ کیسـرایی و نـاڤێ وی پـەرویزێ کـوڕێ هـورمزی بـوو، عەبـدللاهێ کـوڕێ حوذافـەیێ سـەهمـی ئـەو بربـوو پایتـەختێ کیسـرایی (تەیسەفوونێ) ل ڕۆژهەلاتا بەغدایا نوکە:

بەرسـڤا ڤـی ژ یـا هـەمییان کرێتتـر بـوو، وی گـۆت: عەبـدێ مـن ڤـێ داخوازێ ژ من دکەت؟! پاشی وی کاغەزا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دڕاند، و گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ڤی کارێ وی زانـی نفرین لـێ کـر کـو خودێ حوکمێ وی بدڕینت!

پاشی وی هـنـارتە نک جێگرێ خۆ ل یەمەنێ کـو دو زەلامـێن خـۆ یـێن ب هێـز بهنێـرە نـک ڤـی زەلامـی بـلا وی بـۆ مـن بینـن! و مـەزنێ یەمـەنێ (باذام) ئـەوێ پێـش کیسرایی ڤـە حوکـم ل صەنعایێ دکر، ل دویڤ فـەرمانا کیسرایی دو زەلام هـنارتنە حیجازێ دا ئەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بگرن

و بۆ كيسرايى ببەنە وەلاتێ فورسێ، و گاڤا ئەو گەهشتینە مەدینێ وان گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: یان د گەل مە وەرە دا تە ببەینە نک کیسرایی، یان ژی ئەو دێ هێرشێ ئینتە سەر دەڤەرێ و دێ هەوە بەتە هیلاکێ.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: سوباهی وەرن دێ بەرسڤێ دەمە هەوە. و ڕۆژا دی دەمێ ئەو هاتین پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: هەرن بێژنە مەزنێ خۆ خودایێ من شڤێدی خودایێ وی کوشت.. و بێژنێ: دینێ من و دەسهەلاتا من دێ وی جهی هەمییێ ڤەگرت یێ کیسرا حوکمی لێ دکەت، و بێژنێ: ئەگەر ئەو باوەرییێ ب من بینت، ئەز دێ وی جهی هێلمە د دەستان دا یێ نوکە د دەستان دا.

و گاڤا ئەو زڤڕینە نک مەزنێ خۆ و ئاخفتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ ڤەگێڕای وی گۆت: ئەڤە نە گۆتنا مەلکانە، و ئەز دبێژم ڕاستە ئەو پێغەمبەرە.. و پشتی دەمەکی خەبەر گەهشتە یەمەنێ کو ل وێ دیرۆکێ یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی کوڕێ کیسرایی شیرەوەیهی ب شەڤ هێرشەک دا سەر بابێ خۆ و ئەو کوشت.

هنگی مەزنێ یەمەنێ باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینا، و ئەو و مللەتێ وی هاتنە د ئیسلامێ دا.

و واقدی دبێژت: کیسرا ل شەڤا سێشەنبێ دەهی هەیڤا جومادا یا دووماهییێ ل سالا حەفتێ مشەختی (چریا ئێکێ ژ سالا ٦٢٨ز) ب دەستێ کوڕێ وی هاتبوو کوشتن، و ئەڤە هندێ دگەهینت کو هنارتنا کاغەزان ژ لایێ پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- بۆ مەزنێن جیهانی ل سالا حەفتێ بوو.

٥- بۆ مەزنێ فەلێن عەرەبان ل شامێ مونذرێ کوڕێ حارثێ غەسسانی، شوجاعێ کوڕێ وەهبێ ئەسەدی هاتبوو هنارتن:

و ئەو ل دیمەشقێ بوو، و هندەک دبێژن: هنارتنا ڤێ کاغەزێ پشتی حودەیبییێ بوو.

٦- بۆ مەزنێ دەڤەرا یەمامە هەوذەیێ کورێ عەلی یێ حەنەفی، سولەیطێ کورێ عەمرێ عامری هنارتە نک وی:

مەزنێ یەمامێ بەرسڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا کو ئەگەر تو رازی ببی پشتی تە ئەز مەزنییێ وەرگرم و تشتەک بۆ من ژی بت، ئەز دێ باوەرییێ ب تە ئینم! یا ژ وی ڤە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ئێک ژ مەلکێن دنیایێیە، و وی دڤێت مەزنییێ بێختە دەستێ خۆ، لەو وی ئەڤ شەرتە دانا بەر. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شەرتێ وی زڤڕاند، و وی باوەری نەئینا.

٧- مەزنێن عومانێ جەیفەر و عەبد کورێن جولوندایێ ئەزدی:

دیارە ئەڤە ل سالا هەشتێ بوو؛ چونکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەمرێ کورێ عاصی هنارتبوو نک وی و عەمر ل سالا هەشتێ موسلمان بووبوو.

٨- بۆ مەزنێ بەحرەینێ مونذرێ کورێ ساوایێ عەبدی، ئەبوو عەلائێ حەضرەمی هنارتبوو نک:

ژێدەرێن دیرۆکی دبێژن: مەزنێ بەحرەینێ باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینا و ئەو و مللەتێ وی هاتنە د ئیسلامێ دا.

و هێژایی گۆتنێیە کو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤیای کاغەزان بۆ مەزنێن سەردەمێ خۆ بهنێرت، گۆتنێ: عەجەم چو کاغەزان قەبویل ناکەن و باوەرییێ پێ نائینن ئەگەر یا ختمکری نەبت، لەو وی ختمەک بۆ خۆ ل سەر گوستیرکێ چێکر، و نەخشێ وێ سێ ڕێز بوون: ل ڕێزا بنی نڤیسی (محمد) و یا ناڤێ (رسول) و یا سەری (الله) بۆ هندێ دا ناڤێ خودێ

د سەر یێ وی دا بت. و وی ئەو گوستیرک دکرە تبلا دویێ یا ب ڕەخ تبلا قلیچێ ڤە ژ دەستێ چەپێ[1].

و هندی پێغەمبەر یێ ساخ ئەو گوستیرک د تبلا وی بوو، و پشتی وی ئەبووبەکری ئەو دکرە تبلا خۆ، پاشی عومەری، پاشی عوثمانی، و ئەو سالا عوثمان تێدا مری ئەو چوو هنداڤ بیرا (ئەریس) ل قوبایێ، و گوستیرک ژ تبلا وی کەفتە د وێ بیرێ دا، و سێ ڕۆژان لێ گەڕیان ئەو نەدیت.

**عومرەیا قەزاکرنێ:**

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل هەیڤا صەفەرێ سەرکەفتی ژ غەزایا خەیبەرێ ڤەگەڕیایە مەدینێ، ئەو حەتا هەیڤا ذولقەعدە ما ل مەدینێ، و ژێ نەهاتییە ڤەگوهاستن کو ئەو ل ڤی دەمی دەرکەفت بت، بەلێ وی هژمارەکا (سەرییێن لەشکەری) ب سەرۆکاتییا هژمارەکا صەحابییان هنارتبوونە گەلەک جهـ و دەڤەران.

ل هەیڤا ذولقەعدە کو هەیڤا یازدێیە، و ل دویڤ ڕێککەفتنا حودەیبییێ ئەوا ل سالا چوویی د ناڤبەرا موسلمان و کافرێن قورەیشییان دا هاتییەکرن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ژ مەدینێ دەرکەفتن و بەر ب مەکەهێ ڤە چوون؛ دا عومرێ بکەن، و هژمارا وان صەحابییان یێن د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرکەفتین دو هزار کەس بوون، ژ بلی ژن و زارۆکان.

دیمەنەکێ ب سەهم و عەجێب بوو، چونکی جارا ئێکێ بوو خەلکێ وی دەمی دیمەنەکێ هۆسا ببینت: مەوکبەکێ پێکهاتی ژ پتر ژ دو هزار مرۆڤان هەمی پێکڤە و ب ئێک جلکی کو جلکێ ئیحرامان یێ سپی بوو، و

---

(١) وەکی موسلم (٥٦١٠) ژ ئەنەسی ڤەدگوهێزت.

ب ئێک دەنگی کو دەنگێ (تەلبییێ) بوو، بەر ب مەکەهێ ڤە دچوون.. و ژ بەر عەجێبییا ڤی دیمەنی خەلک ل هەمی جهان کۆم دبوون و دهاتنە سەر رێکان و بەرێ خۆ ددانە موسلمانان.

و هەر چەندە دەرکەفتنا موسلمانان بۆ کرنا عومرێ ب تنێ بوو، بەلێ بۆ ئحتیاط پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوسەد سویارێن چەکدار ب سەرۆکاتییا موحەممەدێ کورێ مەسلەمەیی بەری کاروانێ عومرەچییان هنارت دا رێکێ بۆ وان تەئمین بکەن، حەتا مەسەلە گەهشتە هندێ قورەیشییان هزر کر کو نە کو موسلمانان ئنیەتەکا خراب هەبت، لەو وان ژی کۆمەکا سویارێن چەکدار هنارتنە بەرا موسلمانان؛ دا بەرێ خۆ بدەنێ کانێ وان چ ئنیەت هەیە، و وان گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەی موحەممەد! ب خودێ مە تو ب غەدرێ نەنیاسی نە دەمێ تو یێ بچویک و نە پشتی تو مەزن ژی بووی، ئەڤە چییە تو ب چەک ڤە ب سەر مللەتێ خۆ ڤە هاتی، و شەرتێ مە ئەڤە نەبوو؟!

هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قاصدێن قورەیشییان پشتڕاستکرن کو ئەو یێ ل سەر شەرتێ خۆ، و ئەو ناچتە حەرەما مەکەهێ ئەگەر شیرێن وان د کاڤلانان دا نەبن، و هنگی ئەو قاصد ڤەگەڕیانە مەکەهێ و قورەیشی تەناکرن کو (موحەممەد) ل پەیمانا خۆ لێڤە نەبوویە.

شەرتێ کافران ئەو بوو موسلمان سێ ڕۆژان ب تنێ ل مەکەهێ بمینن، و د ڤان هەر سێ ڕۆژان دا هندەک خەلکێ مەکەهێ ژ باژێری دەرکەفتن و چوونە سەر گر و چیایان، و ژ دویر ڤە بەرێ خۆ دانە ڤی دیمەنێ عەجێب، و هندەک ژی ل نک (دار الندوة) کۆمبوون، و بەرێ وان ما ل موسلمانان ئەوێن ل دۆری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- کۆمبووین وقەستا کەعبێ کری بۆ ب جهئینانا رێ و رەسمێن عومرێ، و دا کافر هزر نەکەن کو موسلمان

لاوازبـوویـنـه پێغەمبەر -سلاف لێ بن- فـەرمـان ل هەڤالێن خۆ کر کو ئەو ل هەر سێ شەوطێن ئێکێ یێن طـەوافێ پیـێن خۆ سڤک بکـەن. و پشـتی سـێ ڕۆژان ژ مانـا موسـلمانان ل مەکـەهێ و ل دویـڤ شـەرتێ وان د گـەل کافران ئەو ژ مەکەهێ دەرکەفتن، و بەر ب مەدینێ ڤە زڤڕین.

## مەیموونەیا کچا حارثێ دووماهیێ کابانییا پێغەمبەریێ:

بـەررەیا کچـا حـارثێ عـامری، یـان (مەیموونـه) وەکـی پشـتی هنگـی پێغەمبەری -سلاف لێ بن- ناڤ لێ کری، ئێک ژ وان موسلمانێن لاواز بوو یێنماینه ل مەدینێ، و ئەو خویشـکا (أم الفضل)ـا ژنکا عەبباسێ مـامێ پێغەمبەری بوو، مەیموونایێ زەلامێ وێ مربوو و ئەو مابوو بێ خودان، وێ ئەمرێ خۆ کربوو د دەستێ خویشا خۆ دا، خویشکا وێ کو ژنماما پێغەمبەری بوو -سلاف لێ بن-، هاتنا پێغەمبەری -سلاف لێ بن- بۆ مەکـەهێ بـۆ کرنـا عومرێ بۆ خۆ ب دەلیڤە زانی کو خویشکا خۆ پێشکێشی پێغەمبەری -سلاف لێ بن- بکەت دا ئەو وێ مارە بکەت، و وێ ئـەڤ حـەزا خۆ بـۆ زەلامـێ خۆ عەبباسی ڤەگێڕا و داخواز ژێ کر ئەو هاریکارییا وێ بکەت، عەبباسی ب یـا وێ کر، و ئەو بۆ برازایێ خۆ (عـەرض) کـر، و پێغەمبـەری -سـلاف لـێ بـن- داخوازا وی لێ نەزڤڕاند و ب یـا وی کـر، و هـەر چەنـدە پێغەمبـەری -سـلاف لێ بن- دڤیا ل مەکەهێ مەیموونایێ ڤەگوهێزت، بـەلێ کـافران قـەبویل نـەکر ئـەو ژ سـێ ڕۆژان زێـدەتر ل مەکـەهێ بمینـت، لـەو ب ڕێڤـە و ل نێزیکـی (تەنعیمێ) پێغەمبەری -سلاف لێ بـن- ئـەو ڤەگوهاسـت، و هێژایـی گۆتنێیه کو مەیموونه دووماهی ژن بوو پێغەمبەری -سلاف لێ بن- ئـەو ڤەگوهاسـتی، و ژ تشتێ بۆ مەیموونایێ دئێته هژمارتن ئەو بوو دەمـێ ئـێش ل پێغەمبـەری -سـلاف لـێ بـن- دژوار بـووی، ئـەو ئێشـا ئـەو پـێ مـری، ئـەو ل مـالا مەیموونایێ بوو، و چونکی مەیموونایێ دزانی کو پێغەمبەر -سلاف لـێ بـن-

حەز دکەت ل دەمێ نساخییا خۆ ل مالا عائیشایێ بت، وێ دەستویری دا کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆ مالا عائیشایێ بێتە ڤەگوهاستن.

## گۆتنەکا کورت ل دۆر زەواجا پێغەمبەریﷺ:

ئێکەمین تشتێ دڤێت ئەم ل ڤێرێ بیرا خۆ لێ بینینە ڤە ئەوە: ئینانا پتر ژنەکێ ژ لایێ زەلامی ڤە، بەری هاتنا ئیسلامێ و ل دەسپێکا هاتنا ئیسلامێ ژی تشتەکێ دورست و بێ توخویب بوو، یەعنی: هەر ئێکێ ڤیابا و شیابا چەند حەزکربا هند ژن دئینان، و ئەڤە تشتەکێ رەوا بوو د وان هەمی دین و شریعەت و قانوونێن کار ل دنیایێ پێ دهاتەکرن، و دەمێ ئیسلام هاتی، ئیسلام ئێکەمین دین و شریعەت بوو ئەڤ مەسەلە بەردای و بێ توخویب نەهێلای، ئیسلامێ بۆ جارا ئێکێ د دیرۆکێ دا ئینانا پتر ژ ژنەکێ توخویب دا، یەعنی: وە نینە وەکی هندەک هزر دکەن کو ئیسلامێ دەرگەهێ ئینانا پتر ژ ژنەکێ ڤەکر.. نەخێر! هەمی دین و شریعەتان بەری ئیسلامێ ئەو دەرگەهـ بێ حسێب ل تاق کربوو، پشتی ئیسلام هاتی مەسەلە توخویب دا، و هندەک شەرت بۆ دانان، و ئێک ژ وان شەرتان ئەو بوو کو چێ نابت بۆ زەلامی پتر ژ چار ژنان ل نک خۆ کۆم بکەت.

و ئاشکەرایە کو شریعەتێ ئیسلامێ ب ئێکجار نەهاتبوو دانان، بەلکی ئەو د چەند سالان دا هاتبوو تەشریعکرن ژ لایێ خودێ ڤە، لەو ئەم دبینین هندەک تشت چەند سالان ل نک موسلمانان هەبوون و وان کار پێ دکر، پاشی هندەک ئایەت هاتنە خوارێ و ئەو تشت حەرامکر، و هنگی موسلمانان ژ نوی خۆ ژێ دا پاش.. و ئێک ژ وان تشتان ئەو بوو: دورستبوو بۆ زەلامی هندی بڤێت ژنان بینت، پاشی ل دووماهییێ ئایەت هاتە خوارێ کو چێ نابت بۆ زەلامێ موسلمان پتر ژ چار ژنان پێکڤە ل نک خۆ کۆم بکەت، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل صەحابییێن خۆ کر کو هەچییێ

پـتـر ژ چار ژنان هەبن چاران بهێلن و یێن دی بەردەن، و وان فەرمانا وی ب جهـ ئینـا. بەلێ پێغەمبەری ب خۆ -سلاڤ لێ بن- ئەو چەندە نەکر، یەعنی: وی پتر ژ چار ژنان هەبوون، د گەل هندێ ژی وی ئەو بەرنەدان؛ چونکی ئەڤە ئێک ژ تایبەتمەندییێن وی بوو ژ لایەکی ڤە، و ژ لایەکێ دی ڤە چونکی ئەو ژنکا شوی ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر، ئەو وەک دەیک بۆ خودان باوەران دهاتە هژمارتن، وەکی ئایەتێ ب خۆ گۆتی، لەو بۆ وێ چێ نەدبوو ئەو پشتی بەردانێ یان نەمانا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- شوی ب ئێکێ دی بکەت.

و پشتی مارەکرنا مەیموونایێ ب دەمەکی هندەک ئایەت هاتنە خوارێ کو چێ نابت بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئێدی ئەو ژنەکا دی بینت، وەکی: ﴿ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعْدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَٰجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ رَّقِيبًا ﴿٥٢﴾ ﴾ (الأحزاب: ٥٢).

# سالا هەشتێ مشەختی

عومرەیا قەزاکرنێ ئەوا ل هەیڤا یازدێ ژ سالا حەفتێ چێبووی، کارەکێ نەفسی یێ بەرچاڤ ل خەلکێ مەکەهێ کر، و هژیانەکا مەزن د گیانێ وان دا پەیداکر، تشتێ بوویە ئەگەرا هشیاربوونا هژمارەکا نەیا کێم ژ وان، و پشتی پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی زڤڕینە مەدینێ، کۆمەکا خەلکێ مەدینێ دوبارە حسێبێن خۆ لێکدانە ڤە، و جارەکا دی هزرا خۆ د وێ هەڤڕکییێ دا کر ئەوا ئەڤە بیست سالە د ناڤبەرا وان و موسلمانان دا پەیدابووی، و ئەو بوو د ئەنجام دا گەلەک ژ وان گەهشتنە بڕیارەکا نەچاڤەڕێکری و بەرچاڤترین نموونە کو ل ڤێرێ دێ ئیشارەتێ دەینێ، و بڕیارا وان هژمێرین ئێکەمین ڕویدانێن ڤێ سالا نوی دو ژ پێشکێش و ماقویلێن قورەیشییان بوون، ئێک عەگید و فێرسێ مەیدانا شەڕی بوو، و یێ دی بلیمەت و عەبقەرییێ مەیدانا عەقلدارییێ بوو..

## خالدێ کوڕێ وەلیدێ و عەمرێ کوڕێ عاصێ موسلمان دبن:

و موسلمانبوونا وان ژ ئەنجامێ هزرکرنەکا درێژ و قەناعەتەکا تمام بوو، و ب تایبەتی پشتی وان مەوکبێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی دیتی دەمێ ئەو هاتینە مەکەهێ بۆ کرنا عومرێ.. پشتی موسلمان ژ مەکەهێ زڤڕین ب نێزیکی دو هەیڤان ئەڤ هەردو مرۆڤە ب گوهۆڕینەکا غەریب حسیان ب سەر نەفسا وان دا هات، بێی ئێک ژ وان ب هەڤالێ خۆ یێ دی بحەسییێت، و هەر ئێک ژ وان ژ لایێ خۆ ڤە بڕیار دا دووماهییەکێ بۆ وێ هەڤڕکییێ بدانت ئەوا د ناڤبەرا عەقلێ وان و نەفسا وان دا هەی، هندی خالد بوو سوحبەتا خۆ ژ کەسێن دەور و بەرێن خۆ نەڤەشارت، بەلکی

هەر ئێکێ وی وان ڕۆژان دیتبا دگۆتێ: بەسە، ئاخری بۆ هەر کەسێ عەقل هەبت ئاشکەرابوو کو موحەممەد نە سێرەبەندە و نە شاعرە، و ئەو گۆتنا ئەو دبێژت گۆتنا خودێیە، ڤێجا هەچییێ تێگەهشتی بت دڤێت دویکەفتنا وی بکەت.. و گۆتنەکا هۆسا ژ ئێکێ وەکی خالدی دەرکەڤت و ل مەکەهێ، جهێ هندێیە مەکەهێ بهژینت! سوحبەت گەهشتە ئەبوو سوفیانی، ئەبوو سوفیانی هنارتە ب دویڤ ڕا و گۆتێ: ئەو چ ئاخفتنە من ژ تە گوهـ لێ بووی؟ خالدی گۆتێ: ئەو ئەوە یا تە گوهـ لێ بووی! هنگی ئەبوو سوفیان ژ کەرب ڤە چوویێ، بەلێ عەکرمەیێ کوڕێ ئەبوو جەهلی ئەو گرت، و گۆتێ: هێدی ئەبوو سوفیان، ب خودێ ترسا من ئەوە کو چو نەمابت ئەز ژی وەکی وی بێژم، و بچمە سەر دینێ وی، تە های ژ چ هەیە؟ ب خودێ ئەز دترسم سال نەزڤڕتە سالێ حەتا خەلکێ مەکەهێ هەمی ب دویڤ وی بکەڤن!

و ئەڤ ئاخفتنا عەکرمەیی هندێ دگەهینت کو هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییان بۆ مەکەهێ بۆ کرنا عومرێ کارەکێ مەزن ل خەلکی کربوو، و قەناعەت بۆ وان چێکربوو کو هندە سوحبەتا موحەممەدی و هەڤالێن وی ژ بەر دەست دەرکەفت، و نێزیکە ئەو دێ ب سەرکەڤن.. لەو دڤێت ئەبوو سوفیان مەسەلێ هۆسا ب سادەیی وەرنەگرت، و هزر نەکەت مەسەلە خالدە یان فلانە.

ئەڤە خالد.. و عەمرێ کوڕێ عاصی، بەری هنگی ب دەمەکی چووبوو حەبەشە، و هەڤالینی د ناڤبەرا وی و نەجاشی دا هەبوو، ل وێرێ وی دڤیا ژ نەجاشی بخوازت کو ئەو موسلمانان ژ وەلاتێ خۆ دەربێخت، بەلێ نەجاشی خۆ ل سەر ڤێ گۆتن و داخوازا وی نەرازی کر و گۆتێ: گوهێ خۆ بدە من، هەرە تو ژی باوەرییێ پێ بینە، ب خودێ ئەو ملیاکەتێ دهاتە نک مووسایی دئێتە نک وی ژی.. و ڤێ گۆتنا نەجاشی کارەکێ بەرچاڤ ل نەفسا عەمری

کر، لەو پشتی ئەو زڤڕییە مەکەهێ هەیامەکێ ئەو د گەل خۆ کەفتە هەڤرکییێ، و ئەگەر خالد سەرلەشکەرەکێ قورەیشییان یێ مەزن بت، ژ سالۆخەتێن سەرلەشکەرانە کو نەترسن، لەو وی سوحبەتا خۆ ئاشکەرا کر و بۆ دەور و بەرێن خۆ گۆت، و لێگەرییا هندەکێن دی ژی قانع بکەت کو پێکڤە دەرکەڤن و بچنە مەدینێ.. بەلێ عەمر مرۆڤەکێ (حەکیم و داهیە) بوو، وی سوحبەتا خۆ د عەقلێ خۆ دا دئینا و دبر، و بۆ کەسێ نەگۆت؛ دا کەس نە ب ئیجابی و نە ب سلبی تەئسیرێ ل بریارا وی نەکەت، و گاڤا ئەو گەهشتییە ئەنجامی ژی، دیسا ئەو ب بێ دەنگی ژ مەکەهێ دەرکەفت، بێی دەلیڤەیێ بدەتە کەسەکی کو کاری ل بریار و قەناعەتا وی بکەت.

خالد نشیا هەڤالێن خۆ عەکرمە و صەفوانی ب بۆچوونا خۆ قانع بکەت، لەو وی دەست ژ وان بەردا، و پشتی دەمەکی ئەو شیا عوثمانێ کورێ طەلحەی قانع بکەت، و ئەو خزمەتکارێ کەعبێ بوو، و هەردویان بریار دا درەنگی شەڤ ئەو ژ مەکەهێ دەرکەڤن، و بچن قەستا مەدینێ بکەن، و پشتی چەندەکێ ئەو ژ مەکەهێ دویر کەفتین، وان عەمرێ کورێ عاصی دیت یێ ب لایێ مەدینێ ڤە دچت، و پشتی وان زانی کو ئەو ژی بۆ وێ ئارمانجێ یێ دەرکەفتی یا ئەو بۆ دەرکەفتین، ئەو بوونە هەڤالێن ئێک و پێکڤە چوونە مەدینێ. هەر سێ ل هەیڤا صەفەرێ ژ سالا هەشتێ گەهشتنە مەدینێ، و وان قەستا مزگەفتا پێغەمبەری کر، و ل سەر دەستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتنە د ئیسلامێ دا، و ب موسلمانبوونا وان کەیفەکا مەزن بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هەمی موسلمانان چێبوو.

### سەرییا کەعبێ غیفارێ:

ل هەیڤا رەبیعولئەووەلا سالا هەشتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرییەکا لەشکەری یا ژ پازدە زەلامان پێک دئێت ب لایێ توخوبێن شامێ

ڤە هنارت، و سەرۆکێ وان کەعبێ کورێ عومەیرێ غیفاری بوو، ئەڤ سەرییە چوو حەتا گەهشتییە وێ دەڤەرێ ئەوا دبێژنێ: (ذات أطلاح) ل دەڤەرا بەلقائێ (ل نێزیکی وێ دەڤەرا نوکە دکەفتە د ناڤبەرا ئوردن و سووریێ دا). ل وی جهی ئویجاخا (قوضاعه) یا عەرەب دژیا، و گەلەک ژ وان فەلە بوون، و ژ لایێ ئیداری ڤە سەر ب دەولەتا رۆمێ ڤە بوون..

گاڤا کەعب و هەڤالێن خۆ گەهشتینە وی جهی، وان کۆمەکا قوضاعییان دیت، و گاڤا وان صەحابییان داخواز ژێ کری ئەو موسلمان ببن، ئەو پێ وەر هاتن و شەڕێ وان کر، و ئەو هەمی کوشتن، ب تنێ ئێک تێ نەبت بریندار بوو، وی خۆ ڤەشارت حەتا بوویە شەڤ پاشی زڤڕی مەدینێ و سوجبەتا خۆ و هەڤالێن خۆ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەگێڕا، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک ب وێ چەندێ نەخۆش بوو.

و ژ بەر کو ناڤێ وی جهێ صەحابی لێ هاتینە کوشتن (ذات أطلاح) بوو، دبێژنە ڤێ سەرییێ: (سرية ذات أطلاح).

**شەڕێ موئتە:**

ئەوێ پشتی ڕویدانا سەرییا (ذات أطلاح) ب دو هەیڤا چێبووی.

چو ریوایەتێن هورست د دەست مە دا نینن کانێ ئەگەرا ئێکسەرا ڤی شەڕی چ بوو؟ بەلێ ژ تشتێن ناڤدار ل نک گەلەک نڤیسەرێن سیرەتێ ئەوە کو ئەگەرا ڕویدانا ڤی شەڕی ئەو بوو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قاصد بۆ مەزنێن سەردەمێ خۆ هنارتین و د گەل هەر ئێکی کاغەزەک؛ دا ژ وان بخوازت کو ئەو باوەرییێ ب ئیسلامێ بینن، ئێک ژ وان قاصدان حارثێ کورێ عومەیرێ ئەزدی بوو، ئەوێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتییە نک شورەحبیلێ کورێ عەمرێ غەسسانی حاکمێ بارژێرێ

(بوصرایێ)[1] ل شامێ، کو فەلە بوو و سەر ب قەیصەرێ رۆمێ ڤە بوو، ئەڤی حاکمی دویر ژ عورف و عەدەتێن سیاسی یێن وی دەمی و هەمی دەمان قاصد و هنارتییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کوشت.

ئەڤ رویدانە بوو بوویە ئەگەر کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- لەشکەرەکی بهنێرتە دەڤەرا وی؛ دا وی ئەدەب بدەت.. هۆسا (واقدی) ڤەدگوهێزت، و گەلەک ژ نڤیسەرێن سیرەتێ ئەوێن پشتی وی هاتین هەر گۆتنا وی ڤەدگوهێزن، بەلێ زانایێن حەدیسێ ڤێ ریوایەتا وی دورست نابینن.

ئەگەرەکا دی ژی هەیە هندەک ڤەدگێرن، ئەو ژی ئەڤەیە کو حاکمێ دیمەشقێ حارثێ غەسسانی، و ئەو ژی فەلە بوو و سەر ب قەیصەرێ رۆمێ ڤە بوو، ب رەنگەکێ کرێت پێشوازی ل قاصدێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر، و گەف لێ کرن کو ئەو دێ هێرشەکێ دەتە سەر مەدینێ.. بەلێ ئەڤ چەندە ژی ب رێکێن دورست نەگەهشتییە مە.

و هندەک دبێژن: رویدانا کوشتنا صەحابییان ل (ذات أطلاح) ئەگەرا سەرەکی یا رویدانا ڤی شەری بوو.. ڤێجا چ هەلویستێ دوژمنکاری یێ ئویجاخێن (عەرەب) ئەوێن ل شامێ دژیان د پشت پەیدابوونا ڤی شەری دا بت، یان ژی ئەگەرەکا دی هەبت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بریار دا لەشکەرەکی ژ موسلمانان بەرهەڤ بکەت، و ب لایێ شامێ ڤە بهنێرت، و ئەڤ لەشکەرە بوو یێ شەرێ موئتە کری.

دیرۆکزان دبێژن: هژمارا ڤی لەشکەری سێ هزار کەس بوون، و هەر چەندە گەلەک صەحابییێن مەزن د ناڤ ڤی لەشکەری دا هەبوون ژی، بەلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئالا کرە د دەستێ هەڤالێ خۆ و کورێ خۆ یێ

(١) بوصرا باژێرەک بوو نوکە دکەفتە نێزیکی باژێرێ (دەرعا) ل سەر توخوبێن دەولەتا سووری و ئوردونی.

تەبەنییێ زەیدێ کورێ حارثەیی دا، و ئەو کرە مەزنێ لەشکەری، و گۆت: ئەگەر زەید هاتە کوشتن جەعفەرێ کورێ ئەبوو طالبی ل جهێ وی دێ بتە مەزنێ لەشکەری، و ئەگەر جەعفەر ژی نەما عەبدللاهێ کورێ رەواحەیی دێ بتە مەزنێ لەشکەری.

دەرکەفتنا لەشکەرێ موسلمانان ژ مەدینێ ل هەیڤا (جومادا یا ئێکێ) بوو ژ سالا هەشتێ مشەختی، ل وی دەمی یێ هێشتا کار ب صولحا حودەیبییێ دهاتەکرن ئەوا د ناڤبەرا موسلمان و قورەیشییان دا هاتییە گرێدان. و بۆ خاترخواستنا لەشکەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و موسلمان دەرکەفتنە ژ دەرڤەی باژێری، و دبێژن: دەمێ عەبدللاهێ کورێ رەواحەیی خاترا خۆ خواستی رۆندک ژ چاڤان بارین، لەو هندەکان گۆتێ: تە خێرە بۆچی تو دکەیە گری؟ وی گۆت: ب خودێ ئەو نە ژ بەر ڤیانا منە بۆ دنیایێ، یان چونکی من دڤێت ل نک هەوە بمینم، بەلێ من گوهـ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بوو وی ئایەتەکا قورئانێ دخواند بەحسێ جەهنەمێ دکەت و دبێژت: **(وإن منك إلا واردها)** کەس ژ هەوە نینە ئەگەر تێ دەرباس نەبت، و ئەز نزانم پشتی ئەز تێ دبۆرم کانێ دێ ژێ خلاص بم یان نە.

هندەکان گۆتێ: خودێ د گەل هەوە بت، هەوە بپارێزت، و ب سلامەتی بۆ مە بزڤرینت، هنگی عەبدللاهی گۆت:

لكنني أسأل الرحمن مغفرة　　وضربةً ذاتَ فرْغٍ تقذِفُ الزبدا
أو طعنةً بيدَي حرّانَ مُجْهِزَةً　　بحربةٍ تُنفِذُ الأحشاءَ و الكَبِدا
حتى يقال إذا مروا على جدثي　　أرشده الله من غاز و قد رشدا

و خودێ مرادا وی ب جهئینا، وەکی دێ بۆ مە دیار بت.

لەشکەری دا رێ حەتا گەهشتییە (مەعانێ) کو ئێک ژ پارێزگەهێن وەلاتێ ئوردونا نوکەیە، و ل وێرێ جاب گەهشتە وان کو عەرەبێن شامێ یێن

فەلە ب سەد هزار لەشکەران ڤە یێن دەرکەفتین دا شەڕێ موسلمانان بکەن، و هیرەقل ژی ب سەد هزار لەشکەرێن رۆمی ڤە دەرکەفتییە، و ئەو نوکە ل دەڤەرا بەلقائێنە و یێ ب نک وی جهی ڤە دئێن یێ موسلمان لێ دا شەڕێ وان بکەن.

موسلمان د ناڤبەرا خۆ دا کەفتنە دان و ستاندنێ کانێ ئەو چ بکەن؟ هندەکان گۆت: ئەم دێ کاغەزەکێ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنێرین، کانێ ئەو دێ چ فەرمانێ ل مە کەت، و هندەکان گۆت: ئارمانجا خۆ مە ب جهئینا، و ئەم گەهشتینە وەلاتێ وان و مە سەهما خۆ هاڤێتە دلێن وان، یا باش ئەوە ئەم بزڤڕین، و سلامەتی چێترە.. هنگی عەبدللاهێ کوڕێ رەواحەی گۆت: ئەرێ ترسا هەوە ژ چییە؟ ئەو تشتێ هوین ژێ دترسن هوین بۆ وی یێن هاتین، هوین یێن هاتین شەهیدبوونێ دخوازن، ئەم چو جاران ب هژمارا خۆ شەڕێ نەیاران ناکەین، ئەم ب وی دینی شەڕێ وان دکەین یێ خودێ کەرەم پێ د گەل مە کری، ڤێجا دودل نەبن و بۆ پێشڤە هەڕن، ئێک ژ دو باشییانە: یان دێ ب سەرکەڤن یان دێ شەهید بن.

لەشکەری گۆتێ تو ڕاست دبێژی، و سەرلەشکەرێ موسلمانان زەیدی بڕیار دا قەستا دەڤەرا (بەلقائێ) بکەت، و ل باکوورێ (کەرکێ) ل جهەکێ دبێژنێ: (موئتە) هەردو لەشکەر گەهشتنە ئێک، و ئەگەر ب حسێبێن لەشکەری با دڤیا د چەند دەقیقەکێن کێم دا لەشکەرێ کافران موسلمان هەمی داعویرابان! بەلێ حسێبا خودێ یا ب ڕەنگەکێ دی بوو، د گەل کو کوشتنەکا نە یا کێم کەفتە ناڤ ڕێزێن موسلمانان، بەلێ ئەو وەکی سکرەکێ پیلایی ل بەر سنگێ خاچپەرێسێن رۆمێ و عەرەبێن شامێ ڕاوەستیان، و ل ڕۆژا ئێکێ هەمییێ وان بەردەوامی دا شەڕێ خۆ.

ئالا د دەستێ زەیدی دا بوو، و پشتی شەڕەکێ دژوار ئەو هاتە کوشتن، و بەری ئالا بکەڤت جەعفەری خۆ تێ وەرکر و ژێ ستاند و گۆت:

يـا حبـذا الجنـة واقترابهـا     طيبـة وبـارد شرابهـا
والروم روم قد دنـا عـذابها     كـافرة بعيـدة أنسـابها
عـلي إن لاقيتهـا ضرابهـا

جەعفەرێ کوڕێ ئەبوو طالبی هێرش دا سەر لەشکەرێ رۆمێ، و برینەک ل دویڤ ئێکێ کەفتە لەشێ وی، بەلێ ئەو پاشدا نەزڤڕی، بوخاری ژ عەبدللاهێ کوڕێ عومەری ڤەدگوهێزت، و ئەو ئێک ژ وان بوو یێن ل ڤی شەڕی ئامادەبووین، دبێژت: پشتی شەڕی دەمێ مە جەنازێ جەعفەری د ناڤ کوشتییان دا دیتی مە برینێن وی هژمارتن نۆت و تشتەک برین د لەشێ وی بوون.

د ڤی شەڕی دا هەردو دەستێن جەعفەری هاتنە برین، و ستویێ وی ژی ب شیرێ کافرەکی هاتە برین، و دبێژن: جەعفەر ئێکەمین کەسە بۆ ئیسلامێ هاتییە سەرژێکرن، و د حەدیسێن دورست دا هاتییە کو پێش هەردو دەستێن وی ڤە خودێ د بەحەشتێ دا دو چەنگ یێن داینێ و ئەو پێ دفرت، لەو دبێژنێ: (جەعفەرێ طەییار)، و بەری ئالا ژ ناڤ هەردو چەنگێن جەعفەری بکەڤت، عەبدللاهێ کوڕێ رەواحی خۆ لێ دا، و ئەو بلند کر، و هەسپێ خۆ هاژۆت، و هەر وەکی پیچەکێ ئەو ب دودلییێ حەسیا یان ترس بۆ چێبوو، هنگی وی ئەڤ شعرە ب خۆ گۆت:

أقسـمت يـا نفـس لتنزلنـه     لتنـزلن أو لتكرهنـه
إن أجلب الناس و شدوا الرنه     مـا لي أراك تكـرهين الجنـة
قـد طالمـا قـد كنـت مطمئنـة     هل أنـت إلا نطفـة في شـنة

پاشی ئەو چەندەکێ پێشڤە چوو و گۆت:

يــا نفــس إلا تقــتلي تمــوتي      هذا حمام الموت قد صليت
ومــا تمنيــت فقــد أعطيــت      إن تفعــلي فعلهــا هــديت

و هنگـی ڕاوەسـتیا حـەتا ئـەو ژی ل سـەر ڕێـکا هـەردو هـەڤالێن خـۆ چووی، و شەهیدبووی، و بەری ئالا ژ دەستێ وی بکەفتـە عـەردی، و کـەفتنا ئالای ل وی دەمی نیشانا شکەستنا لـەشکـەری بوو، ثابتێ کـوڕێ ئـەقرەمی، و ئەو ئێـک ژ وان صەحابییان بوو یێن ل بەدرێ ئامـادە بـووین، خۆ د ئـالای وەرکر و ئەو بلند کر، و ژ بـەر کـو ئـەوێ ئـالایی هلگـرت مـەعنا وێ ئـەو بـوو ئەو مەزنێ لەشکەرییە، و چونکی ثابتی حەز نەدکر کەس تێ بگەهت کو ئەڤە وی خۆ کرە مەزنێ لەشکەری، ئـەو وێڤـەتر چـوو و ئـالا چکلانـد و گـازی کـر: گەلی موسلمانان، کەسەکی هلبژێرن دا ئالایی هلگرت. خـەلکی گـۆتێ: هـەما تو وی هلگرە.. وی گـۆت: نـە، ئـەز وێ چـەندێ ناکـەم. و هنگـی چاڤێن وی ب خالـدی کـەفتن، وی گـۆتێ: وەرە ئـالایی هلگـرە، خالـدی خـۆ دا پـاش و گۆتێ: تو ئێک ژ خەلکێ بەدرێ یی، تو هەژیتری بۆ ڤێ چەنـدێ، وی گـۆت: سەرلـەشکـەر دێ تـو بی، و گاڤا خـەلکی ئـەڤ چەنـدە ژ وی دیتـی هـەمییان گۆتـە خالـدی: کـەس ژ تـە فـەرتر نینـە بـۆ ڤـی کـاری، و هنگـی خالـدی ئـالا هلگـرت، و ئارمانجـا خـۆ یـا سـەرەکی کـرە ئـەو: ئـەو لـەشکـەری ژ تێچوونـا مسۆگەر ڕزگار بکەت، بێی نەیار هزر بکەن ئەڤە ئەو شکەستن و ڕەڤین.

خالدی فەرمان دا موسلمانان کو بـەردەوامییێ بدەنـە شـەڕی حـەتا دنیـا تاری ببت، دا پشتی هنگی ئەو پلانا خۆ یـا لـەشکـەری ل بـن پـەردێ تـارییێ ب جهـ بینـت، و پلانـا وی ئـەو بـوو ئـەو لـەشکـەری ب ڕەنگـەکێ دی ڕێـک بێخت، و جهێن وان پێـک بگوهۆڕت، دا سپێدێ دەمێ نەیار وان دبیـنـن هزر بکـەن هنـدەک لـەشکـەرێ دی یـێ د هـەوارا موسـلمانان هـاتی، و ب شـەڤێ دەمێ خالدی ژ لـەشکـەری خواستی ئـەو جهـێ خـۆ پێـک بگوهـۆڕن، وی گۆتـە

وان: دەنگ و دۆرەکێ بلند ژ خۆ دەربێخن دا دەنگێ هەوە بگەهتە دوژمنی و ئەو هزر بکەن کو ئەڤە هاریکاری گەهشتە مە.. و ڤێ پلانا خالدی جهێ خۆ گرت و وەسا چێبوو وەکی وی ڤیای، و سپێدێ گاڤا لەشکەرێ رۆمێ هاتییە مەیدانێ دیت سەر و بەرێ موسلمانان یێ هاتییە گوهارتن و ئەو یێ لەشکەرەکێ نوی دبینن.

ل دۆر ئەنجامێ ئەڤ شەڕە یێ ب دووماهی هاتی، دیرۆکنڤیسێن کەڤن و یێن نوی سێ بۆچوون هەنە:

هندەک دبێژن: لەشکەرێ رۆمێ هەر چەندە هژمارا وان گەلەک ژ یا موسلمانان زێدەتر ژی بوو، بەلێ ئەو ل بەر موسلمانان شکەستن، پشتی خالدی ئەو پلان ب جهئینای یا مە بەحس ژێ کری، و وان هزرکری ئەڤە هاریکاری گەهشتە موسلمانان، و ب تایبەتی پشتی موسلمانان هندەک ژ مەزنێن عەرەبێن فەلە کوشتین ئەوێن پشتەڤانییا رۆمێ دکر.. هنگی شکەستن کەفتە ریزێن وان، و ئەو پاشدا چوون.

و هندەکێن دی دبێژن: رۆم د ڤی شەڕی دا شیانە موسلمانان، و موسلمان شکەستن، و تشتێ خالدی کری ئەو بوو وی نەهێلا لەشکەرێ وی بکەفتە دەستێ نەیاران، و ئەو شیا وان ژ مەیدانێ ڤەکێشت، و پاشدا بچن، و بزڤڕنە ڤە.

و بۆچوونا دورستتر یا سێیێیە ئەوا ئبن ئسحاق د سیرەتێ دا ڤەدگێڕت، و دبێژت: د ڤی شەڕی دا هەردو لا وەکهەڤ دەرکەفتن، و چو سەرکەفتی و شکەستی نەبوون، هەردو لایان زیان دان، و شەڕەکێ درێژ کر، و خۆڕاگرت، پاشی پشتی ئەو وەستیاین، ئەو ژێک ڤەڕەڤین، و کەسێ هزرا هندێ نەکر ب دویڤ یێ دی دا بچت، و هەر ئێک زڤڕی جهێ خۆ. بەلێ ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینین کو هژمارا کافران د ڤی شەڕی دا گەلەک و گەلەک ژ یا

موسلمانان زێدەتر بوو، و چەکێ وان پـتـر یــێ پێشکەفتی بــوو، و ئـەو ل دەڤەرێ شارەزاتر بوو، وەکهەڤی ژی (یان حەتا خۆڤەکێشانا موسـلمانان ژی ژ مەیدانا شەڕی ب سلامەتی) بۆ وان ڕەنگەکێ سەرکەفتنێ بوو.

بـەری لـەشـکەر بزڤڕتـە مـەدینێ، و هێشـتا دەنـگ و بـاس نەگەهشـتین، خودێ وەک موعجیزە بۆ پێغەمبەرێ خۆ ئەو ب حالێ شەڕکەران ئاگەهدار کر، لەو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب سەر مینبـەرێ کـەفت و ب دو چاڤێن تـژی ڕۆنـدک ڤـە وی خەبـەرێ شـەهیدبوونا وان هـەر سـێ صـەحابییان گەهانـدە موسلمانان یێن کو وی بۆ سەرلەشکەرییێ هلبژارتین، و گۆتـە وان کـو پشـتی شەهیدبوونا وان هەر سێیان خودێ شیرەک ژ شـیرێن خـۆ ل سـەر نـەیاران زال کـر، کـو خالـدە، حـەتا ل سـەر موسـلمانان بوویـە فرەهـی.. و ژ هنگـی وەرە ناسناڤێ (سیف الله المسلول) ل سەر خالدێ کوڕێ وەلیدی هاتەدانان.

# ڤەکرنا مەکەهێ ل بەر ڕۆناهییا ئیسلامێ
## (الفتح المبين)

ل هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا هشتێ مشەختی، و پشتی شەڕێ موئتە ب نێزیکی دو هەیڤان، خودێ وەسا حەز کر بـاژێڕێ مەکەها پیرۆز کراسێ شرکێ ژ بەر خۆ بکەت، و دەرگەهێن خۆ ل بەر ڕۆناهییا ئیسلامێ ڤەکەت.

**ئەگەرا ڤەکرنا موسلمانان بۆ مەکەهێ:**

بەری نوکە د سەرهاتییێن سالا شەشێ مشەختی دا، دەمێ مە بەحسێ ڕێککەفتنا حودەیبییێ کری ئەوا د ناڤبەرا موسلمان و کافرێن مەکەهێ دا چێبووی، مە گۆتبوو: موسلمان و کافر ل سەر چەند شەرتەکان پێکهاتبوون، ئێک ژ وان ئەو بوو: چێ نابت دەهـ سالێن دی چو شەڕ د ناڤبەرا هەردو لایـان دا بێنەکرن، و هەر ئویجاخەکا عەرەبان یا بڤێت ماف هەیە خۆ بدەتە د گەل موسلمانان یان د گەل قورەیشییان، و ئەو ئویجاخا خۆ بدەتە د گەل لایەکی حسێبا وی لایی دێ د گەل ئێتەکرن، یەعنی: ئەو ژی دکەفتە د بن بەندێن ڕێککەفتنێ ڤە.

هەردو هەیڤێن دووماهییێ ژ سالا شەشێ، و سالا حەفتێ هەمییێ، و نێزیکی شەش هەیڤان ژ سالا هەشتێ، کار ب وێ ڕێککەفتنێ هاتەکرن ئەوا ل حودەیبییێ هاتییە مۆرکرن.. ل باکوورێ باژێڕێ مەکەهێ دو ئویجاخێن عەرەبان هەبوون، ئێکێ دگۆتنێ: (بەنوو بەکر) و یا دی دگۆتنێ: (بەنوو خوزاعە) د ناڤبەرا وان دا خوینداری هەبوو، و دەم بۆ دەمی هندەک ژ وان دهاتنە کوشتن، دەمێ موسلمان و قورەیشی ل حودەیبییێ پێکهاتین، خوزاعییان خۆ دا د گەل موسلمانان، و بەکرییان خۆ دا د گەل کافرێن

مەکەهێ، و ل سەر بناخەیێ ڕێککەفتنا حودەیبییێ صولح د ناڤبەرا وان هەردو ئویجاخان ژی دا چێبوو.

ئویجاخا بەکرییان، ئەوێن بەری هنگی هندەک زەلام ژێ ب دەستێ خوزاعییان هاتینە کوشتن، ڕێککەفتن بۆ خۆ ب دەلیڤە زانی کو تۆلا خۆ ژ خوزاعییان بستینن، و گۆتن: خوزاعی نوکە ژ مە دغافلن و ئەو هزر دکەن ژ بەر ڕێککەفتنێ ئەم چو ل وان ناکەین. لەوا هندەک زەلام ژ وان چوونە سەر ئاڤەکێ و خۆ ل بەر زەلامێن خوزاعی ڤەنویسا، و گاڤا دەلیڤەیا خۆ دیتی هندەک زەلام ژ وان کوشتن.. و هنگی شەڕ د ناڤبەرا هەردو لایان دا پەیدابوو، و ئەو جهێ شەڕ لێ چێبووی نێزیکی مەکەهێ بوو، گاڤا قورەیشییان ب ڤێ چەندێ زانی ڕابوون چەک بۆ هەڤالێن خۆ ژ بەکرییان هنارت، و ب شەڤێ هندەک زەلامێن خۆ ژی هنارتن دا هاری وان بکەن، و ب ڤێ چەندێ هێزا بەکرییان پتر لێ هات، و خوزاعی بەرانبەر وان شکەستن، خوزاعییان خۆ ڤەکێشا حەتا چووینە د توخوبێن حەرەما مەکەهێ دا، ئەو جهێ ل نک عەرەبان چێ نەدبوو شەڕ لێ بێتەکرن، هنگی هندەک زەلامێن بەکرییان گۆتە مەزنێ خۆ: خودایێ خۆ ژ بیر نەکە، ئەم گەهشتینە توخوبێن حەرەمێ چێ نابت شەڕ ل ڤێرێ بێتەکرن! وی بەرسڤا زەلامێن خۆ دا: چو خودا ئەڤرۆ نینن! هەڕن تۆلا خۆ بستینن، هوین ل حەرەمێ دزییان دکەن، ڤێجا بۆچی هوین تۆلا خۆ ڤەناکەن؟!

هنگی وان داخوازا مەزنێ خۆ ب جهئینا، و پێ ل دین و عورف و عەدەتێن خۆ دانا، و هێرش دا سەر خوزاعییان و چەند زەلام ژێ کوشتن، ژ لایەکێ دی ڤە وان د گەل قورەیشییان پێ ل ڕێککەفتنا حودەیبییێ ژی دانا، دەمێ شەڕێ خوزاعییان کری ئەوێن بووینە حەلیفێن موسلمانان.. و هنگی دەمێ هندەک مرۆڤێن تێگەهشتی ژ قورەیشییان گۆتییە هەڤالێن خۆ:

ڤی کاریٚ خەلەت نەکەن، و پشتا بەکرییان دژی خوزاعییان نەگرن؛ چونکی ئەڤە دبتە شکاندن بۆ ڕێککەفتنا هەوە د گەل موحەممەدی، و ئەنجامیٚ ڤیٚ چەندیٚ دیٚ گران ل سەر هەوە ڕاوەستت. وان گۆتیٚ: شەڤە، موحەممەد ژ کیڤە دیٚ زانت مە هاری بەکرییان کرییە.. پشتی هنگی چی گاڤا وی زانی ژی ئەم دیٚ حاشاتیییٚ کەین!

دەمیٚ ئەڤ ڕویدانە چێبووی، عەمریٚ کوڕیٚ سالمیٚ خوزاعی د گەل چەند زەلامەکان چوو و قستا مەدینیٚ کر، گاڤا گەهشتییە مەدینیٚ، چوو مزگەفتیٚ ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لیٚ بن- دیت ئەو یێ ڕوینشتییە و هندەک هەڤالێن وی یێن ل دۆر وی، هنگی وی شعرەک گۆت، تێدا داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لیٚ بن- کر کو ئەو د هەوارا وان بچت، و وان ب سەر بێخت. هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لیٚ بن- ئەو پشتڕاست کر کو ئەو دیٚ پشتەڤانییا وی و ئویجاخا وی کەت.

پاشی پشتی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لیٚ بن- ڕاستییا گۆتنا خوزاعییان ئاشکەرابووی، وی کاغەزەک بۆ قورەیشییان هنارت و گۆتە وان: دڤێت هوین دەستان ژ پەیمانا خۆ د گەل بەکرییان بشۆن، و خوینا وان کەسان ژی بدەن یێن هەوە کوشتین ژ خوزاعییان، ئەگەر نە.. د ناڤبەرا مە و هەوە دا شەڕە. گاڤا کاغەز گەهشتییە قورەیشییان، وان گۆت: نە ئەم ویٚ دکەین نە ویٚ!

ب ڤیٚ چەندیٚ قورەیشییان ب گۆتن و کریار ڕێککەفتنا حودەیبیییٚ بن پیٚ کر، و هنگی موسلمانان خۆ ئازاد دیت ژ ویٚ صولحیٚ یا ئەو پێڤە هاتینە گرێدان.

## ڕاوەستانەک د گەل سەرهاتییەکیٚ:

د ڕویدانێن سەرهاتییا ڤەکرنا مەکەهیٚ دا، ئبن ئیسحاق و واقدی هەردو ڤەدگوهێزن، کو پشتی قورەیشییان پشتەڤانییا بەکرییان کری، ئەو

ب خەلـەتييا ڤـى كـارێ خـۆ حسـێيان، و ترسـييان موسـلمانان كارڤەدانـەكا وەسا هـەبـت زيـان پـێ بگەهتـە وان، چونكى وان زانيبوو كـو د ڤـان هـەردو ساليێن بۆرين دا موسلمان هند ب هێز كەفتبوون حەتا كـو بشـێن بـەرهنگارييا لەشـكەرێ قەيصـەرێ رۆمـێ بكـەن، لـەو وان بريـار دا مـەزنێ خـۆ ئـەبوو سوفيانى بهنێرنە مەدينێ، دا ئەو پەيمانا حودەيبييێ دوبارە نوى كەتەڤە.

و دبێژن: دەمێ ئەبوو سوفيان گەهشـتييە مـەدينێ، ئـەو چـوو نـك كچا خۆ (ئوم حەبيبە) كو كابانييا پێغەمبەرى بوو -سلاڤ لێ بن-، بەلێ كچا وى پێشـوازى لـێ نـەكر، و جۆدەليـك ژ بن وى ڕاكر، و گـۆتێ: ئەڤـە جۆدەليكا پێغەمبەرييە، و تو مرۆڤەكێ موشركى.. هنگى ئەبوو سـوفيان ب حێبـەتى ڤـە ژ نـك وێ دەركـەفت و چـوو مزگـەفتێ ل نـك پێغـەمبـەرى -سـلاڤ لـێ بـن- بەلێ پێغەمبەر د گـەل وى نەئاخفت، و ئـەو چـوو نك ئەبوو بەكرى ئـەو ژى د گەل نەئاخفت، پاشى چوو نك عومەرى پاشى عەلى.. ديسا چو ب دەست ڤە نەهات، لەو زڤڕى مەكەهێ بێى دەسكەفتييەك بگەهتێ.

ئەڤ سەرهاتييە يا كو د گەلەك كتێبێن سيرەتێ دا دئێتـە ڤەگوهاسـتن، زانايێن حەديسێ دبێژن: ئەو يا بێ بناخەيە، و چو سەنەدێن دورست بۆ نينن.

**ئامادەييێن چوونا مەكەهێ:**

دەمـێ بۆ پێغەمبەرى -سلاڤ لـێ بـن- مسـۆگەر بـووى كـو قورەيشـييان ب بێ منەتى ڤە پێ ل بەندێن ڕێككەفتنا حودەيبييێ دانايە، بێى كو هزرەكێ بۆ كارێ خۆ يێ خراب بكەن، وى ب لـەز، بريـارا چوونـا بـەر ب مەكـەهێ ڤـە دا، و دەمـێ وى داخـواز ژ صـەحابييێن خـۆ كـرى كـو ئـەو خـۆ بـۆ غەزايـەكێ ئامادە بكەن، وى ل دەسپێكێ نەگۆتە وان دێ كيڤە چين، حـەتـا هـنـدەك ژ وان هزر دكر ئەو دێ ب لايێ رۆمێ ڤە دەركەڤن.. و ئارمانجا پێغەمبـەرى -سلاڤ لێ بن- ژ ڤێ چەندێ ئەو بوو دەنگ و باسێن دەركەفتنا وى نەگەهنـە

قورەیشییان، دا ئەو کارێ شەڕی نەکەن، و وی دوعا ژ خودایێ خۆ کرن کو ئەو چاڤێن قورەیشییان تاری بکەت؛ دا ئەو ب دەرکەفتنا وی نەحەسییێن.

و دا ئەو پتر مەسەلێ ل بەر خەلکی بەرزە کەت، بەری دەرکەفتنا وی ب دو سێ ڕۆژەکان وی سەرییەکا لەشکەری ب سەرۆکاتییا ئەبوو قەتادەیێ ئەنصاری هنارتە دەڤەرا نەجدێ ل ڕۆژهەلاتا مەدینێ؛ دا خەلک هزر بکەن کو دیارە وی دڤێت ب لایێ نەجدێ ڤە بچت، بەلێ وەسا ئاشکەرا بوو کو هنارتنا ڤێ سەرییێ ب تنێ بۆ هندێ بوو دا مەسەلێ ل بەر خەلکی بەرزە کەت.

ژ لایەکێ دی ڤە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هندەک جاسووس هنارتنە سەرێن ڕێکان، ب تایبەتی ڕێکێن مەکەهێ، دا نەهێلت چو دەنگ و باس ب لایێ مەکەهێ ڤە بچن، و ئەڤ بەرهەڤیێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کرین ل دەسپێکا هەیڤا ڕەمەزانێ بوون ژ سالا هەشتێ مشەختی.

## حاطەب و خەلەتییەکا مەزن:

حاطەبێ کوڕێ ئەبوو بەلتەعەیێ لەخمی ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن ژ مەکەهێ مشەختبووینە مەدینێ، و ئێک ژ وان بوو یێن ل شەڕێ بەدرێ و شەڕێن د دویڤ دا ژی د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئامادە بووین، و ئێک ژ وان ژی بوو یێن ل حودەیبییێ بەیعە دایە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ئەو قاصدێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- بۆ مەزنێ ئەسکەندەرییێ موقەوقسی.

هەر چەندە حاطب ل مەکەهێ دژیا بەری مشەخت ببت، بەلێ ئەو ژ ئویجاخا لەخمییان بوو و قورەیشی نەبوو، کارێ وی بازرگانییا تشتێن خوارنێ بوو، و دبێژن: ئەو ڕمبازەکێ سەکڤان و زیرەک بوو، دەمێ ئەو مشەختبوویە مەدینێ، هندەک ژ مال و عەیالێ وی مابوونە ل مەکەهێ،

دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دای قەستا مەکەهێ بکەت، و بەری ئەو د گەل صەحابییێن خۆ ژ مەدینێ دەرکەڤت، حاطەبی کاغەزەک بۆ هندەک مرۆڤان ژ مەزنێن مەکەهێ نڤیسی تێدا ئاگەهدارییا وان کر کو ئەڤە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالێن خۆ دەرکەفت و وی ئنیەتە قەستا مەکەهێ بکەت، ڤێجا بلا هەوە ئاگەهـ ژ خۆ هەبت.. و وی کاغەزا خۆ د گەل ژنەکێ هنارت. ئەڤ کارێ حاطەبی کری د فەرهەنگا سیاسی و لەشکەری دا ژ جاسووسییێ دهاتە هژمارتن، و ئەو کارەک بوو دڤیا ژ ئێکێ وەکی حاطەبی چێ نەبا، بەلێ دڤێت ئەم ژ بیر نەکەین کو صەحابی مرۆڤن، و ئەو د مەعصووم نینن ژ گونەهـ و خەلەتییان، ئەگەر خۆ ئەو خەلەتی دمەزن ژی بن.. خودێ دڤیا ڤی جیلێ مرۆڤان ب هەمی ڕەنگان بجەرببینت، دا نەفسێن وان صافی و زەلال بکەت.

خودێ وەحی بۆ پێغەمبەرێ خۆ هنارت و ئەو ب کارێ حاطەبی ئاگەهدار کر، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەر ب لەز عەلی و زوبەیر و مقداد ب دویڤ وێ ژنێ دا هنارتن، دا ئەو ڕێکێ لێ بگرن، و کاغەزێ ژێ بستینن، و ژ لایەکێ دی ڤە وی هنارتە ب دویڤ حاطەبی ژی ڕا، و پشتی عەلی و هەڤالێن وی کاغەز ژ ژنکێ ستاندی و هاتینە مەدینێ، عومەرێ کوڕێ خەططابی گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ڕێ بدە من ئەز وی بکوژم؛ چونکی وی خیانەت ل خودێ و پێغەمبەری و خودان باوەران کر.. پێغەمبەری گۆتە حاطەبی: بۆچی تە ئەڤ کارە کر؟ وی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ب خودێ ئەز د باوەرییا خۆ دا نەکەفتیمە گومانێ، بەلێ من دڤیا قەنجییەکێ ل قورەیشییان بکەم؛ دا ئەو چو نەخۆشییێ نەگەهیننە عەیالێ من ئەوێ ل مەدینێ، چونکی تو دزانی کو د ناڤ صەحابییان دا من ب تنێ کەسێ خۆ ل مەکەهێ نینە مرۆڤێن من بپارێزن. هنگی پێغەمبەری

-سلاڤ لێ بن- گۆتە صەحابییان: وی ڕاستی بۆ هەوە گۆت. عومەری گۆت: وی خیانەت ل خودێ و پێغەمبەری و خودان باوەران کر، رێ بدە من وی بکوژم. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەو ژ خەلکێ بەدرێیە، و تو چو دزانی بەلکی خودێ ب سەر خەلکێ بەدرێ ڤە هاتییە و گۆتییێ: هوین چ دکەن بکەن من بەحشتا دایە هەوە، یان: من گونەهێن هەوە ژێبرینە. هنگی چاڤێن عومەری تژی ڕۆندک بوون و گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی چێتر دزانن[1].

ئەڤ ڕویدانە و ئەو هەلویستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ ڤی صەحابی وەرگرتی دەرسەکا مەزن نیشا مە ددەت، ئەو ژی ئەڤەیە: دڤێت مرۆڤ لەزێ د حوکمێ خۆ دا ل سەر خەلکی نەکەت، ب تایبەتی ئەوێن ب باشییێ و زانینێ و ئیخلاصا بۆ دینی هاتینە نیاسین، ئەگەر خۆ خەلەتییەکا مەزن ژی ژ وان پەیدا ببت، و ئەو هندێ ژی دگەهینت کو ئیمامی ماف هەیە ل وی کەسی ببۆرت یێ خەلەتییەکا مەزن ژێ پەیدا ببت، ئەگەر خۆ جاسووسی ژی بت، ئەگەر وی لێبۆرین چێتر دیت.

هەژییە بێژین: ئەڤ صەحابییە ل سالا سیێ مشەختی مربوو.

## چوون بەر ب مەکەهێ ڤە:

ل دەهی هەیڤا ڕەمەزانێ ژ سالا هەشتێ مشەختی (سەرێ سالا ٦٣٠ ز) پشتی ئێڤاری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل دەهـ هزار صەحابییان ژ مەدینێ دەرکەفت و بەر ب مەکەهێ ڤە چوو، پشتی کو ئەبوو روهم کولثومێ کوڕێ حوصەینێ غیفاری ل جهێ خۆ هێلایە ل مەدینێ، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ب ڕۆژی بوون، و دەمێ ئەو گەهشتینە (کودەیدێ) کو جهەکە دکەفتە نێزیکی عوسفانێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-

(١) هۆسا بوخاری (٣٩٨٣) ڤەدگوهێزت.

و صەحابییان ڕۆژییێن خۆ خوارن، دا ئەو ب هێز بکەڤن دەمێ دچنە مەکەهێ؛ چونکی وان نەدزانی کانێ دێ چ چێ بت.

### مشەختبوونا عەبباسی:

ل وی دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی بەر ب مەکەهێ ڤە دچوون، مامێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەبباسێ کوڕێ عەبدلموطەلبی عەیالێ خۆ ژ مەکەهێ دەرێخستبوو، و دچوو دا قەستا مەدینێ بکەت، و مشەخت ببت، بەلێ دەمێ ئەو گەهشتییە دەڤەرا (جوحفە) کو (١٨٧) کم یا دویرە ژ مەکەهێ، وی دیت پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل صەحابییێن خۆ یێ دئێتە مەکەهێ، لەوا وی ل وێرێ خۆ گەهاندە موسلمانان و د گەل وان زڤڕی مەکەهێ.

هەر وەسا ب ڕێڤە ل دەڤەرا (ثنیة العقاب) پسمامێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەبوو سوفیانێ کوڕێ حارثی و خزمێ وی برایێ ژنکا وی ئوم سەلەمەیێ عەبدللاهێ کوڕێ ئومەییەی گەهشتنە موسلمانان و ل سەر دەستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- موسلمان بوون، و ئەو هەردو ژ دوژمنێن مەزنێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دهاتنە هژمارتن، و وان گەلەک نەخۆشی ب ئەزمانێ خۆ و دەستێ خۆ گەهاندبوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، د گەل هندێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ئەو عەفووکرن.

### موسلمانبوونا ئەبوو سوفیانی:

لەشکەرێ موسلمانان دا ڕێ حەتا گەهشتینە وی جهێ دبێژنێ: (مر الظهران) ئەوێ (٢٢) کیلۆمتران ژ باکوورێ مەکەهێ دویر.. و حەتا وی دەمی هێشتا خەبەرێ دەرکەفتنا موسلمانان و هاتنا وان بەر ب مەکەهێ ڤە ب چو ڕەنگان نەگەهشتبوو قورەیشییان، و وان تشتەک ژ مەسەلێ نەدزانی. ل ڤی جهی ئێڤار ب سەر موسلمانان دا هات، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ

بن- بریار دا ئەو وێ شەڤێ ل وێرێ بدانن، و هندەک دار و بار ل وێرێ هەبوو ڕەنگەکێ فێقی پێڤە دهات، هندەک صەحابی ژ برسان دا ب وان داران وەرهاتن و فێقی ژێ چنی و خوارن، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: فلان ڕەنگێ فێقی ژ فلان داران بچنن ئەو خۆشترە.. و دەمێ وان پسیارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری کانێ چاوا ئەو ڤێ چەندێ دزانت، وی ئاگەهدارییا وان کر کو دەمێ ئەو یێ بچویک و جحێل وی شڤانی ل ڤی جهی دکر، لەوا ئەو ب سەر و بەرێ جهی یێ زانایە..

و هەر هنگی بوو دەمێ عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی ب سەر داران کەفتی، و هندەک صەحابییان پییێن وی یێن زراف و ڕەق و هشک دیتین پێ کرە کەنی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: هوین ژ زراڤییا پییێن وی دعەجێبگرتینە؟ ب خودێ ئەو د تەرازییێ دا ژ چیایێ ئوحودی گرانترن.

دەمێ دنیا تاری بووی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل هەڤالێن خۆ کر کو هەر ئێک ژ وان ئاگرەکی هلکەتێ، و دڤێت ژ بیر نەکەین کو هژمارا وان دەهـ هزار کەس بوون، ڤێجا هزر بکەن ب شەڤێ نێزیکی دەهـ هزار ئاگران بێنە هلکرن، هەیبەتا لەشکەری دێ چەند بت؟

گاڤا عەبباسێ کوڕێ عەبدلموطەلبی ئەڤ چەندە دیتی، سەهمێ سەرێ وی گرت، و هزرا خۆ کر و د گەل خۆ گۆت: ئەڤ هەمی لەشکەرە ئەگەر سوباهی ب سەر مەکەهێ دا بگرت، و خەلکێ مەکەهێ ژ عینادا خۆ نەئێنە خوارێ و بەرهنگارییا موسلمانان بکەن، ئەرێ حالێ قورەیشییان و بازێڕێ وان دێ چ بت؟ ڤێ هزرێ ترسەکا مەزن د دلێ وی دا پەیدا کر، و وی نەزانی دێ چ کەت؟ خەبەرەکی بهنێرتە مەکەهێ؟ چێ نابت ئەو ڤێ چەندێ بێی دەستویرییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت، خۆ بێ دەنگ بکەت؟ دبت هیلاکا قورەیشییان د ڤێ چەندێ دا بت!

تشتێ ب وی مای ئەو بوو، ئەو ل هێسترا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سویار بوو، و ژ ناڤ لەشکەری دەرکەفت و خۆ ڤەدەر کر، و حێبەتی ما نەزانی چ بکەت.. و قەدەرا خودێ وەسا چێبوو ل بن پەردێ تارییێ دەنگێ هندەک مرۆڤان هاتێ، وی گوهێ خۆ دایێ: زەلامەکێ دبێژتە هەڤالەکێ خۆ: ئەڤە چ ئاگرن هلبووینێ، ب عەمرێ خۆ من لەشکەرەکێ هندە بۆش نەدیتییە! هەڤالێ وی گۆتێ: دیارە ئەڤە ئویجاخا خوزاعەیە ڕابوویە سەر خۆ دا تۆلا خۆ بستینت، یێ دی گۆتێ: نە، خوزاعییان هندە مرۆڤ نینن، ئەڤە تشتەکێ دییە.

عەبباسی باش گوهێ خۆ دایێ، ژ دەنگی زانی کو ئەڤە ئەبوو سوفیانە، کەیفا وی ب ڤێ چەندێ هات، لەو ب نک ڤە چوو و گازی کر: بابێ حەنظەلەی! ئەبوو سوفیانی بەرسڤا وی دا: بابێ فەضلی، ئەڤە تویی.. وی گۆت: بەلێ، ئەبوو سوفیانی گۆتێ: ئەڤە چ مەسەلەیە؟ عەبباسی گۆت: وەی بۆ تە ئەبوو سوفیان! ئەڤە پێغەمبەرێ خودێیە و هەڤالێن وی یێن هاتینە هەوە، ئەز ب خودێ کەمە خولی دێ ب قورەیشییان وەربت! ئەبوو سوفیانی ب ترس ڤە گۆتێ: چارە چییە؟ وی گۆت: ب خودێ تو بکەڤییە دەستێ وان ئەو دێ تە کوژن، ڤێجا ل پشت من سویار بە، دا ئەز تە ببەمە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەمانێ بۆ تە ژ وی بخوازم.

ئەبوو سوفیانی ب یا وی کر، و ل پشت وی سویار بوو، و عەبباسی بەرێ هێسترێ دا ناڤ لەشکەرێ موسلمانان و قەستا وی جهی کر یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- لێ، و هەر جارەکا ئەو د بەر ئاگرەکی ڕا چووبان، ئەوێن ل دۆر ئاگری دا بێژن: ئەڤە کییە؟ و گاڤا وان هێسترا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ددیت دا خۆ نێزیک کەن و بێژن: مامێ پێغەمبەرییە ل هێسترا وی سویار.. و دا زڤڕنە جهێ خۆ.

دەمێ ئەو د بەر وی ئاگری ڕا بۆرین یێ عومەرێ کوڕێ خەططابی ل نک، عومەری گازی کر: ئەو کییە؟ پاشی ب نک هێسترێ ڤە چوو، و گاڤا وی ئەبوو سوفیان دیتی وی ئەو نیاسی، لەو ب نک ڤە چوو و گۆت: دوژمنێ خودێ ئەبوو سوفیان! حەمد بۆ وی خودایی بت یێ تو ئێخستییە دەستێ من بێی سۆز و پەیمانەک تە هەبت.. هنگی عەبباسی هێستر ب لەز هاژۆت حەتا خۆ گەهاندییە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و عومری د دویڤ وان دا دکرە غار، گاڤا ئەو گەهشتینە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عومەری گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەڤە ئەبوو سوفیانە خودێ ئەو ئێخستە دەستێ مە بێی کو وی سۆز و پەیمانەک د گەل مە هەبت، دەستویرییێ بدە من ئەز وی بکوژم.. و بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- باخڤت، عەبباسی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەو یێ ل سەر بەختێ من.

گاڤا عومەری گەلەک قەرەبالغ کری، عەبباسی گۆتێ: هێدی هێدی عومەر! ب خودێ ئەگەر ئەو ژ مالباتا عەدی با -کو مالباتا عومەرییە- تە وە نەدگۆت! بەس تو دزانی ئەو ژ زەلامێن مالباتا عەبدمەنافییە لەو تو وە دبێژی. هنگی عومەری گۆت: هێدی هێدی عەبباس! ئەز ب خودێ کەمە موسلمانبوونا تە ڕۆژا تو موسلمانبووی بۆ من خۆشتر بوو ژ موسلمانبوونا خەططابی ئەگەر موسلمان ببا، چونکی ئەز دزانم موسلمانبوونا تە بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خۆشتر بوو.

هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە عەبباسی: وی ببە نک خۆ ئەڤ شەڤە و سوباهی سپێدی بینە نک من.

عەبباسی وە کر، و گاڤا بوویە سپێدە وی ئەو ئینایە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، پێغەمبەری گۆتێ: وەی بۆ تە ئەبوو سوفیان! مە نە دەمە تو

بزانی کو ژ خودێ پێڤەتر چو خوداییێن دی نینن، وی گۆت: دەیک و بابێن من گۆری تە بن! تو چەند یێ بێنفرەهـ و مەرد و ب مرۆڤاینییی! چو جاران من باوەر نەکرییە کو ژ خودێ پێڤەتر خودایەکێ دی هەیە. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: وەی بۆ تە ئەبوو سوفیان! مە نە دەمە تو بزانی کو ئەز پێغەمبەرێ خودێ مە؟ ئەبوو سوفیانی گۆت: دەیک و بابێن من گۆری تە بن! تو چەند یێ بێنفرەهـ و مەرد و ب مرۆڤاینییی! ئەڤێ هێشتا تشتەک ژێ د دلێ من دا مایە.

و ئەڤ صەراحەتا ئەبوو سوفیانی ل دیوانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ل مەوقفەکێ ب ڤی رەنگی هندێ دگەهینت کو ئەو مرۆڤەک بوو نەدترسییا و نە ژی موجامەلە و منافقی دکر، و ئەڤە نیشانا راستگۆییا خودانییە..

گاڤا سوحبەت گەهشتییە ڤێ دەرەجێ عەبباسی ئیسلام ل بەر وی شرین کر، و بیرا وی ل هندێ ئیناڤە کو ئەگەر ئەو عینادێ بکەت، و بەرهنگارییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت، مەسەلە دێ کێشتە کوشتنا وی، چونکی وی چو رێ نینن، و دویر نینە قورەیشی تێ بچن و بازێرێ وان ژی خراب ببت! هنگی ئەبوو سوفیانی شاهدە دا، و ب قەناعەت و باوەری هاتە د ئیسلامێ دا، و کەیفا عەبباسی گەلەک ب ڤێ چەندێ هات.

عەبباسی گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەبوو سوفیان زەلامەکە حەز ژ شانازییێ دکەت، ڤێجا تشتەکی بۆ وی بدانە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: بەلێ، هەچییێ بچتە د مالا ئەبوو سوفیانی ڤە ئەو یێ ئەمینە، و هەچییێ بچتە د مالا خۆ ڤە ئەو یێ ئەمینە، و هەچییێ بچتە د مزگەفتێ ڤە ئەو یێ ئەمینە.. ب ڤێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل نک مەزنێ مەکەهێ بریار دا هەچییێ شەری نەکەت، و روینتە خوارێ کی بت کی نەبت ئەو یێ ئەمینە و کەس دەست ناکەتە..

## نیشادانا (لەشكەرێ خودێ) بۆ ئەبوو سوفیانی:

بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەستوبریێ بدەتە ئەبوو سوفیانی كو بزڤرتە مەكەهێ، دا خەبەرێ هاتنا موسلمانان بگەهینتە خەلكی، وی گۆتە مامێ خۆ عەبباسی: ئەبوو سوفیانی ل دەرێ گەلی ڕاوەستینە بلا ئەو لەشكەرێ خودێ ببینت دەمێ دبۆرت.

عەبباس و ئەبوو سوفیان ل جهەكێ بلند ڕاوەستییان، و لەشكەر قۆل قۆل دەرباس بوو، و هەر قۆلەكێ دەرباس دبوو ئەبوو سوفیانی پسیار ژ عەبباسی دكر: ئەڤە كینە؟ عەبباس دا بێژتێ: ئەڤە فلان ئویجاخە، و هەر جار ئەو دا بێژت: مە و ڤان چ ژێكە! دووماهییێ كەتیبەیەكا لەشكەری یا كەسك بۆری، بەس چاڤێن وان د ناڤ كومزرییان ڕا دیار دكرن، ئەبوو سوفیانی گۆت: ئەڤە كینە؟ عەبباسی گۆتێ: ئەڤە پێغەمبەرە د گەل موهاجر و ئەنصاران. ئەبوو سوفیانی گۆت: كەسێ طاقەتا ڤان نینە.

پاشی وی گۆتە عەبباسی: بابێ فەضلی، ب خودێ ملكێ برازایێ تە ئەڤرۆ یێ مەزنە، عەبباسی گۆتێ: ئەبوو سوفیان، ئەڤە پێغەمبەراتییە.. وی گۆتێ: تو ڕاست دبێژی. عەبباسی گۆتێ: ڤێجا هەڕە ب قەومێ خۆ ڕا بگەهە!

و ئەڤ پێشچاڤكرنا لەشكەری یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- حەزكری ئەبوو سوفیان ب چاڤ ببینت، وەكی (شەڕەكێ نەفسی) بوو وی د گەل خەلكێ مەكەهێ كری، دا ئەو هزرا بەرهنگارییا لەشكەری نەكەن، و وێ كارەكێ هزری و نەفسی و لەشكەری یێ مەزن ل ئەبوو سوفیانی ب خۆ ژی كر، لەو دەمێ ئەو زڤرییە مەكەهێ ئەو زڤڕی مرۆڤەكێ دی یێ جودا!

و د ریوایەتەكێ دا هاتییە دەمێ قۆلەكێ ئەنصارییان د بەر ئەبوو سوفیانی ڕا بۆری و مەزنێ وان یێ ئالا د دەستی دا سەعدێ كوڕێ عوبادەیی

بوو، سەعد ل ئەبوو سوفیانی زڤری و گۆتێ: ئەڤرۆ رۆژا قەهرەمانییێیە، ئەڤرۆ کەعبە دێ ئێتە حەلالکرن.. مەخسەدا وی ئەو بوو: ئەڤرۆ خۆ ل نک کەعبێ ئەم دێ شەرێ هەوە کەین و هەوە کوژین. و گاڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆری، ئەبوو سوفیانی گۆتێ: تە های ژ سەعدی هەیە یێ چ دبێژت؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: سەعد چ دبێژت؟ وی گۆت: ئەو یێ دبێژت: ئەڤرۆ کەعبە دێ ئێتە حەلالکرن. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: سەعد درەوان دکەت! ئەڤرۆ خودێ پیرۆزییا کەعبێ دێ مەزن کەت. و سەرا ڤێ گۆتنێ وی ئالا ژ سەعدی ستاند و کرە د دەستێ کورێ وی قەیسی دا.

## ئەبوو سوفیان ل مەکەهێ:

پشتی ئەبوو سوفیانی (ئستعراضا لەشکەری) یا موسلمانان دیتی، ئەو ب لەز زڤری مەکەهێ، و د ناڤ خەلکی دا راببوو ڤە و کرە هەوار.. خەلک لێ کۆمبوون دا بزانن کانێ چ چێبوویە، وی ب دەنگەکێ بلند گازی کر: گەلی قورەیشییان! ئەڤە موحەممەدە یێ دئێت، و لەشکەرەکێ وەسا یێ د گەل دا هوین قەت نەشێن خۆ ل بەر بگرن.

پاشی وی بریارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەهاندە خەلکێ مەکەهێ کو هەچییێ بچتە د مالا ئەبوو سوفیانی ڤە ئەو یێ ئەمینە کەس چو لێ ناکەت.. هنگی وان گۆتێ: کەنگی دێ مالا تە تێرا مە هەمییان کەت؟ وی گۆت: و هەچییێ بچتە د کەعبێ ژی ڤە ئەو یێ ئەمینە، وان گۆت: کەعبە ژی تێرا مە ناکەت، وی گۆت: و هەچییێ بچتە د مالا خۆ ژی ڤە ئەو یێ ئەمینە، وان گۆت: ئەڤە باشە..

گاڤا ئەبوو سوفیانی ئەڤ خەبەرە گەهاندییە وان، ترسەکا مەزن کەفتە دلێن وان، و ئێدی وان هزرا بەرهنگارییێ نەکر، و هەر ئێک د مالا خۆ دا روینشت و بەرێ وی ما لێ کانێ مەسەلە دێ ل سەر چ راوەستت..

و ب ڤێ بڕیارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دای، ئەو شیا تشتەکێ وەکی وی یێ نوکە دبێژنێ: (قمدەغەیا هاتن و چوونی) ل بـاژێڕی پەیدا بکەت.. و ئاشکەرایە کو ڤالابوونا کۆلان و جادەیان ژ مرۆڤان ل دەمێ لەشکەر ب ناڤ بـاژێڕی دکەڤت، دبتە ئەگەرا هندێ کو چو شەڕ و لێکدان د ناڤبەرا هەردو لایان دا پەیدا نەبن.

**پلانا بندەستکرنا باژێڕی:**

پشتی ئەبوو سوفیانی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و لەشکەرێ موسلمانان ل (مر الظهران) هێلای، و ئەو جهەکە -وەکی مە گۆتی- دکەفتە باکوورێ بـاژێڕێ مەکەهێ ب دویراتییا بیست و دو کیلۆمتران، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا لەشکەر هەمی پێکڤە ب لایێ مەکەهێ ڤە بچت، و گاڤا ئەو گەهشتینە (ذي طوى) ل دویراتییا نێزیکی کیلۆمترەک و نیڤێ ل باکوورێ ڕۆژئاڤایا مەکەهێ، وی بڕیار دا لەشکەر ببتە چەند پارچەیەک:

کۆمەک وی دا د گەل خالدێ کوڕێ وەلیدی و فەرمان لێ کر کو ئەو ب لایێ ڕاستێ دا بچن، لایێ ڕۆژئاڤایا باژێڕی، حەتا دگەهنە باشووری، و ژ بنی ڤە بێنە مەکەهێ، و گۆتێ: ئەگەر هوین گەهشتنە مالان ل وێرێ ڕاوەستن و ئالایێ خۆ بچکلینن.

و کۆمەک دا د گەل زوبەیرێ کوڕێ عەووامی و فەرمان لێ کر ئەو ب لایێ چەپێ دا بچن، لایێ باکوورێ ڕۆژهەلاتا باژێڕی، و گۆتێ: ئەگەر هوین گەهشتنە حوجوونێ ئالایێ خۆ بچکلینن، و زێدەتر نەچن حەتا ئەم دگەهمە هەوە.

و کۆمەک دا د گەل سەعدێ کوڕێ عوبادەی، و کارێ وان ئەبوو ئەو ژ لایێ ڕۆژئاڤایا باژێڕی ڤە بێن، و فەرمان ل وان ژی کر ئەو شەڕی نەکەن، وەسا تێ نەبت شەڕێ وان بێتەکرن.

و کۆمەک ژ لەشکەرێ پەیا دا د گەل ئەبوو عوبەیدەی دا ژ لایێ باکووری ڤە قەستا باژێڕی بکەن.

و هۆسا هەمی لایێن باژێڕی هاتنە دۆرپێچکرن، و ڤێ چەندێ پتر سەهم هاڤێتە دلێن خەلکی، و ئەو پالدان کو خۆ تەسلیم بکەن، و چو بەرگرییێ نەکەن.

لەشکەرێ موسلمانان ئەو پلان پێکئینا یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ داناى، و هەر کۆمەک ژ وی لایی ڤە چوو یێ بۆ هاتییە دەسنیشانکرن.. ل ژێرییا مەکەهێ، ئەو جهێ خالد چوویێ هندەک بەکری و ئەحابیش کۆمبووبوون ب ئنیەتا هندێ کو شەڕی بکەن، هەر وەسا صەفوانێ کوڕێ ئومەییەی و عەکرمەیێ کوڕێ ئەبوو جەهلی و سەهیلێ کوڕێ عەمری هندەک مرۆڤ ل دۆر خۆ کۆمکرن و چوونە وی جهێ دبێژنێ: خەندەمە ل باشوورێ مەکەهێ، دا بەرگرییا موسلمانان بکەن. بەلێ خالدی و لەشکەرێ خۆ شەڕێ وان کر و هەر زوی ئەو شکەستن و ڕەڤین.. و چەند مرۆڤەکێن کێم هەبوون، ژ بەر تاوانێن وان یێن مەزن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ڕاگەهاندبوو کو هەچییێ وان ببینت بلا بکوژت ئەگەر خۆ ئەو د کەعبێ ژی ڤە بن، بەلێ ژ وان ب تنێ سێ هاتنە کوشتن، و ئەوێن دی شیان خۆ بگەهیننە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و داخوازا ئەمانێ ژێ بکەن.

## پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مەکەهێ:

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ (ذات طوی) بەر ب باژێڕێ مەکەهێ ڤە هات، و هنگی ئەو ل سەر وێ حێشترا خۆ یێ سویار بوو ئەوا دگۆتنێ:

(القصواء)، ل لایەکێ وی ئەبوو بەکر بوو و ل لایێ دی ئوسەیدێ کوڕێ حوضەیری، و سەرێ وی هند یێ چەمیای بوو حەتا نێزیک بوو ئەرزنکا وی ژ زینێ بگرت. ئەو ژ (ذات طوی)یێ ب لایێ ڕۆژهەلاتێ ڤە چوو، بەر ب دەڤەرا کەدائێ ڤە، و گاڤا ئەو گەهشتینە وی جهی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیت هندەک ژنک هاتنە بەراهییا لەشکەری و دەرسۆکێن خۆ د سەر و چاڤێن هەسپێن وان دان (دا تۆزێ ژێ داقوتن، یان ژی دا وان پاشدا ببەن). گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ چەندە دیتی، گرنژی و ل ئەبوو بەکری زڤڕی و گۆتێ: حەسسانی چ گۆتبوو؟

و مەخسەدا وی ئەو بوو بیرا وی ل وێ شعرێ بینتە ڤە ئەوا بەری هنگی ب چەند سالەکان حەسسانێ کوڕێ ثابتی گۆتی، دەمێ گەف ل قورەیشییان کرین کو ڕۆژەک دێ ئێت و ئەو دێ مەکەهێ ستینن، ل جهەکی ژ ڤێ شعرێ حەسسان دبێژت:

عـدمنا خيلنـا إن لم تروهـا      تثير النقع موعدها كـداء

تظـل جيادنـا متمطـرات      تلطمهـن بـالخمر النسـاء

یەعنی: گەلی قورەیشییان، ئەم خێرێ ژ هەسپێن خۆ نەبینین ئەگەر هوین وان نەبینن تۆزێ ل هنداڤ هەوە ڕادکەن، و ژڤانێ مە و هەوە کەدائە، دەمێ هەسپێن مە ب لەز دئێن و ژنک دئێنە بەراهییێ و دەرسۆکێن خۆ ل سەر و چاڤان ددەن!

مەخسەدا وی ئەوە: دەمێ ئەم ژ لایێ کەدائێ ڤە -کو ڕێکا خەلکێ مەدینێیە بۆ مەکەهێ- ل سەر هەسپێن خۆ دئێینە هەوە، چو زەلام د ناڤ هەوە دا نابن بستە بکەن بێن بەرانبەر مە ڕاوەستن و شیرێن خۆ هلگرن، ڤێجا ل شوینا زەلام شیرێن خۆ هلگرن و بێن بدانن هەسپێن مە، ژنک دێ ئێن

دەرسۆک و پۆشییێن خۆ ل هەسپێن مە دەن دا بزڤرینن.. ئەڤە وەک کێمکرن بۆ وان!

ڤێجا گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیتی ژنک هاتن دەرسۆکێن خۆ ل روییێن هەسپان دان، ئەڤ شعرا حەسسانی هاتە بیرێ، لەو وی ب گرنژین ڤە گۆتە ئەبوو بەکری: حەسسان چ دبێژت؟ و گاڤا ئەبوو بەکری شعرا حەسسانی بۆ خواندی، و بەحسێ کەدائێ کری و گۆتی: ئەو ژڤانێ مە و هەوەیە.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە هەڤالێن خۆ: د وی جهی را هەرن یێ حەسسانی گۆتی.

و ئەو ژ کەدائێ بەر ب رۆژهەلاتێ ڤە چوون حەتا گەهشتنە وی جهێ دبێژنێ: (موعەللات) ل دەڤەرا (حوجوونێ) ئەوا هنگی دکەفتە ژ دەرڤەی بازێرێ مەکەهێ، ل جهەکێ نێزیک ژ قەبرێ خەدیجایێ خیڤەتەک بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتە ڤەدان، و ل وان هەر هەژدە رۆژێن ئەو مایە ل مەکەهێ، وی و لەشکەرێ خۆ ل وێرێ دانا، دا ل سەر خەلکێ بازێری نەکەتە تەنگاڤی.

پشتی خەلک تەنابووی، و هەر لایەکی زانی کو چو شەڕ و کوشتن چێ نابت، و ئەڤرۆ رۆژا رەحمێ و لێبۆرینێیە، نە کو رۆژا شەڕ و تۆلستاندنێ.. پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل سپێدەیا رۆژا ئەینییێ بیستی هەیڤا رەمەزانێ ژ بن خیڤەتا خۆ دەرکەفت، ل وی گەلی یێ بەری نێزیکی پازدە سالان قورەیشییان ئەو و مرۆڤێن وی هەمی لێ حیصار داین، و نەهێلای خوارن بگەهتە وان، حەتا ئەو نەچاربووین گیایی بخۆن، دەرکەفت و شاشکەکا رەش د سەری بوو، و ئالایەکێ سپی ل بەر دەستی یێ بلندکری بوو، و ل حێشترا خۆ سویار بوو، دا قەستا کەعبێ بکەت.. ژ ناڤبەرا هەمی صەحابی و مرۆڤێن خۆ یێن نێزیک و دویر وی بڕیار دا ئوسامەیێ کوڕێ زەیدی، کوڕێ

مرۆڤەکێ عەبد، بەلێ یێ رحا خۆ گۆری دینێ خودێ کری، ل پشت خۆ سویار کر، دا بۆ خەلکی دیار بکەت کو ئەڤ دینە ئعترافێ ب چو جوداییێن نفشی و طەبەقی و ئویجاخکانێ ناکەت.. و ئەو د ناڤ کۆمەکا مەزن یا صەحابییێن خۆ دا چوو و سەرێ خۆ چەماند بوو، و سوورەتا (الفتح) دخواند: ﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ۝٢ وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ۝٣ ﴾.

ب خۆشکاندن ڤە، و بێی چو نیشانێن خۆمەزنکرنێ ل نک پەیدا ببن، ئەو گەهشتە دەور و بەرێ کەعبێ، و کڤانەک یان گۆپالەک د دەستی دا بوو هەر صەنەمەکێ ئەو گەهشتبایێ وی گۆپالێ خۆ دگەهاندێ و وەردگێڕا عەردی و د بەر ڕا دگۆت: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ۝٨١ ﴾ (الإسراء: ٨١). و پشتی وی طەواف ل دۆر کەعبێ کری، وی فەرمان دا صەنەم هەمی ژ ناڤ کەعبێ ب خۆ بێنە دەرێخستن، پاشی ئەو د گەل ئوسامەی و بیلالی و عوثمانێ کوڕێ طەلحەی چوونە د کەعبێ ڤە، و دەرگەه ل خۆ گرتن.

عەبدللاهێ کوڕێ عومەری دبێژت: پشتی ئەو دەرکەفتین من پسیار ژ بیلالی کر: وی د کەعبێ ڤە چ کر؟ بیلالی گۆت: وی نڤێژ کر.

و هەر وێ ڕۆژێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل بیلالی کر کو ب سەر بانێ کەعبێ بکەڤت و بانگ بدەت.

گاڤا خەلکێ مەکەهێ ئەڤ هەلویستێ تژی رەحم و دلۆڤانی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیتی، پشتی وێ هەمی نەخۆشییا وان ئینایە سەرێ وی، دلێن وان بۆ ئیسلامێ ڤەبوون، و ئەو کۆم کۆمە موسلمان بوون، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل سەر گرگێ صەفایێ ڕوینشت و زەلام چوون موبایەعا وی کر و ئیسلاما خۆ ڕاگەهاند.. و پشتی زەلام خلاصبووین ژن

ژی چوونە نک و بەیعە دایێ، و ئێک ژ وان هندا کچا عوتبەیی بوو، و ل دویڤ هندەک ریوایەتان ئەو ئێک ژ وان بوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کوشتنا وێ حەلال کری، لەوا ئەو ب رەنگەکێ ڤەشارتی هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و بەیعە دایێ، و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی: بەیعێ بدەنە من کو فاحیشا زنایێ نەکەن، وێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ما ژنا ئازاد زنایێ دکەت؟ هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو نیاسی، گۆتێ: تو هندی؟ وێ گۆت: بەلێ.. ل من ببۆرە ژ بەر ئەوا بۆری خودێ ل تە ببۆرت.

# سەرهاتییێن مایین
# ژ سالا هەشتێ مشەختی

**شکاندنا صەنەمان:**

پشتی ڤەکرنا مەکەهێ ل بەر ڕۆناهییا ئیسلامێ ل بیستی هەیڤا ڕەمەزانا سالا هەشتێ مشەختی، و پاقژکرنا کەعبەیا پیرۆز و دەور و بەرێن مزگەفتا حەرام ژ صەنەمان، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هەژدە ڕۆژان ما ل مەکەهێ، وی ل ڤان ڕۆژان نڤێژ کورت و کۆم دکرن، و ئەو ل گەلییێ ئەبوو طالبی یێ ئاکنجیبوو، و ل ڤی دەمی وی چەند سەرییەک هنارتنە چەند دەڤەرەکان ل جەزیرا عەرەبان؛ دا ئەو هژمارەکا صەنەمێن مەزن بشکێنن.

ژ وان سەرییان: سەرییا خالدێ کوڕێ وەلیدی د گەل سیهـ لەشکەران بۆ دەڤەرا نەخلە ل باکووری ڕۆژهەلاتا مەکەهێ، ب دویراتییا (٤٥) کم ژ مەکەهێ، بۆ شکاندنا صەنەمێ مەزن (عوززای) ئەوێ قورەیشییان و گەلەک ئویجاخێن دی یێن عەرەبان ژی پەرستنا وی دکر، و دەمێ خالدی ئەو صەنەم شکاندی وی د بەر ڕا دگۆت:

**یا عزی کفرانك لا سبحانك إنی رأیت الله قد أهانك**

هەر وەسا وی سەرییەکا دی یا ژ بیست کەسان پێکهاتی ب سەرۆکاتییا سەعدێ کوڕێ زەیدێ ئەشهەلی هنارتە دەڤەرا موشەللەلێ ل سەر لێڤا دەریایا سۆر، ل وی جهێ صەنەمێ ناڤدار (مەنات) لێ، و فەرمان لێ کر ئەو وی صەنەمی بشکێنت.

و سەرییا عەمرێ کوڕێ عاصی هنارتنە دەڤەرا بەنوو هوذەیلییان دا صەنەمێ وان یێ ناڤدار (سواعی) بشکێنت.

و هنارتنا ڤان هەرسێ سەرییان ل هەیڤا رەمەزانێ بوو.. و سەرییەکا دی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل هەیڤا شەووالێ ب سەرۆکاتییا طوفەیلێ کورێ عەمرێ دەوسی هنارت دا صەنەمێ دەوسییان یێ مەزن (ذو الکفلین)ی بشکێنت.

ب ڤێ چەندێ مەزنترین صەنەم ل جەزیرا عەرەبان هاتنە شکاندن، و چو ژ وان سەنتەران نەمان یێن شرک لێ دهاتەکرن ل جەزیرا عەرەبان.

**شەڕێ حونەینێ**:

پشتی ستاندنا موسلمانان بۆ مەکەهێ، و موسلمانبوونا قورەیشییان ب تایبەتی مەزنێن وان ئەوێن ئەو بیست سال بوو نەیارەتییا ئیسلامێ ب ستوییێ خۆ ڤە گرتی، ئێدی چەپەرێ کوفرێ ئەوێ قورەیشیان ب رێڤەدبر نەما، هنگی هندەک ئویجاخێن عەرەبان یێن مەزن ئەوێن ل دۆرێن مەکەهێ دژیان، وەکی: ثەقەفی و هەوازنییان، گۆتن: ئەڤە قورەیشی ژ مەیدانێ رابوون، و موحەممەد بۆ مە بەطال بوو، و هەبت نەبت ئێدی ئەو دێ قەستا مە کەت، ڤێجا بەری ئەو بێتە مە دا ئەم بچینێ..

وان خۆ لێکدا و هێزا خۆ هەمی کۆمکر، و ژ لایێ طائفێ ڤە (ل رۆژهەتا مەکەهێ) ئەو هاتن حەتا گەهشتینە نهالا حونەینێ، ئەوا دکەفتە ژۆرییا عەرەفاتێ ب دویراتییا (٣٦) کم ژ مەکەهێ ژ لایێ رۆژهەلاتێ ڤە.

دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب هاتنا وان زانی، وی ژی لەشکەرێ خۆ کۆمکر، دەه هزار ئەو بوون یێن د گەل وی هاتین بۆ ڤەکرنا مەکەهێ، و دو هزار ژی ژ خەلکێ مەکەهێ خۆ دانە د گەل، و ب ڤێ چەندێ هژمارا وان گەهشتە دوازدە هزار کەسان، و ڤێ چەندێ رەنگەکێ پشتراستی و غورووری بۆ وان چێکر، حەتا هندەک ژ وان گۆت: ئەم هند زێدە بووین ئێدی کەس نەشێتە مە!

ل دۆر هژمارا كافران د ڤی شەڕی دا چەند گۆتنەک هەنە، د هندەک کتێبێن دیرۆکێ دا هاتییە کو هژمارا وان دۆرێن جار هزار کەسان بوون. و هندەکێن دی دبێژن: ئەڤ هژمارە یا ئویجاخا (هەوازن و ثەقەفییان) ب تنێ بوو، بەلێ چونکی گەلەک ئویجاخێن دی یێن عەرەبان خۆ دانە د گەل وان هژمارا وان گەهشتە بیست هزار کەسان.. و د گەلەک ژێدەران دا هاتییە کو هژمارا کافران دو جاران هندی یا موسلمانان بوو، و ئەگەر موسلمان دەهـ دوازدە هزار کەس بن، مەعنا هەر چ نەبت دڤێت کافر ژ بیست هزار کەسان کێمتر نەبن.

دەمێ شەش حەفت رۆژەک ژ هەیڤا شەووالێ چووین، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و لەشكەرێ موسلمانان ژ مەكەهێ دەرکەفت، پشتی کو وی عەتتابێ کورێ ئەسیدی ل جهێ خۆ هێلایە ل مەکەهێ..

گەلەک ژ وان کەسان یێن پشتی ستاندنا مەکەهێ موسلمانبووین، و هێشتا هەیڤەک ب سەر موسلمانبوونا وان ڤە نەچووی د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرکەفتنە جیهادێ، ب رێڤە موسلمان د بەر جهەکی ڕا بۆرین دارەکا کەسک و مەزن لێ هەبوو دگۆتنێ: (ذات أنواط)، عەدەتێ کافران بوو هەر سال جارەکێ ئەو هەمی پێکڤە ل نک وێ دارێ کۆم دبوون، و وان شیرێن خۆ ب وێ دارێ ڤەدکرن، و قوربان ل نک ڤەدکوشتن، و حەتا ئێڤاری چەژن و سێران دکرن، پاشی دزڤڕینە مالێن خۆ.. ئەو کەسێن ژ نوی موسلمان بووین و هێشتا باش مەعنایا تەوحیدێ تێ نەگەهشتین گاڤا ئەڤ جهە دیتی بیرا وان ل دەمێ جاهلییەتێ و جەژنێن وێ هاتە ڤە، و دیارە ئەو ژێ خەریب بوون، لەو هندەک ژ وان گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، دارەکا وەکی ڤێ بۆ مە ژی بدانە.. هنگی پێغەمبەری سلاڤ لێ بن- گۆت: ((سبحان الله، كما قال قوم موسى: اجعل لنا إلها كما لهم

آلهة، والذي نفسي بيده لتركبن سنة من كان قبلكم))[1] يەعنى: پاكى بۆ خودێ بت، ئەڤە وەكى وێ گۆتنێـە یا مللەتێ مووسایی گۆتی: خودایەكی بۆ مە بدانە كانێ چاوا وان خودایەک هەیە، ئەز ب وی كەمە یێ نەفسا من د دەستی دا هوین دێ ل وێ رێكێ چن یا یێن بەری هەوە لێ چووین.

ب ڤێ گۆتنا خۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ل هندێ ئاگەهداركرن كو دڤێت ئەو هزرا زڤرینا ل عورف و عەدەتێن جاهلییەتێ ژ سەرێ خۆ بیننە دەر، و ژ لایەكێ دی ڤە ژ ڤێ حەدیسێ دئێتە وەرگرتن كو چاڤلێكرن و پشكدارییا كافران د جەژنێن وان یێن جاهلی دا تشتەكێ حەرامە و بۆ موسلمانی چێ نابت.

ل ئێڤارا رۆژا دەهی شەووالێ موسلمان گەهشتنە دەڤەرا حونەینێ، د ناڤبەرا مەكەهێ و طائیفێ دا، كافر سپێدی زوی بەری وان گەهشتبوونە وی جهی، و دەمێ ئەو گەهشتینە دۆزێن نهالا حونەینێ مەزنەكێ وان گۆتێ: هەرن خۆ ل هەردو لایێن نهالێ ڤەشێرن، و دەمێ لەشكەرێ موسلمانان دئێن و دكەڤنە نهالێ هوین ژ هەمی لایان ڤە هێرشێ بدەنە سەر وان. و وەسا چێبوو، دەمێ موسلمان گەهشتینە نهالێ، و پشتی ئەو كەفتینە د زكێ نهالێ دا، خافلەتی ب وان كەفت دەمێ وان دیتی دوژمنی ژ هەمی لایان ڤە ب سەر وان دا گرت، و هژمارا وان یا مەزن چو فایدە نەگەهاندە وان، و ترس كەفتە هناڤێن وان، و ئەو پاشدا زڤرین و رەڤین، حەتا دبێژن: هندەک ژ وان هنگی خۆ گرت حەتا گەهشتینە مەكەهێ!

ل وی دەمی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هژمارەكا كێم ژ صەحابییان مانە ل مەیدانێ و دەست دانە شەری، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە

---

(١) ئەحمەد و نەسائی د (السنن الكبرى) دا ڤێ حەدیسێ ڤەدگوهێزن.

مامێ خۆ عەبباسی، و ئەو یێ دەنگ بلند بوو: گازی خەلکی بکە و بێژێ بلا نەرەڤن.

عەبباسی گازی وان کر، و پێغەمبەری ژی ب دەنگەکێ بلند گۆت: (أنا النبي لا كذب أنا ابن عبد المطلب)، و ئەڤە نیشانا زیرەکی و جورئەتا وییە، چونکی ل دەم و جهێن هۆسا مەزنێن لەشکەران خۆ کراسگۆهۆڕ دکەن دا ل خەلکی بێنە ڤەشارتن، و کەس وان نەنیاست، بەلێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل وی دەمێ لەشکەرێ وی دڕەڤی، و نەیاری هەمی ڕەخ لێ گرتین، بۆ پێشڤە دچوو، و گازی دکر: ئەز پێغەمبەرم! دا ئەوێ وی نەنیاست ژی وی بنیاست!

خودایێ مەزن د سوورەتا (التوبة) دا بەحسێ ڤێ سەرهاتییێ دکەت، و دبێژت: ﴿ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾ یەعنی: ل ڕۆژا (حونەینێ) هوین ب هژمارا خۆ یا زێدە موعجب بوون، و هەوە گۆت: ئەڤرۆ ژ کێمییێ ئەم قەت ناشکێین، و هوین ب گەلەکییا هژمارا خۆ هاتنە خاپاندن.. بەلێ وێ هژمارێ مفایێ هەوە نەکر، و ئەو عەدرێ هندێ بەرفرەهـ ل هەوە تەنگ بوو و هاتە ئێک، و هوین پاشپاشکی زڤڕین و ڕەڤین.

پشتی خودێ دەرسەک دایە وان، کو ئەو ب هژمارێ دسەردا نەچن، و ب هێزا خۆ نەئێنە خاپاندن، و بزانن سەرکەفتن ژ خودێیە، و پشتی هژمارەکا مەزن ژ وان د گازییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و مامێ وی عەبباسی هاتین، و دەست دایە شەڕی، خودێ د هەوارا وان هات: ﴿ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾ پاشی خودێ تەناهی ب سەر پێغەمبەرێ خۆ و ب سەر خودان باوەران دا ئینا خوارێ، و ئەو موکم مان، و خودێ

ب لەشکەرەکێ وان نەدیتی ژ ملیاکەتان پشتا وان گرت، و ئەو ب سەر دوژمنێ وان ئێخستن، و وی ئەوێن کافربووین عەزاب دان. و ئەو عەزابا خودێیە بۆ وان یێن کافر دبن، وبەرێ خەلکی ژ دینێ وی وەردگێڕن.

د هندەک ریوایەتان دا هاتیە کو ئەوێن ل سپێدەیا ڕۆژا حونەینێ ماینە ل مەیدانا شەڕی د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نێزیکی سەد کسان بوون، ژ وان: مامێ وی عەبباس، و پسمامێن وی: عەلی و فەضلێ کوڕێ عەبباسی و ئەبوو سوفیانێ کوڕێ حارثی، و ژ هەڤالێن وی یێن نێزیک: ئەبوو بەکر و عومەر، و ئەیمەن و ئوسامە.. و چەندەکێن دی.

پشتی هژمارەکا دی یا مەزن ژ موسلمانان زڤڕینە مەیدانا شەڕی، دەمێ وان گوهـ ل گازییا پێغەمبەری بووین، و ب دلەکێ موکم دەست ب شەڕی کری، و خودێ پشتەڤانییا وان کری، کافر شکەستن، و ڕەڤ کەفتە ڕێزێن وان.

د ڤی شەڕی دا[1] کوشتنەکا مەزن کەفتە ناڤ ڕێزێن کافران ب تایبەتی پشتی هندەک مەزنێن ئویجاخا هەوازنییان هاتینە کوشتن و ئالایێ وان کەفتی و ڕەڤ کەفتییە ڕێزێن وان، و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو کوشتی ژ سێسەد مرۆڤان پتر بوون.

و ژ موسلمانان ب تنێ چار کەس شەهیدبوون، و هژمارەک بریندار بوون، و ئەوێن شەهید بووین، وەکی ئبن ئیسحاق ناڤێن وان دبێژت، ئەڤەنە:

١- ئەیمەنێ کوڕێ عوبەیدێ ئەسەدی یێ قورەیشی، و برایێ پێغەمبەری یێ شیری بوو؛ چونکی ئەو کوڕێ بەرەکەیا دادۆکا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ

---

(١) مەخسەد نە ب تنێ ئەو شەڕە یێ ڕۆژا ئێکێ ل نهالا حونەینێ چێبووی، بەلکی ئەو شەڕێ ل وان ڕۆژێن پشتی هنگی ژی چێبووی.

بن- ئەوا دبێژنێ: (أم أيمن)، و ئاشکەرایە کو ئەو ئێک ژ وان ژنکان بوو یێن شیر دایە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-.

٢- یەزیدێ کوڕێ زەمعەی، و ئەڤە ژی قورەیشی بوو.

٣- سوراقەیێ کوڕێ حارثێ ئەنصاری.

٤- ئەبوو عامر عوبەیدێ ئەشعەری.

## پشتی شەڕی:

مەزنێ هەوازنییان مالکێ کوڕێ عەوفی بەری شەڕی بڕیار دا بوو ژن و زاڕۆک و پەز و حەیوانێ خۆ هەمییێ د گەل خۆ بینن، و بدانن پشت ڕێزێن شەڕکەران؛ دا ئەو بۆ کرنا شەڕی مجدتر لێ بێن و بزانن چی گاڤا ئەو شکەستن نامویس و مال و حالێ وان هەمی دێ تێچت.. و وەسا چێبوو!! گاڤا ئەو شکەستین مال و حال و عەرز و عەیال هەمی کەفتە دەستێ موسلمانان، و ئەو مالەکێ مەزن بوو، و گرتی ژی ب هزاران بوون.. ب تنێ ئەو مرۆڤ ژ وان مان یێن شیاین بڕەڤن و خۆ ب طائیفێ ڕا بگەهینن.

گاڤا مەسەلە گەهشتییە ڤێ دەرەجێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا دەسکەفتی ژ ئێخسیر و مالی هەمی ل جهەکێ دبێژنێ: (جعرانە) بێنە کۆمکرن، حەتا ئەو ژ شەڕێ وان کەسان خلاص ببن ئەوێن ژ حونەینێ ڕەڤین..

ئەو ب خۆ ئەوێن ژ حونەینێ ڕەڤین بوونە سێ پارچە:

- هندەک چوونە طائیفێ، و خۆ د حصنێ ثەقەفییان ڤە ئاسێ کر، و مەزنێ هەوازییان مالک د ناڤ وان دا بوو.

- و هندەک چوونە نهالەکێ ل دەڤەرا هەوازییان دبێژنێ: ئەوطاس.

- و هندەکێن دی چوونە نهالەکێ دبێژنێ: نەخلە.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرییەکا لەشکەری ب سەرۆکاتییا ئەبوو عامری عوبەیدێ ئەشعەری بەرهەڤکر، و ئەو هنارتنە (ئەوطاسێ) ب دویڤ وان دا یێن ڕەڤینە وێرێ، و ئەو بوو ل وێرێ ئەبوو عامر شەهیدبوو و پشتی وی برازایێ وی صەحابییێ ناڤدار ئەبوو مووسایێ ئەشعەری جهێ وی د سەرۆکاتییا وێ سەرییێ دا گرت، و پشتی دەمەکی ژ شەڕی موسلمان ب سەرکەفتن، و شکەستن ئێخستە ڕێزا کافران و گەلەک ژ وان کوشتن و گرتن و ئێخسیرکرن.

## دۆرپێچکرنا طائیفێ:

د سەرهاتییا چوونا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- بۆ باژێڕێ طائیفێ، پشتی مرنا مامێ وی ئەبووطالبی ل سالا دەهێ ژ هنارتنا وی، مە ئاشکەرا کربوو کو طائیف ئەو باژێڕێ بچویکێ دکەفتە ڕۆژهەلاتا مەکەهێ و وەکی هاڤینگەهەکێ دهاتە هژارتن، د دەستێ دو بابکان ژ ئویجاخا (ثەقەفییان) دا بوو، ئەو ژی (بەنوو مالک) و (ئەحلاف) بوون، و ژ بەر لاوازییا وان ئەو نەچار دبوون پەیمانان د گەل دو ئویجاخێن ژ خۆ مەزنتر گرێدەن، ئەو ژی (قورەیشی) بوون ئەوێن ل ڕۆژئاڤایا وان دژیان، و (هەوازن) ئەوێن ل ڕۆژهەلاتا وان دژیان.

پشتی هاتنا ئیسلامێ ثەقەفییێن باژێڕێ طائیفێ هەلویستەکێ کرێت و دوژمنکاری ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەرگرت، و سەرهاتییا پێشوازییا وان بۆ وی و هەڤالێ وی زەیدێ کوڕێ حارثەی بەری مشەختبوونێ باشترین دەلیل بوو ل سەر ڤێ چەندێ. و پشتی موسلمانان پەیمانا (حودەیبییێ) د گەل قورەیشییان گرێدای، ثەقەفی ئێک ژ وان ئویجاخێن عەرەبان بوو یێن خۆ دایە د گەل قورەیشییان دژی موسلمانان. و پشتی موسلمان شیاین باژێڕێ مەکەهێ بستینن، و چەپەرێ قورەیشییان

د نەیارەتییا ئیسلامێ دا هلوەشیای، ئەو بوو ئویجاخا (هەوازن) ئالایێ نەیارەتییا ئیسلامێ هلگرت، و هێزا خۆ کۆمکر و ڤیان بەر ب مەکەهێ ڤە بچن؛ دا موسلمانان ژ بن ببەن، و جارەکا دی ئالایێ شرکێ ل سەر بانێ کەعبێ بلند کەن، هنگی ثەقەفییان خۆ دا د گەل وان، و هەمی هاریکاری ژی بۆ وان پێشکێش کرن، و دەمێ هەوازنییان دەست ب شەڕێ حونەینێ ژی کری ثەقەفییان پشتا وان گرت، و د گەل وان چوونە د ئێک چەپەری دا.

و ئەو بوو شەڕ چێبوو، و هەوازنی و پشتەڤانێن وان شکەستن، و -وەکی بەری نوکە مە گۆتی- لەشکەرێ وان بوو سێ پارچە، مەزنێ ئویجاخا هەوازن مالکێ کورێ عەوفی د گەل کۆمەکا زەلامێن خۆ ڕەڤین و بەر ب طائیفێ ڤە چوون، و خۆ د حصنێ ثەقەفییان ڤە ئاسێ کر، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و موسلمان ب دویڤ وان چوون، حەتا گەهشتینە طائیفێ، و گەهشتنا وان بۆ بازێڕێ طائیفێ ل دویڤ بۆچوونا هندەک دیرۆکزانان ل بیستی هەیڤا شەووالێ بوو. و دەمێ ئەو گەهشتینە طائیفێ و وان دیتی کو کافران یێن خۆ ئاسێ کرین، وان پتر ژ دەهـ ڕۆژان حصنێ ثەقەفییان دۆرپێچکر، بێی کو بشێن وی بستینن، و هندەک جاران کافران ژ هنداڤی حصنی تیر د وان موسلمانان وەردکرن ئەوێن خۆ نێزیک دکر و هندەک ژێ کوشتن ژی.

پشتی چەند ڕۆژان ژ حیصارێ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا بوو کو چو فایدە د ڤێ چەندێ دا نینە؛ چونکی ئەو دشێن سالەکا دی ژی خۆ بگرن، ژ بەر کو ئاڤ و خوارن ل جهێ وان یا مشەیە، لەو وی گۆتە هەڤالێن خۆ: یا باشتر ئەوە ئەم بزڤڕێن.. و گاڤا وی دیتی ئەڤ بڕیارە ب دلێ گەلەکان نینە، وی گۆت: باشە، هەڕنێ.. و گاڤا ئەو چووین کافران تیر د وان وەرکرن و گەلەک ژ وان برینداركرن و هندەک ژی کوشتن، لەو هەر

زوی ئەو زڤڕینە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، هنگی پێغەمبەری گۆتنا خۆ دوبارەکر و گۆت: یا باش ئەوە ئەم بزڤڕین. و گاڤا دیتی صەحابییان خۆ بێ دەنگ کر، ئەو گرنژی و بڕیارا زڤڕینێ دا. کەیفا صەحابییان ب ڤێ چەندێ هات، و بەری ئەو ژ طائیفێ بزڤڕن هندەک صەحبییان داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کو ئەو نفرینەکێ ل ثەقەفییان بکەت، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعایا هیدایەتێ بۆ وان کر و گۆت: ((اللهم اهدِ ثقيفاً)) (1)، و ئەگەر ئەڤ حەدیسە یا دورست بت ئەو رەحم و دلۆڤانییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مە بەرچاڤ دکەت.

و ل دویڤ بۆچوونا ئبن ئیسحاقی د سیرەتێ دا، هژمارا وان موسلمانێن ل طائیفێ شەهیدبووین دوازدە بوو.. و هەژییە بێژین کو مەزنێ قورەیشییان ئەبوو سوفیان د ڤی شەڕی دا بریندار بوو، چاڤەکێ وی هاتەدەر، و گاڤا ئەو هاتییە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەڤە چاڤەکێ من د ڕێکا خودێ دا پەقی. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەگەر تە بڤێت دێ دوعایەکێ بۆ تە کەم چاڤێ تە دێ چێ بت، و ئەگەر تە بڤێت بەحەشت بۆ تە پێشڤە. وی گۆت: من بەحەشت دڤێت. و ئەڤە هندێ دگەهینت کو موسلمانبوونا ئەبوو سوفیانی یا ژ دل بوو، و ئەو یێ ڕاستگۆ بوو د باوەرییا خۆ دا، لەو وی بەحەشت هلبژارت.

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ طائیفێ زڤڕی هاتە جعرانە.

### پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل جعرانە:

جعرانە ئەو جهـ بوو یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان دای دەسکەفتییێن شەڕێ حونەینێ لێ بێنە کۆمکرن حەتا ئەو ژ شەڕی خلاص

---

(1) ئەحمەد و ترمذی ڤێ حەدیسێ ب سەنەدەکا مورسەل ڤەدگوهێزن.

ببت، و ئەو جهەک بوو دکەفتە د ناڤبەرا مەکەهێ و طائیفێ دا، ب دویراتییا (٢٢) کم ژ مەکەهێ ژ لایێ باشوورێ رۆژهەلاتێ ڤە.

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل دەسپێکا هەیڤا (ذولقعدە) دەست ژ حیصارا طائیفێ بەردای، ئەو زڤڕی جعرانە، و گەهشتنا وی بۆ جعرانە -ل دویڤ بۆچوونا هندەک زانایێن سیرەتێ- ل شەڤا پێنجشەنبێ بوو، پێنجی هەیڤا (ذولقعدە) ژ سالا هەشتێ، و پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گەهشتی وی پتر ژ دەهـ رۆژان خۆ گرت، چو دەسکەفتی لێکڤە نەکرن، وی گۆت: بەلکی مەزنێن هەوازن و ثەقەفییان بێن و موسلمان ببن، دا ئەو ئێخسیر و مالێ وان لێ بزڤڕینتەڤە.. بەلێ کەس ژ وان دیار نەبوو!

و ئاشکەرایە کو دەهـ پازدە هزار کەس د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بوون، و گەلەک ژ وان ئەو بوون یێن ژ نوی موسلمانبووین و چو ژ ئیسلامێ نەدزانی، و ئەڤە ئەون یێن د کتێبێن سیرەتێ دا ناڤێ (الطلقاء) ل سەر دئێتە دانان؛ چونکی ئەو ئەو بوون یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشتی ڤەکرنا مەکەهێ ئازاکرین، و هندەک ژی ئەو بوون یێن چو رێ نەدیتین لەو مەجبوور بووین خۆ بدەنە د گەل موسلمانان، هەر چەندە هێشتا ئیسلام ب دورستی نەچووبوو د دلێن وان دا، و ئەڤە ئەو بوون یێن دبێژنێ: (المؤلفة قلوبهم)، و هژمارەکا نە یا کێم ژی ژ وان (ئەعرابیێن زڤڕ) بوون ئەوێن ل دەشتێ دژیان وەک کۆچەرات، و وان چو ژ سەر و بەرێ مەدەنییەتێ و ئوصوولێن ژیانا مەدەنی و پەیمان و مەصلحەتا دەولەتێ نەدزانی، و ئەو وەکی وان صەحابییان نەبوون یێن ئەو چەند سالە ب وەحیا خودێ و ل سەر دەستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتینە پەروەردەکرن.. لەوا ل ڤان دەهـ پازدە رۆژێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل جعرانە مای، وان زێدە نەخۆشی گەهاندە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەو گەلەک تەنگاڤ کر،

و ئەگەرا ڤێ چەندێ ئەو بوو وان دڤیا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زوی دەسکەفتییان لێکڤەکەت، دا هەر ئێک بارا خۆ بزانت و بزڤرتە جهێ خۆ!! و پشتی وان زانی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ بەر هندێ یێ خۆ موژیل دکەت دا بەلکی ئویجاخا هەوازن و ثەقەفییان بێن موسلمان ببن، و ئەو مالێ وان لێ بزڤرینتە ڤە، ئەو ئێکجار تەنگاڤ بوون، و پتر ئیلحاح ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کو ئەو دەسکەفتییان لێکڤە بکەت.

دووماهییێ و پشتی بۆرینا پتر ژ دەهـ رۆژان، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نەچار بوو کو دەسکەفتییان لێکڤەکەت.

و ژ بەر نەزانینا ڤان ئەعرابییێن زڤر ب ئوصوولێن سیاسەت و لەشکەرییێ، خۆ د رەنگێ لێکڤەکرنا پێغەمبەری ژی دا بۆ دەسکەفتییان وان نەخۆشی گەهاندە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، بوخاری و موسلم ژ ئەبوو مووسایێ ئەشعەری ڤەدگوهێزن، دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل جعرانە ئەز و بیلال ل نک وی بووین، ئەعرابییەک هاتە نک و گۆتێ: ئەو سۆزا تە دایە من بۆ من ب جهـ بینە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: (أبشر) یەعنی: مزگینییا من ل تە بت.. و ئەڤە گۆتنەکە مەخسەد پێ ئەوە ئەو تشتێ تە دڤێت دێ چێ بت. وی ئەعرابی گۆت: تە درێژ کر (أبشر، أبشر)!! گۆت: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب کەرب ڤە ل من و بیلالی زڤری و گۆت: وی مزگینییا من نەڤێت، کانێ هوین هەردو وەرن.. گۆت: ئەم ب نک ڤە چووین، وی ئامانەکێ ئاڤێ ئینا دەست و دێمێ خۆ پێ شویشت، و هندەک ئاڤ کرە دەڤێ خۆ و بەردا د ئامانی دا و گۆت: هندەکێ ژێ ڤەخۆن و هندەکێ ل دێم و ستویێ خۆ بکەن، و مزگینییا من بۆ هەوە هەردویان بت. گۆت: مە وە کر وەکی وی گۆتی، گاڤا دەیکا موسلمانان ل پشت پەردەیێ

گوهـ ل مـه بـووی، گـازی کـر: هنـدەکێ بـۆ دەیکـا خـۆ ژی بهـێلن، گـۆت مـه هندەک ژ وێ ئاڤێ بۆ وێ هێلا.

و بوخاری ژ جوبەیرێ کورێ موطعمی ڤـەدگوهێزت، دبێژت: دەمـێ ئـەو و هندەک صـەحابییێن دی د گـەل پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- ژ حونـەینـێ ڤەدگـەریان، ئـەعرابی هـاتن و ل پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- کۆمبـوون، و داخـوازا مـالی ژ وی کـر، حـەتا وان ئـەو نـەچارکری کـو ب نـک دارەکـێ ڤـە بچـت، و حـەتا وان عـەبایێ وی ژ سـەر مـلان بـری، هنگـی وی گۆتـه وان: عـەبایێ مـن بینـن، ئەگـەر هنـدی ڤـان داران حێشـتر ل نـک مـن هـەبن، دێ هەمییان دەمە هەوە، و هوین من نابینن چرێک و درەوین و ترسینۆک.

و دەمێ هەوازنی گیرۆ بووین، و خەلکی گەلـەک کوتـەکی ل پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- کری دا ئەو لەزێ د لێکڤەکرنا دەسکەفتییان دا بکـەت، وی دەسکەفتی لێکڤـەکرن، و سیاسـەتا وی د لێکڤـەکرنێ دا ئـەو بـوو وی پتـر دا مەزن و گرگرەیێن ئویجاخان ژ وان یێن هێشـتا دلـێن وان ب تمـامی ب نـک ئیسلامێ ڤە نەهاتینە کێشان، دا دلـێن وان مـوکم بکـەت، و هندەک کسـێن چـو ژ سیاسەت و صەلاحییاتێن ئیمامێ مـەزن نزانن، و باوەرییێ جهـێ خـۆ د دلێن وان دا نەکری کو بزانن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بـن- چـو تشـتان ژ نـک خۆ ناکەت، ب ڤێ لێکڤەکرنێ خۆش نەبوو.

بـوخـاری و موسلم ژ جـابـرێ کـورێ عـەبدللاهی ڤـەدگوهێزن، دبێژت: ل جعرانـه زەلامـەک هاتـه نـک پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن-، و د هنـدەک ریوایـەتێن دی دا هاتییـه کـو نـاڤێ وی (ذو الخویصرە)یێ تـەمیمی بـوو، و هندەک زیڤ د کۆشا بیلالی دا بوو و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژێ بـەلاڤ دکـر و ددا خـەلکی، وی زەلامـی گـۆت: ئـەی موحەممـەد، عەدالـەتێ بکـە! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: هیلاک بۆ تە بت! کی دێ عەدالـەتێ کەت

ئەگەر ئــەز عەدالـەتێ نەکەم؟ خوسارەتی بۆ مـن بت ئەگەر ئەز عەدالـەتێ نەکەم.

هنگی عومەرێ کورێ خەططـابی گۆت: ئەی پێغەمبـەرێ خودێ، بهێلە ئەز ڤی منافقی بکوژم. پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بن- گـۆتێ: حاشا، خەلـک دێ بەحس کەن و بێژن: موحەممەد هەڤالێن خۆ دکوژت. ئەڤە و هـەڤالێن وی قورئانێ دخوینن، و ئەو ژ گەروییێن وان دەرباس نابت، ئەو ژ دینی دەردکەڤن کانێ چاوا تیر نێچیرێ دسمت و ژێ دەرباس دبت.

## ئالۆزییا ئەنصارییان ژ لێکڤەکرنێ:

ب ڕاستی ئەو ڕەنگێ لێکڤەکرنا دەسکەفتییان یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل ڕۆژا حونەینێ کار پێ کری یێ جودا بـوو ژ وی ڕەنگێ وی بـەری هنگی کار پێ دکر، ڤـێ جارێ پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- گەلـەک مـال دا هندەک کەسان یێن بۆرییەکێ بەرچاڤ د ئیسلامێ دا نەهەی، بەلکی هندەک ژ وان حەتا دوهی ژی شیرێن وان بۆ کوشـتنا موسـلمانان دبلنـدکری و دڕویس بوون، ئـەڤرۆ پێغەمبەر -سلاڤ لـێ بـن- بـێ هژمـار مـالی یێ ددەتـە وان، و گـەلـەک ژ وان صەحابییێن ئەڤە ب سالانە جیهادێ دکەن، و چو نەمایە وان د ڕێکا خودێ دا پێشکێش نەکری، ئەڤرۆ پێغـەمبەر -سلاڤ لـێ بـن- چویێ نـادەتێ.. ب تایبـەتی ئەنصـاری ژ خـەلکێ مـەدینێ ئـەوێن مـال و حـالێ خۆ هـەمی گـۆری ڤـی دینـی کـری، ڤـێ چەنـدێ ڕەنگـەکێ ئـالۆزییێ ل نـک ڤـان صەحابییان ژی پەیدا کر، و هـەر چەنـدە وان بـاوەری هـەبوو و وان دزانـی ژی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بێی وەحیا خودێ چو تشـتی ناکـەت، بـەلێ وان د ناڤبەرا خـۆ دا پسیارا وێ حیکمەتێ دکـر یا پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- د ڤی کاری دا هەی، کانێ ئەو چییە؟

هنـدەک ژ وان گـۆت: هێشـتا خوینـا وان یـا ب شـیرێن مەڤـە، و دەسکەفتی بۆ وان بن؟ و هندەکێن دی گۆت: دیارە پشـتی پێغەمبـەر -سلاڤ لێ بن- گەهشتییە مرۆڤێن خۆ ئەم ژ بیر کرین!

سـەعـدێ کـوڕێ عوبادەیێ ئەنصاری سوحبەتا وان گەهانـدە پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بـن- و گـۆتێ: هندەک تـاخێن ئەنصـارییان یێ هۆ دبێـژن.. ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەنصارییان بۆ من ل جهەکی کۆم بکە.

گاڤا ئەنصـاری هـەمی ل جهـەکی کۆمبـووین، هنـدەک موهـاجر هـاتن دا بەرێ خۆ بـدەنێ کـانێ ئەڤـە چ مەسـەلـەیە، پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ئـەو زڤڕاندن، پاشی ل ئەنصـارییان زڤڕی و گـۆتێ: ئێکـێ بیـانی د نـاڤ هـەوە دا هەیە؟ وان گۆت: نەخێر، ب تنێ خوارزایەکێ مـە نـەبت، پێغەمبـەری -سـلاڤ لێ بن- گۆت: خوارزا ژ خالانە.

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- حەمـدا خودێ کـری، و مـەدحێن وی کرین، گۆت: گەلی ئەنصارییان ئەو چ گۆتنە ژ هەوە گەهشتییە من حەتا دلێ هـەوە ژ من مای؟ ما ئەز نەهاتمە نک هـەوە و هـوین دڕێبـەرزە ڤێجـا خودێ ب ڕێکا مـن هیدایـەت دا هـەوە؟ و هـوین دفـەقیر بـوون خودێ هـوین ب مـن دەولـەمەندکرن، و هـوین نـەیارێن ئێـک بـوو وی ب مـن دلـێن هـەوە گەهاندنـە ئێک؟

وان گۆت: بەلێ، مننەت یا خودێ و پێغەمبەرێ وییە!

پاشی وی گۆت: بۆچی هوین بەرسڤا من نادەن؟

وان گۆت: ما دێ چ بێژین ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ قەنجی و منـەت یـا خودێ وپێغەمبەرێ وییە!

وی گـۆت: ب خـودێ ئەگـەر هـەوە بڤێـت هـوین دێ بێـژن و هـوین دێ دڕاسـتگۆ بـن: مـانێ تـو دەمـێ تـو ژی هاتییـە نـک مـە خـەلکی تـو درەویـن

دەردئێخستی و مە باوەری ب تە ئینا، خەلکی تو شەرمزار کربووی مە پشتەڤانییا تە کر، و تو یێ دەربدەر بووی مە تو حەواندی، و تو یێ بێ کەس بووی مە تو وەکی ئێک ژ خۆ هژمارتی.. گەلی ئەنصارییان سەرا مالەکێ فانی یێ دنیایێ دلێ هەوە ژ من ما، ئەو مالێ من دایە هندەک کەسان دا موسلمان ببن، و من هوین هێلانە ب هیڤییا ئیسلاما هەوە ڤە؟ گەلی ئەنصارییان ما هەوە نەڤێت خەلک ب بزن و حێشتران ڤە بزڤرنە جهێن خۆ و هوین ب پێغەمبەرێ خودێ ڤە بزڤرنە جهێ خۆ؟ ئەز ب وی کەمە یێ نەفسا موحەممەدی د دەستان دا ئەگەر ژ بەر مشەختبوونێ نەبا ئەز دا ئێک ژ ئەنصارییان بم، ئەگەر مرۆڤ هەمی بچنە رێکەکێ و ئەنصاری بچنە رێکەکێ، ئەز دێ چمە وێ رێکێ یا ئەنصاری چووینێ، یا رەببی تو رەحمێ ب ئەنصارییان ببە، و عەیالێ ئەنصارییان، و نەڤییێن ئەنصارییان.

هنگی وان هند کرە گری حەتا ریهێن وان ژ بەر رۆندکان تەربووین و گۆتن: ئەم درازینە پێغەمبەرێ خودێ پشک و بارا مە بت. پاشی ئەو ڤەرەڤین.

و هۆسا.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرسەک نیشا وان دا کو دەستەکا هلبژارتی یا بارێ گرانێ ڤی دینی دکەفتە سەر ملی ئەو نابن یێن بەرێ وان ل مالێ دنیایێ؛ چونکی مەزنترین سەرمالێ وان باوەرییا وانە، و ئەوێن ئەڤە هندە سالە رحا خۆ ل سەر پانییا دەستێ خۆ دانای و ب ئەرزانی بۆ خودێ و پێغەمبەرێ وی پێشکێش کری، ئەو نابن ییێن ژ بەر دەرهەمەکی ل پەیمانا خۆ لێڤە ببن!

### هاتنا هەوازنییان بۆ نك پێغەمبەری ﷺ:

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پتر ژ دەهـ رۆژان خۆ گرتی، و پشتی ئەعرابی و ئەو کەسێن نوی خۆ دایە د گەل پێلا نوی یا ئیسلامێ،

ژ وان يـێن هيشـتا دلـێن وان بـاش زەلال نـەبووين، و بـەرێ وان ل مـالێ دنيـايێ ئيلحاحـەكا زێـدە ل پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- كـری كـو ئـەو دەسـكەفتييان لێكڤـە كـەت، وی دەسـكەفتی ل سـەر خـەلكی لێكڤـەكرن، و پشتی لێكڤەكرنێ ب دەمـەكـێ كـێـم، و هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لـێ بـن- ل جعرانە شاندەكا پێكهاتی ژ نەھ مـەزن و گرگرەيێن هـەوازنييان هاتنـە نـك پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئيسلاما خۆ ڕاگەهاند، و داخواز ژێ كر كو ئەو ئێخسير و مالێ وان لێ بزڤڕينتە ڤە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: هـەوە گەلـەک خۆ گيـرۆ كـر! پاشـی گـۆتێ: گۆتنـا ژ هـەمييێ پتـر مـن دڤێـت ڕاستييە، و ئێک ژ دويان بـۆ خۆ هلبـژێرن: هەوە ئێخسـير يـان مـال؟ ئـاخری من گەلەک خۆ ل هەوە گرت و هوين زوی نەهاتن.

وان گۆت: مادەم وەسايە، مە ئێخسيرێن خۆ دڤێن.

پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- گۆتـە وان: هـەچييێ بوويـە ملكـێ مـن و ملكێ مالباتـا عەبدلموطـطـەلبی ئـەو بـۆ هـەوە.. و عـەدەت هنگـی ئـەو بـوو هەچييێ د شــەڕی دا هاتبا گرتن ئـەو حسێب دبوو عەبد. پاشـی پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: گاڤا مە نڤێژا نيڤرۆ كر هوين د ناڤ خەلكی دا ڕابنـە ڤـە و بێـژن: ئـەم پێغەمبـەرێ خـودێ ل نـک موسـلمانان دكەينـە مەهـدەر و موسلمانان ل نک پێغەمبەرێ خودێ دكەينە مەهدەر كو عەيالێ مە بەردەن.

وان وە كـر، هنگـی پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- گۆتـە خـەلكی: ئەڤـە برايێن هەوەنە يێن هاتين موسلمانبووين، و ئەو حەز دكەن ئەم ئێخسيرێن وان لـێ بزڤـڕينين، و هـەچييێ گەهشـتبتە مـن و مالباتـا عەبدلموطـطـەلبی ئـەو دزڤڕاندينە ل مرۆڤێن وان.. و هنگـی بـارا پتـر ژ موسـلمانان گـۆت: يـێن مـە ژی، ب تنێ هندەک ئويجاخ تێ نەبن، ئەو ل بەر نەهاتن، هنگـی پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هەر ئێكێ مرۆڤەكی ئـازا كـەت و ل خودانـان بزڤڕينت

پاشی ئەم دێ شەش حێشتران پێشڤە دەینێ. و هۆسا ئێخسیر هەمی هاتنە بەردان، و ل خودانێن وان هاتنە زڤڕاندن.

و مەزنێ شاندا هەوازن زوهەیرێ کوڕێ صورەدی بوو، و ئەو ژ بابکێ سەعدییان بوو، و ئاشکەرایە کو سەعدی ئەو بوون یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زارۆکینییا خۆ د ناڤ وان دا بۆراندی، ل مالا حەلیما سەعدی.. و دبێژن: دەمێ شاندێ هەوازن هاتییە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وان بیرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل ڤێ چەندێ ئینائە و گۆتێ: د ناڤ ڤان ئێخسیران دا مەت و خالەتێن تە هەنە. و سەر خاترا ڤێ چەندێ ژی بوویە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئێخسیرێن وان هەمی بەردان.

و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پسیارا مەزنێ هەوازن مالکێ کوڕێ عەوفی ژ وێ شاندێ کر، کانێ ئەو چ لێ هاتییە؟ وان گۆتێ: ئەو یێ ل نک ثەقەفییان ل طائیفێ، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بێژنێ ئەگەر ئەو بێتە نک من و موسلمان ببت، ئەز دێ مال و مرۆڤێن وی هەمییان لێ زڤڕینم د گەل سەد حێشتران ژی. گاڤا وان ئەڤ خەبەرە گەهاندییە مالکی، وی هەر زوی خۆ ژ ثەقەفییان ڤەدزی و هات گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و موسلمان بوو، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سۆزا خۆ بۆ ب جهئینا، و ئەو کرە مەزنێ دەڤەرا وی، و پشتی هنگی وی شەڕێ ئویجاخا ثەقەفییان کر، حەتا ئەو نەچارکرین تەسلیم ببن، و پاشی موسلمان ببن.

## حەلیما سەعدیﷺ و مالباتا وێﷺ ل نك پێغەمبەریﷺ:

د هندەک ریوایەتان هاتییە کو ل دەمێ ڕویدانا حونەینێ ۆ سەرهاتییێن پشتی وێ چێبووین، ئێک ژ وان کەسێن ل (ئەوطاسێ) هاتینە ئێخسیرکرن شەیمائا کچا حارثێ سەعدی بوو، و بەری نوکە دەمێ مە بەحسێ ژیانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل نک حەلیمایێ کری مە ئاشکەرا کربوو کو

حەلیمایێ کورەک و دو کچ هەبوون: عەبدللاهـ و ئەنیسا و خوذامە، و خوذامە ئەو بوو یا دگۆتنێ: شەیماء، و ئەو ب عەمرێ خۆ ڤە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مەزنتر بوو.

هندەک ریوایەتێن لاواز -ژ لایێ سەنەدێ ڤە- هەنە کو ل جعرانە شەیماء، وهنگی ئەو ئێک ژ ئێخسیران بوو، هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ئەز خویشکا تەمە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: نیشانا تە چییە؟ وێ زەندکا خۆ نیشا دا وگۆتێ: ئەڤە شوینا وێ لەقییە یا تە ل دەستێ من دای، هێشتا یا مای! هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو نیاسی لەو قەدرەکێ زێدە بۆ گرت، و گۆتێ: تە دڤێت بمینە ل نک مە، و تە دڤێت دێ مالی دەینە تە و بزڤڕە جهێ خۆ.. وێ گۆت: ئەز دێ زڤڕمە جهێ خۆ..

و ل دۆر حەلیمایێ و زەلامێ وێ حارثی و کورێ وان عەبدللاهی، هندەک ریوایەت هەنە کو ئەو ژی ل ڤی دەمی هاتبوونە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، بەلێ ئەو ریوایەت ژی دلاوازن، هەر چەندە هندەک ریوایەت هەنە کو حەلیما و زەلامێ وێ گەهشتبوونە دەمێ ئیسلامێ و باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینابوو، لەو هندەک زانایان ئەو ژ صەحابییان هژمارتینە. و هزر پتر بۆ هندێ دچت کو حەلیما و زەلامێ وێ ل ڤی دەمی -سالا هەشتێ مشەختی- نەمابن، ئەگەر شاندێ هەوازنییان دا بێژنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەیک و بابێن تە ژی د ناڤ ئێخسیران دانە کانێ چاوا گۆتێ: مەت و خالەتێن تە د ناڤ دانە.

### پێغەمبەر و کرنا عومرێ:

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مەسەلا هەوازنییان خلاصبووی، و بەری ئەو بزڤڕتە مەدینێ، وی بریار دا عومرەیەکێ بکەت، لەو وی ل جعرانە

ئیحرام کرنە بەر خۆ، و ئەو میقاتێ خەلکێ طائیفێیە، و هەچییێ د ڕێکا وان ڕا بێت، و دەمێ ئەو ژ عومرێ خلاصبووی ل مەروایێ موعاویەیێ کوڕێ ئەبوو سوفیانی سەرێ وی تراشی.. و پشتی عومرە ب دوومـاهی هاتی ئەو زڤڕی جعرانە، کو ل سەر ڕێکا مەدینێیە، و ژ وێرێ ئەو زڤڕی مەدینێ.

و ئەڤ عومرە وی ل هەیڤا ذولقەعدەیێ کربوو، و صەحابییان ئەو عومرە حسێب دکر عومرەیا سێییێ یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری، عومرەیا ئێکێ ل سالا شەشێ بوو، دەمێ کافران ئەو ژ حودەیبییێ زڤڕاندی و نەهێلای بچتە مەکەهێ، ئینا وی قوربانێ خۆ ڤەکوشت و سەرێ خۆ تراشی و جلکێن ئیحرامان ژ بەر خۆ کرن و زڤڕی مەدینێ. یا دوییێ سالا دی بوو ئەوا دبێژنێ: عومرەیا قەزاکرنێ. و یا سێییێ ئەڤە بوو، و ئەو هەر سێ ل هەیڤا ذولقەعدە بوون. عومرەکا دی ژی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کربوو د گەل حەجا خاترخواستنێ.

## زڤڕینا پێغەمبەری بۆ مەدینێ:

ل بیست و چاری هەیڤا ذولقەعدە، یان ژی ل دەسپێکا هەیڤا ذولحججە ل دویڤ گۆتنەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گەهشتە باژێرێ مەدینێ، پشتی کو عەتتابێ کوڕێ ئەسیدی کرییە مەزنێ وێ، و موعاذێ کوڕێ جەبەلی لێ هێلای دا دینی نیشا خەلکی بدەت.

و دەمێ مایی ژ ڤێ سالێ کو هەیڤەک و چەند ڕۆژەک بوون پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل مەدینێ بۆراند.

## دو سەرهاتییێن مالا پێغەمبەری:

د ڤێ سالێ دا دو سەرهاتییێن بەرچاڤ د مالا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- چێببووبوون، ئێک یا نەخۆش بوو، و ئێک یا خۆش بوو..

سەرهاتییا بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک نەخۆش مرنا کچا وی زەینەبێ بوو، و زەینەب -ل دویڤ بۆچوونەکێ- کچا وی یا مەزنتر بوو، ئەوا شوینا دەیکا خۆ خەدیجایێ د چاڤێن بابێ خۆ دا گرتی.

بەری نوکە پتر ژ جارەکێ بەحسێ وێ د گەل مە بۆرییە، و ل ڤێرێ ب کورتی دێ بێژین: دەمێ ئەو هاتییە سەر دنیایێ ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سیهـ سال بوو. و پشتی ئەو مەزن بووی وێ شوی ب کورێ خالەتا خۆ هالایێ (ئەبوولعاصێ کورێ رەبیعی) کربوو، ئەوێ د شەڕێ بەدرێ دا د گەل کافران ئێخسیر بووی.. دەمێ زەلامێ وێ پشتی شەڕێ بەدرێ ئەو ل سەر داخوازا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتییە مەدینێ، ب رێڤە کافرەکی (یێ پشتی هنگی موسلمانبووی و د شەرەکی دا شەهیدبووی) هاتە د رێکا وێ دا و سەرێ رما خۆ ب نک وێ ڤە درێژکر، تشتێ بوویە ئەگەرا هندێ حێشترا وێ خۆ ڕاهاڤێت، و ئەو ژ سەر پشتێ ژۆردا ب کەڤرەکی بکەڤت، و هنگی ئەو ب زارۆکەکێ خۆ یا گران بوو. ڤێ کەفتنێ کارەکێ خراب لێ کر، لەو پشتی هنگی بچویکێ وێ ژ بەرچوو، و دبێژن: مرنا وێ ژی پشتی هنگی ب چەند سالەکان هەر ژ بەر وێ نەخۆشییێ بوو ئەوا هنگی گەهشتییێ.

ل سالا حەفتێ مشەختی زەلامێ وێ ئەبوولعاص موسلمانبوو و ژ مەکەهێ مشەختبوو مەدینێ، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژنکا وی زەینەب لێ زڤڕاندە ڤە، و پشتی سالەکێ ژ مانا وان د گەل ئێک، و ل دەسپێکا سالا هەشتێ مشەختی زەینەب ل مەدینێ چوو بەر دلۆڤانییا خودێ، و ئەو ل بەقیعێ هاتە ڤەشارتن.

و ئەو نەڤییا خۆ یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د نڤێژا ب جماعەت دا ل مزگەفتێ دکرە ملێ خۆ، وەکی د هندەک حەدیسێن دورست دا هاتی،

ئومامەیا کچا زەینەبێ بوو، هندەک زانا دبێژن: ئەڤ چەندە پشتی مرنا دەیکا وێ زەینەبێ بوو.

سەرهاتییا دی یا خۆش ل دووماهییا سالێ چێبوویوو، ل هەیڤا ذولحججە کو هەیڤا دوازدێیە، پشتی زڤرینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ مەکەهێ، ئەو ژی بوونا کورێ وی ئیبراهیم بوو ژ وێ جارییێ یا مەزنێ ئەسکەندەرییێ موقەوقسی ژ مصرێ بۆ هنارتی، و ناڤێ وێ مارییایا کچا شەمعوونی بوو. و ئەو زارۆکێ وی یێ ئێکانە بوو نە ژ خەدیجایێ یێ خودێ دایێ.

## سەرهاتییێن
## سالا نەهێ مشەختی

بۆری د گەل مە کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل دووماهییا هەیڤا یازدێ یان ل سەرێ هەیڤا دوازدێ ژ سالا بۆری ژ مەکەهێ زڤڕی مەدینێ، و سالا نەهێ مشەختی ب سەر وی دا هات و ئەو ل مەدینێ بوو..

د ڤێ سالێ دا چەند سەرهاتییێن گرنگ د سیرەتێ دا ڕویدابوون بەلێ تشتێ ژ هەمییێ بەرچاڤتر ئەو بوو، شاندێن گەلەک ئێل و عەشیرەتێن عەرەبان بەر ب مەدینێ ڤە هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، وەکی دێ بەحس ژێ کەین، حەتا وێ دەرەجێ هندەک زانایێن سیرەتێ ناڤێ ڤێ سالێ دکەنە: سالا وەفدان. و سەرهاتییا دی یا مەزن یا کو د ڤێ سالێ دا چێبووی سەرهاتییا غەزایا تەبووکێ بوو.

**هەر شەش هەیڤێن ئێکێ**:

د هەر شەش هەیڤێن ئێکێ دا ژ سالا نەهێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مەدینێ بوو و ژێ دەرنەکەفتبوو، و د ڤی دەمی دا ئەو ب سێ کارێن سەرەکی ڕابووبوو:

**ئێك**: وی هژمارەکا صەحابییێن خۆ یێ زانا و تێگەهشتی ب دینی هنارتنە ناڤ وان ئویجاخان یێن ژ نوی موسلمانبووین؛ دا ئیسلامێ نیشا بدەن، و قورئانێ بۆ وان بخوینن، و وان ب تەعالیمێن دینێ نوی شارەزا و پەروەردە بکەن. و دگۆتنە ڤان صەحابییان: (القراء) کو د زاراڤێ وی سەردەمی دا مەعنایا زانایان ددا.

**دو**: وی هژمارەکا دی یا صەحابییێن خۆ هنارتنە دەڤەرێن جودا جودا ژ جەزیرا عەرەبان یێن کو بووینە موسلمان؛ دا تەرتیباتێن وان یێن ئیداری رێک بێخن، و لایێ مالی ژی دورست بکەن، زەکاتان کۆم بکەن و بدەنە هەژارێن وان، و جزیە و خێرێن دی لێکدەن و بۆ خەزینا دەولەتێ ل مەدینێ بهنێرن، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو مال ل سەر پێتڤییێن موسلمانان خەرج دکرن، و دگۆتنە ڤان صەحابییان: (العمال) کو د زاراڤێ وی سەردەمی دا مەعنایا بەرپرس و کاربدەستان ددا.

**سێ**: وی هژمارەکا سەرییێن لەشکەری ژی هنارتنە توخوبێن دەولەتێ، و ب وان لایان ڤە یێن هێشتا کافر لێ ماین، بۆ هندێ دا سەهما دەولەتا ئیسلامێ بکەفتە دلێن وان، و ئەو هزرێ نەکەن کو هێرشێ بدەنە سەر موسلمانان.. و د ڤان هەر شەش هەیڤان دا وی نێزیکی شەش سەرییان هنارتن، و هندەک ژ وان هندەک شەرێن سڤک کرن. و ئێک ژ وان سەرییان، سەرییا عەلییێ کورێ ئەبووطالبی بوو بۆ دەڤەرا (طەی) ل هەیڤا رەبیعولئاخەرێ، د ڤێ رویدانێ دا موسلمانان هندەک کەس ژ ئویجاخا (طائییان) ئێخسیرکرن، و ئێک ژ وان کچا حاتەمێ طائی بوو، گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو نیاسی زێدە قەدرێ وێ گرت، و ب رێز و ئحترام ڤە زڤڕاندە جهێ وێ، تشتێ بوویە ئەگەرا هندێ کو ئەو برایێ خۆ (عەدییێ کورێ حاتەمی) قانع بکەت کو بێت و موسلمان ببت.

### د ناڤبەرا پێغەمبەری ﷺ و ژنکێن وی ﷺ دا:

هەر وەسا ل ڤی دەمی یێ ئەم بەحس ژێ دکەین، کو نیڤا ئێکێیە ژ سالا نەهێ سەرهاتییەکا غەریب و نەعەدەتی د مالا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- رویدابوو، د ناڤبەرا وی و ژنکێن وی دا، ئەو سەرهاتی ئەوە یا د کتێبێن سیرەتێ دا دبێژنێ: (حادثة التخيير) یەعنی: سەرهاتییا داخوازا

هلبژارتنێ، و مەخسەد پێ ئەوە دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخواز ژ ژنکێن خۆ کری کو ئەو ئێک ژ دویان بۆ خۆ هلبژێرن: یان ب ژیانا فەقیرییێ د گەل وی رازی بن، یان ژی بێنە بەردان![1]

د حەدیسەکا دورست و یا درێژ دا ئیمام ئەحمەد و بوخاری ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی ڤەدگوهێزن، کو جارەکێ وی پسیارا ڤێ سەرهاتییێ ژ عومەرێ کورێ خەططابی کر، و دڤێت ژ بیر نەکەین کو حەفصایا کچا عومەری ژنکا پێغەمبەری بوو، و وێ د گەل عائیشایێ دەورەکێ بەرچاڤ د ڤێ سەرهاتییێ دا هەبوو، ل ڤێرێ هندەکێ ژ گۆتنا عومەری دێ ڤەگێرین.

عومەر دبێژت: ئەم قورەیشی دشیاینە ژنێن خۆ، گاڤا ئەم چووینە مەدینێ، مە هندەک مرۆڤ ل وێرێ دیتن ژنێن وان دشیانە وان، ئینا ژنێن مە ژی چاڤ ل یێن وان کر، ڕۆژەکێ کەربێن من ژ ژنکا من ڤەبوون، من دیت ئەو د بەر من ڕا ئاخفت، من گۆتێ: چاوا تو د بەر من ڕا دئاخڤی؟ وێ گۆت: ما تو ژ پێغەمبەری چێتری؟ ژنکێن وی د بەر وی ڕا دئاخڤن، و هندەک جاران ئێک ژ وان ڕۆژێ هەمییێ ژێ سل دبت!

گاڤا من گوهـ ل ڤێ ئاخفتنێ بووی، ئەز چوومە نک حەفصایێ، و من گۆتێ: ڕاستە هوین د بەر پێغەمبەری ڕا دئاخڤن و تشتان ژێ دخوازن؟ وێ گۆت: بەلێ. من گۆتێ: و ئێک ژ هەوە ڕۆژێ هەمییێ ژێ سل دبت؟ وێ گۆت: بەلێ. من گۆت: وەی بۆ خوسارتی و زیانا وێ یا وە دکەت ژ هەوە، ئەرێ ئێک ژ هەوە یا پشتڕاستە ژ هندێ کو خودێ غەزەبێ لێ بکەت دەمێ ئەو کەربێن پێغەمبەرێ وی ڤەدکەت؟ پا ئەگەر ئەو هنگی مر؟ نە وەبت

(١) هندەک زانا ل وێ باوەرێنە کو ئەڤ سەرهاتییە ل سالا پێنجێ مشەختی چێبووبوو.

جارەکێ تو دلێ پێغەمبەری بهێلی یان تشتەکی ژێ بخوازی، تشتێ تە ڤیا ژ من بخوازە..

عومەر دبێژت: من جیرانەکێ ئەنصاری هەبوو، من و وی کربوو دۆرانێ، هەر ئێک ژ مە رۆژەکێ دچوو نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و یێ دی شۆلێ خۆ دکر، پاشی ئەوێ دچوو نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا ئێتە نک یێ دی و بۆ بێژت کانێ وێ رۆژێ چ چێبوویە و چ وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتییە. و هنگی سوحبەتێن مە ل دۆر هندێ بوون کو غەسسانی هەسپێ خۆ یێن نال دکەن دا بێنە شەرێ مە، (و غەسسانی عەرەبێن شامێ یێن فەلە بوون) رۆژەکێ دۆرا هەڤالێ من بوو بچتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، عەیشا دەمێ زڤرییە مال، هات دەرگەهێ من قوتا و گازی من کر، گاڤا ئەز لێ دەرکەفتیم، وی گۆتە من: تشتەکێ مەزنێ چێبووی، من گۆتێ: چ چێبوویە، غەسسانییان ب سەر مە دا گرت؟ وی گۆت: نە.. تشتەکێ مەزنترە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەمی ژنێن خۆ بەردان.

عومەری گۆت: وەی بۆ خوسارەتییا حەفصایێ! من دزانی ئەڤە دێ چێ بت..

پاشی سپێدی عومەر چوو مالا کچا خۆ حەفصایێ دیت ئەو یا دکەتە گری، گۆتێ: راستە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هوین هەمی بەردان؟ وێ گۆت: ئەز نزانم، ئەو یێ ب تنێیە ل فلان جهی.. عومەر چوو وێرێ و گۆتە عەبدەکی: هەرە بێژێ عومەری دڤێت تە ببینت، وی خۆ بێ دەنگ کر، و بەرسڤ نەدا، عومەر چوو مزگەفتێ و زڤری، و جارا دویێ دەستویری ژێ خواست دیسا وی بەرسڤ نەدا، جارا سێیێ عومەر چوو مزگەفتێ و زڤری، و دەستویری ژێ خواست، وی دەستویری دایێ. گاڤا عومەر چوویە نک گۆتێ:

ئەرێ ڕاستە تە ژنێن خۆ هەمی بەردایـنـە؟ وی گـۆت: نـەخێر! عومـەری گـۆت: (الله أكبر) پاشی عومەری سوحبەتا خۆ یا بۆری د گەل ژنکا خۆ و حەفصایێ بۆ وی کر و گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ژنکێن ئەنصارییان فعلێن ژنکێن مە ژی خراب کرن! گۆت: هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- کرنژی.

ژ ڤێ گۆتنا عومەری دئێتە وەرگرتن کو ئەڤ سەرهاتییە هنگی چێبوویوو دەمێ بەرێ صەحابییان لێ کو نێزیکە عەرەبێن شامێ ژ هەڤالێن رۆمێ بێن و هێرشەکێ بـدەنــە ســەر مـەدینێ، و ئەڤە -وەکی زانـایێن دیرۆکێ دبێـژن- ل نیڤا ئێکێ بوو ژ سالا نەهێ، بەری غەزایا تەبووکێ چێ ببت، وەکی پاشی دێ بــەحس ژێ کەین. بەلێ پسیار ل ڤێرێ ئەڤەیە: ئەرێ ئەو چ تـشـت بـوو د ناڤبەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ژنکێن وی دا پـەیدابووی حەتـا ئـەو ژ وان عێجـز ببـت، و هەیڤـەکێ پشـت بدەتـە وان، و مەسـەلە بگەهتـە سەر نێزیکی بەردانێ، حەتا هندەک صەحابی هزر بکەن هەما وی ئەو یێن بـەردایـن ژێ؟

بـۆ بەرسـڤ دێ بێـژین: پشـتی مالـەکێ مـەزن ب دەسـت موسـلمانان کەفتی ڕەنگەکێ بەرفرەهییێ ب ســەر خـەلکی دا هـات، و نێزیکـە چـو مـال ژ ڤـێ بـەرفرەهییێ بێبـار نـەمابن، مـالا پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- تـێ نـەبت، ئەو هەر وەکی خۆ ما و چو لـێ زێدە نەبوو، ژنکێن وی چەنـدەکێ خـۆ گـرت، وان وە هـزر کـر پێغەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- وان ژ ڤـی مالــی بێبـار ناکـەت، و چەنـدەکێ ژینـا وان ژی دێ خـۆش کـەت، دا ئـەو ژ ڤـێ فـەقیرییێ دەرکەڤن یا ئەو تێدا، بەلـێ نێزیـک بـوو ئـەو مـال هەمی ب دوومـاهی بێـت بێی تشـتـەک ژێ بگەهتە وان، ئەو ڕابوون تکبیرا خۆ کرن وگـۆتن: هۆسا چێ نابت، ئەڤە مالەکێ مەزن کەفتە دەستێ پێغەمبەری و وی مال هەمی ل سەر

خەلكی بەلاڤ كر، و چو نەدا مە، ما چییە ئەگەر ئەو مە ژی وەكی مالەكێ ژ موسلمانان بهژمێرت!

پاشی وان شاندەک ب سەرۆكاتییا عائیشایێ ژ خۆ پێک ئینا دا کو ئەو ڤێ داخوازا وان بگەهیننە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، وێ شاندێ گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، کچێن کیسرای و قەیصەری ب زێڕ و زینەتن، و خدام و خولام ل بەر دەستان کار دکەن، و ئەم ب ڤی حالینە یێ تو دبینی!

پاشی وان داخواز ژ وی کر ئەو حالێ وان بەرفرەهـ بکەت، دا ئەو ژی وەکی خەلکی بژین، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ ڤێ داخوازا وان تەنگاڤ بوو، چاوا مەسەلە بگەهتە هندێ ڤیانا دنیایێ د دلێن ژنکێن وی دا ئێکا هند ژ وان چێ بکەت ئەو وەکی مرۆڤێن دنیایێ داخوازا بەرفرەهییێ بکەن؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرسڤا وان نەدا، بەلێ ژ عێجزییان دا وی پشت دا ژنکێن خۆ و ژ مال دەرکەفت، و چوو وی جهی یێ عومەر لێ چوویە نک وی، و ئەو مەزەلکەکا بلند بوو، و وی سویند خوار هەیڤەکێ نەچتە نک وان، پشتی بیست و نەهـ ڕۆژ چووین ئەڤ ئایەتە هاتنە خوارێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ۝ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ۝ ﴾ (الأحزاب: ٢٨-٢٩) یەعنی: ئەی پێغەمبەر تو بێژە وان ژنکێن خۆ یێن ل تە کۆمبووین، و داخوازا زێدەکرنا نەفەقێ ژ تە دکەن: ئەگەر هەوە ژینا دنیایێ و خەملا وێ دڤێت وەرن دا ئەز هندەکێ ژ وی مالێ دنیایێ یێ ل نک من هەی بدەمە هەوە، و بێ زیانەک بگەهتە هەوە ئەز دێ هەوە بەردەم. و ئەگەر هەوە ڕازیبوونا خودێ و پێغەمبەرێ وی دڤێت و ئەو تشتێ خودێ ل ئاخرەتێ بۆ هەوە ئامادەکری،

هوین صەبرێ ل سەر حالێ خۆ بکێشن، و گوهداریا خودێ و پێغەمبەرێ وی بکەن، هندی خودێیە بۆ یێن قەنج ژ هەوە خێرەکا مەزن ئامادەکرییە.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمانا خودایێ خۆ ب جهئینا، و ئێک ئێکە ئەڤ ئایەتە بۆ ژنکێن خۆ خواند، و وی ژ عائیشایێ دەست پێ کر، و دبێژن: دەمێ ئەو چوویە مەزەلکا عائیشایێ، عائیشایێ گۆتێ: پانێ تە گۆتبوو ئەز هەیڤەکێ نائێمە نک هەوە و ئەڤە بیست و نەهـ رۆژ چوون! وی گۆت: ئەڤ هەیڤە بیست و نەهـ رۆژن. پاشی وی گۆتێ: ئەز دێ تشتەکی بۆ تە بێژم و من نەڤێت تو لەزێ د بەرسڤێ دا بکەی حەتا رەئیا دەیبابێن خۆ وەرگری، پاشی وی ئەڤ ئایەتە بۆ وێ خواند.. عائیشایێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەز رەئیا دەیبابێن خۆ د دەر حەقا تە دا وەرگرم؟ نە ب خودێ ئەز خودێ و پێغەمبەرێ وی هل دبژێرم! و ژنکێن وی یێن دی ژی هەمییان ئەڤ بەرسڤە دایێ.

ب ڤێ چەندێ ئەو ژ داخوازا خۆ لێڤەبوون، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زڤری مال.

و مرۆڤ دەمێ ڤێ سەرهاتییێ دخوینت هژمارەکا دەرسێن مەزن ژێ وەردگرت:

یا **ئێکێ**: هندی موحەممەد بوو -سلاڤ لێ بن- ژ وی رەنگێ مەزنان بوو یێن نوکە دبێژنێ: مرۆڤێن شەعبی، غەریزا بابینییێ د دەر حەقا مللەتی دا د دلی دا هەبوو، کا چاوا بابێ پێ خۆش نینە تامێ ژ وی تشتی ببینت یێ چاڤێ بچویکێ وی لێ بت بەری بچویکێ وی تامێ ژێ ببینت، وەسا وی پێ خۆش نەبوو ئەو و بنەمالا وی ب رەنگەکێ وەسا د بەرفرەهییێ دا بژین کو یێ فەقیرێن مللەتی چاڤ لێ و ب دەست نەکەڤت، رۆژەکێ کچا وی (فاطمایێ) داخواز ژێ کر ئەو هندەک مالی بدەتێ دا ئەو خدامەکێ بۆ

خۆ بگرت پێش وێ ڤە شۆلێ مالێ بکەت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ب خودێ ئەز مالی نادەمە تە و خەلکێ (صوففە) قورقورا زکێ وان بت ژ برسان دا.

یا **دویێ**: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دڤیا ژنکێن وی خۆ ب کچێن کیسرای و قەیصەری قیاس نەکەن، و باش بزانن کو ئەو وەکی هەر ژنکەکا دی ژ ژنکێن موسلمانانە یێن کو زەحمەتێ دبینن و صەبرێ ل سەر نەخۆشییا ژینێ دکەن، بەلکی وی دڤیا ئەو د ڤێ چەندێ دا ژ وان زێدە کەن ژی؛ دا ئەو بۆ وان ببنە جهێ چاڤلێکرنێ، کانێ چاوا وی ژی د مەجالێ صەبرکێشانا ل سەر نەخۆشییا فەقیرییێ ژ هەمی زەلامێن موسلمان زێدە کربوو، رۆژەکێ عومەر هاتە مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرێ خۆ دایێ پێغەمبەری خۆ ل سەر حێسیلکەکێ یێ درێژکری، و دیارە ناڤ ملێن وی درویس بووینە لەو عومەری دیت شوینا حێسیلکێ یا ل ناڤ ملێن وی چێبووی، و عومەری بەرێ خۆ دایێ کولمەکا جەهی یا د ئامانەکی و قویتێ وی هەمی ئەو بوو، ئینا چاڤێن عومەری تژی رۆندک بوون، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- لێ زڤڕی وگۆتێ: کوڕێ خەططابی تە خێرە؟ عومەری گۆتێ: کیسرا و قەیصەر یێن د خۆشییان دا دژین، و تو پێغەمبەرێ خودێیی و ئەڤە حالێ تە بت؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ما تە نەڤێت دنیا یا وان بت و ئاخرەت یا مە بت؟

و وە نەبت ئێک هزر کەت بێژت: مانێ وی چو نەبوو لەو حالێ وی ئەڤە بوو، ئەگەر وەسا با عومەری -و بەری هنگی ژنکێن وی- ئەڤ گازندە ژێ نەدکر، بەلێ وی ب ڤی کارێ خۆ دڤیا بۆ ئوممەتێ -و ب تایبەتی بۆ مەزن وکاربدەستان- ببتە جهێ چاڤلێکرنێ بۆ صەبرا ل سەر نەخۆشییا ژینێ، دا نقۆبوونا د ناڤ خۆشییێ دا وان ژ کارێن مەزن نەدەتە پاش، و ئێکا هند

ژ وان چێ نەکەت ئەو پێخەمەت مانا د ناڤ خۆشییان دا قەزییا خۆ یا مەزن ژ دەست بدەن.

یا **سێیێ**: ئەو کەسێ ب ڤی ڕەنگی بت، مال د دەستان دا یێ مشە بت، و لێ نەگەڕێیت ژنکێ د ژینا خۆ دا ل دەرەجا ئێکێ بدانت، خەیالا وێ باخێڤت، و جیهانەکا تژی خەون و هیڤی و بەرفرەهی بۆ ئاڤا بکەت، مەعنا ئەو نە مرۆڤەکێ دنیاییێیە، و نە پالێ خۆشییا بەروەختە، و هەما ئەڤە ب تنێ بەسە هندێ بگەهینت کو ئینانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ پتر ژ ژنەکێ ئارمانج ژێ خۆشی برنا ب دنیایێ نەبوو، وەکی هندەک نەزان هزر دکەن، ئەوێ ل خۆشی و شەهەواتان بگەڕێیت ژنکێ د ژینا خۆ دا د ناڤ کراسێ فەقیری و دەستکورتییێ دا ناپێچت.

یا **چارێ**: چەند تەعبیرەکا بنەجهە دەمێ قورئانێ پشتی ڤێ سەرهاتییێ، یان ڤێ سەرکەفتنێ یا ژنکێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دەست خۆ ڤە ئینای، ناڤێ وان کرییە: دەیکێن خودان باوەران! ئەڤ ناڤلێکرنا هندێ دگەهینت ژنا کامل ژین پێ کامل نابت حەتا سالۆخەتێ وێ د گەل زەلامێ وێ وەکی سالۆخەتێ دەیکێ لێ نەئێت ئەوا ب دلی و رامانێن وی -نە کو ب خۆشی و مفای- زارۆکێ دبینت، و ژن گاڤا یا ب ڤی ڕەنگی بوو ژیان دێ د گەل ب ڕێڤە چت، چونکی ل دەمێ خۆشییێ و نەخۆشییێ دێ یا ب صەبر و ڤیان بت، و مال ئەگەر ل سەر ڤیانێ نەکو مەصلەحەتێ و مفای هاتە ئاڤاکرن مرۆڤ دەمێ خۆ د ناڤ دا دبینت دێ ئحساسێ ب ڕاستییا نەفسا خۆ یا پاقژ کەت، بلا قەت ئحساسێ ب ڕاستییا کیسرای و قەیصەری نەکەت ژێ!

# غەزایا تەبووکێ

غەزایا تەبووکێ ئەوا ل هەیڤا رەجەبێ ژ سالا نەهێ مشەختی چێبووی، دووماهی غەزا بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ژیانا خۆ دا کری، و ئەو بەرانبەر لەشکەرێ دەولەتا رۆمێ یا فەلە بوو.

## جهێ تەبووکێ:

تەبووک باژێرەکە دکەفتە باکوورێ رۆژئاڤایا مەدینێ ل سەر رێکا شامێ، ب دویراتییا (٧٧٨) کم، و هندەک زانا بۆ هندێ دچن کو شوعەیب پێغەمبەر و مللەتێ وی ل ڤێ دەڤەرێ دژیان، و ئاشکەرایە کو تەبووک دکەفتە رۆژهەلاتا کەنداڤێ عەقەبە و سەرێ دەریایا سۆر، ئەوا بەرێ دگۆتنێ: بەحرا قولزەمێ. و ئەڤ دەڤەرە هنگی وەلاتێ ئویجاخا (قوضاعە) یا عەرەبان بوو، و ژ بەر کو عەرەبێن وان دەڤەران و یێن شامێ فەلە بوون، وەلاتێ وان بۆ دەولەتا رۆمێ بوو.

ل باشوورێ تەبووکێ، یەعنی: د ناڤبەرا تەبووکێ و خەیبەرێ دا، شوینوارێن ئویجاخا ثەموودییان هەنە، ئەوێن خودێ صالح پێغەمبەر بۆ وان هنارتی، و بەرێ دگۆتنە وی جهی: (حجر) و هندەک جاران دبێژنێ: (مدائن صالح)، و دەمێ لەشکەرێ موسلمانان د جهێ وان را دەرباس بووی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو جهە بۆ وان دەسنیشان کر یێ مللەتێ صالحی لێ، و ئەو جهێ حێشترا صالحی لێ دهات و دچوو، و ئەو بیرا ئاڤ ژێ ڤەدخوار.

## دەمێ ڤێ غەزایێ:

وەکی مە گۆتی ئەڤ غەزایە ل هەیڤا رەجەبێ بوو ژ سالا نەهێ، و ل وێ سالێ ئەڤ هەیڤە دکەفتە بەرانبەر هەیڤا تەباخێ ژ سالا ٦٣٠ زایینی، یەعنی: ئەو ل چلێ هاڤینێ بوو، و دنیا هنگی گەلەک یا گەرم بوو، و د سەر گەرما دنیایێ و دویراتییا رێکێ را، ل وێ بهارا بۆری رەنگەکێ هشکاتییێ هەبوو، لەو چاندن یا باش نەبوو، و گرانی پەیدا بووبوو، و خەلک د تەنگاڤییەکا مەزن دا دژیان، و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ هندەک جاران دبێژنە ڤێ غەزایێ: (غزوة العسرة) یەعنی: غەزایا تەنگاڤییێ، و خودایێ مەزن د سوورەتا (التوبة) دا ناڤێ (ساعة العسرة) دەمێ تەنگاڤییێ ل ددانت، دەمێ دبێژت: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ ﴾ (التوبة: ١١٧) یەعنی: ب راستی خودێ تەوفیقا پێغەمبەری بۆ تۆبەکرنێ دا، و وی تۆبە دانا سەر وان موهاجر و ئەنصارییان ئەوێن ل دەمێ تەنگاڤییێ د گەل وی دەرکەفتینە شەرێ دوژمنان، پشتی کو نێزیک بووی دلێن هندەک ژ وان ژ حەقییێ وەرگەرێێن، و ئەو مەیلدارییا خۆشییێ و رحەتییێ بکەن، بەلێ خودێ ئەو موکمکرن و ب هێز ئێخستن و تۆبا وان قەبویلکر، هندی ئەوە ئەو ب وان یێ مهرەبان ودلۆڤانکارە.

## ئەگەر و بەرهەڤییێن دەرکەفتنێ:

بەری نوکە دەمێ مە بەحسێ وی تەنگاڤییێ کری یا ل مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پەیدابووی، پشتی ژنکێن وی داخواز ژێ کری کو ئەو حالێ وان بەرفرەهـ بکەت، مە ئاخفتنەکا عومەرێ کورێ خەططابی ئینا، ئەوا بوخاری ژێ ڤەدگوهێزت و تێدا هاتبوو کو وان (یەعنی: صەحابییان) د ناڤبەرا خۆ دا دگۆت: غەسسانی یێن هەسپێن خۆ نال دکەن دا هێرشەکێ

بدەنە سەر مەدینێ، و دیارە ئەڤە خەبەرە ژ لایێ شامێ ڤە بۆ مەدینێ هاتبوو، و دویر نینە غەسسانییان ب خۆ دەست د بەلاڤکرنا ڤی خەبەری دا و هنارتنا وی بۆ مەدینێ هەبت؛ دا ئەو ترسێ د دلێن موسلمانان دا بەلاڤ کەن، و ژ گۆتنا عومەری وەسا دئێتە زانین کو ئەڤ مەسەلە ل سەر هزرا پترییا خەلکی یا زال بوو، لەو حەتا ئێکێ وەکی عومەری دەمێ هەڤالێ وی هاتی ب لەز دەرگەهێ وی قوتای و گازی کرییێ، وی ئێکسەر گۆت: خێرە، غەسسانییان ب سەر مەدینێ دا گرت؟

ژ ڤێ چەندێ ئەو گۆتن بۆ مە ئاشکەرا دبت یا هندەک زانایێن دیرۆکێ دبێژن کو ئەگەرا سەرەکی یا دەرکەفتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ غەزایا تەبووکێ ئەو گەف بوون یێن رۆمێ و پشتەڤانێن وان ژ عەرەبێن شامێ ل موسلمانان دکرن کو ئەو دێ ب سەر مەدینێ دا گرن، و موسلمانان ژ ناڤ بەن. دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ چەندە زانی، وی بڕیار دا بەری کو رۆم بێن و قەستا حیجازێ بکەن، موسلمان بەر ب شامێ ڤە بچن، و هێرشێ بدەنە دەڤەرێن وان، دا ئەو هزر نەکەن موسلمان هند دلاوازن کو ئەو دێ شێن ب ساناهی وەلاتێ وان داگیر کەن.

ئەو بوو ل دۆرێن هەیڤا رەجەبێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابییێن خۆ ئاگەهدار کرن کو وی ل بەرە بۆ شەڕێ رۆمێ و پشتەڤانێن وان ژ عەرەبان بەر ب شامێ ڤە بچت، و ئەو ب خۆ عەدەتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو بوو هەر جارەکا دەرکەفتبا غەزایەکێ، وی جهێ دەرکەفتنێ بۆ خەلکی ئاشکەرا نەدکر، بەلکی هندەک جاران وی کار بۆ هندێ دکر کو مەسەلێ ل بەر خەلکی ڤەشێرت؛ دا دەنگ و باسێن دەرکەفتنا وی نەگەهنە دوژمنی هێشتا ئەو دەرنەکەفتی، بەلێ ڤێ جارێ وی وە نەکر،

بەلکی وی ب ئاشکەرا گۆتە خەلکی هەمییێ: ئەم دێ چینە شامێ بۆ شەڕێ رۆمێ. و چەند ئەگەرەک د پشت ڤێ چەندێ ڕا هەبوون:

**ئێک:** رۆمێ و پشتەڤانێن وان، وەکی دەنگ و باس گەهشتینە مەدینێ، هەما ب خۆ کارێ شەڕی دکر، و ئنیەتا هێرشێ کربوو دلێ خۆ، ڤێجا چو مەعنا بۆ هندێ نینە ئەم بێژین: بلا ئەو نەزانن دا کارێ خۆ نەکەن.

**دو:** هژمارا نەیاری گەلەک بوو، و ڕێک بۆ وەلاتێ وان یا دویر بوو، لەو دڤێت لەشکەر بێتە ئاگەهدارکرن؛ دا کو ب دورستی کارێ خۆ بکەت، و هزرا وێ تەنگاڤییێ ژی بکەت یا کو دێ ئێتە ڕێکا وان.

**سێ:** دەمێ دەرکەفتنێ ژ هەمی لایان ڤە یێ بەرتەنگ بوو، چلێ هاڤینێ بوو و دنیا گەلەک یا گەرم بوو، و سال سالەکا هشک بوو و حالێ خەلکی یێ بەرتەنگ بوو، و گەلەک ژ موسلمانان هەبوون هند پارە نەبوون شیرەکی بۆ خۆ پێ بکڕن بۆ شەڕی یان دەوارەکێ دا لێ سویار بن.

ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ئاشکەرایی خەلک تێ گەهاند کو ئەو دێ دەرکەڤنە شامێ، و وی ژ صەحابییێن خۆ خواست کو هەر ئێک ل دویڤ شیان وپێچێبوونا خۆ پشکدارییێ د بەرهەڤکرنا لەشکەری دا بکەت، و وی ئەو ل وێ خێرا مەزن ئاگەهدار کرن یا کو دێ گەهتە هەر ئێکێ ڤێ چەندێ بکەت، و هنگی گەلەک صەحابی هاتنە پێش و بۆ هەر ئێکی دیارکر کو ئەو زەلامێن تەنگاڤییێنە، بەری هەمییان عوثمانێ کوڕێ عەففانی ڕابوو ڤە و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ سەد حێشتر ب بار ڤە خەما من، و گاڤا وی دیتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ بەردەوامە ل سەر داخوازا خۆ وی گۆت: دوسەد حێشتر خەما من، و دەمێ وی دیتی دیسا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ بەردەوامە ل سەر گۆتنا خۆ، وی گۆت: سێسەد حێشتر ب بار ڤە خەما من.. پاشی ئەو چو مال مێدەکەک ئینا و دانا بەر

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ئەڤە هزار دینارێن زێرِی ژی ژ من بۆ لەشکەری، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پتر ژ جاەکێ گۆت: ئێدی عوثمان چ بکەت بلا بکەت چو ل سەر وی نینە!

و ئێکێ دی هەبوو بەری عوثمانی ژی ڕاکر، بەلکی بەری هەمی صەحابییان ڕاکر، هوین دزانن ئەو کی بوو؟

گوهێ خۆ بدەنێ..

عومەرێ کوڕێ خەططابی دبێژت: دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخوازا خێران ژ مە کری، مالەکێ باش د دەستێ من دا هەبوو، من گۆت: باشە، ئەڤرۆ ئەز دێ بەری ئەبوو بەکری ڕاکەم، ئەز چووم من ئەو مال هەمی ب نیڤی کر، نیڤەک من بۆ خۆ هێلا، و نیڤەک من ئینا کرە خێر.. گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو هەمی مال دیتی، گۆتە عومەری: پا تە چ بۆ مالا خۆ هێلا؟ وی گۆت: هندی وی، و گاڤا ئەبوو بەکر هاتی و مالێ خۆ دانای، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تە چ بۆ مرۆڤێن خۆ هێلا؟ وی گۆت: من خودێ و پێغەمبەرێ وی بۆ وان هێلان!

بەلێ زەلامێ ئێکێ د ئوممەتێ دا، ئەوێ ئەگەر باوەرییا وی بکەنە د لایەکێ تەرازییێ دا، و باوەرییا ئوممەتێ هەمییێ بکەنە د لایێ دی دا، باوەرییا وی دێ گرانتر بت.. ئەبوو بەکر ڤێ جارێ ژی ل پێشییێ بوو و کەس ل بەراهییا وی نەبوو، وی مال و حالێ خۆ هەمی ئینا و خۆ قرشەک د مالا خۆ دا نەهێلا..

عومەری نیڤا مالێ خۆ کرە خێر، و عەبدورڕەحمانێ کوڕێ عەوفی ژی نیڤا مالێ خۆ ئینا، و گەلەک صەحابییێن دی یێن وەکی عەبباسی و طەلحەی ب کۆمان مال ئینا و کرە خێر.. و دانا خێران ب هەبوونا مالەکێ زێدە ڤە یا گرێدای نینە، بەلکی ئەو ب هەبوونا دلەکێ بەرفرەهـ ڤە یا

گرێدایە، صەحابییەک هات ترارەک تژی قەسپ کربوو، دانا بەر سنگێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: بەس ئەڤ مالە من یێ هەی! هنگی وەکی هەر جار منافقان ل پشت پەردەیێن ڕەش و تاری ئەزمانێ خۆ بەردا، ئەوێن مالەکێ زێدە دای گۆتن: ئەو بۆ مەدحە ڤێ چەندێ دکەن.. و ئەوێن مالەکێ کێم دای ترانە بۆ خۆ پێ کرن و گۆتن: ڤێجا ما خودێ چ منەت ب ترارکێ تە یێ قەسپان هەیە! هنگی خودێ بەرسڤ پێش خودان باوەران ڤە دا: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ﴾ (التوبة: ٧٩) یەعنی: ئەوێن ئەزمانێ خۆ د دەرحەقا خودان باوەران دا درێژ دکەن، ئەگەر دەولەمەندان ب مالەکێ مەزن خێرکر ئەو دێ ب ڕیمەتییێ وان گونەهبار کەن، و ئەگەر هەژاران ل دویڤ شیانا خۆ خێر دان، ب ترانە ڤە ئەو دێ بێژن: چ مفا د ڤێ خێرا وان دا هەیە؟ خودێ یاری ب ڤان دوڕوییان کرییە، و عەزابەکا ب ئێش بۆ وان هەیە.

و د ناڤ صەحابییان دا هندەک هەبوون نە چو مال هەبوو بکەنە خێر و نە ژی چو دەوار هەبوون پێ بچنە جیهادێ، و دەمێ ئەو هاتینە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و داخواز ژێ کری کو ئەو هاریکارییا وان بکەت دا ئەو بشێن د گەل وی دەرکەڤن، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتییێ: چو د دەست من دا نەمایە ئەز بشێم هاریکارییا هەوە پێ بکەم، ئەو چوون و چاڤێن وان دتژی ڕۆندک، و خودێ بەحسێ وان دکەت دەمێ دبێژت: ﴿ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ (التوبة: ٩٢) یەعنی: چو گونەه ل سەر وان ژی نینە ئەوێن ئەگەر هاتنە نک تە دا تو هاریکارییا وان بکەی و وان بۆ جیهادێ هلگری تو بێژییێ: ئەز چو پێڕهەکی نابینم هەوە لێ سویار

بکەم، ئەو دچن پشت ددەنە تە، و چاڤێن وان ژ ڕۆندکان تژی دبن کو خێرا جیهادێ ژ دەست وان دەرکەفتی؛ چونکی ئەو چو تشتەکی نابینن خەرج بکەن، و بۆ جیهادا د ڕێکا خودێ دا لێ سویار ببن.

و ئێک ژ وان سەرهاتییێن هەژی ئەم ل ڤێرێ ئیشارەتێ بدەینێ د ڤێ دەربارێ دا، دا بزانین کانێ صەحابی چەند دمجد بوون کو د بەرسڤا خودێ و پێغەمبەرێ وی دەرکەڤن، سەرهاتییا (واثلەیێ کوڕێ ئەسقەعی) بوو، و ئەو ئێک ژ وان مرۆڤێن فەقیر بوو یێن کو پێڕەهـ نەهەین پێ دەرکەفتە جیهادێ، ئەو دبێژت: دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خەلک بۆ غەزایا تەبووکێ داخوازکری، ئەز چوومە مال، و ئەز زڤریم من دیت صەحابییان دەست پێ کربوو ژ مەدینێ دەردکەفتن، یەعنی: بەر ب تەبووکێ ڤە دچوون، و وی چو دەوار نەبوون پێ دەرکەڤت، گۆت: ئینا ئەز ل کۆلانێن مەدینێ هاتم و چووم و من گازی کر: کی دێ من د گەل خۆ بەت و پشکا من بۆ وی، یەعنی: ئەگەر دەسکەفتییەک گەهشتمە مە، و ئەو بارا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ددەتە من بلا بۆ وی بت. گۆت: پیرەمێرەکێ ئەنصاری گۆت: ئەز، بەلێ من دەوارەکا ب تنێ یا هەی، بێنەکێ ئەز دێ سویار بم، بێنەکێ تو، و خوارن ل سەر منە. من گۆتێ: بلا. و پشتی ئەم زڤرین هندەک حێشتر گەهشتنە من، من ئەو هاژۆتن و برنە نک هەڤالێ خۆ یێ ئەنصاری، ئەو ل جهەکێ بلند ڕوینشت و بەرێ خۆ دایێ و گۆتە من: کانێ حێشترێن خۆ بینە و ببنە، پاشی گۆت: ب ڕاستی حێشترێن تە دبەرکەفتینە، من گۆتێ: ئەو بۆ تەنە، شەرتێ مە ئەڤە بوو. وی گۆت: برازا حێشترێن خۆ ببە، من بارا تە نەڤێت، مەخسەدا من بارەکا دی بوو.

## هەلویستێ منافقان:

ل وی دەمێ منافقان بۆ خۆ ترانە و یاری ب خێرکەرێن موسلمانان دکر، وان هەلویستەکێ دی ژی یێ کرێت هەبوو، ئەو ژی ئەڤە بوو وان موسلمان ژ چوونێ سست دکرن، و دگۆتنێ: ڤێ گەرمێ و ل صەحرایێ برسی و تێنی.. هوین هەمی ب رێڤە دێ مرن، نەچن گوهێ نەدەنە موحەممەدی، پشتی هنگی ئەڤە رۆمە رۆم، نە ئویجاخەکا عەرەبانە هوین دێ شێنێ، نیڤەکا دنیایێ یا ل بن دەستێ وان!

و حەتا ئەو ڤی کارێ خۆ یێ پیس رێک بێخن، وان هندەک جاران کۆمبوون دکرن، و دگۆتنە ئێک و دو: کانێ ئەم چ بکەین، و جارەکێ ژ وان جاران ئەو ل مالا زەلامەکێ جوهی کۆمبوون، گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب کۆمبوونا وان زانی هندەک صەحابی هنارتنە وان و گۆتێ: ئاگری بەردەنە وی خانی.. و گاڤا وان ئاگر ب مالێ ڤە دیتی، هەر ئێک ژ وان وەکی مشکان د کونەکێ را رەڤی!

و سوورەتا (التوبة) ڤی هەلویستێ منافقان ب بەرفرەهی تۆمار دکەت، حەتا هندەک زانا دبێژنە ڤێ سوورەتێ، و ڤێ غەزایێ ژی: (الفاضحة) یەعنی: هەتکبەر، چونکی هەتکا منافقان پێ هاتەبرن، و گەلەک ژ وان بۆ موسلمانان ئاشکەرا بوون.

و هندەک منافق ژ بێزەراڤییا خۆ هاتنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و دەستویری ژێ خواست کو ئەو بمیننە ل مەدینێ، و دەرنەکەڤنە شەری، و وان چەند هێجەتەکێن وەکی خۆ خۆ پویچ و بێخێر گرتن، ئێک ژ وان هێجەتان ئەڤە بوو: وان دگۆت: ئەم نشێین بەرانبەر ژنکێن رۆمییان خۆ بگرین، هند ئەو دخوشکۆکن، ڤێجا دا کو ئەم د فتنە نەچین، ئەم دەرناکەڤینە

شەرى!! هنگى ئەڤ ئايەتە هاتە خوارێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّى وَلَا تَفْتِنِّىٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ (التوبة: ٤٩).

**لەشكەرێ تەبووكێ:**

پشتی ڤێ هەمییێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- شیا لەشكەرەكێ پێكهاتی ژ سیه هزار مرۆڤان ئامادە بكەت، و وی ئەبووبەكر كرە سەرلەشكەرێ گشتی، و زوبەیرێ كورێ عەووامی كرە مەزنێ موهاجرییان، و ئوسەیدێ كورێ حوضەیری كرە مەزنێ ئوسییان، و حەبابێ كورێ مونذری كرە مەزنێ خەزرەجییان، و عەببادێ كورێ بشری كرە مەزنێ حەرەسان.

و بەری ئەو ژ مەدینێ دەركەڤت وی موحەممەدێ كورێ مەسلەمەیی ل شوینا خۆ هێلا ل مەدینێ، و عەلییێ كورێ ئەبوو طالبی ژی هێلا دا سەخبێرییا مالا وی بكەت.. پاشی ئەو د گەل لەشكەرێ خۆ دەركەڤت و بەر ب شامێ ڤە چوون.

منافقان گۆت: وی عەلی د گەل خۆ نەبر دا بەلایا وی ژێ ڤەبت! هنگی عەلی د دویڤ دا دەركەفت و ل جهەكی دبێژنێ: (جورف) گەهشتێ و گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خۆ منافق یێ هۆ دبێژن! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەو درەوان دكەن، من تو یێ هێلای دا چاڤێ تە ل وان بت ئەوێن من ل پاش خۆ هێلاین، بزڤرە.. ما تە نەڤێت تو بۆ من وەكی هاروونی بی بۆ مووسای، بەلێ پا چو پێغەمبەر پشتی من نینن.

هنگی عەلی زڤری مەدینێ..

**ب رێكێ ڤە:**

دەمێ لەشكەر ژ مەدینێ دەركەفتی، و بەر ب شامێ ڤە چووی، دەم وەكی مە گۆتی چلێ هاڤینێ بوو، و خوارن و ڤەخوارن و پێرەه د گەل موسلمانان دكێم بوون، لەو وان تەنگاڤییەكا زێدە دیت حەتا گەهشتینە

بنەجهێ، و ب رێڤە دەم بۆ دەمی صەحابییان هزرا خۆ دکر و دا بێژن: کانێ فلان کەس؟ و ئەگەر وان نەدیتبا دا هزرکەن کو نە کو ئەو ب گۆتنێن منافقان هاتبتە خاپاندن، یان چووبتە د گەل وان، لەو دا چنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و بێژنێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، فلان کەس نە یێ دیارە، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دا بێژتە وان: بهێلن، ئەگەر خێرەک تێدا هەبت دێ گەهتە هەوە، و ئەگەر چو خێر تێدا نەبت، خودی بەلا وی ژ هەوە ڤەکر.

ئێک ژ وان صەحابییان یێن ڤەماین ئەبوو خەیثەمە بوو، رۆژەکا دنیا گەرم ئەو چوو ناڤ بیستانێ خۆ، دیت هەردو ژنێن وی کەپرێن خۆ یێن رەشاندین و ئاڤەکا سار و خوارنەکا خۆش یا لێنای، گاڤا وی ئەڤ چەندە دیتی، وی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ ل بەر حەتاڤێ و بای و گەرمێ بت، و ئەبوو خەیثەمە ل بەر سیبەرێ بت د گەل خوارنا خۆش و ژنا جوان؟ ئەڤە عەدالەت نینە.. ب خودێ ئەز نائێمە نک کەس ژ هەوە، کانێ خوارنەکێ بۆ من ئامادە کەن، پاشی ئەو ل حێشترا خۆ سویار بوو و دا رێ، حەتا ل تەبووکێ گەهشتییە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و دەمێ ئەو ژ دویر ڤە هاتی هندەکان گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەڤە سویارەکێ ب نک مە ڤە دئێت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرێ خۆ دایێ و گۆت: ئەبوو خەیثەمە بە. گۆتن: هەما ئەوە!! و گاڤا ئەو هاتییە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەبوو خەیثەمە نێزیک بوو تو بچییە هیلاکێ.

و ب رێکێ ڤە -وەکی بەری نوکە ژی مە گۆتی- لەشکەر د دەڤەرا حجرێ را بۆری، ئەو جهێ ئویجاخا ثەموودییان، قەومێ صالح پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- لێ دژیا، بیرەکا ئاڤێ ل وێرێ هەبوو، و ئەو ئەو بیر بوو یا حێشترا صالحی ژێ ڤەدخوار، هندەک صەحابییان ئاڤ بۆ خۆ ژێ هلکێشتا،

و هندەکان هەڤیر پێ کر، گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب وێ چەندێ زانی، گۆتی: وێ ئاڤێ برێژن، و وی هەڤیری بدەنە حەیوانان.. ئەڤە چونکی ئەو جهەک بوو خودێ غەزەب لێ ل وی مللەتی کربوو یێ پێغەمبەرێ خۆ درەوین دەرێخستی. و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ فەرمانە ل وان کری ژ بەر هندێ نەبوو چونکی حەرامە ئەو وێ ئاڤێ ڤەخۆن، بەلکی ژ بەر هندێ بوو دا ئەو ب ڤان کاران ڤە موژیل نەبن و ئعتبار و وجەکێ بۆ خۆ ژێ وەرنەگرن، لەو وی فەرمان ل صەحابییێن خۆ کر و گۆتی: ئەگەر هوین د جهەکێ هۆسا ڕا بۆرین، بکەنە گری، و ئەگەر گرییا هەوە نەئێت ژی ژ قەستا گرییا خۆ بینن.. یەعنی: ب تەعدایی وێ عەزابێ بیننە بیرا خۆ یا خودێ دایە ڤان مللەتان سەرا نەگوهدارییا وان بۆ پێغەمبەرێن وان.

و دەمێ ئەو ب ڕێڤە، عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی دبێژت: شەڤەکێ درەنگ ئەز ژ خەو ڕابووم، من ڕۆناهییەک دیت ل تەنشت لەشکەرێ مە گەش دکر، ئەز ب نک ڤە چووم دا سەحکەمێ کانێ ئەو چییە؟ من دیت پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و ئەبوو بەکر و عومەر یێن کارێ ڤەشارتنا عەبدللاهێ ذولبیجادەینێ موزەنی دکەن، ئەوێ وێ شەڤێ مری، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چووبوو د قەبرێ وی دا و ئەبوو بەکر و عومەری ئەو دادهێلا، و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەبرێ وی دورستکری، گۆت: یا ڕەببی ئەزێ ژ وی ڕازیمە تو ژی ژێ ڕازی بە. عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی گۆت: هنگی من گۆت: خوزی ئەز خودانێ وی قەبری بامە.

**ل تەبووکێ:**

تەبووک دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوویێ دەڤەرەکا هشک و زوها بوو، د نهالا وێ دا کانیکەک هەبوو، ئاڤ وەکی قەیتانەکێ ژ بەر دچوو هندی یا کێم بوو، موعاذێ کوڕێ جەبەلی دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ

بن- گۆتە مە: سوباهی ئەگەر خودێ حەز بکەت هوین دێ چنە سەر کانیکا تەبووکێ، و حەتا هوین دگەهنە وێرێ ڕۆژ دێ بلند بت، ڤێجا هەچییێ گەهشتە وێرێ دەست نەکەتە ئاڤێ حەتا ئەز دئێمە وێرێ. گاڤا ئەم گەهشتینە وێرێ دو زەلام بەری مە چووبوون، و ئاڤەکا کێم ژ کانیکێ دچوو، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: هەوە دەستکرییە ئاڤێ؟ وان گۆت: بەلێ[1]، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاخفتن گۆتنە وان، پاشی هێدی هێدی ئاڤ ب مستێ ژ کانیکێ ڕاکر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەست و دێمێ خۆ ب وێ ئاڤێ شویشت و ئەو ئاڤ جارەکا دی کرە کانییێ، مە دیت د گاڤێ دا ئاڤ بۆش بوو و ژ بەر کانییێ چوو، حەتا خەلکی هەمییێ ئاڤ بۆ خۆ ژێ بری. موعاذ دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە من: موعاذ، نێزیکە ئەگەر عەمرێ تە درێژبوو تو ڤی جهی ببینی یێ تژی باغ و بیستان.

و ژ بەرەکەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاڤا تەبووکێ زێدە بوو، و وەسا چێبوو وەکی وی گۆتی، تەبووک پشتی هنگی -و حەتا ڤێ گاڤێ ژێ- ب باغ و بیستان و دارقەسپێن خۆ ناڤدار بوو، هەر چەندە بەری هنگی ئەو جهەکێ هشک و بێ شینکاتی بوو.

و موعجیزەیەکا دی ژ وان گەلەک موعجیزەیێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێن صەحابییان د ڤێ سەفەرێ دا ژێ دیتین، ئەو بوو ڕۆژەکێ وی گۆتە صەحابییان: ئەڤ شەڤە هەرەبایەکێ دژوار دێ ب سەر هەوە دا ئێت، ڤێجا کەس ژ هەوە ژ جهێ خۆ ڕانەبن، و هەچییێ حێشترەک هەی بلا وێ گرێ دەت. و وەسا چێبوو، وێ شەڤێ هەرەبایەکێ دژوار هات، زەلامەک ڕابووڤە بای ئەو بر حەتا هاڤێتییە چیایێ (طەی).

---

(١) د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو ئەو ژ منافقان بوون.

دەمێ لەشکەرێ موسلمانان گەهشتییە تەبووکێ، ئەو بیست ڕۆژان مانە ل وێرێ، و هەر چەندە دەنگ و باسێ هاتنا وان ل وەلاتێ شامێ هەمییێ بەلاڤبوو ژی، بەلێ نە لەشکەرێ ڕۆمێ و نە ژی ئویجاخێن عەرەبان ژ پشتەڤانێن ڕۆمێ، ئەوێن گەف ل موسلمانان دکرن کو دێ وان بنبڕ کەن، نە وێریان بێنە موسلمانان، هەر چەندە ئەو دەمەکێ درێژ ژی بوو وان بەرهەڤییێن خۆ بۆ شەڕی دکرن. و نە بەس وان د خۆ ڕا نەدیت شەڕی بکەن، بەلکی هندەک ژ وان -وەکی مەلکێ ئەیلە- خەلات و دیاری بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتن و ئامادەبوونا خۆ دیار کر کو ئەو جزییێ بدەنێ.

هەر وەسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرییەکا لەشکەری یا کو ژ چارسەد و بیست مرۆڤان پێک دهات ب سەرۆکاتییا خالدێ کوڕێ وەلیدی ژ تەبووکێ هنارتە دەڤەرا (دومة الجندل)، و ئەو شیان مەلکێ وێ دەڤەرێ ئەوێ دگۆتنێ: (ئوکیدرێ کوڕێ عەبدلمەلکێ کندی) ئێخسیر بکەن و بیننە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و هژمارەکا مەزن یا دەسکەفتییان ژی ب دەست خۆ بێخن. پشتی هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صولح د گەل ئوکیدری کر کو ئەو جزییێ بدەتە موسلمانان.

و هژمارەکا صولحێن دی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل کۆمەکا عەشیرەتێن عەرەب یێن فەلە گرێدان، و وی جزیە دانا سەر وان، و ئەو ب ڤێ چەندێ شیا چەنگێن دەولەتا ڕۆمێ بقوصینت، و دفنبلندییا وان بشکێنت، و پشتەڤانێن وان ژ عەرەبێن شامێ کێم بکەت.

(ئبن حبان) ژ جابرێ کوڕێ عەبدللاهی ڤەدگوهێزت، کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بیست ڕۆژان ما ل تەبووکی، و وی ل ڤی دەمی هەمییێ نڤێژ (قەصر و جەمع) دکرن. و پشتی بیست ڕۆژان ئەو بەر ب مەدینێ ڤە زڤڕین.

## بەرگەڕیانا کوشتنا پێغەمبەری ب رێڤە:

پـتـر ژ جارەکێ مە ئیشارەت دایێ کو د ڤێ غـەزایێ هژمارەکا منافقـان د گەل موسلمانان دەرکەفتبوون، و وان گەلـەک ب وی ئـەنجامی نـەخۆش بـوو یێ موسلمان د ڤێ غەزایێ گەهشتینێ، لەو هندەک ژ وان ب رێڤە بەرگەڕیانا کوشتنا پێغەمبـەر -سلاڤ لـێ بـن- کـر، و د ئایەتـەکا سـوورەتا (التوبـة) دا خودایێ مەزن ئیشارەتێ ددەتە ڤێ چەندێ دەمـێ بەحسـێ منافقـان د کـەت و دبێژت: ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدْ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُواْ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّواْ بِمَا لَمْ يَنَالُواْ ﴾ یـەعنـی: ئـەو ب خـودێ سـویند دخـۆن کـو وان تشـتـەک نەگۆتیـە خرابـی پـێ بگەهتـە پێغەمبـەری و موسـلمانان. و ئـەو درەوان دکـەن؛ چـونکی وان ئاخفتنا کوفرێ یا گۆتی و ئەو ب ڤێ گـۆتـنــێ ژ ئـیـسلامێ دەرکەفتینـە. و وان دلێ خۆ برە وی تشتی ژی یێ ب دەست وان ڤە نەهاتی.. وئـەو تشـت چ بـوو؟ ئایـەتێ ب ئاشـکەرایی نـەگۆت کـانێ ئـەو چیـە؟ و ئـەو ب خـۆ هـەر تشتەکێ نەخۆشی پێ گەهشتبا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و خودان باوەران، چ گۆتن با یان کریار با، وان دلێ خۆ دبرێ، و کار بۆ دکر، هەر چەنـدە پتریـا وان تشتان ب دەست وان ڤە نـەدهاتن ژی.. و ئێـک ژ وان کـاران بەرگـەڕیانا کوشتنا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، دەمێ ئەو ژ تـەبووکێ زڤـڕی، و ئـەو ب ڤی ڕەنگی بوو:

شەڤەکێ دەمێ پێغەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- ژ تـەبووکێ دزڤـڕی گەهشـتـە نهالـەکێ، و ل بـەر لـێڤـا نـهالـێ ڕێکەکا تـەنگ و بلند هـەبوو، پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان دا ئەو هەمی د نهالـێ ڕا بچـن، و کـەس ژ بلی وی نەچتە ڕێکا بلند، و پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- بـەرێ دەوارا خۆ دا ڕێکـا بلند، حوذەیفە بەرا وی دچوو، و عـەممار پشـتی وی، و ئـەو یـێ سـویـاربوو، دەه پازدە منافقەکان سەر و چاڤێن خۆ پێچان، و ل دەوارێـن خۆ سویاربوون،

و ب لەز چوونە د رێکا پێغەمبەری دا، گۆتن: گاڤا ئەو گەهشتە نێزیکی مە، ئەم دێ ب دەوار ڤە ب نک وی ڤە چین، گاڤا دەوارا وی مە دبینت، دێ پاشدا چت، و ژ رێکێ دەرکەڤت و فرت، و هۆسا ئەو دێ ژێ کەڤت و مرت و بەلا وی ژ مە ڤەبت، و تارییە ژی نە کەس مە دبینت، و نە کەس مە دنیاست، گاڤا پێغەمبەر و هەر دو هەڤالێن خۆ نێزیکی وان بووین، ئەو ب نک ڤە هاتن، حەتا دبێژن: دەوارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هندە خواربوو هندەک تشت ژ سەر پشتێ کەفتن، بەلێ پێغەمبەری خۆ گرت، و ل وان خوری، هەر وەسا حوذەیفە و عەممار ژی ب نک وان ڤە چوون و رێ ل وان گرت، گاڤا وان مەسەلە ب ڤی رەنگی دیتی، ئەو رەڤین، و چوونە د ناڤ کۆما مرۆڤان دا.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە هەردو هەڤالێن خۆ: هەوە ئەو نیاسین؟ وان گۆت: نەخێر! سەر و چاڤێن وان دپێچای بوون، بەلێ مە دەوارێن وان نیاسین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: وان دڤیا پێغەمبەرێ خودێ گرێل کەنە د نهالێ دا[1]. وهۆسا ئەوا وان ڤیای ب دەست وان ڤە نەهات. وئەڤ کەرب و نەڤیانا وان بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ بەر چ بوو؟

خودێ دبێژت: ﴿ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦۚ ﴾ یەعنی: وان منافقان تشتەک ل نک پێغەمبەری نەدیت کو ئەو رەخنێ پێ لێ بگرن و پێ بهاڤێنێ، ژ بلی کو خودێ قەنجی د گەل وان کر، و ئەو ژ وێ خێرێ زەنگین کرن یا وی ل سەر پێغەمبەرێ خۆ ڤەکری. ئەو هندەک مرۆڤێن هەژار و لێککەفتی و بێ دین بوون، خودێ ب بەرەکەتا پێغەمبەرێ خۆ، هیدایەت ب رزقێ وان کر، و ئەو کرنە برایێن ئێک، و رێزێن وان گەهاندنە ئێک، و ئەو دەولەمەند کرن.. ڤێجا وان چیە هندە کەربێ دهاڤێنە ڤی

(١) ئەحمەد ژ ئەبوو طوفەیلی ڤەدگوهێزت.

پێغەمبەری و دینێ وی؟ د گەل ڤان تاوانێن وان یێن مەزن، خودێ دەرگەهێ تەوبێ و زڤڕینێ ل بەر وان هێلا ڤەکری، دا هەچییێ ژ وان بڤێت قست بکەتێ، دەمێ گۆتی: ﴿ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ﴾ ئەگەر ئەو ل ئیمان و تۆبێ بزڤڕن، ئەو دێ بۆ وان چێتر بت. یەعنی: هێشتا وان دەلیڤە یا هەی، ژ خۆ ئەگەر دەلیڤە ژ دەست وان دەرکەڤت، و مەجالێ تۆبێ نەما و وان تۆبە نەکر: ﴿ وَإِن يَتَوَلَّوْاْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِۚ وَمَا لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾ ﴾ ئەگەر وان پشت دا حەقییێ، و ل سەر حالێ خۆ بەردەوام مان، و تۆبە نەکر، خودێ د دنیایێ دا عەزابەکا ب ئێش ب دەستێ موسلمانان دێ دەتە وان، و ل ئاخرەتێ ژی ئەو ب ئاگرێ جەهنەمێ دێ وان عەزاب دەت، و هنگی کەسەک نابت وان ڕزگار بکەت یان خرابییا عەزابێ ژ وان پاشڤە ببەت.

### زڤڕین بۆ مەدینێ:

هندەک زانایێن دیرۆکێ ل وێ باوەرێنە کو غەزایا تەبووکێ هەر ژ خۆ بەرهەڤکرنێ و حەتا زڤڕینێ ژ هەیڤا رەجەبێ حەتا رەمەزانێ ڤەکێشا، یەعنی: پتر ژ دو هەیڤان، و دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زڤڕییە مەدینێ هەیڤا رەمەزانێ دەست پێ کربوو.

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن وی ب سەرفەرازی زڤڕینە ڤە، و سەرکەفتنەکا مەزن ب دەست خۆ ئێخستی بێی کو شەڕی بکەن، ل مەدینێ ئەو کەسێن خۆ ژ چوونا جیهادێ دایە پاش و د گەل موسلمانان دەرنەکەفتین، هاتنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و داخوازا لێبۆرینێ ژ وی کر، و ئەو ب خۆ ئەوێن پاش ڤە ماین، سێ ڕەنگێن مرۆڤان بوون:

١- ئەو کەسێن دلەکێ نساخ و تژی نیفاق هەی، چ ژ خەلکێ مەدینێ ب خۆ بن، یان ژی وان ئەعرابییان بن ئەوێن ل دەور و بەرێن مەدینێ دژیان:

بەری دەرکەفتنا موسلمانان بۆ تەبووکێ، ئەڤان دەورەکێ مەزن د بەلاڤکرنا گۆتگۆتک و ئاخفتێن بێخێر دا هەبوو، و وان ب هەمی هێزا خۆ کار بۆ هندێ کر کو خەلکی ژ چوونێ سست بکەن، و گاڤا چو ب بزاڤا وان ڤە نەهاتی و موسلمان دەرکەفتین، ئەو بوونە دو پشک: هژمارەکا کێم ژ وان چو ڕێ نەدیتن، و بۆ هندێ دا ئەو ئاشکەرا نەبن، نەچاربوون د گەل موسلمانان دەرکەڤن، بەلێ د پتر ژ هلکەفتنەکێ دا وان بەرک ژ سەر خۆ دهاڤێت و نیفاقا خۆ ئاشکەرا دکر.. و بارا پتر ژ وان خۆ ژ دەرکەفتنێ دا پاش، و مانە ل مالێن خۆ و دەرنەکەفتنە جیهادێ، هندەک ژ وان هاتنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هندەک هێجەتێن بێخێر بۆ خۆ گرتن؛ دا دەرنەکەڤن، و هندەک ژی هەما ب بێ منەتی دەرنەکەفتن، بێی چو هێجەتان بۆ خۆ بگرن، چونکی وان هزر دکر موسلمان دێ چن و نازڤرن، ئاخری شەڕی رۆمێ نە وەکی شەڕێ هندەک ئویجاخێن عەرەبانە! هۆسا وان دلێن خۆ خۆشکرن. بەلێ دەمێ موسلمان ب سەرفەرازی زڤرین، د گەل دەسکەفتییێن لەشکەری و سیاسی ژی، گەلەک ژ ڤان منافقان هاتنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ب ڕویەکێ قائیم ڤە داخوازا لێبۆرینێ ژێ کر.

٢- ئەو موسلمانێن خودان عوزرێن شەرعی:

چ عوزرا وان ئەو بت ئەو دنساخ بن، یان دپیر بن، یان ژی ژ فەقیری چو مالێ وەسا نەبت بشێن پێ دەرکەڤنە جیهادێ، هەر چەندە وان گەلەک حەز دکر کو ئەو ژی دەرکەڤنە جیهادێ، حەتا مەسەلە گەهشتە هندێ -وەکی قورئان دبێژت- هندەک ژ وان هاتنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و داخواز ژێ کر ئەو هندەک مالی بدەتە وان دا بشێن پێ دەرکەڤنە جیهادێ، و گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتییە وان: چو مال د دەست من دا نەمایە ئەز بدەمە هەوە.. ئەو زڤرین و چاڤێن وان دتژی ڕۆندک.

و ژ بلی ڤان هندەک کەس هەبوون پێغەمبەری ب خۆ -سلاڤ لێ بن- داخواز ژێ کربوو کو ئەو دەرنەکەڤن؛ دا ب کارێ پاراستنا مەدینێ رابن.

٣- ئەو موسلمانێن بێ عوزر دەرنەکەفتین، هەر چەندە وان باوەری هەبوو ژی:

ئەڤە ژ خەمساری مابوون، هەر وەکی ل بەر وان یا گران بوو ئەو ل دەمێ تەنگاڤی و گەرمێ دەرکەڤن، لەو وان خۆ ڤەکێشا، و بێی عوزرەک هەبت دەرنەکەفتن، و ئێک ژ وان هزر دکر هندی هند لەشکەر یێ بۆشە، کەس ب دەرکەفتنا وان ناحەسییێت، و بەلکی هەما دەرنەکەفتنا وان هەر چو تەئسیرا خۆ ژی نەبت، و هژمارا وان گەلەک یا کێم بوو، و پشتی دەرکەفتنا موسلمانان هندەک ژ وان پەشێمان بوون، لەوا ئەو کت کت دەرکەفتن و خۆ ب لەشکەری ڕا گەهاندن، وەکی د سەرهاتییا ئەبوو خەیشەمەیی دا مە دیتی، و ئەوێن ماین و دەرنەکەفتین حەتا موسلمان زڤڕین، ب تنێ سێ کەس بوون.

## هەرسێ پاشڤەمای:

ئەو هەر سێ ژ ئەنصارییان بوو، ئەو ژی ئەڤە بوون: هیلالێ کوڕێ ئومەییەی، و مورارەیێ کوڕێ رەبیعی، و کەعبێ کوڕێ مالکی، و یا غەریب ئەوە مورارە و هیلال ژ وان صەحابییان بوون یێن ل شەڕێ بەدرێ ئامادەبووین، و هیلال ژ وان بوو یێن ل بەیعا عەقەبە ئامادەبووین!

و بەلکی ئەڤە (وەکی سەرهاتییا حاطەبی ل فەتحا مەکەهێ بەری هنگی) دەرسەک بت بۆ مە ئەم پێ بزانین کو کەفتنا مرۆڤێ زانا و چاک ژی د خەلەتییێن مەزن دا کارەکێ موستەحیل نینە، بەلێ تشتێ وان ژ خەلکێ دی جودا دکەت ئەوە ئەو هەر زوی ب تەوبەیەکا تمام و دورست خۆ دشۆن!

قورئان سەرهاتییا ڤان هەر سێ زەلامێن چاک، یێن کو کەفتینە د گونەهەکا مەزن دا د سوورەتا (التوبة) دا ب کورتی بۆ مە ڤەدگێرت، دەمێ دبێژت: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓا۟ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ یەعنی: ب ڕاستی خودێ تەوفیقا پێغەمبەرێ خۆ موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- بۆ تۆبەکرنێ و گوهدارییێ دا، و خودێ تۆبە دانا سەر وان مشەختێن جهـ و ئوبجاخێن خۆ هێلاین و قەستا وارێ ئیسلامێ کری، و تۆبە دانا سەر پشتەڤانێن پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- ئەوێن ل ڕۆژا (تەبووکێ) د گەل وی دەرکەفتینە شەڕێ دوژمنان ل وی دەمێ گەرما دنیایێ یا دژوار، و تەنگاڤییا خوارن و پێرەهان هەی، خودێ تۆبە دانا سەر وان پشتی کو نێزیک بووی دلێن هندەک ژ وان ژ حەقییێ وەرگەڕێن، و ئەو مەیلدارییا خۆشییێ و ڕحەتییێ بکەن، بەلێ خودێ ئەو موکمکرن و ب هێز ئێخستن و تۆبا وان قەبویلکر، هندی ئەوە ئەو ب وان یێ مهرەبان و دلۆڤانکارە ل دنیایێ و ئاخرەتێ. هەر وەسا خودێ تۆبە دانا سەر وان هەر سێ کەسان ژی یێن د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرنەکەفتین، ڤێجا ئەو گەلەک ب خەم کەفتین ژ بەر وێ چەندێ، حەتا دەمێ ژ بەر وێ خەما بۆ وان چێببووی عەرد ب فرەهییا خۆ ڤە ل وان تەنگ بووی، و بێهنا وان چک بووی، و وان ب دورستی زانی کو ژ بلی خودێ چو جهـ نینن ئەو ژ وی برەڤنێ، خودێ بەرێ وان دا گوهداری و تۆبەکرنێ و زڤڕینا بۆ وی تشتێ خودێ پێ ژ وان ڕازی ببت. هندی خودێیە ئەوە پڕ تۆبەوەرگرێ بەنییێن خۆ، و ئەو یێ دلۆڤانکارە ب وان.

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لی بن- ژ تەبووکێ زڤری ئەو کەسێن ژ منافقی د گەل وی دەرنەکەفتین هاتن و ژ درەو بۆ وی سویندخوارن کو وان عوزرا خۆ هەبوو لەوا ئەو دەرنەکەفتن، و داخوازا لێبۆرین و ئستغفارێ بۆ خۆ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- کر، و پێغەمبەر -سلاڤ لی بن- ب سەر ڤە ل وان بۆری و داخوازا ئستغفارێ بۆ وان کر، و گۆتێ: ناڤخۆیی و ڕاستییا دلێ هەوە خەما خودێ!

ئەڤ هەر سێ زەلامە بەری بێنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- هەر ئێکی د گەل خۆ هزر کر کانێ چ هێجەتێ بۆ خۆ بگرت، پاشی هەر ئێکی -بێی ب هەڤالێ خۆ بحەسییێت- گۆتە خۆ: هەر درەوەکا ئەز بکەم خودێ دێ شەرما من بەت و من ئاشکەرا کەت، ڤێجا هەما یا ژ هەمییێ باشتر ئەوە ئەز ڕاستییێ بێژم، بەلکی ڕاستی من ڕزگار بکەت.

دەمێ وان ڕاستییا خۆ گۆتییە پێغەمبەری -سلاڤ لی بن-، پێغەمبەری گۆت: ئەڤان ڕاستی گۆت.. پاشی وی گۆتە وان: هەڕن حەتا خودێ حوکمێ خۆ د مەسەلەیا هەوە ددەت.

پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- فەرمان ل موسلمانان کر کو کەس تێکەلییا وان نەکەت و د گەل وان نەئاخڤت، حەتا حوکمێ خودی د دەر حەقا وان دا ئاشکەرا دبت.. کەعبێ کوڕێ مالکی دبێژت: هەردو هەڤالێن من کەفتنە د مال دا و دکرنە گری، و ئەز ژ وان هەردویان حجێلتر و ب هێزتر بووم، ئەز دەرکەفتمە بازارێ و دچوومە نڤێژان ل مزگەفتێ، بەلێ کەس د گەل من نەدئاخت، و ئەز دچوومە نک پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- ل مزگەفتێ، و من سلاڤ ددایێ و من دگۆتە خۆ: نزا لێڤێن خۆ لڤلڤاندن بۆ بەرسڤا سلاڤا من یان نە؟! و گاڤا من نڤێژ دکر وی بەرێ خۆ ددا من، و گاڤا ئەز لێ دزڤریم وی بەرێ خۆ ژ من وەردگێڕا..

کەعب دبێژت: ڕۆژەکێ ئەز ل بازارا مەدینێ دچووم، من نەبەطییەکێ خەلکێ شامێ دیت، ژ وان یێن بازرگانییا خوارنێ د ناڤبەرا مەدینێ و شامێ دا دکر، گازی دکر: کی دێ کەعبێ کوڕێ مالکی نیشا من دەت؟ هندەک مرۆڤان ئەز نیشا دام و گۆتنێ: وێ هەیە.. ئەو هات کاغەزەک ژ مەلکێ غەسسانییان کرە د دەستێ من دا، و چونکی ئەز یێ خواندەڤان بووم، من ئەو خواند تێدا هاتبوو: مە یێ زانی هەڤالێ تە پشتا خۆ یا دایە تە، وەرە بگەهە مە ئەم دێ دلێ تە خۆش کەین. گاڤا من ئەو خواندی، من گۆتە خۆ: ئەڤە ژی ژ بەلایێیە، پاشی ئەز چووم و من ئەو هاڤێتە د تەنویرێ دا و سۆت.

پشتی نێزیکی پێنجی ڕۆژان، کەعب دبێژت: من گوهـ ل دەنگەکی بوو ب سەر چیایێ سەلع کەفت گۆت: کەعبێ کوڕێ مالکی مزگینی! وێ گاڤێ ئەز ئێکسەر چوومە سوجدێ، چونکی من زانی ئەڤە تەنگاڤی ڕابوو.. و گاڤا خودانێ دەنگی گەهشتییە من من کراسێ خۆ ژ بەر خۆ کر و وەک شرینییا مزگینییێ دایێ، و ب خودێ من هنگی ژ وی کراسی پێڤەتر چو کراس نەبوون، لەو پشتی هنگی من کراسەک قەرکر دا پێ بچمە مزگەفتێ ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لی بن-.

# سەرهاتییێن مایی
# یێن سالا نەهێ مشەختی

ل هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا نەهێ پێغەمبەر -سلاڤ لی بن- ژ تەبووکێ زڤڕی ڤە، وەکی بەری نوکە مە ڤەگێڕای، و ژ بلی سەرهاتییا غەزایا تەبووکێ، کو بەرچاڤترین سەرهاتییێن ڤێ سالێ بوون، چەند سەرهاتییەکێن دی ژی د ڤێ سالێ دا چێبووبوون، ل ڤێرێ دێ ئیشارەتێ دەینە هندەک ژ وان.

**سەرهاتییا** (**مسجد الضرار**):

ئێکەمین کارێ پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- کری دەمێ ئەو گەهشتییە قوبائێ پشتی کو ژ مەکەهێ مشەخت بووی، وەکی د سەرهاتییا مشەختبوونێ دا مە بەحس ژێ کری، ئاڤاکرنا مزگەفتا قوبائێ بوو، و پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لی بن- گەهشتییە نیڤا مەدینێ و لێ ئاکنجیبووی وی مزگەفتا خۆ ل وێرێ ئاڤاکر.. و ئەڤ هەردو مزگەفتە ژ وان مزگەفتان بوون یێن بهایەکێ مەزن ل نک موسلمانان هەین، ژ بەر کو پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- ئەو ئاڤاکربوون، و گەلەک جاران پێغەمبەر -سلاڤ لی بن- ژ مەدینێ دچوو قوبائێ و نڤێژ ل ڤێ مزگەفتێ دکر و دزڤڕی مەدینێ.

پشتی هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- بۆ مەدینێ، و ب هێزکەفتنا موسلمانان دیاردا نیفاقێ ل مەدینێ پەیدابوو، هندەک کەسان ژ خەلکێ مەدینێ ئەوێن حەز ژ ئیسلامێ نەدکر، و د خۆ ڕا نەددیت کو دوژمناتییا ئیسلامێ بکەن، ب سەر ڤە خۆ ب موسلمانەتییێ دئینادەر و ژ بن ڤە د گەل کافران بوون، و ژ بەر کەربا وان یا زێدە بۆ ئیسلامێ، د گەلەک هلکەفتنان

دا وان بەرک ژ سەر خۆ دهاڤێت، و کوفرا خۆ ئاشکەرا دکر، و گەلەک جاران ئایەتێن قورئانێ دهاتنە خوارێ و نهێنییێن وان ئاشکەرا دکرن، و جبریلی ب رێکا وەحییێ ناڤێن وان بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- ئاشکەرا دکرن، و بەری پێغەمبەر -سلاڤ لی بن- بمرت وی ناڤێن وان هەمییان بۆ صەحابییێ خۆ (حوذەیفەیێ کورێ یەمانی) گۆتبوون، وەکی دێ پاشی بەحس ژێ کەین، ئەگەر خودێ حەز بکەت.

ئێک ژ وان کارێن منافقان کرین بەری پێغەمبەر -سلاڤ لی بن- دەرکەفتە تەبووکی، ئەو بوو وان ل قوبائێ مزگەفتەک ئاڤاکر، جودا ژ مزگەفتا قوبائێ ئەوا پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- ئاڤاکری و موسلمان بۆ نڤێژان لێ کۆم دبوون، و ئارمانجا وان ئەوە ئەو ب ڤی کارێ خۆ دوبەرەکییێ بێخنە رێزا موسلمانان، و هەر جار ل ڤی جهی یێ وان ناڤێ مزگەفتێ ل سەر دانای کۆم ببن، و پیلانێن خۆ دژی موسلمانان بگێڕن، و وان مزگەفت هلبژارت؛ دا کەس چو شک و گومانان ژێ نەبت.

و ل دۆر ئەگەرا ئاڤاکرنا ڤێ مزگەفتێ هندەک ریوایەت هەنە کو ئەبوو عامرێ راهب ژ وەلاتێ شامێ کاغەزەک بۆ هندەک هەڤالێن خۆ ژ منافقان هنارتبوو و تێدا گۆتبوویێ: ئەز دێ هیرەقلێ رۆمێ قانع کەم کو لەشکەرەکی بدەتە د گەل من دا هێرشێ بدەینە سەر مەدینێ و موسلمانان ژ بن ببەین، ڤێجا هوین جهەکی بۆ مە بەرهەڤ بکەن دا ببتە بنگەهـ هوین لێ کۆم ببن، و هەر جار قاصدێن من بۆ هەوە بێنە وێرێ.. و پشتی وان دان و ستاندن د ناڤبەرا خۆ دا کری وان بڕیار دا وی جهی ب ناڤێ مزگەفتێ ئاڤا بکەن.

و ئەبوو عامرێ راهب، زەلامەکێ پێشکێشێ خەزرەجییان بوو، بەری هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- بۆ مەدینێ ئەو بووبوو فەلە، و ئنجیل و تەورات خواندبوو، و ژ بەر عیبادەتێ وی یێ زێدە خەلکی ناڤێ وی کربوو:

راهب، گاڤا پێغەمبەر -سلاڤ لی بن- هاتییە مەدینێ، وی ب ئاشکەرایی نەیارەتییا ئیسلامێ کر، و گاڤا موسلمان ل بەدرێ ب سەرکەفتین، ژ کەرب و کینێن خۆ دا وی تەحەممول نەکر بمینتە ل مەدینێ، لەوا ئەو چوو مەکەهێ، و دەمێ موسلمانان مەکەهـ ستاندی، ئەو رەڤی چوو طائیفێ، پاشی ژ وێرێ ژی چوو وەلاتێ شامێ، و ما ل وێرێ حەتا مری.

و ئەگەر ئەو ریوایەت یا دورست بت یا کو دبێژت: وی کاغەزەک بۆ منافقان هنارتبوو و تێدا داخواز ژێ کربوو کو ئەو جهەکی وەک مەلبەند و بنگەهـ بۆ خۆ بەرهەڤ بکەن، ئەو دێ هنگی بت دەمێ عەرەبێن شامێ یێن فەلە گەف ل موسلمانان دکرن، و هەسپێن خۆ نال دکرن؛ دا هێرشێ بدەنە سەر دەڤەرا وان، و ئاشکەرایە کو وان ئەڤ چەندە دکر ب پشتگەرمییا رۆمێ، بەلێ قەیصەرێ رۆمێ مرادا وان حاصل نەکر، بەلکی بەروڤاژی وێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- هێرش کرە توخوبێن شامێ و چەنگێن وان قوصاندن، وەکی مە بەحس ژێ کری.

هەر چاوا بت دەمێ منافقان مزگەفتا خۆ ئاڤاکری، هندەک ژ وان هاتنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- ل مەدینێ، و گۆتنێ: مالێن مە ل قوبائێ یێن زێدەبووین، و مزگەفتا مە تێرا مە ناکەت، و یا دویرە ژ مە، و گەلەک مرۆڤێن بێچارە و نساخ هەنە نەشێن بچنە وێ مزگەفتێ، لەو مە بریار دا ئەم مزگەفتەکا دی ژی ئاڤا کەین، و دا کو مزگەفتا مە ژی ب بەرەکەت بکەڤت، ئەم حەز دکەین تو بێی نڤێژەکێ ل مزگەفتا مە بکەی.

هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- خۆ بۆ غەزایا تەبووکێ بەرهەڤ دکر، لەو وی گۆتە وان: ئەم یێن ل سەر سەفەرێ، نوکە ئەز نەشێم بێمە نک هەوە، جارێ بلا بمینت حەتا دزڤرین ئەگەر خودێ حەز بکەت.

و پشتی ئەو ژ تەبووکێ زڤڕی و هێشتا ب رێ ڤە هندەک ئایەتێن سوورەتا (التوبة) بۆ وی هاتنە خوارێ، بەحسێ ڤێ مزگەفتێ کرن یا منافقان ئاڤا کری، و تێدا هات: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًۢا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٩﴾ لَا يَزَالُ بُنْيَٰنُهُمُ ٱلَّذِى بَنَوْاْ رِيبَةً فِى قُلُوبِهِمْ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١١٠﴾ ﴾.

ب ڤێ چەندێ خودێ نهێنییا دلێن وان منافقان بۆ پێغەمبەرێ خۆ ئاشکەرا کر، و بۆ وی دیار کر کو ئارمانجا وان ژێکڤەکرنا رێزا موسلمانانە، و پشتەڤانییە بۆ وی یێ نەیارەتییا خودێ و پێغەمبەرێ وی دکەت.. ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- هێشتا ب رێ ڤە و بەری بگەهتە مەدینێ هندەک صەحابی هنارتن دا وێ مزگەفتێ خراب بکەن.

و هندەک زانا ل وێ باوەرێنە کو هەما ئەڤ مزگەفتە ب خۆ ب ئەمرێ خودێ هەرفی، و موسلمان ژ خرابییا وێ رحەت بوون!

### هاتنا شاندێ ئەڤەفییان بۆ مەدینێ:

ل دەسپێکا سەرهاتییێن ڤێ سالێ مە گۆتبوو کو ئێک ژ گرنگترین سەرهاتییێن سالا نەهێ ژ مشەختێ هاتنا گەلەک وەفدێن عەرەبان بوو بۆ نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ هەمی لایێن وەلاتێ عەرەبان، ژ شامێ حەتا یەمەنێ، و ژ بەحرەینێ حەتا دەریا قولزەمێ، و هەما بسە بێژین کو ئبن سەعد د کتێبا خۆ (الطبقات الکبری) دا ناڤێ پتر ژ حەفتێ وەفدان دئینت، یێن کو هاتینە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و موسلمانبوونا خۆ

ڕاگەهاندی، هەر وەکی عەرەبان خۆ لێ دگرت کانێ دووماهییا هەڤڕکییێ د ناڤبەرا وی و ئویجاخا وی دا دێ گەهتە چ سەری، ڤێجا پشتی وان دیتی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب سەر قورەیشییان کەفت، و مەکەهـ ژ صەنەمپەرێسییێ ڕزگار کر، وان دەست پێ کر و وەفد ل دویڤ وەفدێ قەستا مەدینێ کر، دا وەلاتا خۆ بۆ دەولەتا ئیسلامێ ڕاگەهینن، هەر وەسا خۆڕاگرتن یان سەرکەفتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سەر گەف و گوڕێن ڕۆمێ و پشتەڤانێن وان ژ عەرەبێن شامێ، پالدەرەکێ دی یێ ب هێز بوو ئەو بۆ ڤێ چەندێ پالداین.

ل ڤێرێ ب تنێ ئەم دێ ئیشارەتێ دەینە شاندێ ئویجاخا ثەقەفییان ئەوێ ل هەیڤا .ڕەمەزانێ ژ طائیفێ هاتی، و دڤێت ژ بیر نەکەین کو ثەقەفی ئویجاخا ئێکانە بوو ل دەور و بەرێن مەکەهێ ماین و موسلمان نەبووین، و بەری نوکە د سەرهاتییێن سالا هەشتێ دا مە بەحسێ حیصارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ حصنێ وان کربوو، و مە گۆتبوو: دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دای حیصارێ ڤەکەت، و ژ طائیفێ بزڤڕن، هندەک صەحابییان داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کو ئەو نفرینەکێ ل وان بکەت، بەلێ وی ب یا وان نەکر، بەلکی دوعایەک بۆ وان کر کو خودێ هیدایەتێ ب ڕزقێ وان بکەت و ئەو بێن موسلمان ببنن.. و پشتی نێزیکی دەهـ هەیڤان، خودێ دوعایا پێغەمبەرێ خۆ ب جهئینا و ثەقەفییان بڕیار دا شاندەکی ژ خۆ بهنێرنە مەدینێ ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و دەمێ شاند گەهشتییە دۆرێن مەدینێ و صەحابی پێ حسیاین، هەر ئێک ژ وان بەری یێ دی ڕاکر دا زویتر مزگینییێ بدەتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ئەبوو بەکر بوو یێ مزگینی گەهاندییێ. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخواز ژ صەحابییان کر کو ئەو هندەک خیڤەتان بۆ ئەندامێن شاندێ ثەقەفییان

ب رەخ مزگەفتێ ڤە ڤەدەن؛ دا وان گوهـ ل دەنگێ قورئانێ ببت، و ئەو موسلمانان ببینن دەمێ ئەو نڤێژان دکەن.. و پشتی پازدە رۆژان ژ مانا وان ل مەدینێ وان بڕیار دا موسلمان ببن، و ب ڤی رەنگی طائیف ژی بوو پارچەیەک ژ وەلاتێ ئیسلامێ، و ل وی جهێ صەنەمێ وان لێ ب فەرمانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگەفتەک هاتە ئاڤاکرن.

## مرنا سەرۆکێ منافقان:

ل دووماهییا هەیڤا شەووالێ ژ سالا نەهێ سەرۆکێ منافقان عەبدللاهێ کورێ ئوبەیێ کورێ سەلوولی، ئەوێ پتر ژ جارەکێ بەحسێ وی د سەرهاتییێن سیرەتێ دا د گەل مە بۆری کەفتە بەر نساخییا مرنێ، و نساخییا وی چەند رۆژەکان ڤەکێشا، و ل هەیڤا ذولقەعدە ئەو مر.

و دەمێ ئەو مری کورێ وی عەبدللاهـ، و ئەو ئێک ژ باشترین صەحابییێن ئەنصاری بوو، هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و داخواز ژێ کر ئەو کراسەکێ خۆ بدەتێ دا بابێ خۆ پێ کفن کەت، هەر وەسا داخواز ژێ کر ئەو بێت و نڤێژێ ل سەر بکەت. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەردو داخوازێن وی بۆ ب جهئینان، و گاڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ڕابووی دا نڤێژێ ل سەر بکەت، عومەری کراسێ وی گرت، و گۆتێ: چاوا تو دێ نڤێژێ ل سەر وی کەی و ئەو منافق بوو؟ ما خودایێ تە تو ژ ڤێ چەندێ نەدایە پاش؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: خودایێ من هلبژارتن یا دایە.. و پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نڤێژ ل سەر کری، ژ نوی ئەڤ ئایەتا سوورەتا (التوبة) هاتە خوارێ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾ یەعنی: تو -ئەی پێغەمبەر- چو جاران نڤێژێ ل سەر ئێکی ژ دوڕوییان نەکە ئەگەر ئەو مر، و

ل سەر گۆڕا وی ڕانەوەستە دوعا بۆ بکەی؛ چونکی وان کوفر ب خودێ و پێغەمبەرێ وی کر و ئەو مرن و ئەو دسەرداچووی.

و ئەڤە دەلیلە کو چێ نابت مرۆڤ دوعایێ بۆ کافری یان منافقێ کو نیفاقا وی ئاشکەرا بت، بکەت، یا نڤێژێ ل سەر وان بکەت.

## ئەبوو بەکر ئەمیرێ حەجێ:

دەمێ مەوسمێ حەجێ ژ سالا نەهێ هاتی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەبوو بەکر کرە ئەمیرێ حەجێ، و هنارتە مەکەهێ، و د ریوایەتەکێ دا هاتییە سێسەد صەحابی د گەل ئەبوو بەکری ژ مەدینێ دەرکەفتن، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل ئەبوو بەکری کر کو ئەو د ناڤ حەجییان دا ڕاگەهینت کو پشتی ئەڤ سالە چێ نابت مرۆڤەکێ موشرک حەجێ بکەت، و چێ نابت کەس بێ جلک طەوافێ بکەت. و ئاشکەرایە کو وێ سالێ موسلمان و کافر پێکڤە چووبوونە حەجێ.

هندەک کافر هەبوون بەری هنگی پەیمان د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گرێدابوون، ل وی دەمی، و پشتی دەرکەفتنا ئەبوو بەکری و هەڤالێن وی بۆ مەکەهێ، دەسپێکا سوورەتا (التوبة) بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتە خوارێ، و تێدا هات کو هەر پەیمانەکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل کافران هەی پشتی چار هەیڤێن دی نامینت، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی ب دویڤ ئەبوو بەکری دا هنارت، و گۆتێ: ڤان ئایەتان د ناڤ حەجییان دا بخوینە، دا هەر ئێک ڤی حوکمی بزانت.

دەمێ عەلی ب ڕێ ڤە گەهشتییە ئەبوو بەکری، ئەبوو بەکری گۆتێ: تو هاتی ئەمیر یان مەئموور؟ وی گۆت: نەخێر، ئەز مەئموورم و هەر تو ئەمیری.

**مرنا (أم كلثوم)ﷺ كچا پێغەمبەرﷺ:**

ژ وان سەرهاتیێن پەیوەندی ب مالا پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- هەین مرنا کچا وی (أم کلثوم)ێ بوو، و ئەو سێیەمین کچا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- د ژیانا وی دا مری، پشتی روقەییایێ ل سالا دویێ، و زەینەبێ ل سالا هەشتێ، و ئاشکەرایە کو پشتی مرنا روقەییایێ و ئەو ژنکا عوثمانێ کورێ عەففانی بوو، خویشکا وێ (ئوم کولثوومێ) شوی ب عوثمانی کربوو.. و ل سالا نەهێ ئەو ژی ل مەدینێ مر، و ل بەقیعێ هاتە ڤەشارتن، و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو مرنا وێ ل هەیڤا شەعبانێ بوو، بەلێ ئەڤ گۆتنە ئالۆزییەکێ پەیدا دکەت، چونکی ل هەیڤا شەعبانێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مەدینێ نەبوو، و دەرکەفتبوو غەزایا تەبووکێ، و د ریوایەتێن دورست دا هاتییە کو ل دەمێ مرنا (ئوم کولثوومێ) پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ حازر بوو.

## سەرهاتییێن
## سالا دەهێ مشەختی

ل سالا دەهێ مشەختی کاروان هێدی هێدی بەر ب دووماهییێ ڤە دچوو، و دەمێ خاترخواستنێ نێزیک دبوو.. د ڤێ سالێ هەمییێ حەتا هەیڤا یازدێ ژی بەر ب دووماهییێ ڤە چووی، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مەدینێ یێ ئاکنجی بوو، چو سەرهاتییێن وەسا ڕوی نەدابوون کو پێتڤی ب دەرکەفتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەبت ژ مەدینێ، بەلکی مانا وی ل مەدینێ هەر ژ پشتی زڤڕینا وی ژ تەبووکێ (ل ڕەمەزانا سالا نەهێ) و حەتا چوونا وی بۆ حەجێ (ل دووماهییا هەیڤا ذولقەعدە ژ سالا دەهێ) مفایەکێ مەزن تێدا هەبوو؛ چونکی وی خۆ بۆ پێشوازییا وەفدێن عەرەبان بەطال کربوو، ئەوێن ئێک ل دویڤ ئێکێ دهاتنە مەدینێ، دا موسلمان ببن، یان ژی هەر چو نەبت صولحێ د گەل وی بکەن، و ژ بلی ڤێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هژمارەکا صەحابییێن خۆ یێن زانا ب دینی و زیرەک بۆ ب ڕێڤەبرن و سەرۆکاتییێ هنارتنە دەڤەرێن جودا جودا؛ دا دینی نیشا خەلکی بدەن، و کار و بارێن وان یێن ئیداری ب ڕێڤە ببەن، و وان ب سەنتەرێ دەولەتێ ڤە کو مەدینەیە گرێدەن، و د ڤی دەمێ کێم دا پێشکەفتنێن مەزن پەیدابوون، هەر وەسا گوهۆڕینێن مەزن ژی ل سەر نەخشەیا سیاسی یا دەڤەرێ چێبوون، و موسلمان ئێدی بوونە هێزەکا وەسا هزر بۆ بێتەکرن حەتا ژ لایێ کیسرا و قەیصەری ڤە.

## سەرییا خالدێ كورێ وەلیدی بۆ نەجرانێ:

ژ بلی پێشوازییا وان شاندێن عەرەبان یێن ل ڤی دەمی دهاتنە مەدینێ، و هنارتنا هندەک صەحابییان دا دینی نیشا خەلکی بدەن، ل ڤی دەمی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هندەک سەرییێن لەشکەری ژی دهنارتنە هندەک دەڤەران؛ دا ئەو داخوازێ ژ خەلکێ وان جهان بکەن کو بێنە د ئیسلامێ دا، و ئێک ژ وان سەرییێن لەشکەری ئەو سەرییە بوو یا وی ل هەیڤا رەبیعولئەووەلێ ب لایێ نەجرانێ ڤە هنارتی و مەزنێ وێ خالدێ کورێ وەلیدی بوو، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە خالدی شەرێ وان نەکە حەتا سێ جاران تو داخوازێ ژ وان بکەی کو ئەو موسلمان ببن، ئەگەر ل بەر نەهاتن ژ نوی شەرێ وان بکە.. و گاڤا خالدی ئیسلام بۆ وان پێشکێش کری، ئەو هەمی پێکڤە موسلمان بوون، و خالد دەمەکی ما د ناڤ وان دا ئیسلام نیشا دا، و کاغەزەک بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارت ئەڤ چەندە تێدا بۆ وی ئاشکەرا کر، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: وەفدەکێ ژ وان د گەل خۆ بینە و وەرە مەدینێ.

## سەرییا عەلییێ كورێ ئەبوو طالبی بۆ هەمدانێ:

هەمدان، ئێک ژ وان ئویجاخێن عەرەبان بوو یێن ل لایێ یەمەنێ دژیان، د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئێکەمین جار خالد هنارتبوو ڤێ دەڤەرێ دا بەرێ خەلکی بدەتە ئیسلامێ، بەلێ ئەو نەشیا ڤێ چەندێ بکەت، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرییا وی ب ئێکا دی گوهارت، و مەزنێ وێ کرە عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی، و دبێژن: د رۆژەکێ دا ئەو ئویجاخ هەمی ل سەر دەستێ عەلی موسلمان بوو، و دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب وێ چەندێ زانی ژ کەیفا دا سوجدا شوکرێ بۆ خودێ بر.

و پشتـی عەلی زڤـڕییـە ڤە ب دەمەکی پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- ل هـەیڤا ڕەمـەزانێ جارەکـا دی ئـەو د گـەل سێسـەد مرۆڤـان هنارتـە دەڤـەرا (مەذحەج) ل یەمـەنێ، و پشـتی چەنـد شەڕەکـێـن سڤـک د نـاڤـبـەرا وان دا پەیدابووین، ئـەو هـەمی پێکڤـە موسلمان بـوون، و عـەلی ژ هـەیڤا ڕەمـەزانێ حەتا دەسپێکا هەیڤا ذولحججە ما ل وێرێ ئیسلام نیشـا وان دا، پاشـی ئـەو زڤـڕی ڤـە و ل مەکەهێ گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ کرنـا حـەجێ د گەل وی، وەکی دێ پاشی بەحس ژێ کەین، ئەگەر خودێ حەز بکەت.

# دەمێ خاترخواستنێ

و... دەم هات رێ بۆ خاترخواستنێ بێتەڤەکرن!

و ما تشتەک د ڤێ ژیانێ دا هەیە ژ خاترخواستنێ نەخۆشتر بت؟

خاترخواستن خۆ ئەگەر بۆ دەمەکێ دەسنیشانکری ژی بت، ئەو ل سەر دلی هند یا نەخۆشە، دێ بێژی چیایەکە ب سەر دا هاتی، و بێن لێ چککری، ڤێجا پا هوین چ دبێژن ئەگەر ئەو خاترخواستن بۆ وەغەرا دووماهییێ بت؟

دەمێ مرۆڤ هزرێن خۆ د وان هەمی نەخۆشییان دا دکەت ئەوێن د دنیایێ دا دکەڤنە سەر رێکێ و دلی دگڤێشتن، مرۆڤ دبینت هەر ئێک ژ وان هندەک ژ ژەهرا خاترخواستن و دویرکەفتنێ تێدا هەیە.. بەلێ یا خاترخواستنێ.. فەقیری رەنگەکێ خاترخواستنا زەنگینییێیە، و خەریبی رەنگەکێ خاترخواستنێیە ژ وەلاتی، نساخی خاترخواستنا ساخی و سلامەتیییێیە، و مرن خاترخواستنا ژیانێیە.. و هۆسا، هەر نەخۆشییەکا تو هزرا خۆ تێدا بکەی دێ بینی ئەو ژ خاترخواستنێ یا بێ بار نینە.

بەلێ ئەم چ بکەین و ئەڤە رێبازا چەرخا فەلەکێیە د ڤێ دنیایێ دا:

مهرا فەلەکێ ئەزەل عەدیمە ... کینا فەلەکێ ئەبەد قەدیمە

هەرچی وەکوو ئەو ژ عەردێ راکەت ... ئەلبەتتە وی دێ د عەردێ را کەت

عولوی ژ خوە را عەیان دخوازت ... سوفلی ژ مە را نهان دخوازت

نابینی هەرۆ کو ئافتابێ ... داڤێتە مەغارەیا توورابێ

ئەوێ رۆژا گەشا بلند ل نیڤا عەسمانی هوین دبینن؟ ئەو رۆژا ژ بەر بلندییا وێ کەس نەشێت بگەهتێ، و ژ بەر تێنا وێ کەس نەشێت تێر بەرێ

خۆ بدەتن، دەمەک ب سەر دا دئێت، زەراتییا مرنێ ب لێڤان دا دئێتەخوار، و هێدی هێدی بەر ب ئاخێ ڤە دچت و ل بەر چاڤان د تۆزێ وەردبت!

چەند مرۆڤ هەوە دیتینە دەمێ ل سەر عەردی دچن دێ بێژی یێ منەتەکێ ل عەردی دکەن، و عەرد بێنا خۆ لێ فرەهـ دکەت، حەتا ئەگەر رۆژا وان هات دێ بینی ئەو ژ بلندییێ کەفتن، و د وی عەرد دا یێ وان خۆ ل سەر مەزن دکر پەڕاسییێن وان دناڤێک هلبوون، و مەزنییا وان د ئاخێ وەربوو، دێ بێژی رۆژەکێ وان دفنا خۆ بلند نەکربوو؟!

بەلێ.. خاترخواستن، ئەو دەلیڤەیا گرانە یا گەلەک دلێن مەزن خۆ ل بەر نەگرتی، گەلەک چاڤێن قائیم و بەخیل د باراندنا رۆندکان دا های ژ خۆ نەمای، و ژ بەر دربێ دژوارێ خاترخواستنێ رۆندک ب مەردینی باراندین، ئەو دربێ مەعنایا جودابوونێ ددەت، نە جودابوونا د ناڤبەر دو خۆشتڤییان دا، نە.. بەلێ جودابوونا د ناڤبەرا رحێ و لەشی دا ل نک ئێک کەسی، و ئەگەر چاڤ بۆ جودابوونا رحێ ژ لەشی رۆندکان نەبارینن، پا چاڤ بۆ چنە؟

مَنْ لَمْ يَبِتْ وَالبَيْنُ يَصْدَعُ قَلْبَهُ     لَمْ يَدْرِ كَيْفَ تَفَتُّتُ الأكبادِ

ب تنێ مێلاک ب تشتەکی پرتپرت دبن، دەمێ خودان ئێڤاری سەرێ خۆ ددانتە سەر بالیفکێ و ئەو یێ دویر ژ وان جهێن خۆشتڤی لێ.. هۆسا شاعرەکێ کەڤن مەسەلە ددیت!

و گەلەک جاران ترسا ژ نەخۆشییا خاترخواستنێ هێرشا خۆ یا دژوار دکەتە سەر دلی و وی دئێخت، بەری دەمێ خاترخواستنێ یان جودابوون و ژێک دویرکەفتنێ ب خۆ ب سەر خودانی دا بێت، و بەلکی یێ ژ هەمییان

دورستتر حالێ دلـی د ڤـی ڕەنگـە دەمـی دا بـۆ مـە وێنـەکری سەرکێشـێ ئەڤینداران و دینێ لەیلایێ قەیسێ عامری بت دەمێ دبێژت:

كـأنَّ القَلـبَ ليْلَـةَ قيـلَ يُغْـدَى    بِلَيـلَى العامرِيَّـةِ أوْ يُـراحُ
قَطـاةٌ غَرَّهـا شَرَكٌ فَباتَـتْ    تُعالِجـهُ وَقَـدْ عَلِـقَ الجنـاحُ

بەری جودابوون دریێ خۆ بدانت، و خاترخواستن بێتـەکرن، ل وێ شـەڤا هاتییە گۆتن: سوباهی سپێدێ یان ئێڤاری لەیلا دێ ئێتەبرن، قەیس دبێژت: ئەز پێ حسیبام هەر وەکی دلێ من ئەو طەیرە یێ داڤا طـەلهێ ئەو ب نـک خۆ ڤە خراندی و لێ هاتییە ئێک، ڤێجا چەنگەکێ وی کەفتییـە طـەلهێ و شکەستی، و چەنگێ دی مایە بەردای، ڤێجا هندی ئەو پرپرێ پێ دکەت دا خۆ ژ طەلهێ خلاص کەت و بفرت.. فایدە ناکەت!!

(خۆشتڤی) ڕۆژەکێ هەڤالەکێ خۆ دیت، ڕەنگێ وی یێ زەربووی، دێ بێژی ئێشـەکا گران یـا ب سـەر دا هـاتی، و دیـارە ئەڤـە هنگـی بـوو دەمـێ صـەحابییان هسـت دکـر کـو کـاروان یـێ بـەر ب دوومـاهییێ ڤـە دچـت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پسیارا حالێ وی کر و کانێ بۆچی ڕەنگێ وی هاتییـە گوهـارتن، وی گـۆت: ئـەی پێغـەمبـەرێ خودێ، مـن هزرا خۆ د ڕۆژا قیامەتێ دا کر، دەمـێ ئـەم دچینـە بەحەشـتێ و هـوین پێغـەمبـەر دچنـە جهێن بلندتر ژ یێن مە، و ئـەز نەشێم تـە ببینم، ڤێجا ژ خـەمان دا ئـەزێ هۆ لـێ هاتیم! هێشتا خـۆشـتـڤـیـێ وی ل نک وی، و بـەری وەغـەرێ بکـەت، دلـی ژ ترسێن جودابوونێ دا لـەش وەکـی بیهـەکا زەر یـێ لـێ کـری.. ئەڤـە حـالێ دلییە هێشتا دەمێ خاترخواستنێ نەهاتی، پا ئەگەر ئەو دەم هات حالێ وی دێ چ بت؟

و.. دەم هات ڕۆژ ئاڤابیت پشتی دنیایا مە تژی ڕۆناهی و بەرەکەت و خۆشی کری، و ئەڤـە ئـەو قـەدەرە یـا د ئـەزەل دا بـۆ ڕۆژێ هاتییـە نڤیسـین،

ڕۆناهی و تێنێ بدەتە ژیانێ و بار بکەت و بچت. و دەم هات کاروانی بارێ خۆ گرێدەت، و ل وێ ڕێکێ بچت یا قەدەرێ وەسا ڤیای کو ژ دەمێ ئادەمی وەرە ژیان د ڤێ دنیایا مە دا ل سەر ب دووماهی بێت، یان بلا بێژین: ئەوا دەست پێ دکەت. و ژیانێ ئەم فێری هندێ کرینە کو هەر تشتەکێ بەراهی بۆ هەبت، هەر چاوا بت دووماهی ژی دێ بۆ هەبت، و بۆ چو کەس و چو تشتان نینە کو ژ بن ڤی قاعیدەیی دەرکەڤن، ئەگەر خۆ ئەو کەس (خۆشتڤییێ خودێ) ژی بت!

بەلکی ب خەمترین ڕویدان د ژیاننامەیا پێغەمبەرێ خودێ دا -سلاڤ لێ بن- هەی ڕویدانا خاترخواستن و وەغەرکرنا وی بت ژ ڤێ دنیایێ، ژ بەر کارێ مەزنێ وێ ل جڤاکا موسلمانان و دەور و بەران ژی کری، حەتا عائیشا -خودێ ژێ رازی بت- کو ئێک ژ خەلکێ وێ جڤاکێ بوو دبێژت: **((عەرەب ل کوفرا خۆ زڤڕین، و جوهی و فەلان ستوێ خۆ درێژکر، و منافق خورت بوون، و موسلمان وەکی وی کەرێ پەزی لێ هاتن یێ ل شەڤەکا زڤستانێ یا تاری باران لێ هاتی، و بێ شڤان مایە ل جهەکێ تژی گورگ))**. ڤێجا هزر بکەن حالێ وان دێ یێ چاوا بت؟

## بەری حەجا خاترخوستنێ

بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل دووماهییا سالا دەهێ قەستا مەکەهێ بکەت بۆ ب کرنا حەجا خواترخواستنێ -وەکی دئێتە ب ناڤکرن-، نیشانێن خاترخواستنێ هێدی هێدی بۆ وی و ئەو کەسێن ل دەور و بەرێن وی ژی ئاشکەرا دبوون.. و دەسپێکا ڤان نیشانان ل هەیڤا رەمەزانێ بوو ژ سالا دەهێ.

### ل هەیڤا رەمەزانێ:

بەلێ.. ل هەیڤا رەمەزانێ جبریلی ئیشارەت و نیشانەکا ئاشکەرا دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو وەغەرکرنا وی یا نێزیکبووی، بەلێ ئەو نیشانەکا ئاشکەرا بوو بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب تنێ، و کەسێ ژ وی پێڤەتر تێ نەئینادەر، و وی ژی ژ لایێ خۆ ڤە ئەو بۆ کەسێ نەگۆت، حەتا پشتی هنگی ب نێزیکی شەش هەیڤان، دەمێ ئەو نساخبووی، دەمێ ئەو کەفتییە بەر وێ نساخییێ یا وی تێدا وەغەرکری، ژ نوی وی ئەو بۆ کچا خۆ فاطمایێ گۆت؛ دا (تەئسیرا صەدمێ) ل سەر وێ سڤک بکەت دەمێ دئێت!

دەیکا موسلمانان عائیشا دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ نساخ، ئەم ژنکێن وی هەمی ل نک بووین، مە دیت فاطما هات، دا بێژی رێڤەچوونا پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن-، گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو دیتی کەیفا خۆ پێ ئینا و گۆت: کچا من، تو ب خێر هاتی، پاشی داخواز ژێ کر ئەو ل بەر تەنشتا وی روینت، گاڤا ئەو روینشتییە ب رەخ وی ڤە، وی هێدی تشتەک بۆ گۆت، وێ گەلەک کرە گری، و گاڤا پێغەمبەری

-سلاڤ لێ بن- ئەڤ چەندە ژ وێ دیتی، جارەکا دی تشتەک هێدی بۆ گۆت، وێ کرە کەنی.

عائیشا دبێژت: مـن گـۆتـێ: ژ ناڤبەرا هەمی ژنکێن خۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نهێنییا خۆ بۆ تە گۆت، و تو دکەیە گری؟ پاشی پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- رابووی و دەرکەفتی، و ئەڤە هنگی بوو دەمێ هێشتا ئێش گەلەک ل وی نەشدیای کو نەشێت رابتە ڤە، من گۆتە فاطمایێ: ئەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چ گۆتە تە؟ وێ گۆت: ئەز نهێنییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا ناکەم.. یەعنی: مادەم وی ب دەنگەکێ وەسا نەگۆت هەوە گوهـ لێ ببت، ئەز وێ نابێژم.

عائیشا دبێژت: پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مری من گۆتە فاطمایێ: ئەز تە ددەمە سویندێ ب وی حەقێ من ل سەر تە هەی کو تو بۆ من بێژی کانێ هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چ گۆتە تە. وێ گۆت: ڤێ گاڤێ بلا، ئەز دێ بێژم، جارا ئێکێ دەمێ ئەو هێدی د گەل من ئاخفتی، وی گۆت: جبریلی هەر سال جارەکێ (یەعنی: ل هەیڤێن رەمەزانێ وەکی ژ هندەک ریوایەتێن دی ئاشکەرا دبت) قورئان هەمی د گەل من دخواند، بەلێ ڤێ جارێ وی دو جاران ئەو د گەل من خواند، و ئەز دبێژم ئەڤە ژ بەر هندێیە چونکی ئەجەلێ من یێ نێزیکبووی، ڤێجا تەقوایا خودێ بکە و صەبرێ بکێشە، چونکی ئەز باشترین پێشیمە بۆ تە. هنگی من ئەو گری کر یا تە دیتی، و گاڤا وی ئەز وەسا دیتیم، جارا دویێ هێدی گۆتە من: ئەی فاطما ما تە نەڤێت تو سەروەرا ژنێن خودان باوەر بی؟ ڤێجا من ئەو کەنی کر یا تە دیتی.

ئەبوو هورەیرە دبێژت: هەر سال دەهـ رۆژان ژ هەیڤا رەمەزانێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئعتیکاف ل مزگەفتێ دکر، و ئەو سالا ئەو تێدا

مری، وی بیست ڕۆژان ئعتیکاف کر. و هندەک زانا -وەکی ئبن حەجەر ژێ ڤەگوهێزت- دگۆتن: ئەڤە ژ بەر هندێ بوو چونکی دەمێ جبریلی دو جاران قورئان د گەل وی دوبارەکری، وی تێ ئینادەر کو هەر وەکی ئەڤە ئیشارەتەکە ژ جبریلی کو ئەجەلا وی یا نێزیکبووی، لەو وی بیست ڕۆژان ئعتکاف کر، دا ئەو بۆ ئوممەتا خۆ بکەتە سوننەت کو دەمێ مرۆڤ ب ناڤ سال ڤە دچت، و نێزیکی مرنێ دبت دڤێت ئەو کارێ خۆ یێ باش زێدەتر لێ بکەت.

و د ریوایەتێن دورست دا هاتییە کو هەر سال وی ل دەهێن دوومـاهییێ ژ رەمەزانێ ئعتیکاف ل مـزگـەفـتـێ دکـر، بـەلێ ل سـالا دووماهییێ وی ل دەهێن ناڤێ و یێن دووماهییێ ئعتیکاف کر، و دەمێ وی ئعتیکاف دکر، تەختەک بۆ وی ددانا مزگەفتێ ئەو ل سەر دنڤست و بێنا خۆ ڤـەددا، و جهـێ دانانـا تـەختێ وی ل مزگـەفتێ حـەتا نوکـە ژێ یـێ مەعلوومـە، چـونکی صەحابییان گـرنـگـی ددا وێ چـەنـدێ، و وان دگۆتـە وێ ستوینێ یـا تـەخت ل نک دهاتەدانان: ستوینا تەختی، و ئەو ستوین نوکە د کەفتە د ڕەوضـێ دا د پێشــییا وی دیـواری ڕا یـێ دکەفتــە د ناڤبـەرا مــەزەلکا عائیشــایێ و مزگەفتێ دا، یەعنی: ئەگەر مـرۆڤ ل رەوضـێ د ناڤبـەرا حوجرێ و میحرابێ دا ڕاوەستت و بەرێ خۆ بدەتە قیبلێ، ئـەو سـتوین دێ بتـە دووماهی ستوین مـرۆڤ ل سـەر دەسـتێ خـۆ یـێ چـەپێ دبینـت. و ل ڤـی جهـی ئیمـام مالـک دڕوینشت و دەرسا خۆ دگۆت.

ژ ئەڤا بۆری بۆ مە ئاشکەرا دبت کـو ل هـەیڤا رەمـەزانێ ژ سـالا دەهـێ مشەختی، و بەری وەغەرکرنا پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- ب نێزیکـی شـەش هەیڤان ئیشارەتەکا وەسـا بـۆ پێغەمبـەری -سلاڤ لـی بـن- هاتـەدان کـو هنـدە وەغەرا وی یا نێزیک بووی، بەلێ وە نەبت بێتە هزرکرن کـو وی دزانـی کـانێ

ئەو ب دورستی کەنگی دێ مرت؛ چونکی ئەڤە تشتەکە خودێ ب تنێ دزانت.

### هنارتنا موعاذی کوڕێ جەبەلی بۆ یەمەنێ:

د ڤێ سەرهاتییێ دا، و بۆ جارا ئێکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ڕەنگەکێ ئاشکەرا بۆ کەسەکی ژ صەحابییێن خۆ ئاشکەرا کر کو هند ئەجەلێ وی نەمایە کو ئەڤ صەحابییە جارەکا دی وی ببینتە ڤە!

ل دۆر دەمێ هنارتنا موعاذی ژ لایێ پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- بۆ وەلاتێ یەمەنێ؛ دا دینی نیشا وان بدەت، و حوکمی د ناڤبەرا وان دا بکەت، هەمی زانایێن سیرەتێ دبێژن: ئەو ل سالا دەهێ بوو، بەلێ ئەو دیرۆکێ ب دورستی و تمامی ئاشکەرا ناکەن، کانێ ل چ هەیڤێ بوو، و هندەک ژ وان ب تنێ دبێژن: بەری حەجا خاترخواستنێ بوو، و ئاشکەرایە کو دەرکەفتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ حەجا خاترخواستنێ ل دووماهییا هەیڤا یازدێ بوو، مەعنا: دبت هنارتنا موعاذی ل هەیڤا دەهێ یان یازدێ بت.. و هەر چاوا بت، هزرا مە پتر بۆ هندێ دچت کو ئەو پشتی هەیڤا رەمەزانێ بت، و ئەو ئیشارەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ڤێ سەرهاتییێ دا دایە مرنا خۆ، بەلکی وی ژ نیشانا هەیڤا رەمەزانێ وەرگرت بت!

ئیمام ئەحمەد ژ موعاذی ڤەدگوهێزت کو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو هنارتییە یەمەنێ، ئەو د گەل وی دەرکەفتە ژ دەرڤەی باژێری، موعاذ یێ سویار بوو، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب ڕەخ وی ڤە یێ ژ پێیان ڤە بوو، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-شیرەت ل وی دکرن، پاشی پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ شیرەتێن خۆ خلاص بووی، گۆتێ: ئەی موعاذ! بەلکی پشتی ئەڤێ سالا مە تو من نەبینییە ڤە، بەلکی تو بێی د بەر ڤێ مزگەفتا من ڕا دەرباس ببی، و د بەر قەبرێ من ڕا.

گاڤا موعاذی ئەڤ گۆتنە ژێ گوهـ لێ بووی، وی کرە گری، یەعنی: چ؟ ئێدی ئـەو پێغەمبەری نابینتە ڤە، و دەمێ پێغەمبەر وەغـەرێ دکـەت ئـەو ل ڤێـرێ نابـت، ئەڤـە دێ خاترخواسـتنا وان یـا دوومـاهییێ بـت؟ و گاڤـا موعـاذی کریـە گـری، پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- بـەرێ خـۆ ژێ وەرگێـڕا، بۆچی؟ بەلکی دا بشێتە خۆ و ئەو ژی نەکەتە گری، بەلکی! پاشـی وی بـەرێ خۆ ب نک مەدینێ ڤە لێدا و گۆتە موعاذی: مرۆڤێ ژ هەمییان نێزیکتـر بـۆ من ئەون یێن تەقوادار بن، کی بن و ل کیڤە بن.

و ئەڤە ڕەنگەکێ دلخۆشکرن و صەبرئینانێ بوو ژ وی بۆ موعـاذی، هـەر وەکـی وی گۆتییـە موعـاذی: ب خـەم نەکەڤـە کـو تـو دێ ژ مـن دویرکـەڤی و چییە یەمەنێ، و ب خەم نەکەڤە ژی دەمێ تو ژ یەمـەنێ دئێی و من نـەبینی؛ چونکی هەر ئێکێ تەقوادار بت، کی بت، ڕەنگێ وی یێ چاوا بت، و ل کیڤە بـت، و ل کیـژ دەمـی بـت، ئـەو هـەژی هندێیـە ل نێزیکـی مـن بـت و ئـەز مەهدەرێ بۆ بکەم.

بـەلێ ئـەی موعـاذ، ب خـەم نەکەڤـە کـو لەشـێن مـە ژێـک دیرکـەڤن، چـونکی دلـێن مـە هـەمـی گاڤـان یـێن د گـەل ئێـک، و ئـەی خـودان بـاوەرێ تەقوادار ل هەر جهەک و هەر زەمانەکێ تو لێ بی، تو ژی ب خەم نەکەڤە کـو تە ئەز نەدیتیم، و تە هەڤالینییا من نـەکری، ئـەم یـێن ئێکـین، و ئـەم هـەژی ئێکین، هندی تەقوا ئەو پەیوەندی بت یا مە دگەهینتە ئێک.

و موعاذ بەر ب یەمەنێ ڤە چوو.. و دیتنـا وی بـۆ پێغەمبـەری -سـلاڤ لێ بن- د ڤێ دنیایێ دا بوو ئەو جار؛ چونکی دەمێ ئەو زڤڕییە مـەدینێ ئـەو د بەر مزگەفتێ ڕا بۆری، و هندەکان گۆتێ: وێ هە قەبرێ خۆشتڤییە!

و ژ بلی موعاذی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەبوو مووسایێ ئەشعەری ژی هنارتە یەمەنێ، بەلێ هەر ئێک ژ وان بوو لایەکێ وەلاتی.

**مرنا ئیبراهیمی**:

ئیبراهیمێ کوڕێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ جاریا وی ماریبیایا قبطی، ئەوا مەزنێ ئەسکەندەرییێ بۆ هنارتی، و ل هەیڤا ذولحججە ژ سالا نەهێ هاتییە سەر دنیایێ، مرنا وی ل سالا دەهێ بوو، و ریوایەت ل دۆر دەسنیشانکرنا وێ هەیڤا ئەو تێدا مری دژێکجودانە، بەلێ تشتێ مسۆگەر ئەوە ل وێ ڕۆژا ئیبراهیم تێدا مری، ڕۆژ غەییری بوو، حەتا خەلکی گۆت: ڕۆژ ژ بەر مرنا ئیبراهیمی غەییری. هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب سەر مینبەرێ کەفت و گۆت: ((**هندی ڕۆژ و هەیڤن دو نیشانن ژ نیشانێن مەزنییا خودێ، ئەو نە بۆ مرنا کەسێ دغەییرن نە بۆ بوونا وی**)).

و ئەڤە هندێ دگەهینت کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گەلەک یێ حەریص بوو ل سەر هندێ کو نەهێلت هزر و بیرێن خەلەت ڕێکا خۆ بۆ دل و عەقلێ موسلمانان بکەن، و ئەگەر ئەو پێغەمبەر نەبایە و مەزنەک ژ مەزنێن دنیایێ بایە، دا خەلکی هێلت ڤی هزرێ بکەن، بەلکی ئەو دا وێ بۆ خۆ حسێب کەت ئێک ژ وان تشتێن ئەو شانازییێ پێ دبەت.

و هەر چاوا بت ژ تشتێن ئاشکەرایە د علمێ فەلەکێ دا کو زانینا غەییرنا ڕۆژێ و هەیڤێ ب سەعەت و ڕۆژ و هەیڤ و سال دئێتە زانین، و ئەو تشتەکێ (قەطعی) و بێ گومانە، و دەمێ ئەم ل وان کتێبێن فەلەکێ دزڤرین یێن بەحسێ دیرۆکا غەییرنا ڕۆژێ ل دەڤەرا حیجازێ دکەن، ئەم دبینین ئەو دبێژن: ل سالا دەهێ مشەختی، کو دکەفتە بەرانبەر سالا ٦٣٢ زایینی، ل سەعەت هەشت و نیڤی سپێدەیا ڕۆژا سێشەنبێ (٢٧) کانوونا مەزن ڕۆژ غەییری بوو، و ئەڤ ڕۆژە دکەفتە بەرانبەر (٢٩) هەیڤا شەووالێ.

و دەمێ ئیبراهیم مری وی دو سال تمام نەکربوون، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: وی ئێک د بەحەشتێ دا هەیە شیری ددەتێ. و دەمێ

ئـەو مـری پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- کـرە گـری، ئینـا ئـەبوو بـەکری یـان عومـەری گـۆتێ: تـو هـەژیتری حـەقێ خودێ مـەزن بکـەی، وی گـۆت: چـاڤ رۆندکان دبارینت، و دل ب خەم دکەڤت، و ئـەم تشـتەکی نـابێژین خودێ پـێ عێجز ببت، و ئەم ل سەر تە ب خەمین ئەی ئیبراهیم.

و ڤەشارتنا ئیبراهیمی ژی ل زیارەتێن بەقیعێ بوو ل مەدینێ.

## حەجا خاترخوستنێ[1]

ل سالا نەهێ خودایێ مەزن ئەو ئایەت بۆ پێغەمبەرێ خۆ هنارت ئەوا فەركرنا حەجێ تێدا هاتی، ئایەتا (٩٧) ژ سوورەتا (الأنعام): ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ يەعنی: خودێ ل سەر مرۆڤێ شیان هەبن ل هەچی جهێ ئەو لێ بت قەستكرنا ڤێ مالێ بۆ كرنا حەجێ فەركرییە. و هەچییێ باوەرییێ ب فەربوونا حەجێ نەئینت ئەو كافرە، و خودێ یێ دەولەمەندە چو مننەت ب وی و حەجا وی و كارێ وی نینە.

بەلێ ل وێ سالێ ئەو ب پێشوازییا شاندێن عەرەبان ڤە یێ موژیل بوو ژ لایەكی ڤە، و ژ لایەكێ دی ڤە ل وێ سالێ هێشتا موسلمانان هندەك پەیمان د گەل كافران هەبوون، و ل سەر بناخەیێ وان پەیمانان كافران حەق هەبوو بچنە مەكەهێ و ب كرنا حەجی رابن، و یا د جهێ خۆ دا نەبوو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل كافران بچتە حەجێ، لەو وێ سالی وی ئەبوو بەكر هنارت دا ببتە ئەمیرێ حەجێ، پاشی فەرمان ل وی و عەلی كر كو هەردو د ناڤ خەلكی دا ڕاگەهینن كو ژ ئەڤ سالە پێڤەتر چێ نابت چو كافر بێنە حەجێ.

---

(١) بۆ بەرهەڤكرنا ڤێ ناڤبرێ ژ كتێبا خۆ مە مفایەكێ زێدە ژ ڤێ كتێبێ دیتییە: (كأنك معه صفة حجة النبي صلى الله عليه و سلم كأنك معه) یا سەیدا (عبد الوهاب بن ناصر الطريري).

و ل سالا دی، کو سالا دەهێ بوو، هەر زوی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ناڤ خەلکی دا ڕاگەهاند کو وی ئنیەتە ئەڤ سالە بچتە حەجێ، ڤێجا هەچی کەسێ دل تێ هەبت د گەل وی دەرکەڤت بلا خۆ ئامادە بکەت.

**بەرهەڤیێن دەرکەفتنێ:**

خەبەرێ دەرکەفتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ کرنا حەجێ ل ئەڤ سالە د ناڤ هەمی موسلمانان دا بەلاڤبوو، لەو هژمارەکا مەزن ژ وان ب کەیف ڤە خۆ بۆ ڤێ سەفەرا پیرۆز ئامادە کر، و هەر زوی کارێ خۆ کر، و ئەوێن ژ دەرڤەی مەدینێ بەری وەختی هاتن و قەستا مەدینێ کرن، و بەرێ وان ما لێ کانێ کەنگی دێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بڕیارا دەرکەفتنێ دەت.

ڕۆژا ئەینییێ، (٢٤)ی هەیڤا ذولقەعدە ژ سالا دەهێ، ئەوا ل وێ سالێ دکەفتە بەرانبەر (١٠)ی هەیڤا شوباتا سالا (٦٣٢ زایینی) هات، مەدینە یا تژیبوو ژ مرۆڤان، ئەوێن ژ هەمی ڕەخان ڤە هاتین دا د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەستا مەکەهێ بکەن. نیڤرۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل مزگەفتا خۆ خوتبا ئەینییێ بۆ موسلمانان خواند، و تێدا گۆتە وان: ((گەلی مرۆڤان، خودێ حەج ل سەر هەوە یا فەرزکری، ڤێجا حەجێ بکەن)) ئەقرەعێ کوڕێ حابسی گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، هەر سال حەجێ بکەین؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خۆ بێ دەنگ کر، حەتا وی سێ جاران ئاخفتنا خۆ دوبارەکری، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ((نە، و ئەگەر ئەز بێژم: بەلێ، ئەو دێ واجب بت، و هوین نەشێن وێ چەندێ بکەن، مـن بهێلن هندی مـن هوین هێلابن، هەما ئەوێن بەری هەوە ژ بەر هندێ چوونە هیلاکێ چونکی وان گەلەک پسیار دکرن، و ب گۆتنا پێغەمبەرێن خۆ نەدکرن، ئەگەر مـن فەرمان ب تشتەکی ل هەوە کر هندی

هوين بشێن بكەن، و ئەگەر من هوين ژ تشتەكی دانە پاش، هوين خۆ ژێ بدەنە پاش، حەج جارەكە و یا زێدە بت ئەو خێرە)). و هێشتا ئەو ل سەر مینبەرێ خەلكی چەند پسیار ل دۆر كرنا حەجێ ژ وی كرن، و وی بەرسڤا وان دا.

## دەسپێكا دەركەفتنێ:

ڕۆژا د دویڤ دا، شەنبییێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا دەست ب سەفەرێ بكەت، و عەدەتێ وی هەر سەفەرەكا ئەو دەركەفتبایێ وی پشك د ناڤبەرا ژنكێن خۆ دا دهاڤێت، و هەچییا پشك بۆ دەركەفتبا، وی ئەو د گەل خۆ دبر، بەلێ ڤێ جارێ وی وە نەكر، وی بڕیار دا هەمی ژنكێن خۆ د گەل خۆ ببەت.. و پشتی وی نڤێژا نیڤرۆ ل مزگەفتا خۆ ل مەدینێ چار ركاعەت ل بەرا خەلكی كرین، ئەو ب لایێ ڕۆژئاڤایا باشوورێ مزگەفتێ ڤە دەركەفت، و قەستا وێ ڕێكێ كر ئەوا نوكە د بەر (موحەطەطا عەنبەرییێ) ڕا دچت.. خەلك هەمی د گەل دەركەفتن، حەتا ئەو ژنكێن ل سەر ڕۆژا خۆ ژی وەكی ژنكا ئەبوو بەكری ئەسمائا كچا عومەیسی، ئەو ژی دەركەفتن.. زارۆك، مرۆڤێن ب ناڤ سال ڤە چووین، یێن نساخ، هەمی دەركەفتن، گۆتن: بەلكی سەفەرەكا هۆسا جارەكا دی ب دەست مە نەكەڤت. و بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مەدینێ دەركەڤت، وی هەڤالێ خۆ ئەبوو دوجانە یێ ساعدی ل جهێ خۆ هێلا ل مەدینێ.

## ل میقاتا (ذو الحلیفة):

بەری ئێڤار ببت، ئەو ب مەوكبێ خۆ یێ مەزن ڤە گەهشتە (ذو الحلیفة) و ئەو جهەكێ پانە دكەفتە نهالا عەقیقێ یا ناڤدار ئەوا ژ قوینتارێ ڕۆژئاڤایێ چیایێ ئوحودێ دەست پێ دكەت و ب لایێ ڕۆژئاڤایا باژێری دا دچت حەتا دگەهتە باشووری ل سەر ڕێكا نوكە ژ مەدینێ دچتە مەكەهێ. ئەڤ

جهە ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نێزیکی دەهـ دوازدە کیلۆمتران یێ دویر بوو ژ بازێری، بەلێ بازێر نوکە یێ گەهشتییێ و ژێ دەرباس ژی بووی!

ل ڤی جهی ئەوێ هندەک جاران دبێژنێ: (أبیار علی) پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کاروانێ خۆ دانا، و وی نڤێژا ئێڤاری ل وێرێ دو رکاعەت کرن، و ئەو جهێ وی نڤێژ لێ کری هنگی دارەک لێ بوو، و دەمێ عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی ئەمیرێ مەدینێ ل سالێن (٨٧-٩٣) وی مزگەفتەک ل جهێ نڤێژا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاڤاکر و ناڤێ کرە (مسجد الشجرة) و ئەڤ مزگەفتە ئەوە یا نوکە حەجی ئیحرامان لێ دکەنە بەر خۆ دەمێ ژ مەدینێ دچنە مەکەهێ بۆ حەجێ یان عومرێ.

وێ ئێڤارێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ما ل وێرێ، و ب شەڤێ لێ نڤست، وێ شەڤێ ژنکا ئەبوو بەکری ئەسمائێ کورەک بوو ناڤێ وی کرە (موحەممەد). دیسا هەر وێ شەڤێ وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هات کو تو یێ ل نهالەکا پیرۆز، و ل ڤێرێ دەست ب حەجا خۆ بکە، یەعنی: ئیحرامێن حەجێ بکە بەر خۆ و ئنیەتا عومرەیا د حەجێ دا بینە. لەو سپێدێ وی فەرمان ل هەڤالێن خۆ کر کو ئەو ئیحرامێن خۆ گرێدەن.. و دەمێ ئەسمائا ژنکا ئەبوو بەکری داخواز ژ زەلامێ خۆ کری کو بۆ وێ پسیارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت، کانێ ئەو چ بکەت؟ وی گۆتە ئەبوو بەکری: بێژێ بلا خۆ بشۆت، و خۆ بپارێزت، و کانێ ئەم چ دکەین بلا ئەو ژی بکەت، طەواف تێ نەبت.

پاشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قوربانێ خۆ کو حێشترەک بوو ئینا و نیشان کر؛ دا بێتە زانین کو ئەو یا قوربانییە، و نیشانکرن ئەو بوو وی هندەک خوین ژ پشتا وێ بەردا، و ئەو خوین د جۆتەکێ نەعالان دا و ئەو

نەعال وەکی رِستکێ د ستویێ وێ دانا، و وی قوربان هەمی پێکڤە د گەل هەڤالەکێ خۆ هنارتنە مەکەهێ.

ل ئێکشەنبیێ، ل نیڤرۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیحرامێن خۆ کرنە بەر خۆ، پاشی نڤێژا نیڤرۆ کر پشتی هنگی ل حێشترا خۆ (القصواء)ێ سویاربوو، و گاڤا بەرێ حێشترێ کەفتییە قیبلێ وی گۆت: (اللهم حجة لا ريـاء فيها و لا سمعة، لبيک حجة و عمرة)، و یێ ژ هەمییان نێزیکتر ژ وی د ڤێ سەفەرێ دا ئەبوو بەکر بوو، حەتا خوارن و پێتڤییێن وی و یێن ئەبوو بەکری د ناڤێک دا بوون، و ل سەر پشتا حێشترەکێ بوون.

و ئەڤە تشتەکێ غەریب نینە.. مانە ئەبوو بەکر بوو یێ بەری دەهـ سالان د گەل وی ئەڤ رێکە دایە بەر خۆ، و ژ بەر شیرێن کافران رەڤین، و قەستا مەدینێ کرین؟ ئەڤە جارەکا دی هەر ئەو پێکڤە یێ دزڤرنە وی باژێری یێ خەلکێ وی ئەو دەرێخستین، بەلێ ب کراسەکێ دی، و بۆ کارەکێ دی. و دەمێ حێشترا وی ژ نهالا (ذو الحليفة) دەرباس بووی، و ب سەر بەتەنێ کەفتی، و بەرێ وێ ب نک مەکەهێ ڤە هاتییە لێدان، وی ب دەنگەکێ بلند گۆت: (الحمد لله، و سبحان الله، و لا إلـه إلا الله، و الله أكبر، لبيک عمرة و حجة، لبيک اللهم لبيک، لبيک لا شريک لک لبيک، إن الحمد والنعمة لک والملک، لا شريک لک، لبيک إله الحق لبيک).

و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئنیەتا (قیرانێ) ئینا، هەر وەسا گەلەک هەڤالێن وی ژی وەکی ئەبوو بەکری، بەلێ ژنکێن وی ئنیەتا (تەمەتتوعێ) ئینا، و پتریا صەحابییان ئنیەتا (ئیفرادێ) ئینا[1].

---

(١) قیران: ئەوە مرۆڤ عومرێ و حەجێ پێکڤە بکەت، و بکەتە ئێک. و تەمەتتوع ئەوە مرۆڤ عومرێ بکەت، و ئیحرامێن خۆ بدانت، حەتا رۆژا بەری عەرەفێ جارەکا

جابر دبێژت: من بەرێ خۆ دا هەر چار ڕەخێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هندی چاڤێن من قەترە دکر مرۆڤ هەبوون، دسویار و پەیا. و جبریل هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ئەی موحەممەد، فەرمانێ ل هەڤالێن خۆ بکە بلا ئەو دەنگێ خۆ ب (تەلبییێ) بلند بکەن، چونکی ئەو نیشانا حەجێیە. و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمانا جبریلی گەهاندە وان، و وان فەرمان ب جهئینا، و صەحرا هەمی ب (تەلبییا) وان هژیا، و دەنگێ وان د چیا و نهالێن حیجازێ دا ڤەدا..

**ب- ڕێکا ڤە:**

ل گەلەک جهان پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دگۆتە صەحابییێن خۆ حەفتێ پێغەمبەر د ڤی جهی ڕا یێن چووین قەستا حەجێ کری، و جلکێن هرییێ د بەر وان بوون، و ل جهەکی گۆت: یوونسێ کوڕێ مەتتای ل سەر حێشترەکا سۆر د ڤێرێ ڕا یێ چوویە حەجێ، و ل جهەکێ دی گۆت: مووسا ل سەر حێشترا خۆ د ڤێ ڕێکێ ڕا یێ چوویە حەجێ و وی تبلێن خۆ کربوونە د گوهێن خۆ ڕا و ب دەنگەکێ بلند تەلبییە دگۆت، و ل نهالا عوسفانێ ژی وی گۆت: هوود و صالح د ڤێ نهالێ ڕا چووبوونە حەجێ.. و ئەڤە هندێ دگەهینت کو کەعبەیا پیرۆز ل مەکەهێ جهێ حەجا پێغەمبەر و خودان باوەران بوو هێشتا بەری ئیبراهیم پێغەمبەری چونکی هوود و صالح بەری وی بوون، و حەتا وەختێ پێغەمبەرێن ئسرائیلییان ژی یێن وەکی مووسای و یوونسی.

و ل ڕەوحائێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: عیسایێ کوڕێ مەریەمێ د ڤی جهی ڕا دێ چتە حەجێ یان عومرێ.. یەعنی: ئەو هێشتا نەچوویە حەجێ و ل دووماهییا زەمانی ئەو دێ چت.

---

دی ئیحرامان بکەتە بەر خۆ و حەجێ بکەت. و ئیفراد ئەوە مرۆڤ حەجێ ب تنێ بکەت.

## فێرکرنا هەڤالان:

کتێبێن حەدیسێ گەلەک سەرهاتییان ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی بۆ مە ڤەدگێرن کو ب رێکا حەجێ ڤە چێبووین، ژێ دئێتە زانین کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڤێ سەفەرێ دا باشترین فێرکەر بوو بۆ هەڤالێن خۆ ژ ژن و زەلامان، هەر وەسا وی ب ئەخلاقێ خۆ یێ تازە ئەو ل سەر گەلەک رەوشتێن چاک پەروەردەکرن، ئەم دێ هندەکان ژێ ڤەگێرین:

- ب رێڤە وی گوهـ ل زەلامەکی بوو دەمێ تەلبیە دگۆتن، دگۆت: (لبیک) پێش شوبرمەیی ڤە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: شوبرمە کییە؟ وی گۆت: برایێ منە، یان مرۆڤەکێ من یێ نێزیکە.. (راوی تێدا یێ ب شک بوو) پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تە حەج بۆ خۆ کرییە؟ وی گۆت: نەخێر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ڤێ حەجێ بۆ خۆ بکە، پاشی حەجەکا دی بۆ شوبرمەیی بکە.

- دەمێ وی زەلامەک یان ژنەک دیتبا ب پییان ب رێڤە دچوو دا بێژتێ: ل وان حێشتران سویار ببن یێن مە بۆ قوربانی ئینایین.. و ب ڤێ چەندێ وی دڤیا موخالەفا وی عەدەتی بکەت یێ عەرەبان ل جاهلییەتێ دەرێخستی کو چێ نابت مرۆڤ ل قوربانی سویار ببت.

- و زەلامەکێ دبێژتێ: ئەبوو طەلیق ل جهەکی گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ژنکا من (أم طليق) سلاڤان ل تە دکەت، و من حێشترەکێ نێر و ئێکا مێ هەبوون، ژنکا من گۆتە من: یێ نێر بدەف من دا ئەز ژی د گەل هەوە پێ بێمە حەجێ، من گۆتێ: من ئەو یێ کرییە وەقف، گۆت: پا یا مێ بدەف من، من گۆتێ: ئەز دێ پێ چم، وێ گۆت: پا هندەک پارێن خۆ بدە من دا ئەز پێ بێم، من گۆتێ: من پارە نینن، هەما من هند یێن هەین ئەز پێ بچمە حەجێ، و ئەگەر من هەبان ئەز دا دەمە تە.. گۆت:

وێ گۆتە من: پا ئەگەر تە پێغەمبەر دیت سلاڤێن من لێ بکە، و سوحبەتا من بۆ بکە. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەو ڕاست دبێژت، و ئەگەر تە حێشترێ خۆ یێ خێرێ دابا ڤێ هەر دا بۆ تە خێر بت، و ئەگەر تە هندەک پارە دابانێ خودێ دا بۆ تە بەدەل ڤەکەت. وی زەلامی گۆتێ: ڤێجا چ تشت هەیە خێرا وی وەکی یا حەجەکا د گەل تەیە؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: عومرەکا ل هەیڤا ڕەمەزانێ.

- ل جهەکی دیارە حێشترا صەفییایا ژنکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بێچارە بوو، لەو پێغەمبەری گۆتە هەوییا وێ زەینەبێ (و ئەو کچمەتا پێغەمبەری بوو): حێشترەکا خۆ بدەف صەفییایێ.. غیرەت بۆ زەینەبێ ژ هەوییا وێ چێبوو و گۆت: ئەز حێشترا خۆ بدەمە ف جوهییا تە! و ئاشکەرایە کو صەفییا کچا حویەیێ کوڕێ ئەخطەبێ جوهی بوو، موسلمان بووبوو، ژ بەر کرێتییا ڤێ گۆتنا زەینەبێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ وێ عێجز بوو و پشتدایێ و د گەل نەئاخفت حەتا ئەو زڤڕینە مەدینێ!

- ل جهەکی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالێ ئەبوو بەکری و هەردو کچێن وی عائیشا و ئەسمائێ دڕوینشتیبوون، و ئەبوو بەکر ل هیڤییا هندێ بوو کو عەبدێ وی وێ حێشترێ بینت یا خوارنا وان ل سەر پشتێ، گاڤا عەبد هاتی حێشتر د گەل نەبوو، و وی گۆتە ئەبوو بەکری ئەڤە ژ دوهی وەرە من حێشتر یا بەرزەکری، ئەبوو بەکر ژ کەرب ڤە چوویێ و هندەک لێدان و گۆتێ: حێشترەکا ب تنێیە و تو بەرزە دکەی! هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پێ گرنژی و گۆت: بەرێ خۆ بدەنە ڤی یێ د ئیحرامان دا و یێ چ دکەت! و گاڤا مالباتا نەضلەیێ ئەسلەمی زانی کو حێشترا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەبوو بەکری ب خوارن ڤە یا بەرزەبووی وان جفنییەکێ تژی خوارن (ئەوا ژ کەشک و قەسپ و زەیتێ دهاتە چێکرن) بۆ وان ئینا، و

گـاڤـا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیتی هێشتا ئەبوو بەکر یێ کەربگرتییە ژ وی عەبدی، گۆتێ: هێدی هێدی ئەبوو بەکر، مەسەلە نە ب دەستێ تەیە و نە ب دەستێ مەیە، و ڤی جحێلی ژی نەدڤیا حێشترێ بەرزە کەت، و ئەڤە خودێ بۆ مە بەدەل ڤەکر، وەرە بخۆ. پشتی دەمەکی صەفوانێ کورێ موعەططەلی هات و حێشترا بەرزە د گەل دا بوو. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە ئەبوو بەکری: سەحکێ تشتەکێ تە یێ ژێ کێمە.. ئەبوو بەکری سەحکرێ، پاشی گۆت: بەس ئەو تراری کێمە یێ مە ئاڤ پێ ڤەدخوار. عەبدی گۆتێ: ئەڤە ئەو تراری د گەل من!

- گاڤا سەعدێ کورێ عوبادەیێ ئەنصاری زانی حێشترا ئەبوو بەکری ئەوا خوارنا وی و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سەر یا بەرزەبووی، هەر زوی ئەو و کورێ خۆ قەیس چوون ئێکا دی ب خوارن ڤە بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینا، و گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، مە زانی حێشترا هەوە ب خوارن ڤە یا بەرزەبووی، ئەڤە ئێکا دی بۆ هەوە پێش وێ ڤە. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: خودێ حێشترا مە بۆ مە زڤڕاند، حێشترا خۆ ببەن، خودێ بەرەکەتێ بۆ هەوە بهاڤێتێ.. پاشی گۆتێ: بابێ ثابتی، ما بەس نینە ئەو هەمییا د گەل مە هاتییەکرن ئەڤە ژ وێ ڕۆژێ وەرە یا ئەم تێدا بووینە مێڤانێن تە ل مەدینێ؟ سەعدی گۆت: منەت یا خودێ و پێغەمبەرێ وییە، ب خودێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو مالێ مە یێ تو دبەی مە پێ خۆشترە ژ وی یێ تو دهێلی. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تو ڕاست دبێژی، بابێ ثابتی، مزگینییا من ل تە! تو یێ خودان ئیفلەحی، ئەخلاقێن باش د دەستێ خودێ دانە، و هەچییێ وی بڤێت ئەخلاقەکێ باش ژ وان ددەتێ، و وی ئێکێ باش ژێ یێ دایە تە. و هۆسا پێغەمبەری -سلاڤ

لێ بن- نەدهێلا دەلیڤەیەک ژ دەست وی دەرکەڤت ئەگەر تشتەکێ ب مفا نیشا صەحابییێن خۆ نەدەت.

### ل بەر دەرازینکا مەکەهێ:

سەفەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ مەدینێ حەتا مەکەهێ هەشت رۆژان ڤەکێشتا، دەرکەفتنا وی ژ مەدینێ، وەکی بۆری د گەل مە ل نیڤرۆیا شەنبییێ بوو (٢٥) هەیڤا ذولقەعدە، ل ئێڤارا شەنبییا دی ئەوا دبوو (٣) هەیڤا ذولحججە ئەو گەهشتە بەر دەرازینکا باژێرێ مەکەهێ، ل وی جهێ نوکە دبێژنێ: (جەروەل) کو ئەڤرۆ تاخەکە ژ تاخێن مەکەهێ، بەلێ هنگی ئەو جهەکێ ڤەدەر بوو دکەفتە ژ دەرڤەی باژێری، ب دویراتییا نێزیکی کیلۆمترەک و نیڤان ژ حەرەمێ ژ لایێ باکوورێ رۆژئاڤایێ ڤە. ل ڤی جهی بیرەکا ئاڤێ هەبوو دگۆتنێ: (ذو طووا)، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل نک وێ بیرێ دانا، دا بێنا خۆ ڤەدەت، و وێ شەڤێ ئەو ما ل وێرێ، و وی سەرێ خۆ شویشت دا پاقژ و سڤک بت دەمێ دچتە مەکەهێ.

پاشی ئەو ب لایێ رۆژهەلاتێ ڤە چوو دا ل دۆر چیایێ (ئەذاخر) بزڤرت، ئەوێ دکەفتە د ناڤبەرا وی جهێ ئەو لێ و کەعبێ دا، پاشی ئەو ب سەر بەتەنا کەدائێ کەفت، و ژۆر دا ب نک وی جهی ڤە چو خوارێ یێ نوکە پرا حەجوونێ دکەفتێ، و د گەلییێ بەنوو هاشمییان دا هاتە خوارێ، ل وی جهێ کافران ئەو لێ حیصار داین، و قەبرێ خەدیجایێ لێ، و هات حەتا گەهشتییە مالێن مەکەهێ، و گەهشتنا وی بۆ ناڤ مالان ل تێشتەگەها رۆژا ئێکشەنبێ بوو چاری هەیڤا ذولحججە.

### ل مزگەفتا حەرام:

ل تاخێ بەنوو هاشمییان ژ مەکەهێ، ئەوێ دکەفتە رۆژهەلاتا مەروایێ، ل وی جهێ نوکە ئەو مەکتەبە لێ یا دبێژن ئەو جهێ مالا پێغەمبەری بوو

-سلاڤ لێ بن-، کو دکەفتە د دەرێ گەلییێ ئەبوو طالبی، یان گەلییێ هاشمییان دا، هندەک زارۆکێن مالباتا باپیرێ وی عەبدلموطەلبی چوونە بەراهییێ، وی دو ژ وان هلگرتن، ئێک دانا بەرا خۆ و ئێک ژی دانا پشت خۆ، و ئەو چوو حەتا گەهشتییە بەر دەرێ مزگەفتێ ئەوێ دکەفتە رۆژهەلاتا کەعبێ بەرانبەر دەرگەهێ کەعبێ و بەرێ رەش، و هنگی دگۆتنە وی دەرگەهی: دەرگەهێ بەنوو شیبە، پاشی ناڤێ وی بووبوو (باب السلام).

ل بەر دەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ حێشترا خۆ پەیا بوو، و دەسنڤێژا خۆ گرت، و هێدی و ب تەواضوع و خۆشکاندن ڤە ب نک روکنێ بەرێ رەش ڤە چوو، گاڤا گەهشتییێ دەستێ خۆ تێدا و گۆت: (الله أكبر) و چاڤێن وی رۆندک باراندن، پاشی سەرێ خۆ دانا وەک سوجدە بۆ خودێ، و بەر ماچی کر.. پاشی دەست ب طەوافێ کر.

حەفت جاران ئەو ل دۆر کەعبێ زڤری، و ئیحراما وی یا سەری ژ قوماشێ یەمەنێ یێ کەسک بوو، و دەمێ وی طەواف دکر وی دی زەلامەکی بەندکەکێ ب دەستێ خۆ ڤە کری و سەرێ دی یێ ب پییێ زەلامەکی ڤە کری و هەردو پێکڤە یێ طەوافێ دکەن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب نک ڤە چوو و ئەو بەندک ڤەکر و گۆتێ: دەستێ وی بگرە.. و ئەڤە عەدەتەکێ عەرەبان بوو وان د جاهلییەتێ دا خۆ پێکڤە گرێدا و طەواف دکر، گاڤا وان دیتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەندکێ وان قەتاند، ئێک ژ وان گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، مە یا ل سەر خۆ نەزکری هۆسا طەوافێ بکەین. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: خۆ ڤەکەن و حەجێ بکەن، ئەڤە نە نەزرە، نەزر ئەو تشتە یێ بۆ کنارێ خودێ بت، ئەڤە ژ کارێ شەیطانییە.

و هۆسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کار بۆ هندێ کر کو هەر کار و عەدەتەکێ جاهلییەتێ ل حەجێ زێدە کربت نەهێلت و راکەت.

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ طەوافێ خلاصبووی چوو نک مەقامێ ئیبراهیمی، و مەقام هنگی ب دیوارێ کەعبێ یێ ڕۆژهەلاتێ ڤە یێ نویسیای بوو، دو رکاعەت ل وێرێ کرن و چوو نک بیرا زەمزەم ئاڤ ژێ ڤەخوار و هندەک ب سەرێ خۆ ژی دا کر، پاشی زڤڕی نک بەرێ ڕەش ماچی کر، و دەستێ خۆ تێدا و دێمێ خۆ ب هەردو دەستێن خۆ ڤەمالی، و چوو سەعی د ناڤبەرا صەفا و مەروایێ دا کر.

دەمێ وی سەعی دکر، خەبەر ل کۆلان و مالێن مەکەهێ بەلاڤبوو کو پێغەمبەر یێ هاتییە مزگەفتێ و ئەو نوکە یێ سەعییێ دکەت، لەو خەلک هویر و گر ژ مالان دەرکەفتن و قەستا صەفا و مەروایێ کرن؛ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ببینن، دەمێ وی دیتی خەلک بۆ دیتنا وی هند کۆمبوون کو قەرەبالغەکا زێدە چێبوو، و هندەک ل دووماهییێ نەشێن وی ببینن، و چونکی عەدەتێ وی نەبوو ئەو هندەک کەسان ل دۆرێن خۆ بدانت دا خەلکی ژ وی بدەنە پاش، ئەو داخواز کر حێشترا وی بینن و ئەو لێ سویار بوو، دا بلند ببت، حەتا خەلک هەمی وی ببینن، و وی سەعیا خۆ ب سویاری ل سەر پشتا حێشترێ تمام کر.

### عێجزییا پێغەمبەری ژ صەحابیێن وی!

بەری نوکە مە گۆتبوو کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قوربانێ خۆ د گەل خۆ ئینابوو، و دەمێ وی ئیحرامێن خۆ ل (ذو الحليفة) ل نێزیکی مەدینێ کرینە بەر خۆ، وی ئنیەتا (قیرانێ) ئینابوو، یەعنی: حەجێ و عومرێ بکەتە ئێک.. لەوا دەمێ ئەو ژ سەعیا د ناڤبەرا صەفا و مەروایێ دا خلاصبووی، وی ئیحرامێن خۆ نەدانان، بەلێ وی گۆتە هەڤالێن خۆ هەچییێ ژ هەوە قوربانێ خۆ د گەل خۆ نەئینابت، بلا ئیحرامێن خۆ بێخت، و ئەڤێ طەواف و سەعیێ بۆ خۆ حسێب بکەت عومرە. یەعنی: (تەمەتتوعێ)

ب عـومرێ بـۆ حـەجێ بکـەت. و وی ئـەڤ فەرمانـە ل ژنکـێن خـۆ ژی کـر. و ئەڤ فەرمانە ل بەر صەحابییان یا گران بوو، ژ بەر دو ئەگەران:

**یا ئێکێ:** ل نـک عـەرەبـان د جاهلیـیەتـێ دا تشتـێ ژ هـەمییـێ کرێتـتـر ئـەو بوو مرۆڤ ل دەمێ حەجێ عومرێ بکەت.

**یا دویێ:** ئەڤە ئەو ژ مـەدینێ دەرکـەفتین وان ئیحـرام ب ئنیـەتا حـەجێ یێن کرینە بـەر خـۆ، ڤێجا چاوا ژ نـوی ئنیـەتا خۆ بگوهۆڕن، و ئـەڤا چوویی حسێب بکەن عومرە؟

ئەڤ هەردو کارە ل بەر وان دگران بـوون، پشـتی هنگـی ئەڤـە پێغەمبـەر ب خۆ ل بـەر چاڤێن وان یێ ب ئیحرامانـە، چاوا ئـەو تشـتـەکێ جودا ژ وی بکەن؟ ڕەنگەکێ دودلییێ بۆ وان چێبوو، حەتا وان نەڤیا ئیحرامێن خۆ ژ بەر خۆ بکەن، گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ کـارە ژ وان دیتـی عێجزبـوو و کـەربێن وی ڤـەبوون، عائیشـایێ ئـەڤ چەنـدە تـێ ئینـادەر لـەو گـۆتێ: کـێ کـەربێن تـە ڤەکرینـە ئـەی پێغەمبـەرێ خـودێ؟ خـودێ وی ببـەتـە ئـاگری! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ما تو نابینی ئەزێ فـەرمانێ ب تشـتـەکی ل خەلکی دکەم و ئەو ددودلن؟

پشـتی گـۆتنێن خـەلکی گەهشـتینە پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن-، ئـەو دەرکەفتـە نـاڤ وان، و ڕابووڤـە و خوتبـەک بـۆ خوانـد و تێـدا گـۆت: گـەلی مرۆڤان، ب خودێ هوین دزانن ئەز ژ هەوە هەمییان ب تەقواترم، و ئەز چێتـر و ڕاستگۆترم، وێ بکـەن یا مـن فـەرمان پـێ ل هەوە کری، ئەگـەر نـە ژ بـەر هنـدێ بـا کـو مـن قوربـانێ خـۆ یـێ ئینـای، ئـەز ژی دا وە کـەم، و ئەگـەر دەسپێکێ من زانیبا من قوربان نەدئینا.

هنگـی دلـێ صـەحابییان خـۆش بـوو، و ئـەو ب تمـامی د مسـەلێ گەهشتن، و وان فەرمانا پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- ب جهئینـا. و هنگی

سوراقەیێ کوڕێ مالکی ل بنێ مەروایێ ڕابوو ڤە و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەڤە بۆ مە بۆ ئەڤ سالە ب تنێیە، یان بۆ هەر و هەرە؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەردو تبلێن خۆ یێن شاهدێ تێک ئالاندن و گۆتێ: نە، ئەو بۆ هەر و هەرە، ئەو بۆ هەر و هەرە، ئەو بۆ هەر و هەرە، عومرە چوو د ناڤ حەجێ دا حەتا قیامەتێ.

و ژ بیر نەکەن، ئەڤ زەلامێ ئەڤ پسیارە کری، ئەو بوو یێ بەری دەهـ سالان ل دەمێ مشەختبوونێ ب دویڤ پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- چووی دا وی بگرت، و بۆ خەلکێ مەکەهێ بزڤڕینتە ڤە، و خەلاتێ قورەیشییان وەرگرت!

ل (ئەبطوحێ):

بەری نیڤرۆیا ڕۆژا ئێکشەنبێ (٤)ی هەیڤا ذولحججە، پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ سەعییێ خلاصبووی، و دا کو تەنگاڤییێ ل بازێڕی پەیدا نەکەن، ئەو ب هەڤالێن خۆ ڤە ژ ناڤ مالان دەرکەفتن، و بەر ب (ئەبطوحێ) ڤە چوون، ئەو دەڤەرا پان یا دکەفتە د سەر حەجوونێ دا، نێزیکی وی جهێ زیارەتێ خەدیجایێ لێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل وی جهی دانا یێ نوکە دبێژنێ: (جەعفەرییێ)، چار ڕۆژان: ژ ئێکشەنبێ حەتا چارشەنبێ، ئەو ما ل وێرێ، ل نک وان بیرێن ئاڤێن یێن کو ل وێرێ هەین، و د ڤان هەرچار ڕۆژان دا ئەو نەدهاتە حەرەمێ بۆ کرنا نڤێژان، دا تەنگاڤی ل سەر خەلکی پەیدا نەبت، و وەکی هندەک زانا دبێژن ئەڤە دەلیلە کو خێرا کرنا نڤێژێ ل حەرەما مەکەهێ هەمییێ نە کو ل کەعبێ ب تنێ یا زێدەیە، ئەگەر نە.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ خێرا مەزن ژ دەست خۆ نەدکر. د ڤان هەر چار ڕۆژان دا ل (ئەبطوحێ) عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی و ئەبوو مووسایێ ئەشعەری هەردو گەهشتنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و وی بەری

هنگی ئەو هنارتبوونە یەمەنێ، و وان ژی حەجا خۆ د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تمام کر.

**سەرەدانا سەعدی**:

هەر ل ڤی جهی و ڤی دەمی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زانی کو سەعدێ کورێ ئەبوو وەققاصی یێ نەخۆشە، لەو وی بڕیار دا سەرا وی بدەت، و گاڤا ئەو چوویە نک سەعدی، وی دیت سەعد هند یێ نساخە دێ بێژی یێ ل بەر سەکەراتێ، گاڤا سەعدی ئەو دیتی کرە گری. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بۆچی تو دکەیە گری؟ سەعدی گۆت: ئەز دترسم وەکی سەعدێ کورێ خەولەی ئەز ل وی جهی بمرم یێ من هیجرەت ژێ کری. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: نە، ئەگەر خودێ حەز بکەت تو نامری.

پاشی وی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، تو دبینی ئەزێ کەفتیمە د چ حالی دا، و ئەز مرۆڤەکێ مالدارم و من ب تنێ کچەکا هەی، ئەرێ ئەز مالێ خۆ هەمییێ بکەمە خێر؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: نە. وی گۆت: پا نیڤەکا مالێ خۆ؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە: نە. وی گۆت: پا سێئێکێ؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: سێئێکێ، و سێئێک گەلەکە ژی، ئەگەر تو میراتگرێ خۆ بهێلی دەولەمەند چێترە ژ هندێ تو وان بهێلی هەژار ب هیڤییا خەلکی ڤە، و تو خێرەکێ بۆ کنارێ خودێ نادەی ئەگەر خێرا وێ بۆ تە نەئێتەدان، خۆ وی پارییێ تو دکەیە د دەڤێ ژنکا خۆ ژی دا.

سەعدی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەز پشتی هەڤالێن خۆ دێ مینم؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: بەلکی خودێ تە بلند بکەت، و هندی تو بمینی و کارەکێ چاک بکەی دەرەجەیێن تە دێ پێ بلند و زێدە بن،

پشتی هنگی بەلکی تو هند بمینی حەتا هندەک مفایی ژ تە ببینن، و هندەک زیانێ.. هنگی سەعدی گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، پا دوعایەکێ بۆ من بکە. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستێ خۆ دانا سەر ئەنییا وی، پاشی دێم و سنگ و زکێ وی پێ ڤەمالی، و سێ جاران گۆت: یا رەببی تو شفایێ بدە سەعدی، و هجرەتا وی بۆ تمام بکە.

و وەسا چێبوو وەکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی، سەعد پشتی هنگی پێنجی سالان ما زیندی، و سەرلەشکەرێ موسلمانان ل شەرێ قادسییێ ئەو بوو، ئەو شەرێ خودێ موسلمان پێ بلندکرین، و کافرێن ئاگرپەرێس تێدا رویرەش و شەرمزارکرین، یەعنی: مللەتەکی مفا ژ سەعدی دیت کو موسلمان بوون، و مللەتەکی زیان ژێ دیت کو کافر بوون.

**ل مینایێ:**

ل تێشتەگەها رۆژا پێنجشەنبێ (٨)ی هەیڤا ذولحججە، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ وی جهێ لێ ئاکنجی بووی کو (ئەبطوح) بوو بەر ب (مینایێ) ڤە چوو، دا ژ وێرێ بەر ب عەرەفێ ڤە بچت، و دەست ب کار و بارێن حەجێ بکەت، و ئەو صەحابییێن وی یێن تەمەتتوع کری و ئیحرامێن خۆ ئێخستین جارەکا دی ژ وی جهێ ئەو لێ ئیحرام کرنە بەر خۆ و د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرکەفتنە مینایێ. ل مینایێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نڤێژا نیڤرۆ و ئێڤاری و مەغرەب و عەیشا کرن، هەر ئێک ل دەمێ وێ، و ئەوێن چار رکاعەت کرنە دو رکاعەت، و وێ شەڤێ کو شەڤا ئەینییێ بوو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مینایێ نڤست.

**رۆژا عەرەفێ:**

ئەوا ل سالا دەهێ مشەختی، کو سالا حەجا خاترخواستنێ بوو، دکەفتە رۆژا ئەینییێ، بەرانبەر شەشی هەیڤا ئاداری ژ سالا ٦٣٢ ز، مە گۆت:

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- وێ شەڤێ ل مینایێ نڤستبوو، لەو سپێدەیا ڕۆژا عەرەفێ ئەو ل مینایێ بوو، و سپێدێ وی دا ڕێ و بەر ب عەرەفێ ڤە چوو، گەهشتە موزدەلیفێ، و گەلەک خەلکی ب تایبەتی قورەیشییان هزر کر ئەو دێ مینتە ل موزدەلیفێ، و دێ بێژتە خەلکی هوین هەڕنە عەرەفێ! چونکی ئەڤە عەدەتێ قورەیشییان بوو د جاهلییەتێ، دەمێ دبوو ڕۆژا عەرەفێ ژ حەجێ، عەرەب هەمی دچوونە عەرەفی حەتا ئێڤاری ڕاوەستیان، و قورەیشی دمانە ل موزدەلیفێ، هەر وەکی وان خۆ ژ خەلکی بلندتر ددیت، و دگۆت: ئەم خودانێن حەرەمێینە، ئەم ل وی جهی ڕاناوەستین یێ خەلک لێ ڕادوەستت.. بەلێ وان دیت پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ موزدەلیفێ دەرباسبوو، و لایێ ڕاستێ ژ ڕێکێ گرت، و چوو حەتا گەهشتییە وی جهێ دبێژنێ: (نەمرە) ل بەر لێڤا توخوبێ عەرەفێ، ل وێرێ ڕەشمالەک بۆ وی هاتبوو ڤەدان، ئەو چوو ل بن ڕوینشت و دەمەکی بێنا خۆ ڤەدا، و گاڤا ڕۆژ ژ نیڤا عەسمانی وەرگەڕیای و نیڤرۆ بووی، ئەو ڕابووڤە و قەستا نهالا (عورەنەیێ) کر و عەرد ل وێرێ یێ ڕاستبوو و بەرفرەه بوو، ل وێرێ ئەو د ناڤ خەلکی دا ل سەر دەوارێ ڕابووڤە سەر ڕکێبان، و هەردو دەستێن خۆ دانانە سەر پشتا زینێ، دا بلند ببت و خەلک باش وی ببینن، و گازی کر:

**((گەلی مرۆڤان، خۆ بێ دەنگ بکەن، چونکی هوین نزانن بەلکی هوین پشتی ئەڤ سالە من نەبینن!)).**

بەلێ.. دەم دەمێ خاترخواستنێیە، ڤێجا خۆ هشیار کەن!

گەلی مرۆڤان، ئەڤ سالە ل ڤی جهی ئەز یێ د ناڤ هەوە دا، و هوین من دبینن، و هەوە گوهـ ل من هەیە، بەلێ ئەم نزانین بەلکی سالەکا دی هوین من ل ڤێرێ نەبینن! گۆتنەکا گران بوو ل سەر مرۆڤێن ئامادە، ئەڤە چییە؟ تو بێژی پێغەمبەر یێ خاترا خۆ ژ مە دخوازت؟

ئەو مرۆڤێن ل وی جهی ئامادە گەلەک بوون، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ترسیا دەنگێ وی نەگەهتە هەمی کسان، لەو وی داخواز کر مرۆڤەکێ دەنگ بلند دەنگێ وی بگەهینتە خەلکی، و مرۆڤەکێ ب وی رەنگی هات دا دەنگێ وی بگەهینت، و هوین دزانن ئەو کی بوو؟

رەبیعەیێ کورێ ئومەییەیێ کورێ خەلەفی، ئومەییە ئەوێ ل رۆژا بەدرێ ب دەستێ بیلالی هاتییە کوشتن، کورێ وی ئەڤرۆ دەنگێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ دگەهینتە خەلکی.. و بەری ئەز وێ گۆتنێ بۆ هەوە ڤەگێرم یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی، و کورێ ئومەییەی گەهاندییە خەلکی، من دڤێت ل بیرا هەوە بینم کو دەمێ خەلکێ طائیفێ ب کرێتترین رەنگ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ باژێرێ خۆ زڤراندی، و وی ژ کەربان دا ئاگەه ژ خۆ نەمای و قویناغەکا درێژ خەلەت چوویە رێکێ.. هنگی جبریل هاتە نک و گۆتێ: ئەی موحەممەد، ئەڤە ملیاکەتێ چیایان یێ د گەل من، و ئەگەر تو حەز بکەی ئەو دێ هەردو چیایان ب سەر خەلکێ مەکەهێ دا ئینتە خوارێ، وی گۆت: نە.. بەلکی خودێ هندەکان ژ پشتا وان بینتەدەر ڤی دینی بگەهیننە خەلکی! و ئەڤە ئەو هیڤی ب جهہات، و ئەڤە ژ پشتا وان کافران یێن شیرێن خۆ بۆ موسلمانان رویس کرین هندەک مرۆڤ دەرکەفتن یێ دەنگێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دگەهیننە خەلکی!

موسلم ژ جابرێ کورێ عەبدللاهی ڤەدگوهێزت، دبێژت: دەمێ رۆژ ژ نیڤا عەسمانی قولپی، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە د نهالێ دا (یەعنی نهالا عورەنەیێ)، و ئەو یێ سویار بوو، و وی خوتبەک بۆ خەلکی خواند و تێدا گۆت: ((هندی خوین و مال و نامویسا هەوەیە ل سەر هەوە حەرامە، وەکی حەرامییا ئەڤێ رۆژا هەوە، ل ڤێ هەیڤا هەوە، ل ڤی باژێرێ هەوە. هەر کارەکێ هەبت ژ کارێ جاهلییەتێ ل بن ڤان هەردو پیێن منە، خوینێن

جاهلییەتێ چوون، و ئێکەمین خوین دچت خوینێن مەنە، خوینا رەبیعەیێ کورێ حارثی، ئەو ل ناف بەنی سەعدییان دهاتە پەروەردەکرن هوذەیلییان ئەو کوشت. و ئەو ریبایا ل جاهلییەتێ هاتییەکرن چوو، و ئێکەمین ریبایا دچت ریبایا عەبباسێ کورێ عەبدلموطەلبییە، ئەو هەمی چوو، و چو ریبا نابت، ب تنێ سەرمالێ هەوە بۆ هەوەیە، نە هوین زرۆدارییێ دکەن و نە زۆرداری ل هەوە دئێتەکرن، خودێ فەرمان دایە کو ریبا نابت.

گەلی مرۆڤان! تەقوایا خودێ د ژنکان دا بکەن، هەوە ئەو ب ئەمانەتا خودێ برینە، و ب گۆتنا خودێ بۆ خۆ حەلالکرینە، د گەل ژنکان دباش بن، چونکی ئەو ل بەر هەوە دلاوازن، هەوە حەق ل سەر وان هەنە و وان حەق ل سەر هەوە هەنە..

و من ئەو تشت د ناف هەوە دا هێلایە یێ ئەگەر هوین پشتی من خۆ پێڤە بگرن، هوین قەت بەرزە نابن، کیتابا خودێ، و پسیارا من دێ ژ هەوە ئێتەکرن، ڤێجا هوین دێ چ بێژن؟)).

وان گۆت: ئەم دێ شاهدەیێ بۆ تە دەین کو تە دین گەهاند و شیرەت ل مە کر.

هنگی پێغەمبەری -سلاف لێ بن- تبلا خۆ یا شاهدێ بەر ب عەسمانی ڤە درێژ کر و گۆت: یا رەببی تو شاهد بە، یا رەببی تو شاهد بە.

و ئەگەر مرۆڤ بەرێ خۆ بدەتە وان ریوایەتان یێن دەقێ ڤێ خوتبێ تێدا بۆ مە هاتییە ڤەگوهاستن، و هەمییان کۆم کەتە سەرێک، دێ بینت کو پێغەمبەری -سلاف لێ بن- موسلمان ل پێنج مەسەلەیێن گرنگ ئاگەهدارکرن، ئەو ژی ئەڤەنە:

**ئێک:** حەرامکرنا خوین و مال و نامویسا موسلمانی.

**دو:** نەهێلانا وان هەمی كارێن ب رێكا جاهلییەتێ د ناڤ خەلكی دا بەلاڤبووین.

**سێ:** شیرەتكرن ب ژنێ، و دڤێت وێ رێز و ئحتراما خۆ هەبت، و مافێن وێ نەئێنە پێلێدان.

**چار:** شیرەت ب كیتابا خودێ، كو بێتە خواندن و بەلاڤكرن، و كار پێ بێتەكرن.

**پێنج:** ئاگەهداركرنا موسلمانان كو ل رۆژا قیامەتێ پسیار دێ ژ وان ئێتەكرن كانێ پێغەمبەری چ كربوو، و دین گەهاندبوو وان یان نە؟

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خوتبا خۆ ب دووماهی ئیناى، بیلالی بانگ دا، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نڤێژا نیڤرۆ دو ركاعەت پاشی یا ئێڤاری ژی دو ركاعەت، (جمع تقدیم و قصر) كرن، بێی چو سوننەتان د گەل بكەت. پشتی هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل دەوارا خۆ سویار بوو، و ژ نوی چو سەر عەردێ عەرەفێ ب خۆ.

## ل بەرانبەر چیایێ رەحمێ:

(جبل الرحمة) یان (جبل إلال) وەكی هنگی دگۆتێ، چیایەكێ بچویك و تیر كەڤرە، دكەفتە نیڤا وێ دەشتا بەرفرەه ئەوا ل تەنشت چیایێ عەرفێ، و گەلەك كەس نوكە هەنە ژ نەزانین هزر دكەن ئەڤە چیایێ عەرەفێیە، و ئەو ب خۆ وەسا نینە، ئەڤە وەكی گرەكێ مەزنە، دكەفتە دەشتا عەرەفێ و چیایێ عەرەفێ ئەو چیایێ مەزنە ئەوێ وەكی كڤانەكی ل دۆر وێ دەشتێ دزڤرت ژ لایێ رۆژهەلاتێ ڤە.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب سویاری ژ وی جهێ خوتبە لێ خواندی و نڤێژا نیڤرۆ و ئێڤاری لێ كری، بەر ب رۆژهەلاتێ ڤە چوو حەتا چوویە پشت چیایێ رەحمە، و ل بەر لێڤا وی راوەستیا، و ل وێرێ ئەو زڤری پشتا خۆ دا

چیایێ عەرەفێ ئەوێ دکەفتە دویر و بەرێ خۆ دا چیایێ رەحمە یێ بچویک، و ب وی رەنگی ئەو چیا کەفتە د ناڤبەرا وی و قیبلێ دا، و ل وێرێ ئەو رابووڤە و دەستێن خۆ بلندکرن و دەست ب تەلبییێ و دوعایان کر.

هنگی ل ڤی مەوقفی، و ل تەنشت چیایێ رەحمە وەسا چێبوو زەلامەک د حێشترا خۆ دا کەفت، و دیارە سەرێ وی ب هندەک کەڤران کەفت لەوا ئەو مر، هندەک هاتنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و خەبەرێ مرنا وی گەهاندێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: وی بشۆن، و چو بێنێن خۆش لێ نەکەن، و هەر ئیحرامێن وی بکەنە بەر، و سەرێ وی نەپێچن، چونکی رۆژا قیامەتێ ئەو دێ رابت ب تەلبیە ڤە.

هەر وەسا ل وی دەمی ئەعرابییەک ژ ئویجاخا قەیسییان، ب نک وی جهی ڤە هات یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- لێ، وی بەری هنگی پێغەمبەر نەدیتبوو، بەلێ هندەکان سالۆخەتێن وی بۆ گۆتبوون، لەو ئەو هات لێ دگەریا، قەرەبالغەکا مەزن ل دەور و بەرێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەبوو، خەلکی هەمییێ خۆ نێزیکی وی دکر؛ دا وی ببینن و بزانن کانێ ئەو چ دکەت و چ دبێژت، بۆ هندێ دا چاڤ ل وی بکەن، گاڤا ئەو ئەعرابییێ قەیسی ئەوێ دگۆتنێ: (ئبن مونتەفق) گەهشتییە ب رەخ چیایێ رەحمە ڤە ل عەرەفاتێ، و وی دیتی خەلک هەمی یێن ل مرۆڤەکێ سویار ل سەر حێشترەکێ کۆمبووین، وی زانی کو ئەڤە دێ پێغەمبەر بت، لەو وی خۆ کرە د ناڤ قەرەبالغێ را و رێکا خۆ ڤەکر.. و ئەو ژی یێ سویاربوو، هندەکان گۆتێ: هەرە وێڤە!! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو دیت، و گوهـ ل وێ گۆتنێ بوو یا خەلکی گۆتییێ، لەو وی گۆت: زەلامی بهێلن، بلا بێت، کانێ وی چ دڤێت.

ئبن مونتەفق دبێژت: ئەز هند نێزیکی وی بووم، حەتا سویێ حێشترا وی و حێشترا من ڤێککەفتن، هنگی من گۆتێ: دو تشت هەنە من ڤێت پسیارا وان ژ تە بکەم، ئەو چییە من ژ ئاگری رزگار بکەت، و ئەو چییە من ببەتە بەحەشتێ؟ گۆت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرێ خۆ دا عەسمانی، پاشی رویێ خۆ یێ پیرۆز ب نک من ڤە لێدا و گۆت: هەر چەندە تە پسیارا خۆ کورت ژی کر، بەلێ ئەو یا مەزن و درێژە.. تێ بگەهە دێ چ بێژمە تە: عەبدینییا خودێ بکە، و چو شریکان بۆ وی چێ نەکە، و نڤێژا فەر بکە، و زەکاتێ بدە، و رەمەزانێ بگرە، و وی کارێ باش د گەل خەلکی بکە یێ تو حەز دکەی ئەو وی د گەل تە بکەن، و وی کارێ خراب یێ تە نەڤێت خەلک د گەل تە بکەن، تو ژی وی د گەل خەلکی نەکە، و هەڤسارێ دەوارا من بەردە.

## مزگینی.. و رۆندکێن عومەری:

ل بەر وێ تەنشتا دکەفتە رۆژهەلاتا گرکێ عەرەفێ، ل خوارێ.. و مە گۆت: ل خوارێ چونکی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- وێ رۆژێ ب سەر وی گرکی نەکەفتبوو، و مابوو ل وێ مەیدانا دکەفتە ب رەخ ڤە، ل نێزیکی وی جهێ نوکە رێکەکا پەیادە هاتییە چێکرن دا خەلک پێ ب سەر گری بکەڤن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- جار یێ سویار بوو و جار یێ راوەستیای بوو بەرێ وی ل قیبلێ بوو و گر ل بەر سنگێ وی بوو، و وی دعا و زکر دکر.. بوو ئێڤار، رۆژێ هێدی هێدی کارێ خاترخوستنێ دکر و بەر ب ئاڤابوونێ ڤە دچوو، ملیاکەتێ وەحیێ جبریل ب سەفارەتەکا ب لەز ڤە هاتە خوار.. هات دا مزگینییەکێ بدەتە ئوممەتا ئیسلامێ، بەلێ مزگینییەکا چاوا؟ مزگینییەکا وەسا بوو رۆندکێن عومەرێ کورێ خەططابی ژ بەر بارین!

جبریل ب ڤێ ئایەتێ هاتە خوارێ: ﴿ ٱلْيَوْمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ ۚ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ ﴾ یەعنی: ئەڤرۆ کافر ژ دینێ هەوە بێ هیڤی بوون، و ئەو پشتڕاست بوون کو هوین جارەکا دی ل شرکێ نازڤڕنەڤە، ڤێجا هوین ژ وان نەترسن و ژ من بترسن. ئەڤرۆ ب تمامکرنا شریعەتێ و ب سەرکەفتنێ من دینێ هەوە دینێ ئیسلامێ بۆ هەوە پێک ئینا، و ب دەرێخستنا هەوە ژ تارییێن جاهلیەتێ بۆ ڕۆناهییا ئیسلامێ من قەنجییا خۆ ل سەر هەوە تمام کر، و ئەز ڕازی بووم ئیسلام بۆ هەوە ببتە دین..

ل ڕۆژا ئەینییێ، ل ئێڤاری، نەهێ هەیڤا ذولحججە ژ سالا دەهێ، شەشێ ئادارا سالا ٦٣٢ زایینی، کو ڕۆژا عەرەفێ بوو، دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ناڤ خەلکی دا یێ ڕاوەستای، جبریل ب وەحی ڤە هات، و دەمێ قورئان بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دهاتە خوارێ، ئەو کەسێن ل دەور و بەرێن وی پێ دحەسیان؛ چونکی لەشێ وی گران دبوو، و خوهێ ددا، و دەنگەکێ وەکی بڤێنێ ل دۆر سەر و چاڤێن وی دهات.. گاڤا ئەڤ حالەتە ب سەر دا هاتی، ئەو صەحابییێن ل دەور و بەرێن وی زانی ئەڤە وەحیە بۆ دئێت، و گاڤا ئەو حالەت ب دووماهی هاتی، بەرێ وان ما ل دەڤێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کانێ دێ چ بۆ وان بێژت، و ئەو چ بوو بۆ وی هاتییە خوارێ.. و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ ئایەتە بۆ وان خواند: ﴿ ٱلْيَوْمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ ۚ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ ﴾.

ئەڤ ئایەتە هات نە ب تنێ دا ڤێ سەرهاتییا دیرۆکی یا مەزن یا ڕۆژا عەرەفێ بۆ مە تۆمار بکەت، بەلکی دا ئەو ڕابگەهینت ژی کو هندە ئێدی چو ترس ل سەر ئیسلامێ نەما، و دوژمن ژ براندنا وێ بێ هیڤی بوون..

بەری هنگی دستووری ئیسلامێ پارچە پارچە دهاتە خوارێ، و ترس ئەو بوو ژبیێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەری (ماددێن) ڤی دستووری ب دویماهی بێت، بەلێ ل ڕۆژا عەرەفێ خودایێ مەزن ب ڤێ ئایەتێ ڕاگەهاند کو هندە شریعەت تمام بوو، و ژ ئەڤرۆ وێڤە پشتی ڤی شریعەتی چو شریعەتێن دی یێن حەلالکرن و حەرامکرنێ ژ نک خودێ نائێنە خوارێ.

بەیانەکا مەزنە د دیرۆکا شریعەتێ عسمانی دا هاتییە ڕاگەهاندن، و مزگینییەکا بەرچاڤە کو ئاڤاهییێ ئیسلامێ تمام بوو، و نەیار ئێدی ژ هەرفاندنا ڤی ئاڤاهی بێ هیڤی بوون، لەو بلا موسلمان بزانن کو دینێ وان د گەل وان هەمی هێرشێن دژوار یێن دژمن دئینن سەر هەر دێ مینت..

بەلێ د گەل ڤێ بەیانا مەزن و ڤێ مزگینییا بەرچاڤ، عومەرێ کوڕێ خەططابی ئەوێ هنگی ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕاوەستای و گوهێ خۆ دایێ دەمێ وی ئەڤ ئایەتە دخواند، کرە گری.. بەلێ دەمێ عومەری گوه ل ڤێ ئایەتێ بووی کرە گری!

گەلەک کەسێن ئامادە گرییا عومەری ل ڤی مەوقفی ب تشتەکێ غەریب زانی، خۆ پێغەمبەری ب خۆ ژی -سلاڤ لێ بن- ڤیا تەئکید بکەت، کانێ عومەر وەسا د ئایەتێ گەهشت وەکی ئەو تێ گەهشتی یان ژی گرییا وی ژ بەر تشتەکێ دییە، لەو وی گۆتێ: عومەر! ئەو چ بوو گرییا تە ئینای؟ عومەری گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، دینێ مە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ زێدە دبوو، و ئەڤە ئەو تمام بوو، و پشتی تمامبوونێ کێمی دەست پێ دکەت. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تو ڕاست دبێژی!

مەعنا ئەو تشتێ عومەری ژ ئایەتێ ئینایەدەر، هەر ئەو بوو یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تێ ئینایەدەر، پشتی تمامییێ کێمی دەست پێ دکەت، و ئێکەمین کێمی ئەوە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ ناڤ وان بچت..

ئاخری کارێ وی نەما، ما نە کارێ وی ئەو بوو دینی بگەهینت؟ ئەڤە دین خلاص، ڤێجا چو مەعنا بۆ مانا وی نامینت!

هۆسا عومەرێ شارەزا د ئایەتێ گەهشت.. لەو ڕۆندکێن وی بارین.

### پێغەمبەر یێ ب ڕۆژی نەبوو:

بەری هنگی تشتەکێ ئاشکەرابوو ل نک موسلمانان کو گرتنا ڕۆژییێ ل ڕۆژا عەرەفێ خێرەکا مەزنە، ژ بەر هندێ گەلەک صەحبییان ئەڤ ڕۆژییا هە بۆ خۆ دگرت، بەلێ گومان بۆ هندەک ژ وان چێبوو کانێ گرتنا ڕۆژییا عەرەفێ بۆ وی مرۆڤێ ل عەرەفێ ژی بت سوننەتە یان نە، و هندی هند پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- وێ ڕۆژێ بەرقیبلە ما و دوعاکرن، کەسێ نەدیت وی تشتەک خواری یان ڤەخواری، لەو هندەکان هزر کر ئەو یێ ب ڕۆژییە، ژنماما وی (أم الفضل) ژنکا عەبباسی ڤیا ڤێ مەسەلێ تەئکید بکەت، لەو وێ ئامانەکێ شیری بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارت دەمێ ئەو ل سەر پشتا حێشترێ، کانێ دێ ڤەخوت یان نە.. و گاڤا وێ و خەلکی ژی دیتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو شیر ڤەخواری، وان زانی ئەو یێ ب ڕۆژی نینە.

### پێغەمبەر.. و داخوازکرنا ئوسامەی:

و دەمێ ڕۆژ بەر ب ئاڤابوونێ ڤە چووی، و نێزیکبووی ئەو دەم بێت یێ پێتڤییە حەجی ژ عەرەفێ بەر ب موزدەلیفەیێ بچن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل دەور و بەرێن خۆ زڤڕی، هەر وەکی ئەو چاڤێن خۆ ل ئێکی دگێڕت، پاشی گازی کر: کانێ ئوسامە؟

خەلکی گازی ئوسامەی کر.. ئوسامە د گازییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هات. ئوسامەیێ کوڕێ زەیدێ کوڕێ حارثەی، خۆشتڤییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و کوڕێ خۆشتڤییێ وی، و ئەو هنگی جحێلەکێ هەڤدە

هەژدە سالی بوو، و یێ ڕەش بوو، دەیک و بابێن وی هەردو عەبدبوون هاتبوونە ئازاکرن، دەیکا وی ئەو بوو یا شیر دایە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و بابێ وی ئەو بوو یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب خودانکری و تەبەنیبا وی کری، لەو خەلکی دگۆتێ: زەیدێ کوڕێ موحەممەدی.

پشتی ئوسامە هاتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ل پشت خۆ سویار کر.. بەلێ، ژ ناڤبەرا هەمی هەڤال و کەس و کارێن خۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ شەرەفا مەزن دا مرۆڤەکێ ڕەش، یێ خەلکێ وێ جڤاکێ ب چاڤەکێ کێم بەرێ خۆ ددایێ، هەر وەکی وی دڤیا ب ڤی کارێ خۆ بێژتە خەلکێ کۆمبووی هەمییێ: چێترینی ل نک مە موسلمانان نە ب ڕەنگی و ئەزمانی و نفشییە!

و بەری ڕۆژا عەرەفێ ئاڤا ببت، ب دەمەکێ کێم پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل خەلکی زڤڕی و گۆت: گەلی مرۆڤان! ئەوا مای ژ دنیایا هەوە بەرانبەر وێ یا ژێ چووی، هندی وێیە یا مای ژ ڤێ ڕۆژا هەوە. و دەمێ ڕۆژ ئاڤادبوو و خەلکی کارێ چوونێ دکر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە بیلالی خەلکی بۆ من بێ دەنگ بکە، و گاڤا ئەو بێ دەنگ بووین، وی گۆت: گەلی مرۆڤان! نوکە جبریل هاتە نک من و سلاڤێن خودایێ من گەهاندنە من و گۆت: خودێ گونەهێن خەلکێ عەرەفاتێ غەفراندن، و بارێ وان ژ سەر وان ڕاکر. عومەری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەڤە بۆ مە ب تنێیە؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەڤە بۆ هەوەیە و هەر ئێکێ پشتی هەوە بێت ژی حەتا ڕۆژا قیامەتێ.

پشتی ڕۆژ ئاڤابووی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە خەلکی: ب ناڤێ خودێ دەست ب چوونێ بکەن.. و ئەو د گەل ئوسامەی ب سویاری ژ عەرەفێ دەرکەفتن، و هێدی هێدی بەر ب موزدەلیفەیێ ڤە چوون.

### ل موزدەلیفێ:

ئوسامە دبێژت: ب رێڤە دەمێ ئەم گەهشتینە گەلییێ (ئذخر) ئەوێ دکەفتە بەری موزدەلیفێ، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بێنەکێ راوەستیا، تارەتا خۆ گرت و دەسنڤێژا خۆ گرت، من گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دێ نڤێژێ کەین؟ وی گۆت: نڤێژ ل پێشییا تەیە.. و ئەو جارەکا دی سویار بوو و بەر ب موزدەلیفێ ڤە چوو.

ل موزدەلفێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل نێزیکی چیایێ (قوزەحێ) راوەستییا، ل وی جهێ نوکە مزگەفتا (المشعر الحرام) لێ هەی، و ئێکەمین کارێ وی کری وی دەسنڤێژا خۆ نوی کر، و بیلالی بانگ دا، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نڤێژا مەغرەب سێ رکاعەت (جمع تأخیر) کر، پاشی وی نڤێژا عەیشا دو رکاعەت کرن، و چو سوننەت نەکرن. پشتی هنگی وی و صەحابییێن وی بارێن خۆ ڤەکرن، و ل موزدەلیفێ دانان.

دەیکا موسلمانان سەودایێ (و ئەو ژنکەکا گران و قەلەو بوو) دەستویری ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خواست کو وێ شەڤێ بچتە مینایێ بەری خەلک بچن و ببتە قەرەبالغ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دایێ، و پشتی هنگی عائیشایێ دگۆت: خوزی من ژی هنگی دەستویری ژێ خواستبا.

وێ شەڤێ هەمییێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل موزدەلیفێ نڤست، و بۆ کرنا عیبادەتی رانەبوو، و بەلکی ئەو جارا ئێکێ بت وی ئەڤ چەندە کری؛ ژ بەر کو رۆژا بەری هنگی ئەو زێدە وەستیابوو، و رۆژا پشتی هنگی هنگی کارەکێ مەزن ل بەراهییێ هەبوو، لەو وی دڤیا بێنا خۆ ڤەدەت، و لەشێ خۆ رحەت کەت.

بەری سپێدێ ئەو هشیار بوو، و وی فەرمان ل مامێ خۆ عەبباسی کر کو ئەو هندەک ژن و عەیالی یێن لاواز بەری وان ببەت، و گۆتێ: ڤان ژن و لاوازێن مە ببە، بلا ئەو نڤێژا سپێدێ ل مینایێ بکەن، و بەرکان بهاڤێژن بەری قەرەبالغا مرۆڤان بێت. و ژ وان یێن د گەل عەبباسی چووین: هەردو دەیکێن موسلمانان (أم حبيبة) و (أم سلمه) و عەبدللاهێ کوڕێ عەبباسی کو هنگی زارۆک بوو.

و گاڤا دەمێ نڤێژا سپێدێ هاتی، هەر زوی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نڤێژ کر، حەتا صەحابییان گۆت: مە دگۆت نزا سپێدە بوویە یان نە؟! و پشتی وی نڤێژ کری ئەو ل حێشترا خۆ سویار بوو و چوو ب سەر بەتەنەکا چیایێ قوزەح کەفت، ل هنداڤ خەلکی، و وی بەرێ خۆ ب نک قیبلێ ڤە دا و دەست ب دوعا کر، و ئەڤە ب جهئینانە بۆ فەرمانا خودێ: ﴿ فَإِذَآ أَفَضۡتُم مِّنۡ عَرَفَٰتٖ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِۖ وَٱذۡكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمۡ وَإِن كُنتُم مِّن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ۝ ﴾ (البقرة: ١٩٨) و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب ڤی رەنگی ما حەتا دنیا زەلال بووی، و نێزیک بوو رۆژ دەرکەفت.

پشتی هنگی وی داخواز ژ پسمامێ خۆ فەضلێ کوڕێ عەبباسی کر کو ئەو حەفت بەرکان بۆ وی ڤێدەت دا ئەو رەجمێ پێ بکەت، دەمێ فەضلی بەرک داینە ڤێ، و هەر ئێک ژ وان هندی نۆکەکێ بوو یان پیچەکێ مەزنتر، وی ئەو کرنە د دەستێ خۆ دا و پفکرێ، پاشی دەستێ خۆ بلندکر و گۆتە خەلکی: رەجمێ ب هندەک بەرکێن هۆسا بکەن، و هشیار بن شداندنێ د دینی دا نەکەن؛ چونکی شداندنا د دینی دا ئەوێن بەری هەوە برنە هیلاکێ.

پاشی وی پسمامێ خۆ فەضل ل پشت خۆ سویارکر، و بەری رۆژ بهەلێت وی دەوارا خۆ هاژۆت، و ئەو ژ موزدەلیفێ بەر ب مینایێ ڤە چوو،

و وی ب ڤێ چەندێ موخالەفا کافران کر؛ چونکی حەتا ڕۆژ نەهەلات با ئەو ژ موزدەلیفێ نەدچوونە مینایێ.

هنگی هندەک جحێلێن قورەیشییان ب پییان کرنە غار دا بەری خەلکی بگەنە مینایێ، و ئێک ژ وان ئوسامەیێ کوڕێ زەیدی بوو، ئەوێ ئێدی فەضلی جهێ وی ل سەر حێشترا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گرتی.

و گاڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گەهشتییە وێ نهالێ یا فیلێ ئەبرەهەیی لێ چوویە هیلاکێ، ئەوا دبێژنێ: (نهالا موحەسسر)، وی حێشترا خۆ ب لەز هاژۆت، دا زوی ژ وێرێ دەرباس ببت.

**ل مینایێ**:

و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب سویاری گەهشتە مینایێ، و ئەو بەر ب وی جهی ڤە چوو یێ ڕەجم لێ دئێتەکرن، ل عەقەبێ، پسمامێ وی فەضل -وەکی مە گۆتی- د گەل وی یێ سویار بوو، و بیلال و ئوسامە ژی د گەل دا بوون، ئێکی هەڤسارێ حێشترێ د دەستی دا بوو، و یێ دی پاتەک ل هنداڤ سەری گرتبوو دا سیبەرێ لێ بکەت.. و وی ل سەر پشتا حێشترێ بەرکێن خۆ هاڤێتن، و پشتی هاڤێتنا بەرکان ژ نوی وی تەلبییە ڕاوەستاند.

ل جهێ ڕەجمێ مرۆڤ ل دەور و بەرێن وی کۆمبوون، و کرە قەرەبالغ، وی گۆت: گەلی مرۆڤان، ئێک و دو نەکوژن، و بەرکێن خۆ ل ئێک و دو نەدەن، و ئەگەر هەوە بەرک هاڤێتن بلا ئەو دبچویک بن، و د کرنا حەجا خۆ دا هویـن چـاڤ ل من بکەن، چونکی ئەز نزانم بەلکی ئەز چو حەجێن دی ژ بلی ڤێ حەجا خۆ نەکەم!

و ئەڤە بۆ جارا دویێ بوو ئەو ڤێ ئیشارەتێ ددەتە خەلکی: ئیشارەتا کو بەلکی ئەڤە دەمێ خارخواستنێ بت.. و بەلکییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ ڤالاتییێ نائێت!

ل وێرێ کچەکا جحێل و خوشکۆک ب نک پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- هات، و فەضل -وەکی مە گۆتی- د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سەر حێشترێ پێ سویار بوو، و ئەو ژی جحێلەکێ سپی و تازە بوو، بەرێ کچکێ ما ل فەضلی و بەرێ وی ژی ما ل وێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەرزنکا فەضلی گرت و بەرێ وی دا لایێ دی، فەضل جارەکا ل وێ زڤڕی، پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- جارەکا دی بەرێ وی وەرگێڕا.. هنگی بابێ فەضلی عەبباس گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، تە ستوێ پسمامێ خۆ خوارکر! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: من کوڕەکێ جحێل و کچەکا جحێل دیتن، و ئەز پێ پشتڕاست نینم کو شەیطان نەشێتە وان.

هنگی کچکێ گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: فەرزا خودێ کو حەجە ل پیراتییێ گەهشتە بابێ من، و ئەو زەلامەکێ پیرە نەشێت خۆ ل سەر پشتا دەوارێ بگرت، ئەرێ چێ دبت ئەز پێش وی ڤە حەجێ بکەم؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بەلێ.

و دەمێ ئەم هزرا خۆ د ڤێ سەرهاتییێ دا دکەین، ئەم ژ چەند لایەکان ڤە ژێ عەجێبگرتی دبین.. تەواضوعا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و کو ئەو مرۆڤەکێ زڤڕ نەبوو حەتا کچەک و کوڕەک کارەکێ هۆسا ل نک وی بکەن، بێی هزرا غەزەبا وی بکەن! و نەرم و حەلیمییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د پەروەردەکرنا مرۆڤان دا، کو وی چو گۆتنێن ڕەق نەگۆتنە ڤان هەردو جحێلان، و نەگۆتە وان: ئەڤە سڤکییەکە هوین ب من دکەن، چاوا هوین ل دیوانا من کارەکێ هۆسا دکەن؟ و تێگەهشتن و ل بەرچاڤ وەرگرتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ تبیعەتێ گەنجان، و کو شیانا وان بۆ گرتنا دلچوونێن نەفسێ سستترە و مەیلا وان بۆ خۆشییێن دلی پترە. پشتی هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل پسمامێ خۆ زڤڕی و بەرێ وی وەرگێڕا، نە

ل کچکا بیانی؛ چونکی دبت پسمامێ وی تەحەممولا وی تشتی بکەت یێ کچکا بیانی نەکەت.

و ب ڕاستی ڤی دیمەنی و ڤی هەلویستی هژمارەکا دەرسێن پەروەردەیی تێدا هەنە، بۆ هەر کەسەکێ باش هزرا خۆ تێدا بکەت.

**خوتبا خاترخوساتنێ**:

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرکێن خۆ هاڤێتین، ئەو زڤڕی وی جهی یێ کو دێ لێ ئاکنجی بت ل مینایێ، جهێ نوکە مزگەفتا (ئەلخیف) دکەفتێ، و ئەو جهەکێ پیرۆز و کەڤنە، د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو حەفتێ پێغەمبەران نڤێژ ل وێرێ کرییە.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل وی جهی دانا، و وی موهاجر ل لایێ خۆ یێ ڕاستێ دانان و ئەنصار ل لایێ چەپێ، و خەلکێ دی ل دەور و بەرێن وان دانا، و دەمێ صەحابییان داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری کو ئەو جهەکی (یان مالەکێ) بۆ وی ل مینایێ بدانن دا ئەو وان ڕۆژان لێ بت، وی گۆت: نە، مینا جهێ وییە یێ زویتر بگەهتێ.. یەعنی: چو جه ژێ ملکێ کەسێ نینە دا ئەو ئاڤاهییان بۆ خۆ لێ ئاڤا کەت.

و دەمێ ڕۆژ بەژنەکێ دوییان بلند بووی، ل دەمێ تێشتەگەهێ، و ژ بیر نەکەن، ڕۆژ ڕۆژا ئێکێ یا جەژنێ بوو، ڕۆژا شەنبییێ دەهێ هەیڤا ذولحیججە ژ سالا دەهێ مشەختی، و جه مینایە، ل وی جهێ نوکە مزگەفتا (ئەلخەیف) دکەفتێ، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ڕابوو ڤە، و ل حێشترا خۆ (العضباء)ێ سویار بوو، خەلکی تێ ئینادەر کو هەر وەکی ئەو دێ تشتەکی بۆ وان بێژت، لەوا ئەو ل وی کۆمبوون، و وی گۆتە هەڤالێ خۆ جەریرێ کوڕێ عەبدللاهێ بەجەلی، و ئەو زەلامەکێ درێژ و دەنگ بلند بوو: خەلکی بۆ من بێ دەنگ بکە، وی د ناڤ خەلکی دا گازی کر: بێ دەنگ

بن! پێغەمبەرێ خودێ دڤێت بۆ هەوە باخڤت.. و ئەو هەمی بێ دەنگ بوون دا بێژی طەیر یێن ل سەر سەرێن وان!

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەست ب خوتبا خۆ کر، و وی د ڤێ خوتبا خۆ بەحسێ هژمارەکا مەسەلێن گرنگ کر[1]، ل ڤێرێ ئەم دێ ب کورتی ئیشارەتێ دەینە وان مەسەلان، و ب رەنگەکێ بەرفرەهتر دێ ل نک مەسەلەکێ راوەستین. ژ وان مەسەلان:

- وی خەلک ئاگەهدارکر کو ژ ئەڤ سالە وێڤەتر هەر هەیڤەک دێ ل جهێ خۆ بت، و ئەو عەدەتێ عەرەبان ل جاهلییەتێ دکر دەمێ وان هەر سال دەهـ رۆژ ل هەیڤەکێ زێدە دکرن، دا سالنامەیا قەمەری هندی سالنامەیا شەمسی لێ بێت، و ئەڤ چەندە دبوو ئەگەر کو هەیڤێن قەمەری (ب تایبەتی هەر چار هەیڤێن حەرام) هەر سال ژ جهەکی بچنە جهەکێ دی.. ئەڤ عەدەتە نەما، و ئێدی کار پێ نائێتەکرن[2].

- وەکی ل خوتبا رۆژا عەرەفێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خەلک ئاگەهدار کری کو خوین و مال و نامویسا وان ل سەر ئێک و دو حەرامە، وی ڤێ جارێ ژی ئەو چەندە دوبارەکر، و ئەڤە هندێ دگەهینت کو پاراستنا

---

(١) ئەو مەسەلێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ڤێ خوتبێ و خوتبێن دی ژی دا یێن وی ل حەجا خاترخواستنێ بۆ صەحابییان خواندین مە ب بەرفرەهی قەکۆلین ل دۆر کرییە د کتێبەکا تایبەت دا، ب ناڤێ (ل بەر سیبەرا هندەک خوتبێن پێغەمبەری) کو هێشتا چاپ نەبوویە.

(٢) تشتێ غەریب -وەکی زانایێن فەلەکێ دبێژن- ل ڤێ سالێ، سەرێ سالا قەمەری ئەوا عەربێن نەڤییێن ئیسماعیلی کار پێ دکر، و سەرێ سالا عبری ئەوا نەڤییێن ئیسحاقی کار پێ دکر، هەردویان پێکڤە دەست پێ کربوو، و بەلکی ئەڤە بت نهێنییا گۆتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ((إن الزمان قد استدار هيئته..)) بۆ زانینێن بەرفرەهـ ل دۆر ڤێ مەسەلێ هەچییێ بڤێت دشێت ل وێ کتێبێ بزڤرت ئەوا پتر ژ جارەکێ مە ئیشارەت پێ دای: (نتائج الأفهام في تقويم العرب قبل الإسلام) یا مەحموود پاشایێ فەلەکی.

رح و مال و ناموسا خەلكی گرنگییەكا زێدە ل نك پێغەمبەرێ ئیسلامێ هەیە.

- وی خەلك ئاگەهدار كر كو سێ كار هەنە دەغەلی ژ دلێ خودان باوەری دئیننەدەر، ئەو ژی ئەڤەنە: ئیخلاصا د كاری دا، و شیرەتكرنا مەزن و كاریدەستێن موسلمانان، و خۆدانا د گەل كۆما موسلمانان، ونەژێكڤەكرنا رێزا وان.

- وی دیار كر كو هەچییێ خەما وی ئاخرەت بت، خودێ كارێ وی دێ بۆ وی لێكدەت، و زەنگینیا وی دێ كەتە د دلی دا، و دنیاییێ بڤێت نەڤێت دێ گەهتە وی، و هەچییێ ئنیەتا وی دنیا بت، ئەوا وی بۆ خۆ كۆمكری ژی خودێ دێ لێ بژالە كەت، و فەقیری هەمی دەمان دێ ب ناف چاڤێن وی ڤە بت، چونكی دلێ وی دێ یێ فەقیر بت، و ئەوێ دلێ وی یێ برسی بت، چاڤێن وی قەت و قەت تێر نابن، و هند ژ دنیاییێ دێ گەهتێ هندی خودێ بۆ نڤیسی، چەند ئەو خۆ زەحمەت بدەت و خۆ بوەستینت فایدێ وی ناكەت.

- وی فەرمان ل موسلمانان كر كو ئەو گوهدارییا مەزنێن خۆ بكەن، ئەگەر خۆ عەبدەكێ حەبەشی ببتە مەزنێ وان، هندی ئەو كاری ب كیتابا خودێ بكەن.

- و وی ئەو ل فتنا دەجالی ژی هشیاركرن، و سالۆخەتێن وی بۆ وان ئاشكەراكرن؛ دا ئەو ب وی نەئێنە خاپاندن، دەمێ ئەو دئێت.

و مەسەلا مە دڤێت ئەم ل نك ڕاوەستین ئەو بوو یا وی ل دووماهییا خوتبا خۆ گۆتی، دەمێ گۆتی:

((گەلی مرۆڤان! ب خودێ ئەز نزانم، بەلكی پشتی ڤێ ڕۆژێ ئەز هەوە نەبینمە ڤە، ڤێجا خودێ رەحمێ ب وی ببەت یێ گوهـ ل گۆتنا من ببت، و وێ وەرگرت، و بگەهینت، چونكی دبت ئێك زانینەكێ هلگرت و ئەو یێ

زانا نەبت، و دبت ئێک زانینەکێ بۆ ئێکێ ژ خۆ زاناتر هلگرت.. گەلی مرۆڤان! ئەوێ ئامادە بلا بگەهینتە وی یێ نەئامادە، چونکی دبت هندەک ژ وان یێن ئاخفتن دگەهتێ پتر د ئاخفتنێ بگەهن ژ وان یێن گوهـ لێ دبن..))

پاشی وی بەرێ خۆ ب نک عەسمانی ڤە لێدا و گۆت: ((یا رەببی من گەهاند یا رەببی من گەهاند؟)).

خەلکی گۆت: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ..

وی سێ جاران گۆت: ((یا رەببی تو شاهد بە)).

و هندی هند وی د ڤێ خوتبا خۆ دا گازی ئوممەتا خۆ دکر و دەنگێ خۆ بلند و درێژ دکر و دگۆت: (یا أمتاه) بچویکەکی گۆتە دەیکا خۆ: دادێ! بۆچی ئەو هندە گازی دەیکا خۆ دکەت؟ دەیکا وی گۆتێ: ئەو گازی دەیکا خۆ ناکەت و نابێژت: (یا أماه)، ئەو یێ گازی ئوممەتا خۆ دکەت و دبێژت: (یا أمتاه).

د ڤێ گۆتنا خۆ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جارەکا دی ب ئاشکەرایی خەلک ئاگەهدار کر کو دەم دەمێ خاترخواستنێیە، و وەغەر یا نێزیکە، و دبت گەلەک کەس د ناڤ وان دا هەبن ئێدی وی نەبینن.. ڤێجا بلا ئەو گوهێن خۆ باش ڤەکەن کانێ دێ چ گوهـ لێ بن، و چاڤێن خۆ ژی باش ڤەکەن کانێ دێ چ بینن، دا ئەو وێ بۆ یێن پشتی خۆ ڤەگێڕن. و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعا بۆ وان کەسان کر یێن حەدیسا وی هل دگرن، و بۆ خەلکێ دی ڤەدگێڕن، دوعا کو خودێ ڕوییێن وان گەش بکەت..

و مەخسەدا وی ل ڤێری ب ڕویگەشییێ -وەکی زانا دبێژن- خوشکۆکییا سەرڤە و یا ڤەشارتییە، یەعنی: خودێ باوەریەکا وەسا بکەتە د دلێن وان دا، کو شوینوارێن وێ ل سەر ڕوییێن وان ئاشکەرا ببت، د دل دا ئەو هەست

ب خۆشی و رحەتی و دلفرەهییێ بکەن، و سەر و چاڤێن وان ژی ڕۆناهییا باوەرییێ ژێ بچت.. و ئەڤ دوعایە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ وانە یێن حەدیسێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بێ کێمکرن و زێدەکرن بۆ خەلکی ڤەدگوهێزن.

و ژ بەر کو خەلکی ب ئاشکەرایی تێ ئینادەر کو ئەو یێ خاترا خۆ ژ وان دخوازت، لەو وان دەست پێ کر و هەر ئێکی ژ لایێ خۆ ڤە هندەک پسیار ژێ کرن، ئێک ژ وان ئەڤە بوو زەلامەکی گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، تو شیرەتێ ب چ ل مە دکەی؟ وی گۆت: پەرستنا خودایێ خۆ بکەن، و هەر پێنج نڤێژێن خۆ بکەن، و هەیڤا خۆ بگرن، و ب دلەکێ خۆش زکاتا مالێ خۆ بدەن، و گوهدارییا مەزنێن خۆ بکەن، هوین دێ چنە بەحەشتا خودایێ خۆ. و گەلەک کەسان پسیارا کار و بارێن حەجێ ژێ کر و وی بەرسڤا وان دا.

**. دانا قوربانان:**

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ خوتبێ و بەرسڤدانا پسیارێن خەلکی خلاصبووی، ئەو چو وی جهی یێ دکەفتە ناڤبەرا مزگەفتێ و ڕەجما بچویک، و گۆت: بۆ من گازی بابێ حسەنی بکەن.. و دەمێ عەلی هاتی وی داخواز ژێ کر ئەو هاریکارییا وی د ڤەکوشتنا قوربانان دا بکەت.. و تشتێ ئەو کەسێن حازر حێبەتی کری ئەو بوو دەمێ حێشترێن قوربانی ئینانە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا ئەو وان سەرژێ بکەت، وان -و بێی کو ئێک بهاژۆت- وەسا خۆ نێزیکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر، دا بێژی یێ بەری ئێک و دو ڕادکەن، دا هەر ئێک زویتر ژ یا دی ببتە قوربان بۆ وی!

و تشتێ دی یێ کەسێن حاز و نەحازر ژی حێبەتی کرین ئەڤە بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شێست و سێ حێشتر ب دەستێ خۆ سەرژێکرن،

و گاڤا ئەو گەهشتییە ڤێ هژمارێ ئەو ڕاوەستییا و وی فەرمان ل عەلی کر کو قوربانێن مایی ڤەکوژت، و وی عەلی کرە شریک د قوربانێ خۆ دا.. و وی فەرمان ل عەلی کر کو ئەو گۆشتێ وان قوربانان ل سەر خەلکی بەلاڤ بکەت، و گۆتێ: ژ هەر قوربانەکێ مە پرتەکا گۆشتی بکەنە د ئامانەکی دا و بلێنن؛ دا ئەم ژێ بخوین و ئاڤکا وێ فرکەین. و وی دەستویری دا خەلکی کو ژ قوربانێ خۆ بخۆن، و بدەنە خەلکی و هندەکێ ژی بۆ خۆ ژێ ڕاکەن، و هشک بکەن، و وی ب خۆ وە کر.

## تراشینا سەری و دەرکەفتن ژ ئیحرامان:

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ دانا قوربانان خلاصبووی، ڤیا سەرێ خۆ بتراشت، و بەریەری کو موعەممەرێ کورێ عەبدللاهێ عەدەوی بوو مووسا خۆ ئینا و هات، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ سوحبەت گۆتێ: ئەی موعەممەر! ئەڤە پێغەمبەرێ خودێ گوهێن خۆ کرنە د دەستێ دا و دەستێ تە مووس یا تێدا.. موعەممەری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! ئەز ب خودێ کەمە ئەڤە نعمەتەکە خودێ دایە من. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: باشە ئەز خۆ نالڤینم بۆ تە. پاشی وی لایێ ڕاستێ یێ سەرێ خۆ ب نک بەریەری ڤە لێدا و گۆتێ: بتراشە.. و هنگی صەحابی لێ کۆمبوون و وان نەهێلا مویەکێ وی بکەفتە عەردی هەچی موییێ کەفتبا وان دەستێ خۆ ددا بەر و بۆ خۆ ڕادکر، و گاڤا بوویە دۆرا تراشینا لایێ چەپێ، وی گازی کر: کانێ ئەبوو طەلحە؟ و گاڤا ئەبوو طەلحە هاتی، وی مویێ لایێ چەپێ ژ سەرێ خۆ هەمی دا وی.

ئەبوو طولحەیێ ئەنصاری، زەیابێ ئەنەسێ کورێ مالکی بوو، و ئەو ئەو بوو یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەمەکی مایە ل مالا وی پشتی مشەختبوویە مەدینێ، هەر وەکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤیای ژ ناڤبەرا

هەمی صەحابییێن خۆ ڤی خەلاتی بدەتێ، و ئەو چوو و خەلاتێ وی د گەل دا، و وێ گاڤێ ئەگەر ئێکێ زێڕ و زیڤێ دنیایێ هەمی پێش وی خەلاتی ڤە دابایێ ئەو ل بەر نەدهات!

و کانێ چاوا صەحابییان موییێ سەرێ وی ل خۆ لێکڤەکر، وەسا وان پرتێن نینۆکێن وی ژی ل خۆ لێکڤەکرن دەمێ وی نینۆکێن خۆ تراشین.. و پشتی هنگی وی ئیحرامێن خۆ دانان، و دبت کو وی سەرێ خۆ ژی شویشت بت، و جلکێن خۆ کرنە بەر خۆ و دەیکا موسلمانان عائیشایێ هەردو دەستێن خۆ تژی مسک کرن و د سەرێ وی دان.

## ل حەرەما مەکەهێ:

پاشی ئەو سویاربوو، و جارەکا دی ئوسامەیێ کوڕێ زەیدی ل پشت خۆ سویار کر، و قەستا مەکەهێ کر، دا (طواف الإفاضة) بکەت و گاڤا ئەو گەهشتییە حەرەمێ وی ب پییان طەواف کر، و دەمێ خەلکی ب هاتنا وی زانی، لێ کۆمبوون و د گەل وی طەواف کر، و دەمێ وی دیتی بوو قەرەبالغ، و هنگی گۆپالەکێ وەک چەلاکان د دەستی دا بوو، وی گۆپالێ خۆ دگەهاندە روکنێ بەری و سەرێ گۆپالی ماچی دکر، و پشتی ئەو ژ طەوافێ خلاصبووی، و چونکی وی ئنیەتا (قیرانێ) ئینابوو، ئەو نەچوو سەعییێ، بەلێ وی فەرمان ل هەڤالێن خۆ کر هەچییێ (تەمەتتوع) کر بت، بچت سەعییێ بکەت.

پشتی طەوافێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوو وی جهی یێ مامێ وی عەبباسی و عەیالێ وی ئاڤا شرینکری لێ ددا حەجەییان[(١)]، و ئەو د چاڤێن عەرەبان دا کارەکێ پیرۆز و ب قەدر بوو، و عەبباسی ئەو ب میراتگری

(١) ژ بەر کو وان ئاڤ ژ بیرێن مەکەهێ دکێشا، و ئەو ئاڤەکا گەلەک شرین نەبوو، وان قەسپ و مویژ دکرە د ئاڤێ دا ببتە شەربەت و شرین ببت.

ژ عەبدلموطـطـەلبی وەرگرتبوو، عەبباس ل وی جهی بوو و ترارەک د دەستان دا شەربەت پێ ددا حەجییان، گاڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتییە نک عەبباسی، وی گۆتە کوڕێ خۆ فەضلی: هەرە مال نک دەیکا خۆ، و ڤەخوارنەکێ بۆ پێغەمبەری ژ وێرێ بینە.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: هەوجە ناکەت، ژ وێ بدە من یا تو ددەیە خەلکی. عەبباسی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، دەستێن خەلکی دچنە د ڤێ ئاڤێ دا، وی دوبارە گۆت: ژ وێ بدەنە مە یا هوین ددەنە خەلکی.. پاشی وی هندەک ژێ ڤەخوار، و ئەوا مایی دا ئوسامەیێ کوڕێ زەیدی.

پشتی هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوو نک بیرا زەمزەم، هندەک جحێلێن مالباتا عەبدلموطـطـەلبی ل سەر دەرێ بیرێ بوون، وان ئاڤ ب سەتلان دکێشا و ب تراران ددا خەلکی، وی هندەک ئاڤ ژ دەستێ وان وەرگرت و ڤەخوار، پاشی هندەک هێلا د دەڤێ خۆ دا و جارەکا دی بەردا د بیرێ دا، دا بەرەکەتا وی بکەفتێ، و وی گۆتە مالباتا عەبباسی: ئەگەر نە ژ بەر هندێ با دا خەلک دا ململانێ د گەل هەوە کەن سەرا کێشانا ئاڤێ ژ بیرێ، ئەز ب خۆ دا چمە د بیرێ دا و دا وەریسی دانمە سەر ڤێرێ.. و ئیشارەت دا سەر ملێ خۆ.

**زڤڕین بۆ مینایێ:**

پشتی هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زڤڕی مینایێ، و ل وی جهێ نوکە مزگەفتا خەیف لێ هاتییە ئاڤاکرن، وی نڤێژا نیڤرۆ دو رکاعەت ب جماعەت ل بەرا خەلکی کر.. و ڕۆژا خۆ هەمی وی ب زکر و تەکبیرات ڤە بۆراند، و وی کۆمەکا صەحابییان وەکی: عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی و ئەبوو هورەیرەی و عەبدللاهێ کوڕێ عومەری و سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی هنارتنە دۆل و نهالێن مینایێ دا د ناڤ خەلکی دا ڕاگەهینن کو

((ژبلی نەفسا خودان باوەران کەس ناچتە بەحەشتێ، و ڕۆژێن مینایێ ڕۆژێن خوارن و ڤەخوارنێنە و ڕۆژێ تێدا چێ نابن)).

و هەر سێ نڤێژێن دی ژی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وێ ڕۆژێ ل بەرا صەحابییان کرن هەر ئێک ل دەمێ وێ، بەلێ وی نڤێژێن چار ركاعەت كورت دكرن، و دكرنە دو ركاعەت. و ب ڤێ چەندێ ڕۆژا ئێکێ یا جەژنا قوربانی ب دووماهی هات و وێ شەڤێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مینایێ نڤست.

ل ڕۆژا دی، ئێکشەنبێ یازدەی هەیڤا ذولحججە، ل دەمێ تێشتەگەهێ جارەکا دی خوتبەک بۆ خەلکی خواند، و ڤێ جارێ عەلی دەنگێ وی دگەهاندە خەلکی، و د ڤێ خوتبێ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چەند مەسەلەک گۆتن:

- وی بۆ جارا سێیێ، و سێ ڕۆژان ل دویڤ ئێک، موسلمان ئاگەهدارکرن کو خودێ خوین و مال و نامویسا وان ل سەر وان حەرام کرییە وەکی حەرامییا ڕۆژ و هەیڤ و باژێرێ ئەو لێ.

- و وی ب وان دا زانینێ کو خودایێ هەمی مرۆڤان ئێکە، و بابێ وان ئێکە، ئەو ژ ئادەمینە و ئادەم ژ ئاخێیە، و مرۆڤێ عەرەب یێ چێتر نینە ژ یێ نەعەرەب، و یێ نەعەرب چێتر نینە ژ یێ عەرەب، و یێ سپی و یێ ڕەش ژی هەر وەسا، ب تەقوایێ تێ نەبت.

- و وی ئەو شیرەت کرن کو ئەو د گەل عەبدێن خۆ دباش بن، و هەر ئێکێ خۆ بۆ ئێکێ دی ژ بلی بابێ خۆ پالدەت ئەو یێ لەعنەتییە.

و دەمێ وی ئەڤ خوتبە خواندی ئەو ل سەر هێسترەکا سپی بوو.

و گاڤا ڕۆژ ژ نیڤا عەسمانی وەرگەڕیای ئەو چوو ڕەجمێ بکەت، و ل نک هەر سێ ڕەجمان: یا بچویک، پاشی یا ناڤێ، پاشی یا مەزن وی

بەرک هاڤێتن، و زڤڕی جهێ خۆ، و وێ شەڤێ ژی ئەو ما ل مینایێ. و ڕۆژا د دویڤ دا کو دبوو ڕۆژا دوشەنبێ، دوازدەی هەیڤێ، پشتی نیڤرۆ بووی، ئەو چوو رەجمێ و ل نک هەر سێ جهان دیسا وی بەرک هاڤێتن، و زڤڕی، و دەمێ ئەو دچوو دا رەجمێ بکەت ئەو پەیا دچوو و هندەک جاران ل زڤڕینێ ئەو سویار دبوو.. و جارەک ژ ڤان هەردو جارێن ئەو چوویە رەجمێ، زەلامەکی ل نک رەجما بچویک پسیار ژێ کر: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، کیژ جیهاد ژ هەمییان چێترە؟ وی بەرسڤ نەدا، و رەجم کر، و گاڤا وی رەجما ناڤێ کری وی زەلامی پسیارا خۆ دوبارە کر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیسا بەرسڤا وی نەدا، و پشتی وی رەجما مەزن کری، و دەمێ پییێ خۆ دانایە سەر ڕکێبێ دا سویار بت، وی گۆت: کانێ ئەوێ پسیار ژ من کری، وی زەلامی گۆت: ئەڤە ئەزم ئەی پێغەمبەرێ خودێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: باشترین جیهاد ئاخفتنا حەقییێیە یا ل نک سولطانەکێ زالم دئێتە گۆتن.

شەڤا دوازدێ ل سەر سێزدێ ژی دوشەنبێ ل سەر سێشەنبێ، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ما ل مینایێ، و سێشەنبێ سێزدەی هەیڤا ذولحججە، پشتی وی بەرکێن خۆ هاڤێتین، و بەری نڤێژا نیڤرۆ، ئەو ژ مینایێ دەرکەفت، و زڤڕی جهێ خۆ یێ بەری ڕۆژا عەرەفێ ژێ چووی، ئەو جهێ دبێژنێ: (ئەبطوح).

## جارەکا دی ل ئەبطوحێ:

و هەژی گۆتنێیە کو ئەو جهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لێ دانای پشتی ژ مینایێ دەرکەفتی، ئەو جه بوو یێ ل دەسپێکا هاتنا ئیسلامێ قورەیشی لێ کۆمبووین و بڕیار دای حیصارێ بدانن سەر مالباتا هاشمی و موطەلبییان.. لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕۆژا بەری هنگی گۆت:

سوباهی ئەم دێ ل لاتا بەنی کینانەی دانین، ئەو جهێ ئەو ل سەر کوفرێ پێکهاتین.

ئەو جهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل نێزیکی وی دانای یێ دویر بوو ژ مزگەفتا حەرام، ژ لایێ باکووری ڤە، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە خەلکی: کەس نەزڤڕت حەتا کارێ وی یێ دووماهییێ طەوافا ل دۆر بەیتێ بت. ل ڤی جهێ مە بەحس ژێ کری پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی دانا، و وی نڤێژا نیڤرۆ و ئێڤاری و مەغرەب و عەیشا ل وی جهی کر.

## مەسەلا عائیشایێ و صەفییایێ:

دەمێ صەحابییان زانی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ کارێ زڤڕینێ بۆ مەدینێ دکەت، عائیشا وێ شەڤێ هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەو یا خەمگین، و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پسیارا ڤێ چەندێ ژێ کری، وێ گۆت: خەلک دێ زڤڕنە مالێن خۆ و وان حەجەک و عومرەک یا کری، و ئەز دێ زڤڕمە ڤە و من حەجەک ب تنێ یا کری. و بەلکی مەخسەدا وێ ب خەلکی هەوییێن وێ یێن دی بن!! چونکی حەجا وان (تەمەتتوع) بوو، یەعنی: وان عومرەک ب سەرێ خۆ کربوو، و ئەو ژ ئیحرامان دەرکەفتبوون، پاشی ل دەمێ حەجێ وان جارەکا دی ئیحرام کرنە بەر خۆ و حەج کر. عائیشا تێ نەبت وێ ئەڤ چەندە نەکربوو چونکی حەجا وێ (قیران) بوو، و ئەگەرا ڤێ چەندێ ئەو بوو بەری دەسپێکرنا حەجێ عائیشا بێنڤێژ بووبوو.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەو طەوافا تە ل دۆر بەیتێ کری بۆ حەجێ و عومرێ تێرا تە هەیە.. بەلێ وێ قەبویل نەکر! و چونکی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مرۆڤەکێ ب ساناهی بوو، وی گۆتە عەبدرڕەحمانێ برایێ

عائیشایێ: خویشکا خۆ ببەت تەنعیمێ بلا ئەو ل وێرێ ئیحرامێ بۆ عومرێ بینت، پاشی هەرن عومرا خۆ بکەن، و ئەز ل ڤێرێ دێ ل هیڤیيا هەوە بم.

وان وە کر.. و پشتی ئەو ژ عومرا خۆ خلاصبووین ئەو زڤڕینە وی جهی یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- لێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: هوین خلاصبوون؟ وێ گۆت: بەلێ. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەڤە پێش عومرا تە ڤە.

ل وی دەمێ عائیشا و برایێ خۆ چووین دا عومرێ بکەن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چەندەکێ نڤست. و دەمێ شەڤ ژ نیڤێ بۆری، ئەو ڕابووڤە و صەحابییێن خۆ ئاگەهدارکرن کو ئەو دێ چنە کەعبێ طەوافا خاترخواستنێ کەن، دا پشتی هنگی قەستا مەدینێ بکەن.

ل وی دەمێ خەلکی کارێ خۆ دکر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژنکا خۆ صەفییا دیت یا ل بەر دەرێ خیڤەتا خۆ ڕوینشتی و ئەو یا ب خەمە، و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پسیارا وێ چەندێ ژێ کری، وێ گۆت: ئەز دبێژم ئەز دێ هەوە گیرۆ کەم! و ئەڤە ژ بەر هندێ بوو چونکی ئەو کەفتبوو د عادەی دا، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ما ڕۆژا جەژنێ تە طەواف نەکربوو؟ وێ گۆت: بەلێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: قەیدی ناکەت، تو طەوافا خاترخواستنێ نەکە.

و (أم سلمە)یێ گۆتێ: ئەز یا نەخۆشم و ئەز نەشێم طەوافێ د گەل خەلکی بکەم. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: دەمێ خەلک نڤێژا سپێدێ دکەن تو ل سەر حێشترا خۆ ل پشت وان طەوافێ بکە.

ل دووماهییا شەڤێ، شەڤا چاردەی ذولحججە، سێشەنبێ ل سەر چارشەنبێ، مەوکبێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل صەحابییێن وی بەر ب کەعبێ ڤە چوو، دا کو طەوافا خاترخواستنێ بکەن.

## نڤێژا دووماهییێ ل مەکەهێ و طەوافا خاترخواستنێ:

ل سەحەرێ، بەری سپێدەیا چارشەنبێ بهەلێت، مەوکبێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەکی (نەسیمێ سەحەرێ) ب سەر مالا خودێ یا پیرۆز دا هات، ل وی دەمێ سپێدێ کارێ خۆ دکر دا ب ڕۆناهییا خۆ ڤە دنیایێ گەش بکەت، پێغەمبەرێ خودێ د گەل کۆما هلبژارتی یا صەحابییێن خۆ مزگەفت ب ڕۆناهییا خۆ گەش کر.. و بۆ جارا دووماهییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چاڤێن خۆ ب دیتنا وان جهێن پیرۆز تژی کر، بۆ جارا دووماهییێ؛ چونکی پشتی ڤێ جارێ دەستێ وی ژ مەکەهێ ڤەقەتیا، ئەو جهێ پێنجی و سێ سال ژ عەمرێ خۆ وی ل سەر ئاخا وێ بۆراندی، و ل جهەکێ دویر وی وەغەرا خۆ یا دووماهییێ کر.

و سپێدە بوو، بانگ هاتەدان، و دەست ب نڤێژێ هاتەکرن.. و ئەو دووماهی نڤێژ بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل مزگەفتا پیرۆزا مەکەهێ کری د ناڤبەرا (حەطیم و بەری) دا، و دەمێ خەلکی دەست ب نڤێژا سپێدێ کری، دەیکا موسلمانان (ئوم سەلەمەیێ) ل پشت وان ب سویاری طەواف کر، (ئوم سەلەمە) دبێژت: من گوهـ ل پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- وی د نڤێژێ دا سوورەتا (الطور) دخواند. و پشتی نڤێژا سپێدێ ب دووماهی هاتی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەست ب طەوافا خاترخواستنێ کر، و ئەو ئێک ژ واجباتێن حەجێیە، و دەمێ ئەو ژ طەوافێ خلاصبووی، ئەو چوو (مولتەزەمی) -ئەو جهێ دکەفتە ناڤبەرا بەرێ ڕەش و دەرگەهێ کەعبێ- و وی سنگێ خۆ و دێمێ خۆ ب دیوارێ کەعبێ ڤەنا، و بێنەکا خۆش دوعا کرن. پاشی ژ لایێ بنی یێ مزگەفتێ دەرکەفت و د ڕێکا (کودایێ) ڕا چوو، و زڤڕی سەر ڕێکا مەدینێ، و بۆ دەمەکی وی ل (ذي طوی) دانا، دا کو ئەو صەحابییێن گیرۆ بووین هەمی بگەهنێ.

پشتی هنگی هەر ل وێ ڕۆژێ، چارشەنبێ چاردەی هەیڤا ذولحججە، کاروانێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ژ مەکەهێ دەرکەفت و بەر ب مەدینێ ڤە زڤڕی.

**خوتبا** (**غدیر خم**):

ب ڕێڤە، دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ژ حەجێ دزڤڕینە مەدینێ، و پشتی دەرکەفتنا وان ژ مەکەهێ ب چار ڕۆژان، یەعنی: ل نیڤا ڕێ، و ب دورستی ل ڕۆژا ئێکشەنبێ هەژدەی هەیڤا ذولحججە، ئەو گەهشتنە جهەکی دبێژنێ: (غەدیروخوم) کو دکەفتە ڕۆژهەلاتا (جوحفە) ل نێزیکی دەریایا سۆر.. ل وی جهی وەفدەک ژ لایێ یەمەنێ ڤە هات و گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و وان هندەک گازندە ژ عەلی کرن، کو وی عەدالەت نەکرییە، و بەری نوکە مە ئاشکەرا کربوو کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەلی هنارتبوو یەمەنێ، و بەری حەجێ ئەو زڤڕی و ل مەکەهێ گەهشتبوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ئەو ب خۆ مەسەلە یا وەسا نەبوو وەکی وان مرۆڤان گۆتی ئەوێن ژ یەمەنێ هاتین.. گاڤا ڕاستی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیاربووی، و وی زانی کو عەلی یێ بێ گونەهە و ئەوا وی کری عەدالەتە، وی داخواز کر خەلک هەمی بێنە کۆمکرن، و وی خوتبەک بۆ وان خواند، و تشتێ ژ هەمییێ بەرچاڤتر د ڤێ خوتبێ دا بەرەڤانییا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- ژ ئیمام عەلی، حەتا وی گۆت: ((هەچییێ ئەز خودان و سەروەرێ وی بم، عەلی خودان و سەروەرێ وییە))، هەر وەسا وی تەئکید ل صەحابییێن خۆ کر کو ئەو خۆ ب کیتابا خودێ ڤە بگرن، و بهایێ مالباتا وی بزانن.

و چو دەلیل د ڤێ خوتبێ دا بۆ وان بەختڕەشان نینە ئەوێن نەڤیانا صەحابییان بۆ خۆ کرییە دین و بێبەختی بۆ خۆ کرییە ڕێباز کو دڤێت ئیمام

عەلی پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ببتە خەلیفە، بەلکی ئەو بهاٌ و قەدر و عەدالەتا ئیمام عەلی -خودێ ژێ رازی بت- بەرچاڤ دکەت.

ل مەدینێ:

پشتی هنگی ب چار رۆژان، یەعنی: ل پێنجشەنبێ (٢٢) هەیڤا ذولحججە، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زڤڕی مەدینێ، و ئەو رۆژا ئەو گەهشتیە مەدینێ، ژ بەر نساخییەکێ سەرێ وی و لەشێ وی ئێشا، وی هزر کر ئەڤ نساخییە ژ بەر وەستیانا سەفەرێیە؛ چونکی پشتی هنگی ب دەمەکێ کێم ئەو ئێشان ل نک نەما.

رۆژێن مایین ژ ڤێ سالێ، کو نێزیکی حەفتییەکێ بوون، ئەوی ل مەدینێ بۆراندن.

ژ رویدانێن هێژای گۆتنێ کو ل ڤی دەمی چێبووین، ئەوە: ل هەیڤا ذولحججە ژ ڤێ سالێ، (موسەیلەمەیێ درەوین) ل (یەمامە) ئەوێ دکەفتە وەلاتێ نەجدێ ل رۆژهەلاتا مەدینێ دەرکەفت، و گۆت: ئەز ژی پێغەمبەرم، و پشتی موحەممەدی پێغەمبەراتی یا منە.. و وی ل ڤێ هەیڤێ کاغەزەک بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارت بۆ هندێ دا بێژتێ: ئەز شریکێ تەمە د ڤی کاری دا، نیڤەک بۆ من نیڤەک بۆ تە. و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرسڤا وی دا کو کار هەمی یێ خودێیە، و د بەرسڤا خۆ دا بۆ وی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناسناڤێ (الكذاب) دانا سەر. ئەڤ درەوینە ل دووماهییا سالا د دویڤ دا، ل سەر زەمانێ خیلافەتا ئەبوو بەکری ب دەستێ موسلمانان هاتە کوشتن.

## سەرهاتییێن سالا یازدێ

ل (٢٨) ئادارا سالا ٦٣٢ زایینی سالا یازدێ مشەختی دەست پی کر، و دەمێ ڤێ سالێ دەست پێ کری ئەو نێزیکی حەفییەکێ بوو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مەکەهێ زڤڕییە ڤە پشتی وی و ب هزاران مرۆڤان حەج کری، ئەو حەجا د کتێبێن سیرەتێ دا ناڤێ حەجا خاترخواستنێ ل سەر هاتییە دانان.

سالا یازدێ ئێک ژ وان سالانە یێن گەلەک ڕویدانێن مەزن تێدا چێبووین، و مەزنترین ڕویدان یا موسلمان هەمی هژاندین ڕویدانا وەغەرکرنا پێغەمبەرێ خودی بوو -سلاڤ لێ بن- و ئەو سەرهاتییێن د دویڤ دا هاتین، وەکی دێ بۆمە ئاشکەرا بت.

**پەیدابوونا ئەسوەدێ عەنسی**:

ل هەیڤا موحەررەمێ ژ ڤێ سالێ مرۆڤەک ل لایێ یەمەنێ دەرکەفت دبێژنێ: (الأسود العنسی) گۆت: ئەز پێغەمبەرم، و هژمارەکا مرۆڤێن وی باوەری پێ ئینا و ب دویڤ وی کەفتن، و هێرش دانە سەر موسلمانان و والی و مەزنێن وان یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتینە وێرێ، کو ئێک ژ وان موعاذێ کوڕێ جەبەلی بوو، و دەڤەرا نەجرانێ و صەنعائێ نێزیکی سێ هەیڤان ب تمامی کەفتە دەستی، و فتنا وی مەزن و بەرفرەه بوو.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کاغەزەک بۆ موسلمانێن وی جهی هنارت کو شەڕێ وی بکەن.. پاشی خودێ وەسا حەز کر پشتی دەرکەفتنا وی ب نێزیکی سێ هەیڤان هندەک مرۆڤێن نێزیکی وی ب شەڤ ب سەر وی دا

گرت د مالا وی دا و ئەو کوشت، و ب کوشتنا وی هەڤالێن وی بژاله بوون، و هێزا وان نەما، و موسلمان جارەکا دی زڤڕینە سەر کارێ خۆ، و کوشتنا وی بەری مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب چەند ڕۆژەکان بوو، وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هات کو ئەسوەدێ درەوین هاتە کوشتن، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگینییا کوشتنا وی دا موسلمانان ل مەدینێ، و ل دووماهییا هەیڤا (رەبیعولئەووەلێ) یەعنی: پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب نێزیکی بیست ڕۆژان هندەک موسلمان ژ یەمەنێ هاتنە مەدینێ و مزگینییا ڤەمرینا فتنا ئەسوەدێ عەنسی گەهاندە خەلیفێ موسلمانان ئەبوو بەکری.

**بەرهەڤکرنا لەشکەرێ ئوسامەی:**

ل هەیڤا صەفەرێ ژ سالا یازدێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا لەشکەرەکی ئامادە بکەت و بۆ شەڕێ ڕۆمێ بهنێرتە شامێ، و د ناڤ ڤی لەشکەری دا هژمارەکا مەزنێن موهاجر و ئەنصارییان هەبوون، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان دا ئوسامەیێ کوڕێ زەیدی ببەتە مەزنێ ڤی لەشکەری، و ژییێ ئوسامەی هنگی هەژدە (یان بیست) سال بوو.

و دەمێ موسلمانان کار بۆ ئامادەکرنا ڤی لەشکەری دکر، نساخییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەست پێ کر، ژ بەر ڤێ چەندێ بەرهەڤبوونا لەشکەری و دەرکەفتنا وی چەندەکێ گیرۆ بوو، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د سەر نەخۆشییا خۆ ڕا ب ڤێ چەندێ نەخۆش بوو، لەو وی فەرمان ل موسلمانان کر کو ئەو لەشکەری ئامادە بکەن و بهنێرن، و نساخییا وی نەکەنە هێجەت بۆ نەهنارتنا لەشکەری، وەکی دێ بۆ مە دیار بت دەمێ ئەم بەحسێ ڕۆژانێن وەغەرێ دکەین.

موسلمانان فەرمانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب جهئینا، و سێ هزار لەشکەر ل ژێر سەرۆکاتییا ئوسامەی هاتنە بەرهەڤکرن، و ئەو ژ باژێرێ مەدینێ دەرکەفتن ژی، بەلێ پشتی چوونا وان ب قویناغەکێ خەبەر گەهشتە وان کو ئێش ل سەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گرانبوو، و دویر نینە ئەوا ئەو نوکە تێدا سەکەرات بت، لەو وان ل جهەکێ نێزیکی مەدینێ دانا، دا بەرێ خۆ بدەنێ کانێ مەسەلە دێ چ لێ ئێت.

# نساخیيا مرنێ و ڕۆژا وەغەرکرنێ

ل دەمێ حەجا خاترخواستنێ -وەکی بۆری د گەل مە- پتر ژ جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیشارەت دانە هندێ کو چو نەمایە ئەو دێ وەغەرکەت، هەر وەکی وی دڤیا ب ڤێ چەندێ صەحابییێن خۆ ژ لایێ نەفسی ڤە بۆ ڤێ موصیبەتا مەزن ئامادە بکەت؛ چونکی وی باش دزانی فیراقا وی بۆ دلێن وان دێ ئەو دربێ دژوار بت یێ د گاڤێ دا دلی دکەتە دوکەر! و تیرێ فیراقێ دەمێ ب خافلەتی ڤە دئێتە وەشاندن، چو دل نینن بشێن خۆ ل بەر بگرن، ئەگەر خۆ ئەو دل د موکومییا خۆ دا چیا بت:

**خەدەنگا فورقەتێ رەعدە دلێ ئەو غەفلەتێ لێ دت**

**دبێژم: وەر جەبەل بت ئەو بکەربت وێ د گاڤێ دا**

و نە بەس پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دل و هەست و نەفسێن وان بۆ ڤی خەبەرێ موصیبەتێ بەرهەڤ دکرن، بەلکی بەری وی خودایێ مەزن ب خۆ ژی بیرا وان ل ڤێ چەندێ دئینا ڤە، دەمێ دگۆتە پێغەمبەرێ خۆ: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾ (الزمر: ٣٠) هندی تویی تو دێ مری، و هندی ئەون ئەو ژی دێ مرن. و دەمێ دگۆتە صەحابییان: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ ﴾ (آل عمران: ١٤٤) هەما موحەممەد پێغەمبەرەکە وەکی پێغەمبەرێن بەری خۆ پەیاما خودایێ خۆ دگەهینت. ئەرێ ڤێجا ئەگەر ئەو ب ڕۆژا خۆ مر، یان ژی هاتە کوشتن، هوین دێ ژ دینێ خۆ زڤڕنەڤە، و وێ هێلن یا پێغەمبەرێ هەوە بۆ هەوە پێ هاتی؟

د گەل کو صەحابییان ئەڤ ئایەتە سپێدە و ئێڤاران دخواندن، و خۆ پێ نیزیکی خودێ دکر، و د گەل کو وان دزانی کو کەس نینە ژ مرنێ ڤالا ببت،

بەلێ ڕۆژەک ژ هەیڤا ڕەبیعولئەووەلا ڤێ سالێ ب سەر وان دا هات، مەدینە -وەکی ئەنەس دبێژت- د چاڤێن وان دا تاری بوو، کەسێ باوەر ژ چاڤ و گوهێن خۆ نەکر، و هەر ئێکی دڤیا ڤی خەبەری درەو دەربێخت یێ وان گوهـ لێ بووی!

هندەک ژ وان دەمێ هەوارێن خۆ برینە نک دلێ خۆ، دا دل هندەک صەبرێ بدەتێ، دیت دل یێ وان ژ صەبرێ بێ هیڤی دکەت:

شكوتُ إلى قلبـي الفـراقَ فقـال لي     مِن الآن فَيْأس لا أغُـرّك بالصـبرِ

من گازندەیا خۆ ژ فیراق و جودابوونێ گەهاندە دلێ خۆ، دلێ من گۆتە من: ئێدی ئەز تە ب صەبرێ ناخاپینم، ژ ئەڤرۆ وێڤە بێ هیڤی ببە، ویصال نەما!

إذا صَدّ مَنْ أهْوَى وأسـلمني العـزا     ففُرْقة من أهوى أحرُّ مـن الجمـر

ئەگەر ئەوێ من دڤێت پشتا خۆ دا من و چوو، و ئەز هێلامە ب هیڤیا هندێ ڤە کو صەبرا خۆ بینم، هنگی فیراقا وی یێ من دڤێت ل سەر دلێ من ژ پەلێ گەرمترە..

و ئەگەر ئەڤە حالێ فیراقێ د گەل دلێن عاشق بت ب گشتی، پا هوین چ دبێژن ئەگەر خۆشتڤی پێغەمبەر بت؟ ئەوێ پەیوەندییا عەردی ب عەسمانی ڤە گرێددا، و ئەو ڕۆژا ڕۆناهی و تێن ددا ژیانێ؟ و ئەگەر حەژێکەر هندەکێن وەکی صەحابییان بن؟

وان دزانی کو وەغەر تشتەکێ (حەتمییە) و دێ هەر ئێت، بەلێ وان هزر نەدکر ئەو هندە دێ یا نێزیک بت، لەو دەمێ ئەو هاتی وان نەڤیا باوەر ژ هاتنا وێ بکەن.. بەلێ حوکمێ قەدەرێ دەمێ هات فایدێ تە ناکەت تو باوەر ژ هاتنا وی بکەی یان نە!

**دووماهییا صەفەرێ:**

بەری هەیڤا صەفەرێ ب دووماهی بێت، ل وی دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ موژیل ب ئامادەکرنا لەشکەرێ ئوسامەی ڤە دا بهنێرتە شامێ، ئەو ب دو سەرەدانان بۆ مرییان ڕابوو، هەر وەکی وی ب ڤێ چەندێ خاترا خۆ ژێ دخواست.

**یا ئێکێ: سەرەدانا وی بوو بۆ شەهیدێن ئوحودێ:**

بوخاری و موسلم ژ عوقبەیێ کوڕێ عامری ڤەدگوهێزن، دبێژت: هەشت سالان پشتی شەڕێ ئوحودێ (و ئاشکەرایە ئەڤە دبتە سالا یازدێ) پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- وەکی وی یێ خاترا خۆ ژ ساخ و مرییان دخوازت، ڕۆژەکێ چوو نڤێژا مری ل سەر کوشتییێن ئوحودێ کر، (و بەلکی مەخسەدا وی ئەو بت دوعا بۆ وان کرن، وەکی هندەک زانا دبێژن)، و پشتی ئەو زڤڕی هاتە مزگەفتێ و ب سەر مینبەرێ کەفت، و گۆت: ئەز بەری هەوەمە (یان بەری هەوە دێ چم) و ئەز دێ بمە شاهد ل سەر هەوە، و ژ ڤانێ من و هەوە حەوضە (یەعنی: حەوضا کەوثەرێ)، و ب خودێ ئەز ڤێ گاڤێ ژ ڤی جهێ خۆ یێ بەرێ خۆ ددەمە حەوضا خۆ، و کلیلێن خزینەیێن عەردی بۆ من هاتنەدان، و ئەز ب خودێ کەمە ئەز ژ شرکێ ناترسم ل سەر هەوە، بەلێ ئەز دترسم دنیا ل بەر هەوە ڤەببت ڤێجا هوین ململانێ ل سەر بکەن، و شەڕێ ئێک و دو سەرا بکەن، ڤێجا هوین ژی وەکی یێن بەری خۆ بچنە هیلاکێ. عوقبە دبێژت: و ئەو جارا دووماهییێ بوو من پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل سەر مینبەرێ دیتی.

**یا دویێ: سەرەدانا وی بوو بۆ زیارەتێن بەقیعێ:**

بەقیع ئەو گۆڕستانە یا -ل وی دەمی- دکەفتە ڕۆژهەلاتا باژێرێ مەدینێ، و موسلمانان مرییێن خۆ لێ ڤەدشارتن، و زیارەتێن گەلەک

ژ خەلکێ مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی لێنە..
مەولایێ پێغەمبەری (ئەبوو موەیهیبە) دبێژت: شەڤەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هات ئەز هشیارکرم و گۆت: وەرە دا بچینە بەقیعێ، فەرمان یا ل من هاتییەکرن کو ئەز داخوازا غەفراندنێ بۆ وان بکەم. گۆت: گاڤا ئەم چووینە ناڤ زیارەتان، وی دەستێن خۆ بلندکرن و دەمەکێ درێژ دوعا بۆ کرن، پاشی گۆت: بلا کەیفا هەوە ب وێ بێت یا هوین ژبلی خەلکی گەهشتینێ، فتنە ئێک ل دویڤ ئێکێ وەکی کەرتێن شەڤا تاری یێ دئێن، یا پاشییێ ژ یا پێشییێ خرابترە.. پاشی وی گۆت: ئەی ئەبوو موەیهیبە، کلیلێن خزینێن دنیایێ و مانا د دنیایێ دا پاشی بەحەشت بۆ من هاتەدان، کو ئەز وێ هلبژێرم یان لیقائا خودایێ خۆ و بەحەشتێ.

یەعنی: هلبژارتن بۆ من هاتەدان کو ئەز دنیایێ و هەرمانا تێدا بۆ خۆ راکەم، یان قەستا لیقائا خودی بکەم.. و هوین چ دبێژن: ئەگەر د دنیایێ دا بێژنە عاشقەکێ شەیدا: تە کیژ هەردویان دیدارا خۆشتڤی یان مالێ دنیایێ؟ ئەو دێ کیژکێ هلبژێرت؟

ئەبوو موەیهیبەی گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، دەیک و بابێن من گوری تە ببن، کلیلێن خزینەیێن دنیایێ و هەرمانا تێدا پاشی بەحەشتێ بۆ خۆ هلبژێرە. وی گۆت: نە ب خودێ ئەبوو موەیهیبە، من لیقائا خودێ و بەحەشت بۆ خۆ هلبژارت. پشتی ئەڤ سەرەدانا وان ب دووماهی هاتی، هەر ئێک زڤری سەر جهێ خۆ، ئەبوو موەیهیبە دبێژت: رۆژا د دویڤ دا سپێدێ نساخییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەست پێ کر.

## دەسپێکا نساخییێ:

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خاترا خۆ ژ مرییان خواستی، و بەری هنگی وی پتر ژ جارەکێ خاترا خۆ ژ ساخان ژی خواستبوو، نساخییا

وی یا مرنێ دەست پێ کر.. ل ڕۆژێن دووماهییێ ژ هەیڤا صەفەرێ، یان ژێ ل دەسپێکا هەیڤا رەبیعولئەووەلێ ل دویڤ گۆتنەکێ، و نساخییا وی ب سەرئێشێ دەست پێ کر.

دیارە وێ ڕۆژێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل جەنازەیەکێ دەرکەفتبوو بەقیعێ، و پشتی ئەو زڤڕییە مال وی هەست ب سەرئێشانێ کر، عائیشا دبێژت: ڕۆژەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل جەنازەیەکی دەرکەفتە بەقیعێ، و دەمێ ئەو زڤڕییە نک من ل مال، سەرێ من دئێشا، و من دگۆت: ئای سەرێ من، ئینا وی گۆت: ئای سەرێ من نە یێ تە ئەی عائیشا! پاشی گۆت: و ما چ قەیدییە تو بەری من بمری، ڤێجا ئەز تە بشۆم و کفن کەم و نڤێژێ ل سەر تە بکەم و تە ڤەشێرم؟ عائیشایێ ب یاری ڤە گۆتێ: ئە، و پشتی هنگی تو دێ ئێی چییە نک ژنکەکا خۆ یا دی! پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پێ کرنژی و نەئاخفت.. و ئەڤە وەکی عائیشا دبێژت: دەسپێکا نساخییا وی بوو.

ل چەند ڕۆژێن ئێکێ نساخی ل سەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یا سڤک بوو، لەوا ئەو دشیا بێت و بچت، و قەستا مزگەفتێ بکەت بۆ نڤێژا ب جماعەت، و دەمێ وی هند هێز نەبا نڤێژێ ژ پێیان ڤە بکەت، ئەو دروینشتە خوارێ، و ئەبوو بەکری ل پشت وی دەنگێ وی دگەهاندە خەلکی و وان چاڤ ل لڤینێن ئەبوو بەکری دکر.

و جارەکێ دەمێ ئەو ل مالا ژنکا خۆ مەیموونایێ ئێش ل وی شدیا، حەتا ئەو کەفت و دلگرتی بوو.. و پشتی ئەو هشیاربووی، وی داخواز کر ژنکێن وی هەمی بێنە کۆمکرن، و ئەو هەمی ل مەزەلکا مەیموونایێ کۆمبوون، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: ئەز نشێم د ناڤبەرا هەوە دا بێم و بچم، ڤێجا ئەگەر هوین دەستویرییێ بدەنە من هندی ئەزێ نساخ

ئەز ل مالا عائیشایێ بم.. هنگی وان دەستویری دایێ، و چونکی ئەو ژ بەر تایێ بێ هێز بوویوو، وی نەدشیا خۆ ل سەر پیێن خۆ بگرت، لەو هەردو پسمامێن وی: فەضلێ کورێ عەبباسی و عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی هاتن ئەو ڕاکرە ڤە، و وی هەر دەستەکێ خۆ دانا سەر ملێ ئێک ژ وان و ئەو برە مالا عائیشایێ، عائیشا دبێژت: دەمێ وان ئەو دبر، پییێن وی ب عەردی ڕا دخشیان. یەعنی: وی هند هێز نەبوو پییێن خۆ ڕاکەت و دانت.

## ل مالا عائیشایێ:

و ئەو ب خۆ مالا عیشایێ ب تنێ مەزەلکەک و بەرسفکەک بوو، دکەفتە ب ڕەخ مزگەفتێ ڤە، ژ لایێ چەپێ (یێ ڕۆژهەلاتێ) ڤە، و دو دەرگەهـ لێ هەبوون، ئێک دهاتە مزگەفتێ، و یێ دی دچوو وێ کۆلانکێ (یان مەمەری) یێ وێ مەزەلکێ ب مەزەلکێن دی یێن ژنکێن پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- گرێددەت..

عەلی و فەضلی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گەهاندنە مەزەلکا عائیشایێ، و دانا سەر جهێ وی، و ژنکێن وی و هندەک مرۆڤێن وی یێن نێزیک ل وێرێ لێ کۆمبوون.. و خەبەرێ کەفتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ناڤ صەحابییان دا بەلاڤبوو.

ژ عائیشایێ دئێتە ڤەگوهاستن کو ئەو ڕۆژا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ئینایە مەزەلکا وێ دوشەنب بوو، و ل دوشەنبا دی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ دنیایێ بارکر.. مەعنا دەمێ مانا وی ب نساخی ل مالا عائیشایێ حەفتییەک بوو.

## بلا ئەبوو بەکر نڤێژێ ل بەرا خەلکێ بکەت:

دەمێ ئێش ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گرانبووی، و ئەو ئێخستی، دەمێ نڤێژێ هات، بیلالی بانگ دا، و گاڤا بوویە دەمێ نڤێژێ و

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زانی کو ئەو نەشێت ڕابتەڤە و بچتە نڤێژێ، وی گۆت: بێژنە ئەبوو بەکری بلا نڤێژێ ل بەرا خەلکی بکەت.. و ژ ریوایەتەکێ دئێتە زانین کو جارا ئێکێ یا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا دەرنەکەفتییە نڤێژێ، ئەبوو بەکر ل مزگەفتێ نەبوو، لەوا دەمێ قاصدێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەبوو بەکر نەدیتی، گۆتە عومەری: هلۆ نڤێژێ ل بەرا خەلکی بکە.. و گاڤا عومەری دەست ب نڤێژێ کری، و ئەو یێ دەنگ بلند بوو، دەنگێ وی گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: کانێ ئەبوو بەکر؟ خودێ وێ چەندێ قەبویل ناکەت و موسلمان ژی! و گاڤا عومەری ئەڤ چەندە زانی گۆتە قاصدی: ئەو تە چ کر؟ من هزر کر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ گۆتییە ئەز نڤێژێ بکەم! وی گۆت: نە ب خودێ وی فەرمان ل من کر ئەز بێژمە ئەبوو بەکری نڤێژێ ل بەرا خەلکی بکەت، بەلێ دەمێ من ئەو ل مزگەفتێ نەدیتی، من گۆت: کەس ژ تە چێتر نینە.

پشتی ڤێ چەندێ و هندی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نەشیا بت دەرکەفتە نڤێژێ، ئەبوو بەکری نڤێژ ل بەرا صەحابییان دکر.. و عائیشا ژی لایەکی ژ ڤێ مەسەلێ بۆ مە ڤەدگێڕت، دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ نساخ وی گۆت: بێژنە ئەبوو بەکری بلا نڤێژێ ل بەرا خەلکی بکەت. من گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، هندی ئەبوو بەکرە مرۆڤەکێ دلنازکە، دەمێ ئەو خۆ ل جهێ تە ببینت نەشێتە خۆ و دێ کەتە گری. بەلێ وی جارەکا دی گۆت: بێژنە ئەبوو بەکری بلا نڤێژێ ل بەرا خەلکی بکەت. عائیشا دبێژت: دو سێ جاران ئەز مامە ب پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- دا ئەبوو بەکر ل جهێ وی نڤێژێ نەکەت؛ چونکی من گۆتە خۆ: مسۆگەر ئەو کەسێ ل جهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕاوەستت خەلک دێ ب چاڤێ بێ

ئیفلەحیییێ بەرێ خۆ دەنێ، لەو مـن دڤیا پێغەمبەر -سلاڤ لـێ بـن- ئێکـێ دی ژبلی ئەبوو بەکری بۆ ڤی کاری هلبژێرت (و ئەبوو بەکر بابێ وێ بوو)، بەلێ جارا دووماهیێ پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- ب عێجزی ڤە گۆت: بێژنە ئەبوو بەکری بلا نڤێژێ ل بەرا خەلکی بکەت، هوین وەکی هەڤالێن یووسفینە!

## داخوازکرنا فاطمایێ:

دەمـێ ل مـالا عائیشـایێ ئـێش ل سـەر پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- دژواربووی، وی هنارتە ب دویڤ کچا خـۆ فـاطمایـێ را، و هنگی ژ هەمی عەیالێ وی فاطما ب تنێ یا زێندی بوو، و ژیێ وێ د بن سیهێ دا بوو..

هەر جار دەمێ فاطما دهات سەرا بابێ خۆ ددا، پێغەمبەر -سلاڤ لـێ بن- پێشڤە دچوو و کەیفا خۆ پێ دئینا و ددانا ب رەخ خۆ ڤە، بەلێ ڤـێ جارێ ئەو نەشیا وێ چەندێ بکەت، فاطما هات، عائیشا دبێژت: تـو دا بێژی رێڤەچوونا وێ رێڤەچوونا پێغەمبەرییە. و گاڤا ئەو چووی ب رەخ بابێ خۆ ڤە روینشتی و وێ ئەو د وی حالی دا دیتی، وێ گۆت: (وا کرب أباه) یەعنی: وەی بۆ نەخۆشییا بابێ بن! پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- گۆتێ: (لیس علی أبیک کرب بعد هذا الیوم) ژ ئەڤرۆ وێڤە بابێ تە چو نەخۆشی نابن!

بەلێ.. ئەڤ نەخۆشییە، نەخۆشییا وی یا دووماهیێیە ئەو ل وارێ نەخۆشییێ دبەت، نێزیک ئەو دێ بارکەت و ل نک خۆشتڤییێ خۆ دانت، و ل وێرێ وی چو نەخۆشی نابن. هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- هێدی تشتەک بۆ فاطمایێ گۆت، ئینا وێ کرە گری، پاشی تشتەکێ دی بۆ گۆت، وێ کرە کەنی.

و دەمێ عائیشایێ داخواز ژێ کری ئەو بۆ وێ بێژت کانێ ئەڤە چ بوو وێ کری؟ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل هەر دو جاران چ گۆتێ؟ وێ گۆت: ئەز نهێنییا پێغەمبەری ئاشکەرا ناکەم.. یەعنی: مادەم وی ب دەنگەکێ وەسا نەگۆت هەوە گوه لێ ببت، ئەز وێ بۆ هەوە نابێژم.

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مری، عائیشایێ جارەکا دی داخوازا خۆ بۆ فاطمایێ دوبارە کر، فاطمایێ گۆت: ڤێ گاڤێ بلا، ئەز دێ بۆ تە بێژم، جارا ئێکێ وی گۆتە من: جبریلی هەر سال جارەکێ (یەعنی: ل هەیڤێن رەمەزانێ وەکی ژ هندەک ریوایەتێن دی ئاشکەرا دبت) قورئان هەمی د گەل من دخواند، بەلێ ڤێ جارێ وی دو جاران ئەو د گەل من خواند، و ئەز دبێژم ئەڤە ژ بەر هندێیە چونکی ئەجەلێ من یێ نێزیکبووی، ڤێجا تەقوایا خودێ بکە و صەبرێ بکێشە، چونکی ئەز باشترین پێشیمە بۆ تە. و دریوایەتەکا دی دا هاتییە: وی گۆتە من ئەڤ نساخییا من نساخییا مرنێیە.

فاطما دبێژت: هنگی من کرە گری، و گاڤا وی ئەز وەسا دیتیم، جارا دویێ وی گۆتە من: ئەی فاطما ما تە نەڤێت تو سەروەرا ژنێن خودان باوەر بی؟ و د ریوایەتەکا دی دا هاتییە: وی گۆتە من تو ئێکەمین مرۆڤێن منی دگەهییە من.

ڤێجا من کرە کەنی.. و وەسا چێبوو، پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب نێزیکی شەش هەیڤان، فاطمایێ ژ ڤێ دنیایێ وەغەر کر، و ئەو ئێکەمین کەس بوو ژ مرۆڤێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشتی وی مری.

ڤێجا ئەڤە چ مزگینی بوو بۆ فاطمایێ هاتییەدان، و چاوا وێ ئەو ژ بابێ خۆ وەرگرت؟ فاطما -وەکی مە گۆتی- ژییێ وێ هێشتا نەبووبوو سیه سال، و وێ دو کوڕ و دو کچ هەبوون یێ ژ هەمییا مەزنتر کو حسەن

بوو هێشتا هەشت سال تمام نەکربوون، و ئەڤە بابێ وێ یێ (مزگینییێ) ددەتە کو نێزیکە ئەو دێ بار کەت و مرت.. ئەگەر ئێکا دی ل جهێ وێ با هوین بێژن نەگۆتبا: یا عەیالێ من یێ هویر؟ یا زەلامێ من یێ خۆشتڤی؟ یا ژیێ من یێ بچویک؟

وێ کرە کەنی.. و ئەڤە عەدەتێ وێ ب تنێ نەبوو کو ب کەنییێ پێشوازییێ ل مرنێ بکەت، گەلەک خویشک و برایێن وێ یێن دی ژی ژ صەحابییان پشتی وێ، دەمێ دکەفتنە بەر مرنێ و وان دزانی کو چو نەمایە وەغەرا دووماهییێ دێ دەست پێ کەت، دکرە کەنی.. هوین دزانن بۆچی؟

چونکی وان دگۆت: (غدا نلقى الأحبة، محمدا و صحبه) سوباهی ئەم دێ گەهینە خۆشتڤییان، موحەممەدی و دەستەکا وی.. بەلێ ڤیانا پێغەمبەری -سلاف لێ بن- دلێن وان هند تژی کربوو، ئێک ژ وان باوەر نەدکر کەنگی دێ مرت، مادەم د ناڤبەرا وان و دیتنا خۆشتڤی دا ئاستەنگ ب تنێ مرنە..

وإني لأستغشـي وما بي نعسـةٌ  لعل خيالاً منـكِ يلقى خياليا

ئەز دلێ خۆ دبەمە خەوێ، و چاڤێن خۆ ب تەعدایی ددانمە سەرێک، هەر چەندە خەوا من نائێت ژی، بەلێ من ژ بەر هندێیە ئەز دبێژم: بەلکی خەیالا هەوە د بەر چاڤێن من ڕا دەرباس ببت، و ئەز هەوە ببینم، وەلەو د خەونێ ژی دا بت!!

### هێشتا ئەڤە ئێشا ژەهرێیە:

ل وان ڕۆژان یێن پێغەمبەر -سلاف لێ بن- نساخ ل مالا عائیشایێ، ژنکا بەررائێ کورێ مەعروری ئەوا دبێژنێ: (أم مبشر) هاتە سەرا

پێغەمبەری دا، و کورەکێ وێ ل ڕۆژا فەتحا خەیبەرێ د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پاریەکێ وێ پەزا ژەهرکری خواربوو، ئەوا ژنکەکا جوهی لێنای، پاشی پشتی هنگی ب دەمەکی کورێ وێ مر، ڤێ ژنکێ گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تو هزر دکەی ئێشا تە ژ چییە؟ ئەز ب خۆ هزر دکەم دەردێ کورێ من ژ تشتەکی نەبوو ژ بلی وێ بزنا ژەهرکری یا وی خواری.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: دەردێ من ژی هەر ژ وێیە، و ئەڤە دەمێ قەتیانا ڕەها ستویێ منە!

و د هندەک ریوایەتێن دی ژی دا هاتییە کو پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پارییێ ژەهرکری ل ڕۆژا خەیبەرێ ڤەچوی، هەر سال دەم بۆ دەمی ئێشان ل نک وی پەیدا دبوو، حەتا هندەک ژنکێن وی ئەڤ چەندە تێ ئینادەر و گۆتێ: دیارە ئەڤە ژ بەر وێ ژەهرێ بوو یا ل خەیبەرێ بۆ تە هاتییەدان.

و ئیقرارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو ئێشا ئەو پێ مری ژ بەر ژەهرا ژنکا جوهی بوو، هندێ دگەهینت کو جوهییان -لەعنەت لێ بن- دەست د مرنا وی دا هەبوو، و ئەو مربوو شەهید.

**تایا گران:**

د نساخییا مرنێ دا ئێشانەکا زێدە و تایەکا گران ب سەر پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- هات، حەتا وێ دەرەجێ ئەو پاتێ ب سەر وی دادای ژ بەر تایا وی گەرم بووبوو وەکی عائیشا دبێژت.

عەبدللاهێ کورێ مەسعوودی دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ نساخ، ئەز چوو سەرا بدەم، من دەستێ خۆ کرێ و من گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، هەر وەکی ئێشانا تە یا دژوارە؟ گۆت: وی گۆتە من: بەلێ، ئێشانا من هندی ئێشانا دو ژ هەویە. من گۆتێ: مەعنا: خێرا تە ژی

هندی یا دویانه؟ وی گۆت: بەلێ، پاشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هەر موسلمانەکێ ئێشەک ژ نساخییێ یان ژ تشتەکێ دی بگەهتێ، خودێ گونەهێن وی وەسا دێ ژێ وەرینت کانێ چاوا دار بەلگێن خۆ دوەرینت.

و ل ڕۆژەکێ ژ وان ڕۆژێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مالا عائیشایێ، کو ڕۆژا پێنجشەنبێ بوو، هەشتی هەیڤا رەبیعولئەوولێ، چار ڕۆژان بەری ئەو قەستا خودایێ خۆ بکەت، ئێش ل وی گرانبوو و تایێ گرت، لەو وی داخواز ژ مرۆڤێن خۆ کر و گۆتێ: کاغەزەکێ بینن دا ئەز بۆ هەوە تشتەکی بنڤیسم، هوین پشتی من قەت د سەر دا نەچن.. هندەک ژ مرۆڤێن ئامادە گۆت: کاغەزێ بینن دا ئەو بنڤیست، و هندەکان گۆت: ژ بەر تایێ وی های ژ خۆ نینە کانێ چ دبێژت.. و هۆسا وان کرە قەرەبالغ ئینا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- عێجز بوو و گۆت: ڕابن دەرکەڤن![(1)]

پاشی تایا وی هند دژوار بوو، حەتا وی داخواز ژ خەلکێ مالا خۆ کر کو ئەو حەفت کونێن ئاڤێ لێ بکەن، دا لەشێ وی سڤک ببت، بەلکی بشێت دەرکەفتە مزگەفتێ و بۆ خەلکی باخڤت.. وان داخوازا وی ب جهـ ئینا، و چوون حەفت کونێن ئاڤا سار ژ بیرێن مەدینێ ئینان، و لێ کرن،

---

(١) بیدعەچی و خودانێن دەستەکێن سەرداچووی، ئەوێن عەدەتێ وان هەردەم سەرهاتییێن دیرۆکێ ل دویف دلچوونێن خۆ یێن بێخێر شرۆڤە دکەن، و ژ نک خۆ ئاخفتنێ ل سەر ئەزمانێ کەسێن دیرۆکێ دگێڕن ئەگەر خۆ ئەو نەئاخفت بن ژی، ڤێ سەرهاتییێ ل دویف گێولێ خۆ یێ ئێشەوی شرۆڤە دکەن، و دبێژن: پێغەمبەر دا فلان تشتی و فلان تشتی د وێ کاغەزێ دا نڤیست. هەر وەکی وان علمێ غەیبێ هەی! و ژ تشتێن مسۆگەر د عەقیدا مە دا ئەوە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چو تشتان ژ دینی ڤەشارتی ناهێلت ژ بەر قەرەبالغا هندەک مرۆڤان، و خودێ چێتر دزانت کو دبت ئەو خوتبا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل وێ ڕۆژێ بۆ صەحابییان خواندی ئەو شیرەت و گۆتن تێدا گۆت بن یێن وی دڤیا د کاغەزا خۆ دا بگەهینتە ئوممەتێ.. هەر چاوا بت بۆ پێغەمبەری نابت ژ کەرێن تشتەکی دا هندەک ژ دینی و مەصلحەتا ئوممەتێ ڤەشێرت.

عائیشا دبێژت: تەستەکا حەفصایێ هەبوو، مە ئینا ئەو تێدا ڕوینشت و مە ئەو هەر حەفت کونێن ئاڤێ لێ کرن، حەتا وی ب دەستی ئیشارەت دایە مە کو بەسە.

و تشتێ بوویە ئەگەر کو ئەو حەز بکەت دەرکەفتە مزگەفتێ و بۆ صەحابییێن خۆ باخڤت، ئەو بوو وێ ڕۆژێ مامێ وی عەبباس د بەر هندەک زەلامێن ئەنصاری ڕا بۆری، دیت ئەو یێن دکەنە گری.. عەبباسی گۆتێ: هەوە خێرە، بۆچی هوین دکەنە گری؟ وان گۆت: بیرا مە ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هات دەمێ ئەو د ناڤ مە دڕوینشت و بۆ مە دئاخفت، ڤێجا گرییا مە هات. هنگی عەبباس چوو نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و سوحبەتا وان ئەنصارییان بۆ وی کر، لەو وی داخواز کر ئاڤێ لێ بکەن دا لەشێ وی سڤک بت، و دەرکەفتە مزگەفتێ.

پشتی ژنکێن وی ئاڤا سار پێدا کری، وی جلکێن خۆ کرنە بەر خۆ، و پاتەکێ ڕەش ل ئەنییا خۆ شداند، و ب هاریکارییا هندەک مرۆڤێن خۆ دەرکەفتە مزگەفتێ، و ب هندەک پێگاڤێن گران ڤە هێدی هێدی بەر ب مینبەرا خۆ ڤە چوو، دا بۆ جارا دووماهییێ ل سەر ڕوینتە خوارێ، و خوتبەکێ بۆ هەڤالێن خۆ بێژت، پشتی ب سەر هەر سێ دەرەجێن مینبەرێ کەفتی، و مینبەرا وی سێ دەرەجە بوو، و صەحابییان ئەو دیتی، هەمی ب کەیف و شەوقەکا زێدە ل دۆر وی کۆمبوون؛ دا گوهێ خۆ بدەنێ کانێ دێ چ بێژت.

## دووماهیێ جار ل سەر مینبەرێ:

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب حەمدا خودێ دەست پێ کری، وەکی عەدەتێ وی یێ هەر جار د دەسپێکا خوتبان دا، وی بەحسێ ئەنصارییان کر، مەدحێن وان کرن، و شیرەت ل صەحابییێن خۆ کر کو ئەو

قــەدر و بهایێ ئەنصارییان بزانن، چونکی ئەو پشتەڤانێن پێغەمبەری بوون -سلاڤ لێ بن-، و هاریکارێن وی بوون ل سەر بەلاڤکرنا ڤی دینی.. پاشی وی مەدحێن هەڤالێ خۆ یێ نێزیک ئەبوو بەکری ژی کرن، و گۆت: کەسێ وەکی ئەبوو بەکری ب هەڤالینی و مالێ خۆ منەت ل من نەکرییە، و ئەگەر من ژ بلی خودێ خۆشتڤییەکێ نێزیک بۆ خۆ هلبژارتبا، ئەز دا ئەبوو بەکری هلبژێرم، بەلــێ براینی و ڤــیانــا ئیسلامێیە.. و بــلا دەرگەهەک نەمینت ژ مالێن هەوە بێتە مزگەفتێ ژ بلی دەرگەهێ ئەبوو بەکری.

و ئاشکەرایە کو ل دەور و بەرێن مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مالێن صەحابییان دبەلاڤبوون، و گەلەک ژ وان دەرگەهەک د ناڤبەرا مالا خۆ و مزگەفتێ دا ڤەکربوو، دا ل دەمێ نڤێژان تێرا بێنە مزگەفتێ، مالا ئەبوو بەکری دکەفتە لایێ ڕۆژئاڤایا مزگەفتێ (لایێ دەستێ ڕاستێ یێ وی کەسێ نڤێژێ دکەت)، و وی ژی دەرگەهەک بۆ خۆ د ناڤبەرا مزگەفتێ و مالا خۆ دا ڤەکربوو، د ڤێ خوتبێ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان دا هەمی دەرگەهـ بێنە گرتن ب تنێ دەرگەهێ ئەبوو بەکری نەبت.

پاشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: یێن بەری هەوە قەبرێن پێغەمبەر و چاکێن خۆ دکرنە مزگەفت و جهێ نڤێژان بۆ خۆ، هوین وێ چەندێ نەکەن، ئەز هەوە ژ وێ چەندێ ددەمە پاش.

هەر وەسا د ڤێ خوتبێ دا، وەکی ئەبوو سەعیدێ خودری بۆ مە ڤەگێڕت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هندی خودێیە هلبژارتن دا عەبدەکی د ناڤبەرا دنیایێ و وی تشتی دا یێ ل نک خودێ هەی، وی عەبدی ئەو تشتێ ل نک خودێ هەی هلبژارت. و گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ گۆتنە گۆتی، ئەبوو بەکری کرە گری، ئەبوو سەعیدێ خودری دبێژت: ئەم هەمی عەجێبگرتی بووین ژ گرییا ئەبوو بەکری، و مە د گەل خۆ

گۆت: ئەو بۆچی دکەتە گری؟ عەبدەک وی تشتی هلبژێرت یێ ل نک خودێ هەی.. چ گری ب ڤێ گۆتنێ دڤێت! پاشی دەرکەفت ئەبوو بەکر ژ مە هەمییان زاناتر.

بەلێ، بەس ئەبوو بەکری تێ ئینادەر کانێ مەخسەدا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ڤێ ئاخفتنێ چییە؟ عەبد ئەوە، و هلبژارتنا تشتێ ل نک خودێ هەی، ئیشارەتە کو ئێدی خلاص! ئەڤە دووماهییە، ئێدی ئەبوو بەکر نەشێت هەر ڕۆژ چاڤێن خۆ ب دیتنا خۆشتڤی روهن بکەت، دەم دەمێ خاتر خواستنا دووماهییێیە.. لەو ئەبوو بەکری کرە گری، و حەقێ وییە بکەتە گری، و ئەگەر گری بۆ ڤێ ڕۆژێ نەبت، پا دێ بۆ کەنگی بت؟!

و مرۆڤ دەمێ هزرا خۆ د ڤێ خوتبا پێغەمبەری دا دکەت، مرۆڤ باش تێ دئینتەدەر کو ئەو یێ وەصییەتێ ل ئوممەتا خۆ دکەت، و بەحسێ دەمێ پشتی مرنا خۆ بۆ وان دکەت، و کانێ وی دڤێت موسلمانان ب چ ڕەنگی بن، بێی کو ئەو ب ڕەنگەکێ ئێکسەر ئەمر و فەرمانێ ل وان بکەت..

ئەو یێ بەرێ وان ددەتە قەدر و بهایێ ئەبوو بەکری، دا پشتی مرنا وی بەرێ وان نەمینتە ل ئێکێ دی، و ئەو یێ بیرا وان ل بهایێ ئەنصارییان دئینتە ڤە، و کو ئەوێ حوکم دکەفتە دەستی دڤێت قەدرێ وان بگرت، هەر وەسا ئەو یێ وان بەرهەڤ دکەت بۆ خەبەرێ مەزن کو هندە ئەو دێ وەغەر کەت، لەو دڤێت ئەو وەکی ئوممەتێن بۆرین قەبرێ وی نەکەنە جهێ نڤێژ و طەوافێ یان جهێ جەژن و کۆمبوونان بۆ خۆ.

و ئاشکەرایە کو وی ل وێ ڕۆژێ ئەڤ خوتبە بۆ صەحابییان خواند، ڕۆژا وی بڕیارا خۆ گوهاڕتی کو کیتابەکێ بۆ وان بنڤیست، و وی تشتی تێدا بێژت یێ ئەو پێ بەرزە نەبن، پشتی وی دیتی قەرەبالغ ل نک وی هاتەکرن، و دویر نینە ئەو تشتێ وی دڤیا بنڤیست وی ب دەڤ د ڤێ خوتبا خۆ دا

گۆت بت.. و هەر چاوا بت ئەڤە جارا دووماهییێ بوو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل سەر مینبەرێ هاتییە دیتن.

## نڤێژا دووماهییێ ل مزگەفتێ:

هەر ل رۆژا پێنجشەنبێ نیڤرۆ دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەرکەفتییە مزگەفتێ و دووماهی خوتبە بۆ صەحابییان گۆتی، وی نڤێژا نیڤرۆ ژی ل مزگەفتێ ل بەرا صەحابییان کر، و ل دەمێ کرنا نڤێژێ ئەو یێ روینشتیبوو و ئەبوو بەکر ل لایێ وی یێ راستێ یێ ژ پییان ڤە بوو، و رێزێن صەحابییان ل پشت وان بوون، ئەبوو بەکری ل دویڤ وی نڤێژ دکر، و خەلکی ل دویڤ ئەبوو بەکری، یەعنی: ئەبوو بەکری دەنگێ وی دگەهاندە خەلکی.

و بارا پتر زانا ل وێ باوەرێنە کو ئەڤ نڤێژە، نڤێژا نیڤرۆ ل رۆژا پێنجشەنبێ هەشتی هەیڤا رەبیعولئەووەلێ، دووماهی نڤێژا ب جماعەت بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل بەرا صەحابییێن خۆ ل مزگەفتێ کری.

پشتی وی نڤێژا نیڤرۆ کری و خوتبەیەک خواندی، بۆ جارا دووماهییێ ئەو زڤڕی مەزەلکا عائیشا، و ئێدی ژێ دەرنەکەفت.. ل ئەینییێ و شەنبییێ و ئێکشەنبێ ئەو نەهاتە مزگەفتێ، و ل دوشەنبێ وەغەرکر.

## ئێکەمین خوتبا بێ پێغەمبەر!

ژ ئەڤێ گۆتنا بۆری بۆ مە ئاشکەرا دبت کو ل رۆژا ئەینییێ نەهی هەیڤێ، و بۆ جارا ئێکێ ل مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خوتبەکا بێ پێغەمبەر هاتەکرن.. و ئاشکەرایە کو ل ڤێ خوتبێ ئەبوو بەکر ئیمام و خوتبەخوین بوو.

## د ناڤبەرا عەلی و عەبباسی دا:

ل هەر سێ ڕۆژێن دووماهییێ ژی ژ ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هندەک جاران وی هەست ب سڤکییا لەشێ خۆ دکر، و بۆ دەمەکێ بەروەخت ئەو هشیار دبوو، حەتا ئەو کەسێن ل نک وی هزر دکر هەر وەکی نساخییا وی یا خلاص دبت، و جارەک ژ ڤان جاران (و ئیمامێ زوهری دبێژت: ئەو ل وێ ڕۆژێ بوو یا پێغەمبەر تێدا مری) عەلی ل نک پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، و گاڤا عەلی دیتی ئێش ل سەر وی یا سڤکبووی، کەیفا وی گەلەک هات، لەو دەرکەفتە مزگەفتێ، دەمێ صەحابییان دیتی ئەو یێ ژ مەزەلکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەردکەڤت، وان پسیارا حالێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ وی کر کانێ ئەو یێ چاوایە؟ عەلی گۆت: حەمد بۆ خودێ بت، ئەڤرۆ ئەو یێ باشە.. و هنگی عەبباسێ کوڕێ عەبدلموطەلبی ل وێرێ بوو، گاڤا عەبباسی عەلی وەسا گەشبین دیتی، دەستێ وی گرت و ئەو وێڤە بر و گۆتێ: ئەزێ دبینم پشتی سێ ڕۆژێن دی تو ب داری یێ دئێیە هاژۆتن[1]، و ئەز باوەر دکەم کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ ڤێ نساخییا خۆ ڕانابت، ئەز سەر و چاڤێن مالباتا عەبدلموطەلبی دنیاسم دەمێ ئەو دکەڤنە بەر مرنێ، ڤێجا هەرە نک پێغەمبەرێ خودێ و پسیارا وی بکە کانێ مەزنی پشتی وی بۆ کێیە، ئەگەر ئەو بۆ مە بت دا بزانین، و ئەگەر بۆ ئێکی دی بت دا ئەو مە ئێمانەتی وی بکەت.

و ژ بەر کو عەبباس وی دەمی مەزنێ مالباتا هاشمییان بوو، وی هەست ب بەرپرسییێ ژ مالباتا خۆ دکر، و وی دڤیا ژ پێغەمبەری ب خۆ

---

(١) دەقێ دورستێ ئاخفتنا عەبباسی ئەڤەیە: (إنک بعد ثلاث عبد العصا) و ئەڤە کینایەتە بۆ وی کەسی یێ دبتە تابع بۆ ئێکێ دی، و ئەڤە ژ بیرتیژییا عەبباسی بوو، یەعنی: ئەگەر پێغەمبەر ب ئاشکەرایی تە نەدانتە جهێ خۆ، خەلک دێ ئێکێ دی کەنە مەزنێ خۆ، و تو دێ بییە تابع بۆ وی.

-سلاڤ لێ بن- بزانت، کانێ مەزنییا مرۆڤان پشتی وی دێ کەفتە د دەستێ کێ دا، هەر وەسا عەبباسی ژ بیرتیژی و زیرەکییا خۆ دزانی کو باشترین کەس ژ مالباتا وان ب کێر مەزنییا موسلمانان بێت عەلییە، هەر چەندە عەلی نە مەزنێ مالباتێ بوو، و گەلەکێن دی هەبوون ژ وی ب عەمرتر ژی، بەلێ ژ بەر زوی موسلمانبوونا عەلی، و زاڤاینییا وی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی عەلی ژ هەر ئێکێ مالباتێ هێژاتر دیت بۆ ڤی مەنصبی، لەو وی گۆتە عەلی: هەرە پسیارێ ژ پێغەمبەری بکە. بەلێ عەلی گۆتە وی: ئەز ب خودێ کەمە ئەگەر مە پسیارا مەزنییێ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر، و وی ئەو نەدا مە، ئێدی قەت خەلک وێ نادەنە مە، ب خودێ ئەز پسیارا وێ ژ پێغەمبەری ناکەم!

بەلێ مەسەلە -وەکی عەبباسی ب خۆ ل رۆژا فەتحا مەکەهێ گۆتییە ئەبوو سوفیانی- مەسەلا پێغەمبەراتییێ بوو، و نە مەسەلا ملکی و مەلکاتییێ بوو، مەسەلە ئاڤاکرنا دەولەتا قورئانێ بوو، نە کو چێکرنا مەملەکەتەکێ بۆ مالباتەکێ، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چو ئیشارەتێن وەسا نەدانە صەحابییێن خۆ کو دڤێت پشتی وی ئێک ژ مالباتا وی حوکمی ل جهێ وی بکەت.

### ئوسامە و خاترخواستنا دووماهییێ:

بەری نوکە مە ئاشکەرا کربوو کو ل هەیڤا صەفەرێ و هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نساخ نەبووی، وی بەرهەڤی بۆ ئامادەکرنا لەشکەرەکی کر؛ دا قەستا وەلاتێ شامێ بکەت، و وی هنارتە ب دویڤ (خۆشتڤییێ خۆ) ئوسامەیێ کورێ زەیدی را و ئالایێ لەشکەری کرە د دەستێ وی دا و گۆتێ: هەرە وی جهی یێ بابێ تە لێ هاتییە کوشتن، و ب سەر وان دا بگرە، و من تو کرییە مەزنێ ڤی لەشکەری.

و هنگی ژییێ ئوسامەی هەژدە یان بیست سال بوو ل دویڤ گۆتنەکێ، و ژ بەر کو گەلەک ژ صەحابییێن مەزن ژ موهاجر و ئەنصارییان د ناڤ ڤی لەشکەری دا هەبوون، هندەک مرۆڤان ب عەجێبی زانی کو حجێلەکێ وەکی ئوسامەی ببتە ئەمیرێ وان، و ئەڤ حێبەتیبوونا وان گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، لەو وی گۆت: ئەگەر ئەو ئەڤرۆ طانێ ل ئەمیرییا ئوسامەی بدەن، وان بەری نوکە طان ل ئەمیرییا بابێ وی ژی دابوو، و ئەز ب خودێ کەمە ئەو یێ هەژی ئەمیراتییێ بوو، و پشتی وی ئەڤە خۆشتڤیترین مرۆڤە ل نک من.

پشتی بەرهەڤکرنا لەشکەری ب سێ رۆژان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نساخبوو، و چونکی صەحابی ب نساخییا وی ڤە موژیل بوون، دەرکەفتنا لەشکەری گیرۆ بوو، و دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هندەک جاران د نساخییا خۆ دا هشیار دبوو، وی پسیارا لەشکەرێ ئوسامەی کر کانێ دەرکەفتییە یان نە؟ و گاڤا وان گۆتییێ: ئەو ژ بەر نساخییا تە دەرنەکەفتییە. وی ب ڤێ چەندێ نەخۆش بوو، لەو وێ پێنجشەنبا ئەو دەرکەفتییە مزگەفتێ و خوتبەک بۆ موسلمانان خواندی، وی تەئکید ل صەحابییان کر کو دڤێت ئەو لەشکەرێ ئوسامەی بهنێرن. ئەو بوو ل رۆژا شەنبییێ، دو رۆژا بەری مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لەشکەر ژ مەدینێ دەرکەفت، و پشتی قووناغەکێ وان دایە رێ جاب گەهشتێ کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- زێدە یێ تەنگاڤە، هنگی وان بریار دا لەشکەر ل جهێ خۆ بمینت حەتا بزانن کانێ دێ چ چێ بت.

ل وی دەمی سەرۆکێ لەشکەری، ئوسامەیێ کورێ زەیدی ب لەز زڤری مەدینێ، و چوو قەستا مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر، ئوسامە دبێژت: گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەز دیتیم، ب ئیشارەتان گازی من کر، ئەز

ب نـک وی ڤـه چووم، وی بـەرێ خـۆ دا مـن، پاشـی دەسـتێ خـۆ ب نـک عەسمانی ڤە بلندکر، و د دێمێ خۆ دا، من زانی ئەو یێ دوعا بۆ من دکەت، بەلێ ئەزمانێ وی ناگەڕیێت.

و کـی دزانـت؟ بـەلکی وی هنگـی دوعـا بـۆ ئوسـامەی دکـرن کـو خـودێ تەوفیقا وی بدەت د وی کاری دا یێ وی ئەو بۆ هلبژارتی!

## گۆتن و شیرەتێن وی یێن ل بەر مرنێ:

پـێ نەڤێت بێژین: هــەر مرۆڤـەکێ نسـاخی ب سـەر دا دئێـت، و ئـەو ژ حال و سەر و بەرێ خۆ دزانت کو هەر وەکی ئەڤـە نسـاخییا مرنێیـە، ئـەو دێ بـەرێ خـۆ دەتـێ کـانێ چ تشـت ژ هـەمییێ گرنگتـرە ل نـک وی ئـەو دێ بێـژت، و شـیرەتێ پـێ ل مـرۆڤ و کـەس و کـارێن خـۆ کـەت، و صـەحابییێن پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- چ ژ خـەلکێ مـالا وی بـن، ئـەوێن ل دەمـێ نساخییێ بەردەوام د گــەل وی، چ ژی یـێـن وێڤەتر بن ئەوێن هندەک جاران ل دەمــێ نســاخییێ سـەرەدانا وی کـری، ب ئەمانەتـەکا مــەزن شـیرەت و ئاخفتنێن وی یێن دووماهییێ بۆ مە ڤەگێڕاینە، و ل ڤێرێ ئەم دێ ب کورتـی ئـیشـارەتێ دەینـە وان مەسەلان یێن پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- ل ڕۆژێـن خۆ یێن دووماهییێ تەئکید ل سەر کری:

- دڤێـت لـەشـکەرێ ئوسـامەی بێتـە بەرهـەڤکرن و هنـارتن بـۆ وەلاتـێ شامێ.. و ئەو ئێکەمین کار بوو ئەبوو بەکری کری دەمێ بوویە خەلیفە، هەر چەندە رەئیا گەلەک صەحابییان ئەو بوو ئەو لەشکەر نەئێتە هنارتن؛ چونکی سەر و بەر پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتە گوهاڕتن، و گەلـەک عەرەب ل کوفرێ زڤڕین.

- دڤێت جەزیرا عەرەبان ژ موشرکان بێتە ڤالاکرن؛ چونکی دو دیـن لـێ کۆم نابن، و عومەری ئەڤ شیرەتا وی ب جهئینا دەمێ بوویە خەلیفە.

- تشتێ ژ هەمییێ پتر وی د نساخییا خۆ دا دگۆت و دوبارە دکر و شیرەت پێ دکر، نڤێژ بوو، و خۆ دەمێ رحا وی نێزیکی گەروییێ بووی ژی وی هەر دگۆت: هەوە ئێمانەت نڤێژ.

- هەر وەسا وی شیرەت ل زەلامان ژی کر کو ئەو قەدر و بهایێ وان بگرن یێن ل بن دەستێ وان، و هەر چەندە ئەڤە پتر بەحسێ عەبد و خولام و خزمەتکارانە ژی، بەلێ دبت ئەو ژ ژن و عەیال و هەمی خەلکێ مالێ بگرت یێن کو واجبە ل سەر زەلامی وان ب خودان بکەت و کێماسییێ نەگەهینتێ.

- پتر ژ جارەکێ وی لەعنەت ل وان کرن یێن گونبەد و مزگەفت ل سەر قەبرێن پێغەمبەر و چاکێن خۆ ئاڤاکرین، و ئەو کرینە جهێ عیبادەت و جەژن و کۆمبوونان، و وی ئوممەتا خۆ ژ هندێ دا پاش کو ئەو د ڤێ چەندێ دا چاڤ ل جوهی و فەلان بکەن، و وێ د گەل قەبرێ وی بکەن یا وان د گەل قەبرێن چاکێن خۆ کری.

- وەصییەت ب موسلمانێن ئێکێ ژ موهاجر و ئەنصاران، و عەیالێ وان ژی پشتی وان، کو قەدرێ وان بێتە گرتن، و بهایێ وان بێتە زانین.

- جابر دبێژت: بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بمرت ب سێ رۆژان من گوهـ ل وی بوو دگۆت: بلا ئێک ژ هەوە نەمرت، ئەگەر ئەو هزرەکا باش ژ خودێ نەکەت.

- عەبدللاهێ کورێ عەبباسی دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ نساخ وی پەردە راکر، و وی پاتەک ل ئەنییا خۆ شداندبوو، و وی گۆت: یا رەببی من گەهاند -سێ جاران- تشتەک ژ مزگینییێن پێغەمبەرینییێ نەمایە ژ بلی خەونا باش، ئەوا عەبدەکێ چاک دبینت یان ئێک ب وی ڤە دبینت، نێ من هوین ژ هندێ دابوونە پاش کو هوین د رکووع و سوجوودێ دا

قورئانێ بخوینن، ڤێجا ئەگەر هوین چوونە رکووعێ هوین خودانێ خۆ مەزن بکەن، (یەعنی: بێژن: سبحان ربی العظیم) و ئەگەر هوین چوونە سوجوودێ گەلەک دوعایان بکەن؛ چونکی دوعا هنگی هەژینە بێنە قەبویلکرن.

## صەفییا و هەوارا وێ:

دەیکا موسلمانان صەفییایا کچا حویەیێ کورێ ئەخطەبی، کو د ئەصل دا کچا مەزنێ جوهییێن بەنوو نەضیر بوو، دەمێ زەلامێ وێ پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- کەفتییە بەر مرنێ و ئێش لێ گرانبووی، د سەر خەما وێ یا مەزن ڕا خەمەکا دی ژی هەبوو، ئەو هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، هەر ژنکەکێ ژ ژنکێن تە مرۆڤێن خۆ هەنە پەنا بۆ بێتەبرن، ب تنێ ئەز تێ نەبم، مرۆڤێن من تە ییّن دەرێخستین، ئەگەر تشتەک چێبوو ئەز پەنایا خۆ ببەمە نک کێ؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ببە نک عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی.

و ئەڤە هندێ دگەهینت کو پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەلی دێ یێ بەرپرس بت ژ کار و بارێن مالباتا وی.

## گرنژینا دووماهییێ و خاترخواستنەکا ب بێ دەنگێ:

ل ڕۆژا دووماهییێ ژ ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو ڕۆژا دوشەنبێ بوو، دەمێ نڤێژا سپێدێ ل مزگەفتا وی هاتییەکرن، وی هەست ب سڤکییا لەشێ خۆ کر، لەوا ئەو ڕابوو ڤە و ب نک وی دەرگەهی ڤە چوو ئەوێ دکەفتە ناڤبەرا مەزەلکا وی و مزگەفتێ دا، وی دیت صەحابییێن وی هەمی درێژکرینە و یێ نڤێژا سپێدێ ل پشت ئەبوو بەکری دکەن.. کەیفا وی گەلەک ب ڤی دیمەنی هات، و دێمێ وی گەشبوو..

و کەیفهاتنا وی ب چ بوو؟

خودێ دزانت! بەلکی ژ بەر هندێ بت چونکی وی دیت ئەو دارا وی چاندی، هاتە بەری، و ئەو زەحمەتا وی ب ڤی دینی ڤە بری ل دەمێ ئەو نە یێ حازر ژی بەرهەم ژ خۆ دا.. و بەلکی ژی کەیفا وی ژ بەر هندێ بت کو وی دیتی صەحابییێن وی هەمی ب ئیمامەتییا ئەبوو بەکری درازینە و ل پشت وی یێن بووینە ئێک ڕێز.

و ئەو گرنژی..

و ئەڤ گرنژینە خاترخواستنا وی یا دووماهییێ بوو ژ هەڤالان، خاترخواستنەکا ب بێ دەنگی.. و صەحابی پێ حەسییان کو پەردە ژ بەر دەرگەهی هاتە هلدان، لێ زڤرین دیت پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ ڕاوەستایە و بەرێ خۆ ددەتە وان و دگرنژت، نێزیکبوو ژ کەیفان دا ئەو ب نک وی ڤە بچن و ژ بیر بکەن کو یێن د نڤێژێ دا، ئەبوو بەکری ژی ئەو دیت، و هەمی هزرا ئەبوو بەکری ئەو بوو کو ئەو یێ ژ گرانییا ئێشێ ڕابووی، و وی دڤێت بێت نڤێژێ د گەل وان بکەت، و قەت ل بیرا وی نەبوو کو ئەڤە خاترخواستنا دووماهییێیە، و دیتنا وی بۆ خۆشتڤییێ وی دێ بتە ئەڤ جارە ب تنێ..

## ڤیراڤا گاڤەکێ بۆ مە مرن بوو    ژڤان یا کو حەشر بت دێ چەوا بت؟

ئەبوو بەکر ل سەر پاشپانییێن خۆ دا چوو، و ڤیا پشت و پشت بزڤرتە ناڤ ڕێزا ئێکێ و جهێ ئیمامی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤالا بکەت، بەلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دەستێ خۆ ئیشارەت دایێ کو ل جهێ خۆ بمینە.. پاشی جارەکا دی پەردە بەردا، و ل بەر چاڤێن صەحابییان ئێک جار غەوارە بوو. و ئەو گرنژینا وێ سپێدەیێ صەحابییان ل سەر دێمێ وی دیتی، ئەوێ صەحابییەک بۆ مە وەصف دکەت و دبێژت: تو دا بێژی پەڕێ موصحەفێیە، دووماهی تشت بوو وان ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیتی.

و گاڤا صەحابییان نقێژ ب دووماهی ئیناى، هەر وەكى وان باوەر ژ چاڤێن خۆ نەدكر، هەر ئێكى پسیار ژ هەڤالێ خۆ كر: تە ژى ئەو تشت دیت یێ من دیتى؟ و گاڤا بەرسڤا هەمییان (ئەرێ) بووى، وان پیرۆزى و چاڤرۆنى ل ئێك و دو كرن، و هەر ئێك زوى زڤرى مال دا ڤێ مزگینییا خۆش بۆ خەلكێ مالا خۆ ببەت!

## سەعەتێن دووماهییێ ل مەزەلكا عائیشایێ:

ئەبوو بەكر تێ نەبت، بەرى ئەو بزڤرتە مالا خۆ، ئەو چوو مالا كچا خۆ عائیشایێ، دیت پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ رازایە ل سەر جهێ خۆ، وى گۆتە عائیشایێ: ئەز دبێژم ئێشا پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- نەمایە، ئەڤرۆ ئەز دێ چمە نك كچا خارجەیى.. و ئەو ژنكەكا وى بوو، ل وێ مالا وى بوو ئەوا دكەفتە ژ دەرڤەى باژێرێ مەدینێ ل وى جهێ دگۆتنێ: (سونح).

هەر وەسا عەلى ژى پشتى هنگى چوو نك پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- دا بەرێ خۆ بدەتە حالێ وى، و عائیشا تێ نەبت ئیمامێ عەلى دووماهى كەس بوو پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- دیتى، گاڤا عەلى ئەو دیتى، وى ژى وەكى ئەبوو بەكرى و وەكى ژنكێن دى یێن پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- هزر كر كو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ بەر ب ساخلەمییێ ڤە دچت، لەوا ئەو ژى ژ نك چوو، و دەمێ ئەو چوویە مزگەفتێ د ناڤبەرا وى و مامێ وى عەبباسى دا ئەو چێبوو یا بەرى نوكە مە بەحس ژێ كرى.

و دەمێ تێشتەگەها رۆژا دوشەنبێ دوازدەى هەیڤا رەبیعولئەووەلێ ب سەر مالا عائیشایێ دا هاتى، ب تنێ ئەو و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د مالێ دا بوون.. و عەدەتێ پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- ئەو بوو هەردەمەكێ ئەو نساخ ببا، وى قورئان ب خۆ ڤە دخواند، و دەمێ ئەو كەفتییە بەر نساخییا مرنێ ژى -وەكى عائیشا دبێژت- وى سوورەتێن

(الفلق و الناس) ب خۆ ڤـه دخواندن و پف دکره خۆ، بەلێ ل ڕۆژێن دووماهییێ دەمێ ئەو بێ هێز بووی عائیشایێ ئەو پێڤـه دخواندن و دەستێن وی -ژ بەر بەرەکەتا وان- د لەشێ وی ددان.

و بەری مرنێ ب دەمەکی عەبدررەحمانێ کوڕێ ئەبوو بەکری چوو سەرا پێغەمبەری بدەت، و سیواکەک د دەستان دا بوو، عائیشا دبێژت: من دیت بەرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ما ل سیواکا وی، من گۆتێ: وێ سیواکێ بۆ تە ژێ وەرگرم؟ وی ب سەرێ خۆ ئیشارەت کر کو ئەرێ، ئینا من ئەو ژ عەبدررەحمانی وەرگرت و دا ڤێ، پاشی من دیت هەر وەکی ئەو بۆ وی یا رەق بوو، لەو من گۆتێ: وێ سیواکێ بۆ تە نەرم بکەم؟ وی ب ئیشارەتا سەری گۆت: بەلێ.. ئینا من ئەو سیواک ب دەڤێ خۆ نەرم کر، پاشی من دا ڤێ. و بەری نیڤرۆ ببت، سەکەراتێ دەست پێ کر.

### هلبژارتنا هەڤالێ بلندتر (الرفيق الأعلى):

سەکەراتا وی ژی وەکی ئێشا وی یا گران بوو، ئامانەکێ ئاڤێ ب رەخ وی ڤە بوو، هەر جار وی دەستێ خۆ دکرە تێدا و دێمێ خۆ پێ ڤەدمالی، و دگۆت: ((لا إله إلا الله، اللهم أعني على سكرات الموت)) یا رەببی تو هاریکارییا من بکەی ل سەر سەکەراتێن مرنێ..

عائیشا دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ ساخ گەلەک جاران وی دگۆتە مە: رحا پێغەمبەرەکی نائێتە ستاندن حەتا ئەو جهێ خۆ ل بەحەشتێ نەبینت، پاشی هلبژارتن بۆ دئێتەدان: وی ژیان دڤێت یان ئەو جهـ..

عائیشا دبێژت: و گاڤا ئەو کەفتییە بەر مرنێ، سەرێ وی ل سەر پێ من بوو، دلێ وی هاتەگرتن، پاشی هشیار بوو و بەرێ خۆ دا بانێ مەزەلێ و گۆت: ((اللهم الرفيق الأعلى)) یەعنی: یا رەببی ئەز هەڤالێ بلندتر هل

دبژێرم.. هنگی من زانی هلبژارتن بۆ وی هاتەدان و ئەو مە ناهلبژێرت! و هنگی من زانی ئەڤە ئەو سوحبەتە یا وی ل دەمێ ساخییا خۆ بۆ مە دگۆت.

و ئەڤ پەیڤا وی هێدی گۆتی: ((اللهم الرفیق الأعلی)) دووماهی پەیڤ بوو ژ دەڤێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرکەفتی، و عائیشایێ گوهـ لێ بووی.. و دووماهی پەیڤ بەرێ وێ ژ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتییە گوهـ لێ بوون، ئەڤە بوو: ((الصلاة الصلاة و ماملکت أیمانکم)) هەوە ئێمانەت نڤێژ، هەوە ئێمانەت نڤێژ، و ئەو کەسێن ل بن دەستێ هەوە.

و دەمێ عائیشایێ سەرێ وی ڕاکرییە ڤە و دانایە سەر سنگێ خۆ، وی دەستێ خۆ درێژ کر و دیسا گۆت: ((اللهم الرفیق الأعلی))، پاشی دەستێ وی خواربوو و کەفت، و عائیشایێ زانی مەسەلە ب دووماهی هات..

عائیشایێ ئەو ل سەر جهی درێژ کر، و پاتەک ب سەر دادا، و سەرێ خۆ دانا سەر بالیفکەکێ و کەلا گرییێ ڤێ کەفت.. دەنگێ وێ گەهشتە ژنکێن دی یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و مەزەلکێن وان ب ڕەخ یا وێ ڤە بوون، و هەر زوی ئەو د هەوارێ هاتن.

و.. د گاڤێ دا ئەو خەبەر ل مەدینێ بەلاڤبوو یێ کو د چاڤێن صەحابییان دا هەر تشتەکێ ل مەدینێ هەی ژ بەر تاری بووی، وەکی ئەنەسێ کوڕێ مالکی گۆتی.

### دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مری:

تشتێ ریوایەت هەمی ل سەر پێکهاتین ئەڤەیە کو مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ناڤبەرا سپێدە و نیڤرۆیا ڕۆژا دوشەنبێ دا بوو، بەلێ دەسنیشانکرنا دەمی ب دورستی و کانێ ئەو پتر نێزیکی سپێدێ بوو یان نڤیرۆ، ئەڤە جهێ دان و ستاندنێیە، و هندەک دبێژن: پشتی زەوالێ بوو.

ئەڤ دوشەنبە چەندی هەیڤا ڕەبیعولئەووەلێ بوو؟

هندەک دبێژن: ئەو ئێکی هەیڤێ بوو، و هندەک دبێژن: دویێ هەیڤێ بوو، و بارا پتر ل وێ باوەرێنە کو ئەو دوازدەی هەیڤێ بوو، و دبێژن: ل بیست و نەهی هەیڤا صەفەرێ نەخۆشیا وی دەست پێ کربوو، و نساخییا وی سێزدە ڕۆژان ڤەکێشا.

هەژییە بێژین کو ل دویڤ بۆچوونێن زانایێن فەلەکێ و سالنامەیان ڕۆژا (١٢) رەبیعولئەووەلا سالا یازدێ مشەختی ئەوا دکەفتە بەرانبەر (٧) خزیرانا سالا ٦٣٢ زایینی ئێکشەنبە نە دوشەنبە، و ئەگەر ئەم ڤێ بۆچوونێ بکەینە بناخە و بێژین: وەغەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل ڕۆژا دوشەنبێ بوو دڤێت بێژین: ئەو ل (١٣) رەبیعولئەووەلێ مربوو، نە ل (١٢)ێ. و هەر چاوا بت، ل دویڤ وێ بۆچوونا مە بۆ بوون و مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هلبژارتی، ئەم دبێژین: ژییێ پیرۆزێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب سالنامەیا شەمسی (٦١) سال و (٨٤) ڕۆژ بوو، و ب سالنامەیا قەمەری (٦٣) سال و (٣) ڕۆژ بوو، و هژمارا وان ڕۆژێن وی د دنیایێ دا برین (٢٢٣٢٩) ڕۆژ بوون.

### میراتێ پێغەمبەری ﷺ:

و هۆسا خۆشتڤییێ خودێ ژی ژ وی پەرداغی ڤەخوار، یێ هەر خودان رحەکی ل سەر ڕوییێ عەردی بەری وی ژێ ڤەخواری، و دێ پشتی وی ژێ ڤەخۆن.. پەرداغێ مرنێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ۝٣٤ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ (الأنبياء: ٣٤-٣٥)، و ڕۆژا پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- ژ دنیایێ بارکری جەزیرا عەرەبان هەمی ل بن دەستێ وی بوو، و کیسرا و قەیصەر و هەمی مەلکێن دنیایێ هزرەکا مەزن بۆ وی دکر، و وی هندەک هەڤال هەبوون رح و عەیال و مالێ خۆ هەمی گۆری وی دکر، د گەل هندێ ژی وی ژ دنیایێ بارکر و د مالا وی دا نە

دینارەک و نە دەرهەمەک نەبوو، هندەک عەبد و جارییە وی هەبوون، بەری بمرت وی ئەو ئازاکرن، و پارچەیەکا عەردی ل خەیبەرێ وی هەبوو، وی ئەو ژی د رێکا خودێ دا کرە وەقف، و تشتێ وی ل پاش خۆ هێلای ب تنێ هێسترەکا سپی بوو د گەل سیلاحێ وی، و زریەک ژی وی هەبوو دانابوو نک مرۆڤەکێ جوهی وەک گەرەوە بەرانبەر سیه (صاعێن) جەهی وی ئەو ب دەین بۆ خۆ ژ نک وی ئینابوون.. مالێ وی هەمی ئەڤە بوو! بەلێ وی میراتەکێ دی ل پاش خۆ هێلا.. میراتەکێ مەزن، یێ هندی دنیا هەبت خلاص نەبت.. هوین دزانن ئەو میرات چییە؟

رۆژەکا کۆمەکا مرۆڤان ل عەبدللاهێ کورێ مەسعوودی کۆمبووبوون، ئەو ل نیڤا وان یێ روینشتیبوو و حەدیس بۆ وان دگۆتن، ئەعرابییەک د بەر را بۆری، هندی بەرێ خۆ دایێ چو تشت د ناڤ دەستێن وان دا نەدیت کو ئەو لێ کۆم ببن، لەو وی ب عەجێبی ڤە گۆت: ئەڤە ل چ کۆمبووینە؟ عەبدللاهی گۆتێ: ئەو یێ ل میراتی پێغەمبەری کۆمبووین ل خۆ لێکڤە دکەن!

## د ناڤبەرا مرنێ و ڤەشارتنێ دا

د ناڤبەرا مرنا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- ئەوا ل نیڤرۆیا رۆژا دوشەنبێ رویدای، و ڤەشارتنا وی ئەوا رۆژا د دویڤ دا ب شەڤێ چێبووی، هژمارەکا سەرهاتی و رویدانێن گرنگ چێبووبوون، ل ڤێ ناڤبرێ دا ئەم دێ بەحس ژێ کەین.

### صەحابێ و کارلێکرنا مرنێ:

بینە بەر چاڤێن خۆ: مرۆڤەک، ل شەڤەکا تاری تبلچاڤ، ل چۆلەکێ ب ترس و سەهم، چرایێ وی یێ د دەستی دا و ل بەر رۆناهییا وی یێ ب رێڤە دچت، و دلێ وی یێ تژی هیڤییە کو بشێت ب وی چرایی خۆ بگەهینتە قووناغەکێ، پاشی.. ب خافلەتی ڤە ئەو هند ببینت چرایێ وی د دەستی دا ڤەمری، و هندی ل بەریکێن خۆ بگەرێت دا ئاگرەکی ببینت، کو چرایێ خۆ هلکەتێ ڤە، و جارەکا دی بدەتێ رێ.. و چو نەبینت!

حالێ وی دێ چ بت؟

ئەها ئەو حالێ هەر صەحابییەکی بوو ژن بت یان مێر، دەمێ خەبەرێ مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەهشتییێ! لەو خوزییا هەر ئێک ژ وان ئەو بوو: خوزی کتەک ژ مە نەبا، بەری مە گوهـ ل ڤی خەبەری ببت.. و ئەڤە نە گۆتنا منە، بەلکی یا ئێک ژ وان ب خۆیە، گوهێ خۆ بدەنێ چ دبێژت:

كانَ الضياءَ وكـان النـورَ نتبعـهُ　　بَعْدَ الإلهِ، وكان السّمْعَ والبَصَـرَا
فَلَيْتَنـــا يـــوْمَ وَارَوْهُ بِمَلْحَـــدِهِ　　وغيبـــوهُ وألقـــوا فوقـــهُ المـــدرا
لمْ يَــتْرُكِ الله مِنّــا بَعْــدَهُ أحَــداً　　ولمْ يُعِـشْ بعــدَهُ أنْثـى ولا ذَكَـرَا

بەلێ، هۆسا شاعرێ پێغەمبەری حەسسانێ کورێ ثابتێ ئەنصاری، حالێ خۆ و هەڤالێن خۆ ژ صەحابییان د گەل خۆشتڤیێ خۆ بۆ مە سالۆخ ددەت، و دبێژت: پشتی خودێ، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆ مە ئەو گەشاتی و رۆناهی بوو یا رێ بۆ مە ئاشکەرا دکر و ئەم ل دویڤ دچووین، و ئەو بۆ مە گوهـ و چاڤ بوو، مە دنیا ب وی ددیت، و مە ب وی گوهـ ل تشتان دبوو، ڤێجا سەد خوزی دەمێ ئەو رۆژ هاتی یا وان ئەو د قەبری دا ڤەشارتی و ئاخ رادایە سەر، خودێ ئێک ژ مە نەهێلابا، و نە ژنەک نە مێرەک ژ مە پشتی وی نەهێلابا زێندی!

بەلێ چو ب خوزییان ڤە نائێت!

بەری نوکە مە ئاشکەرا کربوو کو ل دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەغەرا دووماهییێ کری، ب تنێ ژنکا وی عائیشایا کچا ئەبوو بەکری ل نک وی بوو؛ چونکی بەری هنگی باشییەکا بەروەخت ب سەر حالێ وی دا هاتبوو، حەتا مرۆڤ و هەڤالێن وی یێن نێزیک هزر کر ئێش و نەخۆشییا وی نەما، لەو هەر ئێکی قەستا کارێ خۆ کر، و ب تنێ عائیشا ل نک وی ما..

هەر وەسا مە ئاشکەرا کر کو دەمێ بۆ عائیشایێ مسۆگەربووی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تمام بوو، وێ ئەو درێژکرە سەر جهێ وی و پاتەیەک ب سەر دادا، و دێمێ خۆ د ناڤ پالیفکەکێ را ڤەشارت، و کرە گری.. و دیارە ئەو نەشیا ب رەنگەکێ وەسا خۆ بگرت کو دەنگێ وێ نزم بمینت، لەو دەنگێ گرییا وێ گەهشتە مەزەلکێن دەور و بەران: مەزەلکا حەفصایێ ل بەر سنگی، و یا فاطمایێ ل پشت، و یا سەودایێ ب رەخ ڤە.. لەو هەر د گاڤێ دا ئەو هەمی لێ کۆمبوون.

و ژ بەر کو د ناڤبەرا مەزەلکا عائیشایێ و مزگەفتێ دا ب تنێ دەگەهەک هەبوو، خەبەر زوی گەهشتە مزگەفتێ ژی، و دیارە هنگی عومەرێ کورێ خەططابی و موغیرەیێ کورێ شوعبەی ل نێزیک بوون، گاڤا خەبەر گەهشتییە وان، وان نەشیا خۆ بگرن، لەو ئێکسەر ئەو ب نک مەزەلکا عائیشایێ ڤە چوون، و دەستویری خواست کو بچنە ژۆر، عائیشا دبێژت: پشتی من پەردە بەردای من دەستویری دا وان، عومەر ب نک پێغەمبەری ڤە هات، و بەرێ خۆ دایێ، پاشی گۆت: وەی بۆ دلگرتنا وی! دلگرتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چەند یا دژوارە! و گاڤا ئەو چووینە نک دەرگەهی دا دەرکەڤن، موغیرەی گۆتە عومەری: عومەر، پێغەمبەر یێ مری!

و ئەو ب خۆ بەلکی عومەری ژی د دل دا زانیبت کو ئەو یێ مری، یان شکەک بۆ وی چێ ببت، بەلێ وی نەڤێت باوەر بکەت! و گاڤا موغیرەی ئەو روی ب روی دانایە بەرانبەر راستییێ، (صەدمەکا) وەسا بۆ وی چێبوو وی نەڤیا خۆ لێ هشیار بکەت، لەوا ئەو ب کەرب ڤە ل موغیرەی زڤری و گۆتێ: تو درەوان دکەی، بەلکی تو مرۆڤەکی فتنەیەکا د سەرێ تە دا هەی!

و موغیرەی خۆ بێ دەنگ کر.. چ ژ ترسێن کەربا عومەری دا بت، چ ژی وی د دل دا حەز کربت وەکی عومەری بت.

و خەبەر ل مزگەفتێ بەلاڤبوو، و ژ مزگەفتێ بەلاڤبوو و کەفتە ناڤ بازێری، و خەلک هەمی ل دۆرێن مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کۆمبوون، و دەیکا موسلمانان عائیشا ئەوا ناڤدار ب رەهوانبێژییێ و شارەزا ب شعر و ئەدەب و پەیڤێن نازکێن عەرەبان، ب جوانترین دیمەن حالێ صەحابییان ل وی دەمی بۆ مە سالۆخ ددەت دەمێ دبێژت: ئەو وەکی وی پەزی لێ هاتن یێ ل شەڤەکا زڤستانێ یا ب باران، بێ شڤان مایە ل چۆلی، و گورگ ب ناڤ کەفتی!

هندەک مرۆڤان ب دەنگەکێ نزم ڤە گۆت: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ مری.. بەلێ عومەر وەکی مرۆڤەکێ عەقلێ خۆ ژ دەست دای هات و چوو و ب دەنگەکێ بلند گازی کر: نە ب خودێ، پێغەمبەر نەمرییە، جارەکا دی خودێ دێ وی ڕاکەتەڤە و ئەو دێ دەست و پییێن وان کەسان بڕت ئەوێن دبێژن: ئەو یێ مری! ئەو نەمرییە، ئەو یێ چوویە نک خودایێ خۆ کانێ چاوا مووسا چل ڕۆژان چووبوو نک خودایێ خۆ و زڤڕی ڤە! ئەوێن دبێژن: پێغەمبەر یێ مری ئەو منافقن، کەیفا وان ب مرنا پێغەمبەری دئێت!!

و هۆسا عومەری هەمی ئحتیمال دانان، ب تنێ ئەو نەبت یا ب دورستی چێبووی، و وی ب خۆ ب چاڤێن خۆ دیتی!

و ژ بەر ڤێ ئیصرارا عومەری صەحابی کەفتنە گومانێ، و گەلەک ژ وان دلێ خۆ ب هندێ خۆش دکر دگۆتە خۆ: دیسا، ما بەلکی عومەر یێ دورست بت، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نەمر بت! و دەمەکی صەحابی هەمی ل مزگەفتێ ب حێبەتی ڤە تێک هاتن و تێک چوون، و کەسێ نەزانی دێ چ کەت.. ئەبوو بەکر ژ دەرڤەی بازێڕی بوو، عومەری شیرێ خۆ هلگرتبوو و دگۆت: یێ بێژت: پێغەمبەرێ مری دێ ب ڤی شیری کوژم! ئەزمانێ عوثمانی شکەست بوو و کەفتبوو قورنەتەکێ مزگەفتێ نەدشیا پەیڤەکێ بدەت یان بستینت، و عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی خۆ ژ بەر چاڤا غەوارە کربوو، ل سەر ئەزمانێ وی نەدگەڕیا بێژتە خەلکی: عومەر یێ خەلەتە! و دلێ وی نەدگرت ژی بێژتە وان: ئەوا هوین ژێ دترست یا چێبووی.. لەو وی ل جهەکی ب تنێ خۆ ڤەشارتبوو، و ڕۆندک دباراندن.

ل ڤی دەمێ پەز مایە بێ شڤان.. شڤانێ ئوممەتێ پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتە مەیدانێ؛ دا بەرێ صەحابییان هەمییان بدەتە ڕێکا دورست.

## ئەبوو بەكرێ خۆراگر ل دەمێ تەنگاڤییان:

ل وی دەمێ خەلک هەمی مەندەهوشماین، عائیشایێ مرۆڤەکێ دبێژنێ: سالمێ کورێ عوبەیدی هنارتە نک بابێ خۆ ئەبوو بەکری ل وێ مالا وی ئەوا دکەفتە (سونحێ) ل تەنشت بازێری..

سالم ژی وەکی هەر صەحابییەکێ دی یێ حێبەتی بوو کانێ چ بێژتە ئەبوو بەکری، بێژتێ: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نەمایە؟ یان بێژتێ: ئەو یێ دلگرتی بووی و های ژ خۆ نەمایە؟ یان بێژنێ: د هەوارا صەحابییان وەرە سەرێن ڕێکان یێن ل وان بەرزەبووین؟

گاڤا ئەبوو بەکری مەندەهووشییا سالمی ل سەر دێمێ وی دیتی، و بەری سالم باخڤت، ئەبوو بەکری گۆتێ: پێغەمبەر تمام بوویە؟ وی نەگۆت: بەلێ.. چونکی وی دزانی کو ئەڤ بەرسڤە کانێ چەند بۆ وی یا نەخۆشە، ئەو بۆ ئەبوو بەکری نەخۆشترە.. سالمی گۆتێ: عومەر یێ دبێژت: ئەو نەمرییە، و هەچییێ بێژت: ئەو یێ مری، ئەز دێ ب ڤی شیری وی کوژم.

ئەبوو بەکر ب بێ دەنگییەکا خەمێ گاڤ لێ گران کرین ب نک سالمی ڤە هات و گۆتێ: وەرە دا بچین.. و ئەو ب نک بازێری ڤە هات، چوو مزگەفتێ، و ئەو حال دیت یێ خەلک تێدا، بەرێ هەمییان ما لێ کانێ دێ چ بێژت؟ وی نە دا و نە ستاند، هێدی چوو حەتا گەهشتییە مەزەلکا کچا خۆ عائیشایێ.. ژنکێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و کۆمەکا مرۆڤێن وی لێ کۆمبووبوون، ئەبوو بەکری گۆتە وان: ڕێکێ بدەنە من. وان ڕێکا وی ڤەکر و ئەو چوو هنداڤ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ڕاوەستییا، پاتە ژ سەر سەر و چاڤان ڕاکر، و دەستێ خۆ کرێ و گۆت: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ۝٣٠﴾ (الزمر: ٣٠)، پاشی هەردو دەستێن خۆ دانانە سەر زەندکێن وی و سێ جاران ب ئەنییا وی ڤە ماچی کر، و کرە گری و گۆت: وەی بۆ

خۆشتڤییێ من! پاشی گۆت: دەیک و بابێن من گۆری تە بن ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەز ب خودێ کەمە خودێ دو مرنان ل سەر تە کۆم ناکەت، و ئەو مرنا ل سەر تە هاتییە نڤیسین، ئەڤەیە گەهشتە تە.. ب ڤێ گۆتنا خۆ، ئەبوو بەکری خەلکێ حوجرێ هەمی بێ هیڤی کرن، کو مەسەلە یا تمامە، و ئەڤە مرنە، پاشی وی جارەکا دی پاتە ب سەر دادا، و دەرکەفتە مزگەفتێ.

ل مزگەفتێ هێشتا شیری عومەری د دەستان دا بوو و ئەو بۆ خەلکی دئاخفت، و گەف ل وان کەسان دکرن یێن دبێژن: پێغەمبەرێ مری.. ئەبوو بەکر هێدی ب نک ڤە هات، و گۆتێ: ڕوینە خوارێ! بەلێ عومەر نەڕوینشت! ئەبوو بەکر چوو حەتا گەهشتییە نک مینبەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و مینبەر -وەکی بەری نوکە مە گۆتی- سێ دەرەج بوون، و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خوتبە دخواند، ل سەر دەرەجا سێیێ ڕادوەستیا، هندەک دبێژن: ئەبوو بەکر ب سەر دەرەجا دویێ کەفت و ڕاوەستیا[1]، و دەست ب ئاخفتنێ کر، و هندەک دبێژن: ئەو ب ڕەخ مینبەرێ ڤە ڕاوەستیا و ب سەر نەکەفت، هەر چاوا بت، وی دەست ب ئاخفتنێ کر، و گاڤا خەلکی ئەو دیتی هەمی ژ دەور و بەرێن عومەری ڤەڕەڤین، و ل نک وی کۆمبوون؛ دا گوهێ خۆ بدەنێ کانێ دێ چ بێژت.

پشتی ئەبوو بەکری حەمدا خودێ کری و شاهدە دای، گۆت: گەلی مرۆڤان! هەچییێ ژ هەوە پەرستنا موحەممەدی دکر، ئەڤە موحەممەد مر و چوو، و هەچییێ پەرستنا خودێ بکەت خودێ یێ زێندییە و قەت نامرت.. پاشی وی ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ

---

(١) نەشیا خۆ ل جهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ببینت، و هندی ئەبوو بەکر خەلیفە ئەو ب سەر دەرەجا سێیێ نەکەفت، و گاڤا عومەر بوویە خەلیفە وی ل سەر دەرەجا ئێکێ خوتبە دخواند، و ل سەر دەمێ عوثمانی پشتی مزگەفت هاتییە بەرفرەهکرن، مینبەر هاتە گوهارتن، و ئێکا دی ژ شەش دەرەجان هاتە دورستکرن.

﴿أَفَإِين مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾﴾ (آل عمران: ١٤٤).

عومەر دبێژت: گاڤا وی ئەڤ ئایەتە خواندی، دا بێژی ژ نوی ئەو یا هاتییە خوارێ، و ژ نوی من گوهـ لێ بوو، لەو پیێن من شکەستن و ئەز کەفتمە عەردی، و دەنگ ژ من نەهات؛ چونکی من زانی ڕاستە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ مری. پشتی ئەبوو بەکری ئەڤ گۆتنا کورت د ناڤ صەحابییان دا گۆتی، خودێ وەسا حەز کر هشێن هەمییان هاتنە سەری، و ئەو ژ (صەدما) خۆ یا دژوار هشیار بوون، و وان زانی کو مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل کو ئەو موصیبەتەکا هندا مەزنە چو موصیبەتێن وەکی وێ ب سەر وان دا نائێن، بەلێ ئەو نە دووماهییا ڤی دینییە، و ئەڤ دینە دینێ خودێیە، و خودێ هەر دێ هەبت.

و وەکی ئەم دبینین د ڤێ موصیبەتا مەزن دا یا ب سەر صەحابییان دا هاتی و ئەو هەمی حێبەتی کرین، ب تنێ ئەبوو بەکر بوو ئەو کۆمکرینە سەرێک و بەرێ وان دایە ڕێکا دورست.

**ل بن کەپرا بەنوو ساعدە:**

ل تاخێ (بەنوو ساعدە) ل باکوورێ ڕۆژئاڤایا مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەپرەک هەبوو، بابکێ ساعدەییان ئەو بۆ خۆ وەک دیوانخانە دانابوو، دەمێ وان ڤیابا کۆم ببن؛ دا دان و ستاندنێ ل سەر تشتەکی بکەن، ئەو دچوونە وێرێ.

پشتی ئەبوو بەکر ل مزگەفتێ د ناڤ صەحابییان دا ڕابوویە ڤە و ئاخفتی، و ئەو تێ گەهاندین کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ مری و نەمایە، و دڤێت ئەو ب دلەکێ موکم پێشوازییێ ل ڤی خەبەری بکەن، پسیارا هاتییە سەر هزرا صەحابییان هەمییان ئەو بوو: ئەرێ کی دێ جهێ

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گرت؟ و نە پشتی مرنا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ نوی ئەڤ پسیارە هاتە سەر هزرا وان، بەلێ هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د سەرکەراتێ دا هندەک ژ وان، وەکی عەبباسی، هزر د ڤێ چەندێ دا دکر، و عەلی پال ددا کو ئەو بچت پسیارێ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت کانێ کی دێ ل شوینا وی بت؟ وەکی بەری نوکە مە ڤەگێڕای.

و دەمێ ئەبوو بەکر ژ گۆتنا خۆ یا ل مزگەفتێ خلاصبووی، و هەمی صەحابی تەسلیم بووین کو ڕاستە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نەمایە، موهاجر ل دۆر ئەبوو بەکری کۆمبوون، و حەقێ وان بوو ئەو ڤێ چەندێ بکەن، ما نە ئەبوو بەکر بوو یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیصرار کری کو ل جهێ وی نڤێژێ ل بەرا موسلمانان بکەت، و ما نە ئەبوو بەکر بوو یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ ناڤبەرا هەمی صەحابییان د خوتبا خۆ یا دووماهییێ دا مەدحێن وی کرین، و گۆتی: وان هەمی دەرگەهێن دئێنە مزگەفتێ بگرن، ئەو تێ نەبت یێ ژ مالا ئەبوو بەکری دئێت؟

موهاجر هەمی ل دۆر ئەبوو بەکری کۆمبوون، و بەرێ وان ما لێ کانێ ئەو دێ چ کەت و چ بێژت؟ و مرۆڤێن مالباتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەکی مامێ وی عەبباسی و عەیالێ وی و برازایێن وی، د گەل مەولاییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب حالێ خۆ ڤە دموژیل بوون، کانێ دێ چ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەن؟

هنگی ئەنصارییان هزرکر ئەڤە موهاجر بێی پسیارا وان بکەن یان گۆتنا وان وەرگرن یێ جێگرەکی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ددانن، لەو وان ب ڤێ چەندێ نەخۆشبوو، و ئەو ژی هەمی ل دۆر مەزنێ خەزرەجییان سەعدێ کوڕێ عوبادەی کۆمبوون، و ل ئێڤارا ڕۆژا دوشەنبێ ئەو چوون ل بن

کەپرا بەنوو ساعدەییان گەهشتنە ئێک، دا کو دان و ستاندنێ ل دۆر ڤێ مەسەلێ بکەن.

دەمێ خەبەر گەهشتییە موهاجران کو ئەنصاری یێن کۆمبووین، وان گۆتە ئێک و دو: برایێن مە یێن ئەنصاری ژی حەقێ وانە گۆتنا خۆ د ڤێ مەسەلێ دا بێژن، ڕابن دا بچینە نک وان و گۆتنا وان ژی بزانین.. و گاڤا ئەو نێزیک بووین، دو زەلامێن چاک ژ ئەنصارییان ئەو دیتن، پسیارا وان کر: هوین دێ چ کەن؟ وان گۆت: دێ چینە نک برایێن خۆ یێن ئەنصاری دا گۆتنا وان بزانین. وان گۆت: نەچن، هەما مەسەلێ صافی کەن پاشی هەڕنە نک وان. و ترسا ڤان هەردو زەلامێن ئەنصاری ئەو بوو د ناڤبەرا موهاجر و ئەنصاران دا دوبەرەکی پەیدا ببت، و د ڤی دەمێ نەخۆش دا یێ موسلمان تێ دبۆرن فتنەک سەری هلدەت. بەلێ موهاجران گۆتە وان: ب خودێ ئەم دێ چینە نک وان و بەرێ خۆ دەینێ کانێ وان چ دڤێت؟

گاڤا وەفدا موهاجرییان گەهشتییە وی جهی، و ئەبوو بەکر و عومەر و گەلەکێن دی د ناڤ دا بوون، مرۆڤەک ژ ئەنصارییان ڕابوو ڤە، و ئاخفت، پشتی حەمدا خودێ کری گۆتنا خۆ ئاراستەی موهاجران کر و گۆت: ئەم ئەنصارێن خودێ کەتیبەیا ئیسلامێینە، بەلێ هندەک ژ هەوە گەلی موهاجران دڤێت مە بدەنە لایەکی و مە ب چو حسێب نەکەن.. و گاڤا وی ئاخفتنا خۆ ب دووماهی ئینای، و هنگی سەعدێ کوڕێ عوبادەی یێ ڕوینشتیبوو، ژ بەر نساخییەکێ کراسێ خۆ د خۆ ئالاندبوو، عومەری ڤیا ڕابت باخڤت، بەلێ ئەبوو بەکری گۆتێ: ڕاوەستە.. پاشی ئەبوو بەکر ڕابوو ڤە، و ب ڕەنگەکێ نەرم و حەلیم ئاخفت، و گۆتە ئەنصارییان: هەچییا هەوە د دەر حەقا خۆ دا گۆتی وەسایە و وێڤەتر، و بەحسێ هندەک قەدر و بهایێ ئەنصارییان کر یێ وان نەگۆتی ژی، و گۆت: ئەم دزانین پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ گۆتی:

ئەگەر مرۆڤ هەمی بچنە ڕێکەکێ و ئەنصاری بچنە ڕێکەکا دی ئەز دێ چمە وێ ڕێکێ یا ئەنصاری دچنێ. و ئەی سەعد! تو دزانی و تو یێ ڕوینشتیبوُوی دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی: قورەیشی خودانێن ڤی کارینە.. هنگی سەعدی گۆت: تو ڕاست دبێژی، هوین ئەمیرن و ئەم وەزیرین.

و د ریوایەتەکێ دا هاتییە کو ئەبوو بەکری گۆت: ئەز ب ئێک ژ ڤان هەردو زەلامان یێ رازیمە هەوە کی ژ وان دڤێت وی هلبژێرن، و وی دەستێ عومەری و ئەبوو عوبەیدەی گرت. هنگی بوو دەنگ و دۆرێ خەلکی، و زەلامەکێ ئەنصاری ڕابوو ڤە و گۆت: من بۆچوونەکا دورست هەیە: ئەمیرەک ژ مە و ئێک ژ هەوە، و هنگی قەرەبالغ زێدەتر لێ هات، ئینا عومەر ڕابوو ڤە چوو دەستێ ئەبوو بەکری و گۆت: خەلیفەیێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دێ تو بی، و ئەڤە من بەیعە دا تە.. پاشی ل خەلکی زڤڕی و گۆت: گەلی مرۆڤان، هوین هەمی دزانن کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەری مرنا خۆ ئەبوو بەکر ب پێش مە هەمییان ئێخستبوو، دا ئیمامەتییا مە بکەت، ما ئێک ژ هەوە دڤێت وی پاش بێخت یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پێش ئێخستی؟ هنگی وان هەمییان پێکڤە گۆت: (نعوذ بالله) چاوا دێ وە کەین! و هەمی ل سەر هندێ پێکهاتن کو ئەبوو بەکر جهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بگرت.

## خیلافا صەحابییان ل سەر هندەک حوکمێن شەرعی:

پشتی هەمی صەحابی ل سەر هندێ پێکهاتین کو ئەبوو بەکر ببتە خەلیفە و جێگرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەمی هزرا وان ل سەر هندێ کۆمبوو کانێ چاوا دێ سەر و بەرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەن، و هنگی خیلاف د ناڤبەرا وان دا ل سەر هندەک مەسەلێن شەرعی یێن

پەیوەندی ب مرنا پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- هەی چێبوو، تشتێ بوویە ئەگەر کو مسەلا ڤەشارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ ڕۆژا دی بێتە پاشئێخستن، و مەخسەدا مە ب وان هەردو مسەلان: شویشتنا جەنازەیێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، و جهێ ڤەشارتنا وی. ئەو ب خۆ ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک جاران خیلاف د ناڤبەرا صەحابییان دا د هندەک مسەلەیێن دینی و یێن دنیایێ ژی دا چێ دبوو، بەلێ هەر جارەکا خیلاف پەیدا دبوو ئەو ئێکسەر دهاتنە نک خۆشتڤییێ خۆ پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- دا ئەو وێ خیلافێ ژ ناڤبەرا وان ڕاکەت. بەلێ ڤێ گاڤێ ئەو چ بکەن، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ناڤ وان دا نەمایە، و ئەو خیلافا خۆ ببەنە نک کێ؟

**مسەلەیا شویشتنا جەنازەیێ پیرۆز:**

کو ل نیڤرۆیا ڕۆژا سێشەنبێ بوو، و د مسەلەیا شویشتنا جەنازەیێ پیرۆزێ پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- ل دەسپێکێ صەحابی ب خیلاف چوون، هەر ئێکی دڤیا ئەڤ شەرەفا مەزن بۆ وی بت، بەلێ ئەبوو بەکری هەر زوی خیلاف ژ ناڤبەرا وان ڕاکر، و گۆتە صەحابییان: بهێلن، بلا کوڕێن بابێ وی وی بشۆن.. و مەخسەدا ئەبوو بەکری زەلامێن مالباتا پێغەمبەری بوون -سلاڤ لێ بن- ژ مام و پسمامێن وی، و ئاشکەرایە د شریعەتی دا کو یێ ژ هەمییان فەرتر کو مری بشۆن مرۆڤێن وی یێن نێزیکن، و ئەڤە حوکمەکێ شەرعییە ئەبوو بەکری بیرا صەحابییان لێ ئیناڤە، و هنگی ئەو هەمی قانع بوون.

شویشتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەر ل وی جهی بوو یێ ئەو لێ مری د مەزەلکا عائیشایێ ڤە، و گاڤا دەمێ شویشتنێ هاتی ب تنێ مرۆڤێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێن نێزیک چوونە د مەزەلکێ ڤە:

مامێ وی عەبباس، و هەردو کوڕێن وی فەضل و قوثەم، و عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی، و ئوسامەیێ کوڕێ زەیدی، و صالح مەولایێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-. و دەمێ ئەو د مەزەلکێ ڤە کارێ شویشتنا جەنازەیی دکر، ئەوسێ کوڕێ خەولی یێ ئەنصاری، و ئەو ئێک ژ خەلکێ بەدرێ بوو، گۆتە عەلی: بارا مە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بدەنە مە.. یەعنی: بلا ئێک ژ مە ئەنصارییان ژی د گەل هەوە بت، هنگی عەلی گۆتە وی: وەرە ژۆر. و ئەو ژی چوو د مەزلکێ ڤە.

وان د مەزەلکێ ڤە کولەیەک ڤەدا، و ل پشت وی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- شویشت.

ئوسامەی و صالحی ئاڤ دئینا و لێ دکر[1]، و و عەبباسی و هەردو کوڕێن خۆ ئەو وەردگێڕا، و عەلی ئەو دشویشت، و ئەوس ب تنێ د ژۆر ڤە بوو، و چو نەدکر.

و بەری ئەو دەست ب شویشتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەن، وان نەزانی کانێ وەکی مرییێن دی جلکان ژ بەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەن یان ژی وی ب جلک ڤە بشۆن؟ عائیشا دبێژت: هنگی خودێ وەسا حەز کر تەمارا خەوێ کەفتە چاڤێن وان هەمییان، حەتا ئەرزنکێن وان مانە ب سنگێن وان ڤە، و دەنگەک ژ لایێ مەزەلکێ ڤە هاتە وان: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب جلک ڤە بشۆن. ژ بەر هندێ وان کراسێ فرەهـ و شۆڕێ د بەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ بەر وی نەکر، بەلکی عەلی د سەر

---

(١) د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو ئەو ئاڤ ژ بیرا (غەرس)ێ هاتبوو ئینان، و ئەو بیرەکە ڕۆژهەلاتا باکوورێ مزگەفتا قوبائێ، و ژ بەر کو ئاڤا وێ یا خۆش و شرین بوو گەلەک جاران ئەو بۆ ڤەخوارنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دهاتە ئینان، و د هندەک ریوایەتێن ضەعیف دا هاتییە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شیرەت کربوو کو وی ب ئاڤا وێ بیرێ بشۆن.

کراسی ڕا دەستێ خۆ د لەشێ وی ددا و دشویشت. عائیشا دبێژت: ئەگەر ئەوا ڤێ گاڤێ من دزانی هنگی من زانیبا، من نەدهێلا ژ بلی ژنکێن وی ئێک وی بشۆت.

پشتی ئەو ژ شویشتنێ خلاصبووین وان ئەو زوها کر، و سێ پارچە ژ پاتەکێ یەمەنی یێ سپی ئینان و وەک کفن کرنە بەر وی، عائیشا دبێژت: ئەو پاتەیەک بوو چو پەنبی د ناڤ دا نەبوو.

**کرنا نڤێژێ ل سەر جەنازەی:**

پشتی شویشتن ب دووماهی هاتی، دیسا صەحابی تێک هاتن و تێک چوون، و گۆتن: ئەم نزانین کانێ نڤێژێ ل پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- بکەین یان نە؟ و ئەگەر ئەم نڤێژێ لێ بکەین، ئەم چاوا بکەین؟ و ژ بەر کو وان بەری هنگی بەیعە دابوو ئەبوو بەکری کو ئەو دێ جێگرییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ئیمامەتییا وان دا کەت، ئەو چوونە نک ئەبوو بەکری و گۆتنێ: ئەرێ دێ نڤێژێ ل سەر پێغەمبەرێ خودێ ژی کەین؟ وی گۆت: بەلێ.. وان گۆتێ: چاوا نڤێژێ ل وی بکەین؟ ئەبوو بەکری گۆت: هندەک مرۆڤ دێ چن نڤێژێ لێ کەن، و گاڤا خلاصبوون ئەو دێ دەرکەڤن و هندەکێن دی چن، حەتا هەمی نڤێژێ ل سەر دکەن.

و چونکی مەزەلا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یا ب دو دەرگەهـ بوو، ئەو د دەرگەهەکی ڕا دچوون نڤێژ دکر و د دەرگەهێ دی ڕا دەردکەفتن، و دەمێ وان نڤێژ دکر هەر ئێکی جودا دکر، یەعنی: وان ب جماعەت نەدکر.

**ڤەشارتن و جهێ ڤەشارتنێ:**

ب ڤی ڕەنگی و حەتا صەحابی ژ کارێ شویشتن و کفنکرن و نڤێژکرنێ خلاصبووین، ڕۆژ بەر ب ئاڤابوونێ ڤە چوو، و شەڤا سێشەنبێ ل سەر

چارشەنبێ هات، و دۆرا ڤەشارتنێ هات، صەحابییان ب حێبەتی ڤە پسیار ژ ئێک و دو کر: ئەرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل بن ئاخێ ڤەشێرین؟

چاوا دلێ وان دێ گرت ئەو خۆشتڤییێ خۆ ل بن ئاخێ ڤەشێرن؟

پشتی هنگی ئەگەر وی ڤەشێرین ژی وی ل کیڤە ڤەشێرین؟

هندەک موهاجرییان گۆت: دێ وی بەینە جهێ باب و باپیرێن وی ل مەکەهێ و ل وێرێ وی ڤەشێرین. ئەنصارییان گۆت: دێ وی ل مەدینێ ڤەشێرین، جهێ ئەو لێ ئاکنجی بووی. و ئەڤە ژی ئێک ژ وان مەسەلەیان بوو یێن خیلاف د ناڤبەرا صەحابییان دا چێبووی، و بوویە ئەگەرا گیرۆبوونا ڤەشارتنێ.

هنگی هاتە بیرا ئەبوو بەکری کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جارەکێ گۆتبوو: ((**یدفن النبي حيث قبض**)) پێغەمبەر ل وی جهی دئێتە ڤەشارتن یێ رحا وی لێ دئێتە ستاندن. و گاڤا ئەبوو بەکری ئەڤ حەدیسە بۆ وان گۆتی، هەمی ب گۆتنا ئەبوو بەکری رازیبوون و گۆتن: ئەم دێ وی ل وی جهی ڤەشێرین یێ ئەو لێ مری. لەو وان تەختێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ وی جهی ڤەگوهاستن، و کارێ کۆلانا زیارەتی کر. و ل مەدینێ دو کەس هەبوون کارێ وان چێکرنا قەبران بوو: ئەبوو عوبەیدەیێ کورێ جەرراحی قەبرێن خەلکێ مەکەهێ چێ دکرن، و ئەبوو طەلحەیێ کورێ سەهلێ ئەنصاری قەبرێن خەلکێ مەدینێ چێ دکرن، ئەبوو عوبەیدەی قەبر ل سەر رەنگێ (ضەریحی) چێ دکرن، یەعنی: چال دەمێ دهاتە کۆلان، وی لبنە ل هەر چار رەخان ب رێز دکرن، و مری دکرە د ناڤبەرێ دا، و ل سەر لبنەیان دگرت، و ئاخ رادادا سەر. بەلێ ئەبوو طەلحەی ب رەنگێ (لەحد)ی قەبر چێ دکر، یەعنی: پشتی چال دهاتە کۆلان، وی ژ لایێ قیبلێ ڤە ئاخ دبری و مری دکرە د وێ شەقێ دا و ل پشت وی لبنە ددانان و قەبر تژی ئاخ دکر.

گاڤا صەحابی ل سەر هندێ کۆمبووین کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل وی جهی ڤەشێرن یێ رحا وی لێ هاتییە ستاندن، عەبباسی گۆتە دو زەلامان: ئێک ژ هەوە هەرنە ب دویڤ ئەبوو عوبەیدەی ڕا و ئێک ب دویڤ ئەبوو طەلحەی ڕا، دا بێن زیارەتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکۆلن. پاشی عەبباسی گۆت: یا رەببی وێ بۆ پێغەمبەرێ خۆ هلبژێرە یا تە دڤێت.

ئەوێ چوویە ب دویڤ ئەبوو عوبەیدەی ڕا ئەو نەدیت، بەلێ ئەوێ چوویە ب دویڤ ئەبوو طەلحەی ڕا ئەو دیت و ئینا، و ئەبوو طەلحەی زیارەتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەکی یێن خەلکێ مەدینێ چێ کر.

ل گۆشەیێ بەرقیبلێ (باشووری) ل لایێ دەستێ ڕاستێ (ڕۆژئاڤا) ژ مەزەلکا عائیشایێ، ل بەر وی دیوارێ دکەفتە د ناڤبەرا مەزەلکێ و مزگەفتێ دا زیارەتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتە کۆلان، سەرێ وی دکەفتە لایێ مزگەفتێ و پییێن وی ل لایێ دی، و دەمێ ئەبوو بەکر مری زیارەتێ وی ژی ل نک یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتە کۆلان، سەرێ وی دکەفتە بەرانبەر پییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، پاشی عومەر ژی هەر ل وێرێ هاتە ڤەشارتن، سەرێ وی دکەفتە بەرانبەر پییێن ئەبوو بەکری.

و هەر ئەوێن جەنازەیێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شویشتی ژ مرۆڤێن وی یێن نێزیک، ئەو داهێلا د قەبری دا و ڤەشارت ژی، و دەمێ ڤەشارتنێ -وەکی مە گۆتی- شەڤ بوو، و ل دەمێ شویشتن و ڤەشارتنێ چو ژ کچ و ژنکێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل وی جهی دئامادە نەبوون، عائیشا دبێژت: هنگی ئەم ب ڤەشارتنا وی حەسیاین دەمێ دەنگێ تەڤر و بیران ب شەڤێ هاتییە گوهێن مە.

# ڕۆندكێن خاترخواستنێ

ڕۆژەكێ هندی وێ ڕۆژا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تێدا باركری مەدینە د چاڤێن خەلكێ وێ دا تاری نەبووبوو، و ڕۆژەكێ هندی وێ ڕۆژێ ڕۆندك ل مەدینێ نەهاتینە باراندن، و ڤان ڕۆندكان.. ڕۆندكێن خاترخواستنێ، هێشتا بەری هنگی دەست پێ كربوون، هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ ساخبوو د ناڤ وان، وان ژ ترسێن وەغەركرنا وی دا دكرە گری، و ئەو نەدشیان بیننە سەر هزرا خۆ چاوا ڕۆژەك دێ ئێت ئەو دێ ل مەدینێ ئێن و چن و خۆشتڤییێ خۆ لێ نەبینن، و خەما وان خەمەكا ب تنێ نەبوو..

(أم أیمن) ئەو ژنكا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل زارۆكینییا وی ب خودان كری، و پشتی دەیكا وی مری بۆ وی بوویە دەیك، و ل دەمێ پێغەمبەرینییا وی پشتەڤانی لێ كری، و د گەل وی مشەختبوویە مەدینێ، پشتی پیربووی عەدەتێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- هەر جار ئەو دچوو سەرا وێ ددا، پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خاتر خواستی و چوویە وەغەرێ، ئەبوو بەكری گۆتە عومەری: وەرە دا بچین سەرا (أم أیمن)ێ بدەین، گاڤا پیرەژنێ دیتی ئەو ب ژۆركەفتین، و (كوڕێ وێ یێ خۆشتڤی) د گەل دا نە، وێ هند كرە گری حەتا گرییا ئەبوو بەكری و عومەری ئینای، ئەبوو بەكری گۆتێ: بۆچی تو دكەیە گری، ئاخری ئەوا ل نك خودێ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەی چێترە ژ وێ یا بۆ وی ل نك مە هەی. پیرەژنێ گۆت: ئەز وێ چەندێ دزانم، ئەز نە بۆ هندێ دكەمە گری كو

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوویە نک خودایێ خۆ، گرییا من بۆ هندێیە ئێدی وەحی ژ ناڤ مە هاتە بڕین!

هەر وەکی وێ دڤیا بێژت: گرییا من نە بۆ وییە، ئەز دزانم جهێ ئەو چوویێ بۆ وی ژ نک مە چێترە، گرییا من بۆ مەیە ڕۆناهییا وەحییێ ئەوا ب شەڤ و ڕۆژ ب سەر مە دا دهاتە خوارێ، ئێدی نائێتە خوارێ. ژ بلی چوونا خۆشتڤییێ وان، ئەوا دنیا د چاڤێن وان دا تاری کری، خەما وان خەما بڕینا ڕۆناهییا عەسمانی ژی بوو ژ عەردی، و ما خەمەک ژ وێ خەمێ مەزنتر هەیە؟

و هندی ئەو د ساخ خەما وان سڤک نەبوو، سالەکێ پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جارەکێ ئەبوو بەکر ب سەر مینبەرێ کەفت؛ دا خوتبێ بخوینت، گۆتنەکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت، و بیرا وی ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتە ڤە، و کەلا گرییێ لێدا، سێ جاران ئاخفتنا خۆ ب نیڤی کر و نەشیا تمام بکەت، ئینا ژ سەر مینبەرێ هاتە خوارێ!

و گەلەک جاران دەمێ دبوو ڕۆژا پێنجشەنبێ، عەبدللاهێ کوڕێ عەبباسی هند دکرە گری حەتا گرییا هەڤالێن خۆ دئینا، و دگۆتە وان: پێنجشەنب.. هوین دزانن پێنجشەنب چ ڕۆژە؟ پێنجشەنب ئەو ڕۆژ بوو یا ئێش تێدا ل سەر پێغەمبەری گران بووی.

ئەنەسێ کوڕێ مالکی دبێژت: پشتی ڤەشارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەز د بەر مالا فاطمایێ ڕا بۆریم، وێ گۆتە من: ئەی ئەنەس! چاوا دلێ هەوە گرت هوین ئاخێ بهاڤێنە سەر پێغەمبەرێ خودێ؟

و ب ڕاستی ئەو کارەکێ گران بوو ل بەر ئەنەسی و هەڤالێن وی ژی، ئەنەس دبێژت: پشتی مە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ڤەشارتی، مە باوەر ژ خۆ نەکر کو ئەڤە ئەمین مە ئەڤ کارە کری؟ چاوا ئەم شیاین وە بکەین؟!

و بیلالێ کوڕێ ڕەباحی ژی سەرهاتییا خۆ د گەل ڕۆندکێن خاترخواستنێ هەیە، بیلال موئەززنێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، هەر جارەکا نڤێژ دبوو، ئەو ب سەر جهەکێ بلند دکەفت ل مزگەفتێ و بانگ ددا، و پشتی بێنەکێ دا بێژتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: دەمێ نڤێژێیە ئەی پێغەمبەرێ خودێ.. و هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دا ژ مەزەلکا خۆ دەرکەفت و قەستا نڤێژێ کەت، و بیلالی قامەت دگرت..

ڕۆژا خۆشتڤییێ وی تێدا بارکری، وەکی هەر جار دەمێ نڤێژێ هات، و بەرێ هەمییان ما ل بیلالی، بیلال هاتە پێش.. دا ب وی کاری ڕابیت یێ خۆشتڤییێ وی ئەو پێ تەکلیف کری، بیلال ب سەر (مێئذەنێ) کەفت، و دەست ب بانگی کر:

- (الله أکبر.. الله أکبر)

پاشی ل سەر ملێ خۆ زڤڕی، دیت جهێ ئیمامی یێ خالیە..

ل سەر ملێ خۆ یێ چەپێ زڤڕی نەدیت پەردە ژ بەر دەرگەهێ مەزەلکا عائیشایێ ڕابیت و پێغەمبەر ب نک مینبەرێ ڤە بێت..

- (أشهد أن لا إله إلا الله.. أشهد أن لا إله إلا الله)

ئەو ژی گۆت.. و گاڤا گەهشتییە یا د دویڤ دا، (أشهد أن محمدا رسول الله) و گەهشتییە ناڤێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەشیا بانگی تمام بکەت، گریێ ڕێ نەدایێ، و بانگ ما د حەفکێ ڕا، هاتە خوارێ و کەفتە عەردی، هندەک صەحابی لێ کۆم بوون، و هەوجە نەدکر ئەو بێژنێ: تە خێرە؟ چونکی وان دزانی وی خێرە!

بیلالی گۆتە وان:

- بۆ خۆ پسیارا موئەذذەنەکی بکەن دا بۆ هەوە بانگ بدەت!

و پشتی هنگی بیلالی بانگ نەدا..

و ڕۆژا دوشەنبێ دوازدەی هەیڤا ڕەبیعولئەووەلێ دو بیرهاتن د دلێ خەلکێ مەدینێ دا هێلان، قەت و قەت نەهاتنە ژێبرن یان ژبیرکرن، ئەنەس -کو ئێک ژ خەلکێ مەدینێ بوو- دبێژت: خۆشترین ڕۆژ ل بەر خەلکێ مەدینێ ئەو دوشەنب بوو یا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا هاتییە مەدینێ، و نەخۆشترین ڕۆژ ئەو دوشەنب بوو یا وی تێدا وەغەرکری.

و ئەو هەردو دوشەنب ل دوازدەی ڕەبیعولئەووەلێ بوون.

و بەری ئەم ڤێ ناڤبرێ ب دووماهی بینین، مە دڤێت گوهداریيا هندەک ژ ئاوازێ دلەکێ شاعر بکەین، یێ کو ب پەیڤێن نازک گەلەک ڕۆندک ل ڕۆژا خاترخواستنێ باراندین، حەسسانێ کوڕێ ثابتێ ئەنصاری، شاعرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، ئەوێ پتر ژ شعرەکێ ل بیرهاتنا وەغەرکرنا خۆشتڤییێ خۆ ڤەهاندین، د شعرەکێ دا ژ شعرێن خۆ دبێژت:

مـا بَـالُ عَينِـكَ لا تَنَـامُ كـأنّها   كُحِلَـتْ مآقِيهـا بكُحْـلِ الأرْمَـدِ

جزعاً على المهديّ أصبحَ ثاويـاً   يا خيرَ من وطىءَ الحصى لا تَبْعُدِ

وجهي يقيكَ التربَ لهفي ليتنـي   غُيّبْـتُ قَبْلَـكَ في بَقِيـعِ الغَرْقَـدِ

تە خێرە، بۆچی چاڤێن تە خەو نائێتێ؟ تو دێ بێژی ئێشێ ئەو یێن گرتین و کول کرین؟ دیارە صەبرا تە نەمایە ژ بەر وی ڕێنیشاندەرێ چووی و ڕازای؟ ئەی ب بهاترین کەسێ ل سەر ئاخێ ب ڕێڤە چووی ژ مە دویر نەکەڤە، ڕوییێ من بلا تە ژ ئاخێ بپارێزت، وەی مالا من! خوزی بەری تو بچی ئەز ل گۆڕستانا بەقیعێ هاتبامە ڤەشارتن.

أأقِـيمُ بَعْـدَكَ بالمَدينَـةِ بَيْـنَهُمْ؟ يا لَيْتَني صُبّحْتُ سَـمَّ الأسْـوَدِ
أوْ حــلّ أمــرُ الله فينــا عــاجلاً في روحـةٍ مـنْ يومنـا أوْ في غـدِ
والله ما أسْـمَعُ مـا بَقِيـتُ بهالِـكٍ إلا بكيــتُ عــلى النبــيّ محمــدِ

چـاوا پشتی ته ئەز دێ د ناڤ خەلکی دا ل مەدینێ ئێم و چم؟ خوزی ژ خێرا خودێ ڕا ژەهرا کۆرەمارێ ڕەش دابانە من! یان ژی ئـەمرێ خـودێ ڤـێ ئێڤارێ یـان سوباهی ب سەر مـە دا هاتبا و ئەم هەمی نـەمابایین و مـە گوهـ ل مرنا تە نەبیا، ئەز ب خودێ کەمە هندی ئەزێ ساخ بم و مـن گوهـ ل مرنـا کەسەکی ببت ئەز دێ بۆ مرنا موحەمەد پێغەمبەری کەمە گری، چونکی ئـەو دێ بیرا من ل وی ئیننە ڤە.

يــا ويــحَ أنصــارِ النبــيِّ ورهطـهِ بَعْـدَ المغَيَّـبِ في سَـوَاءِ المَلْحَـدِ
ضاقتْ بالأنصارِ البلادُ فأصبحتْ سوداً وجوههمُ كلـونِ الإثمـدِ
صَـلّى الإلـهُ وَمَـنْ يَحُـفُّ بِعَرْشِـهِ والطيبـونَ عـلى المبـاركِ أحمـدِ

وەی بۆ ئەنصار و پشتەڤانێن پێغەمبەری و هەڤالێن وی پشتی وی یێ د گۆڕی دا هاتییە ڤەشارتن، وەلات ل ئەنصـارییان بەرتـەنگ بـوو و سـەر و چاڤێن وان وەسا تاری بوون وەکی ڕەنگێ کلی لێ هـاتن، صـەلەواتێن خودێ و ئەو ملیاکەتێن ل دۆر عەرشێ وی و پاکان ل سەر ئەحمەدێ پیرۆز بن.

## کەسینییا پێغەمبەری
## سلاڤ لێ بن

ژ بابەتێن سەرەکی یێن کو فەرە مرۆڤ بەحس ژێ بکەت دەمێ ل دۆر سیرەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دئاخڤت بابەتێ کەسینییا وییە، و تشتێ بەرچاڤ ل ڤێرێ ئەوە ئەڤ بابەتە زەلالترین بابەتە د سیرەتا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن-، و هەر کەسەکێ بەحسێ کەسینییا پێغەمبەری بکەت بڤێت نەڤێت دێ تەسلیم بت، و ئعترافێ ب مەزنییا وی کەت، ئەو پێغەمبەرێ -ب ئانەهییا خودێ- شیای شوینتبلێن خۆ ل سەر هەمی بەرپەڕێن دیرۆکا پشتی خۆ ئاشکەرا بهێلت، و بەلکی ئەگەرا د پشت ڤێ چەندێ ڕا ئەو بت مەزنییا کەسینییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل وی مستەواییە کو کەس نەشێت ئینکار بکەت، ئەو تێ نەبت یێ کەرب و کینێ چاڤ لێ تاری کرین.

**پیرۆزییا پێغەمبەران**:

پێغەمبەرێن خودێ، هەر چەندە ژ ناڤ مرۆڤان دئێنە هلبژارتن، چونکی بۆ وان دئێنە هنارتن، بەلێ ئەو پیرۆزترین کەسن د ناڤ وان دا، ژ لایێ نسەبا خۆ ڤە، و ژ لایێ ئەخلاقێ خۆ ڤە، و خۆ ژ لایێ سەر و بەرێ خۆ ژی ڤە، ئەو باشترین و بلندترین و ب بهاترین مرۆڤن، و ئەڤە تشتەکێ غەریب نینە ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینین کو ئەو ئەون یێن خودێ بۆ هلگرتنا پەیمانا خۆ هلبژارتین، خودایێ مەزن د ئایەتەکێ دا دبێژت: ﴿ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ﴾ (الأنعام: ١٢٤) خودێ چێتر دزانت کانێ ئەو دێ پەیاما خۆ ل کیڤە دانت.. و ئەڤە ڕاستییەکە هەر کەسەک ب ساناهی دشێت ب سەر هل ببت، ڕۆژا مەلکێ ڕۆمێ هیرەقلی پسیارا نسەبا پێغەمبەری -سلاڤ لێ

بن- ژ ئەبوو سوفیانی کری، و ئەبوو سوفیانی گۆتییێ: ئەو یێ خودان نەسەبە د ناڤ مە دا، هیرەقلی بەرسڤا وی دا و گۆتێ: پێغەمبەر هەمی دوەسانن، ئەو د ناڤ مللەتێن خۆ دا خودان حەسەب و نەسەبن. و پێغەمبەرێ مە ژی -سلاڤ لێ بن- ژ ڤی قاعیدەیی دەرنەکەفتبوو، ئەو ژی د ناڤ مللەتێ خۆ یێ عەرەب و ئویجاخا خۆ یا قورەیشی دا خودان شەریفترین نەسەب و بنەمال بوو..

## پێغەمبەرەکێ هلبژارتێ:

ئەو پێغەمبەرێ ئیسلام بەرێ مە ددەتێ، یێ کو خودێ بۆ پەیاما خۆ یا دویماهییێ هلبژارتی، سەروەرێ دووندەها ئادەمییە، و سەییدێ وانە ل دنیایێ و ئاخرەتێ، ئەوە یێ ژ ناڤ هلبژارتییان هاتییە هلبژارتن، د حەدیسەکێ دا یا (موسلم) ژێ ڤەدگوهێزت، هاتییە: ((إِنَّ الله اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى قُرَيْشًا مِنْ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ)) ژ ناڤبەرا عەیالێ ئیسماعیلی خودێ کینانە هلبژارت، و ژ ناڤبەرا کینانەی قورەیش هلبژارت، و ژ ناڤبەرا قورەیشی بنەمالا هاشمی هلبژارت، و ژ ناڤبەرا بنەمالا هاشمی ئەز هلبژارتم.

مەعنا: دەمێ حەزکرنا خودێ ل سەر هندێ پێکهاتی کو پێغەمبەرێ خۆ یێ دویماهییێ هلبژێرت، وی ژ ناڤ دووندەها ئیسماعیلێ کورێ ئیبراهیمی -سلاڤ لێ بن- باشترین بنەمال هلبژارت، باشترین ژ لایێ شەرەف و قەدر و قیمەتی ڤە، و ئەو بنەمال بنەمالا (کینانەیێ کورێ خوزەیمەی) بوو، ئەوێ ل بابێ خۆ یێ حەفتێ دگەهشتە عەدنانی، پاشی ژ دووندەها ڤێ کینانەی ژی، وی باشترین بنەمال هلبژارت کو بنەمالا کورێ وی (نەضری) بوو، ئەوێ دگۆتنێ: قورەیش، پاشی ژ ناڤ بنەمالا نەضری ژی، وی دووندەها هاشمێ

کوڕێ عەبدمەنافی هلبژارت، و ژ دووندەها هاشمی موحەممەدێ کوڕێ عەبدللاهی هلبژارت.. ڤێجا ئەو هلبژارتییێ هلبژارتییانە، و چێترینێ چێترانە -سلاڤ لێ بن-، و نەسەبا وی د ناڤ عەرەبان دا پاقژترین و بلندترین نەسەبە.

و دئێتە زانین کو ئەو کەسێ نەسەبەکا بلند و شەریف هەبت، بلندی و پێشکێشی دێ یا ژ هەژی وی بت، و هێڤێنێ پاک پترین جاران کارتێکرنەکا باش ل خودانی دکەت، و ڕێکێ بۆ وی خۆش دکەت کو د ناڤ خەلکی دا ببتە پێشەوا، و خەلک ب ئیمامەتییا وی رازی ببن. ئەڤە ژ لایێ ئەصل و نەسەبان ڤە، و ئەگەر ئەم ژ لایێ کەسینییا وی ژی ڤە بەرێ خۆ بدەینێ، دێ بینین ئەو باشترین و چێترین مرۆڤە، چ ژ لایێ سەر و بەری ڤە بت، یەعنی: ژ لایێ سەر و سیما و بەژن و بالێ ڤە، یان ژ لایێ تبیعەت و ئەخلاقی و کەسینییا مەعنەوی ڤە بت..

و ل ڤێرێ مە دڤێت ب کورتی ئیشارەتێ بدەینە کەسینییا وی ژ ڤان هەردو لایان ڤە یێن مە بەحس ژێ کری؛ دا ب تمامی بزانین کانێ ئەو چ پێغەمبەرە یێ ئیسلام ژ مە دخوازت ئەم حەز ژێ بکەین، و ل سەر ڕێکا وی بچین؟

**سەر و بەرێ وی ﷺ:**

یان کەسینییا وی یا (حسسی) ئەوا کەسێن هەڤچاخ بۆ وی ب چاڤ دبینن، و سەرەدەرییێ د گەل دکەن، وەکی بەژن و بالێ، ڕەنگێ دێم و سەر و چاڤان، سەر و بەرێ جل و بەرگان.. وهتد، و بەلکی -ل نک گەلەک کەسان- ئەڤی لایی گرنگییا خۆ نەبت؛ چونکی هەر کەسەک دەمێ دمرت ڤی لایی د گەل خۆ دبەتە بن ئاخێ، و ئەو کەسێن پشتی وی دئێن، بەلکی نە سلبی نە ئیجابی چو مفایی ژێ وەرنەگرن، و گەلەک کەس د دیرۆکێ دا هەنە

مرۆڤ ب وان و كارێ وان (موعجب) دبت، بێی بزانت كانێ سەر و سیمایێ وان یێ چاوایە.. بەلێ د گەل هندێ ژی دەمێ مرۆڤی كەیف ب كەسەكی دئێت، یان حەز ژێ دكەت، حەز دكەت (وێنەیێ) وی ببینت، یان ئەگەر وێنەیێ وی ب دەست نەكەڤت ژی بزانت كانێ ئەو یێ چاوا بوو، ل سەر ڤی بناخەیی مە دڤێت گەلەك ب كورتی وێنەیێ پێغەمبەرێ خۆشتڤی -سلاڤ لێ بن- ل بەر چاڤێن هەوە بدانین، هەر وەكی هوین وی دبینن! و بێ گومان باشترین كەس بۆ ڤەگوهاستنا وێنەیێ وی بۆ مە ڕابن، دێ ئەو كەس بن یێن هەڤالینییا وی كری، كو صەحابییێن وینە.

نێزیكترین كەس د ناڤ صەحابییان دا بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پسمامێ وی عەلی بوو، ئەو ب ڤی رەنگی سالۆخەتێن پێغەمبەری بۆ مە ئاشكەرا دكەت، دبێژت: ((ئەو مرۆڤەكێ گەلەك درێژ نەبوو، و یێ كورت ژی نەبوو، یێ ناڤنجی بوو، سەرێ وی یێ بچویك نەبوو، و موویێ سەرێ وی نە گەلەكێ حلی بوو، و نە یێ خەلەك بوو، هەر ئەندامەكێ لەشێ وی ئەگەر تە بەرێ خۆ دابایێ دا هزر كەی جوانی هندە، دێمێ وی یێ گرۆڤر نەبوو، بەلێ یێ نێزیكی گرۆڤرییێ بوو، چاڤێن وی درەش بوون، و ب كەلەخی ڤە ئەو یێ زەلام باش بوو، و یێ هویر نەبوو، ناڤملێن وی دپان بوون، گاڤا ئەو ب رێڤە دچوو ب لایێ سنگی ڤە دچوو، تو دا بێژی یێ ب لایێ نشیڤی ڤە دچت..)).

و ئەنەسێ كورێ مالكی -خودێ ژێ رازی بت- ئەوێ دەهـ سالان خزمەتا وی كری، دبێژت: ((پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مرۆڤەكێ زێدە یێ سپی نەبوو بەلكی ئەو یێ ئەسمەر بوو، ب بەژنا خۆ یێ ناڤنجی بوو، من نەزانییە خودێ ئێكێ وەكی وی جوان، یان بێنخۆش و نەرم و حەلیم، دابت)).

و هەڤالەکێ وی یێ دی، ئەوێ دبێژنێ: هندێ کورێ ئەبوو هالەی، ب ڤی ڕەنگی وی بۆ مە وەصف دکەت، دبێژت: ((ئەو مرۆڤەکێ گر و زەلام باش بوو، دێمێ وی تە دگۆت هەیڤا چاردە شەڤییە گەش دکەت، نە یێ کورت و نە یێ درێژ بوو.. ڕەنگێ وی وەکی یێ هەیڤێ بوو: سۆراتییەکا ب سەر سپی یان زەری ڤە، بروێێن وی دزراڤ بوون و هەردو نەدگەهشتنە ئێک، دفنا وی ژ نیڤێ وێڤە پیچەکێ یا بلند بوو، ڕیهێن وی دبۆش و درێژ بوون، ئالەکێن وی دقەلەو نەبوون، دڕاست بوون، ددانێن وی هندەک ڤالاتی د ناڤبەرێ دا هەبوو، ستوێ وی دا بێژی ژ زیڤی یێ هاتییە چێکرن، مرۆڤەکێ تژی بوو، بەلێ زکێ وی ل ڕاستا سنگێ وی بوو، گاڤا ب ڕێڤە دچوو بەرێ وی پتر ل عەردی بوو، و وی هەڤالێن خۆ ددانە بەرا خۆ..)).

**تبیعەت و ئەخلاقێ وی:**

و ئەڤ لایە یێ گرنگە بۆ مە، چونکی ئەم دداخوازکرینە کو د ڤی لایی دا چاڤ لێ بکەین، و وی بۆ خۆ بکەینە (قودوە) وەکی د ئایەتەکا پیرۆز دا هاتی.

ب خواندنا سیرەتا وی، و ب گوهداریکرنا گۆتنێن هەڤالێن وی، بۆ مە ئاشکەرا دبت کو هەر تبیعەتەکێ باش، و ئەخلاقەکێ مەزن ل نک وی هەبوو، و تێرا وی هەیە مەدح کو خودایێ وی دەمێ بەحسێ وی دکەت، دبێژتێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝ ﴾ (القلم: ٤) یەعنی: مسۆگەر تو خودان ئەخلاقەکێ مەزنی. و دەمێ پسیار ژ عائیشایێ -خودێ ژێ رازی بت- هاتییەکرن کانێ ئەخلاقێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ چاوا بوویە؟ وێ گۆت: ئەخلاقێ وی قورئان بوو.

و ئەڤە کورتترین پەیڤە ئەخلاقێ وی د ناڤ خۆ دا کۆم دکەت، مەعنا وێ ئەوە هەر ئەخلاقەکێ باش یێ قورئان پێ هاتی ب تمامترین ڕەنگی

ل نک وی هەبوو: تەواضوعا هەیبەت د گەل دا، شەرما زیرەکی د گەل دا، مەردینییا ڕاست یا دویر ژ خۆئینانەپێشێ، ئەمانەت و دەستپاکی، ڕاستگۆییا د گۆتن و کریاران دا، زوهدا د دنیایێ دا، دلسۆزی و ئیخلاص د هەمی کاران دا، موکمیا دلی و ڕەهوانبێژیا ئەزمانی، تێگەهشتنا باش و شرۆڤەکرنا دورست بۆ هەر ڕویدانەکێ، دلۆڤانییا د گەل مەزن و بچویکان، دلنەرمی و ڤیانا لێبۆرینێ و خۆدویرکرنا ژ زڤراتییێ، صەبرا ل سەر نەخۆشییێ و بستەیی د گۆتنا حەقییێ دا.. و هتد.

عائیشا بەحسێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکەت، دبێژت: ((جارەکا ب تنێ ژی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەهاتییە خواستن ئەو ئێک ژ دو تشتان هلبژێرت ئەگەر وی یێ ب ساناهیتر نەهلبژارت بت هندی گونەهـ د وی تشتی دا نەبا، ژ خۆ ئەگەر گونەهـ تێدا هەبا وی ژ هەر کەسەکی پتر خۆ ژێ ددا پاش، و جارەکا ب تنێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ خۆ تۆل ژ کەسێ نەستاندییە، وەسا تێ نەبت ئێک پێ ل توخویبێن خودێ بدانت)).

و ئەنەسێ کوڕێ مالکی مەسەلێ بۆ مە کورت دکەت، دەمێ دبێژت: (( ئەخلاقێ پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- ژ یێ هەر کەسەکێ دی باشتر بوو)).

## دەمێ وی بەحسێ خۆ کری:

ئەڤە دەمێ صەحابییێن وی بەحسێ وی کری، و چاوایە دەمێ ئەو ب خۆ بەحسێ خۆ دکەت؟

جارەکێ هندەک صەحابییێن وی هاتنە نک و گۆتنێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بۆ مە بەحسێ خۆ بکە.. وی گۆت: ((أنا دعوة أبي إبراهيم، وَبشرى عيسى عليهما السلام، ورأت أمي حين حملت بِي أنه خرج منها نور أضاء له قصور

الشام)) و وەکی ئەم دبینین ژ ناڤبەرا وان هەمی سالوخەتێن وی هەین، یێن مە بەحسێ هندەک ژ وان کری، وی ئیشارەت دا سالوخەتێ ژ هەمییان مەزنتر، سالوخەتێ پێغەمبەرینییێ، و وێ ڕوناهییا ب هاتنا وی د ناڤ خەلکی دا بەلاڤبووی، و ئەو بەسە سالوخەت!!

گوت: ئەز ئەو دوعامە یا بابێ من ئیبراهیمی کری..

ئەو دوعا چ بوو؟

ئەو بوو یا ئیبراهیمی ژ خودایێ خو کری دەمێ طەواف ل دور کەعبێ کری، پشتی دوبارە ئاڤاکری، دەمێ گوتی: ﴿رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٢٩﴾ (البقرة: ١٢٩) یا رەببی، د ناڤ دووندەها من دا ئەوا ل ڤێرێ ئاکنجی بووی، تو پێغەمبەرەکی بهنێرە ئایەتێن تە بو وان بخوینت، و وان فێری کیتاب و سوننەت و کارێن بنەجھ بکەت، و وان ژ هەمی کێماسی و خرابییان پاقژ بکەت.. خودێ دوعایا وی ب جھ ئینا، و ئەز ئەو پێغەمبەرم یێ وی داخوازکری.

گوت: و ئەز ئەو مزگینیمە یا عیسایێ کورێ مەریەمێ دایە مللەتێ خو دەمێ گوتی: ﴿وَإِذۡ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم مُّصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَمُبَشِّرَۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ﴾ (الصف: ٦) گەلی ئسرائیلییان، ئەز پێغەمبەرێ خودێمە بو هەوە هاتیم، ڕاستییا تەوراتێ بو هەوە ئاشکەرا بکەم، و مزگینییێ بدەمە هەوە کو پێغەمبەرەک پشتی من دێ بو هەوە ئێت ناڤێ وی ئەحمەدە.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: و دەمێ دەیکا من یا گران ب من، وێ د خەونا خو ددیت، هەر وەکی ڕوناهییەک ژ وێ ڤەدپەشی قەسرێن شامێ

ژ بەر روهن دبوون.. و ڕۆژەک هات ئەو ڕۆناهییا دەیکا وی د خەونا خۆ دا دیتی، ل سەر عەردی و د واقعی دا پەیدا بوو، و نە ب تنێ شام ژ بەر گەش و روهن بوو، بەلکی هەر جهەکێ هەی ل سەر عەردێ خودێ هندەک ژ وێ ڕۆناهییێ گەهشتێ:

**میم مەطلەعێ شەمسا ئەحەد ئایینە صفەت کر**

**لامع ژ عەرەب بەرقێ ل فەخخارێ عەجەم دا**

# ڕێبازا پێغەمبەری
# سلاڤ لێ بن[1]

### ڕەحم ڕێبازا وی بوو
### ((یا أیها الناس إنما أنا رحمة مهداة)):

د قورئانێ و حەدیسێ دا، دو دەق هەنە تبیعەتێ وێ پێغەمبەرینییێ یا موحەممەد -سلاڤ لێ بن- پێ هاتییە هنارتن بۆ مە د چەند پەیڤەکێن کورت دا کۆم دکەن: قورئان دبێژت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ (الأنبیاء: ١٠٧) یەعنی: هەما مە تو -ئەی پێغەمبەر- یێ هنارتی دلۆڤانییەک بۆ هەمی مرۆڤان.

و حەدیس دبێژت: ((یا أیها الناسُ إنما أنا رحمةٌ مهداةٌ)) یەعنی: گەلی مرۆڤان، هەما ئەز دلۆڤانییەکم بۆ هەوە هاتیمە خەلاتکرن (حاکم ژ ئەبوو هورەیرەی ڤەدگوهێزت).

و هەر کەسەکێ ب زمانێ عەرەبان زانا بت، دێ زانت کو ڤان هەردو نەصان (حەصر) تێدا هەیە وەکی زمانزان دبێژن، جارەکێ ب (ما) و (إلا)یێ، و جارا دی ب (إنما)یێ، مەعنا: هەر وەکی خودێ و پێغەمبەرێ وی دڤێت بێژنە مرۆڤان هەمییان موسلمان و نە موسلمانان: ڕێبازا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- ژ ڕەحمێ پێڤەتر تشتەکێ دی نینە!

و پشتی ڤی عنوانێ مەزن یێ خودێ و پێغەمبەری بۆ ڕێبازا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- دانای دا بەرێ خۆ بدینە سەرهاتییا ڤی

---

(١) بەرێ خۆ بدە کتێبا: (إنسانیات محمد) یا سەیدا خالد محمد خالد.

پێغەمبەری د گەل رەحمێ و دلۆڤانییێ دا بزانین کانێ ئەو گۆتن و شعارەکێ ب دەڤی بوو یان ژی تبیعەتەکێ چاندی بوو د شەخصییەتا وی دا؟

ژ سیرەتێ بۆ مە ئاشکەرا بوو کو هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نەهاتییە دنیایێ خودێ ئێتیمی بۆ وی کربوو بار و پشک، و هێشتا ب دورستی ئەو د دنیایێ نەگەهشتی دەیکا وی ژی ئەو هێلا و ب رێکا بابێ وی دا چوو، بوو سێوی ژی.. دەمێ عەمرێ وی بوویە هەشت سال باپیرێ وی ئەوێ لێ دگەریا جهێ دەیکا وی و بابێ وی بگرت ئەو ژی مر.. ل وی دەمێ هەڤالێن وی د کۆشا دەیبابان دا و ل بەر سنگێ وان کەیف و تەناهی ددیت بەرێ وی دما ل عسمانی.

و ب سەربۆر یا هاتییە زانین کو د ڤێ دنیایێ دا چ تشت وەکی ئێتیمییێ دلی نەرم ناکەت، و کانیکا رەحمێ د گیانێ مرۆڤی دا ناپەقینت، چ تشت وەکی ئێتیمییێ وە ل مرۆڤی ناکەت مرۆڤ ئحساسێ ب گرنگییا رەحمێ بکەت، و ئەوێ برسی نەبت نزانت کانێ برس چەندا نەخۆشە..

تشتێ ژ هەمییان خۆشتر ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د دنیایێ دا نڤێژ بوو، وەکی ب رێکێن دورست ژێ هاتییە ڤەگوهاستن، و دەمێ ئەو دچوو د نڤێژێ دا تو دا بێژی ئەو یێ ژ ڤێ دنیایێ دەرکەفتی، هندەک جاران پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل مزگەفتێ دەست ب ڤێ نڤێژێ دکر ل بەرا صەحابییێن خۆ، دەنگێ گرییا زارۆکەکێ ساڤا دا ئێتێ.. ئەو دا لەزێ ل ڤێ نڤێژا هندە ل بەر وی شرین کەت بۆ هندێ دا زوی خلاص ببت، و وی دگۆت: ئەز دچمە د نڤێژێ دا و من دڤێت ئەز درێژ بکەم، بەلێ دێ من گوهـ ل دەنگێ گرییا زارۆکەکی بت، ڤێجا ئەز دێ لەزێ ل نڤێژێ کەم ئەز دبێژم نوکە دلێ دەیکا وی د دویڤ رایە.

هنده وی پێ نەخۆش بوو زارۆکەک بکەتە گری.. وی پێ خۆش نەبوو مەزنترین عیبادەت کو نڤێژە ببتە رێگر د ناڤبەرا دەیکێ و زارۆکێ وێ دا کو ئەو وی تەنا کەت!

ئەڤە رێبازا پێغەمبەرێ ئیسلامێیە، نە کارێ وان نەزانان ژ (گازیکەرێن ضەلالەتێ) ئەوێن دچنە د ناڤ کۆمێن زارۆکان دا و خۆ دپەڤینن، پاشی بێبەختی و ڤی پیسەکارێ خۆ ب ئیسلامێ راددەن و ب جهادا پیرۆز ب ناڤ دکەن.

پێغەمبەرێ دلۆڤان ئەوێ دزانی گرییا زارۆکی چەند یا گرانە ل سەر دلێ دەیکێ پێ خۆش نەبوو نڤێژ کو مەزنترین روکنێ ئیسلامێیە، ببتە مانع د رێکا نەخشاندنا گرنژینێ ل سەر لێڤێن زارۆکەکی، چونکی وی ژ (سەربۆرا خۆ یا شەخصی) دزانی چەند تشتەکێ نەخۆشە دەمێ گرییا زارۆکی دئێت سنگێ دەیکا وی ب دەست نەکەڤت ئەو سەرێ خۆ بدانتە سەر! و بەروڤاژی ڤێ چەندێ وی دزانی چەند یا گرانە دەستێ دەیبابان ژ عەیالی بێتە قەتاندن، لەو وی قەبویل نەدکر خۆ (جیهاد) ژی کو پیرۆزترین کارە د ئیسلامێ دا ببتە ئەگەرا ڤێ ڤەقەتاندنێ..

د حەدیسەکا دورست دا هاتییە: جارەکێ زەلامەک هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: دەستوریییێ بدە من دا ئەز د گەل تە بێمە جهادێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: دەیبابێن تە دساخن؟ وی گۆت: بەلێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: د دەر حەقا وان دا جیهادێ بکە. یەعنی: بزڤرە مال خزمەتا وان بکە، ئەوە جهادا تە! و د ریوایەتەکا دی دا هاتییە: وی زەلامی گۆت: بەلێ، ئەو هەردو دساخن، و دەمێ ئەز هاتیم وان هەر دویان دکرە گری، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بزڤرەڤە و کانێ چاوا تە ئەو گراندن وەسا وان بکەنینە.. و ژ ڤێ ژی ئاشکەراتر ریوایەتەکا

دییە ئەوا تێدا هاتی: پێغەمبەری گۆتی: نڤستنا تە ل نک دەیبابێن تە، کو کەیفا وان ب تە بێت و یارییان بۆ تە بکەن بۆ تە ژ هندێ چێترە تو د گەل من بێیە جهادێ.

ب دیتنا موحەممەدێ دلۆڤان چاندنا گرنژینەکێ ل سەر لێڤێن دەیبابان ب دنیایێ هەمییێ نائێتە کڕین، ئەگەر خۆ بهایێ وێ ئەو جهاد ژی بت یا گازییا ئیسلامێ بەلاڤ دکەت، رەحما مەزن و جیهادا مەزن ل نک موحەممەدی ئەوە دەمێ مرۆڤ دلێ دەیبابێن خۆ خۆش دکەت، و هەوە دیت چاوا وی رێ نەدا صەحابییەکێ خۆ کو مەزنترین عیبادەتی بکەت دەمێ ئەو عیبادەت بوویە ئەگەرا هێلانا دلێ دەیبابان.

ئەڤە رێبازا مەحەممەدییە -سلاڤ لێ بن- رەحم پاشی رەحم پاشی رەحم!

و رەحما موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- یان رێبازا وی د رەحمێ دا، ژ ڤی چارچووڤەیێ رەحمبرنا ب مرۆڤان ژی دەرباس بووبوو، (بوخاری) حەدیسەکێ ژ (سەعیدێ کوڕێ جوبەیری) ڤەدگوهێزت دبێژت: جارەکێ ئەز د گەل (عەبدللاهێ کوڕێ عومەری) بووم ئەم د بەر هندەک جحێلان ڕا بۆرین وان مریشکەک بۆ خۆ کربوو ئارمانج، گاڤا وان عەبدللاهـ دیتی هەمی ڤەرەڤین، عەبدللاهی گۆت: کێ ئەڤە کرییە؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لەعنەتێن ل وی کەسی کرین یێ ئەڤی کاری بکەت. و د ریوایەتا (موسلمی) دا هاتییە: عەبدلاهی گۆت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لەعنەت ل وی کەسی کرینە یێ خودان رحەکی بۆ خۆ بکەتە ئارمانج. یەعنی: ئەو مرۆڤ یێ لەعنەتییە ئەوێ ستێرکا خۆ ل تشتەکێ خودان رح بگرت و وی بۆ خۆ بکەتە ئارمانج و ژ قەستا بکوژت، ئەو تشت ئەگەر خۆ حەیوانەکێ بێ خێر ژی بت.

و حەتا هێشتا بۆ هەوە ئاشکەرا ببت کانێ جهێ رەحمێ د دلێ ڤی پێغەمبەرێ مەزن دا چەند بوو هندەک گۆتنێن وی ل دۆر رەحمبرنا ب خودان رحان بۆ هەوە ڤەگێڕین:

ل سەری دێ بێژین: کەسەکێ خودان باوەر نینە حەز نەکەت رۆژا قیامەتێ دەمێ تەنگاڤی دژوار دبت، و بەحەشت و جەهنەم ئامادە دبن رەحم پێ بێتەبرن، و د گەل بەحەشتییان بێتە کۆم کرن و ژ جەهنەمێ بێتە ئازا کرن.. و ئەگەر هەوە بڤێت بزانن کانێ چیە ڤێ مرادێ بۆ مرۆڤی ب جهـ دئینت گوهدارییا ڤان هەر سێ حەدیسان -بۆ نموونە- بکەن:

**یا ئێکێ:** موسلم ژ عەبدللاهێ کورێ مەسعوودی ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: حسێب د گەل مرۆڤەکی ژ ئوممەتێن بەری هەوە هاتەکرن، وی چو خێر نەبوون، ب تنێ خێرەک نەبت بارێ وی یێ ژێ تژی بوو، ئەو ژی ئەڤە بوو: ئەو مرۆڤەکێ دەولەمەند بوو، کڕین و فرۆتن دکر و تێکەلی خەلکی دبوو، و گەلەک جاران تشت ب دەین ددانە خەلکی و دگۆتە وان جحێلان ئەوێن ل بەر دەستێ وی کار دکر: ئەگەر هەوە دیت مرۆڤەکی حالێ وی یێ بەرتەنگە لێ ببۆرن، خۆ لێ بگرن یان دەینی پێ بهێلن.. کارێ خێرێ یێ وی کری بەس ئەڤە بوو، رەحم ب مرۆڤێ فەقیر دبر و بێنا وی تەنگ نەدکر، دا دەینێ وی بزڤڕینت، خودێ گۆت: مادەم ئەڤ عەبدێ من هندە یێ ب رەحم بوو و ل خەلکی دبۆری، هوین ژی لێ ببۆرن، چونکی عەفو و لێبۆرین پتر بابەتی مەیە.

**یا دویێ:** بوخاری ژ ئەبوو هورەیرەی ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: دەمەکی نێزیک بوو تهێناتی صەیەکی بکوژت، لەوا ئەو ل دۆر بیرەکا ئاڤێ دزڤڕی، ژنەکا ئسرائیلی یا دەهمەن پیس ئەو دیت،

ئینا خوفکا خوّ ژ پیّ خوّ کر و چوو د بیریّ دا بوّ تژی ئاڤ کر و ئینا دایێ، ژ بەر هندێ گونەهێن وێ بوّ هاتنە ژێبرن.

**یا سێیێ:** طەبەرانی ژ ئەبوو ذەرری ڤەدگوهێزت، دبێژت: من گوّتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: چ کار هەیە عەبدی ژ ئاگری رزگار بکەت؟ گوّت: وی گوّتە من: باوەرییا ب خودێ، من گوّت: کارەکێ د گەل باوەرییێ؟ گوّت: ئەگەر ئەو ژ ڤی رزقی بدەت یێ خودێ دایێ، من گوّت: ئەگەر یێ فەقیر بت و نەشێت چو بدەت؟ گوّت: بلا بەرێ خەلکی بدەتە کارێ باش و وان ژ کارێ خراب بدەتە پاش، من گوّت: ئەگەر یێ نەزان بت و نەشێت ب ڤی کاری رابت؟ گوّت: بلا هاریکارییا مروّڤێ پێتڤی بکەت، من گوّت: پا ئەگەر ئەو ب خوّ یێ پێتڤی بوو و نەشیا هاریکارییا کەسێ بکەت؟ گوّت: بلا پشتەڤانییا وی کەسی بکەت یێ زوّرداری لێ هاتییەکرن، من گوّت: ئەگەر یێ بێ هێز بت و نەشێت هاریکارییا وی کەسی بکەت یێ زوّرداری لێ هاتییەکرن؟ گوّت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گوّتە من: تە دڤێت خێرەکێ د هەڤالێ خوّ نەهێلی؟! نەهێلە خرابییا تە بگەهتە خەلکی. من گوّت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! ئەگەر ئەو ڤێ چەندێ ژی بکەت دێ چتە بەحەشتێ؟ گوّت: نینە موسلمانەک خەسلەتەکی ژ ڤان خەسلەتان بکەت ئەگەر ئەو دەستێ وی نەگرت حەتا وی دبەتە بەحەشتێ.

باش هزرا خوّ د دویماهییا ڤێ گوّتنا پێغەمبەری دا بکەن: (خەسلەتەکی ژ ڤان خەسلەتان) یەعنی: ئەگەر ساخلەتەکا ب تنێ ژی ژ ڤان هەمی خەسلەتان د گەل ئیمانێ ل نک تە هەبت، تێرا هندێ هەیە ئەو تە ببەتە بەحەشتێ.

## عەدالەتا شریعەتێ وێ بوو

**((إذا لم أعدل فمن يعدل)):**

سەرهاتییا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- د گەل عەدالـەتێ سـەرهاتییەکا عنتیکە بوویە، و ڤیانا وی بۆ ب جهئینانا دادییێ یا کێمتر نەبوویـە ژ ڤیانا وی بۆ ب کارئینانا رەحمێ..

ئبـن حـبـبـان ژ جـابـرێ ئەنصاری ڤەدگوهێزت کو رۆژەکێ پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- مالـەک د ناڤبـەرا صـەحابییێن خۆ دا لێکڤە دکـر، ئینـا ئەعرابییەکێ زڤر خۆ نێزیکی وی کر و گۆتێ: ئەی موحەممەد عەدالەتێ بکـە! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تێچوون بۆ تـە بت! ئەگـەر ئـەز عەدالـەتێ نەکـەم کـی دێ عەدالـەتێ کـەت؟ یـێ خوسـارەت ئـەزم، ئەگـەر ئـەز عەدالـەتێ نەکەم.

و ژبلی وان ڕامـانێن ژ ڤـێ سـەرهاتییێ دئێنـە وەرگـرتن هـەما ب تنـێ ڕابوونا مرۆڤەکێ عەدەتی کـو ئەعرابییـەکێ ڤالا بـوو ژ هـەر مەنصبەکێ هـەی بەرانبـەر کەسـێ ئێکـێ د دەولـەتێ دا بـێ تـرس و سـەهم، ئـەو ب خـۆ هنـدێ دگەهینت کو عەدالـەتا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- خەلـک بسـتە کربـوون کـو وێ بێژن یا د دلێ وان دا هەی، دحەق بن یان نە، و بێی ئەو بەرێ خۆ بدەنـە هندێ کانێ کاربدەسـتێن دەولـەتێ ب ڤـێ گۆتنـا وان خۆشـە یـان نـە! و ئەگـەر موحەممەد -سلاڤ لێ بن- ژ وان مەزنان با یـێن سـیاجەکی ژ خۆمـەزنکرن و ترسـێ د ناڤبـەرا خـۆ و خـەلکی دا ئاڤادکـەن، مرۆڤـەکێ عـەدەتی ژ کـوڕێن مللەتی هزرا هندێ نەدکر ئاخفتنەکا ب ڤی ڕەنگی ڕوی ب ڕوی بێژتێ..

و هەر دەلیڤەیەکا هلکەفتبا پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- ئستغلال دکـر دا صەحابییێن خۆ ل سەر (ڕاکرنا جـوداهییێ د ناڤبـەرا مرۆڤـان دا) پـەروەردە بکەت، و وان فێری هندێ بکەت کو وان سنگەکێ هندێ بەرفرەهـ هـەبت ئـەو

بشێن گوهێ خۆ بدەنە رەئیا کەسێ بەرانبەر، چونکی پێگاڤا ئێکێ یا مەزن بەر ب زۆرداریییێ دهاڤێن ژ هندێ دەست پێ دکەت دەمێ ئەو رێکێ ل خەلکی دگرن کو رەئیا خۆ ب سەربەستی بێژن و داخوازا مافێ خۆ بکەن، یان ئەو تشتێ ئەو هزر دکەن مافێ وانە!

(بوخاری و موسلم) د حەدیسەکێ دا ریوایەت دکەن کو جارەکێ زەلامەکی حەقەک ل سەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەبوو، و دیارە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چەندەکێ یێ گیرۆ بووی د زڤڕاندنا ڤی حەقێ وی دا، حەتا وی کەسی هزرکری هەر وەکی پێغەمبەری نەڤێت حەقێ وی بزڤڕینت، لەو ئەو زەلام هاتە نک پێغەمبەری و چەندەکێ زڤر ئاخفت، صەحابی تێک چوون، و هندەک ژ وان خۆ ئامادە کر دا بچنێ و وی ئەدەب دەن، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ژ وێ چەندێ دانە پاش و گۆت: ئەوێ حەقەک هەبت مافێ ئاخفتنێ هەیە.

ئەڤە رێبازا موحەممەدی بوو -سلاڤ لێ بن-: ئەوێ حەقەک هەی، چ حەقێ وی یێ تایبەت بت یان حەقەکێ گشتی بت، دڤێت رێ بۆ بێتەدان باخڤت و دەنگێ خۆ بگەهینتە وان کەسێن کار د دەستی دا، و ئەو کەسێن دەڤێ خەلکی ددورین، و گورزێ گەفێ ل هنداڤ سەری ڕادکەن دا ئەو لێڤا سەری ل یا بنی نەدەن و داخوازا حەقێ خۆ نەکەن.. وان و ڤی پێغەمبەری چو د گەل ئێک نینە!

ئەڤینداریيا موحەممەدێ مرۆڤ بەری کو ببتە موحەممەدێ پێغەمبەری بۆ ب جهئینانا حەقییێ یا مەزن بوو، دەمێ ژییێ وی بیست سال وی گوهـ لێ بوو هندەک زەلامێن مەکەهێ ل مالا (عەبدللاهێ کوڕێ جەدعانی) یێن کۆم بووین و ئارمانجا وان ئەوە پەیمانەکێ د ناڤبەرا خۆ دا گرێدەن بۆ هندێ دا هاریکاریيا مرۆڤێن بێ خودان و ستەم لێکری بکەن، هەر زوی ئەو چوو

قەستا جهێ کۆمبوونێ کر و دەستێ خۆ دکرە د ناڤ دەستێن کۆمبوویان دا و وی ژی پەیمان دا هندی ژێ بێت هاریکاریێ کسێن پێتڤی بکەت حەتا مافێ وان بۆ دزڤرینت، و ئەڤ پەیمانە ئەو بوو یا د دیرۆکێ ب ناڤێ (حلف الفضول) هاتییە نیاسین.. و خۆ پشتی پێغەمبەرینییێ ژی هندەک جاران پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب شانازی بەحسێ ڤێ پەیمانێ دکر. مەعنا: ڤیانا وی بۆ عەدالەتێ تشتەکێ خورستی بوو ل نک وی نە کو د گەل پێغەمبەرینییێ ل نک پەیدا بووبوو.

و ئەگەر ئەم هویر بەرێ خۆ بدەینە پەیوەندییا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- د گەل دادییێ دێ بینین (مەظاهرێن عەدالەتا وی) د چەند خالەکێن سەرەکی دا کۆم دبن:

**یا ئێکێ:** و ئەڤە بەری نوکە ژی مە ئیشارەت دایێ ئەوە وی نەدهێلا (جودایی) د ناڤبەرا خەلکی دا هەبت، چونکی لێکڤەکرنا خەلکی ل سەر ناڤ و نیشانێن ژێکجودا، و دانا چێتری و نەچێترییێ بۆ وان ل سەر بناخەیێ ڤان ناڤ و نیشانان ئەو دەرگەهێ مەزنە یێ زۆرداری تێرا دئێت و جهێ عەدالەتێ دگرت.

(حاکم) ژ عەبدللاهێ کورێ جەریری ڤەدگوهێزت دبێژت: ل رۆژا مەکەهـ تێدا هاتییە ڤەکرن زەلامەک ئینا نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ژ ترسان دا ڤەدلەرزی.. ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: هێدی هێدی! هەما ئەز کورێ ژنەکێمە گۆشتێ هشککری ل ڤێ مەکەهێ دخوار.

ل مەکەهێ دەمێ خەلک دهاتە حەجێ و قوربان ددان، مرۆڤێن فەقیر دچوون ئەو گۆشت بۆ خۆ هشک دکر و رادکر، دا پشتی هنگی بخۆن.. بەس مالێن فەقیر ئەڤ چەندە دکر، و مالا پێغەمبەری ئێک ژ وان بوو، دەیکا وی ئەڤ گۆشتێ هشککری دخوار، ل وی دەمێ ئەڤ باژێرە ب مەزن و

بچویـک ڤـە کەفتییـە دەسـتێ ڤـی مرۆڤـی، و لەشـکەرێ وی سێ چارێکێن وەلاتێ عەرەبان ئێخستییە بن دەستێ خۆ، یا بەرهزر ئەو بوو ئەڤ سەرۆکێ سەرکەفتی کەڤنە بەرپەرێ فەقیرییا بنەمالا خۆ بپێچت، و وی ل بەر خەلکی ڤەشێرت دا چو ژ مەزنییا وی و تاما سەرکەفتنێ کێم نەبت، ئاخری یا ئەم دبینین ژ خەلکێ دنیایێ گاڤا ئێک بەر پێیێن خۆ دبینت و چار دەرهەم دچنە د بەریکێ دا دفنبلندییا وی ئێکا هند ژێ چێ دکەت ئاخێ ب سەر بۆرییێ خۆ رادەت و دبێژت: هندی من بیرە بنەمالا مە دخۆدیتی بوون!

پێغەمبەرێ عەدالەتێ ژ ڤی توخمێ مرۆڤان نەبوو، ل وی دەمێ خەلکی ب چاڤەکێ مەزن بەرێ خۆ ددا سەرکەفتنا وی، و جهێ وی یێ بلند، وی بیراخەلکی ل بۆرییێ خۆ و بنەمالا خۆ ئیناڤە، گۆت: خۆ نەترسینە، و هزرەکا مەزن نەکە، ئەز وەکی هەر ئێک ژ هەوە مرۆڤەکێ فەقیرم، دەیکا من قەدید دخوار!

و ژ بەر کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەدڤیا خۆ ژ خەلکێ دی جودا کەت، ئەوی نە ب جلکێ خۆ و نە ب جهێ خۆ، خۆ ژ خەلکی جودا نەدکر، و گەلەک جاران مرۆڤەکێ بیانی دەمێ دهات دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ببینت، وی ئەو ژ هەڤالێن وی جودا نەدکر، لەو دا پسیار کەت: کی ژ هەوە موحەممەدە؟!

**یا دووێ:** ژ مەظاهرێن عەدالەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤە بوو وی نەدهێلا زولم بێتەکرن، و وی خەلک وە تێ دگەهاند کو مەنعەکرنا زولمێ بەری هەر تشتەکی هاریکارییەکە مرۆڤ بۆ زالمی ب خۆ پێشکێش دکەت، د ناڤ عەرەبان دا گۆتنەک هەبوو ژ گۆتنێن مەزنان دهاتە هژمارتن، دگۆتن: پشتەڤانییا برایێ خۆ بکە و وی ب سەربێخە ئەو زالم بت یان مەزلووم! و مەخسەدا وان ئەو (عونصرییەتا عەشائری) بوو یا وان شانازی

پێ دبر، کو مرۆڤ پشتەڤانییا مرۆڤێ خۆ د حەقی و نەحەقییێ دا بکەت، بێی بەرێ خۆ بدەتێ کانێ ئەو یێ زالمە یان نە. ڕۆژەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ ئاخفتنا (جاهلی!) د ناڤ صەحابییێن خۆ دا گۆت، صەحابی عەجێبگرتی بوون، چاوا پێغەمبەر ڤێ ئاخفتنێ دبێژت؟ ئێک ژ وان گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! ئەم دزانین چاوا دێ پشتەڤانییا وی کەین ئەگەر ئەو یێ مەزلووم بت، بەلێ ئەگەر یێ زالم بت چاوا دێ پشتەڤانییا وی کەین؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: مەنعا وی ژ زولمێ بکە، ئەو تە پشتەڤانییا وی کر. ڕەنگەکێ غەریبێ پشتەڤانییێیە ل بەر خەلکی، بەلێ نە ل نک پێغەمبەرێ عەدالەتێ..

و حەژێکرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ عەدالەتێ و کەربڤەبوونا وی ژ زولمێ ل ڤی توخوبیی ڕاناوەستت، بەلکی ژێ دەرباس دبت و دگەهتە هندێ ئەو فەرمانێ ل مە دکەت کو نە بەس ئەم هاریکارییا وی کەسی نەکەین یێ زولمێ دکەت و حەز ژێ نەکەین، بەلکی دڤێت خۆ ب سەر وی کەسی ژی ڤە نەچین یێ زولمێ دکەت، دا ئەو هەست ب هندێ بکەت کو یێ ب تنێیە بەلکی ل ڤی کارێ خۆ لێڤە ببت، یان ژی ئەگەر ئەم ب سەر ڤە چووین دڤێت وی وە تێ بگەهینین کو ئەم هەڤالێن وی یێن زۆردارییێ نینین.

(بەیهەقی) ژ (کەعبێ کورێ عەجورەی) ڤەدگوهێزت، دبێژت: جارەکێ ئەم نەهـ مرۆڤ د مزگەفتێ ڤە بووین، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە نک مە و سێ جاران گۆت: هەوە گوهـ ل من هەیە؟ پاشی گۆت: پشتی من هندەک مەزن دێ حوکمی ل هەوە کەن، هەچییێ ب سەر وان ڤە بچت و باوەرییێ ب درەوا وان بینت، و هاریکارییا وان ل سەر زۆردارییا وان بکەت ئەز نە ژ ویمە و ئەو نە ژ منە، و ئەو ب سەر من ڤە نائێتە سەر حەوضێ

ڕۆژا قیامەتێ، و هەچییێ ب سەر وان ڤە چوو و باوەری ب درەوا وان نەئینا و هاریکارییا وان ل سەر زۆرداریا وان نەکر، ئەو ژ منە و ئەز ژ ویمە، و ئەو دێ ب سەر من ڤە ئێتە سەر حەوضێ ڕۆژا قیامەتێ.

و ئەو زولما موحەممەدی دوژمناتییا وێ دکر نە بەس ئەو زولمە یا هندەک مەزن ل مللەتێن خۆ دکەن، هەر چەندە ئەو ژ هەمییان خرابترە ژ بەر کو کارتێکرنا وێ بەرفرەهترە.. بەلکی ئەو زولم گەلەک ڕەنگان ڤەدگرت، ژ وانان:

پێغەمبەر د گۆتنەکا خۆ دا مە ئاگەهدار دکەت کو ئەو جهێ زولم لێ دئێتەکرن و پێ ل عەدالەتێ دئێتە دانان دڤێت ئەم خۆ ژێ بدەینە پاش، ئەگەر خۆ ئەم ب خۆ زولمێ نەکەین و مە پێ نەخۆش ژی بت، چونکی لەعنەت ل وی جهی دبارن و ژ هەر کەسەکی دگرت یێ حازر ئەو تێ نەبت یێ بەرەڤانییێ ژ وی کەسی بکەت یێ زولم لێ دئێتە کرن.

زەلامەک جارەکێ هاتە نک پێغەمبەری دا وی ل سەر هندێ بکەتە شاهد کو وی تشتەک ژ مالێ خۆ یێ دایە کوڕەکێ خۆ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: هەمی عەیالێن خۆ تە ئەو دایێ؟ وی گۆت: نە، پێغەمبەری گۆتێ: تشتێ عەدالەت تێدا نەبت ئەز ل سەر نابمە شاهد.

جارەکێ زەلامەک ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ ڕوینشتی بوو کوڕەکێ وی یێ بچویک هات، وی ئەو ماچی کر و دانا سەر پێ خۆ، پاشی کچەکا وی یا بچویک هات وی ئەو دانا ب ڕەخ خۆ ڤە، پێغەمبەری نەرازیبوونا خۆ ل سەر کارێ وی دیارکر و گۆتێ: بۆچی تە عەدالەت د ناڤبەرا وان دا نەکر؟

جارەکێ وی کوڕە جحێلەک ب کارەکی هنارت، ئەو چوو حەتا نیڤرۆ نەهات، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- عێجز بوو، ئەو مرۆڤێن حازر هزرکر گاڤا

ئەو جحێل هات پێغەمبەر دێ وی ئێشینت، گاڤا هاتی، پێغەمبەری گۆتێ: ئەگەر ژ ترسێن خودێ نەبا ئەز دا تە ب ڤێ سیواکێ قوتم.. ب سیواکێ!!

و د گۆتنەکا خۆ یا دی دا دبێژت: ئەو زەلامێ دو ژن هەبن و عەدالەتێ د ناڤبەرا وان دا نەکەت، رۆژا قیامەتێ دێ ئێت یێ خار، دا خەلک هەمی بزانن ئەڤە ئەو بوو یێ زولم کری!

مەعنا: زولم چ ل سەر مستوایێ حاکمی بت چ ل سەر موستەوایێ مەحکوومی، د شریعەتێ موحەممەدی دا تشتەکە نائێتە قەبویلکرن.

**یا سێیێ:** و دبت ئەڤە ژ هەمییێ عەجێبتر بت، د شریعەتێ موحەممەدی دا عەدالەت دڤێت د (گۆتن و کریاران) ب تنێ دا نەبت، بەلکی عەدالەتا مەزنتر ئەو عەدالەتە یا د هەست و (شعوورێ) دا بت، یەعنی: ئەگەر دلێ مرۆڤی و شعوورا وی د دەر حەقا خەلکی دا یا دورست و صافی و عادل نەبت ئەو نابتە ژ وان مرۆڤان یێن موحەممەد حەز ژێ دکەت ئەگەر خۆ گۆتن و کریارێن وی د عادل ژی بن.. ما نە تشتەکێ غەریبە؟! موجەررەد تە هندەک مەشاعرێن دوژمناتییێ د دل دا هەبن، یان کەرب و نەڤیانا خەلکی دلێ تە داگیر کربت، ئەڤە تێرا هندێ هەیە تو پێ ببییە ژ زۆرداران.. سێ رۆژان ل سەر ئێک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگینی ب بەحەشتێ دا زەلامەکی، نە چونکی وی گەلەک عیبادەت دکر یان گەلەک خێر ددان، بەلکی ژ بەر هندێ چونکی دلێ وی د دەر حەقا خەلکی دا یێ صافی بوو، و وی دوژمناتییا کەسێ د سنگێ خۆ دا هل نەدگرت. و ل سەر ڤی بناخەیی هەر تشتەکێ هەبت یێ بێنا بێ باوەری و دلرەشییێ ژێ بێتە سەحکرن د شریعەتێ موحەممەدی دا یێ حەرامە، چونکی عەدالەت پێ دئێتە تێکدان، وەکی: حەسویدییێ، هەزرا خەلەت، جاسووسی، بەحسکرن و دویچوونا عەیبێن خەلکی..

و كورتترین وكۆمكەرترین پەیڤ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د دەر حەقا ڤێ مەسەلێ دا گۆتی ئەوە یا (موسلم) ژ ئەبوو هورەیرەی ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: موسلمان برایێ موسلمانییە، زۆرداریێ لێ ناكەت، و وی شەرمزار ناكەت، تەقوا یا د ڤێرێ دا.. و سێ جاران وی ئیشارەت دا سنگێ خۆ، و تێرا مرۆڤی هەیە یێ خراب بت كو وی كەرب ژ برایێ خۆ یێ موسلمان ڤەببن، موسلمان هەمی ل سەر موسلمانی حەرامە: خوینا وی و مالێ و ناموسا وی.

و مرۆڤەكی ئەگەر چو خرابی نەبن، ب تنێ خرابییا وی ئەو بت كەربێن وی ژ خەلكی ڤەببن ئەو تێرا وی هەیە وی ل نک خودێ و پێغەمبەری بكەتە ژ مرۆڤێن خراب.. جارەكێ ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مەدحێن ژنكەكێ هاتنە كرن گۆتن: ئەو ژنەكە گەلەک نڤێژان دكەت و رۆژیان دگرت، و گەلەک یا خێركەرەكە، بەلێ قوسویرییا وێ ئەوە ئەو ب ئەزمانێ خۆ نەخۆشییێ دگەهینتە جیرانێن خۆ.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەو دێ چتە ئاگری! یەعنی: ئەو هەمی رۆژی و نڤێژ و خێر چو فایدەی ناگەهیننێ، مادەم وێ ئەزمانەكێ رەش هەیە نەخۆشییێ پێ دگەهینتە خەلكی.

### ڤیان تبیتە وێ بوو

### ((لا تدخلون الجنة حتى تؤمنوا، ولا تؤمنوا حتى تحابوا)):

رۆژەكێ مرۆڤەكێ شانازییێ ب رێبازا باب و باپیران دبەت ئەگەر خۆ رێبازەكا جاهلی ژی بت، گوه لێ بوو كو زەلامەک د ناڤ قورەیشییان دا یێ دەركەفتی دبێژت: ئەز پێغەمبەرم.. و ئەو دینێ باب و باپیرێن هەوە ل سەر یێ خەلەتە! وەكی عەورێ زڤستانێ دەمێ رەش و شین دبت، ئەو مرۆڤ تێک چوو و بوو گورگورا وی.. چاوا ئەڤە دێ چێ بت؟! مرۆڤەک د ناڤ مە

دا دەرکەڤت و ب ئاشکەرایی گۆتنێن سەقەت د دەر حەقا وی دینی دا بێژت یێ باب و باپیرێن مە ل سەر چووین.. ئەڤە قەت و قەت چێ نابت! وەکی هڕەبایەکێ دژوار قەستا وی جهی کر یێ پێغەمبەر لێ و سویندا وی یا مەزن ئەو بوو ئەو نەزڤڕت حەتا حسێبا خۆ د گەل موحەممەدی صافی نەکەت.. ب گڕنژینەکا تژی ئەڤین ڤە پێغەمبەری پێشوازیا وی کر، و داخواز ژێ کر چەندەکێ ل نک ڕوینتە خوارێ و گوهێ خۆ بدەتە ئاخفتنا وی..

بیست خەبەر پێڤە نەچوون تو دا بێژی ئەڤ مرۆڤە ژ ڤی دەستی کرە د دەستێ دی دا، ئەو عەورێن ڕەش و تاری ل هنداڤ دلێ وی ڤەڕەڤین، بوو ساهی، ئەو کەربا ناڤچاڤێن وی تێک بری بریا و ل شوینا وێ گەشاتیبا ئەڤینێ ل سەر دێمی روهنکر.. و بەری ئەو ژ نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕابت دلێ وی وەسا نەرم بوو حەتا چاڤێن وی ڕۆندک باراندن، و بەری بزڤڕت گۆت: ئەی موحەممەد! ئەز ب خودێ کەمە دەمێ ئەز هاتیمە نک تە کەسەک ل سەر ڕوییێ عەردی نەبوو هندی تە ل بەر من یێ ڕەش بت، و نوکە ئەز دێ ژ نک تە چم و کەسەک ل سەر ڕوییێ عەدی نینە هندی تە ل بەر من یێ شرین بت.

و عومەر.. جەبباری جاهلییەتێ، دەمێ خودێ ڤیای ڕۆناهییا ئیسلامێ بکەتە د دلی دا بەرێ وی دا پێغەمبەرێ ڕەحمێ و دادییێ و ئەڤینێ، ڕۆژەکێ عومەری شیرێ ڕویس دا دەستێ خۆ و سۆز دا ئەو شیری نەزڤڕینتە د کاڤلانی دا حەتا موحەممەدی پێ نەکوژت.. گۆت: چاوا ئەو بستە دکەت بهاڤێتە خوداوەندێن قوریشییان یێن پیرۆز! و دەرکەفت.. قیت کرە مالا ئەرقەمی پشتی زانی پێغەمبەر و هندەک هەڤالێن خۆ یێن ل وێرێ، و پشتی عومەر دەمەکێ کورت ل دیوانا پێغەمبەری ڕوینشتی و ئێکسەر گوهێ خۆ دایە گۆتنا وی وەکی تو چپکەکا ئاڤێ بەردەیە سەر کەللا شەکەرێ ڤیانا

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەسا کەربا عومەری مێت، عومەر ب هەمی جەبباریيا خۆ ڤە بەرانبەر دیمێ گشێ پێغەمبەری حەلیا و بوو ئێکێ دی.. بوو عومەرەکێ دلنەرم و چاڤ تەڕ!

بەرانبەر ڤێ ڕویدانا مەزن قورەیشی حێبەتی بوون.. نەشیان ڤێ سەرهاتییێ شرۆڤە بکەن، چو د دەستان دا نەما گۆتن: موحەممەد ساحرە!! ئەگەر نە ئەو چ هێزە وی هەی بشێت ب ڤی ڕەنگی دلان بگوهۆڕت؟

ئەو دنەزان بوون ب زمانێ دلان، لەو هندە خەلەت چوون.. موحەممەدی کەسێ بەرانبەر ژ دل دڤیا، و خێرا وی دخواست، لەو دفتبلندییا یێ بەرانبەر ب چەکێ ڤێ ڤیانا مەزن دهاتە وەرگێڕان، و چونکی ڤیان د دلێ موحەممەدی دا -سلاڤ لێ بن- تشتەکێ فطری بوو، و تبیعەتەکێ خوڕستی بوو، و نە (تەصەننوعەکا) ژ قەستا بوو، تیشکا ئەڤینێ ژ دلێ وی یێ مەزن ڤەدپەشی و هەر زوی خۆ ل دلێ کەسێ بەرانبەر ددا.. موحەممەدی خودێ دڤیا.. و مرۆڤ دڤیان.. و دەم و جهـ دڤیان.. لەو دلێ وی هندی کەونێ خودێ دای یێ بەرفرەهـ بوو، و ئەڤ ڤیانە ب ڕاستی عاطفەکا عەجێبە هەر جارەکا ب دورستی جهێ خۆ د دلەکی دا کر وی دلی ب خودان ڤە وەسا دگوهۆڕت تو دێ بێژی ئەڤ مرۆڤە نە ئەو کەسێ بەرێیە!!

گەلەک جاران دئێتە گۆتن: ئەگەر تە بڤێت مرۆڤەکی ب دورستی بنیاسی وی عێجز کە.. ڕۆژەکێ پێغەمبەر، خودانێ ڤی دلێ هندە مەزن، مللەتێ وی یێ نەزان ئەو زێدە عێجز کر، (بوخاری) ژ دەیکا موسلمانان عائیشایێ ڤەدگوهێزت، دبێژت: من گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەرێ ڕۆژەک ب سەر تە دا هاتییە نەخۆشتر ژ ڕۆژا ئوحودێ؟ د بەرسڤا وێ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاشکەراکر کو بەلێ ئەو ڕۆژا خەلکێ طائفێ ئەو ب کرێتی دەرێخستی و زارۆک و مرۆڤێن دین و بێ عەقل ڤێڕا بەردایـن، ئەو

رۆژ ل بەر وی نەخۆشتر بوو، لەو ژ قەهران دا ئەو ل دویڤ سەرێ خۆ چوو حەتا وی هند خۆ دیتی ئەو یێ ل (قرن الثعالب) قویناغا رۆژەکێ دویر ژ مەکەهێ، عێجزی هندە!! ل وی دەمی خودێ وەحی بۆ وی هنارت: ئەی موحەممەد، ئەگەر تە بڤێت دێ چیایان ب سەر وان دا ئینم.. بەرسڤا پێغەمبەرێ دلۆڤان چ بوو؟

وی گۆت: نە یا رەببی! هیڤییا من ئەوە هندەک ژ پشتا ڤان دەرکەڤن، عەبدینییا خودێ بکەن.

ئەڤە رێبازا پێغەمبەرێ ئیسلامێ بوو.. پێغەمبەرێ رەحمێ و ڤیانێ، ل بەر نەهات غەزەب ل دوژمنێن وی یێن کافر ببارت، سەر خاترا وان عەیالێن بەلکی ژ وان ببن و عەبدینییا خودێ بکەن، و رێبازا داخوازکەرێن ضەلالەتێ ژ موجاهدێن جیهاد ژێ بەری ئەوە ئەو ب سەدان عیبادەتکەران دکوژن دبێژن: بەلکی کافرەک د ناڤ وان دا هەبت!

موحەممەدی بەری هەر تشتەکی و پتر ژ هەر تشتەکی خودایێ خۆ دڤیا، چونکی خودێ ل نک وی مەزنترین راستی بوو، و حەژێکرنا وی یا مەزن بۆ خودێ دلێ وی هند فرەه کریوو کو ڤیانا مەخلووقێن خودێ ژی د ناڤ خۆ دا بحەوینت ئەگەر خۆ ئەڤ مەخلووقە ئەو بن یێن نەخۆشی ژی گەهاندییێ. و خۆ دەمێ خەمێن دنیایێ چەنگێ خۆ ب سەر دلێ وی یێ مەزن دا دئینت ژی ڤیانا خۆشتڤییێ وی یا ل بەر چاڤان، رۆژەکێ کورێ وی یێ ئێکانە، هیڤییا ژییێ وی، مر.. مر، بەلێ هیڤی د دلی دا نەمر، خەیالا کورێ خۆ ئاخافت و گۆتێ: چاڤ رۆندکان دبارینت، و دل ب خەم دکەڤت، و ئەم تشتەکی نابێژین خودێ پێ نەخۆش بت، و ئەم ل سەر وەغەرکرنا تە ب کۆڤانین ئەی ئیبراهیم! مرنا کورێ تشتەکێ مەزنە.. بەلێ گۆتنا ئاخفتنەکا

خودێ پێ نەخۆش بت ل نک موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- مەزنترە، ئەڤە قانوونا ڤیانێیە ل نک پێغەمبەرێ ڤیانێ.

و حەتا هوین بهایێ حەژێکرنێ و ڤیانێ د شریعەتێ موحەممەدی دا بزانن گوهدارییا ڤێ حەدیسێ بکەن:

موسلم ژ ئەبوو هورەیرەی ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هوین ناچنە بەحەشتێ حەتا هوین باوەرییێ نەئینن، و هوین باوەرییێ نائینن حەتا هوین حەز ژ ئێک و دو نەکەن، و ما ئەز بۆ هەوە تشتەکی نەبێژم ئەگەر هوین بکەن هوین دێ حەز ژ ئێک و دو بکەن؟ سلاڤێ د ناڤبەرا خۆ دا بەلاڤ کەن.

هەر دەلیڤەیەکا هەبا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- ئستغلال دکر دا بەرێ هەڤالێن خۆ بدەتە ڤیانێ، و هەر رێکەکا وی زانیبا ڤیان پێ زێدە دبت وی نیشا وان ددا.. رۆژەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالەکێ خۆ بوو، زەلامەک د بەر وان را بۆری، ئەوێ ل نک پێغەمبەری روینشتی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! ئەز حەز ژ ڤی زەلامی دکەم.. پێغەمبەری گۆتێ: تە ئەو پێ حەساندییە کو تو حەز ژ وی دکەی؟ گۆت: نە. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: وی پێ بحەسینە. و بۆ ڤێ چەندێ وی قاعدەیەکێ گشتی دانا و گۆت: ئەگەر ئێک ژ هەوە برایەکێ خۆ ڤیا بلا بێژتێ کو وی ئەو دڤێت.

بۆچی؟

چونکی ئەڤ چەندە دێ بتە ئەگەرا زێدەبوونا ڤیانێ د ناڤبەرا وان دا.

و ڤیان ل نک موحەممەدی ب خۆ ب خۆ قەنجییە، و مرۆڤێ ئەڤیندار ب ئەڤینا خۆ وێ خێرێ ب دەست خۆ ڤە دئینت یا ب کارێ خۆ ب دەست خۆ ڤە نەئینت، رۆژەکێ ئەبوو ذەرری پسیارەک ژێ کر و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ

خودێ! مرۆڤەکێ هەی حەز ژ هندەک باشان دکەت و نەشێت وی کاری بکەت یێ ئەو دکەن.. ئەرێ رۆژا قیامەتێ حالێ وی دێ چ بت؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: تو دێ د گەل وی بی یێ تو حەز ژێ بکەی. ئەبوو ذەر! ئەگەر کارێ تە یێ باش هند یێ گەلەک نەبت تە ژی کو تە بگەهینتە دەرەجا وان باشان، ڤیانا تە بۆ وان دێ تە گەهینتە رێزا وان.. هەر وەکی ڤیان د شریعەتی موحەممەدی دا -سلاڤ لێ بن- ئەو نەسەبا ب هێزە یا دەورێ خۆ دبینت دەمێ هەمی نەسەب دئێنە لادان، ئەی ئەبوو ذەر! ڤیان دێ هەوە گەهینتە ئێک دەمێ کار هەوە ژێکجودا دکەت، چەند بهایەکێ مەزنە ڤیانێ ل نک ڤی پێغەمبەری هەی؟! و چەند گونەهەکا مەزنە ئەوێ کەرب و نەڤیانێ ب ناڤێ حەژێکرنا ڤی پێغەمبەری د ناف عەبدێن خودێ دا بەلاڤ دکەت!

و حەتا باش بۆ هەوە ئاشکەرا بت کو ڤیانە ئەو نەسەبا دمینت دەمێ نەسەبا دایبابی دئێتە لادان گوهدارییا ڤێ گۆتنا پێغەمبەرێ ئەڤینێ بکەن:

(ئەبوو داوود) ژ ئەبوو هورەیرەی ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: د ناڤ بەنییێن خودێ دا هندەک مرۆڤ هەنە نە پێغەمبەرن و نە شەهیدن، پێغەمبەر و شەهید رۆژا قیامەتێ حەز دکەن وەکی وان بن ژ بەر جهێ وان ل نک خودێ. گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بۆ مە بێژە کانێ ئەو کینە؟ وی گۆت: ئەو هندەک مرۆڤن بۆ خودێ حەز ژ ئێک و دو کرییە نە چونکی مرۆڤاینییەک د ناڤبەرا وان دا هەیە یان مالەکی ددەنە ئێک و دو، دێمێن وان رۆناهینە، و ئەو ل سەر رۆناهییێنە، ناترسن دەمێ مرۆڤ دترسن، و ب خەم ناکەڤن دەمێ مرۆڤ ب خەم دکەڤن. و ڤیان ل نک موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- قاعدەیەکێ موکمە بۆ ژینێ، لەو خۆ دەمێ

کاودان وی مەجبوور دکەن کو وی ئێک نەڤێت ژی ئەو ژ قاعدەیێ ڤیانێ دویر ناکەڤت، بەلکی هوین بێژن: چاوا؟

د بەرسڤێ دا دێ بێژم: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ نموونە حەز ژ حەقیییێ دکر، و ڤیانا وی بۆ حەقیییێ ئێکا هند ژێ چێ دکر گاڤا وی کەسەک دیتبا دوژمناتییا حەقیییێ بکەت ڤیانا وی بۆ حەقیییێ نەڤیانا ڤی کەسی ل نک وی پەیدا دکر، و دەلیل ل سەر ڤێ چەندێ ئەو بوو هەر جارەکا ڤی کەسێ دوژمناتییا حەقیییێ بەس کربا نەڤیانا د دلێ پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- نەدما، ئەگەر خۆ ئەو کەس نەهاتبا سەر دینێ وی ژی.. رۆژا پێغەمبەر سەرکەفتی هاتییە د مەکەهێ دا کەنکەنێن قورەیشییان هەمی سەرشۆڕ بەرانبەر وی ڕاوەستیان، و چاڤەڕێییی هندێ مان کانێ ئەڤ قائدێ سەرکەفتی چ بڕیارێ د دەر حەقا وان دا دێ دەت، ما نە ئەو بوون یێن ئەو ژ مالا وی دەرێخستی؟! ما نە ئەو بوون پتر ژ جارەکێ جاسووس هنارتینە مەدینێ دا ب دزی ڤە دا وی بکوژن؟! ما نە ئەو بوون یێن ئویجاخێن عەرەبان هەمی کۆم کرین و پێکڤە هێرش کرییە مەدینێ و چەند ڕۆژان دۆر ل باژێری گرتی ب ئنیەتا براندنا گازییا وی؟!

ئەڤە ئەو هەمی نەڤرۆ ستۆخوار ل بەر شیرێ وی دڕاوەستاینە.. نەهاتینە سەر دینێ وی، بەلێ کاودان و گوهۆڕین ئێدی ڕێکێ نادەنە وان ئەو بشێن دوژمناتییا دینێ وی بکەن، لەو بڕیارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یا روهن و ئاشکەرا بوو: ئەو ل وان هەمییان بۆری.

بەلێ.. دلێ موحەممەدی کەرب و کینێ نانیاست، و ئەو نە ژ وان کەسانە یێن ل سەر (مرۆڤینییێ) حاڤد، و هزرا تۆلستاندن و سەربڕینێ مەژییێ وی داگیرکری..

و دا بۆ مە دیار ببت کانێ بەرێ ڤی پێغەمبەرێ دلۆڤان و مهرەبان چەند لێ بوو وان ئەگەران د ناڤ مە دا نەهێلت یێن کارەکێ سلبی ل ڤیانا مە بکەن چ ل سەر مستەوایێ فەردی یان یێ جەماعی بەرێ خۆ بدەنە ڤان ئەحکامێن جڤاکی یێن وی بۆ مە دانایین:

- پێغەمبەر دبێژت: ئەگەر هوین سێ کەس ل دیوانەکێ بوون، دو ب تنێ هێدی د گەل ئێک و دو نەئاخڤن. بۆچی؟ چونکی دبت کەسێ سێیێ عێجز بت، و ئەڤ عێجزییە تەئثیرێ ل ڤیانا وی بکەت بۆ هەر دو هەڤالێن وی.

- پێغەمبەر دبێژت: ئەگەر ئێک ژ هەوە چوو دیوانەکێ بلا کەسێ ژ جهێ وی ڕانەکەت و ئەو بچت ل جهێ وی ڕوینت. بۆچی؟ چونکی دبت ئەڤ کارێ وی ببتە ئەگەرا هندێ کەربێن یێ دی ژ وی ڤەببن.

- پێغەمبەر دبێژت: چێ نابت بۆ مرۆڤی بچت د ناڤبەرا دو کەسان دا ڕوینت بێی دەستوریریا وان. بۆچی؟ دا کەربێن وان ژ وی ڤەنەبن.

- پێغەمبەر نیشا مە ددەت کو ئەگەر مە ڤیا بچینە نک کەسەکی دڤێت دەرگەهی بقوتین و نەچینە ژۆر حەتا ئەو دەستوریریێ بدەت، خو ئەگەر ئەو کەس هەڤالەکێ مرۆڤی یێ نێزیک ژی بت یان مرۆڤەکێ مرۆڤی بت. بۆچی؟ چونکی دبت چوونا مرۆڤی بارگرانییەک بوو بۆ وی ڤێجا ئەو ببتە جهێ نەخۆشییێ بۆ وی، و دلێ وی د دەر حەقا مرۆڤی دا بێتە گوهارتن.

- پێغەمبەر فەرمانێ ل مە دکەت کو ئەگەر مە گازی کەسەکی کر ب خۆشترین ناڤێ وی ل نک وی ئەم گازی بکەینێ. بۆچی؟ دا کەیفا وی بێت، و ڤیان د ناڤبەرا مرۆڤی و وی دا زێدە ببت.

- پێغەمبەر بەرێ مە ددەتە وەفادارییێ، و وی ب خۆ ژی ب کریار ئەڤ وەفایە ب جهـ دئینا، چونکی وەفاداری ڤیانێ بەلاڤ دکەت.. جارەکێ

پیرەژنەک هاتە مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، پێغەمبەر ب بەر ڤە چوو و گەلەک کەیفا خـۆ پێ ئینا و عەبایێ خۆ ژ سەر ملێن خۆ دانا دا ئـەو پیرەژن ل سەر ڕوینت.. عائیشا ژ ڤی کارێ وی حێبەتی بوو، لەو گاڤا پیرەژن زڤـڕی وێ پسـیار ژ پێغەمبـەری کـر کـانێ ئـەو کـی بـوو؟ پێغەمبـەری گـۆتێ: ئـەڤـە هەڤالا خەدیجایێ بوو، وەختێ خەدیجا یا ساخ دهات سەرا مە ددا.

یـا عـەجێب ئـەوە وەفادارییـا پێغەمبـەری و ڤیانـا وی خـۆ د گـەل (جەماداتان) ژی هـەبـوو.. بەلێ خـۆ د گەل تشـتێن هشـک و بێ ڕح ژی، ل مزگەفتا وی قورمەکێ دارێ هەبوو دەمێ وی خوتبە دخواند دچوو سـەر وی قورمی، پشتی منبەرەک بۆ هاتییە چێکرن وی ئـەو قـورم هـێلا، دەمـەکی وی بەرێ خۆ دایێ هەر وەکی ئەو قورم یێ خوار دبت، ئـەو چـوو ئـەو قـورم دا بـەر سنگێ خۆ و بڕیار دا قورم ل نک وی ل سەر منبەرێ بێتە دانان!!

و ڕۆژەکێ بـەرێ وی ب چیـایێ ئوحودێ کـەفت.. ئینـا ل هـەڤـالێن خـۆ زڤڕی و گۆت: ئوحود چیایەکە حەز ژ مە دکەت، و ئەم حەز ژێ دکەین!!

- پێغەمبەری حەرام کـر ل سـەر مـە کـو ئێک ژ مە سێ ڕۆژان پتر ژ برایەکێ خۆ سل ببت، و پشت بدەتێ. بۆچی؟ دا ئەڤ کارە ڤیانێ د ناڤبەرا وان دا نەبڕینت.

ل دویماهییا ڤێ ناڤبڕێ دێ بێژین:

د ریوایەتـەکێ دا هاتییـە جـارەکێ پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- گۆتـە صەحابییەکێ خۆ: ئەز کـارەکێ بـۆ تـە بێـژم خودێ و پێغەمبـەرێ وی حـەز ژێ دکـەن؟ گـۆت: بـەلێ ئـەی پێغەمبـەرێ خودێ، گـۆت: مرۆڤـان بگەهینـە ئێـک دەمـێ ژێـک عێجـز دبـن، و وان نێزیکـی ئێـک بکـە دەمـێ ئـەو ژێـک دویـر دکەڤن.

## بلندی و خێرخوازی کاری وی بوو

## ((تنام عینی ولا ینام قلبی)):

د ناڤ گیلەشۆکا ژینێ دا، و د گەل وان هەمی هەڤدژییێن ژینا دنیایێ د ناڤ خۆ دا هل دگرت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کار دکر پێخەمەت (تۆمارکرنا رەقەمەکێ قیاسی یێ دویردەست) د لایێ بلندی و خێرخوازییێ دا.

و هەر ل سەری وی بڕیار دا کو بۆ خەلکی بژیت پتر ژ کو بۆ خۆ بژیت، و ئەگەر ئەم دیرۆکێ بخوینین دێ بینین گەلەک کەس ب ڤی ڕەنگی هەبووینە، یەعنی: بۆ خەلکی ژیابن پتر ژ کو بۆ خۆ ژیابن.. بەلێ تشتێ موحەممەدێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ ڤان کەسێن هە جوداکری ئەو بوو ئەڤ بلندییا موحەممەد -سلاڤ لێ بن- گەهشتییێ ل نک وی ب تنێ ڕانەوەستیا بوو، و میراتەکێ وی یێ شەخصی نەبوو وی بۆ عەیالێ خۆ یان بنەمالا خۆ هێلا بت، بەلکی ئەو ڕێبازەکا گشتی بوو وی بۆ ئوممەتا خۆ پشتی خۆ ژ هێلا.

دەمێ مرۆڤ گوهێ خۆ ددەتە موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- وەکی دئاخڤت مرۆڤ بلندییێ و (ئەناقەتێ) دبینت.. و دەمێ مرۆڤ بەرێ خۆ ددەتە موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- دیسا مرۆڤ بلندی و (ئەناقەتێ) دبینت. نە بەس هندە، بەلکی خۆ دەمێ دوژمنێن وی ئەو مەجبوور دکر کو ئەو چەکی ژی هلگرت، مرۆڤ بلندییێ و (ئەناقەتێ) د شەڕێ وی دا دبینت!

وەرن دا ژ ڤێرێ دەست پێ بکەین.. چونکی ئەناقەت د گۆتن و کریاران دا بەلکی ل نک گەلەک ژ مە تشتەکێ غەریب نەبت، بەلێ ئەناقەتا د کرنا شەڕێ دوژمنان دا دبت ئەڤە ل بەر گەلەک ژ مە تشتەکێ عەجێب بت.

(ابن أبي شيبه) ژ (ئەنسێ کوڕێ مالکی) ڤەدگوهێزت کو هەر جارەکا ئەو دەرکەفتبانە شەڕەکی، لەشکەر دا خۆ ل لایێ باژێڕی گرت بەری بدەتە ڕێ حەتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوویا نک و هندەک شیرەت لێ کربان، جارەک ژ ڤان جاران پێغەمبەری گۆتە وان: ب ناڤێ خودێ دەرکەڤن، و د ڕێکا خودێ دا شەڕێ دوژمنێن خودێ بکەن، پیرەمێرێن ئەختیار نەکوژن، و چو بچویک و ژنکان نەکوژن..

و ئەڤ ئەناقەتا هە خەلیفێ وێ (ئەبوو بەکری) ژی ژێ وەرگرت بوو، جارەکێ ئەبوو بەکر د گەل لەشکەرێ موسلمانان بۆ خاترخواستنێ دەرکەفتە ژ دەرڤەی باژێڕی، سەرلەشکەر (یەزیدێ کوڕێ ئەبوو سوفیانی) بوو، ئەبوو بەکری هندەک شیرەت ل وی کرن و گۆتێ: چو بچویکان نەکوژە، و چو ژنکان ژی، و چو پیرەمێران ژی، چو دارێن فێقی نەبڕە، و چو ئاڤاهییان خراب نەکە، و چو حەیوانەتان سەرژێ نەکە، و چو دار و باری نەسوژە، و خیانەتێ نەکە، و یێ ترسنۆک نەبە..

هەوە دیت (ئەناقەت) و بلندییا د کرنا شەڕێ دوژمنی دا یا چاوایە ل نک موحەممەدی و ئەوێن ب دورستی ل سەر ڕێکا وی دچن؟ و هەوە زانی تاوانا وان کەسان چەندە ئەوێن ب ناڤێ شریعەتێ موحەممەدی زاڕۆک و ژن و پیر و بێ گونەهان دکوژن، و مال و ملکەتێ فەقیر و ژاران دسوژن و وێران دکەن؟!

خۆ دەمێ مرۆڤی دڤێت کەسەکێ موستەحەق ئەدەب بدەت و پیچەکێ بترسینت ژی، د شریعەتێ ڤی پێغەمبەری دا یێ ئەم ژ ڤەگێڕینا سیرەتا وی خلاصبووین، چێ نابت مرۆڤ قوتانەکا دژوار ل وی بکەت، یان ل ڕوییێ وی بدەت، یان ژی هندەک ئاخفتنێن کرێت و سەقەت بێژتێ.. ئەدەبدانا مە ژی دڤێت بلندی و ئەناقەت تێدا هەبت.

و ئەو پەیڤێن موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- گازییا خۆ پێ بەلاڤکری ڤیانا وی یا مەزن بۆ بلندییێ و گرێدانا وی ب ئەناقەتێ ڤە بۆ مە ئاشکەرا دکەت: جارەکێ هەڤالەکێ وی هات و ئنیەتا وی ئەو بوو تشتەکی ژ باشییێ و خرابییێ نەهێلت ئەگەر پسیارا وی ژێ نەکەت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تو هاتی پسیارا قەنجییێ بکەی؟! وی گۆت: بەلێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەر سێ تبلێن خۆ گەهاندنە ئێک و ل سنگێ وی دان و گۆتێ: پسیارا دلێ خۆ بکە، قەنجی ئەو تشتە یێ نەفس پێ پشتڕاست دبت و دل پێ رحەت دبت، و خرابی ئەو تشتە یێ بکەفتە سنگی و مرۆڤ یێ ژێ دودل بت، ئەگەر خۆ خەلک فەتوایێ بۆ تە بدەن ژێ.

مەعنا: موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- دڤێت هەر کەسەک دل و وژدانا خۆ وەکی (رادارەکێ) لێ بکەت، دا هەر جارەکا رەفتارێ وی ب دیوارێ خرابییێ کەفت یان ب لایێ سەرداچوونەکێ ڤە چوو، ئەو وی هشیار بکەت و بەرێ وی وەرگێرت، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ مە دخوازت ئەم هند د سادە نەبین خۆ ل هیڤییا خەلکی بگرین دا ئەو ب فەتوایێن خۆ خرابییێن مە بۆ مە دورست بکەن..

و بلندییا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- ئەوا وی بۆ گازی دکر ژ ڤێ چەندێ ژی (راڤیتر) بوو گوهێ خۆ بدێ چاوا ئەو بەحسێ خۆدویرکرنا ژ کارێ خراب دکەت، حسەنێ کوڕێ عەلی دبێژت: من ئەڤ گۆتنە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەرگرتییە، وی دگۆت: ئەو تشتێ تو یێ ژێ ب گومان بی بهێلە و هەرە وی تشتی یێ تو ژێ ب گومان نەبی، چونکی هندی ڕاستییە دل یێ ژێ پشتڕاستە و هندی درەوە شک و گومانە.

مەعنا: ئەگەر جارەکێ تە د مەسەلەکێ دا پسیارا دلێ خۆ کر ژی و دلێ تە چو بەرسڤێن بنبڕ نەدانە تە تو وی تشتی بهێلە و نەکە، چونکی

د تشتێ خەلەت دا مرۆڤ یێ دودل و ب گومانە، ب تنێ دودلی د دورستییا تشتەکی دا بۆ تە چێ ببت، خۆ ژێ بدە پاش.. ئەڤەیە خۆبلندکرنا د سەر شەهەواتێن نەفسێ ڕا.

و دڤێت نەئێتە هزرکرن کو ئەڤ داخوازییا خۆبلندکرنێ ژ لایێ پێغەمبەری ڤە ڕەنگەکێ هشکاتی و (تەزەمموتێ) بوو، یان ئەو تەقوایا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- ژ مە دخوازت تەقوایەکا ناڤچاڤ گرێ و زڤر بوو.. نەخێر! موحەممەد ب خۆ وەکی صەحابییێن وی دبێژن: مرۆڤەکێ ناڤچاڤ ڤەکری بوو، سوحبەت د گەل هەڤالێن خۆ دکرن، ئەو کەسێ ل نک روینشتبا شعوور دکر کو چو جوداهی د ناڤبەرا وی و وی دا نینن، ڕۆژەکێ عائیشا ژ داوەتا کچکەکا نیاسا خۆ زڤڕی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پسیار ژێ کر کانێ وان چ کر، پشتی عائیشایێ سوحبەت بۆ ڤەگێڕای و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زانی کو وان چ ستران بۆ بویکێ نەگۆتینە، گۆتێ: بۆچی هەوە سترانا (أتیناکم) بۆ وێ نەدگۆت؟ و ئەڤە سترانەک بوو کچکێن خەلکێ مەدینێ دەمێ بویک ڤەدگوهاست بۆ وێ دگۆتن.. و بۆ زانین ئەڤە عەدەتێ وان بوو هێژ بەری ئیسلامێ، بەلێ چونکی ئەو تشتەک بوو هەڤدژی (تەعالیمێن ئیسلامێ) نەبوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ناڤێ تەقوایێ و خۆڕاگرییێ ئەو ژێ نەدانە پاش، بەلکی بەرێ وان دایێ.

جارەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مزگەفتێ بوو پشتی نڤێژێ مرۆڤەک هاتە نک یێ بزدیای بوو ژ کارەکێ خراب یێ کو وی کری.. هزر دکر خلاس هندە ئەو چو هیلاکێ چونکی وی فلان گونەها مەزن یا کری، کیڤە بچت؟ هەوارێن خۆ بگەهینتە کێ؟ هاتە نک پێغەمبەری: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! ئەز تێچووم؟

- بۆچی؟

وی گۆت: چونکی من فلان گونەها مەزن یا کری..

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب سادەیی و ب نەرمی ڤە گۆتێ: تە نوکە نڤێژ د گەل مە کر؟ وی گۆت: بەلێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: نەترسە! خێر گونەهان ژێ دبەن.

ب ڤێ سادەیێ پێغەمبەرێ رەحمێ ئەڤ بێ هیڤیبوون و بێ باوەرییا ڤی زەلامی ب خۆ هەی وەرگێڕا و کرە هیڤی و باوەری..

و بلا کەس هزر نەکەت موحەممەد -سلاڤ لێ بن- یێ نەرم بوو د گەل کرنا گونەهێ.. نە! وی گەلەک و گەلەک صەحابییێن خۆ ژ خەلەتییێ ددانە پاش، بەلێ ئەگەر جارەکێ نەفسا ئێک ژ وان شیایایێ و بەرێ وی دابا بێ ئەمرییا خودێ وی ئەو ژ رەحما خودێ بێ هیڤی نەدکر، چونکی وی باش دزانی کو هیڤییا ب رەحما خودێ د گەل کرنا گونەهێ چێترە ژ بێ هیڤیبوونێ د گەل نەکرنا گونەهێ.

ئەو مرۆڤێ تویشی گونەهێ دبت کەسەکێ نساخە، و مرۆڤێ نساخ ئەگەر نساخییا وی چەند یا مەزن ژی بت دەمێ قستا دختۆری دکەت، دختۆر ئەگەر یێ شارەزا بت بەری عیلاجێ بۆ دەسنیشان بکەت دڤێت هیڤییەکا مەزن د دلێ وی دا بچینت؛ دا ئەو بشێت پێ بەرگرییا ئێشا خۆ بکەت، و دەمێ دختۆر هیڤییێ د دلێ نساخێ خۆ دا پەیدا دکەت دڤێت کەس تێ نەگەهت ئەو یێ سڤکییێ ب ئێشا وی دکەت، یان بەس یێ دلێ وی خۆش دکەت.. نە! ئەڤا ئەو دکەت پشکەکا گرنگە ژ چارەسەرییێ.

ڕۆژەکێ مرۆڤەک هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا شاهدەیێ ل سەر دزییا ئێکی بدەت.. مەسەلە هێشتا دیار نەبوویە، زەلامەکی مرۆڤەک دیت ب دزی ڤە تشتەک ژ جهەکی بر، شعوورا وی ب مەسئوولییەتا جڤاکی بەرێ وی دا هندێ بچت ڤی خەبەری بگەهینتە مەزنێ باژێری کو پێغەمبەر

بوو، و دەمێ ئەو هاتی شاهدەیێ بدەت، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! من ددیت فلان کەسی فلان تشت ددزی..

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بۆچی تە نەدگۆت من دیت فلان تشت دبر؟

ئەگەر پێغەمبەر نەبت کییە هندە قەدری ددەتە مرۆڤی و مەشاعرێن وی.. و یا ئاشکەرایە ژ سیرەتێ کو گەلەک جاران مرۆڤەک دا خەلەتییەکێ ل پێش چاڤێن خەلکی کەت، و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤیابا صەحابییێن خۆ ژ وێ خەلەتییێ بدەتە پاش و بەری هەمییان ئەوی کەسێ خەلەتی کری، ئەو دا ب سەر مینبەرێ کەڤت و بێژت: بۆچی هندەک کەس فلان خەلەتییێ دکەن.

ئەڤە مەنهەجێ موحەممەدییە -سلاڤ لێ بن- پاراستنا شعوورا هەمی کەسان خۆ ئەوێن خەلەتییێ و گونەهێ ژی دکەن، دا زڤڕینا وان ب ساناهیتر لێ بێت، نە وەکی هندەک وەعظکەر و خوتبەخوینێن ئەڤرۆ ئەوێن ژ نەزانین مینبەرێن خۆ دکەنە جهێ هەتکبرنا خەلکی و کەشفکرنا نهێنییێن وان ب هێجەتا (پاشڤەبرنا ژ خرابییێ)!

ژ لایەکێ دی ڤە موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- چارەسەرکرنا گرفتارییێن خەلکی بۆ خۆ ب عیبادەت بەلکی باشترین عیبادەت حسێب دکر، د گۆتنەکا خۆ دا ئەو دبێژت: ئەگەر ئەز د گەل برایەکی دەرکەڤم دا شۆلەکێ وی بۆ ب جهـ بینم ل نک من چێترە ژ هندێ ئەز هەیڤەکێ ئعتکافێ د ڤێ مزگەفتا خۆ دا بکەم.

ژ بەر ڤێ چەندێ بەرێ وی ل خەلکی بوو کانێ وان چ گرفتاری هەنە دا بۆ چارەسەر بکەت، بەری خەلک گرفتارییێن خۆ بگەهیننێ..

رۆژەکێ وی زانی کو ژنکەکا هاتییە مالا وی سەر و بەرێ وێ وەکی یێ رەبەنایە، و یا دەڤ ب گازندەیە.. پسیار کر ئەڤە کییە و بۆچی ئەو یا ب ڤی رەنگییە؟ گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! ئەڤە ژنکا (عوثمانێ کورێ مەظعوونییە)، و عوثمانی ئاگەهـ ژ وێ نەمایە، هەمی رۆژان یێ ب رۆژییە و هەمی شەڤان حەتا سپێدێ عیبادەتێ دکەت!

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب گرفتارییێ حسیا، لەو چوو نک عوثمانی، و گۆتێ: ما تو چاڤ ل من ناکەی؟ گۆت: چاوا ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ پێغەمبەری گۆت: تو ب رۆژێ یێ ب رۆژییی و ب شەڤێ عیبادەتێ دکەی؟ گۆت: بەلێ ئەز وە دکەم. پێغەمبەری گۆتێ: وە نەکە، لەشێ تە حەقێ ل سەر تە هەی، و عەیالێ تە ژی حەقێ ل سەر تە هەی.

کچکەکێ بابێ وێ دڤیا وێ بدەتە شوی بێی رەئیا وێ وەربگرت، کچک هات قەستا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر و گۆتێ: حال و مەسەلێن من ئەڤەنە! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: چێ نابت بۆ بابێ تە ڤێ چەندێ بکەت، ئینا کچکێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! قەیدی ناکەت ئەز دێ گوهدارییا بابێ خۆ کەم، بەلێ ئەز هاتمە نک تە دا زەلام بزانن وان حەق نینە کچێن خۆ ب تەعدایی بدەنە شوی.

پیرەژنەکێ زەلامێ وێ ئاخفتنەک گۆتێ، و عەدەت بوو د جاهلییەتێ دا هەچییێ وێ ئاخفتنێ بێژتە ژنا خۆ، ژنا وی ژێ دچوو، پیرەژن هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! هندی ئەزا جحێل وی ئەڤ تەصەرروفە د گەل من نەدکر پشتی ئەز پیر بوویم وی دڤێت من دەربێختە کۆلانان.. پاشی، د سەر حەفت عەسمانان را خودێ گوهـ ل دەنگێ وێ بوو و هندەک ئایەت د دەر حەقا وێ دا هنارتن و گرفتارییا وێ چارەسەر کر.

مەعنا: بەرێ وی لێ بوو هەردەم گرفتارییێن خەلکی چارەسەر بکەت، لەو مە ل سەری گۆت: ئەو هند بۆ خۆ نەدژیا هندی بۆ خەلکی دژیا.

و ل سەر ڤی بناخەیی وی گازییەک ئاراستەی وان مرۆڤان کر ئەوێن کار و بارێن خەلکی دکەڤنە د دەستان دا و ئاشکەرا دکەت کو هەر مەزنەکێ دەرگەهێ خۆ ل بەر موحتاج و خودان کاران بگرت، خودێ ژی دەرگەهێ خۆ رۆژا قیامەتێ ل بەر موحتاجییا وی دێ گرت.. ڤێجا هنگی ئەو دێ خوزییان راهێلت کو رۆژەکا ب تنێ ژی وی مەزنی نەکربا.

ئەڤە هندەکا کێم بوو ژ مەزنی و بلندی و ئنسانییەتا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن-، و ئەو رێبازا ئەو پێ هاتی، مە ڤیا ل دووماهییا سیرەتا وی بیرا خواندەڤانێن هێژا لێ بینینە ڤە، هیڤییا مە ژ خودایێ مەزن ئەوە ئەو ڤیانا پێغەمبەرێ خۆ د دلێ مە دا زێدە بکەت، و وی بۆ مە بکەتە جهێ چاڤلێکرنێ.

# ناڤەرۆک